ڕووناكی (رَبِّ الْعالَمِين)

ڕوونكردنەوەی

# منهاج الطالبين

للإمام النواوي

لە تێگەیشتنی بڕیارەكانی شەریعەتی ئیسلام

لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعي) رضي الله عنه


دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی



دار المعرفة

بيروت - لبنان

# ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين)

## ڕوونکردنەوەی

# ﴿مِنْهَاجِ الطَّالِبِين﴾

للإمام النواوي

لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعی) رضي الله عنه

بەرگی سێیەم

دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

چاپی پوختەکراو

دانەر بەخۆی پێیدا چۆتەوەو چەند مەسەلەیەکی تێدا زیاد کردون

محرم (١٤٣٠)ی کۆچی

بەفرانبار (٢٧٠٨)ی کوردی

کانونیدووەم (٢٠٠٩)ی زایینی

ژمارەی سپاردنی (١٩٤) ساڵی (٢٠٠١)ز، لە کتێبخانەی گشتی هەولێر، دراوەتێ

## ناسنامە:

**ناوی کیتاب:** ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین).
**بابەت:** شەریعەتی ئیسلام.
**دانەر:** عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.
**نۆبەتی چاپ:** دوایین چاپی پوختەکراو و زێدەکراو.
**بڵاوکراوەی:** کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.
**چاپخانە:** دارالمعرفة بەیرووت

---

## شارەزاکردن:

### ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشیخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.
* رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.
* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان ڕوون کراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

١ -(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).
٢ -(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهیتمي).
٣ -(نهایةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).
٤ -(مغنی‌المحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطیب الشربیني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ، ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

---

### ئەی قوتابی‌ی خۆشەویست و ڕێزدار، تکایە:

١- پێشەکیەکەلە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.
٢- بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستی‌خۆت، بەڵکو لە لای مامۆستای ئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين، ئەمەیە بەرگی سێیەمی ﴿ ڕووناکی(رَبِّ الْعالَمِينَ) ڕوونکردنەوەی(مِنْهاجِ الطّالِبِينَ)﴾، خوایگەورە یارمەتیم بدا بۆ تەواوکردنی، آمین.

ئیمامی (اَلنَّواوِي) دەفەرموێ:

## ﴿ كِتابُ الْبَيْعِ: ئەمە پەڕتوکی کڕین و فرۆشتن و مامڵەتەکانیترە ﴾

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا ﴾ خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەلاڵ کردوەو ڕیبای حەرام کردوە.

ئینجا بزانە: ئەو ڕوکنانەی کڕین و فرۆشتنیان لێ پێك دێ، سێ ڕوکنن، یەکەم: گفتوگۆی مامڵەتەکە. دووەم: مامڵەتکەرەکە. سێیەم: مامڵەت پێکراوەکە.

ئینجا دەربارەی ڕوکنییەکەم دەفەرموێ: (شَرْطُهُ) مەرجی دروستبوونی کڕین و فرۆشتن (اَلإِيجابُ) گوتنی ووشەیەکە: کە بگەیەنێ شتەکەی پێ بکرێتە ملك (كـ) وەك فرۆشیارەکە بڵێ: (بِعْتُكَ) ئەم شتەم فرۆشتە تۆ بە ئەوەندە پارەیە (وَمَلَّكْتُكَ) یان بڵێ: کردمە ملکی‌تۆ بە ئەوەندە پارەیە.

(وَالْقَبُولُ) هەروەها گوتنی ووشەیەکە: کە بگەیەنێ ملکایەتیی پێ قبول بکرێ (كـ) وەك کڕیارەکە لە وەڵامدا بڵێ: (اِشْتَرَيْتُ) شتەکەم کڕی بە ئەوەندە (وَتَمَلَّكْتُ) یان بڵێ: کردمە ملکی‌خۆم (وَقَبِلْتُ) یان بڵێ: قبولم کرد.

جا لە زۆربەی سەرچاوەکاندا بۆ ئەو مەرجە، بەڵگەیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە، کە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ﴾ صححەإبن حبان، دروستبوونی کڕین و فرۆشتن تەنها بە ڕازیبوون دەبێ. واتە: چونکە ڕازیبوون کارێکی‌پەنهانی ناو دڵە، بە گوتەی‌زوبان ئاشکرا دەبێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: مەرجە سەرپەرشتکارەکە ئەو دوو گوتەیە بڵێ لەو کاتەدا: کە ماڵی شێت، یان منداڵ دەفرۆشێتە خۆی، یان ماڵیخۆی دەفرۆشێتە ئەوان، یان ماڵی یەکێك لە ئەوان دەفرۆشێتە یەکێکیتر، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بۆ وێنە: مەرجە بڵێ: ئەم شتەی‌خۆم فرۆشتە ئەم منداڵەی خۆم بە ئەوەندە پارەیەو بۆ ئەوی قبولم کرد. یان بڵێ: ئەم شتەی ئەم منداڵەم فرۆشتە خۆم‌و بۆ خۆم قبولم کرد. یان بڵێ: ئەم شتەی ئەم منداڵەم فرۆشتە ئەو منداڵەم‌و بۆ ئەوی قبولم کرد.

وَيَجُوزُ تَقَدُّمُ لَفْظ الْمُشْتَرِى، وَلَوْ قالَ: بِعْنِى. فَقالَ: بِعْتُكَ. إنْعَقَدَ فِىالأَظْهَـر، وَيَنْعَقِدُ بالْكِنايَةِ كَجَعَلْتُهُ لَكَ بِكَذا فِىالأَصَحِّ،

دووهم: چەند زانایەك ئەم فەرموودەیان هەڵبژاردوە: كە (بَيْعُ المُعاطاة)، واتە: كرینو فرۆشتنی بێگوتە دروستە، بە تایبەتی لەو شتانەی كەم نرخن: وەك كڕیارەكەو فرۆشیارەكە لە سەر نرخی شتەكە پێك بێنو بێگوتنی هیچ ووشەیەك پارەكەو فرۆشراوەكە بدەنە یەكتری، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

سێیەم: ئەوەی دەربارەی نەگوتنی ووشەی كڕینو فرۆشتن ڕوونمان كردەوە، لە گشت مامڵەتەكانیتری ماڵیدا ڕەفتاری پێدەكرێ: وەك بەخشینو بەكرێدانو...هتد.

ئینجا بزانە: مەرجە كڕینو فرۆشتنەكە بۆ ماوەیەك نەبێ، كەوابو: دروست نیە بڵێ: بۆ ماوەی ئەوەندە ساڵ فرۆشتمە تۆ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَيَجُوزُ تَقَدُّمُ لَفْظِ الْمُشْتَرِى) دروستە: گوتەیكڕیارەكە وەپێش گوتەیفرۆشیارەكە بكەوێ، وەك بڵێ: ئەو شتەم لە تۆ كڕی. فرۆشیارەكەش بڵێ: فرۆشتمە تۆ (وَلَوْقالَ) ئەگەر كڕیارەكە گوتەیەكیفەرمانی بەكار هێناو گوتی (بِعْنِى) ئەم شتەم پێ بفرۆشە (فَقالَ) فرۆشیارەكەش گوتی (بِعْتُكَ) فرۆشتمە تۆ (إنْعَقَدَ) فرۆشتنەكە دادەمەزرێو پێویست نیە دیسان كڕیارەكە بڵێ: لێتم كڕی (فِىالأَظْهَرِ) لە فەرمودەی بەهێزتردا.

(وَيَنْعَقِدُ) مامڵەتی فرۆشتن دادەمەزرێ (بِالْكِنايَةِ) بە گوتەی نائاشكرا: بەو مەرجەی نیەتی فرۆشتنی هەبێ (كَـ) وەك بڵێ: (جَعَلْتُهُ لَكَ بِكَذا) ئەم شتەم كردە هی تۆ بە ئەوەندە پارەیە. یان بڵێ: بۆ خۆت بیبە بە ئەوەندە پارەیە. یان بڵێ: پیرۆزت بێ بە ئەوەندە پارەیە. جا كڕیارەكەش قبوڵ بكا (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: نووسینیش وەكو گوتەی نائاشكرایە، واتە: بە نووسینیش كڕینو فرۆشتن دادەمەزرێ ئەگەر نیەتی هەبێ، كەوابو: هەر لەو كاتەی كڕیارەكە لە ناوەڕۆكینووسراوەكە ئاگادار بـو، مەرجـە: یەكسـەر مامڵەتەكـە قبـوڵ بكـا، ئینجـا هـەردوو لا مـاوەی پەشیمانبوونەوەیان بەردەوام دەبێ تا كڕیارەكە لە دانیشگەی قبولكردن جیا دەبێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ئەم مەسەلەیە ڕوون كراوەتەوە.

﴿ ئاگـاداری ﴾: بـە تەلـەفۆنو بێتـەلیش كـڕینو فرۆشـتن دادەمـەزرێ، هـەروەك لـە (الشروانى)دا بە گوتەی ناشكرای داناوە، بەلام ئاگاداریە: لەو حاڵەتـەدا نـابێ مامڵـەت پێكراوەكان –هەردووكیان– یەك ڕگەزیپیبادلر بن؟ چونكە لەو جۆرەڕیبادارانـەدا مەرجـە: هەردوو لا–لە دانیشگەیمامڵەتەكەدا– دەمودەست لە یەكتری وەربگرن، ئەگینا: دەبێتـە ڕیبا، هەروەك لە باسیڕیبادا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

وَيُشْتَرَطُ أَنْ لايَطُولَ الْفَصْلُ بَيْنَ لَفْظَيْهِما وَأَنْ يَقْبَلَ عَلَى وَفْقِ الإِيجابِ، فَلَوْ قالَ: بِعْتُكَ بِأَلْفٍ مُكَسَّرَةٍ، فَقالَ: قَبِلْتُ بِأَلْفٍ صَحِيحَةٍ، لَمْ يَصِحَّ، وَإِشارَةُ الأَخْرَسِ بِالْعَقْدِ كَالنُّطْقِ، وَشَرْطُ الْعاقِدِ الرُّشْدُ،

---

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی کڕین‌و فرۆشتن بە مەرج دادەنرێ (أَنْ لاَ يَطُولَ الْفَصْلُ) لێك پچڕانەکە درێژ نەبێ (بَيْنَ لَفْظَيْهِما) لە نێوان گوتەی کڕیارەکەو فرۆشیارەکە، هەروەها گفتوگۆیەکی وەهاش نەکەوێتە نێوان کە پەیوەندی بە مامڵەتەکەوە نەبێ، کەواتە: ئەگەر گوتەی کڕیارەکەو فرۆشیارەکە ماوەیەکی‌درێژ لێك پچڕان، یان گفتوگۆیەکی بێ‌پەیوەندی کەوتە نێوان گوتەکەیان، ئەو کاتە فرۆشتنەکە دروست نابێ.

(وَأَنْ يَقْبَلَ) هەروەها مەرجە کڕیارەکە بە گوتەیەکی وەها قبوڵ بکا: کە (عَلَى وَفْقِ الإِيجابِ) لە واتەدا لەگەڵ گوتەی کردنەملێ تێك بکاتەوە، تاکو واتەی گوتەی هەردوو لا لێك جیا نەبێتەوە، کەوابو: (فَلَوْ قالَ) ئەگەر فرۆشیارەکە گوتی (بِعْتُكَ بِأَلْفٍ مُكَسَّرَةٍ) ئەم شتەم فرۆشتە تۆ بە هەزار دیناری وردە (فَقالَ) کڕیارەکەش گوتی (قَبِلْتُ بِأَلْفٍ صَحِيحَةٍ) قبوڵم کرد بە هەزار دیناری درشتە (لَمْ يَصِحَّ) ئەو مامڵەتە دروست نیە، چونکە واتەکەیان تێك ناکاتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ مەرجە لە ڕستەی کڕین‌و فرۆشتندا ناوی پارەکە بگوترێ، هەروەها مەرجە: فرۆشتنەکە بدرێتە پاڵ کڕیارەکە، هەرچەند کڕیارەکەش وەکیلی یەکێکی‌تر بێ، بۆ وێنە: ئەگەر نەوزاد وەکیلی ئازاد بێ، دەبێ کڕیارەکە بڵێ: نەوزاد ئەم شتەم فرۆشتە تۆ بە ئەوەندە پارەیە. ئینجا نەوزادیش بۆ ئازاد قبوڵی بکا، واتە: دروست نیە فرۆشیارەکە بڵێ: فرۆشتمە ئازاد. چونکە ئازاد لەم دانیشگەدا نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِشارَةُ الأَخْرَسِ) ئاماژەکردنی مرۆڤی لاڵ (بِالْعَقْدِ) بە مامڵەتی کڕین‌و فرۆشتن‌و بەکرێدان‌و بەکرێگرتن‌و...هتد (كَالنُّطْقِ) وەکو گوتەی زمان ساغ وایەو گشت مامڵەتێك بە ئاماژەکەی دروست دەبێ.

## ﴿ مەرجەکانی کڕیارو فرۆشیار ﴾

(وَشَرْطُ العاقِدِ) مەرجی مامڵەتکەر، واتە: کڕیارو فرۆشیار (الرُّشْدُ) ڕەشیدیە، واتە: بالغو عاقڵ بێ‌و قەدەغەی دەستکاری ماڵی لە سەر دانەنرابێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَبْلُغَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ﴾ رواه أبوداد بسند صحيح، نووسین لە سەر سێ کەسان هەڵگیراوە: لە سەر خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا چاك دەبێتەوە.

کەوابو: کڕینو فرۆشتنو هیچ مامڵەتەکانیتری شێتو منداڵ دروست نابن، بەلام لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا: ئەگەر منداڵ کڕینو فرۆشتن بزانیو سەرپەرشتکارەکەشی ئیزنی بدا، ئەو کاتە دروستە: کڕینو فرۆشتن بکا، هەروەك لە کتێبەکانیخۆیاندا فەرموویانە.

هەروەها ئیمام (أحمد) ڕێگای داوە: منداڵ بە بێئیزنی سەرپەرشتکارەکەی لە شتی کەمدا کڕینو فرۆشتن بکا، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ کڕینو فرۆشتنو گشت مامڵەتەکانیتری مرۆڤی سەرخۆش دروستن، جیاوازی نیە: بۆ سودی خۆی بێ، یان لە دژی خۆی بێ، بەلام بەکرێدانو کڕینو فرۆشتنی مرۆڤی کوێر دروست نیە، کەوابو: پێویستە وەکیلێك بۆ خۆی دابنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەم ئاگادارییە ڕوون کراوەتەوە، بەلام لە فەرمودەیەکی مەزهەبی (شافعی)و لە هەرسێك مەزهەبەکەیتردا: کڕینو فرۆشتنی مرۆڤی کوێریش دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ زۆرلێکردن بۆ کڕین و فرۆشتن ﴾

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (وَعَدَمُ الإِكْراهِ بِغَيْرِحَقٍّ) هەم مەرجە: بە زۆرلێکردنێکی بە ناحەق کڕینو فرۆشتنەکەی پێنەکرێ، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَتَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ لە نێوان خۆتاندا ماڵی یەکتری بە ناهەق مەخۆن، مەگەر بازرگانییەکی بە ڕەزامەندی ئێوە بێ. کەوابو: کڕینو فرۆشتنی مرۆڤیزۆرلێکراوی بە ناهەق دروست نابێ.

بەلام ئەگەر زۆرلێکردنەکە بە ناهەق نەبو، بەڵکو بە ڕێگایەکیشەرعی بوو: وەك مرۆڤێکی قەرزدار کەلوپەلێکی هەبێو بە قەسدیش قەرزەکە نەداتەوە، ئەوە -بە زۆرلێکردن- دەبی کەلوپەلەکەی بفرۆشێو قەرزەکەی بداتەوە.

هەروەها لە حاڵەتی گرانیو نەبوونیدا، ئەو کەسانەی لە پێویستیخۆیان زیادیان هەیە -بە زۆرلێکردن- دەبی زێدەییەکە بفرۆشن، واتە: لەو جۆرە حاڵەتانەدا کڕینو فرۆشتنەکان دروست دەبن.

هەروەها فرۆشتنی ناچاریش دروستە، کەوابو: ئەگەر یەکێك -بە ناهەق- تەنگاو کرا شتێك بداتە ستەمکارێك، ئەویش لە بەر ناچاری شتێکیخۆی فرۆشت ئەو فرۆشتنەش دروست دەبێ، چونکە بۆ خودی فرۆشتنەکە زۆری لێنەکراوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

وَلاَ يَصِحُّ شِراءُ الْكافِرِ اَلْمُصْحَفَ وَالْمُسْلِمَ-فِي الأَظْهَرِ-إِلاَّ أَنْ يَعْتِقَ عَلَيْهِ فَيَصِحُّ فِي الأَصَحِّ، وَلاَالْحَرْبِيِّ سِلاحاً، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلِلْمَبِيعِ شُرُوطٌ: طَهارَةُعَيْنِهِ، فَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْكَلْبِ وَالْخَمْرِ وَالْمُتَنَجِّسِ الَّذِي لاَ يُمْكِنُ تَطْهِيرُهُ كَالْخَلِّ وَاللَّبَنِ وَكَذَاالدُّهْنُ فِي الأَصَحِّ.

---

(وَلاَ يَصِحُ) دروست نیه (شِراءُالْكافِرِ الْمُصْحَفَ) مرۆڤی کافر قورئان بکڕێ، واتە: ئەو شتەی قورئانی تێدا نووسراوە، هەروەها کڕینی کتێبی حەدیسو شەرعیش بۆ کافر دروست نابێ، چونکە تووشی ڕەفتاری بێڕێزانە دەبن.

(وَالْمُسْلِمَ) هەروەها دروست نیە مرۆڤی کافر کۆیلەی موسوڵمان بکڕێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە زەلیلکردنی موسوڵمانی تێدایە (إِلاَّ أَنْ يَعْتِقَ عَلَيْهِ) مەگەر کۆیلەکە بە هۆی کڕینەوە ئازاد ببێ: وەك کۆیلەکە باوكو باپیری، یان منداڵو نەوەی مرۆڤە کافرەکە بێ (فَيَصِحُّ) ئەو کاتە کڕینەکە دروست دەبێ، کۆیلەکەش ئازاد دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَالْحَرْبِيِّ سِلاحاً) هەروەها دروست نیە کافریجەنگی چەكو کەلوپەلی جەنگ بکڕێ، چونکە بە پاڵپشتی ئەو چەکە جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان دەکا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ مەرجەکانی پارە و فرۆشراو ﴾

(وَلِلْمَبِيعِ شُرُوطٌ) بۆ مامڵەت پێکراوەکە -واتە: بۆ پارەکەو فرۆشراوەکە- پێنج مەرج داندراون:

مەرجییەکەم: (طَهارَةُعَيْنِهِ) بنچینەی مامڵەت پێکراوەکە پاك بێ، کەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ) دروست نیەو دانامەزرێ (بَيْعُ الْكَلْبِ) کڕینو فرۆشتنی سەگو تولەو تاژیو بەرازو (وَالْخَمْرِ) شەڕابو مرداروو زبڵو چیقنەو خوێنو هەر شتێکیتری لە بنچینەی خۆیدا پیس بێ، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنامِ﴾ رواه الشيخان، خواو پێغەمبەرﷺ حەرامیان کردوە: فرۆشتنی شەڕابو مرداروو بەرازو بتو سەنەم.

﴿وَعَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عنه: نَهَى النَّبِيُّﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَثَمَنِ الدَّمِ﴾ رواه البخاری، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: پارەی سەگو پارەی خوێن. واتە: فرۆشتنیان.

(وَالْمُتَنَجِّسِ الَّذِي لاَيُمْكِنُ تَطْهِيرُهُ) هەروەها دروست نیەو دانامەزرێ: کڕینو فرۆشتنی ئەو جۆرە پیسبووەی ناگونجێ پاك بکرێتەوە (كَالْخَلِّ وَاللَّبَنِ) وەکو سرکەو شیری پیسبوو (وَكَذا الدُّهْنُ) هەروەها ڕونی پیسبوو (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: چونکە ئەو جۆرە شلە پیسبووانە ناگونجێ پاك بکرێنەوە، ئەوانیش وەك پیسی بنچینەیی کڕینو فرۆشتنیان دروست نابێ.

اَلثَّانِي: اَلنَّفْعُ، فَلا يَصِحُّ بَيْعُ الْحَشَراتِ وَكُلِّ سَبُعٍ لاَ يَنْفَعُ وَلاَ حَبَّتَيِ الْحِنطَةِ وَنَحْوِهَا وَآلَةِ اللَّهْوِ، وَقِيلَ يَصِحُّ فِي الآلَةِ إِنْ عُدَّ رُضاضُها مالاً،

---

بەڵام هەر پیسبوویێکی بگونجێ پاك بکرێتەوە: وەك دارو ئاسنو جلوبەرگو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە کڕینو فرۆشتنیان دروستە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەروەها کڕینو فرۆشتنی خانووی پیسبوو و زەوی‌ی زبڵدراو دروستە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: پیسیبنچینەیی‌و شتی پیسبوو دروستە: ببەخشرێو بکرێتە خێر بە نیازی دەست لە سەر هەڵگرتن، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە، کەوابو: دروستە لە بەرامبەر ئەو دەست لە سەر هەڵگرتنەش پارە وەربگیرێ، وەك بڵێ: ئەوە وازم لەم سەگە هێنا بۆ تۆ بە پێنج دینار. یان بڵێ: دەستم لە سەر ئەم زبڵە هەڵگرت بۆ تۆ بە چوار دینار. هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(اَلثَّانِي) مەرجیدووەمی مامڵەت پێکراوەکە: (اَلنَّفْعُ) سودی لێوەربگیرێ، جیاوازی نیە: هەر ئێستا سودی لێوەربگیرێ، یان لەمەودوا: وەکو جاشولەیەکی بچووك، یان خانوویێکی بەکرێدراو بۆ ماوەیەك، واتە: هەر کاتێك جاشوولەکە گەورە بوو، یان ماوەی بەکرێدانەکە تەواو بوو، کڕیارەکە دەتوانێ سودی لێوەربگرێ.

کەوابو: (فَلا يَصِحُّ) دروست نیەو دانامەزرێ (بَيْعُ الْحَشَراتِ) کڕینو فرۆشتنی مێشومەگەز: وەکو مشك، قالۆچە، مار، دوپشك، مێش، مێشولە، مێروو...(وَ) هەروەها دروست نیە کڕینو فرۆشتنی (كُلِّ سَبُعٍ لاَ يَنْفَعُ) گشت دڕندەیەکی سودی نەبێ: وەك گورگو شێرو کوڵارەو ئەو جۆرە شتانە، بەڵام ئەگەر سودی هەبێ ئەوە کڕینو فرۆشتنی دروستە: وەك فیلو باز (وَلاَ) هەروەها دروست نیە کڕینو فرۆشتنی (حَبَّتَيِ الْحِنطَةِ) دوو دەنکە گەنمو (وَنَحْوِها) ئەو جۆرە شتانە، چونکە لە بەر کەمی سودی لێوەرناگیرێ.

(وَآلَةِ اللَّهْوِ) هەروەها دروست نیە کڕینو فرۆشتنی کەلوپەلو ئامێری گەمە کردنی حەرام: وەکو زوڕناو دمبكو مۆسیقاو...هتد (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَصِحُّ فِي الآلَةِ) دروستە: ئەو کەلوپەلانە بفرۆشێن (إِنْ عُدَّ رُضاضُها مالاً) ئەگەر پارچەکانی–لە دوای شکاندن– بە ماڵ دابندرێنو سودیان لێوەربگیرێ.

هەروەها دروست نیە کڕینو فرۆشتنی کەلوپەلی قومارو دەبدەبەو کەلاو ئەو جۆرە شتە بێسودانەی منداڵان گەمەی پێدەکەن، هەم ئەو کتێبانەی (بِدْعَة)، یان قسەی پڕو پووچیان تێدایە، چونکە شتی بێسود بە ماڵ دانانرێ، کەوابو: کڕینەکەی دەبێتە ماڵ بە فیڕۆدان، فرۆشتنیشی ماڵخواردنیخەڵکە بە ناهەق، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ ماڵی یەکتری لە نێوان خۆتاندا بە ناهەق مەخۆن.

وَيَصِحُّ بَيْعُ الْماء عَلَى الشَّطِّ، وَالتُّرابِ بِالصَّحْراء فِي الأَصَحِّ. اَلثَّالِثُ: إِمْكانُ تَسْليمِه، فَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الضَّالِّ وَالآبِقِ وَالْمَغْصُوب، فَإِنْ باعَهُ لِقادِرٍ عَلَى إِنْتِزاعِه صَحَّ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلاَيَصِحُّ بَيْعُ نِصْفٍ مُعَيَّنٍ مِنَ الإِناءِ والسَّيْفِ وَنَحْوِهِما،

---

هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿...وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقالَ وَكَثْرَةَالسُّؤالِ وَإِضاعَةَالْمالِ﴾ رواه الشيخان، خوای گەورە بۆ ئێوەی ناپەسەند کردوە: گۆتە گۆتی بێسودو زۆر پرسیارکردنی بێسودو ماڵ بەفیڕۆدان.

(وَيَصِحُّ) دروستە (بَيْعُ الْماءِ عَلَى الشَّطِّ) فرۆشتنی ئاو لە سەر ڕۆخی ڕوبار (وَالتُّرابِ بِالصَّحْراءِ) هەم فرۆشتنی گڵ لە دەشتاییدا، هەم فرۆشتنی بەرد لە چیادا، چونکە ئەو جۆرە شتانە سودیان هەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: کڕینو فرۆشتنی توتنو جگەرە هەرچەند دروستە، بەڵام ناپەسەندە؟ چونکە جگەرە خواردن ناپەسندە، ولته: حەرام نیە؟ چونکە هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرای لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر یەکێك بێگومان جگەرە زیانی پێ بگەیەنێ، یان دەستکورت بێو بە پارەی بەخێوکردنی خێزانەکەی جگەرە بکڕێ، ئەو کاتە جگەرە لەوی حەرامە، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام زۆربەی مامۆستایانیئایینی ئەم سەردەمە بۆ هەموو کەسێك بە حەرامی دەزانن؟ چونکە دەرکەوتوە: جگەرە زیانی هەیە بۆ تەندروستیمرۆڤ.

(اَلثَّالِثُ) مەرجیسێیەمی مامڵەت پێکراوەکە: (إِمْكانُ تَسْلِيمِهِ) مامڵەتکەرەکە توانای هەبێ مامڵەت پێکراوەکە تەسلیم بکا، چونکە ئەگەر نەگونجێ تەسلیمی بکا، دەبێتە فریودان ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَرضي الله عنه نَهَيالنَّبِيُّﷺعَنِ بَيْعِ الْغَرَرِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە کڕینو فرۆشتنێك کە فریودانی تێدابێ.

کەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الضَّالِّ) دروست نیەو دانامەزرێ کڕینو فرۆشتنی ئاژەڵی گوم بوو (وَالآبِقِ) هەم کۆیلەی هەڵاتوو (وَالْمَغْصُوبِ) هەم شتی زەوتکراو، چونکە ناتوانێ ئەوانە تەسلیمی کڕیارەکە بکا، کەوابو: (فَإِنْ باعَهُ لِقادِرٍ عَلَى إِنْتِزاعِهِ) ئەگەر شتە زەوتکراوەکەی، یان گومبووەکەی فرۆشتە کەسێکی وەها: کە توانای هەبو زەوتکراوەکە لە زەوتکەرەکە بسێنێتەوە، یان گومبووەکە بگەڕێنێتەوە (صَحَّ) ئەو کڕینو فرۆشتنە دروستە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، هەروەها ئەگەر بیفرۆشێتە خودی زەوتکەرەکەش هەر دروستە، چونکە لە ژێر دەستی ئەودایە، بەڵام دروست نیە باڵندەی لە هەوا بفرۆشێ، یان ماسی لە ناو ڕوبارو دەریادا بفرۆشێ، مەگەر ئاوەکە کەم بێو گرتنی ئاسان بێ، ئەو کاتە دروستە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يَصِحُّ) دروست نیەو دانامەزرێ (بَيْعُ نِصْفٍ مُعَيَّنٍ) فرۆشتنی نیوەیەکی دیارکراو (مِنَ الإِناءِ والسَّيْفِ) لە قاپو شمشێرو (وَنَحْوِهِما) ئەو جۆرە شتانە، چونکە ناگونجێ نیوە

وَيَصِحُّ فِي الثَّوْبِ الَّذِي لاَ يَنْقُصُ بِقَطْعِهِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ الْمَرْهُونِ بِغَيْرِ إِذْنِ مُرْتَهِنِهِ، وَلاَ الْجَانِي الْمُتَعَلِّقِ بِرَقَبَتِهِ مَالٌ فِي الأَظْهَرِ، وَلاَ يَضُرُّ تَعَلُّقُهُ بِذِمَّتِهِ، وَكَذَا تَعَلُّقُ الْقِصَاصِ فِي الأَظْهَرِ. اَلرَّابِعُ: اَلْمِلْكُ لِمَنْ لَهُ الْعَقْدُ، فَبَيْعُ الْفُضُولِيِّ بَاطِلٌ،

---

دیارکراوەکە تەسلیمی کڕیارەکە بکرێ تەنها بە پارچەکردن نەبێ، بە پارچەکردنیش سودی نامێنێ، کەوابو: ئەگەر نیوەکە دیاری نەکرێو بە بڵاوی بیفرۆشێ: وەك بڵێ: نیوەی ئەم قاپەم فرۆشتە تۆ، ئەو کاتە دروستەو دەبێتە هاوبەش لە نێوانیاندا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هەروەها (وَيَصِحُّ) کڕینو فرۆشتنی بەشێکی‌دیارکراو دروستە (فِي الثَّوْبِ الَّذِي لاَيَنْقُصُ بِقَطْعِهِ) لەو پارچە جلەی بە پارچە کردن کەم ناکاتەوە: وەك پارچە قوماشێکی گەورە، یان بەڕەیەکی گەورە، چونکە ئەگەر پارچە دیارکراوەکەی لێبکرێتەوە سودی دەمێنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ الْمَرْهُونِ) هەروەها دروست نیەو دانامەزرێ کڕینو فرۆشتنی شتی ڕەهنکراو (بِغَيْرِ إِذْنِ مُرْتَهِنِهِ) بە بێ‌ئیزنی ڕەهنوەرگرەکەی (وَلاَ الْجَانِي) هەروەها دروست نیە کڕینو فرۆشتنی کۆیلەیەکی تاوانکار: کە (الْمُتَعَلِّقِ بِرَقَبَتِهِ مَالٌ) تۆڵەی تاوانەکەی بە گەردەنیەوە بەسترابێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَلاَ يَضُرُّ تَعَلُّقُهُ بِذِمَّتِهِ) زیان نادا ئەگەر ماڵێك قەرز بێو لە ئەستۆیدا مابێ (وَكَذَا) هەروەها زیان نادا (تَعَلُّقُ الْقِصَاصِ) کوشتنی لە تۆڵەی بە گەردەنیەوە بەسترابێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، واتە: فرۆشتنی ئەو کۆیلەیە دروستە، چونکە چاوەڕوانی لێبوردنی دەکرێ.

(اَلرَّابِعُ) مەرجی‌چوارەمی مامڵەت پێکراوەکە: (اَلْمِلْكُ لِمَنْ لَهُ الْعَقْدُ) مامڵەت پێکراوەکە ملکی ئەو کەسە بێ: کە مامڵەتەکەی بۆ دەبێ، جیاوازی نیە: خاوەنەکەی بە خۆی مامڵەتەکە بکا، یان وەکیلەکەی، یان سەرپەرشتکارەکەی، کەوابو: (فَبَيْعُ الْفُضُولِيِّ) کڕینو فرۆشتنو گشت مامڵەتێکی‌تری خۆتێکەڵکەر -کە وەکیلی، یان سەرپەرشتکاری خاوەنەکە نەبێ- (بَاطِلٌ) بەتاڵەو دانامەزرێ، چونکە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لاَبَيْعَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ﴾ حديث حسن رواه ابوداود والترمذي وغيرهما، هیچ کڕینو فرۆشتنێك دروست نیە تەنها لەو شتەدا نەبێ کە ملکی خۆتە.

کەواتە: کڕینو فرۆشتنی ماڵی دزراو، یان زەوتکراو دروست نیە، هەروەها دروست نیە -بە بێ‌ئیزن- ماڵی ژن لە مێردەکەی بکڕێو هەم بە پێچەوانەش دروست نیە، هەروەك لە (إحياءالعلوم)دا فەرموویەتی، هەروەها مامڵەتی سەرقوفڵانەش دروست نیە، هەروەك لە (باسی ماوەی بەکرێدان)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

وَفِي الْقَدِيمِ مَوْقُوفٌ: إِنْ أَجازَ مالِكُهُ نَفَذَ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ باعَ مالَ مُوَرِّثِهِ ظانًّا حَيَاتَهُ وَكانَ مَيِّتاً صَحَّ فِي الأَظْهَرِ.

---

(وَفِيالْقَدِيمِ) لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعی)دا کڕینو فرۆشتنو گشت مامڵەتێکیتری خۆتێکەڵکەر–کە وەکیل نیەو سەرپەرشتکاریش نیە–(مَوْقُوفٌ) ڕادەگیرێ تا پرسی خاوەنەکەی دەکرێ، ئینجا (إِنْ أَجازَ مالِكُهُ) ئەگەر خاوەنەکەی ڕێگەی دا و بە کڕینو فرۆشتنەکەی ڕازی بوو، ئەوە (نَفَذَ) مامڵەتەکە جێبەجێ دەکرێو دروست دەبێ (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر ڕازی نەبو، دروست نابێ.

جا لە (تحفة)و (مغني)دا –لە ڕووی بەڵگەوە– ئەم فەرموودە کۆنە بە بەهێز دانراوە، کە ئەم حەدیسەیە: ﴿عَنْ عُرْوَةَ الْبارِقِيّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْطاهُ دِيناراً يَشْتَرِي بِهِ شاةً، فَاشْتَرَى بِهِ شاتَيْنِ، فَباعَ أَحَدَهُما بِدِينارٍ، فَأَتَاهُ بِشاةٍ وَدِينارٍ، فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ﴾ حديث صحيح رواه أبوداد والترمذي، پێغەمبەرﷺ دینارێکی دایە (عروة) تاکو مەڕێکی بۆ بکڕێ، (عروة)ش–بێئیزنی پێغەمبەرﷺ- دوو مەڕی بەو دینارە کڕین، جا یەکێکیانی بە دینارێك فرۆشتەوە، ئینجا ئەم دینارەو مەڕەکەیتری بۆ پێغەمبەرﷺ هێنانەوە، پێغەمبەرﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ (عروة) کرد. واتە: لە کڕینو فرۆشتنەوەی مەڕەکەیتردا (عروة) نەکرابوە وەکیل، بەڵام چونکە پێغەمبەرﷺ ڕازی بوو، مامڵەتەکە بە دروستبوویی دانرا.

(وَلَوْ باعَ مالَ مُوَرِّثِهِ) ئەگەر فرۆشیارێك ماڵی میراتدەری خۆی فرۆشت، واتە: ماڵی ئەو کەسەی کە میراتەکەی وی بۆ فرۆشیارەکە دەبو (ظانًّا حَيَاتَهُ) وا تێگەیشت ئەو میراتدەرە زیندووە (وَكانَ مَيِّتاً) بەڵام لە کاتی فرۆشتندا میراتدەرەکە مردوو بوو (صَحَّ) ئەو فرۆشتنە دروستە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەیبەهێزتردا، چونکە میراتەکەی بۆ بووەو لە ڕاستیدا ملکیخۆی فرۆشتوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: هەر کەسێك دەترسا: ستەمکارێك–بە ناهەق– ماڵی کەسێکینادیار ببا، یان زیانێکی لێبدا، نەشگونجا–جگە لە فرۆشتن– بە هیچ ڕێگایەکیتر ماڵەکە بپارێزێ، ئەوە بۆ کەسەکە دروستە: ماڵەکە بۆ نادیارەکە بفرۆشێ، چونکە فرۆشتن بۆتە تاکە ڕێگا بۆ پاراستنی ماڵەکە، هەروەك لە (تحفة) لە (باسی سەرپەرشتی منداڵ)دا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: فرۆشتنی بە ئەمانەت دروستە: (وەك یەکێك بترسێ ماڵەکەی لێداگیر بکرێ، یان بە زۆر پێی بفرۆشرێ، ئەویش لە ترسان بیفرۆشێتە دۆستێکیخۆی، بەڵام لە پێش فرۆشتندا ڕێك کەوتبون: هەر کاتێك ترسەکە نەماو خاوەنەکەی داوای ماڵەکەی کرد، کڕیارەکە بە پارە بیداتەوە)، ئەو جۆرە فرۆشتنە دروست دەبێ، هەروەك لە (المجموع)و

اَلْخامِسُ: اَلْعِلْمُ بِهِ، فَبَيْعُ أَحَدِ الثَّوْبَيْنِ باطِلٌ، وَيَصِحُ بَيْعُ صاعٍ مِنْ صُبْرَةٍ تُعْلَمُ صِيعانُها، وَكَذا إِنْ جُهِلَتْ فِي الأَصَحِّ،

---

(مغنی)دا فەرموویانە، واتە: ماڵەکە دەبێتە ملکی کڕیارەکەو ئەگەر نەشیداتەوە لێی حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر وەعدەکەی نەگەیەنێتە جێ گوناهبار دەبێ، جا ئەگەر بیداتەوە خێری دەگاتێ.

سێیەم: ئەگەر یەکێك بازرگانی بکا: بە ماڵێکی زەوتکراو، یان دزراو، یان بە ماڵی ڕیبا، یان شیربایی، یان هەر ماڵێکیتر: کە ملکیخۆی نەبێو بە ئیزنێکیشەرعیی خاوەنەکەشی نەبێ، تەماشا دەکەین: ئەگەر بە خودیماڵەکە کڕین، یان فرۆشتن بکا، ئەو مامڵەتە بەتاڵەو دانامەزرێ؟ نە پارەکەو نە فرۆشراوەکە لە هیچیان حەڵاڵ نابن، جا ئەگەر ماڵەکە، یان پارەکە بفەوتێ، واجبە: تۆڵەی بدا، هەروەها ئەو قازانجەش کە لەم بازرگانییە پەیدا بووە، ئەگەر بگونجێ: دەبێ بیداتەوە مامڵەتچیەکان، ئەگەر نەگونجا: ئەوە بە ماڵێکی لە دەستچوو دادەنرێ، ( کەواتە: لە بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانان سەرف دەکرێو نابێتە ملکیخۆی).

بەڵام ئەگەر بە خودی ماڵەحەرامەکە بازرگانی نەکردبو، بەڵکو بە قەرز شتێکی کڕیو شتە کڕاوەکەشی وەرگرت، ئینجا پارەیەکی حەرامی لەو قەرزە دایەوە، ئەوە مامڵەتەکان دروست دەبنو قازانجەکەشی بۆ خۆیەتی لە فەرموودەی نوێی ئیمامی (الشافعی)دا، بەڵام پارەی ئەو شتە کڕاوەی هەر لە ئەستۆدا دەمێنێو گوناهباریش دەبێ، چونکە پارە حەرامەکەشی هەر لە ئەستۆدا ماوە، هەروەك لە (الأنوار) لە (کتاب الغصب)دا ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە، ئێمەش لە پاشکۆی (غصب)دا بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(اَلْخامِسُ) مەرجیپێنجەمی مامڵەت پێکراوەکە: (اَلْعِلْمُ بِهِ) زانستی هەبێ بە خودی مامڵەت پێکراوەکە، یان بە ئەندازەکەیو بە شێوەکەی، کەوابو: (فَبَيْعُ أَحَدِ الثَّوْبَيْنِ) فرۆشتنی یەکێك لە دوو جلەکان–کە دیار نەکرێ کامەیانە– (باطِلٌ) بەتاڵەو دانامەزرێ، هەروەهاش ئەگەر بڵێ: مەڕێکم لەو مێگەلە، یان لەو دوو مەڕانە فرۆشتمە تۆ، ئەوە–ئەگەر مەڕەکە دیاری نەکرێ– بەتاڵەو دانامەزرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺقەدەغەی کردوە: کڕینو فرۆشتنێك کە فریودانی تێدابێ.

(وَيَصِحُّ) دروستە (بَيْعُ صاعٍ) ساعێك، یان چەند کیلۆیەك بفرۆشێ (مِنْ صُبْرَةٍ) لە کۆمەڵە گەنمێکی وەها: کە (تُعْلَمُ صِيعانُها) ئەندازەی ساعەکانی، یان کیلۆیەکانی بزاندرێ (وَكَذا إِنْ جُهِلَتْ) هەروەها ئەگەر نەشزاندرێ چەندە، هەر دروستە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، وەك بڵێ: بیست کیلۆ گەنمم لەم کۆمەڵە فرۆشتە تۆ.

وَلَوْ باعَ بِملْءِ ذَاالْبَيْت حنْطَةً أَوْ بزِنَةِ هَذه الْحَصاة ذَهَباً أَوْ بما باعَ به فُلانٌ فَرَسَهُ أَوْ بِأَلْفِ دَراهِمَ وَدَنانيرَ لَمْ يَصِحَّ، وَلَوْ باعَ بنَقْد وَفِي الْبَلَد نَقْدٌ غالبٌ تَعَيَّنَ، أَوْ نَقْدان لَمْ يَغْلبْ أَحَدُهُما اُشْتُرِطَ التَّعيينُ، وَيَصِحُ بَيْعُ الصُّبْرَةِ الْمَجْهُولَةِالصِّيعان كُلَّ صاعٍ بِدرْهَمٍ،

---

( وَلَوْ باعَ بِملْءِ ذَاالْبَيْتِ حِنْطَةً) ئەگەر بە ئەندازەی پڕ بەم ژوورە گەنمی فرۆشت (أَوْ بِزِنَةِ هَذِهِ الْحَصاةِ ذَهَباً) یان بە گرانایی ئەم بەردە زێڕی فرۆشت (أَوْ بِما باعَ بِهِ فُلانٌ فَرَسَهُ) یان فرۆشتمە تۆ بەو پارەیەی فلانکەس ئەسپەکەی خۆی پێ فرۆشتوە (أَوْ بِألْفِ دَراهِمَ وَدَنانيرَ) یان بە هەزار دیرهەم‌و دینار (لَمْ يَصِحَّ) فرۆشتنی هیچیان دروست نابێ، چونکە نەیزانیوە: ئەندازەی پڕ بە ژوورەکە چەند ڕیەیە، گرانایی بەردەکە چەند میسقالە، پارەی ئەسپەکە چەندە، هەروەها دیار نەکراوە: لەو هەزارە چەندی دیرهەمەو چەندی دینارە، کەواتە: ئەگەر پێش مامڵەتکردنەکە ئەو ئەندازانە بزاندرێن، ئەوە کڕین‌و فرۆشتنەکە دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ پارەی فرۆشراوەکە ﴾

**پێشەکی** بزانە: ئەگەر شتێکی فرۆشت بە پارەیەکی‌قەرز، دەبی ماوەی قەرزەکە بزاندرێ، چونکە ئەگەر پارەی فرۆشراوەکە قەرز بێ‌و ماوەی نەزاندرێ، فرۆشتنەکە دروست نابێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(و) هەروەها (لَوْ باعَ بِنَقْدٍ) ئەگەر–بە قەرز، یان بە حازر– شتێکی بە پارە فرۆشت (وَفِي الْبَلَدِ نَقْدٌغالِبٌ) لەو شوێنەشدا پارەیەکی وەها هەبو: کە بە ئەغلەبی موعامەلەی پێ دەکرا، پارەیەکی‌تریش بەو ناوە هەبو: بە کەمی موعامەلەی پێ‌دەکرا (تَعَيَّنَ) لەو دووانە ئەغلەبەکە دیاری دەکرێ‌و دەبی ئەویان بدرێتە فرۆشیارەکە.

(أَوْ نَقْدانِ) یان لەو شوێنەدا دوو پارە هەبون، بەلام (لَمْ يَغْلِبْ أَحَدُهُما) یەکێکیان لەوی‌تر غالبتر نەبو، واتە: وەکو یەك–بە یەکسانی– موعامەلەیان پێ‌دەکرا، بەلام یەکێکیان بە نرختر بوو، یان ڕەواجتر بوو، ئەو کاتە (اُشْتُرِطَ التَّعيِينُ) بە مەرج داندراوە لە مامڵەتەکەدا دیاری بکرێ: کامەیان مەبەستە، بەلام ئەگەر نرخ‌و ڕەواجی پارەکان وەکو یەکتری بوو، ئەو کاتە دیاری‌کردن مەرج نیە، بەلکو کڕیارەکە کامەیان حەز دەکا دەیداتە فرۆشیارەکە، هەرچەند یەکێکیان وردە بێ‌و ئەوی‌تریش درشتە بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَصِحُّ) دروستە (بَيْعُ الصُّبْرَةِ الْمَجْهُولَةِالصِّيعانِ) فرۆشتنی کۆمەڵە گەنمێك، یان شتێکی‌تر: کە ژمارەی ساعەکانی نەزاندراو بێ (كُلَّ صاعٍ بِدِرْهَمٍ) هەر ساعێکی بە دیرهەمێك، یان ئەم مێگەلە مەڕەم فرۆشتە تۆ هەر مەڕێك بە دیرهەمێك. ئەوە دروستە، چونکە فرۆشراوەکە

وَلَوْ باعَها بمأة دِرْهَم كُلَّ صاعٍ بدِرْهَمٍ صَحَّ إنْ خَرَجَتْ مأةً وَإلاَّ فَلاَ عَلَى الصَّحِيح، وَمَتَى كانَ الْعِوَضُ مُعَيَّناً كَفَتْ مُعايَنَتُهُ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْغائِبِ، وَالثَّانِي يَصِحُّ وَيَثْبُتُ الْخِيارُ عِنْدَ الرُّؤْيَة،

---

لەبەرچاوەو بە پێوانەو بە ژماردنیش دەزاندرێ پارەکەی دەکاتە چەند، بەڵام ئەگەر گوتی: ئەم مێگەلە مەڕەم فرۆشتە تۆ جووتی بە دینارێك. یان گوتی: لەم مێگەلە دە مەڕم بە سەد دینار فرۆشتنە تۆ. ئەو جۆرە فرۆشتنە دروست نابێ، چونکە بە ئەغلەبی نرخی مەڕەکان لێك جیاوازە، هەروەك لە(المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ باعَها بِمأةِ دِرْهَمٍ) ئەگەر هەموو کۆمەڵەکەی بە سەد دیرهەم فرۆشت (كُلَّ صاعٍ بِدِرْهَمٍ) هەر ساعێکی بە دیرهەمێك (صَحَّ) دروستە (إِنْ خَرَجَتْ مأةً) ئەگەر سەد ساع دەربچێ (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر سەد ساع دەرنەچێ دروست نابێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

## ﴿ کڕین و فرۆشتنی لە گۆترە ﴾

(وَمَتَى كانَ الْعِوَضُ مُعَيَّناً) هەر کاتێك کەلوپەلەکە، یان پارەکە لە بەرچاو بێ (كَفَتْ مُعايَنَتُهُ) بۆ دروستبوونی مامڵەتەکە تەنها بە چاو بدیترێ بەسە، واتە: هەر شتێك کڕیارو فرۆشیار بە چاوی خۆیان دیتیان: وەك پارچە زێڕێك، یان کۆمەڵە گەنمێك، یان کۆمەڵە گوێزێك، یان پارچە قوماشێك، ئەوە دروستە لە گۆترە بیکڕن و بیفرۆشن، بێ ئەوەی بزانن کێشی چەندە، یان پێوانەی چەندە، یان ژمارەی چەندە، هەروەك لەسەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام دروست نیە خواردەمەنی و زێڕو زیو -لە گۆترە- بە ڕەگەزی خۆیان بفرۆشرێن، هەروەك لە پێبادا ڕوونی دەکەینەوە إن شاء الله تعالى.

ئینجا بزانە: ئەو شتەی بە چاو دیتراوە، مەرج نیە تام بکرێ، یان بۆن بکرێ، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە، جا ئەگەر شتێکی بە چاو دیت و لە ناسینی بە هەڵەدا چوو: وەك وا تێبگا شتەکە زیوە، یان گەوهەرە، ئینجا لە دوای کڕینی ئاشکرا بوو: شتەکە مسە، یان شوشەیە، ئەم فرۆشتنەش دروستەو پەشیمانبوونەوەشی بۆ نیە، هەروەك لە (الشبراملسي)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ لاَيَصِحُّ بَيْعُ الْغائِبِ) دروست نیە کڕین و فرۆشتنی شتی نادیار: کە کڕیارەکە، یان فرۆشیارەکە نەیدیتبێ، هەرچەند شتەکەش لە لای خۆیان بێ، جا کەلوپەل بێ، یان پارە بێ، چونکە هەڵخەڵەتاندنی تێدایە (وَالثَّانِي) بە فەرموودەی دووەمی ئیمامی(الشافعي)و بە هەرسێك مەزهەبەکەیتر: (يَصِحُّ) دروستە کڕین و فرۆشتنی شتی نەدیتراو، بەو مەرجەی ڕەگەزو جۆرەکەی ڕوون بکرێتەوە (وَيَثْبُتُ الْخِيارُ) کڕیارەکە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە (عِنْدَ الرُّؤْيَةِ) لە کاتی دیتنی فرۆشراوەکە.

وَتَكْفِي الرُّؤْيَةُ قَبْلَ الْعَقْدِ فِيمالاَيَتَغَيَّرُ غالِباً إلَى وَقْتِ الْعَقْدِ، دُونَ مَا يَتَغَيَّرُ غالِباً، وَتَكْفِي رُؤْيَةُ بَعْضِ الْمَبِيعِ إنْ دَلَّ عَلَى باقِيهِ كَظاهِرِالصُّبْرَةِ وَأُنْمُوذَجِ الْمُتَماثِلِ، أَوْ كانَ صِواناً لِلْباقِي خِلْقَةً كَقِشْرِالرُّمَّانِ وَالْبَيْضِ وَالْقِشْرَةِالسُّفْلَى لِلْجَوْزِ وَاللَّوْزِ، وَتُعْتَبَرُ رُؤْيَةُ كُلِّ شَيْءٍ عَلَى مَايَلِيقُ بِهِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ وَصْفَهُ بِصِفَةِ السَّلَمِ لاَ يَكْفِي،

---

جا بزانە: سولحی بە ماڵو ڕەهنکردنو بەکرێدانو بەخشینو مارەیی ژن، گشتیان ئەو دوو فەرموودانەیان تێدا دێنە جێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَكْفِي الرُّؤْيَةُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: دیتنی مامڵەت پێکراوەکە بەسە (قَبْلَ الْعَقْدِ) پێش بەستنی مامڵەتەکە (فِيما لاَيَتَغَيَّرُ غالِباً) لەو جۆرە شتەدا کە ناگۆڕێ بە ئەغلەبی (إلَى وَقْتِ الْعَقْدِ) تا کاتی بەستنی مامڵەتەکە: وەك زەوی‌و ئاسن‌و بەردو ئەو جۆرە شتانە (دُونَ مَا يَتَغَيَّرُ غالِباً) بەڵام لەو جۆرە شتەدا دروست نیە کە بە ئەغلەبی-لەو ماوەیەدا- دەگۆڕێ: وەکو خواردەمەنی‌و ئەو جۆرە شتانەی زوو دەگۆڕێن، بەڵام لەو جۆرە شتانەدا دروستە کە دەگونجا-لەو ماوەیەدا- بگۆڕین، یان نەگۆڕێن: وەك ئاژەڵ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَكْفِي رُؤْيَةُ بَعْضِ الْمَبِيعِ) بۆ دروستبوونی مامڵەتەکە دیتنی بەشێکی فرۆشراوەکە بەسە (إنْ دَلَّ عَلَى باقِيهِ) ئەگەر ئەو بەشە نیشانە بێ لە سەر بەشەکەیتر (كَظاهِرِالصُّبْرَةِ) وەکو لای دەرەوەی کۆمەڵێکی دانەوێڵە، یان گوێز، یان ئاردو ئەو جۆرە شتانە.

(وَ) هەروەها وەکو (أُنْمُوذَجِ الْمُتَماثِلِ) نموونەی ئەو شتەی گشت بەشەکانی یەکسانن: وەکو گەنم‌و ئاردو دۆشاو و سرکەو...هتد (أَوْ كانَ صِواناً لِلْباقِي خِلْقَةً) یان ئەگەر هەر لە دروستبوونیەوە لایدەرەوەی پارێزەری بەشەکەیتر بوو (كَقِشْرِالرُّمَّانِ) وەك توێکڵی هەنارو (وَالْبَيْضِ) توێکڵی هێلکەو (وَالْقِشْرَةِالسُّفْلَى لِلْجَوْزِ وَاللَّوْزِ) هەم وەکو توێکڵی بنەوەی گوێزو چواله، یان توێکڵیسەرەوەیان ئەگەر ڕەق نەبوبن، واتە: تەنها دیتنی ئەو توێکڵانەیڕابردوو، بەسە بۆ دروستبوونی فرۆشتنی ناوەوەیان.

(وَتُعْتَبَرُ رُؤْيَةُكُلِّ شَيْءٍ) ڕەچاو دەکرێ دیتنی گشت شتێك (عَلَىمَا يَلِيقُ بِهِ) بە گوێرەی لێوەشانەوەیخۆی، وەك لە کڕینی خانوودا: ژوورەکان‌و بان‌و سەرشۆرگەو ئاودەستخانەو دیوارەکانی دەرەوەو ناوەوەی ببینێ، لە کڕینی باغدا: درەختەکان‌و جۆگەکانی ناوەوەی ببینێ، لە کڕینی جلوبەرگدا: بڵاوی بکا، تاکو دەرەوەو ناوەوەی ببینێ...بەو جۆرە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر (أَنَّ وَصْفَهُ بِصِفَةِالسَّلَمِ لاَيَكْفِي) باسکردنی فرۆشراوەکە بە سیفەتەکانی(سَلَمْ) بەس نیەو بە بەر دیتن ناکەوێ.

وَيَصِحُّ سَلَمُ الأَعْمَى، وَقِيلَ إِنْ عَمِيَ قَبْلَ تَمْيِيزِهِ فَلاَ.

(وَيَصِحُّ سَلَمُ الأَعْمَى) دروسته: مرۆڤی كوێر (سَلَمْ) بكا (وَقِيلَ) لـه فه‌رمووده‌یه‌كی بێهێزدا (إِنْ عَمِيَ قَبْلَ تَمْيِيزِهِ) ئه‌گه‌ر مرۆڤه‌كه پێش جیاوازیكردنی نێوان شته‌كان كوێر بوبێ (فَلاَ) ئه‌وه (سَلَمْ)كردنی دروست نابێ، ئینجا بزانه: كڕینو فرۆشتنو به‌كرێدانی مرۆڤی كوێر له مه‌رجه‌كانی كڕیارو فرۆشیاردا ڕوون كراوه، والْحَمْدُ لله تَعالَى.

## ﴿ پاشكۆ: چه‌ند فرۆشتنێكی نادروست ﴾

ئه‌و عاده‌ته‌ی له ناو خه‌ڵكدا هه‌یه: كه به‌شه ئاوه‌كه‌ی زه‌وی‌و باغه‌كانیان له ئاوی ڕه‌وان ده‌فرۆشن، ئه‌و كڕینو فرۆشتنه حه‌ڕامه‌و دروست نابێ، چونكه ئه‌ندازه‌ی ئاوه ڕه‌وانه‌كه نه‌زانـدراوه‌و هـه‌مووی نـه‌دیتراوه، هـه‌م ئـاوی جۆگـه‌و ڕوبـارو سه‌رچـاوه گشـتیه‌كانیش ملكی فرۆشیاره‌كه نیه، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

هه‌روه‌ها دروست نیه: شیر لـه نـاو گوانـدا بفرۆشـرێ‌و خـوری‌و مـوو لـه سـه‌ر پشـتی ئـاژه‌ڵی زیندوو بفرۆشرێ، دروست نیه سه‌روپێی ئاژه‌ڵ –پێش لێكردنه‌وه‌یان– بفرۆشـرێنو دروسـت نیـه: ئـاژه‌ڵی سـه‌ربڕاو، یـان پیسـته‌كه‌ی –پـێش گروانـدن– بفرۆشـرێ، هـه‌روه‌ها لـه دوای گروانـدنیش –ئه‌گـه‌ر نـاوه‌وه‌ی پـاك نه‌كرێتـه‌وه– دروسـت نیـه بـه كێشـان بفرۆشـرێ، واتـه: چونكه پیسایی‌ناوه‌وه‌شی له‌گه‌ڵ ده‌كێشرێ‌و نازانـدرێ چـه‌نده، كه‌وابو: ئه‌گـه‌ر لـه گـۆتره بیفرۆشێ دروست ده‌بێ، هه‌روه‌ها دروست نیه: سه‌ركی ڕه‌شه ووڵاغ‌و سـه‌ركی ووشـتر –پـێش لابردنـی پیسـته‌كه‌ی– بفرۆشـرێ، چـونكه پیسـته‌كه‌ی له‌گـه‌ڵی نـاخورێ، بـه‌ڵام فرۆشـتنی سه‌ركی مه‌ڕو بزن دروسته، هه‌روه‌ك له (الأنوار)دا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

﴿ ئاگاداری ﴾: فرۆشتنی ئاژه‌ڵو باڵنده به كێشـان –هـه‌روه‌ك بـه سـه‌ربڕاوی دروسـت نیـه– به زیندوییش هه‌ر دروست نیه به به‌ڵگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌ی ﴿نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْـعِ الْغَـرَرِ﴾ی ڕابـردوو؟ چـونكه مه‌رجی‌پێنجه‌می‌فرۆشـراوی لێ نه‌هاتوتـه جـێ‌و نازانـدرێ كێشی‌گۆشـته‌كه –بـه تـه‌نهایی– چـه‌نده‌و پیسـایی نـاوه‌وه‌ی چـه‌نده، بـه‌ڵام –لـه‌م مه‌سـه‌له‌یه– ماسـی جیـا كراوه‌تـه‌وه‌و لـه هـه‌موو حاڵـه‌تێكی‌دا دروسـته: بـه كێشـانو بـه گـۆتره بفرۆشـرێ؟ چـونكه پیسایی ناوه‌وه‌ی كه‌مه، هه‌روه‌ك له(نهاية)و (مغنى)دا فه‌رموویانه.

جا نه‌مزانیوه –وَاللهُ أَعْلَمُ– به هیچ مه‌زهه‌بێك دروست بێ: ئاژه‌ڵو باڵنده –جگه لـه ماسـی– بـه كێشان بفرۆشرێ، بۆ نمونه: له (المبسـوط للسرخسـي)ی مه‌زهـه‌بی(حنفـي)دا ب(١٢)ل(١٨٩) فه‌رموویه‌تی: (الشَّاةُالْحَيَّةُ لاتُوزَنُ) بزنو مه‌ڕی زیندوو –بۆ كڕینوفرۆشتن– ناكێشرێ.

هـه‌روه‌ها لـه(مواهـب الجليـل)ی مه‌زهـه‌بی(مـالكي)دا ب(٤) ل(٢٧٩) فه‌رموویـه‌تی: (وَلاَيَجُوزُ بَيْعُ لَحْمِ شَاةٍ حَيَّةٍ أَوْ مَذْبُوحَةٍ أَوْ لَحْمِ بَعِيرٍ كُسِرَ قَبْلَ الذَّبْحِ وَالسَّلْخِ كُلَّ رَطْلٍ بِكَذَا) دروسـت نیه: فـرۆشتنی بزنو مـه‌ڕی زیندوو، یان سـه‌ربڕاو، یان ووشـتری قاچ شكاو پێش

سەربڕینو گرواندن، هەر ڕیتلێکی بە ئەوەندە. کەوابو: واجبە موسوڵمان خۆی لەم مامڵەتە حەرامە بپارێزیو ئاژەڵو باڵندە بە کێشان نەکڕیو نەفرۆشی.

ئینجا بزانە: دروستە هەنگ، واتە: مێشیهەنگوین لە ناو غەڵێفیخۆیدا بفرۆشی، بەو مەرجەی لە کاتی هاتنە دەرەوەو چوونە ژوورەوەیدا بدیترێن، هەرچەند هەموویشی نەدیترێن، بەڵام فرۆشتنی سلقو تورو پیازو ئەو جۆرە شتانە لە ناو زەویدا –پێش هەڵکەندن– دروست نیە، بەڵام لە لای ئیمام(مالك) دروستە: پیازو تورو ئەو جۆرە شتانەش –پێش هەڵکەندن– بفرۆشرێن، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

هەروەها فرۆشتنی دانەوێڵەش لە ناو گوڵی خۆیدا دروست نیە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا دروستە: دانەوێڵەش لە گوڵیخۆیدا بفرۆشری، هەروەك لە (الهداية)ی خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها گەنمو جۆی تێکەڵکراویش دروستە لە گۆترەو بە کێشانو بە پێوانیش بفرۆشری، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، هەروەها فرۆشتنی قەسیل، واتە: ئەو کشتوکاڵە سەوزەی گوڵی نەگرتوە، هەم فرۆشتنی پەرێز، واتە: ئەو زڵكو پووشەی لە دوایدروێنە لە زەویدا دەمێنێتەوە، هەردووکی دروستە، هەروەك لە باسی (الأصول والثمار) بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە،إن شاءَ اللّهُ تَعالَی.

## ﴿ بابُ الرِّبا: باسی ڕیبا ﴾

واتە: سود وەرگرتن بە ڕێگایەکی ناشەرعی: وەك خواردەمەنی، یان زێڕو زیو و پارە بە یەکتری بفرۆشیّ بە پێچەوانەی یاسای ئیسلام، هەروەك لەم باسەدا ڕوون کراوەتەوە.

**ڕیبا** لە گوناهەکانی هەرە گەورەیەو لە هیچ شەریعەتێکدا حەڵاڵ نەکراوەو گەورەترین هەڕەشە لە قورئانو حەدیسدا دەربارەی ڕیبا هاتوە، خوایگەورە بانگەوازی جەنگ دەکا لەگەڵ ڕیباخۆرەکانو دەفەرمویّ: ﴿يَاأَيُّهاالَّذِينَ آمَنُوااتَّقُوااللّهَ وَذَرُوا مَابَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ﴾ هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە لە خوا بترسنو ئەو ڕیبایەی ماوە وازی لێبێنن ئەگەر ئێوە ئیماندارن، جا ئەگەر واز لە ڕیبا نەهێنن، ئاگادار ببنەوە بۆ جەنگێك لە لای خواو پێغەمبەرەوەﷺ.

هەروەها ﴿لَعَنَ رَسُولُ اللّهِﷺ آكِلَ الرِّبا وَمُوكِلَهُ وَكاتِبَهُ وَشاهِدَيْهِ، وَقالَ: هُمْ سَواءٌ﴾ رواه مسلم وغيره، پێغەمبەرﷺ لەعنەتی کردوە لە ڕیباوەرگرو لە ڕیبادەرو لە نووسەری مامڵەتیڕیباو لە هەردوو شاهیدەکانی، فەرمووی: ئەوانە لە تاوانیڕیبادا یەکسانن.

ئینجا بزانە: حەڕامکردنی ڕیبا خواپەرستی‌یەو هۆیەکەی ئاشکرا نیـە، بـەڵام حیکمەتەکـەی ئەمەیـە: تـەنگایی‌و زیـان دەکەوێتـە بـازاڕ، هـەروەك لـە (تحفة)و (نهایـة)و حاشـیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە، بۆیـێ پێویسـتە مرۆڤـی موسـوڵمان لـە گشت مامڵـەتێکی‌دا ئاگـادارو بـە ترس بێ؟ نەوەك تووشی ڕیبا ببێ، چونکە پێغەمبـەرﷺدەفـەرموێ: ﴿اَلرِّبَا ثَلاَثَةٌ وَسَبْعُونَ باباً أَيْسَرُها مِثْلُ أَنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ أُمَّـهُ﴾ صـححه الحـاكم علىشرط البخـاري ومسـلم، ڕیبـا حـەفتاو سـێ دەرگەیـە، لـە هـەموویان کـەم گونـاهتر وەك ئەوەیـە: پیـاو زینـا لەگـەڵ دایکی‌خۆی بکا.

جـا هـەر لەبـەر ئـەو ترسـەیە ئیمـامی(عمرﷺ) فەرموویـەتی: (کـەس لـە بازاڕی ئێمـەدا بازرگـانی نـەکا تـەنها ئـەو کەسـە نـەبێ: کـە شـارەزای شـەریعەتە، دەنـا تووشی ڕیبـا خواردن دەبێ).

هەروەها ئیمامی(علیﷺ) فەرموویـەتی: (هـەر کەسێك بازرگـانی بکـا پـێش ئـەوەی شـەرع بزانێ، ئەوە دەکەوێتە ناو ڕیبا). لە (مغنی)دا ئەو فەرموودانەی گێڕاونەوە.

ئینجا بزانـە: ڕیبـا سـێ جـۆرە، یەکـەم: (رِبَاالْفَضْل)، واتـە: ڕیبای‌زێـدەیی، وەك یـەکێکیان شتێکی‌زیاتر لـەوی‌تر وەربگرێ: لـە کـاتی مامڵەتەکـەدا، یـان لەمـەودوا، هـەروەك لـە (باسی قەرز)دا ڕوونی دەکەینـەوە،إن شـاءالله تعـالی. دووەم: (رِبَاالْيَد)، واتـە: ڕیبای‌دەسـت بەدەسـت، وەك لایـەنێکیان -یـان هـەردووکیان- پـێش لێکـوەرگرتنی مامڵەتێپکراوەکـە لـەوی‌تر جیـا ببێتـــەوە. ســـێیەم: (رِبَاالنَّسَـاء)، واتـــە: ڕیبای‌دواخســـتن، وەك لایـــەنێکیان -یـــان هەردووکیان- ماوە دابنـێ بـۆ وەرگرتنی‌مامڵەتێپکراوەکـە، هەرچـەند لێکیش جیـا نەبنـەوە.

جا بزانە: زۆر جار (رِبَاالْيَد) لە (رِبَاالنَّسَاء)ش دێتەجێ.

دیسان بزانە: ڕیبا تەنها لە خواردەمەنی‌و زێڕو زیو و پارەدا هەیە، واتە: جگە لەوانـە لـە هـیچ شتێکی‌تردا ڕیبا نیە، وەك بەردو دارو ئاسن‌و جل‌وبەرگو ئاژەڵو ئەو جۆرە شتانە، کەوابو: دروستە بـەردێك بـە دوو بـەرد، دارێـك بـە دوو دار، جلێـك بـە دوو جـل، مـەڕێك بـە دوو مـەڕ بفرۆشێ: بە قەرز، یان دەست بەدەست، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا لە پێشدا باسی ڕیبای خواردەمەنی دەکاو دەفـەرموێ: (إِذا بِيعَ الطَّعـامُ بِالطَّعامِ) هـەر کاتێك خواردەمەنی بە خواردەمەنی فرۆشرا، ئەوە تەماشا دەکرێ: (إِنْ كانـا جِنْسـاً) ئەگـەر هەردوو خواردەمەنیەکان یەك ڕەگەز بون: وەك گەنم بە گەنم، یان جۆ بە جۆ، یـان برنج بـە برنج...هتد، ئەوە (أُشْتُرِطَ) بۆ دروستبوونی مامڵەتەکە سێ مەرج دانراون:

یەکـەم: (اَلْحُلُـولُ) هـەر ئـەو دەمـە بێ‌ماوەدانـان -هـەردوو لا- خواردەمەنیـەکان بدەنە یەکتری، واتە: ئەگـەر ماوە دابندرێ، وەك یەکێکیان بڵێ: پاش دەقیقەیەك لێرە

وَالْمُماثَلَةُ وَالتَّقابُضُ قَبْلَ التَّفَرُّقِ، أَوْ جِنْسَيْنِ كَحِنْطَةٍ وَشَعِيرٍ جازَ التَّفاضُلُ، وَاشْتُرِطَ الْحُلُولُ وَالتَّقابُضُ،

---

دەتـدەمێ، ئـەو حەرامـەو دەبێتـە (رِباالنَّسَـاء)، واتـە: ڕیبای‌دواخسـتن، هەرچـەند لـە شوێنی‌مامڵەتەکەش لە یەکتری جیا نەبوبنەوە.

دووەم: (وَالْمُماثَلَـةُ) خواردەمەنیەکـەی هـەردوو لا هەنـدی یـەکتری بـن، واتـە: ئەگـەر یەکێکیان لەوی‌تر زیاتر بوو، ئەوە حەرامەو دەبێتە (رِباالْفَضْل)، واتە: ڕیبای‌زێدەیی.

سێیەم: (وَالتَّقـابُضُ قَبْـلَ التَّفَـرُّقِ) هـەردوو لا خواردەمەنیـەکان لـە یـەکتری وەربگـرن پـێش ئەوەی -لە شوێنی مامڵەتبەستن- لێك جیا ببنەوە، واتە: ئەگـەر یـەکێکیان خواردەمەنیەکـەی وەرنەگرتو ڕۆیشت، ئـەوەش حەرامـەو دەبێتـە (رِباالْیَـد)، واتـە: ڕیبـای دەسـت بەدەسـت، بـە بەڵگەی حەدیسەکەی‌داهاتوو.

﴿ ئاگاداری ﴾: لەو حاڵەتەی خواردەمەنیەکان لـە یـەك ڕەگـەزن، جیـاوازی نیـە: زێدەییەکـە لـە خـودی ڕەگەزەکـە وەربگـیرێ، یـان لـە ڕەگـەزێکی‌تر، لـە هـەردوو حاڵەتـدا هـەر پـێی دەگـوترێ: (رِباالْفَضْـل)-ڕیبـای زێـدەیی، وەك کیلـۆ گـەنمێك بفرۆشـێ بـە کیلـۆ گـەنمێكو دیرهەمێك، هەروەها جیاوازی نیە: لە شـوێنی مامڵەتبەسـتنەکەدا زێدەییەکـە وەربگـرێ، یـان زێدەییەکە بکاتە مەرجی‌قەرزێك و لە مـەودوا وەری‌بگـرێ، جـا ئەمـەیان (رِبـاالْقَرْضِ)شـی پـێ دەگوترێ، واتە: ڕیبای‌قەرز، کە لە (باسی قەرز)دا ڕوونی دەکەینەوە،إن شاءالله تعالى.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ وَالْبُرُّ بِـالْبُرِّ وَالشَّـعِيرُ بِالشَّـعِيرِ وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ مِثْلاً بِمِثْلٍ يَداًبِيَدٍ، فَمَنْ زادَ أَوْ اسْتَزادَ فَقَدْ أَرْبَى، اَلآخِذُ وَالْمُعْطِـي فِيهِ سَواءٌ﴾ رواه مسلم، زێڕ بە زێڕ، زیو بە زیو، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، قەسپ بـە قەسـپ، خوێ بە خوێ، دەبێ بە وێنەی یەکتر بن: لە ئەندازەدا یەکسان بن‌و دەسـت بـە دەسـت بـن، هەر کەسێك زێدە بدا، یـان زێـدە وەربگـرێ، بـە ڕاسـتی ڕیبـای کـردوە، ڕیبـاوەرگرو ڕیبـادەر -واتە: زێدەوەرگرەکەو زێدەدەرەکە- لە تاواندا یەکسانن.

(أَوْ جِنْسَيْنِ) یان ئەگەر هەردوو خواردەمەنیـەکان دوو ڕەگـەزی لێـك جیـاواز بـون (كَحِنْطَـةٍ وَشَعِيرٍ) وەکو گەنم‌و جۆ بـە یـەکتری بفرۆشـرێن، یـان بـرنج‌و نـۆك بـە یـەکتری بفرۆشـرێن، ئـەوە (جـازَ التَّفاضُـلُ) دروسـتە یـەکێکیان لـەوی‌تر زیـاتر بـێ، بـەڵام (وَاشْـتُرِطَ) بـۆ دروستبوونی مامڵەتەکە، دوو مەرجەکەی‌تر داندراون:

یەکـەم: (اَلْحُلُـولُ) هـەر ئـەودەمـە بێ‌ماوەدانـان-هـەردوو لا- خواردەمەنیـەکانیان بدەنـە یەکتری. دووەم: (وَالتَّقابُضُ) خواردەمەنیەکانیش لە یەکتری وەربگـرن پـێش ئـەوەی لێـك جیا ببنەوە، کەواتە: ئەگەر ترێ بە گەنم بفرۆشـرێ، یان برنج بە ساوار بفـرۆشـرێ، یان

وَالطَّعامُ ما قُصِدَ للطُّعْمِ اقْتِياتاً أَوْ تَفَكُّهاً أَوْ تَـداوِياً، وَأَدِقَّةُالأُصُـولِ الْمُخْتَلِفَـةِالْجِنْسِ وَخُلُولُها وَأَدْهانُها أَجْناسٌ،

---

هەر خواردەمەنیەك بە ڕەگەزێكیتری خواردەمەنی بفرۆشرێ، ئەگەر یەكێكیان بڵێ: پاش ماوەیەكیتر لێرە دەتدەمێ. ئەوە دەبێتە (رِباالنَّسَاء)-ڕیبای‌دواخستن.

هەروەها ئەگەر یەكێكیان لەو شوێنە بڕواو خواردەمەنیەكەی وەرنەگرێ، ئەوەش دەبێتە (رِباالْيَـدِ)-ڕیبـای دەسـت بەدەسـت، چـونكە لـە ڕیوایـەتێكی حەدیسـەكەی‌ڕابردوودا پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كانَ يَداً بِيَـدٍ﴾ رواه مسلم، هەر كاتێك ئـەو ڕەگەزانە لێك جیـاواز بـون، ئـەوە چـۆن حـەز دەكـەن پێكیـان بفرۆشن، بەو مەرجەی دەست بەدەست بێ.

(وَالطَّعـامُ) ئـەو خواردەمەنیـەی ڕیبـای تێدایـە (مـا قُصِـدَ لِلطُّعْـمِ) ئـەو شـتەیە مەبەسـتی ئادەمیزاد بۆ خواردنی بـێ: جـا (اقْتِياتـاً) بـۆ پـێژیـان بیخـوا: وەك ئـاوی خواردنـەوەو گـەنمو برنج...هتد (أَوْ تَفَكُّهاً) یان بۆ خۆشیو پێخۆر بیخوا: وەك سركەو دۆشـاو و كـەنگرو ڕێـواسو قەسپو هـەنجیرو تـرێو هـەنار...هتـد (أَوْ تَـداوِياً) یـان بـۆ دەرمـانكردن، واتـە: چـاككردنی خواردەمەنی: وەك شەكرو چایەو خوێو بیبـەرو سـۆدە، یـان چـاككردنی لاشـەی ئـادەمیزاد: وەك دەرمانەكانی پزیشكی كە لە ڕێگای دەمەوە بە كار دێن.

كەواتە: ئەگەر شەكری قەند بفرۆشرێ بە شەكری وردە، یـان خـوێی گـەرمیان بفرۆشـرێ بـە خوێی كوێستان، مەرجە: بە ئەندازەی یەكتر بنو دەست بـە دەسـت لـە یـەكتری وەربگـرن، واتە: ئەگەر پارەی بە زیادە لە سەر وەربگرن، یـان خـودی شـەكرەكە زیـاتر وەربگـرن، یـان لە دوای لێك جیابونەوە لە یەكتری وەربگرن، ئەوە دەبێتە ڕیبا.

هەروەها لە دەرمانی پزیشكیشدا زێدەیی ڕیبایە: وەك (ئەمبیسیلین)ی(٥٠٠ ملغم)ی‌ئێرانـی بفرۆشێ بە (ئەمبیسیلین)ی(٢٥٠ ملغم)ی عێراقی، چونكە هەردووكیان یەك ڕەگـەزن، بـەڵام ئەگـەر (ئەمبیسـیلین) بفرۆشـرێ بـە (ئەسـپرین)، ئـەوە زێـدەیی دروسـتە، بـەو مەرجـەی دەسـت بەدەسـت لـە یـەكتری وەربگـرن، هـەروەك دروسـتە: خـوێ بفرۆشـرێ بـە شـەكرو زێـدەییش وەربگـرێ، بـەو مەرجـەی دەسـت بەدەسـت بـێ، چـونكە ئـەو ڕەگەزانـە لێـك جیاوازن، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(وَأَدِقَّةُالأُصُـولِ) ئـاردی ئـەو دانەوێڵانـەی كـە (الْمُخْتَلِفَـةِالْجِنْسِ) ڕەگـەزیان لێـك جیـاوازەو (وَخُلُولُها) هەم سركەی ئەو میوەیەی ڕەگـەزی لێـك جیـاوازەو (وَأَدْهانُهـا) هـەم ڕونـی ئـەو دەنكانـەی ڕەگـەزیان لێـك جیـاوازە: گشـتیان (أَجْنـاسٌ) ڕەگـەزی لێـك جیـاوازن وەك بنچینەكەی خۆیـان، كەواتـە: دروسـتە ئـاردی گـەنم بفرۆشـرێ بـە ئـاردی جـۆ، زێـدەش وەربگیرێ بەو مەرجەی دەست بە دەست بێ.

وَاللُّحُومُ وَالأَلْبانُ كَذَلِكَ فِى الأَظْهَر، وَالْمُماثَلَةُ تُعْتَبَرُ فِى الْمَكِيلِ كَيْلاً وَالْمَوْزُونِ وَزْنـاً، وَالْمُعْتَبَرُ غَالِبُ عادَةِ أَهْلِ الْحِجازِ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ،

---

هەروەها دروستە: سرکەی‌خورما بفرۆشرێ بە سرکەی‌تریێ، یان هـەنار، زێـدەش وەربگیرێ بـەو مەرجـەی دەسـت بـە دەسـت بـێ، هـەروەها دروسـتە: ڕونـی کـونجی‌و گوڵەبـەڕۆژە بفرۆشرێن بە ڕونی زەیتون‌و زوڕات‌و پەمۆ، بـەو مەرجـەی دەسـت بـە دەسـت بـێ، چـونکە ئەو ئاردو سرکەو ڕونانە لە بنچینەدا ڕەگەزیان لێك جیاوازە.

(وَاللُّحُومُ) گۆشـتـەکان‌و (وَالأَلْبـانُ) شـیرو ماسـتـەکان، هـەم ڕونـەکان‌و هێلکـەکان گشـتـیان (كَـذَلِكَ) ڕەگـەزی لێـك جیـاوازن وەك بنچـینەکەی خۆیـان (فِى الأَظْهَـرِ) لـە فـەرموودەی بەهێزتردا، کەواتە: دروستە گۆشتی مەڕو بزن بفرۆشرێ بە گۆشتی ڕەشـە وڵاغ، زێـدەش وەربگیرێ، هەروەهاش دروستە: ڕون‌و شیرو ماستی مـەڕو بـزن بفرۆشـرێ بـە ڕون‌و شـیرو ماستی مانگا، زێـدەش وەربگیرێ، هـەروەهاش دروسـتە: هێلکـەی مریشـك بفرۆشـرێ بـە هێلکـەی قـاز، زێـدەش وەربگیرێ، بـەو مەرجـەی لـە گشـت ئەوانـەی‌ڕابردوودا دەسـت بـە دەست بێ.

بەڵام ئەگەر ئەوانـەی‌ڕابردوو، لـە بنچینەدا یـەك ڕەگـەز بـون زێـدەیی دروسـت نیـە، کـەوابو: دروست نیە ئاردێکی ووردی گەنم بە ئاردێکی ووردی، یان درشتی گـەنم بفرۆشـرێ‌و زێـدەش وەربگیرێ، یان سـرکەیەکی مـزری هـەنار بـە سـرکەیەکی‌مزری، یـان ترشـی هـەنار بفرۆشـێ‌و زێدەش وەربگیرێ، یان ڕونێکی پەیتی گوڵەبەڕۆژە بە ڕونێکی پەیتی، یـان شلی گوڵەبـەڕۆژە بفرۆشرێ‌و زێدەش وەربگیرێ، هەروەها دروست نیە: گۆشت‌و شیرو ماست‌و ڕونـی مـەڕو بـزن بفرۆشرێ بە گۆشت‌و شیرو ماست‌و ڕونی مەڕو بزن‌و زێـدەش وەربگیرێ، چـونکە مـەڕو بـزن یەك ڕەگەزن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْمُماثَلَـةُ) هاووێنەیی‌خواردەمـەنی (تُعْتَبَـرُ) ڕەچـاو دەکـرێ (فِى الْمَكِيـلِ كَـيْلاً) لـەو خواردەمەنیەدا: کە دەپیورێ (كَيْلاً) بە پێوانە ڕەچاو دەکرێ، هەرچـەندە لـە کێشانیشدا لێك جیا بن (وَالْمَوْزُونِ) هـەروەها لـەو خواردەمەنیەشدا کە دەکێشرێ (وَزْنـاً) بـە کێشـان ڕەچاو دەکرێ، هەرچەندە لە پێوانەشدا لێك جیا بن (وَالْمُعْتَبَرُ) ئـەو عادەتـەش کـە ڕەچـاو دەکرێ بـۆ زانـینی کێشـان‌و پێـوان (غـالِبُ عـادَةِ أَهْـلِ الْحِجازِ) عادەتـە زۆرەکـەی خـەڵکی حیجازە (فِى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ) لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، واتـە: هـەر خواردەمەنیـەك لـە سـەردەمی‌پێغەمبەردا ﷺ پیورابـێ، ئێسـتاش هـەر پێوانەکـەی ڕەچـاو دەکـرێ‌و ئـەوەی کێشرابێ، ئێستاش هەر کێشانەکەی ڕەچاو دەکرێ، عـادەتی ئێستای خـەڵك –ئەگـەر بە پێچەوانەی ئەو سەردەم بێ– ڕەچاو ناکرێ.

وَما جُهِلَ يُراعَى فِيهِ عادَةُ بَلَدِالْبَيْعِ، وَقِيلَ الْكَيْلُ، وَقِيلَ الْوَزْنُ، وَقِيلَ يَتَخَيَّرُ، وَقِيلَ إِنْ كانَ لَهُ أَصْلٌ اُعْتُبِرَ، وَالنَّقْدُ بِالنَّقْدِ كَطَعامٍ بِطَعامٍ،

---

(وَماجُهِلَ) ئەو خواردەمەنیەش کە نەزانراوە: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئایا پێوراوە، یان کێشراوە (يُراعَى فِيهِ عادَةُ بَلَدِالْبَيْعِ) عادەتی شوێنی مامڵەتەکەی تیّدا ڕەچاو دەکریّ (وَقِيلَ الْكَيْلُ) لە فەرموودەیەکی بیّهێزدا: پێوانە ڕەچاو دەکریّو (وَقِيلَ الْوَزْنُ) لە فەرموودەیەکی تری بیّهێزدا: کێشان ڕەچاو دەکریّ (وَقِيلَ يَتَخَيَّرُ) لە فەرموودەیەکی تری بیّهێزدا سەرپشکە: کامەیان ڕەچاو بکا دروستە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی تری بیّهێزدا: (إِنْ كانَ لَهُ أَصْلٌ) ئەگەر خواردەمەنیەکە بنچینەیەکی هەبیّ (اُعْتُبِرَ) بنچینەکە ڕەچاو دەکریّ.

## ﴿ ڕیبای زێڕو زیو و پارە ﴾

(وَالنَّقْدُ بِالنَّقْدِ) زێڕ بە زێڕ و زیو بە زیو، هەم پارە بە پارە و بە پێچەوانەش (كَطَعامٍ بِطَعامٍ) وەك خواردەمەنی بە خواردەمەنی‌یە: لە گشت ڕوونکردنەوەکانیڕابردوودا، بە بەلگەی هەردوو حەدیسەکەیڕابردوو، واتە: ئەگەر زێڕ بە زێڕ بفرۆشریّ، یان زیو بە زیو بفرۆشریّ، یان پارەی وولاتێك بە پارەی هەمان وولات بگۆڕدرێتەوە، ئەوە -بۆ دروستبوونی مامڵەتەکە- سیّ مەرج داندراون:

یەکەم: بیّماوەدانان-هەردوو لا- شتەکە بدەنە یەکتر. دووەم: لە ئەندازەدا هاووێنەی یەکتری بن. سیّیەم: پێش لێکجیابوونەوە-هەردوو لا- شتەکە لە یەکتری وەربگرن.

هەروەها ئەگەر زێڕ بە زیو بفرۆشریّ، یان زێڕو زیو بە پارە بفرۆشرێن، یان پارەی وولاتێك بە پارەی وولاتێکیتر بفرۆشریّ، ئەوە-بۆ دروستبوونی مامڵەتەکە- دوو مەرج داندراون:
یەکەم: بیّماوەدانان-هەردوو لا- شتەکە بدەنە یەکتر. دووەم: پێش لێکجیابوونەوە -هەردوو لا- شتەکە لە یەکتری وەربگرن. واتە: هاووێنەیی لە ئەندازەدا مەرج نیە.

ئینجا بزانە: چەند ڕیبایەکی ناو بازاڕ هەنە لەم ئاگاداریانەدا ڕوونیان دەکەینەوە:

**﴿ ئاگاداری ﴾** یەکەم: پارەو دراوی ئەم سەردەمە جێگری زێڕو زیوە، کەواتە: زەکاتی تیّدا واجبەو ڕیبای تیّدا حەرامە، ئینجا بزانە: کە لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە: (فلوس) ڕیبای تیّدا نیە. مەبەستیان (فلوس)ی سەردەمیخۆیانە، چونکە پارەی سەردەمی ئەو زانایانە لە زێڕو زیو بوو، بەلاّم (فلوس) پارە نەبو، بەلکو لە سفر دروست دەکرلو لەجیّی وردەی زیو بەکار دەهێندرا، هەروەك لە (الدرالمنتقى شرح الملتقى) ل(١٢٣) ب(٢)و (شرح أحكام النقود لابن عابدين) ل(١٤و ١٦و ٢٤) ڕوون کراوەتەوە.

کەواتە: (فلوس)ی ئەو سەردەم بەرامبەر زێڕو زیو هیچ بایەخی پیّنەدەدرا، بەلاّم لە سەردەمی ئێستادا زێڕو زیو بونەتە کەلوپەلێکی بە نرخی بازرگانی، واتە: وەکو پارە

به كار ناهێندرێن، هەر وولاتێك بۆ خۆی جۆرە پارەیەكی لە جێی زێڕو زیو داناوە، ئەوەش شتێكی ئاشكراو بەڵگە نەویستەو ململانەی ناوێ.

دووەم: لە پارە وردكردنەوەدا، یان لە پارە گۆڕینەوەدا تەماشا دەكرێ: ئەگەر وردەكەو درشتەكە پارەی یەك وولات بن: وەك پێنج دیناری عێراقی بە تاك دیناری، یان بە تاك دیرهەمی عێراقی ورد بكرێتەوە، یان هەزار تومەنی ئێرانی بە تاك تومەن ورد بكرێتەوە، یان سەد دۆلاری ئەمریكی بە تاك دۆلار ورد بكرێتەوە، ئەوە هەرسێك مەرجەكانیڕابردوو پێویستن، واتە: وردەكەو درشتەكە بە ئەندازەی یەكتر-بێزێدەیی- بن، بێماوەدانان، پێش لێكجیابوونەوە، دەست بە دەست وردەكەو درشتەكە لە یەكتری وەربگرن، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو.

بەڵام ئەگەر پارەكان هی دوو وولات بن: وەك دیناری عێراقی بە تومەنی ئێرانی، یان بە دۆلاری ئەمریكی بگۆڕێتەوە، ئەوە زێدەیی دروستە، بەڵام دوو مەرجەكەیتر پێویستن، واتە: بێماوەدانانو پێش لێكجیابوونەوە دەست بە دەست لە یەكتری وەربگرن، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عَنْ مالك بن أوْس﷜ قالَ: إلْتَمَسْتُ صَرْفاً بِماْةِدينار فَدَعاني طَلْحَةُ فَتَراوَضْنا حَتَّى إصْطَرَفَ مِنّي، فَأَخَذَ الذَّهَبَ ثُمَّ قالَ: حَتَّى يَأْتِيَ خازِني مِنَ الْغابَةِ-وَعُمَرُ يَسْمَعُ- فَقالَ عُمَرُ: وَاللهِ لاَ تُفارِقُهُ حَتَّى تَأْخُذَ مِنْهُ، قالَ رَسُولُ اللهِﷺ: اَلْوَرِقُ بِالذَّهَبِ رِباً إلاَّ هاءَ وَهاءَ...﴾ رواه‌الشيخان، (مالك) فەرمووی: ویستم سەد دیناری زێڕ ورد بكەمەوە بە دیرهەمی زیو، ئینجا (طلحة) بانگی كردمو گفتوگۆمان كرد تا پێك هاتین، ئینجا سەد دینارە زێڕەكەی لێوەرگرتمو گوتی: تا خزمەتكارەكەم دێتەوە ئینجا وردەكەت بۆ دەنێرم. ئیمامی(عمر) فەرمووی: (والله) نابێ لێیجیا ببیەوە تا وردەكەی لێوەردەگری، چونكە پێغەمبەرﷺفەرمووی: زیو بە زێڕ ڕیبایە، تەنها دەست بەدەست نەبێ: ئەو بڵێ: بیگرە. ئەمیش بڵێ: بیگرە. واتە: دەبێتە (رِباالْيَد).

سێیەم: لە (المجموع) لیرەدا، لە سەرچاوەكانیتر لە (سَلَمْ)دا فەرموویانە: (دروست نیە (سَلَمْ) لە زێڕو زیودا بكرێ ئەگەر سەرمایەكەشی زێڕ، یان زیو بێ).

ئەوەش وا دەگەیەنێ كە دروست نیە: زێڕو زیو بە پارەی ئەم سەردەمە بە قەرز بفرۆشرێن، چونكە پارەكەش جێگری زێڕو زیوەو دەبێتە (رِباالنَّساء)، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لاَتَبيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ وَلاَ تَبيعُواالْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَتُشِفُّوا بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ وَلاَتَبيعُوا شَيْئاً غائِباً مِنْهُ بِناجِزٍ﴾ رواه‌الشيخان واللفظ لمسلم، زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن تەنها بە هاووێنەیی نەبێ، زیو بە زیو مەفرۆشن تەنها بە هاووێنەیی نەبێ، بەشێكی ڕەگەزی

زێڕ، یان زیو لە سەر هەمان ڕەگەز زیاد مەکەن، هیچ زێڕو زیوێکی نادیارو قەرز مەفرۆشن بە حازرو بەرچاو تەنها دەست بە دەست نەبێ.

هەروەها ئیمام(مالك) فەرموویەتی: (وَلَوْ أَنَّ النَّاسَ أَجَازُوا بَيْنَهُمُ الْجُلُودَ حَتَّى يَكُونَ لَهَا سِكَّةٌ وعَيْنٌ، لَكَرِهْتُهَا أَنْ تُبَاعَ بالذَّهَبِ والْوَرِقِ نَظِرَةً) ئەگەر خەڵك لە نێوان خۆیاندا پێستە بکەنە پارەیەکی وەها: کە سیکەیەکی‌دیارکراوی هەبێ، ناپەسندی دەکەم -واتە: حەرامە- بە زێڕو زیو بفرۆشرێ بە قەرز. بڕوانە (المُدَوَّنةالكُبْرى: باب الصرف).

چوارەم: لە باسی ڕیبادا پیشەو زێدەیی‌نرخ ڕەچاو ناکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، کەوابو: ئەگەر لە وولاتێکدا دوو پارەی باش‌و خراپ هەبون‌و خراپەکەش نرخی کەمتر بوو، هەر دەبی بە هاوونەیی بە یەکتری بگۆڕدرێنەوە، واتە: ئەگەر لە گۆڕینەوەدا خراپەکە زیاتر بدرێ، دەبێتە (رِباالفَضْل)، هەروەك لە (إحياءالعلوم)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەگەر کەسێك پێویستی بە گۆڕینەوەی یەکێك لەو دوو پارەیە هەبو-بۆ ڕزگاربوون لە ڕیبا- پێویستە یەکێك لەو دوو پارەیە بە پارەی وولاتێکی‌تر بگۆڕێتەوە، ئینجا پارەی وولاتەکەش بەو پارەیە بگۆڕێتەوە: کە پێویستیەتی، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەوها ڕێگای بۆ داناوین؟ بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ جاءَ بِلالٌ بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ فَقالَ لَهُ النَّبِيُّﷺ: مِنْ أَيْنَ هَذَا؟ فَقالَ بِلالٌ: تَمْرٌ كانَ عِنْدَنا رَدِيءٌ فَبِعْتُ مِنْهُ صاعَيْنِ بِصاعٍ لِمَطْعَمِ النَّبِيِّﷺ. فَقالَ النَّبِيُّﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: أَوَّهْ عَيْنُ الرِّبا، لاتَفْعَلْ وَلَكِنْ إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ التَّمْرَ فَبِعْهُ بِبَيْعٍ آخَرَ ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ﴾ رواه مسلم، وزاد في حديث آخر: ﴿قالَ أَبُوسَعِيد: فالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ أَحَقُّ أَنْ يَكُونَ رِباً أَمِ الْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ؟﴾. (بلال) هەندێ قەسپی باشی هێناو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم قەسپە لە کوێوە هاتوە؟ (بلال) فەرمووی: هەندێ قەسپی خراپمان هەبو، منیش دوو ساعی خراپەکەم فرۆشت بە ساعێکی باشەکە بۆ خۆراکی پێغەمبەرﷺ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئای ئەوە خودی ڕیبایە، وا مەکە، بەڵام ئەگەر ویستت قەسپی باش بکڕی، ئەوە خراپەکە بە شتێکی‌تر بفرۆشە، ئینجا بەو شتەش باشەکە بکڕە. جا (أبوسعيد) فەرمووی: ئایا قەسپ بە قەسپ شیاوترە ببێتە ڕیبا، یان زیو بە زیو؟.

واتە: چونکە قەسپ ڕیبادارە، پارەش ڕیبادارە، بۆیە (أبوسعيد) پارەی (قیاس) کردە سەر قەسپ، هەروەك لە (طِلْبَةُالطَّلَبَة)دا ڕوون کراوەتەوە.

پێنجەم: نرخی پیشە-لە باسی ڕیبادا- هیچ کار لە ڕیبا ناکا، کەوابو: ئەگەر بە چەند دینارێکی زێڕ هەندێ خشڵی زێڕ بکڕێ-کە بە هۆی کردنە خشڵ- نرخی لە زێڕەکەی‌تر زیاتر بوو، ئەوە دەبی-لە کێشاندا- بە ئەندازەی یەکتری بن‌و هیچ نرخی پیشە ڕەچاو

وَلَوْ باعَ جِزافاً تَخْمِيناً لَمْ يَصِحَّ وَإِنْ خَرَجا سَواءً، وَتُعْتَبَرُ الْمُماثَلَةُ وَقْتَ الْجَفافِ، وَقَدْ يُعْتَبَرُ الْكَمالُ أَوَّلاً،

---

نەکرێ، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزادَ﴾ی ڕابردوو.

کەوابو: ئەگەر زێڕینگرەکە بڵێ: لە بەرامبەر کرێیکارەکەم- دەستحەقیخۆم شتێك زیاد وەردەگرم، ئەوە حەرامەو دەبێتە ڕیبا ﴿عَنْ أَبِي رافِعٍ: سَأَلْتُ عُمَرَ ﷺ عَنِ الْمَصُوغِ أَصُوغُهُ وَأَبِيعُهُ؟ قالَ: وَزْناً بِوَزْنٍ، قُلْتُ: إِنِّي أَبِيعُهُ وَزْناً بِوَزْنٍ وَلَكِنْ آخُذُ أَجْرَ عَمَلِي، قالَ إِنَّما عَمَلُكَ لِنَفْسِكَ فَلا تَزْدَدْ شَيْئاً...﴾ رواه الإمام النسفي في طِلْبَةِالطَّلَبَةِ، پرسیارم لە ئیمامی(عمر) کرد: من زێڕ، یان زیو دەکەمە خشڵ، خشڵەکەش دەفرۆشم؟ فەرمووی: کێش بە کێش -خشڵەکە- بە ڕەگەزی خۆی بفرۆشە. گوتم: کێش بە کێش دەیفرۆشم، بەڵام کرێی کارەکەی خۆم وەردەگرم؟ فەرمووی: کارەکەی خۆت بۆ خۆتە، هیچ شتێك زیاد وەرمەگرە. کەوابو: چارە ئەمەیە: خشڵەکەی بە ڕەگەزێکیتر بفرۆشێتە خاوەن زێڕەکەو زێڕەکەشی بە ڕەگەزێکیتر لێبکڕێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی قەسپە باشەکەیڕابردوو.

(وَلَوْ باعَ جِزافاً) ئەگەر لە گوترە: خواردەمەنی، یان زێڕ، یان زیو، یان پارەی فرۆشت: هەر یەکەیان بە ڕەگەزی خۆی (تَخْمِيناً) یەکسانیەکەشی خەملاند، واتە: بە بۆچوونی خۆی داینا: ئەمەیان بە ئەندازەی ئەویترە (لَمْ يَصِحَّ) ئەم جۆرە فرۆشتنە دروست نیە (وَإِنْ خَرَجا سَواءً) هەرچەندەش هەردوو لا بە یەکسانی دەربچن، چونکە لە کاتی مامڵەت بەستندا یەکسانیەکە نەزانراوە، بەڵام ئەگەر فرۆشتنەکەیان بە ڕەگەزیخۆیان نەبو، بەڵکو هەر یەکەیان بە ڕەگەزێکیتری جیاواز فرۆشرا: وەك گەنم بە جۆ، یان زێڕ بە زیو، یان بە پارە ئەو کاتە دروستە لە گوترە بفرۆشرێن، چونکە لەو حاڵەتەدا یەکسانی مەرج نیە، بەڵکو دەست بەدەستی مەرجە، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

ئینجا بزانە: مەبەست بە هاوێنەیی خواردەمەنیەکان ئەمەیە: لە حاڵەتێکی تەواوی وەهادا هەردووکیان هاوێنەی یەکتر بن: کە بگونجێن پاشەکەوت بکرێن، یان زۆربەی سودەکانیان لێوەربگیرێن، کەوابو: (وَتُعْتَبَرُالْمُماثَلَةُ وَقْتَ الْجَفافِ) هاوێنەیی هەردوو خواردەمەنیەکان لە کاتی ووشکیدا ڕەچاو دەکرێ، چونکە لەو کاتەدا تەواونو کەڵکی پاشەکەوتکردنیان هەیە.

هەروەها (وَقَدْ يُعْتَبَرُالْكَمالُ أَوَّلاً) هەندێ جاریش تەواویی خواردەمەنیەکان لە حاڵەتی سەرەتاییدا ڕەچاو دەکرێ، هەرچەندەش نەگەنە حاڵەتی پاشەکەوتکردن: وەك ئاویترێو

فَلاَ يُباعُ رُطَبٌ بِرُطَبٍ وَلاَ بِتَمرٍ، وَلاَ عنَبٌ بِعنَبٍ وَلاَ بِزَبِيبٍ، وَما لاَ جَفافَ لَهُ كَالْقِثّاءِ وَالْعِنَبِ الَّذِى لاَ يَتَزَبَّبُ لاَ يُباعُ أَصْلاً، وَفِي قَوْلٍ تَكْفِي مُماثَلَتُهُ رَطْباً، وَلاَ تَكْفِي مُماثَلَةُ الدَّقِيقِ وَالسَّوِيقِ وَالْخُبْزِ، بَلْ تُعْتَبَرُ الْمُماثَلَةُ فِي الْحُبُوبِ حَبّاً،

---

شیری تازە دۆشراو و تەڕەقەسپی مەسەلەی (بَيْعُ العَرايا): کە لە باسی فرۆشتنی میوەدا ڕوون کراوەتەوە، واتە: لەو حاڵەتەدا دروستە ئەوانە بە ڕەگەزی خۆیان بە هاوێنەیی بفرۆشرێنو نایەوێ ترێ بکرێتە مێوژ، یان شیرەکە بکرێتە ماست، یان تەڕەکە ببێتە قەسپ، چونکە هەر لە حاڵەتی سەرەتاییدا زۆریەی سودەکانیان لێوەردەگیرێ.

ئینجا لە بەر ئەوەی هاوێنەیی لە کاتی ووشکیدا ڕەچاو دەکرێ (فَلاَ يُباعُ رُطَبٌ بِرُطَبٍ) دروست نیە: تەڕەقەسپ بفرۆشرێ بە تەڕەقەسپ، هەم (وَلاَ بِتَمْرٍ) دروست نیە: تەڕە قەسپ بفرۆشرێ بە قەسپیووشك، هەروەها (وَلاَ عِنَبٌ بِعِنَبٍ) دروست نیە: ترێ بفرۆشرێ بە ترێ، هەم (وَلاَ بِزَبِيبٍ) دروست نیە: ترێ بفرۆشرێ بە مێوژ، هەروەها دروست نیە: هەنجیریتەڕ بفرۆشرێ بە هەنجیریتەڕ، یان ووشك، هەم درست نیە گۆشتیتەڕ بفرۆشرێ بە گۆشتیتەڕ چونکە نازانین لە کاتیووشکیدا-ئەوانە- دەبنە هاوێنەی یەکتر، یان نا:

﴿عَنْ سَعْدٍ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شِراءِ الرُّطَبِ بِالتَّمْرِ؟ فَقالَ: أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذا يَبِسَ؟ قالُوا: نَعَمْ. فَنَهَى عَنْ ذَالِكَ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، دەربارەی کڕینو فرۆشتنی تەڕەقەسپ بە قەسپ، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا؟ ئەویش فەرمووی: ئایا هەر کاتێك تەڕەقەسپ ووشك کراوە، کەم دەبێتەوە؟ گوتیان: بەڵێ. جا پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد: تەڕەقەسپ بفرۆشرێ بە قەسپ.

(وَمـا لاَجَفـافَ لَـهُ) ئەو جۆرە خواردەمەنیەی حاڵەتیووشکی ی نیە: (كَالْقِثّاءِ) وەك: تەرۆزیو خیار، هەم (وَالْعِنَبِ الَّذِى لاَيَتَزَبَّبُ) ئەو ترێیەی نابێتە مێوژ (لاَ يُباعُ أَصْلاً) ئەوە بە هیچ جۆرێك نافرۆشرێ بە ڕەگەزی خۆی.

(وَفِيقَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (تَكْفِي مُماثَلَتُهُ رَطْباً) هاوێنەیی لە حاڵەتی تەڕیدا بەسە، کەواتە: ئەو جۆرە دروستە بە کێشان بە یەکتری بفرۆشرێن.

(وَلاَتَكْفِي) بەس نیە (مُماثَلَةُالدَّقِيقِ) هاوێنەیی ئاردو (وَالسَّوِيقِ) ئاردی جۆ و (وَالْخُبْزِ) نانو هەر شتێکیتری بنچینەکەی دەنك بێ (بَلْ تُعْتَبَرُالْمُماثَلَةُ فِيالْحُبُوبِ حَبّاً) بەڵکو ڕەچاو دەکرێ هاوێنەیی دەنکەکانیان لە حاڵەتی دەنکی ڕەقدا، چونکە ئەمەیان حاڵەتێکی تەواوە.

کەوابو: دروست نیە ئارد بە ئارد بفرۆشرێ، ساوار بە ساوار بفرۆشرێ، ئارد بە گەنم بفرۆشرێ، چونکە نازاندرێ دەنکەکانیان یەکسانن، یان نا.

وَفِي حُبُوبِ الدُّهْنِ كَالسِّمْسِمِ حَبّاً أَوْ دُهْناً، وَفِي الْعِنَبِ زَبِيباً أَوْ خَلَّ عِنَبٍ، وَكَذَا الْعَصِيرُ فِي الأَصَحِّ، وَفِي اللَّبَنِ لَبَناً أَوْ سَمْناً أَوْ مَخِيضاً صافِياً، وَلاَ تَكْفِي الْمُماثَلَةُ فِي سائِرِ أَحْوالِهِ كَالْجُبْنِ وَالأَقِطِ، وَلاَ تَكْفِي مُماثَلَةُ ما أَثَّرَتْ فِيهِ النَّارُ بِالطَّبْخِ أَوِ الْقَلْيِ أَوِ الشَّيِّ،

---

﴿ **ئاگاداری** ﴾: له مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا دروستە: نان بفرۆشرێ بە ئارد، هەم بە گەنم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمام (أبوحنیفة) بە خۆی دەفەرموێ: ئەو مامڵەتەی نان بە ئارد خێرو چاکەی تێدا نیە. هەروەك لە کتێبەکانی خۆیاندا فەرموویانە.

(وَفِي حُبُوبِ الدُّهْنِ) هاووێنەیی ڕەچاو دەکرێ لەو دەنکانەی ڕونیان لێوەردەگیرێ: (كَالسِّمْسِمِ) وەکو کونجی‌و گوڵە بەڕۆژەو زوڕات...هتد (حَبّاً أَوْ دُهْناً) یان لە حاڵەتی دەنکایەتی‌دا، یان لە حاڵەتی ڕونی‌دا (وَفِي الْعِنَبِ) هاووێنەیی لە ترێدا ڕەچاو دەکرێ (زَبِيباً) لە حاڵەتی‌مێوژی‌دا (أَوْ خَلَّ عِنَبٍ) یان لە حاڵەتی‌سرکەیی‌دا (وَكَذَا الْعَصِيرُ) هەروەها ئاوی ترێ‌و ئاوی قەسپ‌و ئاوی هەنارو گشت میوەیەکی‌تر، لە حاڵەتی‌گوشراوی‌دا هاووێنەیی تێدا ڕەچاو دەکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

(وَفِي اللَّبَنِ) هاووێنەیی ڕەچاو دەکرێ لە شیردا (لَبَناً) لە حاڵەتی بوونە ماست (أَوْ سَمْناً) یان ڕون (أَوْ مَخِيضاً) یان دۆ (صافِياً) بەو مەرجەی ماست‌و ڕون‌و دۆیەکە: ئاویان تێکەڵ نەکرابێ، چونکە ئەگەر ئاویان تێکەڵ کرابێ، دروست نیە بە یەکتری بفرۆشرێن، هەم بەو مەرجەش بە ئاگر نەکوڵێندرابن.

(وَلاَ تَكْفِي الْمُماثَلَةُ فِي سائِرِ أَحْوالِهِ) هاووێنەیی بەس نیە لە حاڵەتەکانی‌تری شیردا: (كَالْجُبْنِ) وەك پەنیر بە پەنیر، چونکە فرێشکی تێکەڵ بوە، هەم (وَالأَقِطِ) وەکو کەشك بە کەشك، چونکە خوێی تێکەڵ بوە، واتە: ئەو دووانە ڕێبای دوو قوڵییان تێدایە، هەروەك لە دوای ئێرە ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَلاَ تَكْفِي) بەس نیە (مُماثَلَةُ ما أَثَّرَتْ فِيهِ النَّارُ) هاووێنەیی ئەو خواردەمەنیەی ئاگر کاری تێکردوە (بِالطَّبْخِ) بە کوڵاندن (أَوِ الْقَلْيِ) یان بە سوورکردنەوە (أَوِ الشَّيِّ) یان بە برژاندن، واتە: هەر خواردنێك ئاگر کاری تێکردبێ، دروست نیە بە ڕەگەزی‌خۆی بفرۆشرێ، چونکە گشت کارتێکردنێك وەك یەکتر نیەو هاوێنەیی نازاندرێ.

هەروەها: هەر شتێك لە دوو جۆرە خواردەمەنی، یان لە زیاتر دروست کرابێ، دروست نیە بە شتێکی وەها بفرۆشرێ: کە هەمان ڕەگەزی‌خواردەمەنیەکەی تێدا بێ:

بۆ وێنە: دروست نیە پاقلاوە، یان لوقم بفرۆشرێن بە پاقلاوە، یان بە لوقم، یان تەنها بە ئارد بفرۆشرێن، یان تەنها بە شەکر بفرۆشرێن، چونکە ئاگر کاری تێ‌کردون، هەم –وەك پەنیرو کەشك– ڕیبای دوو قوڵیان تێدایە.

وَلاَ يَضُرُّ تَأْثِيرُ تَمْيِيزٍ كَالْعَسَلِ وَالسَّمْنِ، وَإِذَا جَمَعَتِ الصَّفْقَةُ رِبَوِيّاً مِنَ الْجانِبَيْنِ وَاخْتَلَفَ الْجِنسُ مِنْهُما: كَمُدٍّ عَجْوَةٍ وَدِرْهَمٍ بِمُدٍّ وَدِرْهَمٍ، وَكَمُدٍّ وَدِرْهَمٍ بِمُدَّيْنِ أَوْ دِرْهَمَيْنِ، أَوِالنَّوْعُ: كَصِحاحٍ وَمُكَسَّرَةٍ بِهِما أَوْ بِأَحَدِهِما فَباطِلَةٌ،

---

(وَلاَ يَضُرُّ تَأْثِيرُتَمْيِيزٍ) زەرەر نادا: كارتێكردنی لێك جیاكردنەوە (كَالْعَسَلِ) وەك كارتێكردنی هەنگوینو (وَالسَّمْنِ) ڕونی ئاژەڵ، كەواتە: هەر یەكێك لەوانە دروستە بە ڕەگەزی خۆیان بفرۆشرێن.

## ﴿ ڕیبای دوو قۆڵی ﴾

(وَإِذَا جَمَعَتِ الصَّفْقَةُ) هەر كاتێك بەستنی یەك مامڵەت كۆی كردەوە (رِبَوِيّاً مِنَ الْجانِبَيْنِ) ڕەگەزێكی ڕیبادار لە هەردوو لای مامڵەتەكەوە (وَاخْتَلَفَ الْجِنْسُ) ڕەگەزیفرۆشراوەكانیش لێك جیا بون (مِنْهُما) لە هەردوو لایەكەیان، یان لە یەكێكیان (كَمُدٍّعَجْوَةٍ وَدِرْهَمٍ) وەك مستێك قەسپو یەك دیرهەم بفرۆشرێن (بِمُدٍّ وَدِرْهَمٍ) بە مستێكیقەسپو یەك دیرهەم (وَ) هەروەها (كَمُدٍّ وَدِرْهَمٍ) وەك مستێكیقەسپو یەك دیرهەم بفرۆشرێن (بِمُدَّيْنِ) تەنها بە دوو مستەقەسپ (أَوْ دِرْهَمَيْنِ) یان تەنها بە دوو دیرهەم (أَوِالنَّوْعُ) یان جۆری ڕیبادارەكان لێك جیاواز بون (كَصِحاحٍ وَمُكَسَّرَةٍ) وەك زێڕی وردەو درشتە، یان زیوی وردەو درشتە، یان پارەی وردەو درشتە وێكڕا بفرۆشرێن (بِهِما) بە وردەو درشتەی وێكڕا (أَوْ بِأَحَدِهِما) یان تەنها بە وردە، یان تەنها بە درشتە، یان پارەی باشو خراپ وێكرا بفرۆشرێ، بە پارەی باشو خراپی وێكڕا، یان تەنها بە باشەكە، یان تەنها بە خراپەكە، لەو حاڵەتانەشدا نرخی وردەو درشتەو نرخی باشو خراپ لێك جیاواز بو، ئەوە (فَباطِلَةٌ) ئەو جۆرە مامڵەتە-لەو هەموو مەسەلانەدا- بەتاڵەو دروست نیە، چونكە لە كاتی مامڵەت بەستندا نەزاندراوە: ئایا نرخی ئەم لایە-بە یەكسانی- بە سەر ئەو لادا بەشكراوە، یان نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانەو بەڵگەیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە:

﴿عَنْ فضالَةَﷺ: إشْتَرَيْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ قِلادَةً بِاثْنَيْعَشَرَ ديناراً فِيها ذَهَبٌ وَخَرَزٌ، فَفَصَلْتُها فَوَجَدْتُ فِيها أَكْثَرَ مِنْ اثْنَيْعَشَرَ دِيناراً، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّﷺ؟ فَقالَ: لاَ تُباعُ حَتَّى تُفْصَلَ﴾ رواه مسلم، لە كاتی غەزای (خەیبەر) ملوانكەیەكم كڕی بە دوانزە دیناری زێڕ، ملوانكەكەش زێڕو مۆرەی تێدا بوو، ئینجا لێكم جیا كردەوەو دیتم لە كێشی دوانزە دینار زۆرتر زێڕی تێدایە، جا ئەمەم بۆ پێغەمبەرﷺباس كرد، ئەویش فەرمووی: نابێ ئەو ملوانكەیە بفرۆشرێ تا لێك جیا دەكرێتەوە.

كەوابو: ئەگەر مامڵەتەكە بكرێتە دوو بەش: وەك بڵێ: مستەكە لە بەرامبەر مستەكە بێو دیرهەمەكەش لە بەرامبەر دیرهەمەكە بێ، ئەو كاتە دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی

وَيَحْرُمُ بَيْعُ اللَّحْمِ بِالْحَيْوانِ مِنْ جِنْسِهِ، وَكَذَا بِغَيْرِ جِنْسِهِ مِنْ مَأْكُولٍ وَغَيْرِهِ فِي الأَظْهَر.

(بابٌ)

نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ: وَهُوَ ضِرابُهُ وَيُقالُ ماؤُهُ وَيُقالُ أُجْرَةُ ضِرابِهِ،

---

سەرچاوەکاندا فەرموویانە. هەروەها: ئەگەر نرخی وردەکەو درشتەکەو نرخی باش‌و خراپەکە یەکسان بون، ئەو کاتەش دروستە: ئەم لایە بەو لایە بفرۆشرێ، هەروەك لە (الشبراملسی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَحْرُمُ) حەرامەو دروست نیە (بَيْعُ اللَّحْمِ بِالْحَيْوانِ) گۆشت بفرۆشرێ بە ئاژەڵی‌زیندوو (مِنْ جِنْسِهِ) جا گۆشتەکە لە ڕەگەزی‌ئاژەڵەکە بێ: وەك گۆشتی‌مەڕ بە مەڕ (وكَذا بِغَيْرِ جِنْسِهِ) هەروەها دروست نیە ئەگەر لە ڕەگەزی‌ئاژەڵەکەش نەبێ: وەك گۆشتی‌مەڕ بە مانگا (مِنْ مأْكُولٍ) جا ئاژەڵەکە لە ڕەگەزی گۆشت حەڵاڵەکان بێ: وەك باسمان کرد (وَغَيْرِهِ) یان لە گۆشت حەرامەکان بێ: وەك گۆشتی‌مەڕ بفرۆشرێ بە کەرو هێستر (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا ﴿عَنْ سَعِيد بِن الْمُسَيَّب ﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَنْ بَيْعِ اللَّحْمِ بِالْحَيْوانِ﴾ رواه أبوداود، ورفعه الحاكم والبيهقي بسند صحيح بلفظ: ﴿نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الشَّاةِ بِاللَّحْمِ﴾ پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: مەڕ بفرۆشرێ بە گۆشت.

## ﴿ بابٌ: لە باسی مامڵەتەکانی قەدەغەکراو ﴾

**پێشەکی** بزانە: مامڵەتەکانی قەدەغەکراو دوو جۆرن، یەکەمیان: مامڵەتی دانەمەزراوی حەرام: کە ڕوکنێك، یان مەرجێکی ناتەواو بێ، یان مەرجێکی ناتەواوی تێدا بێ، ئەم مامڵەتە بەتاڵەو ناتەواوە، واتە: فرۆشراوەکە نابێتە ملکی کڕیارەکەو پارەکەش نابێتە ملکی فرۆشیارەکە، هەم کردنی‌مامڵەتەکەش حەرامەو مامڵەتچیەکانیش گوناهبار دەبن: وەك ئەو مامڵەتانەی لەم باسەدا ڕوون کراونەوەو چەندی‌تریش.

دووەمیان: مامڵەتی دامەزراوی‌حەرام: کە گشت ڕوکن‌و مەرجەکانی تەواو بن، بەڵام لە بەر هۆیەکی‌دەرەوەیی قەدەغە کرابێ، واتە: مامڵەتەکە دادەمەزرێ‌و تەواوە، بەڵام کردنی مامڵەتەکە حەرامەو مامڵەتچیەکەش گوناهبار دەبێ: وەك ئەو مامڵەتانەی کە لە باسەکەی دوای‌ئێرەدا ڕوون کراونەوەو چەندی‌تریش.

دەربارەی جۆری یەکەمیان دەفەرموێ: ﴿نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە پەڕینی نێرەی‌ئاژەڵ بفرۆشرێ. (وَهُوَ) پەڕینی نێرە (ضِرابُهُ) ئەوەیە نێرەکە بپەڕێندرێتە سەر ئاژەڵە مێیەکە تاکو ئاوسی بکا (وَيُقالُ ماؤُهُ) هەم دەگوترێ: مەبەست ئاوی-تۆی نێرەکەیە (وَيُقالُ) دەشگوترێ (أُجْرَةُ ضِرابِهِ) مەبەست کرێی پەڕاندنی نێرەکەیە.

فَيحْرُمُ ثمنُ مائه وكَذا أُجرَتُهُ فِى الأَصحِّ، وَعَنْ حَبَلِ الْحَبَلَة: وَهُوَ نَتاجُ النّتاجِ بِأَنْ يَبِيعَ نَتاجَ النّتاجِ أَوْ بثمنٍ إِلَى نَتاجِ النّتاجِ، وَعَنِ الْمَلاقِيحِ: وَهِىَ ما فِى الْبُطُون، وَالْمَضامِين: وَهِىَ مافِى أَصْلابِ الْفُحُولِ، وَالْمُلامَسَة: بِأَنْ يَلْمَسَ ثوْباً مَطْوِيّاً ثُمَّ يَشْتَرِيَهُ عَلَى أَنْ لاخِيارَ لَهُ إِذا رَآهُ، أَوْ يَقُولَ إِذَا لَمَسْتَهُ فَقَدْ بِعْتُكَهُ، وَالْمُنابَذَة: بِأَنْ يَجْعَلا النَّبْذَ بَيْعاً، وَبَيْعِ الْحَصاةِ: بِأَنْ يَقُولَ لَهُ بِعتُكَ مِنْ هَذه الأَثْوابِ ما تَقَعُ هَذه الْحَصاةُ عَلَيْه

---

کەوابو: (فَيَحْرُمُ ثَمَنُ مائِه) حەرامە پارەی ئاوی نێرەکە وەربگیرێ (وكَذا أُجرَتُهُ) هەروەها: حەرامە نێرەکەش بۆ پەڕاندن بە کرێ بدا (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.
کەوابو: وەها سوننەتە: نێرەکەی بە خواستن بداتە خاوەن ئاژەڵەکە، تاکو -بە خۆڕایی- بیپەڕێنێتە سەر ئاژەڵە مێیەکانی، ئینجا دروستە: ئەویش شتێك بە دیاری بداتە خاوەنی نێرەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
﴿وَعَنْ حَبَلِ الْحَبَلَة﴾ رواه‌الشيخان، هەروەها پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە بەرهەمی بەرهەمەکان بفرۆشرێ. (وَهُوَ نَتاجُ النِّتاجِ) ئەوەش مەبەست بێچووی بێچووێکی‌نەبووە (بِأَنْ يَبِيعَ نَتاجَ النِّتاجِ) وەك بێچووی بێچووێکی وەها بفرۆشێ: کە هێشتا بەخۆیشی لە دایك نەبوبێ (أَوْ بِثَمَنٍ) یان شتێك بە پارەیەکی قەرز بفرۆشێ (إِلَى نَتاجِ النِّتاجِ) تا بێچووی بێچووە نەبووەکە لە دایك ئەبێ، ئینجا پارە قەرزەکە بدا.
﴿وَعَنِ الْمَلاقِيحِ وَهِيَ ما فِى الْبُطُونِ﴾ هەروەها پێغەمبەرﷺقەدەغەی کردوە: کۆرپەی ناو زگی ئاژەڵ بفرۆشرێ، هەم ﴿وَالْمَضامِينِ وَهِيَ ما فِى أَصْلابِ الْفُحُولِ﴾ رواهما مالك وعبدالرزاق بإسناد قوی، پێغەمبەرﷺقەدەغەی کردوە ئاوی=تۆوی ئاژەڵە نێرەکان -کە هێشتا هەر لە پشتی نێرەکەدایە- بفرۆشرێ.
﴿وَالْمُلامَسَةِ﴾ رواه الشيخان، هەروەها قەدەغەی کردوە: فرۆشتنی دەست لێدان. (بِأَنْ يَلْمَسَ ثَوْباًمَطْوِيّاً) وەك دەست لە جلێکی‌پێچراو بداو (ثُمَّ يَشْتَرِيَهُ) ئینجا بیکڕێ (عَلَى أَنْ لاخِيارَ لَهُ) بەو مەرجەی پەشیمانبوونەوەی نەبێ (إِذا رَآهُ) کاتێ جلەکەی دیت (أَوْ يَقُولَ) یان بڵێ: (إِذَا لَمَسْتَهُ) هەر کاتێك دەستت لەم شتەدا (فَقَدْ بِعْتُكَهُ) ئەوە فرۆشتمە تۆ. واتە: دەست لێدانەکەی بکاتە فرۆشتن.
﴿وَالْمُنابَذَةِ﴾ رواه الشيخان، هەروەها پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: فرۆشتنی بە فڕێدان. (بِأَنْ يَجْعَلا النَّبْذَ بَيْعاً) وەك فڕێدانی شتەکە بکەنە فرۆشتن‌و بڵێ: هەر کاتێك بۆم فڕێدای ئەوە فرۆشتمە تۆ.
﴿وَبَيْعِ الْحَصاةِ﴾ رواه مسلم، هەروەها قەدەغەی کردوە: فرۆشتنی وردە بەرد. (بِأَنْ يَقُولَ لَهُ) وەك پێی بڵێ: (بِعْتُكَ مِنْ هَذِهِ الأَثْوابِ ما تَقَعُ هَذِهِ الْحَصاةُ عَلَيْهِ) لەم جلانە هەر

أَوْ يَجْعَلاَ الرَّمْيَ بَيْعاً، أَوْ بِعْتُكَ وَلَكَ الْخِيارُ إِلَىٰرَمْيِهَا، وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَة: بِـأَنْ يَقُـولَ بِعْتُكَ بِأَلْف نَقْداً أَوْ أَلْفَيْنِ إِلَىٰسَنَة، أَوْ بِعْتُكَ ذَاالْعَبْدَ بِأَلْف عَلَىٰأَنْ تَبِيعَنِـي دَارَكَ بِكَـذَا، وَعَنْ بَيْعٍ وَشَرْط: كَبَيْعٍ بِشَرْط بَيْعٍ أَوْ قَرْضٍ، وَلَواشْتَرَى زَرْعـاً بِشَـرْط أَنْ يَحْصُـدَهُ الْبائِعُ، أَوْ ثَوْباً وَيَخِيطَهُ فَالأَصَحُّ بُطْلاَنُهُ،

---

كاميان ئەم بەردەی كەوتە سەر ئەوم فرۆشتە تۆ (أَوْ يَجْعَلاَ الرَّمْيَ بَيْعـاً) يـان هاويشتنی بەردەكە بكەنە فرۆشتن‌و بڵێ: هەر كاتێك بەردەكەم هاويشت ئـەم شـتەم فرۆشـتە تـۆ (أَوْ بِعْتُكَ) يـان بڵـێ: فرۆشـتمە تـۆ (وَلَـكَ الْخِيـارُ إِلَىٰرَمْيِهَـا) مـاف پەشـيمانبوونەوەت هـەبێ تـا بەردەكە دەهاوێم.

﴿وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَة﴾ صـححه‌الترمـذی، هـەروەها پێغەمبـەرﷺ قەدەغـەی كـردوە: دوو فرۆشتن لە يەك فرۆشتندا بكرێ. (بِأَنْ يَقُولَ) وەك بڵێ: (بِعْتُكَ بِأَلْفٍ نَقْداً أَوْ أَلْفَيْنِ إِلَىٰسَنَةٍ) فرۆشتمە تۆ بە هەزار ديناری حازر، يـان بـە دوو هـەزاری قـەرز تـا سـاڵێك. ئينجـا يەكسـەر شتەكە بباو هيچ لايەك دياری نەكاو نەزاندرێ بە قەرزی بردوە، يان بە حازر.

بەڵام ئەگەر لايەك دياری بكاو بزاندرێ بە قەرزی بردوە، يان بـە حـازری بـردوە، وەك بڵـێ: ئەم شتە بە حازر بە ديناريكە، بە قەرز بـە دوو دينـارە. كڕيارەكـەش بڵـێ: ئـەوە بـە قـەرز لێتم كڕی بە دوو دينار. ئەوە دروستە، چونكە بە هۆی ئەو دياریكردنـە، نـەزانين لاچـووە، هەروەك لە (سنن الترمذی)و (حاشية إبن قاسم)دا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ فرۆشتنی بە مەرج ﴾

(أَوْ) يان بڵێ: (بِعْتُكَ ذَاالْعَبْدَ بِأَلْفٍ عَلَى أَنْ تَبِيعَنِي دَارَكَ بِكَذَا) ئەم كۆيلەيەم فرۆشـتە تـۆ بـە هـەزار دينـار، بـەو مەرجـەی خانووەكـەتم پـێ بفرۆشـی بەوەنـدە. ئەمـەش دروسـت نيـە، هەروەك دەفەرموێ: ﴿وَعَنْ بَيْعٍ وَشَرْطٍ﴾ رواه الحاكم وعبدالحق وآخرون وصححه بعضهم، پێغەمبەرﷺ قەدەغـەی كـردوە: فرۆشـتن‌و مـەرج وێكـڕا بكـرێن. (كَبَيْـعٍ بِشَـرْطِ بَيْـعٍ) وەك شتێكی پێ بفرۆشێ بەو مەرجەی ئەويش شـتێكی پـێ بفرۆشـێ: وەكـو نموونەكـەیڕابردوو (أَوْ قَرْضٍ) يان شتێكی پێ بفرۆشـێ بـەو مەرجـەی ئـەويش سـەد دينـاری بـە قـەرز بـداتێ، ئەمەش دروست نيە.

(وَلَواشْـتَرَى زَرْعـاً) ئەگـەر كشـتوكاڵێكی كـڕی (بِشَـرْطِ أَنْ يَحْصُـدَهُ الْبـائِعُ) بـەو مەرجـەی فرۆشيارەكە بيدروێتەوە (أَوْ ثَوْباً وَيَخِيطَـهُ) يـان جلێكـی كـڕی بـەو مەرجـەی فرۆشـيارەكە بيـدورێ (فَالأَصَـحُّ بُطْلاَنُـهُ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر: كڕينەكـە دروسـت نيـەو بەتاڵـە لـە هەردوو مەسەلەكەدا، بەڵام بە فەرموودەی بێهێز: كڕينەكە دروستەو مەرجەكـەش دەبێتـە بەكرێگرتن، هەروەك لە (نهايـة)و (مغنـی)دا ڕوون كراوەتـەوە، واتـە: بەشـێكی نرخەكـە لـە بەرامبەر كرێيەكە دادەندرێ، هەروەك لە (شرح المَحلِی)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَيُسْتَثْنَى صُوَرٌ: كَالْبَيْعِ بِشَرْطِ الْخِيارِ أَوالْبَراءَةِ مِنَ الْعَيْبِ أَوْ بِشَرْطِ قَطْعِ الثَّمَرِ أَوالأَجَلِ وَالرَّهْنِ وَالْكَفِيلِ الْمُعَيَّناتِ لِثَمَنٍ فِي الذِّمَّةِ، وَالإِشْهادِ وَلاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ الشُّهُودِ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ لَمْ يَرْهَنْ أَوْ لَمْ يَتَكَفَّلِ الْمُعَيَّنُ فَلِلْبائِعِ الْخِيارُ، وَلَوْ باعَ عَبْداً بِشَرْطِ إِعْتاقِهِ فَالْمَشْهُورُ صِحَّةُ الْبَيْعِ وَالشَّرْطِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ لِلْبائِعِ مُطالَبَةَ الْمُشْتَرِي بِالإِعْتاقِ، وَأَنَّهُ لَوْ شَرَطَ مَعَ الْعِتْقِ الْوَلاءَ لَهُ أَوْ شَرَطَ تَدْبِيرَهُ أَوْ كِتابَتَهُ أَوْ إِعْتاقَهُ بَعْدَ شَهْرٍ لَمْ يَصِحَّ الْبَيْعُ،

---

(وَيُسْتَثْنَى) جیا دەکرێتەوە: لە قەدەغەکردنی فرۆشتنو مەرج (صُوَرٌ) چەند وێنەیەك: کە فرۆشتنەکەو مەرجەکەی تێیاندا دروستە (كَالْبَيْعِ بِشَرْطِ الْخِيارِ) وەك فرۆشتن بە مەرجی پەشیمانبوونەوە (أَوالْبَراءَةِ مِنَ الْعَيْبِ) یان بە مەرجی بێعەیبی (أَوْ بِشَرْطِ قَطْعِ الثَّمَرِ) یان بە مەرجی بڕینەوەی میوەی فرۆشراو بە سەر درەختەکەیەوە (أَوالأَجَلِ) یان بە مەرجی پاش ماوەیەکیتر پارەکەی بداتێ، ئەگەر فرۆشراوەکەش ڕیبای تێدا نەبێ، ئەگینا: ئەو ماوە دانانە دروست نیە، هەروەك لە ڕیبادا ڕونمان کردەوە (وَالرَّهْنِ) هەم فرۆشتنی بە مەرجی بارمتە دانانو (وَالْكَفِيلِ) بە مەرجی کەفیل دانان (الْمُعَيَّناتِ) ئەو ماوەیەو بارمتەکەو کەفیلەکە دیاریکرلو بن (لِثَمَنٍ فِي الذِّمَّةِ) بۆ پارەی فرۆشراوێك کە بە قەرز فرۆشرابێ (وَالإِشْهادِ) هەم فرۆشتنی بە مەرجی شاهید گرتن، بەلام (وَلاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ الشُّهُودِ) مەرج نیە شاهیدەکان دیاری بکرێن: کێنە؟ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: ئەو وێنانەیڕابردوو گشتی دروستن، چونکە ئەو مەرجانە گشتیان-لە قورئانو حەدیسدا- بەلگەیان لە سەرە (فَإِنْ لَمْ يَرْهَنْ) جا ئەگەر کڕیارەکە بارمتەی دانەنا (أَوْ لَمْ يَتَكَفَّلِ الْمُعَيَّنُ) یان دیارکراوەکە نەبوە کەفیل، ئەوە (فَلِلْبائِعِ الْخِيارُ) فرۆشیارەکە بۆی دروستە پەشیمان ببێتەوە مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

(وَلَوْ باعَ عَبْداً بِشَرْطِ إِعْتاقِهِ) ئەگەر کۆیلەیەکی فرۆشت بە مەرجی ئازادکردنی (فَالْمَشْهُورُ) بە فەرموودەیناسراویمەزهەب (صِحَّةُ الْبَيْعِ وَالشَّرْطِ) فرۆشتنەکەو مەرجەکە هەردووکیان دروستن، کەوابو: (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ لِلْبائِعِ) فرۆشیارەکە مافی هەیە: (مُطالَبَةَ الْمُشْتَرِي بِالإِعْتاقِ) داوا لە کڕیارەکە بکا: کۆیلەکە ئازاد بکا، جا ئەگەر ئازادی نەکرد، ئەو کاتە دادوەر-بە زۆرلێکردن- پێی ئازاد ئەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (لَوْ شَرَطَ مَعَ الْعِتْقِ) ئەگەر فرۆشیارەکە-لەگەڵ مەرجی ئازادکردن- بە مەرجی دانا (الْوَلاءَ لَهُ) خزمایەتی ئازادکردن بۆ خۆی بێ (أَوْ شَرَطَ تَدْبِيرَهُ) یان بە مەرجی دانا لە دوای مردن ئازادی بکا (أَوْ كِتابَتَهُ) یان بە پارە ئازادی بکا (أَوْ إِعْتاقَهُ بَعْدَ شَهْرٍ) یان لە دوای مانگێك ئازادی بکا (لَمْ يَصِحَّ الْبَيْعُ) لەو چوارە مەسەلانەدا فرۆشتنەکە دروست نابێ.

وَلَوْ شَرَطَ مُقْتَضَى الْعَقْدِ: كَالْقَبْضِ وَالرَّدِّ بِعَيْبٍ أَوْ مالاَ غَرَضَ فِيهِ كَشَرْطِ أَنْ لاَ يَأْكُلَ إلاَّ كَذَا صَحَّ، وَلَوْ شَرَطَ وَصْفاً يُقْصَدُ: كَكَوْنِ الْعَبْدِ كاتِباً أَوِالدَّابَّةِ حامِلاً أَوْ لَبُوناً صَحَّ، وَلَهُ الْخِيارُ إِنْ أَخْلَفَ، وَفِي قَوْلٍ يَبْطُلُ الْعَقْدُ فِي الدَّابَّةِ، وَلَوْ قالَ بِعْتُكَها وَحَمْلَها بَطَلَ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْحَمْلِ وَحْدَهُ، وَلاَالْحامِلِ دُونَهُ، وَلاَالْحامِلِ بِحُرٍّ، وَلَوْ باعَ حامِلاً مُطْلَقاً دَخَلَ الْحَمْلُ فِي الْبَيْعِ.

---

(وَلَوْ شَرَطَ مُقْتَضَى الْعَقْدِ) ئەگەر مەرجێکی وەهای دانا: کە مامڵەتەکە ئەو مەرجەی دەویا (كَالْقَبْضِ) وەك بەو مەرجەی کڕیارەکە: فرۆشراوەکە وەربگرێ، هەم (وَالرَّدِّ بِعَيْبٍ) ئەگەر عەیبی هەبو بیگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیارەکە (أَوْ مالاَغَرَضَ فِيهِ) یان مەرجێکی وەهای دانا کە هیچ مەبەستێکی تێدا نەبێ (كَشَرْطِ أَنْ لاَ يَأْكُلَ إلاَّ كَذَا) وەك بە مەرج دابنێ: فرۆشراوەکە تەنها ئەو شتە بخوا، یان ئەو جلە بکاتە بەری (صَحَّ) لەو مەسەلانەدا فرۆشتنەکە دروست دەبێو ئەو مەرجانەیڕابردوو زیانی لێنادەن.

(وَلَوْ شَرَطَ وَصْفاً يُقْصَدُ) ئەگەر بە مەرجی دانا: فرشراوەکە سیفەتێکی ویستراوی تێدا بێ: (كَكَوْنِ الْعَبْدِ كاتِباً) وەك بەو مەرجەی کۆیلە فرۆشراوەکە نووسەر بێ (أَوِ الدَّابَّةِ حامِلاً) یان بەو مەرجەی ئاژەڵە فرۆشرلوەکە ئاوس بێ (أَوْ لَبُوناً) یان شیری تێدابێ (صَحَّ) مامڵەتەکەو هەم مەرجەکەش دروستە، کەوابو: (وَلَهُ الْخِيارُ) کڕیارەکە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە (إِنْ أَخْلَفَ) ئەگەر مەرجەکە نەهاتە جێ: وەك نووسەر نەبێ، یان ئاوس نەبێ، یان شیری تێدا نەبێ (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (يَبْطُلُ الْعَقْدُ فِي الدَّابَّةِ) بە هۆی مەرجەکە مامڵەتەکە لە ئاژەڵەکەدا بەتاڵ دەبێتەوە.

بەلام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر بلێ (بِعْتُكَها وَحَمْلَها) ئاژەڵەکەو کۆرپەکەی ناو زکم فرۆشتە تۆ (بَطَلَ) فرۆشتنەکە بەتاڵەو دروست نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە شتێکی نەزاندراو -کە کۆرپەکەیە- لەگەڵی فرۆشتوە، کەوابو: (وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْحَمْلِ وَحْدَهُ) دروست نیە کۆرپەکەش -لە ناو زکدا- بە تەنها بفرۆشرێ، هەم (وَلاَالْحامِلِ دُونَهُ) دروست نیە ئاوسەکەش بە بێکۆرپەکەی ناو زکی بە تەنها بفرۆشرێ، چونکە کۆرپەی ناو زکی وەك ئەندامێکی خۆیەتیو جیا ناکرێتەوە (وَلاَالْحامِلِ بِحُرٍّ) هەروەها دروست نیە: کۆیلەیەکی ئاوسی وەها بفرۆشرێ: کە کۆرپەکەی ناو زکی ئازاد بێ.

(وَلَوْ باعَ حامِلاً) ئەگەر کۆیلەیەکی، یان ئاژەڵێکی ئاوسی فرۆشت (مُطْلَقاً) باسی کۆرپەکەی ناو زکی نەکرد، واتە: بە مەرجیشی دانەنا (دَخَلَ الْحَمْلُ فِي الْبَيْعِ) کۆرپەکەی ناو زکیشی دەچێتە ناو فرۆشتنەکەیو هەردووکیان دەبنە ملکی کڕیارەکە، بە (إجماع)ی زانایانی ئایینی، بەو مەرجەی هەردووکیان ملکیفرۆشیارەکە بن، بەلام ئەگەر دایکەکە هی یەکێك

(فَصْلٌ) وَمِنَ الْمَنْهِيِّ عَنْهُ مالاَ يُبْطِلُ لِرُجُوعِهِ إِلَى مَعْنىً يَقْتَرِنُ بِهِ: كَبَيْعِ حاضِرٍ لِبادٍ، بِأَنْ يَقْدَمَ غَرِيبٌ بِمَتاعٍ تَعُمُّ الْحاجَةُ إِلَيْهِ لِيَبِيعَهُ بِسِعْرِ يَوْمِهِ فَيَقُولُ بَلَدِيٌّ: اُتْرُكْهُ عِنْدِي لأَبِيعَهُ عَلَى التَّدْرِيجِ بِأَغْلَى، وَتَلَقِّي الرُّكْبانِ: بِأَنْ يَتَلَقَّى طائِفَةً يَحْمِلُونَ مَتاعاً إِلَى الْبَلَدِ فَيَشْتَرِيَهُ قَبْلَ قُدُومِهِمْ وَمَعْرِفَتِهِمْ بِالسِّعْرِ، وَلَهُمُ الْخِيارُ إِذا عَرَفُوا الْغَبْنَ،

---

بوو، کوڕەکەی ناو زگیشی هی یەکێکی‌تر بوو، ئەو کاتە فرۆشتنەکەی بەتاڵەو دروست نابێ، هەروەك تازە ڕابراو، لە زۆربەی سەرچاوەکانیشدا فەرموویانە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی جۆری‌دووەمینی مامڵەتەکانی‌قەدەغەکراو ﴾

واتە: ئەو مامڵەتانەی دادەمەزرێن، بەڵام لەبەر هۆیەکی‌دەرەوەیی قەدەغەکراون‌و کردنیان حەرامەو مامڵەتچیەکەش گوناهبار دەبێ، هەروەك دەفەرموێ:

(وَمِنَ الْمَنْهِيِّ عَنْهُ) هەندێك لەو مامڵەتانەی قەدەغە کراون‌و حەرامن (ما لاَ يُبْطِلُ) ئەو جۆرە مامڵەتەیە: کە قەدەغەکە فرۆشتنەکە بەتاڵ ناکا، واتە: دادەمەزرێ (لِرُجُوعِهِ) چونکە قەدەغەکە دەگەڕێتەوە (إِلَى مَعْنىً) بۆ واتەیەکی دەرەوەی‌مامڵەتەکە، بەڵام (يَقْتَرِنُ بِهِ) واتەکە لەگەڵ مامڵەتەکە وێکڕا دێنە جێ:

(كَبَيْعِ حاضِرٍ لِبادٍ) وەك فرۆشتنی نیشتەجێی‌شار بۆ نیشتەجێی دەشت‌و لادێ (بِأَنْ يَقْدَمَ غَرِيبٌ) وەك یەکێکی نامۆ لە دەرەوەی شارەوە بێتە شار (بِمَتاعٍ تَعُمُّ الْحاجَةُ إِلَيْهِ) کەلوپەلێکی وەها لەگەڵ خۆی بۆ فرۆشتن بێنێ: کە خەڵك پێویستیەتی (لِيَبِيعَهُ بِسِعْرِ يَوْمِهِ) بۆ ئەوەی بە نرخی‌ڕۆژەکەی بیفرۆشێ (فَيَقُولُ بَلَدِيٌّ) ئینجا شارستانیەك پێی بڵێ: ئەمڕۆ مەیفرۆشە، بەڵکو (اُتْرُكْهُ عِنْدِي) لە لای من بەجێی بهێڵە (لأَبِيعَهُ عَلَى التَّدْرِيجِ) تاکو بەرە بەرە بۆ تۆی بفرۆشم (بِأَغْلَى) بە نرخێکی گرانتر. ئەو جۆرە مامڵەتە حەرامە چونکە تەنگایی پەیدا دەکا، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لاَ يَبِعْ حاضِرٌ لِبادٍ﴾ رواه الشيخان، نابێ شارستانی بۆ لادێیی بفرۆشێ.

هەروەها (وَتَلَقِّي الرُّكْبانِ) وەکو خۆ گەیاندنە کاروانچیەکان (بِأَنْ يَتَلَقَّى طائِفَةً) وەك لە دەرەوەی شار بگاتە ئەو کاروانچیانەی: کە (يَحْمِلُونَ مَتاعاً إِلَى الْبَلَدِ) کەلوپەلێك ئەهێنن بۆ ناو شارەکە، یان گوندەکە (فَيَشْتَرِيَهُ) جا کەلوپەلەکەیان لێبکڕێ (قَبْلَ قُدُومِهِمْ وَمَعْرِفَتِهِمْ بِالسِّعْرِ) پێش ئەوەی بگەنە ناو شارو نرخی‌کەلوپەلەکە بزانن، ئەو جۆرە مامڵەتەش حەرامە، نەوەك زەرەر بکەن.

کەوابو: (وَلَهُمُ الْخِيارُ إِذا عَرَفُوا الْغَبْنَ) کاروانچیەکان مافی پەشیمانبوونەوەیان هەیە کاتێك زانییان زەرەریان کردوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتَلَقَّوُا الرُّكْبانَ-وَفِي رِوايَةٍ- فَإِنْ تَلَقَّاهُ إِنْسانٌ فَابْتاعَهُ فَصاحِبُ السِّلْعَةِ فِيها بِالْخِيارِ إِذَا وَرَدَ السُّوقَ﴾ رواه الشيخان، خۆتان

وَالسَّوْمِ عَلَى سَوْمِ غَيْرِهِ، وَإِنَّما يَحْرُمُ ذَلِكَ بَعْدَ إِسْتِقْرارِ الثَّمَنِ، وَالْبَيْعِ عَلَى بَيْعِ غَيْرِهِ قَبْلَ لُزُومِهِ: بِأَنْ يَأْمُرَ الْمُشْتَرِيَ بِالْفَسْخِ لِيَبِيعَهُ مِثْلَهُ، وَالشِّراءِ عَلَى الشِّراءِ: بِأَنْ يَأْمُرَ الْبائِعَ بِالْفَسْخِ لِيَشْتَرِيَهُ، وَالنَّجَشِ: بِأَنْ يَزِيدَ فِي الثَّمَنِ لاَ لِرَغْبَةٍ بَلْ لِيَخْدَعَ غَيْرَهُ،

---

مەگەیەننە كاروانچیەكان، هەر كاروانچیەك مرۆڤێكی گەیشتیو كەلوپەلێكی لێكڕی، ئەوە خاوەنی كەلوپەلەكە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە هەر كاتێك هاتە بازاڕ.

## ﴿ مامەڵە لە سەر مامەڵە ﴾

هەروەها (وَالسَّوْمِ عَلَى سَوْمِ غَيْرِهِ) وەكو مامەڵە بە سەر مامەڵەی كەسێكیتردا (وَإِنَّما يَحْرُمُ ذَلِكَ بَعْدَ إِسْتِقْرارِ الثَّمَنِ) ئەوەش تەنها لەو حاڵەتەدا حەرامە، كە پارەكە جێگیر بوبێ: وەك یەكێك بیەوێ شتێك بە دینارێك بكڕێ، ئەویش پێی بڵێ: ئەمە مەكڕە، من لەمەیان باشترت ئەدەمێ بە هەمان نرخ، یان بە كەمتر. یان بە فرۆشیارەكە بڵێ: ئەم شتەی پێ مەفرۆشە، من لێت دەكڕم بە زیاتر. ئەوەش حەرامە، چونكە ئازاردانی تێدایە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يَسُومُ الْمُسْلِمُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ﴾ رواه مسلم، نابێ موسوڵمان مامەڵە بەسەر مامەڵەی برایخۆیدا بكا.

هەروەها (وَالْبَيْعِ عَلَى بَيْعِ غَيْرِهِ) وەك فرۆشتن بە سەر فرۆشتنی كەسێكیتردا (قَبْلَ لُزُومِهِ) پێش ئەوەی فرۆشتنەكە بچەسپێ، چونكە مافی پەشیمانبوونەوە هەیە (بِأَنْ يَأْمُرَ الْمُشْتَرِيَ بِالْفَسْخِ) وەك لە ماوەی پەشیمانبوونەوەدا بە كڕیارەكە بڵێ: كڕینەكەت هەڵبوەشێنەوە (لِيَبِيعَهُ مِثْلَهُ) تاكو شتێكی وەكو وی، یان چاكتری پێ بفرۆشێ بە هەمان نرخ، یان بە كەمتر.

هەروەها (وَالشِّراءِ عَلَى الشِّراءِ) وەكو كڕین بە سەر كڕینیكەسێكیتردا (بِأَنْ يَأْمُرَ الْبائِعَ بِالْفَسْخِ) وەك لە ماوەی پەشیمانبوونەوەدا بە فرۆشیارەكە بڵێ: فرۆشتنەكەت هەڵبوەشێنەوە (لِيَشْتَرِيَهُ) تاكو بەخۆی شتەكەی لێبكڕێ بە نرخێكی زۆرتر، ئەوەش حەرامە، چونكە ئازاردانی تێدایە، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لاَ يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ﴾ رواه الشيخان، نابێ پیاو كڕینو فرۆشتن بە سەر كڕینوفرۆشتنی برایخۆیدا بكا.

## ﴿ مەزادكردنی بە فێڵ ﴾

هەروەها (وَالنَّجَشِ) وەكو نرخ بەرزكردنی بە فێڵ (بِأَنْ يَزِيدَ فِي الثَّمَنِ) وەك شتێك مەزاد بكرێ —واتە: بانگەوازی فرۆشتنی بكرێ— ئەویش نرخەكەی زیاد بكا (لاَ لِرَغْبَةٍ) مەبەستیشی كڕینی شتەكە نەبێ (بَلْ لِيَخْدَعَ غَيْرَهُ) بەڵكو مەبەستی ئەوە بێ: فێڵ لە كڕیارەكانیتر بكاو دڵیان بۆی بچێو بیكڕن، ئەوەش حەرامە ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: نَهَى النَّبِيُّﷺ عَنِ النَّجَشِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی كردوە: نرخ —بە فێڵ— بەرز

وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَخِيارَ، وَبَيْعِ الرُّطَبِ وَالْعِنَبِ لِعاصِرِالْخَمْرِ، وَيَحْـرُمُ التَّفْرِيـقُ بَـيْنَ الأُمِّ وَالْوَلَدِ حَتَّى يُمَيِّزَ، وَفِي قَوْلٍ حَتَّى يَبْلُغَ، وَإِذَا فَرَّقَ بِبَيْعٍ أَوْ هِبَةٍ بَطَلا فِي الأَظْهَرِ،

---

بکرێتـەوە. (وَالأَصَـحُ) فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّـهُ لاَخِيـارَ) کڕیـاری فـێڵ لێکـراو مـافی پەشیمانبوونەوەی نیە، چونکە کەمتەرخەمی لە خۆیەتی.

هەروەها ئەگەر بە درۆ مەدحی شتەکە بکا تـاکو کڕیارەکـە دڵـی بـۆ کڕینـی بچـێ، ئـەویش وەکو (نَجَش) حەرامە، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

ئینجـا بزانـە: ووشـەی (لاَ لِرَغْبَـةٍ) وا دەگەیـەنێ: ئەگـەر شـتێك مـەزاد کـرا، واتـە: بانگـەوازی فرۆشتنی دەکرا، ئەویش دەیویست شتەکە بکڕێ، بۆیێ نرخـی زیـاد کـرد، ئـەو کاتـە حـەرام نیە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا لە باسی مامڵەت لە سەر مامڵەتدا فەرموویانـە ﴿عَـنْ أَنَسٍ: باعَ النَّبِيُّ ﷺ حِلْساً وَقَدَحاً وَقالَ: مَنْ يَشْتَرِي هَذَاالْحِلْسَ وَالْقَـدَحَ؟ فَقَـالَ رَجُـلٌ: أَخَذْتُهَا بِدِرْهَمٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ يَزِيدُ؟ فَأَعْطاهُ رَجُلٌ دِرْهَمَيْنِ فَباعَهُمَـا مِنْـهُ﴾ رواه‌الترمذی وحسنه، پێغەمبـەر ﷺ جلـە ووشـترێکو پـەرداغێکی فرۆشـتنو فـەرمووی: کـێ ئـەم دووانـەم لێدەکڕێ؟ پیاوێك گـوتی: مـن بـە دیرهـەمێك دەمـەوێ. ئینجا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: کـێ زیاد دەکا؟ پیاوێکیتر دوو دیرهەمی دایێو فرۆشتییە ئەوی.

هـەروەها (وَبَيْـعِ الرُّطَـبِ وَالْعِنَـبِ لِعاصِـرِالْخَمْرِ) وەکـو قەسـپو تـرێ بفرۆشـیتە ئـەو کەسـەی دەیکاتە شەڕاب، واتە: مەی، ئەوەش حەرامە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَـبَسَ الْعِنَـبَ أَيَّامَ الْقِطافِ حَتَّى يَبِيعَهُ مِمَّنْ يَتَّخِذُهُ خَمْراً فَقَدْ تَقَحَّمَ النَّارَ عَلَى بَصِيرَةٍ﴾ رواه‌الطبرانی فی‌الأوسط بإسنادحسن، هەر کەسێك ترێ بهێڵێتەوە–لە کاتیبڕینەوەیدا– تـاکو بیفرۆشـێتە ئـەو کەسـەی دەیکاتە مەی– شەڕاب، بە ڕاستی بە زانینەوە خۆی خستۆتە ناو ئاگری دۆزەخ.

هـەروەهاش هـەر مامڵـەتێك ببێتـە هـۆی تاوانکـاری ئـەویش حەرامـە، وەك چـەك بفرۆشـێتە ڕێگرو ستەمکاران، یان دەرمانی بێهۆشکردن بفرۆشێتە پیاو خراپان...هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَعاوَنُوا عَلَـى الإِثْمِ وَالْعُـدْوَانِ﴾ یارمەتی یەکتری مەدەن لە سەر گوناهو دوژمنکاری.

(وَيَحْرُمُ) حەرامە (التَّفْرِيقُ بَيْنَ الأُمِّ وَالْوَلَدِ) دایکەکۆیلەکەو منداڵەکەی لێـك جیـا بکرێنـەوە: بە فرۆشتن، یان بە بەخشین، یان بە بەشکردن، یان بـە قـەرزدان (حَتَّىيُمَيِّـزَ) تـا منداڵەکـە فامیدە دەبێ (وَفِي قَـوْلٍ حَتَّـى يَبْلُـغَ) لـە فەرموودەیەکدا تـا بلـوغ دەبـێ (وَإِذَا فَـرَّقَ) هـەر کاتێك دایکەکەو منداڵەکەی لێك جیا کردنەوە (بِبَيْعٍ أَوْ هِبَةٍ) بە فرۆشـتن، یـان بـە بەخشـین (بَطَلاَ) فرۆشتنەکەو بەخشینەکە هەردووکیان بەتاڵ دەبنـەوە (فِيالأَظْهَرِ) لـە فـەرموودەی بەهێزتردا.

وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْعَرَبُونِ: بِأَنْ يَشْتَرِيَ وَيُعْطِيَهُ دَرَاهِمَ لِتَكُونَ مِنَ الثَّمَنِ إِنْ رَضِيَ السِّلْعَةَ، وَإِلاَّ فَهِبَةً.

---

ئینجا بزانە: لە ئاژەڵیشدا حەرامە: دایکەکەو بێچووەکەی لێك جیا بکرێنەوە ئەگەر بێچووەکە شیرخۆر بێ، جا بە سەربڕینی دایکەکە، یان بە فرۆشتن، یان بە بەخشین، یان بە بەشکردن، واتە: مامڵەتەکەش بەتاڵەو دروست نابێ، بەڵام ئەگەر بێچووە شیرخۆرەکە، گۆشتی بخورێ، ئەو کاتە دروستە سەری ببڕێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا روون کراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ وَالِدَةٍ وَوَلَدِهَا فَرَّقَ اللهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، هەر کەسێك دایكو منداڵەکەی لێك جیا بکاتەوە، خوای گەورە خۆیو خۆشەویستەکانی لە رۆژی قیامەت لێك جیا دەکاتەوە.

(وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْعَرَبُونِ) دروست نابێو حەرامە فرۆشتنی عەرەبوون (بِأَنْ يَشْتَرِيَ) وەك شتێك بکڕێو (وَيُعْطِيَهُ دَرَاهِمَ) چەند دیرهەمێك، یان چەند دینارێکی بداتێو لەگەڵ مامڵەت بەستنەکەدا بە مەرج دابنێ: (لِتَكُونَ مِنَ الثَّمَنِ) ئەم دیرهەمو دینارانە بەشێکی پارەکە بن (إِنْ رَضِيَ السِّلْعَةَ) ئەگەر بە شتەکە رازی بوو (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە شتەکە رازی نەبو و نەیویست (فَهِبَةً) ئەو پارەی داویەتی ببێتە بەخشینو لێی وەرنەگرێتەوە ﴿عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ رضي الله عنه: قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ﴾ رواه مالك وأحمد لكن إسناده غير متصل، پێغەمبەرﷺ فرۆشتنی عەرەبوونی قەدەغە کردوە.

جا ئەگەر لە گفتوگۆی مامڵەت بەستندا ئەو مەرجە دانەنێ، بەڵکو لە پێش مامڵەت بەستنەکەدا مەرجەکە دابنێ، ئەو کاتە فرۆشتنەکە دروست دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ پاشکۆ لەبارەی (إِحْتِكَار)و نرخ دانان ﴾

یەکەم: (إِحْتِكَار) حەرامە، واتە: لە کاتی گرانیدا خواردەمەنی بکڕێو داینێ تاکو بە گرانتر بیفرۆشێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَحْتَكِرُ إِلاَّ خَاطِئٌ﴾ رواه مسلم، کەس ئیحتکار ناکا، تەنها مرۆڤی تاوانبار نەبێ.

واتە: چونکە بە هۆی (إِحْتِكَار) خەڵك زیانی دەگاتێ، بۆیێ بە (إِجْمَاع)ی زانایانی ئیسلام: ئەگەر یەکێك خواردەمەنیەکی هەبوو، خەڵکیش ناچار بوو بۆ ئەو خواردەمەنیە، ئەوە زۆری لێدەکرێ خواردەمەنیەکە بفرۆشێ، تاکو زیان لە سەر خەڵکەکە لابدرێ، هەروەك (ابن حجر) لە (الزواجر)دا گێڕاویەتیەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە کاتی هەرزانیدا شتێك بکڕێ تاکو لە کاتی گرانیدا بە پارەیەکی زۆر بیفرۆشێتەوە، یان لە کاتی گرانیدا بۆ خۆیو خێزانەکەی بیکڕێ، یان بەروبومی باغو

(فَصْلٌ) باعَ خَلاًّ وَخَمْراً، أَوْ عَبْدَهُ وَحُرّاً، أَوْ وَعَبدَ غَيْرِه، أَوْ مُشْتَرَكاً بِغَيْرِإِذْنِ الآخَرِ صَحَّ فِي مِلْكِه فِيالأَظْهَر، فَيَتَخَيَّرُالْمُشْتَرِي

زەویی‌خۆی بە گران فرۆشت، ئەوانە هیچیان نابنە (إحتكار)و گوناهبار نابن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: (تَسْعِير)، واتە: نرخ دانان حەرامە، وەك کاربەدەست فەرمان بداتە بازرگانەکان: کەلوپەلەکەیان لەم نرخە زیاتر نەفرۆشن ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قالَ النّاسُ: غَلاَالسِّعْرُ فَسَعِّرْ لَنا يارَسُولَ الله. فَقالَ رَسُولُ الله ﷺ: إِنَّ الله هُوَ الْمُسَعِّرُ الْقابِضُ الْباسِطُ الرّازِقُ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى الله وَلَيْسَ أَحَدٌ يُطالِبُنِي بِمَظْلَمَةٍ فِي دَمٍ وَلاَ مالٍ﴾ صححه الترمذي، ئەی پێغەمبەری خوا نرخ گران بوە، تۆ نرخمان بۆ دابنێ. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خوای گەورە بە ویستی خۆی نرخ دادەنێ ـ واتە: من نرخ دانانێم چونکە ستەمە ـ من دەمەوێ بگەمە لای خوا، هیچ کەسێکیش داوای هیچم لێنەکا، بە هۆی ستەمێك لە خوێن‌و لەماڵ.

بەڵام لە (نهاية)و (مغني)و (الشبراملسي)دا ئاماژەیان کردوە: کە فەرموودەیەکی‌زانایانیش هەیە: دانانی نرخی دروست کردوە. ئینجا نرخ دانان دروست بێ، یان حەرام بێ، هەر کەسێك سەرپێچی لەو فەرمانەی کاربەدەست بکاو بە نرخێکی زیاتر بیفرۆشێ، گوناهبار دەبێ‌و دەبی کاربەدەست تەمبێی بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

سێیەم: گوتمان: هەر کڕین‌و فرۆشتنێك مەرجێك، یان ڕوکنێکی ناتەواو بێ، یان مەرجێکی ناتەواوی تێدا بێ، ئەو مامڵەتە بەتاڵەو دانامەزرێ، واتە: هەر شتێك بەو مامڵەتە دانەمەزراوە وەربگیرێ، شتەکە حەرامەو حەڵاڵ نابێ، کەوابو: واجبە شتەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، جا ئەگەر شتەکەش نەمابو، واجبە: وێنەی شتەکە بداتەوە خاوەنەکەی، ئەگەر وێنەی نەبو، واجبە: بەرزترین نرخ بداتە خاوەنەکەی، هەروەك (مغني) لێرەدلو (تحفة)و (نهاية)ش لە باسی‌فرۆشتنی بە مەرجدا ڕوونیان کردۆتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی لێك جیاکردنەوەی یەك مامڵەت ﴾

هەر کاتێك (باعَ خَلاًّ وَخَمْراً) بە یەك مامڵەت: سرکەو شەڕابی وێکڕا فرۆشتن (أَوْ عَبْدَهُ وَحُرّاً) یان کۆیلەی‌خۆی‌و مرۆڤێکی‌ئازادی وێکڕا فرۆشتن (أَوْ وَعَبدَغَيْرِه) یان کۆیلەی‌خۆی‌و کۆیلەی‌کەسێکی‌تری فرۆشتن (أَوْ مُشْتَرَكاً) یان ماڵێکی هاوبەشی فرۆشت (بِغَيْرِإِذْنِ الآخَرِ) بە بێ‌ئیزنی هاوبەشەکەی‌خۆی، لەو مامڵەتانەدا (صَحَّ فِي مِلْكِه) فرۆشتنەکە ـ تەنها ـ لە ملکی‌خۆی‌دا دروست دەبێ: کە سرکەکەو کۆیلەکەی‌خۆی‌و بەشەکەی‌خۆیەتی، بەڵام لە شەڕابەکەو ئازادەکەو کۆیلەکەی ئەوی‌ترو بەشی هاوبەشەکەی‌تردا بەتاڵ دەبێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەوابو: (فَيَتَخَيَّرُالْمُشْتَرِي) کڕیارەکە سەرپشکە لە نێوان

إِنْ جَهِلَ، فَإِنْ أَجازَ فَبِحِصَّتِهِ مِنَ الْمُسَمَّى بِاعْتِبارِ قِيمَتِهِما، وَفِي قَوْلٍ بِجَمِيعِهِ، وَلاَخِيارَ لِلْبائِعِ، وَلَوْ باعَ عَبْدَيْهِ فَتَلِفَ أَحَدُهُما قَبْلَ قَبْضِهِ لَمْ يَنْفَسِخْ فِي الآخَرِ عَلَى الْمَذْهَبِ، بَلْ يَتَخَيَّرُ: فَإِنْ أَجازَ فَبِالْحِصَّةِ قَطْعاً، وَلَوْ جَمَعَ فِي صَفْقَةٍ مُخْتَلِفَي الْحُكْمِ: كَإِجارَةٍ وَبَيْعٍ أَوْ سَلَمٍ

---

پەشیمانبوونەوەو ڕازیبووندا (إِنْ جَهِلَ) ئەگەر نەیزانیبو فرۆشراوەکە ئەوها لێك جیایە، چونکە بە هۆی لێکجیابوونەوەیمامڵەتەکە زیانی پێدەگا:

(فَإِنْ أَجازَ) جا ئەگەر ڕازی بوو و مامڵەتەکەی ڕۆیاندو پەشیمان نەبۆوە، یان لە سەرەتاوە دەیزانی فرۆشراوەکە لێك جیایە، ئەوە (فَبِحِصَّتِهِ مِنَ الْمُسَمَّى) بەشە فرۆشراوەکەی دروستبوو دەبێتە ملکی کڕیارەکە بە بەشە پارەکەیخۆی: لە کۆی ئەو پارەیەی گۆتراوە (بِاعْتِبارِ قِيمَتِهِما) بە گوێرەی ڕەچاوکردنی نرخی هەردووکیان، بۆ وێنە: هەموو ماڵە هاوبەشە فرۆشراوەکە نرخی سێسەد دینار بوو، بەڵام ئەو هەمووی بە سەدو پەنجا دینار فرۆشت، لەگەڵ ئەوەشدا بەشەکەیخۆی -بە تەنها- نرخی سەد دینار بوو، ئەوە بەشە پارەی بەشەکەی خۆی لەو سەدو پەنجا یە: پەنجا دینارە، چونکە سێیەکی پارەکەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِي قَوْلٍ بِجَمِيعِهِ) لە فەرموودەیەکدا فرۆشراوەکە بە هەموو پارەکە دەبێتە ملکی کڕیارەکە، بەڵام (وَلاَ خِيارَ لِلْبائِعِ) فرۆشیارەکە مافی پەشیمانبوونەوەی نیە، چونکە بە ویستی خۆی شتێکی دروست نەبووی فرۆشتوەو کەمتەرخەمیی کردوە.

(وَلَوْ باعَ عَبْدَيْهِ) ئەگەر دوو کۆیلەی خۆی فرۆشتن، یان دوو مەڕی خۆی فرۆشتن (فَتَلِفَ أَحَدُهُما قَبْلَ قَبْضِهِ) ئینجا یەکێکیان -لەو دووانە- فەوتا پێش ئەوەی کڕیارەکە وەریبگرێ، ئەوە فرۆشتنەکە لەو فەوتاوەدا هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام (لَمْ يَنْفَسِخْ فِي الآخَرِ) لەویتریان -کە ماوەتەوە- فرۆشتنەکە هەڵناوەشێتەوە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی بەهێزی مەزهەب (بَلْ يَتَخَيَّرُ) بەڵکو کڕیارەکە سەرپشکە لە نێوان پەشیمانبوونەوەو ڕازیبووندا (فَإِنْ أَجازَ) جا ئەگەر ڕازی بوو و مامڵەتەکەی ڕۆیاند (فَبِالْحِصَّةِ قَطْعاً) بە فەرموودەیەکی بڕاوە: ئەو کۆیلەیەی، یان ئەو مەڕەی ماوە، بە بەشە پارەکەی خۆی دەبێتە ملکیکڕیارەکە، کەواتە: بەشە پارەکەیفەوتاوەکەشی بۆ دەگەڕێتەوە.

(وَلَوْ جَمَعَ فِي صَفْقَةٍ) ئەگەر کۆی کردەوە لە یەك مامڵەتدا (مُخْتَلِفَي الْحُكْمِ) دوو مامڵەتی لێك جیاواز (كَإِجارَةٍ وَبَيْعٍ) وەکو بەکرێدانو فرۆشتنێکی وێکڕا، وەك بڵێ: خانووەکەم مانگێك بە کرێ دایە تۆ، باغەکەشم فرۆشتە تۆ، هەردوو لا بە هەزار دینار (أَوْ سَلَمٍ) یان

صَحَّا فِي الأَظْهَرِ، وَيُوَزَّعُ الْمُسَمَّى عَلَى قِيمَتِهِما، أَوْ بَيْعٍ وَنِكاحٍ صَحَّ النِّكاحُ، وَفِي الْبَيْعِ وَالصَّدَاقِ الْقَوْلاَنِ، وَتَتَعَدَّدُ الصَّفْقَةُ بِتَفْصِيلِ الثَّمَنِ: كَبِعْتُكَ ذَا بِكَذَا وَذَا بِكَذَا، وَبِتَعَدُّدِ الْبائِعِ، وَكَذَا بِتَعَدُّدِ الْمُشْتَرِي فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ وَكَّلاهُ أَوْ وَكَّلَهُما فَالأَصَحُّ اِعْتِبارُ الْوَكِيلِ.

(بَابُ الْخِيارِ)

---

وەکو بەکرێدان‌و (سَلَم)، وەك بڵێ: خانووەکەم مانگێك بەکرێ دایە تۆ، تۆنێك گەنمیشم بە (سَلَمْ) دایە تۆ، هەردوو لا بە هەزار دینار (صَحَّا) هەردوو مامڵەتەکان دروست دەبن، لە هەردوو مەسەلەدا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَيُوَزَّعُ الْمُسَمَّى) ئەو پارەیەی گوتراوە-کە هەزار دینارەکەیە- دابەش دەکرێ (عَلَى قِيمَتِهِما) بە سەر نرخی هەردوو مامڵەتەکەدا، واتە: کرێی خانووەکەو نرخی باغەکە، یان گەنمەکە.

(أَوْ بَيْعٍ وَنِكاحٍ) یان وەکو فرۆشتن‌و مارەبڕین، وەك بڵێ: کیژی خۆم مارەبڕی لە تۆ، باغەکەی کیژەکەشم فرۆشتە تۆ بە هەزار دینار. واتە: مارەیی‌و پارەی‌باغەکە وێکڕا هەزار دینار بێ، ئەوە (صَحَّ النِّكاحُ) مارەبڕینەکە دروست دەبێ (وَفِي الْبَيْعِ وَالصَّدَاقِ) لە دروستبوونی فرۆشتنەکەو مارەیی‌ژنەکەشدا (الْقَوْلاَنِ) هەردوو فەرموودەی‌ڕابردوو هەنە، بەهێزتریان ئەمەیە: فرۆشتنەکە بە بەشە پارەی نرخی‌خۆی دروست دەبێ‌و مارەییەکەش بە بەشە پارەی مارەیی‌هاوێنە دروست دەبێ.

(وَتَتَعَدَّدُ الصَّفْقَةُ) یەك مامڵەت بە چەند مامڵەت دەژمێردرێ (بِتَفْصِيلِ الثَّمَنِ) بە لێکجیاکردنەوەی پارەکە (کَـ) وەك بڵێ: (بِعْتُكَ ذَا بِكَذَا وَذَا بِكَذَا) ئەمەم بە ئەوەندە پارەیە فرۆشتە تۆ، ئەمەشم بە ئەوەندە پارەیە فرۆشتە تۆ (وَ) هەروەها یەك مامڵەت بە چەند مامڵەت دەژمێردرێ (بِتَعَدُّدِ الْبائِعِ) بە ژمارەی فرۆشیارەکان، وەك هاوبەشەکان وێکڕا بڵێن: باغەکەمان فرۆشتە تۆ بە هەزار دینار (وَكَذَا بِتَعَدُّدِ الْمُشْتَرِي) هەروەهاش بە ژمارەی کڕیارەکانیش، وەك بڵێ: خانووەکەم فرۆشتە هەرسێکتان بە هەزار دینار (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَلَوْ وَكَّلاهُ) ئەگەر دوو کەس یەکێکی‌تریان کردە وەکیلی‌خۆیان (أَوْ وَكَّلَهُما) یان یەکێك دوو کەسی کردنە وەکیلی‌خۆی، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (اِعْتِبارُ الْوَكِيلِ) بۆ ژمارەی‌مامڵەتەکە وەکیلەکە ڕەچاو دەکرێ، واتە: ئەگەر یەك وەکیل بێ، مامڵەتەکەش بە یەك مامڵەت دەژمێردرێ، ئەگەر دوو وەکیل بن، بە دوو مامڵەت دەژمێردرێن.

## ﴿ بَابُ الْخِيارِ: باسی پەشیمانبوونەوە ﴾

پەشیمانبوونەوە سێ جۆرە، یەکەم: (خِيارُ الْمَجْلِسِ) پەشیمانبوونەوەی دانیشگە. دووەم: (خِيارُ الشَّرْطِ) پەشیمانبوونەوەی مەرج. سێیەم: (خِيارُ النَّقِيصَةِ)-(خِيارُ الْعَيْبِ) پەشیمانبوونەوەی ناتەواوی=عەیبداری.

يَثْبُتُ خِيارُالْمَجْلسِ فِىأَنْواعِ الْبَيْعِ: كالصَّرْفِ وَالطَّعامِ بِالطَّعامِ وَالسَّلَمِ وَالتَّوْلِيَةِ وَالتَّشْرِيكِ وَصُلْحِ الْمُعاوَضَةِ، وَلَوِ اشْتَرَى مَنْ يَعْتِقُ عَلَيْه: فَإِنْ قُلْنا الْمِلْكُ فى زَمَنِ الْخِيارِ لِلْبائِعِ أَوْ مَوْقُوفٌ فَلَهُما الْخِيارُ، وَإِنْ قُلْنا لِلْمُشْتَرِى تَخَيَّرَ الْبائِعُ دُونَهُ، وَلاَ خِيارَ فِى الإِبْراءِ وَالنِّكاحِ وَالْهِبَةِ بِلاَثَوابٍ، وَكَذا ذاتُ الثَّوابِ وَالشُّفْعَةُ وَالإِجارَةُ وَالْمُساقاةُ وَالصَّداقُ فِىالأَصَحِّ،

---

ئینجا دەربارەی جۆرییەکەم دەفەرموێ: (يَثْبُتُ خِيارُالْمَجْلسِ) پەشیمانبوونەوەی دانیشگە هەیە: بۆ کڕیارو فرۆشیار (فِى أَنْواعِ الْبَيْعِ) لە هەموو جۆرە کڕینو فرۆشتنێکدا (كالصَّرْفِ) وەك پارە وردکردنەوەو پارەگۆڕینەوەو (وَالطَّعامِ بِالطَّعامِ) وەکو فرۆشتنی خۆراك بە خۆراكو (وَالسَّلَمِ) وەکو (سَلَمْ)کردنو (وَالتَّوْلِيَةِ) وەکو کردنە سەرپەرشتکاری کڕینەوەو (وَالتَّشْرِيكِ) وەکو کردنە هاوبەشی ماڵە کڕاوەکەو (وَصُلْحِ الْمُعاوَضَةِ) وەکو سولحی بە گۆڕینەوە، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿اَلْبَيِّعانِ بِالْخِيارِ مالَمْ يَتفرَّقا أَوْ يَقُولَ أَحَدُهُما لِلآخَرِ: اِختَرْ﴾ رواه الشيخان، کڕیارو فرۆشیار مافی پەشیمانبوونەوەیان هەیە، تا لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا بنو لێك جیا نەبوبنەوە، یان تا یەکێك بەویتر ئەڵێ: پەشیمانبوونەوە نەبێو مامڵەتەکەم برِاندەوە.

(وَلَواشْتَرَى مَنْ يَعْتِقُ عَلَيْهِ) ئەگەر کۆیلەیەکی وەهای کڕی کە لە سەر خۆی ئازاد دەبو: وەکو باوکی خۆی، یان منداڵی خۆی بکڕێ (فَإِنْ قُلْنا) ئەگەر بڵێین (اَلْمِلْكُ فِى زَمَنِ الْخِيارِ لِلْبائِعِ) ملکایەتی فرۆشراوەکە لە ماوەی پەشیمانبوونەوەدا بۆ فرۆشیارەکەیە (أَوْ) یان بە فەرموودەی بەهێزتر بڵێین (مَوْقُوفٌ) ملکایەتی فرۆشراوەکە لە ماوەی پەشیمانبوونەوەدا ڕاگیراوە (فَلَهُما الْخِيارُ) بۆ هەردووکیان هەیە پەشیمان ببنەوە، بەلاَم (وَإِنْ قُلْنا لِلْمُشْتَرِى) ئەگەر بڵێین: ملکایەتیەکە بۆ کڕیارەکەیە، ئەو کاتە (تَخَيَّرَالْبائِعُ) تەنها فرۆشیارەکە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە (دُونَهُ) کڕیارەکە مافی نیە.

(وَلاَخِيارَ) پەشیمانبوونەوە نیە (فِىالإِبْراءِ) لە گەردەن ئازادکردنداو (وَالنِّكاحِ) لە مارەبڕینداو (وَالْهِبَةِ بِلاَثَوابٍ) لە بەخشینی بێپاداشتدا (وَكَذا ذاتُ الثَّوابِ) هەروەهاش بەخشینی بە پاداشو (وَالشُّفْعَةُ) شوفعەو (وَالإِجارَةُ) بەکرێدانو (وَالْمُساقاةُ) باغەوانیو (وَالصَّداقُ) مارەییدانان، ئەوانە هیچیان پەشیمانبوونەوەیان تێدا نیە (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها پەشیمانبوونەوە نیە: لە تەلاقدانو لە ئازادکردنو لە وەقفکردنو لە شریکایەتیو لە وەکیلایەتیو لە قەرزو لە پارە بە معامەلەدان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَيَنْقَطِعُ بِالتَّخايُرِ: بِأَنْ يَخْتارَا لُزُومَهُ، فَلَوْ اخْتارَ أَحَدُهُما سَقَطَ حَقُّهُ وَبَقِيَ لِلآخَرِ، وَبِالتَّفَرُّقِ بِبَدَنِهِما، فَلَوْ طالَ مُكْثُهُما أَوْ قاما وَتَماشَيا مَنازِلَ دامَ خِيارُهُما، وَيُعْتَبَرُ فِي التَّفَرُّقِ الْعُرْفُ، وَلَوْ ماتَ فِي الْمَجْلِسِ أَوْ جُنَّ فَالأَصَحُّ إِنْتِقالُهُ إِلَى الْوارِثِ وَالْوَلِيِّ، وَلَوْ تَنازَعا فِي التَّفَرُّقِ أَوِ الْفَسْخِ قَبْلَهُ صُدِّقَ النَّافِي.

---

(وَيَنْقَطِعُ) مافی پەشیمانبوونەوەیدانیشگە دەبڕێو نامێنێ (بِالتَّخايُرِ) بە هەڵبژاردنی ڕۆیاندنی مامڵەتەکە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو (بِأَنْ يَخْتارا لُزُومَهُ) وەکو هەردووکیان بڵێن: کڕینو فرۆشتنەکەمان ڕۆیاندو پەشیمانبوونەوەمان نەبێ. بەڵام (فَلَوْ اخْتارَ أَحَدُهُما) ئەگەر تەنها یەکێکیان ڕۆیاندنی هەڵبژاردو گوتی: من پەشیمانبوونەوەم نەبێ. ئەوە (سَقَطَ حَقُّهُ) مافی پەشیمانبوونەوەی خۆی نامێنێو (وَبَقِيَ لِلآخَرِ) ئەویتر مافی پەشیمانبوونەوەی دەمێنێ تا لەو دانیشگەیەدا بمێنن.

(وَ) هەروەها مافی پەشیمانبوونەوەی دانیشگە دەبڕێو نامێنێ (بِالتَّفَرُّقِ بِبَدَنِهِما) بە لێکجیابوونەوەی لاشەی کڕیارەکەو فرۆشیارەکە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، جیاوازی نیە: بە ویستیخۆیان لێك جیا ببنەوە، یان بە نەزانی، جا هەردووکیان لێك جیا ببنەوە، یان تەنها یەکێکیان بڕوا، بەو مەرجەی لێکجیابوونەوەکە بە زۆرلێکردن نەبێ، کەواتە: (فَلَوْ طالَ مُكْثُهُما) ئەگەر کڕیارەکەو فرۆشیارەکە ماوەیەکیدرێژ لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا مانەوە (أَوْ قاما) یان بە یەکەوە هەڵسانو (وَتَماشَيا مَنازِلَ) چەند قۆناغێك وێکڕا ڕۆیشتن، ئەوە (دامَ خِيارُهُما) لە هەردوو مەسەلەدا پەشیمانبوونەوەی دانیشگەیان بەردەوام دەبێ، هەرچەند مانەوەکەیان، یان ڕۆیشتنەکەیان لە سێ ڕۆژانیش زیاتر بێ.

(وَيُعْتَبَرُ فِي التَّفَرُّقِ) ڕەچاو دەکرێ لە لێکجیابوونەوەدا (الْعُرْفُ) عادەتیخەڵك: وەك یەکێك لە ژوورەکە، یان لە ناو ئوتومبێلەکە بڕواتە دەرەوە، یان لە ژوورێکی خانووەکە بڕواتە ژوورێکیتر، یان لە هۆڵێکی زۆر بەرین پشتی تێبکاو نەختێك بڕوا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە (وَلَوْ ماتَ فِي الْمَجْلِسِ) ئەگەر یەکێك –کڕیارەکە، یان فرۆشیارەکە– لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا مرد (أَوْ جُنَّ) یان شێت بوو، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (إِنْتِقالُهُ) مافی پەشیمانبوونەوە دەگوازرێتەوە (إِلَى الْوارِثِ) بۆ میراتگری مردووەکەو (وَالْوَلِيِّ) بۆ سەرپەرشتکاری شێتەکە.

(وَلَوْتَنازَعا) ئەگەر کڕیارەکەو فرۆشیارەکە بووە کێشەیان (فِي التَّفَرُّقِ) لەبارەی لێکجیابوونەوە، وەك بە یەکەوە بێنو یەکێکیان بڵێ: پێش هاتنمان لێك جیا بوینەوە. ئەویتریش گوتی: لێك جیا نەبوینەوە (أَوِ الْفَسْخِ قَبْلَهُ) یان بووە کێشەیان لەبارەی

(فَصْلٌ) لَهُما وَلأَحَدِهِما شَرْطُ الْخِيارِ فِي أَنْواعِ الْبَيْعِ إِلاَّ أَنْ يُشْتَرَطَ الْقَبْضُ فِي الْمَجْلِسِ: كَرِبَوِيٍّ وَسَلَمٍ، وَإِنَّما يَجُوزُ فِي مُدَّةٍ مَعْلُومَةٍ لاَ تَزِيدُ عَلَى ثَلاَثَةِ أَيّامٍ، وَتُحْسَبُ مِنَ الْعَقْدِ، وَقِيلَ مِنَ التَّفَرُّقِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ إِنْ كانَ الْخِيارُ لِلْبائِعِ فَمِلْكُ الْمَبِيعِ لَهُ،

---

هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتەکە پێش لێکجیابوونەوە، وەك یەکێکیان بڵێ: پێش لێکجیابوونەوە مامڵەتەکەمان هەڵوەشاندۆتەوە. ئەویتریش بڵێ: نا. ئەوە (صُدِّقَ النّافِي) لە هەردوو مەسەلەدا باوەڕ بەوەیان دەکرێ کە دەڵێ: لێك جیا نەبوینەوە. یان دەڵێ: هەڵنەوەشاندراوەتەوە. بەو مەرجەی سوێند بخوا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (خِيارُ الشَّرْط) پەشیمانبوونەوەی مەرج ﴾

(لَهُما) بۆ کڕیارەکەو فرۆشیارەکە دروستە، هەم (وَلأَحَدِهِما) بۆ یەکێکیانیش دروستە (شَرْطُ الْخِيارِ) بە مەرج دابنێن: مافی پەشیمانبوونەوە بۆ هەردووکیان هەبێ، یان تەنها بۆ یەکێکیان هەبێ (فِي أَنْواعِ الْبَيْعِ) لە هەموو ئەو جۆرە مامڵەتانەی پەشیمانی‌ی دانیشگەیان تێدابو (إِلاَّ أَنْ يُشْتَرَطَ الْقَبْضُ فِي الْمَجْلِسِ) تەنها لەو مامڵەتەدا نەبێ: کە مەرجە لە دانیشگەکەدا: پارەکەو فرۆشراوەکە -یان تەنها پارەکە- وەربگیرێ (كَرِبَوِيٍّ) وەك ڕیبادارێك بە ڕیبادارێکی‌تر بفرۆشرێ: وەکو خواردن بە خواردن، یان زێڕو زیو بە پارە، هەم (وَسَلَمٍ) وەکو (سَلَمْ)، کە تێیدا مەرجە: سەرمایەکە لە دانیشگەکەدا وەربگیرێ، واتە: لەو دووانەدا دروست نیە پەشیمانبوونەوە بە مەرج دابندرێ.

(وَإِنَّما يَجُوزُ فِي مُدَّةٍ مَعْلُومَةٍ) بە مەرج دانانی پەشیمانی تەنها لە ماوەیەکی زاندراودا دروستە: کە (لاَتَزِيدُ عَلَى ثَلاَثَةِ أَيّامٍ) لە سێ ڕۆژان زیاتر نەبێ، پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ﴿إِذَا بايَعْتَ فَقُلْ لاَ خِلابَةَ﴾ رواه الشيخان، زادالبيهقي بإسنادحسن: ﴿ثُمَّ أَنْتَ بِالْخِيارِ فِي كُلِّ سِلْعَةٍ ابْتَعْتَها ثَلاَثَ لَيالٍ﴾ هەر کاتێك مامەڵەیەکت کرد، بڵێ: فێڵبازی نیە، ئینجا هەر شتێکت کڕی ماوەی سێ شەوان مافی پەشیمانیت هەیە.

جا بزانە: ئەگەر ماوەی پەشیمانیەکە نەزاندرلو بوو، یان لە سێ‌ڕۆژان زیاتر بوو، ئەوە -لە هەردوو حاڵەتدا- خودی مامڵەتەکە بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە(تحفة)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَتُحْسَبُ) ئەو ماوەیەی بە مەرج داندراوە، دەژمێردرێ (مِنَ الْعَقْدِ) لە بەستنی مامڵەتەکەوە (وَقِيلَ) لەفەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (مِنَ التَّفَرُّقِ) لە لێکجیابوونەوەوە دەژمێردرێ.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر -لە پەشیمانی‌ی دانیشگەو مەرجدا- ئەمەیە: (أَنَّهُ إِنْ كانَ الْخِيارُ لِلْبائِعِ) ئەگەر مافی پەشیمانی تەنها بۆ فرۆشیارەکە هەبێ، ئەوە لە ماوەی پەشیمانی‌دا: (فَمِلْكُ الْمَبِيعِ لَهُ) ملکایەتی‌فرۆشراوەکەو گشت بەرهەمێکی‌فرۆشراوەکەش

وَإنْ كانَ لِلْمُشْتَرِي فَلَهُ، وَإنْ كانَ لَهُما فَمَوْقُوفٌ: فَإنْ تَمَّ الْبَيْعُ بانَ أنَّهُ لِلْمُشْتَرِي مِنْ حِينِ الْعَقْدِ وَإلاَّ فَلِلْبائِعِ، وَيَحْصُلُ الْفَسْخُ وَالإجازَةُ بِلَفْظٍ يَدُلُّ عَلَيْهِما: كَفَسَخْتُ الْبَيْعَ وَرَفَعْتُهُ وَاسْتَرْجَعْتُ الْمَبِيعَ، وَفِي الإجازَةِ: أجَزْتُهُ وَأمْضَيْتُهُ، وَوَطْءُ الْبائِعِ وَإعْتاقُهُ فَسْخٌ، وَكَذا بَيْعُهُ وَإجارَتُهُ وَتَزْوِيجُهُ فِي الأصَحِّ، وَالأصَحُّ أنَّ هَذِهِ التَّصَرُّفاتِ مِنَ الْمُشْتَرِي إجازَةٌ،

---

بۆ فرۆشیارەکەیە، ملکایەتیپارەکەش بۆ کڕیارەکەیە (وَإنْ كانَ لِلْمُشْتَرِي) وە ئەگەر مافی پەشیمانی تەنها بۆ کڕیارەکە هەبێ، ئەوە لە ماوەی پەشیمانیدا: (فَلَهُ) ملکایەتی فرۆشراوەکەو بەرهەمەکانیشی بۆ کڕیارەکەنە، ملکایەتیپارەکەش بۆ فرۆشیارەکەیە.

بەلام (وَإنْ كانَ لَهُما) ئەگەر مافی پەشیمانی بۆ هەردووکیان هەبێ، ئەوە لە ماوەی پەشیمانیدا: (فَمَوْقُوفٌ) ملکایەتی فرۆشراوەکەو پارەکە ڕادەگیرێ: (فَإنْ تَمَّ الْبَيْعُ) جا ئەگەر فرۆشتنەکە تەواو بوو و هیچێکیان پەشیمان نەبونەوە، ئەوە (بانَ) دەردەکەوێ (أنَّهُ لِلْمُشْتَرِي) ملکایەتیفرۆشراوەکەو بەرهەمەکەشی بۆ کڕیارەکەنە، هی پارەکەش بۆ فرۆشیارەکەیە (مِنْ حِينِ الْعَقْدِ) لە کاتی مامڵەت بەستنەکەوە (وَإلاَّ) بەلام ئەگەر فرۆشتنەکە تەولو نەبو و یەکێکیان پەشیمان بۆوە (فَلِلْبائِعِ) ئەو کاتە ملکایەتی فرۆشراوەکەو بەرهەمەکەشی بۆ فرۆشیارەکەیە، هی پارەکەش بۆ کڕیارەکەیە.

(وَيَحْصُلُ الْفَسْخُ وَالإجازَةُ) –لە ماوەیپەشیمانیدا– هەڵوەشاندنەوەیمامڵەتەکەو ڕۆیاندنی مامڵەتەکە–هەردووك– دێنەجێ (بِلَفْظٍ يَدُلُّ عَلَيْهِما) بە گوتەیەکی وەها: ببێتە نیشانە لە سەر هەڵوەشاندنەوە، یان لە سەر ڕۆیاندن (كَ) وەك بڵێ: (فَسَخْتُ الْبَيْعَ) فرۆشتنەکەم هەڵوەشاندەوە (وَ) یان بڵێ: (رَفَعْتُهُ) فرۆشتنەکەم هەلگرتو نەمویست (وَ) یان بڵێ: (اسْتَرْجَعْتُ الْمَبِيعَ) فرۆشراوەکەم بۆ خۆم گەڕاندەوە (وَفِي الإجازَةِ) هەم لە ڕۆیاندنیشدا بڵێ (أجَزْتُهُ) ڕێگەم دا: مامڵەتەکە ببێ (وَ) یان بڵێ: (أمْضَيْتُهُ) مامڵەتەکەم ڕۆیاند.

ئینجا بزانە: هەر یەکێك پەشیمانبوونەوەیمەرجی بۆ هەبێ، ئەوە بۆی دروستە: لە کاتی ئامادەبوونی مامڵەتچیەکەیترو هەم لە کاتی ئامادەنەبوونیشیدا مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَوَطْءُ الْبائِعِ) لە ماوەی پەشیمانیدا: (جماع)کردنی فرۆشیارەکە لەگەڵ (جاریة) فرۆشراوەکە، هەم (وَإعْتاقُهُ) ئازادکردنی کۆیلە فرۆشراوەکە (فَسْخٌ) هەردووکیان بە هەڵوەشاندنەوە دادەندرێن (وَكَذا بَيْعُهُ) هەروەها فرۆشتنی فرۆشراوەکە، هەم (وَإجارَتُهُ) بەکرێدانی، هەم (وَتَزْوِيجُهُ) مارەبڕینی، گشتی بە هەڵوەشاندنەوە دادەندرێن (فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَالأصَحُّ) هەم بە فەرموودەی ڕاستتر: (أنَّ هَذِهِ التَّصَرُّفاتِ مِنَ الْمُشْتَرِي) ئەو کردەوانەیڕابردوو ئەگەر لە کڕیارەکەوە ڕوو بدەن لە ماوەی پەشیمانیدا (إجازَةٌ) بە ڕێگادانو ڕۆیاندنی مامڵەتەکە دادەندرێن.

وَأَنَّ الْعَرْضَ عَلَى الْبَيْعِ وَالتَّوْكِيلَ فِيهِ لَيْسَ فَسْخاً مِنَ الْبائِعِ وَلاَ إِجازَةً مِنَ الْمُشْتَرِي. (فَصْلٌ) لِلْمُشْتَرِي الْخِيارُ بِظُهُورِ عَيْبٍ قَدِيمٍ: كَخِصَاءِ رَقِيقٍ وَزِناهُ وَسَرِقَتِهِ وَإِباقِهِ وَبَوْلِهِ فِي الْفِراشِ وَبَخَرِهِ وَصِنانِهِ وَجِماحِ الدَّابَّةِ وَعَضِّها وَكُلِّ مَا يَنْقُصُ الْعَيْنَ أَوِ الْقِيمَةَ نَقْصاً يَفُوتُ بِهِ غَرَضٌ صَحِيحٌ إِذَا غَلَبَ فِي جِنْسِ الْمَبِيعِ

---

بەلام (وَأَنَّ الْعَرْضَ عَلَى الْبَيْعِ) دانانی فرۆشراوەکە بۆ فرۆشتن، هەم (وَالتَّوْكِيلَ فِيهِ) وەکیلگرتن بۆ فرۆشتنی (لَيْسَ فَسْخاً مِنَ الْبائِعِ) هیچیان نابنە هەڵوەشاندنەوە لە لایەن فرۆشیارەکەوە (وَلاَ إِجازَةً مِنَ الْمُشْتَرِي) هەم نابنە ڕۆیاندن لە لایەن کڕیارەکەوە، چونکە وا دەبێ: مەریەکەیان مەبەستی ئەوە بێ: بزانێ ئایا زەرەر دەکا، یان قازانج.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (خِيارُ النَّقِيصَةِ) پەشیمانبوونەوەی ناتەواوی ﴾

هەم پێی دەگوترێ: (خِيارُ الْعَيْبِ)-پەشیمانبوونەوەی عەیبداری (لِلْمُشْتَرِي الْخِيارُ) کڕیارەکە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە (بِظُهُورِ عَيْبٍ قَدِيمٍ) بە هۆی دەرکەوتنی عەیبێکی کۆنی فرۆشراوەکە، بەو مەرجەی نەیزانیبێ ئەو عەیبەی هەیە، جا لەکاتی مامڵەت بەستندا فرۆشراوەکە عەیبەکەی هەبوبێ-بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام- یان لە دوای مامڵەت بەستن و پێش وەرگرتنی عەیبێکی لێپەیدا ببێ، بە بەڵگەی حەدیسی ئاژەڵە نەدۆشراوەکەی داهاتوو، هەم ﴿عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَجُلاً اشْتَرَى غُلاماً وَكانَ عِنْدَهُ ماشاءَ اللهُ ثُمَّ رَدَّهُ مِنْ عَيْبٍ وَجَدَهُ، فَقَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِرَدِّهِ بِالْعَيْبِ. فَقالَ الْمَقْضِيُّ عَلَيْهِ: قَدِ اسْتَعْمَلَهُ يارَسُولَ اللهِ؟ فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْخَراجُ بِالضَّمانِ﴾ رواه اصحاب السنن وصححه الترمذي والحاكم، پیاوێک کۆیلەیەکی کڕیو ماوەیەکی زۆر لەلای بوو، ئینجا بە هۆی عەیبێکی کۆن گەڕاندیەوە سەرفرۆشیارەکەو، پێغەمبەرﷺ بڕیاری دروستبوونی گەڕاندنەوەکەی دا بە هۆی عەیبەکەی، ئینجا فرۆشیارەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە کاری بەو کۆیلەیە کردوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەرهەمی فرۆشراوەکە بۆ کڕیارەکەیە، چونکە لە زامینی ئەویدا بووە.

ئینجا عەیبەکە: (كَخِصَاءِ رَقِيقٍ) وەکو خەساندنی کۆیلەو ئاژەڵ (وَزِناهُ) وەکو زینای کۆیلەو (وَسَرِقَتِهِ) دزیو (وَإِباقِهِ) هەڵاتن و خۆ بزرکردنیو (وَبَوْلِهِ فِي الْفِراشِ) میزکردنی لە کاتی خەوتنداو (وَبَخَرِهِ) بۆگەنی هەناسەیی و (وَصِنانِهِ) بۆگەنی بن هەنگڵی، هەروەها (وَجِماحِ الدَّابَّةِ) وەکو شەموسی وولاغو (وَعَضِّها) قەپار لێدانیو لوشکە لێدانیو هەڵاتن و ڕەوینەوەیو (وَكُلِّ ما يَنْقُصُ الْعَيْنَ) هەم وەکو هەر عەیبێکیتر: کە خودی فرۆشراوەکە کەم بکاتەوە (أَوِ الْقِيمَةَ) یان نرخەکەی کەم بکاتەوە (نَقْصاً) کەمکردنەوەیەکی وەها: کە (يَفُوتُ بِهِ غَرَضٌ صَحِيحٌ) مەبەستێکی ڕاستی پێ لە دەست بچێ (إِذَا غَلَبَ فِي جِنْسِ الْمَبِيعِ

عَدَمُهُ، سَواءٌ قارَنَ الْعَقْدَ أَمْ حَدَثَ قَبْلَ الْقَبْضِ، وَلَوْ حَدَثَ بَعْدَهُ فَلاَ خيارَ إلاَّ أَنْ يَسْتَنِدَ إلَى سَبَبٍ مُتَقَدِّمٍ: كَقَطْعِهِ بجنايَةٍ سابقَةٍ فَيَثْبُتُ الرَّدُّ فِي الأَصَحِّ، بخلافِ مَوْتِهِ بمَرَضٍ سابقٍ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قُتِلَ برِدَّةٍ سابقَةٍ ضَمِنَهُ الْبائعُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ باعَ بشَرْطِ بَراءَتِهِ مِنَ الْعُيُوبِ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَبْرَأُ عَنْ كُلِّ عَيْبٍ باطنٍ بالْحَيَوانِ لَمْ يَعْلَمْهُ دُونَ غَيْرِه،

---

عَدَمُهُ) بەو مەرجەی لە ڕەگەزی فرۆشراوەکەدا-بە ئەغلەبی- ئەو جۆرە عەیبەی نەبێ، واتە: ئەگەر بە ئەغلەبی هەبو: وەك گاجووتی خەسێندرلو، ئەو کاتە زیانی نیە.

ئینجا بزانە: (سَواءٌ) بۆ هەبوونی پەشیمانی یەکسانەو جیاوازی نیە: (قارَنَ الْعَقْدَ) لەگەڵ بەستنی مامڵەتەکەدا فرۆشراوەکە عەیبەکەی هەبوبێ (أَمْ حَدَثَ قَبْلَ الْقَبْضِ) یان-لە دوای مامڵەت بەستن- پێش ئەوەی کڕیارەکە وەریبگرێ عەیبەکەی لێپەیدا بوبێ، واتە: لە هەردوو حاڵەتدا کڕیارەکە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە.

بەڵام (وَلَوْ حَدَثَ بَعْدَهُ) ئەگەر لە دوای وەرگرتنیفرۆشراوەکە عەیبەکەی لێپەیدا بو (فَلاَ خِيارَ) ئەو کاتە کڕیارەکە مافی پەشیمانیی نیە (إلاَّ أَنْ يَسْتَنِدَ إلَى سَبَبٍ مُتَقَدِّمٍ) مەگەر پەیدابوونی عەیبەکە بگەڕێتەوە سەر هۆیەکیڕابردوو (كَقَطْعِهِ بِجِنايَةٍ سابِقَةٍ) وەك دەستی کۆیلە فرۆشراوەکە ببڕدرێ بە هۆی تاوانێکی، یان دزییەکیڕابردوو، ئەو کاتە (فَيَثْبُتُ الرَّدُّ) مافی گەڕاندنەوەی دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(بِخِلافِ مَوْتِهِ بِمَرَضٍ سابِقٍ) بەڵام ئەگەر فرۆشراوەکە بە هۆی نەخۆشییەکیڕابردوو بمرێ، ئەو کاتە مافی گەڕاندنەوەی نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەرچەندە کڕیارەکەش نەیزانیبێ فرۆشراوەکە نەخۆشە، بەڵام (وَلَوْ قُتِلَ بِرِدَّةٍ سابِقَةٍ) ئەگەر کۆیلە فرۆشراوەکە کوژرا بە هۆی کافربوونێکیڕابردوو، یان بە هۆی کوشتنێکیڕابردوو (ضَمِنَهُ الْبائِعُ) فرۆشراوەکە دەبێتە زامینیو واجبە: پارەکە بگەڕێنێتەوە بۆ کڕیارەکە، ئەگەر کڕیارەکە ئەو هۆیەی نەزانیبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ باعَ) ئەگەر ئاژەڵێکی-یان شتێکیتری- فرۆشت (بِشَرْطِ بَراءَتِهِ مِنَ الْعُيُوبِ) بەو مەرجەی فرۆشیارەکە بەری بێو بەرپرسیار نەبێ لە عەیبەکانی فرۆشراوەکە، یان بڵێ: فرۆشراوەکە هیچ عەیبێکی نیە. یان بڵێ بە هەموو عەیبێکەوە دەیفرۆشمە تۆ. ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ يَبْرَأُ) فرۆشیارەکە بەری دەبێو بەرپرسیار نابێ (عَنْ كُلِّ عَيْبٍ باطِنٍ بِالْحَيَوانِ) لە گشت عەیبێکینادیار کە ئاژەڵەکە هەیبێ، بەو مەرجەی (لَمْ يَعْلَمْهُ) فرۆشیارەکە ئەو عەیبەی نەزانیبێ.

(دُونَ غَيْرِهِ) بەڵام لە عەیبەکانی ئاشکرای ئاژەڵ بەری نابێ، هەروەها لە عەیبەکانی شتیتری-جگە لە ئاژەڵیش- بەری نابێ، جا ئاشکرا بێ، یان نادیار بێ.

وَلَهُ مَعَ هَذَا الشَّرْطِ اَلرَّدُّ بِعَيْبٍ حَدَثَ قَبْلَ الْقَبْضِ، وَلَوْ شَرَطَ الْبَراءَةَ عَمَّا يَحْدُثُ لَمْ يَصِحَّ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ هَلَكَ الْمَبِيعُ عِنْدَ الْمُشْتَرِي أَوْ أَعْتَقَهُ ثُمَّ عَلِمَ الْعَيْبَ رَجَعَ بِالأَرْشِ: وَهُوَ جُزْءٌ مِنْ ثَمَنِهِ نِسْبَتُهُ إِلَيْهِ نِسْبَةُ ما نَقَصَ الْعَيْبُ مِنَ الْقِيمَةِ لَوْ كانَ سَلِيماً، وَالأَصَحُّ إِعْتِبارُ أَقَلِّ قِيَمِهِ مِنْ يَوْمِ الْبَيْعِ إِلَى الْقَبْضِ، وَلَوْ تَلِفَ الثَّمَنُ دُونَ الْمَبِيعِ رَدَّهُ وَأَخَذَ مِثْلَ الثَّمَنِ أَوْ قِيمَتَهُ،

---

(وَلَهُ) بۆ کڕیارەکە دروستە -(مَعَ هَذَا الشَّرْطِ) لەگەڵ ئەو مەرجەی ڕابردووش- (اَلرَّدُّ بِعَيْبٍ) فرۆشراوەکە بگەڕێنێتەوە بە هۆی عەیبێکی وەها: کە (حَدَثَ قَبْلَ الْقَبْضِ) پێش وەرگرتنی فرۆشراوەکە پەیدا بوبێ.

(وَلَوْ شَرَطَ الْبَراءَةَ) ئەگەر بە مەرجی دانا: فرۆشیارەکە بەری بێ (عَمَّا يَحْدُثُ) لەو عەیبەی لەمەودوا -پێش وەرگرتن- پەیدا دەبێ (لَمْ يَصِحَّ) ئەو مەرجە دروست نیە، بەڵام فرۆشتنەکە دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ هَلَكَ الْمَبِيعُ عِنْدَ الْمُشْتَرِي) ئەگەر کڕیارەکە فرۆشراوەکەی وەرگرتو لە لای خۆی لەناو چوو (أَوْ أَعْتَقَهُ) یان کۆیلەکەی ئازاد کرد (ثُمَّ عَلِمَ الْعَيْبَ) ئینجا لە دوای لەناوچوون و ئازادکردن زانی عەیبێکی هەبوە (رَجَعَ بِالأَرْشِ) کڕیارەکە دەگەڕێتەوە سەر فرۆشیارەکە بۆ ئەوەی تۆڵەی عەیبەکەی لێوەربگرێ، چونکە لەو حاڵەتەدا ناتوانێ فرۆشراوەکە بگەڕێنێتەوە (وَهُوَ) تۆڵەی عەیبەکە (جُزْءٌ مِنْ ثَمَنِهِ) بەشێکە لە پارەی فرۆشراوەکە (نِسْبَتُهُ إِلَيْهِ) نیسبەتی ئەم بەشە بۆ پارەکە (نِسْبَةُ ما نَقَصَ الْعَيْبُ مِنَ الْقِيمَةِ) وەك نیسبەتی ئەو بەشەیە کە عەیبەکە لە نرخی فرۆشراوەکەی کەم کردۆتەوە (لَوْ كانَ سَلِيماً) ئەگەر فرۆشراوەکە بە سەلامەتی بماباوە:

بۆ وێنە: ئەگەر بە بێ عەیب نرخی سەد دینار بێ، بە عەیبەوە نرخی هەشتا دینار بێ، ئەوە نیسبەتی کەمبوونەوە -بە هۆی عەیبەکە- پێنجیەکی نرخەکەیە، کەوابو: پێنجیەکی پارەکەی لە تۆڵەی عەیبەکە دەدرێ.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (إِعْتِبارُ أَقَلِّ قِيَمِهِ) کەمترین نرخەکانی فرۆشراوەکە -بۆ قرساندن- ڕەچاو دەکرێ (مِنْ يَوْمِ الْبَيْعِ) لە ڕۆژی کڕینیەوە (إِلَى الْقَبْضِ) تا کاتی وەرگرتنی.

(وَلَوْ تَلِفَ الثَّمَنُ) ئەگەر پارەکە فەوتابو (دُونَ الْمَبِيعِ) بەڵام فرۆشراوەکە نەفەوتابو و عەیبێکی کۆنی لێ ئاشکرا بوو (رَدَّهُ) ئەوە فرۆشراوەکە دەگەڕێنێتەوە (وَأَخَذَ مِثْلَ الثَّمَنِ) وێنەی پارەکەی لە فرۆشیارەکە وەردەگرێتەوە ئەگەر وێنەی هەبێ (أَوْ قِيمَتَهُ) یان نرخی پارەکەی لێوەردەگرێتەوە، ئەگەر دەقرسێندرا.

وَلَوْ عَلِمَ الْعَيْبَ بَعْدَ زَوالِ مِلْكِه إِلَىٰ غَيْرِه فَلاَ أَرْشَ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ عَادَ الْمِلْكُ فَلَهُ الرَّدُّ، وَقِيلَ إِنْ عادَ بِغَيْرِ الرَّدِّ بِعَيْبٍ فَلاَ رَدَّ، وَالرَّدُّ عَلَى الْفَوْرِ فَلْيُبادِرْ عَلَى الْعادَةِ، فَلَوْ عَلِمَهُ وَهُوَ يُصَلِّي أَوْ يَأْكُلُ فَلَهُ تَأْخِيرُهُ حَتَّى يَفْرُغَ، أَوْ لَيْلاً فَحَتَّى يُصْبِحَ، فَإِنْ كانَ الْبائِعُ بِالْبَلَدِ رَدَّهُ عَلَيْهِ بِنَفْسِه أَوْ وَكِيلِه أَوْ عَلَى وَكِيلِه، وَلَوْ تَرَكَهُ

---

(وَلَوْ عَلِمَ الْعَيْبَ) ئەگەر كڕيارەكە زانی فرۆشراوەكە عەیبێكی كۆنی هەبوە، بەلام (بَعْدَ زَوالِ مِلْكِه) پاش ئەوەی فرۆشراوەكە لە ملكایەتی وی دەرچوبو (إِلَىٰ غَيْرِه) بۆ ملكایەتی كەسێكی‌تر، ئەوە (فَلاَ أَرْشَ) كڕیارەكە تۆڵەی عەیبەكەی نادرێتێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام (فَإِنْ عادَ الْمِلْكُ) ئەگەر ملكایەتیەكەی بۆ گەڕاوە، واتە: فرۆشراوەكەی دووبارە كڕیەوە، یان پێی بەخشرا، یان بە میرات بۆی هاتەوە، یان بە هۆی عەیبەكۆنەكە گەڕاندرایەوە (فَلَهُ الرَّدُّ) ئەو كاتە بۆی دروستە –بە هۆی عەیبە كۆنەكە– بیگەڕێنێتەوە سەر فرۆشیارەكە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إِنْ عادَ) ئەگەر فرۆشراوەكە گەڕابۆوە، بەلام (بِغَيْرِ الرَّدِّ بِعَيْبٍ) بە هۆیەكی‌تری جگە لە گەڕاندنەوەی عەیبداری (فَلاَ رَدَّ) ئەو كاتە ئەویش گەڕاندنەوەی بۆ نیە.

(وَالرَّدُّ عَلَى الْفَوْرِ) گەڕاندنەوەی فرۆشراوی‌عەیبدار دەبێ دەمودەست بێ، واتە: هەر كاتێك عەیبە كۆنەكەی دەركەوت، نابێ گەڕاندنەوەكەی دوا بخا، كەواتە: ئەگەر بە بێ‌عوزر دوای خست مافی گەڕاندنەوەكەی نامێنێ، مەگەر نەزان بێ‌و سوێند بخوا: كە نەیزانیوە پێویستە گەڕاندنەوە دەمودەست بێ. ئەو كاتە مافی دەمێنێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە، كەوابو: (فَلْيُبادِرْ عَلَى الْعادَةِ) با پەلە بكا لە گەڕاندنەوەی فرۆشراوەكە بە گوێرەی عادەت (فَلَوْ عَلِمَهُ وَهُوَ يُصَلِّي) ئەگەر بە عەیبەكەی زانی لەو حاڵەتەی نوێژی دەكرد (أَوْ يَأْكُلُ) یان شتێكی دەخوارد (فَلَهُ تَأْخِيرُهُ) بۆی هەیە گەڕاندنەوەكەی دوا بخا (حَتَّى يَفْرُغَ) تا لە نوێژەكە، یان لە خواردنەكە دەبێتەوە.

(أَوْ لَيْلاً) یان لە شەوێدا زانی فرۆشراوەكە عەیبدارە (فَحَتَّى يُصْبِحَ) ئەوەش بۆی هەیە گەڕاندنەوەكە دوا بخا تا دەبێتە ڕۆژ، بەلام ئەگەر دەگونجا لە شەوێدا بیگەڕێنێتەوە –چونكە لە شوێنی‌فرۆشیارەكە نزیك بوو– ئەو كاتەش واجبە: دەمودەست بیگەڕێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ كانَ الْبائِعُ بِالْبَلَدِ) جا ئەگەر فرۆشیارەكەش لە هەمان شوێنی كڕیارەكەدا بوو، ئەوە (رَدَّهُ عَلَيْهِ بِنَفْسِه) هەر بەخۆی ماڵەعەیبدارەكە دەگەڕێنێتەوە سەر فرۆشیارەكە (أَوْ وَكِيلِه) یان بە وەكیلێكی خۆیدا بۆی دەگەڕێنێتەوە (أَوْ عَلَى وَكِيلِه) یان دەیگەڕێنێتەوە سەر وەكیلی‌فرۆشیارەكە، بەلام (وَلَوْ تَرَكَهُ) ئەگەر –لە سەرەتاوە– وازی لە فرۆشیارەكە

وَرَفَعَ الأَمْرَ إِلَى الحاكِمِ فَهُوَ آكَدُ، وَإِنْ كانَ غائِباً رَفَعَ إِلَى الحاكِمِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَلْزَمُهُ الإِشْهادُ عَلَى الفَسْخِ إِنْ أَمْكَنَهُ حَتَّى يُنْهِيَهُ إِلَى البائِعِ أَوِالحاكِمِ، فَإِنْ عَجَزَ عَنِ الإِشْهادِ لَمْ يَلْزَمْهُ التَّلَفُّظُ بِالفَسْخِ فِي الأَصَحِّ،

---

هێناو (وَرَفَعَ الأَمْرَ إِلَى الحاكِمِ) یەكسەر كاروبارەكەی بەرز كردەوە بۆ دادوەری شارەكە (فَهُوَ آكَدُ) ئەوە باشترە.

(وَ) هەروەها (إِنْ كانَ غائِباً) ئەگەر فرۆشیارەكە لە شوێنیكڕیارەكەدا نەبو، هیچ وەكیلیشی لەوێ نەبو، ئەو كاتەش (رَفَعَ إِلَى الحاكِمِ) یەكسەر كاروبارەكە بەرز دەكاتەوە بۆ دادوەریشوێنەكەو دەڵێ: ئەم شتەم لە فلانكەس كڕیوە بە ئەوەندە پارەیە، ئێستاش عەیبێكیكۆنی لێدەركەوتوە، بۆیێ فرۆشتنەكەم هەڵوەشاندەوە. ئینجا دەبێ دوو شاهیدیش ئەو شاهیدییە بدەنو سوێندیش بخوا، ئینجا دادوەر بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی بۆ دەداو ماڵە فرۆشراوەكەی لێوەردەگرێو لە لای دادپەروەرێك دایدەنێ، پارەكەش بە قەرز لە سەر فرۆشیارەكە دەمێنێتەوە، جا ئەگەر فرۆشیارەكە ماڵی لەو شارەدا هەبێ، ئەوە دادوەر پارەیكڕیارەكە لەو ماڵە دەداتەوە، ئەگەر نا: ماڵە عەیبدارەكە دەفرۆشێو پارەیكڕیارەكەی لێدەداتەوە، كەوابو: نابێ گەڕاندنەوەكە دوا بخا تا فرۆشیارەكە ئامادە دەبێ، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە (أَنَّهُ يَلْزَمُهُ الإِشْهادُ عَلَى الفَسْخِ) كڕیارەكە لە سەری واجبە: دوو شاهید بگرێ لە سەر هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتەكە، یان شاهیدێك بگرێ تاكو سوێندیش بخوا (إِنْ أَمْكَنَهُ) ئەگەر شاهیدگرتنەكەی بۆ بگونجێ، جا هەر كاتێك لە لای دوو شاهید، یان لە لای شاهیدێك مامڵەتەكەی هەڵوەشاندەوە، پێویست ناكا پەلە بكا لە گەڕاندنەوەی ماڵەعەیبدارەكە، چونكە بە هۆی هەڵوەشاندنەوە ماڵەكە دەبێتەوە ملكی فرۆشیارەكە، كەوابو: لەو حاڵەتەدا بۆی دروستە: خۆی گیر بكاو پاش ماوەیەك ماڵەكە بگەڕێنێتەوە (حَتَّى يُنْهِيَهُ إِلَى البائِعِ أَوِالحاكِمِ) تا بیداتەوە دەست فرۆشیارەكە، یان دادوەرەكە تاكو كێشەكە ببڕێتەوە.

ئینجا بزانە: لەو شاهیدگرتنەدا جیاوازی نیە: كڕیارەكە بتوانێ بە خۆی ماڵەكە بگەڕێنێتەوە، یان نەتوانێ: بە هۆی نەخۆشی، یان ترسیدوژمن، یان دووریی فرۆشیارەكە، كە لەو سێ حاڵەتانەدا وەكیلیشی دەست نەكەوێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(فَإِنْ عَجَزَ عَنِ الإِشْهادِ) جا ئەگەر توانای شاهیدگرتنی نەبو (لَمْ يَلْزَمْهُ التَّلَفُّظُ بِالفَسْخِ) واجب نیە بە زوبان بڵێ: مامڵەتەكەم هەڵوەشاندەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵكو هەر كاتێك فرۆشراوەكەی گەیاندە لای فرۆشیارەكە، یان لای

وَيُشْتَرَطُ تَرْكُ الإِسْتِعْمالِ: فَلَوْ اسْتَخْدَمَ الْعَبْدَ أَوْ تَرَكَ عَلَى الدَّابَّةِ سَرْجَها أَوْ إِكافَها بَطَلَ حَقُّهُ، وَيُعْذَرُ فِي رُكُوبِ جَمُوحٍ يَعْسُرُ سَوْقُها وَقَوْدُها، وَإِذا سَقَطَ رَدُّهُ بِتَقْصِيرٍ فَلاَ أَرْشَ، وَلَوْ حَدَثَ عِنْدَهُ عَيْبٌ سَقَطَ الرَّدُّ قَهْراً: ثُمَّ إِنْ رَضِيَ بِهِ الْبائِعُ رَدَّهُ الْمُشْتَرِي أَوْ قَنِعَ بِهِ، وَإِلاَّ فَلْيَضُمَّ الْمُشْتَرِي أَرْشَ الْحادِثِ إِلَى الْمَبِيعِ وَيَرُدَّ، أَوْ يَغْرَمُ الْبائِعُ أَرْشَ الْقَدِيمِ وَلاَ يَرُدُّ،

---

دادوەرەکە، ئەو کاتە بە زویان دەڵێ: مامڵەتەکەم هەڵوەشاندەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها بۆ دروستبوونی گەڕاندنەوە (يُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (تَرْكُ الإِسْتِعْمالِ) کڕیارەکە فرۆشراوەکە بەکار نەهێنێ لە دوای زانینی عەیبەکەی، کەوابو: (فَلَوْ اسْتَخْدَمَ الْعَبْدَ) ئەگەر کڕیارەکە داوای خزمەتی لە کۆیلە فرۆشراوەکە کرد (أَوْ تَرَكَ عَلَى الدَّابَّةِ سَرْجَها أَوْ إِكافَها) یان زین، یان کورتانی لە سەر پشتی وڵاغە فرۆشراوەکە هێشتەوە (بَطَلَ حَقُّهُ) مافی گەڕاندنەوەی نامێنێ، بەڵام ئەگەر لادانیکورتان زیانی بە وڵاغەکە دەگەیاند، یان نەیدەزانی بە هۆی هێشتنەوەیکورتان مافی نامێنێ، ئەو کاتە زیانی نیەو مافی دەمێنێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (يُعْذَرُ) عوزری دەدرێتێو مافی دەمێنێ (فِي رُكُوبِ جَمُوحٍ) لە سواربوونی وڵاغێکی شەموس: کە (يَعْسُرُ سَوْقُها وَقَوْدُها) لێخوڕینو ڕاکێشانی زەحمەت بێ، هەروەها ئەگەر لە ڕێگادا عەیبی جڵوبەرگەکەی زانی، ئەو کاتەش مەرج نیە لە ڕێگادا دایبکەنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَإِذا سَقَطَ رَدُّهُ بِتَقْصِيرٍ) هەر کاتێك کڕیارەکە مافی گەڕاندنەوەی نەما بە هۆی کەمتەرخەمیەکی خۆی (فَلاَ أَرْشَ) تۆڵەی عەیبەکەشی نادرێتێ.

(وَلَوْ حَدَثَ عِنْدَهُ عَيْبٌ) ئەگەر –فرۆشراوەکە– لە لای کڕیارەکە عەیبێکی تازەی لێ پەیدا بوو، ئینجا عەیبەکۆنەکەشی لێدەرکەوت، ئەوا (سَقَطَ الرَّدُّ قَهْراً) مافی گەڕاندنەوەی زاڵبوونی نامێنێ (ثُمَّ) ئینجا کە مافی گەڕاندنەوەی نەما، تەماشا دەکەین: (إِنْ رَضِيَ بِهِ الْبائِعُ) ئەگەر فرۆشیارەکە ڕازی بوو فرۆشراوەکەی بە عەیبە تازەکەوە بدرێتەوە، ئەوە (رَدَّهُ الْمُشْتَرِي) کڕیارەکە فرۆشراوەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوە (أَوْ قَنِعَ بِهِ) یان هەر کڕیارەکە –بە بێتۆڵە– بە فرۆشراوەکە ڕازی دەبێو قەناعەتی پێدەکا.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر فرۆشیارەکە ڕازی نەبو–لە بەر عەیبە تازەکە– فرۆشراوەکەی وەرنەگرتەوە (فَلْيَضُمَّ الْمُشْتَرِي أَرْشَ الْحادِثِ إِلَى الْمَبِيعِ) با کڕیارەکە تۆڵەی عەیبە تازەکە وەگەڵ فرۆشراوەکە بنێو (وَيَرُدَّ) بە تۆڵەوە بیگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیارەکە (أَوْ يَغْرَمُ الْبائِعُ أَرْشَ الْقَدِيمِ) یان با فرۆشیارەکە تۆڵەی عەیبە کۆنەکە بداتە کڕیارەکەو (وَلاَ يَرُدُّ) کڕیارەکە فرۆشراوەکەی بۆ نەگەڕێنێتەوە.

فَإنْ إتَّفَقَا عَلَىأَحَدِهِما فَذَاكَ، وَإلاَّ فَالأَصَحُّ إجابَةُ مَنْ طَلَبَ الإمْسَاكَ، وَيَجِبُ أَنْ يُعْلِمَ الْمُشْتَرِى الْبَائِعَ عَلَىالْفَوْرِ بِالْحادثِ لِيَخْتارَ، فَإِنْ أَخَّرَ إعْلاَمَهُ بِلاَ عُذْرٍ فَلاَ رَدَّ وَلاَ أَرْشَ، وَلَوْ حَدَثَ عَيْبٌ لاَ يُعْرَفُ الْقَدِيمُ إلاَّ بِه كَكَسْرِ بَيْضٍ وَرَانِجٍ وَتَقْوِيرِ بَطِّيخٍ مُدَوِّدٍ رَدَّ وَلاَ أَرْشَ عَلَيْه فِي الأَظْهَرِ، فَإِنْ أَمْكَنَ مَعْرِفَةُ الْقَدِيمِ بِأَقَلَّ مِمَّا أَحْدَثَهُ فَكَسائِرِ الْعُيُوبِ الْحادِثَةِ.

(فَرْعٌ) إشْتَرَى عَبْدَيْنِ مَعِيبَيْنِ صَفْقَةً رَدَّهُما،

---

(فَإنْ إتَّفَقَا عَلَىأَحَدِهِمَا) جا ئەگەر هەردووكيان لە سەر يەكێك لەو دوو ڕێگايەىڕابردوو ڕێك كەوتن (فَذَاكَ) ئەوە ديارە (وَإلاَّ) بەلام ئەگەر ڕێك نەكەوتن (فَالأَصَحُّ) فەرموودەى ڕاستتر (إجابَةُ مَنْ طَلَبَ الإمْسَاكَ) وەلامى ئەوەيان دەدرێتەوە كە داواى مانەوەى فرۆشراوەكەو تۆڵەى عەيبە كۆنەكە دەكا: جا كڕيارەكە بێ، يان فرۆشيارەكە بێ.

(وَيَجِبُ أَنْ يُعْلِمَ الْمُشْتَرِى الْبائِعَ عَلَىالْفَوْرِ) واجبە: كڕيارەكە–بە پەلە– فرۆشيارەكە ئاگادار بكاتەوە (بِالْحادِثِ) بە پەيدابوونى عەيبە تازەكە (لِيَخْتارَ) تاكو ڕێگايەك–لەو دووانەى ڕابردوو– هەڵبژێرێ (فَإِنْ أَخَّرَ إعْلاَمَهُ بِلاَعُذْرٍ) جا ئەگەر–بە بێعوزر– ئاگاداركردنەوەكەيى دواخست ئەو كاتە (فَلاَرَدَّ وَلاَأَرْشَ) نە مافىگەڕاندنەوەى هەيەو نە مافىتۆڵەى هەيە، بەلام ئەگەر عوزرى هەبێ: وەك نەزانێ پەلەكردن واجبە، ئەو كاتە بە سوێند باوەڕى پێ دەكرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَلَوْ حَدَثَ عَيْبٌ) ئەگەر عەيبێكى وەها لە فرۆشراوەكە پەيدا بو: كە (لاَ يُعْرَفُ الْقَدِيمُ إلاَّ بِه) عەيبە كۆنەكە نەدەزاندرا تەنها بەو عەيبە تازەيە نەبێ (كَكَسْرِ بَيْضٍ) وەكو شكاندنى هێلكەى نەعامەو (وَرَانِجٍ) شكاندنى گوێزىهيندىو (وَتَقْوِيرِ بَطِّيخٍ مُدَوِّدٍ) كونكردنى گندۆرەى كرمىبوو، يان هەنارى ڕزيو، يان گوێزى پووچەڵ، هەر يەكێك لەوانە (رَدَّ) دەگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشيارەكەو (وَلاَ أَرْشَ عَلَيْه) تۆڵەى عەيبە تازەكەشى لە سەر نيە (فِى الأَظْهَرِ) لە فەرموودەى بەهێزتردا، بەلام (فَإِنْ أَمْكَنَ مَعْرِفَةُ الْقَدِيمِ) ئەگەر دەگونجا عەيبە كۆنەكە بزاندرێ (بِأَقَلَّ مِمَّا أَحْدَثَهُ) بە كەمتر لەو عەيبە تازەى كڕيارەكە پەيداى كردوە، ئەوەش (فَكَسائِرِ الْعُيُوبِ الْحادِثَةِ) وەك عەيبە تازەكانىترە: كە ڕابران.

﴿ ئاگادارى ﴾: ئەگەر ژمارەيەك هێلكە، يان گندۆرەى كڕىو يەكێكيانى شكاندو دەركەوت عەيبدارە، ئەوە مافى هەيە گشتيان بگەڕێنێتەوە، كەوابو: دروست نيە زياتر بشكێنێ، واتە: ئەگەر لەو عەيبدارە زياترى شكاند، ئەو كاتە مافى گەڕاندنەوەى نامێنێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموويانە.

﴿ فَرْعٌ ﴾ لقێك لەم باسە (إشْتَرَى عَبْدَيْنِ) هەر كاتێك دوو كۆيلەى كڕين (مَعِيبَيْنِ) هەردووكيان عەيبدار بون (صَفْقَةً) كڕينەكەش بە يەك مامڵەت بوو (رَدَّهُما) با هەردووكيان

وَلَوْ ظَهَرَ عَيْبُ أَحَدهما رَدَّهُما لاَالْمَعيبَ وَحْدَهُ فِي الأَظْهَر، وَلَو اشْتَرَى عَبْدَ رَجُلَيْنِ مَعيباً فَلَهُ رَدُّ نَصيب أَحَدهما، وَلَوْ اشْتَرَياهُ فَلأَحدهما الرَّدُّ في الأَظْهَر، وَلَو اخْتَلَفا فِي قِدَمِ الْعَيْبِ صُدِّقَ الْبائعُ بِيَمينه عَلَى حَسَب جَوابه، وَالزِّيادَةُ الْمُتَّصِلَةُ كَالسِّمَنِ

---

بگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیارەکە، ئەگەر حەز دەکا (وَلَوْ ظَهَرَ عَيْبُ أَحَدِهِما) ئەگەر تەنها عەیبی یەکێکیان دەرکەوت، ئەو کاتەش (رَدَّهُما) هەردووکیان دەگەڕێنێتەوە، ئەگەر حەز دەکا (لاَ الْمَعِيبَ وَحْدَهُ) نەك تەنها عەیبدارەکە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام ئەگەر فرۆشیارەکە ڕازی بێ: تەنها عەیبدارەکەی بدرێتەوە، ئەو کاتە دروستە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: هەر دوو شتێکی -بە یەك مامڵەت- بیانکڕێو یەکێکیان، یان هەردووکیان عەیبدار بن، بەو ڕوونکردنەوەیڕابردوو ڕەفتار دەکرێ، جیاوازی نیە: سودی ئەو دوو شتە بە یەکەوە بەسترابێ: وەکو جووتێك گۆرەوی، یان نەبەسترابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوِ اشْتَرَى عَبْدَ رَجُلَيْنِ) ئەگەر بە یەك مامڵەت کۆیلەیەك، یان شتێکیتری کڕی کە ملکی دوو کەسان -یان زیاتر- بوو (مَعِيباً) شتە کڕاوەکەش عەیبدار بوو (فَلَهُ رَدُّ نَصِيبِ أَحَدِهِما) بۆی دروستە: تەنها بەشی یەکێکیان بگەڕێنێتەوەو بەشی یەکێکیانیش بۆ خۆی بهێڵێتەوە، هەروەها ئەگەر بە یەك مامڵەت دوو شتی بە دوو نرخ لە یەکێك کڕین، ئەو کاتەش دروستە تەنها یەکێکیان بگەڕێنێتەوە، هەروەهاش (وَلَوْ اشْتَرَياهُ) ئەگەر دوو کەس کۆیلەیەك، یان شتێکیتریان لە یەك کەس کڕیو عەیبێکی لێدەرکەوت (فَلأَحَدِهِما الرَّدُّ) ئەو کاتەش دروستە: تەنها یەکێکیان بەشیخۆی بگەڕێنێتەوەو، ئەویتر بەشی خۆی بهێڵێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

## ﴿ کێشەی کڕیار و فرۆشیار لە عەیبی فرۆشراوەکەدا ﴾

(وَلَوْ اخْتَلَفا) ئەگەر کڕیارەکەو فرۆشیارەکە لێیان بووە کێشە (فِي قِدَمِ الْعَيْبِ) دەربارەی کۆنیعەیبەکەو پەیدابوونیعەیبەکە (صُدِّقَ الْبائِعُ) لەو کێشەیەدا باوەڕ بە فرۆشیارەکە دەکرێ (بِيَمِينِهِ) بەو مەرجەی سوێند بخوا، ئینجا سوێندخواردنەکەشی (عَلَى حَسَبِ جَوابِهِ) بەگوێرەی وەڵامدانەوەکەی دەبێ، واتە: ئەگەر لە وەڵامەکەیدا بڵێ: مافی گەڕاندنەوەی نیە، یان بڵێ: لە سەرم واجب نیە لێی وەریگرمەوە، هەر ئەوەهاش سوێند دەخواو داوای لێناکرێ: لە سوێندەکەیدا بڵێ: ئەو عەیبەی لێپەیدا بوە. یان بڵێ: عەیبەکە کۆن نیە.

(وَالزِّيادَةُ) ئەو زێدەبییەی -لە دوای مامڵەت بەستن- لە لای کڕیارەکە لە فرۆشراوە عەیبدارەکە پەیدا بوەو (الْمُتَّصِلَةُ) هەر بە فرۆشراوەکەوەیەو لێی جیا نابێتەوە (كَالسِّمَنِ)

تَتْبَعُ الأَصْلَ، وَالْمُنْفَصِلَةُ كَالْوَلَدِ وَالأُجْرَةِ لاَ تَمْنَعُ الرَّدَّ، وَهِيَ لِلْمُشْتَرِي إِنْ رَدَّ بَعْدَ الْقَبْضِ وَكَذَا قَبْلَهُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ بَاعَهَا حَامِلاً فَانْفَصَلَ رَدَّهُ مَعَهَا فِي الأَظْهَرِ، وَلاَ يَمْنَعُ الرَّدَّ الإِسْتِخْدَامُ

---

وەکو قەڵەوی‌و گەورەبوونی فرۆشراوەکە، ئەوە (تَتْبَعُ الأَصْلَ) لەگەڵ فرۆشراوەکەدا دەگەڕێندرێتەوە بۆ فرۆشیارەکەی، چونکە لێی جیا نابێتەوە.

هەروەها (وَالْمُنْفَصِلَةُ) ئەو زێدەییەی -لە دوای مامڵەت بەستن- لە فرۆشراوە عەیبدارەکە پەیدا بوەو لێی جیا بۆتەوە (كَالْوَلَدِ) وەکو بێچووی فرۆشراوەکەو (وَالأُجْرَةِ) کرێی فرۆشراوەکە، ئەگەر بە کرێی دابێ (لاَتَمْنَعُ الرَّدَّ) ئەو زێدەییانەش ڕێگەی گەڕاندنەوە ناگرن، واتە: ئەگەر عەیبێکی کۆنی لێدەرکەوت، خودی فرۆشراوەکە دەگەڕێنێتەوە، بەڵام (وَهِيَ) ئەو زێدەییە جیابووانەی -لە دوای مامڵەت بەستن- لە فرۆشراوەکە پەیدا بونە (لِلْمُشْتَرِي) هەمووی ملکی کڕیارەکەنە (إِنْ رَدَّ بَعْدَالْقَبْضِ) ئەگەر کڕیارەکە فرۆشراوەکە بگەڕێنێتەوە پاش ئەوەی وەریگرتبێ، چونکە لە حەدیسەکەی‌ڕابردوودا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ﴾ صححه الترمذي، بەرهەمی‌فرۆشراوەکە بۆ کڕیارەکەیە، چونکە لە زامینیی ئەوی‌دایە.

(وَكَذَا قَبْلَهُ) هەروەها زێدەییەکانی‌فرۆشراوەکە بۆ کڕیارەکەنە، ئەگەر پێش وەرگرتنیشی بیداتەوە فرۆشیارەکەی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو دەربارەی ئەو زێدەییە بوو: کە -لە دوای مامڵەت بەستن- لە لای کڕیارەکە لە فرۆشراوەکە پەیدا ببێ‌و لێی جیا ببێتەوە، بەڵام (وَلَوْ بَاعَهَا حَامِلاً) ئەگەر ئاژەڵێکی ئاوسی فرۆشت‌و عەیبێکی کۆنی لێدەرکەوت‌و ویستی بیگەڕێنێتەوە (فَانْفَصَلَ) ئینجا لە لای کڕیارەکە بێچووەکەی لێ جیا بۆوە (رَدَّهُ مَعَهَا) دەبێ بێچووەکەش لەگەڵ دایکەکەی بگەڕێنێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە دەزاندرێ لە لای فرۆشیارەکە ئەو بێچووەی تێدا بووەو بەشێکی پارەکەش لە بەرانبەری دادەندرێ، کەوابو: ئەگەر بێچووەکەی لێ جیا نەبۆوەو عەیبی لێ‌پەیدا بو، ئەو کاتە بە ئاوسی دەیگەڕێنێتەوە.

هەروەها ئەو خوری‌و مووەی لە کاتی فرۆشتندا بە ئاژەڵەوەیە، ئەویش لەگەڵ ئاژەڵە عەیبدارەکە دەگەڕێنێتەوە، هەرچەند لێیشی جیا کرابێتەوە، هەروەها بەری درەختیش -ئەگەر لە کاتی‌فرۆشتندا دەرکەوتبێ- ئەویش لەگەڵ درەختە عەیبدارەکە دەگەڕێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراوەتەوە.

(وَلاَ يَمْنَعُ الرَّدَّ الإِسْتِخْدَامُ) بەکارهێنانی فرۆشراوەکە ڕێگەی گەڕاندنەوەی ناگرێ بە (إجماع)و حەدیسەکەی‌ڕابردوو. بەو مەرجەی لە حاڵەتی بەکارهێناندا بە عەیبەکەی

وَوَطْءُ الثَّيِّبِ، وَإقْتِضَاضُ الْبِكْرِ بَعْدَ الْقَبْضِ نَقْصٌ حَدَثَ، وَقَبْلَهُ جِنايَةٌ عَلَى الْمَبِيعِ قَبْلَ الْقَبْضِ.
(فَصْلٌ) اَلتَّصْرِيَةُ حَرامٌ تُثْبِتُ الْخِيارَ عَلَى الْفَوْرِ، وَقِيلَ يَمْتَدُّ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ رَدَّ بَعْدَ تَلَفِ اللَّبَنِ رَدَّ مَعَها صاعَ تَمْرٍ، وَقِيلَ يَكْفِي صاعُ قُوتٍ، والأَصَحُّ أَنَّ الصّاعَ لاَ يَخْتَلِفُ بِكَثْرَةِ اللَّبَنِ، وَأَنَّ خِيارَها لاَ يَخْتَصُّ بِالنَّعَمِ بَلْ يَعُمُّ كُلَّ مَأْكُولٍ وَالْجارِيَةَ

---

نەزانيبێ (وَوَطْءُ الثَّيِّبِ) هەروەهاش جيماع لەگەڵكردنی (جاريـة)ی بێـوەژن، بـەڵام (وَإِقْتِضاضُ الْبِكْرِ) لابردنی كچێنی (جاريـة)یفرۆشـرلو (بَعْدَالْقَبْضِ) پـاش وەرگرتنی (نَقْصٌ حَدَثَ) ناتـەواویو عەيبێكە پەيدا بوەو ڕێگەی گەڕاندنـەوەی بـە زاڵبوون دەگرێ (وَقَبْلَهُ) پێش وەرگرتنیكۆيلەكەش (جِنايَةٌ عَلَى الْمَبِيعِ) دەستدرێژيەكە بۆ سەر فرۆشراوەكە (قَبْلَ الْقَبْضِ) پێش وەرگرتنی، واتە: ئەگەر كڕيارەكە لايبردبێ مافی گەڕاندنەوەی نامێنێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئاژەڵی نەدۆشراو و فريودانیكڕيارەكە ﴾

(اَلتَّصْرِيَةُ) ڕاگرتنی شير لـە گوانی ئاژەڵدا، تـاكو كڕيارەكـە وا تێبگـا شـيری زۆرە (حَرامٌ) حەرامە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿لاَ تُصَرُّوا الإِبِلَ وَالْغَنَمَ، فَمَنِ ابْتاعَها بَعْدُ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَها: إِنْ شاءَ أَمْسَكَ وَإِنْ شاءَ رَدَّها وَصاعاً مِنْ تَمْرٍ﴾ رواه الشيخان، شير لە ناو گوانی ووشترو كارەگەڵدا ڕامەگرن–تا فـێڵ لـە كڕيـار بكـەن– جـا هـەر كەسێك ئاژەڵێكی نەدۆشراوی ئەوەهای كڕی، ئـەوە لـە دوای دۆشـينی بـا يـەكێك لـەم دوو ڕێگايانـە هەڵبژێرێ: ئەگەر حەز دەكا با بۆخۆی بيهێڵێتەوە، ئەگەر حـەزيش دەكـا بـا بيگەڕێنێتـەوە لەگەڵ ساعە قەسپێك لە تۆڵەی شيرەكە.
كـەوابو: (تُثْبِتُ الْخِيـارَ عَلَى الْفَـوْرِ) ئـەو ڕاگرتنـە مـافی پەشـيمانی دەداتـە كڕيارەكـە: كـە دەمودەست–بێدواخستن– بيگەڕێنێتەوە (وَقِيـلَ) لـە فەرموودەيـەكی بێهێزدا (يَمْتَدُّ ثَلاثَةَ أَيّـامٍ) مـاوەی پەشيمانی تـا سێ ڕۆژان درێـژ دەبێتـەوە، چـونكە لـە حەديسێكی(مسلم)دا هـاتوە، بۆيـێ زۆربـەی زانايـان ئـەم بێهێزەيـان بـە بـەهێز دانـاوە (فَـإِنْ رَدَّ) جـا ئەگـەر ئاژەڵەكەی گەڕاندەوە (بَعْدَ تَلَفِ اللَّبَنِ) پاش ئەوەی شيرە دۆشراوەكە نـەما (رَدَّ مَعَها صاعَ تَمْرٍ) دەبی ساعێكیقەسپ لەگەڵی بگەڕێنێتەوە (وَقِيلَ يَكْفِي صاعُ قُوتٍ) لـە فەرموودەيـەكی بێهێزدا: ساعێكی هەر ئازووقەيەك بێ، بەسەو دروستە.
(والأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستر (أَنَّ الصّاعَ لاَ يَخْتَلِفُ) سـاعی قەسـپ نـاگۆڕێ (بِكَثْـرَةِ اللَّبَنِ) بـە هـۆی زۆریو كـەمیی شيرە دۆشـراوەكە (وَأَنَّ خِيارَهـا) هـەم پەشـيمانیی ئـەو شـير ڕاگرتنـە (لاَ يَخْـتَصُّ بِـالنَّعَمِ) تايبـەت نيـە بـە ووشـترو مـەڕو بـزنو ڕەشـە وولاغ (بَـلْ يَعُـمُّ كُلَّ مَـأْكُولٍ) بەڵكو گـشت ئاژەڵێكی گۆشت خـوراو دەگرێتەوە (وَالْـجَارِيَةَ) هـەم (جارية)و

وَالأَتانَ، وَلاَ يَرُدُّ مَعَهُما شَيْئاً، وَفِيالْجارِيَةِ وَجْهٌ، وَحَبْسُ ماءِ الْقَناةِ وَالرَّحا الْمُرْسَلِ عِنْدَ الْبَيْعِ وَتَحْمِيرُ الْوَجْهِ وَتَسْوِيدُ الشَّعَرِ وَتَجْعِيدُهُ يُثْبِتُ الْخِيارَ، لاَ لَطْخُ ثَوْبِهِ تَخْيِيلاً لِكتابَتِه فِي الأَصَحِّ.

---

(وَالأَتانَ) ماكەریش دەگرێتەوە، بەلام (وَلاَ يَرُدُّ مَعَهُما شَيْئاً) لەگەڵ گەڕاندنەوەی (جارية)و ماكەرەكەدا هیچ شتێك لە تۆڵەی شیرەكە ناگەڕێنێتەوە (وَفِيالْجارِيَةِ وَجْهٌ) بەلام لە بارەی (جارية) فەرموودەیەك هەیە: كە تۆڵەی شیرەكەش دەگەڕێنێتەوە، چونكە ئەوەیان وەكو شیری ماكەر پیس نیە.

(وَحَبْسُ ماءِالْقَناةِ) ڕاگرتنی ئاوی كارێزو جۆگەو (وَالرَّحا) ڕاگرتنی ئاوی ئاش (الْمُرْسَلِ عِنْدَ الْبَيْعِ) كە ئاوی هەر یەكێك لەو دووانە لە كاتیفرۆشتندا بەر بدرێ، تاكو كڕیارەكە وا تێبگا ئاوەكە زۆرە (وَتَحْمِيرُالْوَجْهِ) سوورکردنی ڕووی كۆیلەو (وَتَسْوِيدُالشَّعَرِ) ڕەشكردنی مووی كۆیلەو (وَتَجْعِيدُهُ) ڕێكخستنی مووی كۆیلە، ئەوانە گشتی حەرامنو (يُثْبِتُ الْخِيارَ) هەر یەكەیان مافی پەشیمانی دەداتە كڕیارەكە، بە قیاس لە سەر ئاژەڵی نەدۆشراو (لاَ لَطْخُ ثَوْبِهِ) بەلام ڕەنگكردنی جلەكانی كۆیلە بە مەرەكەب (تَخْيِيلاً لِكتابَتِهِ) تاكو كڕیارەكە وا تێبگا نووسەرە، ئینجا نووسەریش نەبێ، ئەوە مافی پەشیمانیی نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە دەیتوانی تاقیی بكاتەوە ئینجا بیكڕێ.

### ﴿ پاشكۆ: لە باسی چاوپۆشی لە پەشیمانو، ئەركی گەڕاندنەوەی فرۆشراو ﴾

١-هەر كەسێك لە كڕینو فرۆشتنەكەی پەشیمان بۆوە، بەلام بە شەرع مافی پەشیمانیی نەبو، ئەوە بۆ لایەنەكەیتر سوننەتە: چاوپۆشیی لێبكاو پەشیمانبوونەوەكەی لێ قبوڵ بكا، چونكە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿مَنْ أَقالَ مُسْلِماً بَيْعَتَهُ أَقالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ﴾ رواه أبوداود وصححهابن حبان، هەر كەسێك چاوپۆشی پەشیمانیمامڵەت لە موسوڵمانێك بكا، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت چاوپۆشیی لێدەكا.

ئینجا بزانە: ئەو چاوپۆشییە لە شەرعدا پێی دەگوترێ: (الإقالة)، واتە: لابردنیمامڵەت، جا ئەم لابردنە بە (فَسْخ): هەڵوەشاندەوە دادەنرێو مەرجە: كڕیارەكەو فرۆشیارەكە هەردووكیان ئامادە بنو لە یەكتری قبوڵ بكەن، وەك بڵێن: ئەو مامڵەتەمان هەڵوەشاندەوە. یان بڵێ: ئەوە چاوپۆشی ئەم مامڵەتەم لێكردی. ئەویش بڵێ: قبوڵم كرد. هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا ئەو مەسەلەیە ڕوون كراوەتەوە.

٢-هەر كاتێك مامڵەتەكە هەڵوەشێندراوە: جا بە هۆی عەیبداری، یان بە هۆیەكیتر، ئەوە ئەركی گەڕاندنەوەی فرۆشراوەكە-بۆ فرۆشیارەكە- تا ئەو شوێنەی لێیەوە وەرگیراوە، لە سەر كڕیارەكەیە، ئەركی گەڕاندنەوەی پارەكەش-بۆ كڕیارەكە- تا ئەو

(بابٌ)

اَلْمَبِيعُ قَبْلَ قَبْضِه مِنْ ضَمان الْبائِعِ: فَإِنْ تَلِفَ انْفَسَخَ الْبَيْعُ وَسَقَطَ الثَّمَنُ، وَلَوْ أَبْرَأَهُ الْمُشْتَرِي عَنِ الضَّمانِ لَمْ يَبْرَأْ-فِي الأَظْهَرِ-وَلَمْ يَتَغَيَّرِ الْحُكْمُ،

---

شوێنەی لێیەوە وەرگیراوە، لە سەر فرۆشیارەکەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

٣-هەر کەسێك بزانێ ماڵەکەی عەیبدارە، حەرامە بیفرۆشێ تا عەیبەکە بە کڕیارەکە دەڵێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌داهاتوو، هەروەها ئەگەر یەکێکی‌تریش جگە لە فرۆشیارەکە بزانێ ئەو ماڵە عەیبی هەیە، لە سەری واجبە کڕیارەکە ئاگادار بکاتەوە، جا کڕیارەکە موسوڵمان بێ، یان کافر بێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەگەر ماڵە عەیبدارەکە بخاتە بەرچاو بە شێوەیەکی وەها: کڕیارەکە عەیبەکە ببینێ، ئەوەش بە ئاگادارکردنەوە دادەنرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى صُبْرَةٍ مِنْ طَعامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيها فَنالَتْ أَصابِعُهُ بَلَلاً، فَقالَ: ما هَذا يا صاحِبَ الطَّعامِ؟ قالَ: أَصابَتْهُ السَّماءُ. فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَفَلا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعامِ كَيْ يَراهُ النّاسُ، مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ بە لای کۆمەڵە گەنمێکدا ڕابرد، جا دەستی‌خۆی خستە ناو گەنمەکەو پەنجەکانی گەیشتنە تەڕایەتی‌و فەرمووی: ئەی خاوەن گەنم ئەمە چیە؟ گوتی: باران لێ‌داوە. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەبوا گەنمە تەڕەکەت لە لای سەرەوە دانابایە تاکو خەڵك ببینێ، هەر کەسێك خیانەت‌و فێڵبازی بکا، لە سەر ڕەووشتی من نیە.

## ﴿ بابٌ: لە باسی شتی‌فرۆشراو پێش وەرگرتنی ﴾

(اَلْمَبِيعُ) شتی‌فرۆشراو (قَبْلَ قَبْضِهِ) پێش ئەوەی کڕیارەکە وەری‌بگرێ (مِنْ ضَمانِ الْبائِعِ) هەر لە زامینی‌ی فرۆشیارەکەی‌دایە، کەواتە: (فَإِنْ تَلِفَ) ئەگەر شتە فرۆشراوەکە فەوتاو نەما (انْفَسَخَ الْبَيْعُ) مامڵەتەکە هەڵدەوەشێتەوە (وَسَقَطَ الثَّمَنُ) پارەی فرۆشراوەکەش لە سەر کڕیارەکە لادەچێ، واتە: ئەگەر کڕیارەکە پارەی فرۆشراوەکەی دابوە فرۆشیارەکە، واجبە: بۆی بگەڕێنێتەوە، ئەگەر نەیدابو، لە سەری نیە بیداتێ.

(وَلَوْ أَبْرَأَهُ الْمُشْتَرِي) ئەگەر کڕیارەکە فرۆشیارەکەی ئازاد کرد (عَنِ الضَّمانِ) لە زامینیەکەو گوتی: ئەگەر فرۆشراوەکە بشفەوتێ پارەکەم وەرناگرمەوە (لَمْ يَبْرَأْ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا ئازاد نابێ‌و (وَلَمْ يَتَغَيَّرِ الْحُكْمُ) ئەو بڕیارەی‌ڕابردوو ناگۆڕێ، واتە: ئەگەر فرۆشراوەکە فەوتا، مامڵەتەکە هەڵدەوەشێتەوەو واجبە: پارەکەی بگەڕێنێتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر فرۆشیارەکە ماڵە فرۆشراوەکەی لە بەر دەستی‌کڕیارەکە دانا، کڕیارەکەش زانی ئەوە فرۆشراوەکەیەو لە وەرگرتنیشی قەدەغە نەکرابو بەڵام بە قەسدی

وَإِتْلاَفُ الْمُشْتَرِي قَبْضٌ إِنْ عَلِمَ، وَإِلاَّ فَقَوْلاَن: كَأَكْلِ الْمالك طَعامَهُ الْمَغْصُوبَ ضَـيْفاً، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ إِتْلاَفَ الْبَائِعِ كَتَلَفه، وَالأَظْهَرُ أَنَّ إِتْلاَفَ الأَجْنَبِيِّ لاَ يَفْسَخُ، بَـلْ يَتَخَيَّـرُ الْمُشْتَرِي بَيْنَ أَنْ يُجِيزَ وَيُغَرِّمَ الأَجْنَبِيَّ، أَوْ يَفْسَخَ فَيُغَرِّمَ الْبائِعُ الأَجْنَبِيَّ،

---

وەری‌نـەگرت، ئـەوە بـە وەرگـرتن دادەنـدرێ، هـەروەك لـە زۆریـەی سەرچـاوەكاندا فەرموویانـە، كەواتـە: ئەگـەر لـەو حاڵەتـەدا فرۆشـراوەكە بشفەوتێ پارەكـەی لـە سـەر كڕیارەكە لاناچێ. هەروەها ئەگەر فرۆشیارەكە ماڵەفرۆشرلوەكەی هێنـا، بـەڵام كڕیارەكـە بـە ڕقـەكاری وەری‌نـەگرت، ئـەو كاتـە دادوەر زۆری لێدەكـا تـا وەریبگرێ، جـا ئەگـەر كڕیارەكە سووربوو لە سەر وەرنەگرتنی فرۆشراوەكە، یان لـەو شـوێنەدا حـازر نـەبو، ئـەو كاتـە دادوەر فـەرمان دەداتـە كەسێكی‌تر: فرۆشـراوەكەی بـۆ وەربگـرێ، هـەروەك لـە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَإِتْلاَفُ الْمُشْتَرِي) فەوتاندنی ماڵەفرۆشراوەكە بە كردارێكی‌كڕیارەكە (قَبْضٌ) بـە وەرگـرتن دادەنـدرێ (إِنْ عَلِـمَ) ئەگـەر زانیبـی ئـەوە فرۆشـراوەكەیە (وَإِلاَّ) بـەڵام ئەگـەر نـەیزانیبێ (فَقَوْلاَنِ) لەو حاڵەتەدا دوو فـەرموودە هەنـە (كَأَكْلِ الْمالِكِ طَعامَـهُ الْمَغْصُوبَ ضَـيْفاً) وەك ئەو مەسەلەی خاوەنێك خواردەمەنیـە زەوتكراوەكـەی خـۆی بـە مێـوانی بخـواو نەشزانێ ئەمە هی خۆیـەتی، بـە فـەرموودەی بـەهێزتر: ئـەوەش بـە وەرگـرتن دادەنـدرێ، هـەروەك زەوتكەرەكەش ئازاد دەبێ، چونكە خاوەنەكە بە خۆی ماڵی‌خۆی لە ناو بردوە.

(وَالْمَـذْهَبُ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتی مەزهـەب (إِنَّ إِتْـلاَفَ الْبـائِعِ) فەوتانـدنی فرۆشـرلوەكە –پێش وەرگرتنی– بـە دەسـتی فرۆشـیارەكەی: وەك لـەناوی ببـا، یـان دووبـارە بیفرۆشێتە كەسێكی‌ترو نەتوانێ وەری‌بگرێتەوە، ئەوەش (كَتَلَفِهِ) وەك بە خۆی فـەوتابێ وەهایـە، واتـە: مامڵەتەكە هەڵدەوەشێتەوەو پارەكەش لە سەر كڕیارەكە لادەچێ.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ إِتْلاَفَ الأَجْنَبِيِّ) فەوتاندندنی فرۆشرلوەكە بـە دەسـتی كەسێكی بێگانە (لاَ يَفْسَخُ) مامڵەتەكە هەڵناوەشێتەوە (بَلْ يَتَخَيَّرُالْمُشْتَرِي) بـەڵكو كڕیارەكـە سەرپشكە: (بَيْنَ أَنْ يُجِيزَ) لـە نێوان ئـەوەی مامڵەتەكـە بروێنـێو هەڵینەوەشێنێتەوەو (وَيُغَرِّمَ الأَجْنَبِيَّ) تۆڵەی فرۆشراوەكەش –بۆ خۆی– لـە بێگانەكـە بسـتێنێ (أَوْ يَفْسَـخَ) یـان مامڵەتەكـە هەڵبوەشـێنێتەوە (فَيُغَـرِمَ الْبـائِعُ الأَجْنَبِـيَّ) ئینجـا فرۆشـیارەكەش تۆڵـەی فرۆشـراوەكە لـە بێگانەكە بستێنێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لـە دوای مامڵەتبەسـتن–پـێش وەرگرتن– فرۆشـیارەكە سـودی لـە خـودی فرۆشـراوەكە وەرگـرتو بـە كـاری هێنـا، ئـەوە هـیچ كـرێی لـە سـەرنیە، مەگـەر كڕیارەكە داوای فـرۆشراوەكە بكاو فـرۆشیارەكەش بە ڕقەكاری تەسلیمی نەكا، ئەو كاتە

وَلَوْ تَعَيَّبَ قَبْلَ الْقَبْضِ فَرَضِيَهُ أَخَذَهُ بِكُلِّ الثَّمَنِ، وَلَوْ عَيَّبَهُ الْمُشْتَرِى فَلاَ خِيَارَ، أَوِ الأَجْنَبِيُّ فَالْخِيَارُ: فَإِنْ أَجَازَ غَرَّمَ الأَجْنَبِيَّ الأَرْشَ، وَلَوْ عَيَّبَهُ الْبَائِعُ فَالْمَذْهَبُ ثُبُوتُ الْخِيَارِ لاَالتَّغْرِيمِ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْمَبِيعِ قَبْلَ قَبْضِهِ،

---

کرێی لە سەر واجب دەبێ، بەڵام ئەو بەرهەمە زیادانەی لە دوای مامڵەت بەستن–لە لای فرۆشیارەکە– لە ماڵەفرۆشراوەکە پەیدا دەبن و لێی جیادەبنەوە: وەکو میوەو شیرو مێلکەو بێچوو...هتد، ئەوانە گشتی ملکی کڕیارەکەنەو بە ئەمانەت لە لای فرۆشیارەکەنە، واتە: ئەگەر فرۆشیارەکە ئەو بەرهەمانە بە قەسدی بفەوتێنێ، تۆڵەی لە سەرە، بەڵام مامڵەتەکە هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو ئەگەر بە هۆی فەوتانی فرۆشراوەکەش مامڵەتەکە هەڵبوەشێتەوە، ئەو بەرهەمانەی پێش هەڵوەشانەوە هەر بۆ کڕیارەکەنە، هەروەك لە (تحفە)و(الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ تَعَيَّبَ) ئەگەر ماڵەفرۆشراوەکە عەیبێکی لێپەیدا بو (قَبْلَ الْقَبْضِ) پێش ئەوەی کڕیارەکە وەری بگرێ (فَرَضِيَهُ) جا کڕیارەکەش–بە عەیبەوە– پێی ڕازی بو (أَخَذَهُ بِكُلِّ الثَّمَنِ) ئەوە دەبی بە تەواوی پارەکەی بیەوێ و وەری بگرێ، واتە: مافی تۆڵەی عەیبەکەی نیە، چونکە دەتوانێ ڕازی نەبێ و مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە، هەروەك لە لە پەشیمانیی عەیبدا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ عَيَّبَهُ الْمُشْتَرِى) ئەگەر کڕیارەکە–بە خۆی– عەیبێکی لێپەیدا کرد (فَلاَخِيَارَ) ئەو کاتە مافی پەشیمانیی نیە (أَوِالأَجْنَبِيُّ) یان ئەگەر بێگانەیەك عەیبێکی لێپەیدا کرد (فَالْخِيَارُ) ئەو کاتە کڕیارەکە مافی پەشیمانیی هەیە: (فَإِنْ أَجَازَ) جا ئەگەر پەشیمان نەبۆوەو مامڵەتەکەی ڕۆیاند (غَرَّمَ الأَجْنَبِيَّ الأَرْشَ) ئەو کاتە تۆڵەی عەیبەکە–بۆ خۆی– لە بێگانەکە دەستێنێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ عَيَّبَهُ الْبَائِعُ) ئەگەر فرۆشیارەکە–بەخۆی– عەیبێکی لێپەیدا کرد (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (ثُبُوتُ الْخِيَارِ) ئەو کاتەش مافی پەشیمانی بۆ کڕیارەکە هەیە (لاَالتَّغْرِيمِ) بەڵام مافی تۆڵەی عەیبەکەی نیە، کەوابو: ئەگەر حەز بکا: پەشیمان دەبێتەوە، ئەگەر نا: دەبی بە تەواوی پارەکەیی بیەوێ، هەروەك ڕابرا.

### ﴿ فرۆشتنەوەی شتیفرۆشراو پێش وەرگرتنی ﴾

(وَلاَ يَصِحُّ) بۆ کڕیارەکە دروست نیەو دانامەزرێ (بَيْعُ الْمَبِيعِ) فرۆشتنەوەی شتیفرۆشراو (قَبْلَ قَبْضِهِ) پێش وەرگرتنی؟ چونکە ملکایەتیەکەی بێهێزە، واتە: ئەگەر فرۆشراوەکە –پێش وەرگرتنی– بفەوتێ مامڵەتەکە هەڵدەوەشێتەوە، هەروەك ڕابرا، جیاوازی نیە فرۆشراوەکە: خواردەمەنی بێ–بە (إجماع)ی زانایانیئاییینی– یان هەر شتێکیتر بێ: کە

وَالأَصَحُ أَنَّ بَيْعَهُ لِلْبائِعِ كَغَيْرِهِ، وَأَنَّ الإجارَةَ وَالرَّهْنَ وَالْهِبَةَ كَالْبَيْعِ، وَأَنَّ الإِعْتاقَ بِخلاَفِهِ، وَالثَّمَنُ الْمُعَيَّنُ كالْمَبِيعِ فَلاَ يَبِيعُهُ الْبائِعُ قَبْلَ قَبْضِهِ،

---

بگونجیٚ بگوازرێتەوە، یان نەگونجیٚ: وەکو زەوی‌و خانوو ﴿عَنْ حَكِيم بن حـزام ﷺ: قـالَ النَّبِيُّ ﷺ: إذَا اشْتَرَيْتَ شَيْئاً فَلاَ تَبِعْـهُ حَتَّـى تَقْبِضَـهُ﴾ رواه أحمد والبيهقي بسند حسن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کاتێك شتێکت کڕی، مەیفرۆشەوە تا وەری‌دەگری.

﴿ ئاگـاداری ﴾: لـە مەزهـەبی‌ئیمامی(حنفـی)دا دروسـتە: بـاغ‌و زەمـینی فرۆشـراو پـێش وەرگـرتن بفرۆشـێتەوە، بـەڵام ئـەو فرۆشـراوەی دەگونجیٚ بگوازرێتـەوە، ئـەو دروسـت نیـە، هەروەك لە کتێبەکانی‌خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

هـەروەها لـە مەزهـەبی ئیمـام(مالـك)دا: تـەنها خواردەمـەنی دروسـت نیـە، واتـە: گشـت فرۆشراوێکی-جگـە لـە خواردەمـەنی- دروسـتە پـێش وەرگـرتنی بفرۆشـێتەوە، هـەروەك لـە (شرح الموطأ)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَصَـحُّ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّ بَيْعَـهُ لِلْبـائِعِ) فرۆشـتنەوەی فرۆشـراو-پـێش وەرگرتنی- هـەر بـە فرۆشیارەکەی (كَغَيْـرِهِ) وەك فرۆشتنەوەیەتی بـە یـەکێکی‌تر، واتـە: ئەگـەر بـە پارەیـەکی‌تر، یـان بـە زیـاتر، یـان بـە کـەمتر، یـان بـە ڕەگـەزێکی‌تری جگـە لـە پارەکەی-پێش وەرگرتنی- بیفرۆشێتەوە فرۆشیارەکە، ئەو فرۆشتنە دروست نیـە، بـەڵام ئەگـەر هـەر بـە خـودی پارەکـەی‌خۆی، یـان بـە وێنـەی پارەکـەی‌خۆی بیفرۆشـێتەوە فرۆشیارەکە، ئەو کاتە دروستە‌و بە چاوپۆشی‌ی‌پەشیمانی دادەندرێ، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ)هـەر بـە فەرموودەی‌ڕاسـتتر (أَنَّ الإِجـارَةَ) بەکرێـدانی فرۆشـراوەکە پـێش وەرگرتنـی‌و (وَالرَّهْنَ) هەم بە بارمتە دانـانی‌و (وَالْهِبَـةَ)هـەم بەخشـینی‌و بـە قـەرزدانی‌و کردنـە مـارەیی‌و کردنـە خێـر، ئەوانـە گشـتیان (كَـالْبَيْعِ) وەکـو فرۆشـتنەوەیەتی پـێش وەرگـرتنی، واتـە: هیچیان دروست نـابن، بـەڵام بـە فـەرموودەی بـێ‌هێز: ئەوانـە گشـتیان-پـێش وەرگرتنـی فرۆشراوەکە- دروستن، هەروەك لە (نهاية)و(مغنی)دا فەرموویانە.

(وَأَنَّ الإِعْتـاقَ) هـەر بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر: ئازادکردنی‌کۆیلەی‌فرۆشراو پـێش وەرگـرتنی (بِخلاَفِهِ) بە پێچەوانەی فرۆشتنەوەیەتی واتە: ئازادکردنی دروست دەبێ.

(وَالثَّمَنُ الْمُعَيَّنُ) پارەی شتەفرۆشراوەکە ئەگـەر دیـارکراو بـێ، ئـەویش-پـێش وەرگـرتنی- (كالْمَبِيعِ) وەکو ماڵەفرۆشراوەکەیە-پـێش وەرگـرتنی- لـە گشـت ئـەو بڕیارانـەی‌ڕابردوودا، کەواتە: (فَلاَ يَبِيعُهُ الْبائِعُ) نابی فرۆشیارەکە بیفرۆشێتەوە، واتـە: دروسـت نیـە دەسـتکاری پارەکە بکا (قَـبْلَ قَـبْضِهِ) پێش وەرگرتنی، جیاوازی نیە ئەو دەسـتکاریە: کردنـە پـارەی

وَلَهُ بَيْعُ مالِه فِي يَدِ غَيْرِه أَمانَةً: كَوَدِيعَةٍ وَمُشْتَرَكٍ وَقِراضٍ وَمَرْهُونٍ بَعْدَ إِنْفِكاكِه وَمَوْرُوثٍ وَباقٍ فِي يَدِ وَلِيِّه بَعْدَ رُشْدِه وَكَذا عارِيَةٌ وَمَأْخُوذٌ بِسَوْمٍ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْمُسْلَمِ فِيهِ وَلاَ الإِعْتِياضُ عَنْهُ، وَالْجَدِيدُ جَوازُ الإِسْتِبْدالِ عَنِ الثَّمَنِ:

---

بازرگانی بێ، یان کرێی بەکرێگرتن بێ، یان بەخشین بێ، یان بە قەرزدان بێ، یان کردنە مارەیی بێ، یان کردنە خێر بێ، هەروەها جیاوازی نیە پارەکە پول‌و دراو بێ، یان شتێکی‌تر بێ.

## ﴿ فرۆشتنی (صَكّ)=شیك ﴾

(صَكّ)=شیك: پەڕە کاغەزێکە لە لایەن کاربەدەستی وولات دەردەچێ بۆ کەسێك، تێیدا دەنووسرێ: (ئەوەندە خۆراکە، یان ئەوەندە پارەیە بدرێتە ئەو کەسە).

جا بە فەرموودەی ڕاستتر: بۆ کەسەکە دروستە ئەو پەڕە کاغەزە بفرۆشێ؟ چونکە پەڕە کاغەزەکە –بە بێ‌کڕین– بووەتە ملکی‌خۆی‌و بۆی جێگیر بووە، هەروەك ئیمامی(النواوی) لە (شرح مسلم)دا بە درێژی ڕوونی کردۆتەوە.

(وَلَهُ) هەروەها بۆی دروستە (بَيْعُ مالِهِ) مالی‌خۆی بفرۆشێ لەو حاڵەتەی (فِي يَدِ غَيْرِهِ أَمانَةً) ماڵەکە –بە ئەمانەت– لە دەستی کەسێکی‌تردایە: (كَوَدِيعَةٍ) وەك مالی سپێردراو و (وَمُشْتَرَكٍ) مالی‌هاوبەش‌و (وَقِراضٍ) مالی بە قازانج گێڕدراو لە لایەن کەسێکی‌ترو (وَمَرْهُونٍ بَعْدَ إِنْفِكاكِهِ) مالی بە بارمتە داندراو پاش بەرهەڵبوونی‌و (وَمَوْرُوثٍ) هەم وەك مالی بە میرات گیراو و (وَباقٍ فِي يَدِ وَلِيِّهِ) مالی بن دەست سەرپەرشتکارەکەی (بَعْدَ رُشْدِهِ) پاش لاچوونی قەدەغەکردن (وَكَذا عارِيَةٌ) هەروەها ئەو شتەی بە خواستن داویەتیە کەسێکی‌تر، هەم (وَمَأْخُوذٌ بِسَوْمٍ) ئەو شتەی کڕیاریش بە دەستیەوە گرتوە، تاکو تەماشای بکا: ئایا پێی باشە بیکڕێ، یان نا؟ بەلام هێشتا پێك نەهاتبون، واتە: ئەوانەی‌ڕابردوو–گشتیان– دروستە: پێش وەرگرتنەوەیان بیانفرۆشێ؟ چونکە ئەوانە ملکی‌خۆیەتی‌و نەیکڕیون، بۆیێ وەرگرتنەوەیان مەرج نیە بۆ فرۆشتنیان.

## ﴿ گۆڕینەوەی قەرزێك بە شتێکی‌تر ﴾

(وَلاَ يَصِحُّ) دروست نیەو دانامەزرێ (بَيْعُ الْمُسْلَمِ فِيهِ) فرۆشتنی مالی سەلەم تێداکراو پێش وەرگرتنی (وَلاَالإِعْتِياضُ عَنْهُ) هەروەها گۆڕینەوەشی دروست نیە پێش وەرگرتنی، بۆ وێنە: ئێستا سەد دینار بداتە یەکێك بە سەلەمی سەد کیلۆ گەنم کە پاش پێنج مانگی‌تر بۆی بێنێ، ئەوە فرۆشتن‌و گۆڕینەوەی ئەو گەنمە–پێش وەرگرتنی– دروست نیە.

بەلام (وَالْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێی‌ئیمامی(الشافعی) ئەمەیە: (جَوازُالإِسْتِبْدالِ عَنِ الثَّمَنِ) پارەی شتە فرۆشراوەکە–ئەگەر قەرز بێ– دروستە: لەگەڵ قەرزدارەکەی بیگۆڕێتەوە بە

فَإِنْ اسْتَبْدَلَ مُوافِقاً في عِلَّةِالرِّبا كَدَراهِمَ عَنْ دَنانِيرَ اُشْتُرِطَ قَبْضُ الْبَدَلِ فِي الْمَجْلِسِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ التَّعْيِينُ فِي الْعَقْدِ وَكَذا الْقَبْضُ فِي الْمَجْلِسِ إِنِ اسْتَبْدَلَ ما لاَيُوافِقُ فِي الْعِلَّةِ: كَثَوْبٍ عَنْ دَراهِمَ، وَلَواسْتَبْدَلَ عَنِ الْقَرْضِ

---

شتێکیتر، جا پارەکە: پولو دراو بێ، یان نا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قُلْتُ: يارَسُولَ اللهِﷺ إِنِّي أَبِيعُ الإِبِلَ بِالدَّنانِيرِ وَآخُذُ الدَّراهِمَ وَأَبِيعُ بِالدَّراهِمِ وَآخُذُ الدَّنانِيرَ؟ فَقالَ النَّبِيُّﷺ: لاَبَأْسَ أَنْ تَأْخُذَها بِسِعْرِ يَوْمِها مالَم تَفْتَرِقا وَبَيْنَكُما شَيْءٌ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه الحاكم، من ووشتر بە قەرز دەفرۆشم: جا بە دینار دەیفرۆشمو لە جیاتیدینار دیرهەم وەردەگرمەوە، بە دیرهەم دەیفرۆشمو لە جیاتیدیرهەم دینار وەردەگرمەوە؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی: هیچ باس نیە بەگوێرەی نرخی ڕۆژەکەیان –لەجیاتییەکتری– وەریان بگری، بەو مەرجەی کە لێك جیا نەبنەوە، هیچ شتێك لە نێوانتاندا نەمابێ، واتە: گۆڕدراوەکە گشتی وەرگیرابێ.

(فَإِنِ اسْتَبْدَلَ مُوافِقاً) جا ئەگەر قەرزەکەی گۆڕیەوە بە شتێکی وەها: کە وەکو یەکتری بون (فِي عِلَّةِالرِّبا) لە هۆکاری ڕیبادا (كَدَراهِمَ عَنْ دَنانِيرَ) وەك لە جیاتی دینارەقەرزەکانی دیرهەم وەربگرێتەوە، ئەوە–لە گۆڕینەوەی ئەوجۆرەقەرزەدا– مەرجە: بە زوبان قبوڵی بکاو، هەم (اُشْتُرِطَ قَبْضُ الْبَدَلِ فِي الْمَجْلِسِ) بە مەرج داندراوە: پێش لێکجیابوونەوە لە دانیشگەی گۆڕینەوەدا–هەموو گۆڕدراوەکە– وەربگرێ، نەوەك ببێتە (رِباالْيَدِ)، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو.

ئینجا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ التَّعْيِينُ فِي الْعَقْدِ) مەرج نیە ئەو پارەیەی–لەجیاتیقەرزەکە– وەردەگیرێ: لە مامڵەت بەستنی گۆڕینەوەکەدا دیاری بکا، وەك بڵێ: ئەم دینارە لەجیاتی دیرهەمەقەرزەکان. چونکە دیاریکردنو وەرگرتنی گۆڕدراوەکە لە دانیشگەیگۆڕینەوەکەدا بە مەرج داندراوە ئەگەر گۆڕدراوەکان لە هۆکاری ڕیبادا وەکو یەکتری بن، هەروەك تازە ڕابرا.

(وَكَذا الْقَبْضُ فِي الْمَجْلِسِ) هەروەها مەرج نیە لە دانیشگەیگۆڕینەوەشدا شتەگۆڕدراوەکە وەربگرێ (إِنِ اسْتَبْدَلَ مالاَيُوافِقُ فِي الْعِلَّةِ) ئەگەر قەرزەکەی گۆڕیەوە بە شتێکی وەها: کە لە هۆکاری ڕیبادا وەکو یەکتری نەبون (كَثَوْبٍ عَنْ دَراهِمَ) وەك جلوبەرگێك لە جیاتی دیرهەمە قەرزەکانی وەربگرێ، واتە: لە دانیشگەکەدا تەنها مەرجە جلەکە دیاری بکرێو قبوڵی بکا، بەڵام وەرگرتنی مەرج نیە؟ چونکە لە هۆکاریڕیبادا وەکو یەکتری نین.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو، دەربارەی ئەو فرۆشراوە بوو: کە بە قەرز فرۆشرابێو هێشتا پارەکەی وەرنەگیرابێ (وَ) هەروەها (لَوِ اسْتَبْدَلَ عَنِ الْقَرْضِ)ئەگەر شتێك وەربگرێ لەجیاتی

وَقيمَةالْمُتْلَف جازَ، وَفي اشْتراط قَبْضه في الْمَجْلس مَاسَبَقَ، وَبَيْعُ الدَّيْن لغَيْر مَــنْ عَلَيْــه باطلٌ في الأَظْهَر: بأَن يَشْتَرِيَ عَبْدَ زَيْد بمأَة لَهُ عَلَى عَمْرو، وَلَوْ كانَ لزَيْد وَعَمْرو دَيْنــانَ عَلَى شَخْص فَباعَ زَيْدٌ عَمْراً دَيْنَهُ بدَيْنه بَطَلَ قَطْعاً،

---

شتێکیتری بـه قـەرزدراو: جا پـاره بێ، یـان نـا (وَقيمَةِ الْمُتْلَفِ) هـەروەها ئەگـەر شـتێك وەربگرێ لەجیاتی نرخیشتێکیفەوتێندراو، لەو دووانەشدا (جازَ) ئـەو گۆڕینەوەیـە دروسـتەو (وَفِــي اشْــتِراطِ قَبْضِــهِ فِــي الْمَجْلِسِ) دەربــارەی وەرگـرتنی گۆڕدراوەکـە لـە دانیشـگەی گۆڕینەوەدا (ما سَبَقَ) گشت ئەو بڕیارانەیڕابردوو ڕەچاو دەکرێن:

واتە: ئەگەر لەجیاتی پارە بە قەرزدراوەکە پارەیەکیتر لە قەرزدارەکە وەربگرێتـەوە، یـان لـەجیاتی گەنمـە بـە قەرزدراوەکـە خواردەمەنیـەکیتر لـە قەرزدارەکـە وەربگرێتـەوە، ئـەوە مەرجە پێش لێکجیابوونەوە: لە دانیشـگەکەدا پارەکەو خواردەمەنیەکە وەربگرێ؟ چونکە لە هۆکاری ڕیبادا وەکو یەکترن، بـەڵام ئەگـەر شتێکیتری –جگە لە پـارە– لـەجیاتی پـارە قەرزەکـە وەربگـرێ، یـان شـتێکیتری –جگـە لـە خواردەمـەنی– لـەجیاتی خواردەمەنیـە قەرزەکە وەربگرێ، ئەو کاتە وەرگرتنی مەرج نیە؟ چونکە لە هۆکـاری ڕیبـادا وەکـو یـەکتری نین، بەڵام دیاریکردنیو قبولکردنی مەرجە.

هەروەها ئەگەر لە تۆڵەی گەنمەفەوتێندراوەکە برنج، یان جۆ وەربگرێتـەوە، مەرجـە پـێش لێکجیابوونەوە: لە دانیشگەکەدا برنجەکەو جۆیەکـە وەربگرێ؟ چـونکە لـە هۆکاریڕیبـادا وەکـو یـەکترن، بـەڵام ئەگـەر شـتێکیتری جگـە لـە خواردەمـەنی– لـە تۆڵەیگەنمەکـە– وەربگرێ، ئەو کاتە وەرگرتنی مـەرج نیـە؟ چـونکە لـە هۆکاریڕیبـادا وەکـو یـەکتری نـین، بەڵام دیاریکردنیو قبولٚکردنی مەرجە.

(وَبَيْعُ الدَّيْنِ) فرۆشتنی قەرز (لِغَيْرِ مَنْ عَلَيْهِ) بـە کەسـێکیتری جگـە لـەو کەسـەی قەرزەکـەی لە سەرە (باطِلٌ) بەتاڵەو دانامەزرێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بـەهێزتردا (بِأَنْ يَشْتَرِيَ عَبْدَ زَيْدٍ) وەك کۆیلەی زەید بکڕێ (بِمأَةٍ لَـهُ عَلَى عَمْرٍو) بـەو سـەددیناره‌قەرزەی لـە سـەر عـەمر هەیەتی، بەڵام لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە: فەرموودەی پشت پێبەسـتراو ئەمەیـە: فرۆشـتنی قـەرز بـە کەسـێکیتری جگـە لـە قەرزدارەکـەش دروسـتە، هـەروەك بـە خـودی قەرزدارەکەش دروست بوو: وەك گۆڕینەوەکەیڕابردوو.

(وَلَوْكانَ لِزَيْدٍ وَعَمْرٍو دَيْنانِ عَلَى شَخْصٍ) ئەگەر (زەید)و (عەمر) هەر یەکەیان قـەرزێکیان لـە سەر کەسێکیتر هەبو (فَباعَ زَيْدٌ عَمْراً دَيْنَهُ بِدَيْنِهِ) ئینجا (زەید) قەرزەکـەی خـۆی فرۆشـتە (عەمر) بە قەرزەکەی وی (بَطَلَ قَطْعاً) ئەوە دروسـت نیـەو بەتاڵـە، بـە (إجماع)ی زانایـانی ئیسلام ﴿عَنْ ابْنِ عمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهما: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْكالِئِ بِالْكـالِئِ﴾ رواه الحـاكم وصححه، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: قەرزێك بە قەرزێك بفرۆشرێ.

وَقَبْضُ الْعَقارِ تَخلِيَتُهُ لِلْمُشْتَرِي وَتَمْكِينُهُ مِنَ التَّصَرُّفِ، بِشَرْطِ فَراغِهِ مِنْ أَمْتِعَةِ الْبائِعِ، فَإِنْ لَمْ يَحْضُرِ الْعاقِدانِ الْمَبِيعَ اُعْتُبِرَ مُضِيُّ زَمَنٍ يُمْكِنُ فِيهِ الْمُضِيُّ إِلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَقَبْضُ الْمَنْقُولِ تَحْوِيلُهُ:

---

﴿ ئاگاداری ﴾: لەو ڕوونکردنەوەیڕابردوو دەردەکەوێ: ئەگەر ژنێك نۆزدە میسقال زێڕ مارەیی قەرز بوو لە سەر مێردەکەی، ئەوە دروستە مارەییەکەی بفرۆشێتە مێردەکەی -واتە: لەجیاتیمارەییەکەی شتێکیتری لێوەربگرێ- جا ئەگەر بە پارە بیفرۆشیتێ، ئەوە مەرجە قبوڵی بکاو هەم -پێش لێکجیابوونەوە- لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا پارەکەی لێوەربگرێ، بەلام ئەگەر بە شتێکیتری -جگە لە پارە- بیفرۆشیتێ، ئەوە تەنها مەرجە: شتەکە دیاری بکرێو قبوڵی بکا، بەلام وەرگرتنی مەرج نیە، هەروەك لە پێش ئێرەدا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ چۆنیەتی وەرگرتنی فرۆشراوەکە ﴾

(وَقَبْضُ الْعَقارِ) وەرگرتنی باغو زەمینو خانوو، بەم جۆرەیە: (تَخلِيَتُهُ لِلْمُشْتَرِي) فرۆشیارەکە -بە گۆتن- واز لە فرۆشراوەکە بێنێ بۆ کڕیارەکەو (وَتَمْكِينُهُ مِنَ التَّصَرُّفِ) هەم بۆی بگونجێنێ دەستکاری فرۆشراوەکە بکا (بِشَرْطِ فَراغِهِ مِنْ أَمْتِعَةِالْبائِعِ) بەو مەرجەی شوێنە فرۆشراوەکە: گشت کەلوپەلێکی فرۆشیارەکەو هەم کەلوپەلی خەڵکیتریش -جگە لە هیکڕیارەکە- لێی لابربرێ: وەك کەلوپەلی کرێچیو زەوتکەرو هەر کەسێکیتر، بەلام مەرج نیە کڕیارەکە بڕواتە ناو شوێنەکەو دەستکاریی بکا.

(فَإِنْ لَمْ يَحْضُرِالْعاقِدانِ الْمَبِيعَ) جا ئەگەر کڕیارەکەو فرۆشیارەکە لە لای شتەفرۆشراوەکە ئامادە نەبون، ئەوە فرۆشتنەکە دروست دەبێ، بەلام (اُعْتُبِرَ) بۆ دروستبوونی وەرگرتنەکە ڕەچاو دەکرێ (مُضِيُّ زَمَنٍ) کاتێکی وەها بڕوا: کە (يُمْكِنُ فِيهِ الْمُضِيُّ إِلَيْهِ) بگونجێ بەگوێرەی عادەت لەو ماوەیەدا بڕواتە لای فرۆشراوەکە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەم پێویستە کەلوپەلی فرۆشیارەکەو خەڵکیتریشی لێ لابربرێ، هەروەك لە (تحفة) و(نهاية)دا فەرموویانە.

(وَقَبْضُ الْمَنْقُولِ) وەرگرتنی ئەو فرۆشراوەی دەگونجێ بگواسترێتەوە، بەم جۆرەیە: (تَحْوِيلُهُ) کڕیارەکە، یان جێگرێکیکڕیارەکە لە شوێنێك بیباتە شوێنێکیتر ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: كُنّا نَشْتَرِي الطَّعامَ مِنَ الرُّكْبانِ جُزافاً، فَنَهانا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نَبِيعَهُ حَتَّى نَنْقُلَهُ﴾ رواه الشيخان، ئێمە لەگوترە خواردەمەنیمان لە کاروانچیان دەکڕی، جا پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردین ئەو خواردەمەنیە بفرۆشینەوە، تا لە شوێنی خۆی دەیگوازینەوە شوێنێکیتر.

فَـإِنْ جَـرَى الْبَيْـعُ بِمَوْضِـعٍ لاَ يَخْـتَصُّ بِالْبَـائِعِ كَفَـى نَقْلُـهُ إِلَـى حَيِّـزٍ، وَإِنْ جَرَى فِي دارِالْبائِعِ لَمْ يَكْفِ ذَلِـكَ إِلاَّ بِـإِذْنِ الْبَـائِعِ فَيَكُـونُ مُعِيراً لِلْبُقْعَـةِ. (فَرْعٌ) لِلْمُشْتَرِي قَبْضُ الْمَبِيعِ إِنْ كانَ الثَّمَنُ مُؤَجَّلاً أَوْ سَلَّمَهُ، وَإِلاَّ فَلاَ يَسْتَقِلُّ بِه، وَلَـوْ بِيعَ الشَّيْءُ تَقْدِيراً: كَثَوْبٍ وَأَرْضٍ ذَرْعاً وَحِنْطَةٍ كَيْلاً أَوْ وَزْناً اُشْتُرِطَ مَعَ النَّقْلِ ذَرْعُهُ أَوْ كَيْلُهُ أَوْ وَزْنُهُ،

---

(فَإِنْ جَرَىالْبَيْعُ بِمَوْضِعٍ) جا ئەگەر فرۆشتنەکە لـە شوێنێکی وەهـادا کرا: کـە (لاَ يَخْتَصُّ بِالبائِعِ) تايبەت بە فرۆشيارەکە نـەبو: وەك ڕێگـەو کۆڵانو شوێنە گشتيەکانیتر، يـان لـە ماڵیکڕيارەکـەدا کـرا، ئـەوە (كَفَىنَقْلُهُ إِلَىحَيِّزٍ) بـۆ دروسـتبوونی وەرگرتنەکـە ئەوەنـدە بەسە: فرۆشراوەکە بگوازێتەوە لايەکیشوێنەکە.

(وَإِنْ جَرَىٰ فِي دارِالْبائِعِ) بـەڵام ئەگـەر فرۆشـتنەکە لـە خـانوو-ملکی فرۆشـيارەکەدا کـرا، ئـەوە (لَـمْ يَكْـفِ ذَلِـكَ) ئـەو گواسـتنەوەيە بـەس نيـە (إِلاَّ بِـإِذْنِ البـائِعِ) تـەنها بـەئيزنی فرۆشـيارەکە نـەبێ (فَيَكُـونُ مُعِيراً لِلْبُقْعَةِ) جا ئەگـەر فرۆشـيارەکە ئيزنـیدا بيگوازێتـەوە لايـەك، ئـەوە لايەکـەی بـە خواسـتن داوەتـە کڕيارەکـە، تـاکو فرۆشـراوەکەی لێدابنـێو وەرگرتنەکە دروست دەبێ.

﴿(فَـــرْعٌ) لقێکی باسەکە: مافی وەرگرتنیفرۆشراوەکە﴾

(لِلْمُشْـتَرِي قَـبْضُ الْمَبِيـعِ) کڕيارەکـە مـافی هەيـە: فرۆشـراوەکە وەربگـرێ بـە بـێئيزنی فرۆشيارەکە (إِنْ كانَ الثَّمَنُ مُؤَجَّلاً) ئەگەر فرۆشتنەکەی بە پارەيەکی قـەرز بـێ (أَوْ سَـلَّمَهُ) يان بە حازر بێو پارەکەشی تەسليمی فرۆشـيارەکە کردبـێ (وَإِلاَّ) بـەڵام ئەگـەر بـە حـازر بـوو، پارەکەشـی تەسـليم نـەکردبو (فَـلاَ يَسْـتَقِلُّ بِـهِ) نابـێ سـەربەخۆ-بـە بـێئيزنی فرۆشـيارەکە- وەریبگـرێ، واتـە: ئەگـەر لـەم حاڵەتـەدا بـە بـێئيزنی فرۆشـيارەکە وەریگرت، واجبە: بيگەڕێنێتەوەو هيچ دەستکاريەکيشی لـەو وەرگيراوەدا دروست نابـێ، جا ئەگەر فەوتاندی پارەکەی لە سەر جێگير دەبێو واجبە بيداتـە فرۆشيارەکە، هـەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموويانە.

ئينجـا بزانـە: ئـەوەیڕابردوو-کـە گووتمـان ئەوەنـدە بەسـە: فرۆشـراوەکە لـە شـوێنێك بگواسترێتەوە شوێنێکیتر- دەربـارەی ئـەو شـتانە بـوو: کـە لـە گۆتره فرۆشرابن، بـەڵام (وَلَـوْ بِيـعَ الشَّـيْءُ تَقْدِيراً) ئەگـەر شـتومەك بـە ئەنـدازە بفرۆشـرێ (كَثَـوْبٍ وَأَرْضٍ) وەك جلوبەرگو زەوی (ذَرْعاً) بە پێوانەی گەز بفرۆشرێو (وَحِنْطَةٍ كَيْلاً) گـەنم بـە پێوانـەی ڕيـە بفرۆشرێ (أَوْ وَزْناً) يان شتێك بە کێشانەی تـەرازوو بفرۆشرێ، يـان بـە ژمـاردن بفرۆشرێ، ئـەوە (اُشْـتُرِطَ مَـعَ النَّقْـلِ) بـە مـەرج دانـدراوە-لەگـەڵ گواستنەوەشی- (ذَرْعُـهُ) بـە گـەز بپێورێ (أَوْ كَيْلُهُ) يان بە ڕيە بپێورێ (أَوْ وَزْنُهُ) يـان بکێشـرێ، يـان بژمـێردرێ، چـونکە

مثالُهُ: بِعْتُكَها كُلَّ صاعٍ بِدِرْهَمٍ، أَوْ عَلَى أَنَّها عَشَرَةُ آصُعٍ، وَلَوْ كانَ لَهُ طَعامٌ مُقَدَّرٌ عَلَى زَيْدٍ وَلِعَمْرٍو عَلَيْهِ مِثْلُهُ فَلْيَكْتَلْ لِنَفْسِهِ ثُمَّ يَكِيلُ لِعَمْرٍو، فَلَوْ قالَ اِقْبِضْ مِنْ زَيْدٍ ما لِي عَلَيْهِ لِنَفْسِكَ فَفَعَلَ فَالْقَبْضُ فاسِدٌ.
(فَرْعٌ) قالَ الْبائِعُ: لاَ أُسَلِّمُ الْمَبِيعَ حَتَّى أَقْبِضَ ثَمَنَهُ، وَقالَ الْمُشْتَرِي فِي الثَّمَنِ مِثْلَهُ،

---

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ اشْتَرَى طَعاماً فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَكْتالَهُ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك خواردەمەنیەکی کڕی، نابێ بیفرۆشێتەوە تا دەیپێوێ.
(مِثالُهُ) وێنەی پێوانەکە: (بِعْتُكَها) ئەم کۆمەڵە گەنمەم فرۆشتە تۆ (كُلَّ صاعٍ بِدِرْهَمٍ) هەر ساعێك بە دیرهەمێك (أَوْ) یان فرۆشتمە تۆ (عَلَى أَنَّها عَشَرَةُ آصُعٍ) کە کۆمەڵەکە دە ساعە، واتە: مەرجە بپێورێو وەربگیرێ.
(وَلَوْ كانَ لَهُ طَعامٌ مُقَدَّرٌ عَلَى زَيْدٍ) ئەگەر (بەکر) ئەندازەیەك خواردەمەنیی لە سەر (زەید) هەبو (وَلِعَمْرٍو عَلَيْهِ مِثْلُهُ) هەم (عەمر)یش هەمان ئەندازەی خواردەمەنیەکەی لە سەر (بەکر) هەبو (فَلْيَكْتَلْ لِنَفْسِهِ) کە (بەکر)خواردەمەنیەکەی لە (زەید) وەرگرتەوە، واجبە: بۆ خۆی داوای لێبکا جارێك بیپێوێ (ثُمَّ) ئینجا (يَكِيلُ لِعَمْرٍو) ئەویش بۆ (عەمر) دووبارە دەیپێوێتەوە کە دەیداتەوە، تا وەرگرتن و وێدانەکە دروست بێن.
کەوابو: (فَلَوْ قالَ) ئەگەر لە وێنەیڕابردوودا (بەکر) بە (عەمر)یگوت (اِقْبِضْ مِنْ زَيْدٍ ما لِي عَلَيْهِ) برۆ لای (زەید) ئەوەی من لە سەر ئەوم هەیە لێی وەربگرەوە (لِنَفْسِكَ) بۆ خۆت لەجیاتی قەرزەکەت (فَفَعَلَ) ئینجا (عەمر)یش لە جیاتی (بەکر) بۆ خۆی لە (زەید)ی وەرگرتەوە (فَالْقَبْضُ فاسِدٌ) ئەم وەرگرتنەوەی (عەمر) بۆ خۆی بەتاڵەو دانامەزرێ، چونکە وەرگرو وێدەر-تەنها- یەك کەسە: کە (عەمر)ە، هەم ﴿نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ عَنْ بَيْعِ الطَّعامِ حَتَّى يَجْرِيَ فِيهِ الصَّاعانِ: صاعُ الْبائِعِ وَصاعُ الْمُشْتَرِي﴾ رواه الدارقطني والبزار بإسناد حسن، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: خواردەمەنی بفرۆشرێ، تا دوو ساعی تێدا بەکار دێن: ساعی فرۆشیارو ساعی کڕیار. بەڵام بەم وەرگرتنە (زەید) ئازاد دەبێو قەرزی (بەکر)ی لە ئەستۆ لادەچێ، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.
﴿ ئاگاداری ﴾ ئەرکی هێنانیفرۆشراوەکەو پێوانیو کێشانیو ژماردنی لە سەر فرۆشیارەکەیە، هەروەها ئەرکی ژماردنو هێنانی پارەکەو ئەرکی گواستنەوەی فرۆشراوەکەش لە سەر کڕیارەکەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ (فَرْعٌ) لقێکی باسەکە: کێشەی تەسلیمکردنی فرۆشراوەکە ﴾

(قالَ الْبائِعُ) ئەگەر-لە دوای جێگیربوونی مامڵەت بەستن- فرۆشیارەکە گوتی: (لاَ أُسَلِّمُ الْمَبِيعَ حَتَّى أَقْبِضَ ثَمَنَهُ) فرۆشراوەکە تەسلیم ناکەم، واتە: نایدەمە دەستیکڕیارەکە تا پارەکەی وەردەگرم (وَقالَ الْمُشْتَرِي فِي الثَّمَنِ مِثْلَهُ) کڕیارەکەش گوتی: منیش پارەکەی

أُجْبِرَالْبائِعُ، وَفِي قَوْلٍ الْمُشْتَرِي، وَفِي قَوْلٍ لاإِجْبار، فَمَنْ سَلَّمَ أُجْبِرَ صَـاحِبُهُ، وَفِي قَـوْلٍ يُجْبَران، قُلْتُ: فَإِنْ كانَ الثَّمَنُ مُعَيَّناً سَقَطَ الْقَـوْلاَن الأوَّلاَن وَأُجْبِـرا فِي الأَظْهَـرِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِذا سَلَّمَ الْبائِعُ أُجْبِرَالْمُشْتَرِي إِنْ حَضَرَالثَّمَنُ، وَإِلاَّ فَإِنْ كانَ مُعْسِـراً فَلِلْبـائِعِ الْفَسْخُ بِالْفَلَسِ، أَوْ مُوسِراً وَمالُهُ بِالْبَلَد أَوْ بِمَسافَةٍ قَرِيبَةٍ حُجِرَ عَلَيْـهِ فِي أَمْوالِـهِ حَتَّـى يُسَلِّمَ، فَإِنْ كانَ بِمَسافَةِالْقَصْرِ لَمْ يُكَلَّفِ الْبائِعُ الصَّبْرَ إِلَى إِحْضارِهِ، وَالأَصَحُّ

---

نادەمە دەستیفرۆشیارەکە تا فرۆشراوەکە وەردەگرم. ئـەوە بـۆ براندنـەوەی ئـەم کێشـەیە (أُجْبِرَالْبـائِعُ) فرۆشـیارەکە ناچار دەکرێ: فرۆشـرلوەکە بداتـە دەسـتیکڕیارەکە (وَفِي قَـوْلٍ الْمُشْـتَرِي) لــە فەرموودەیەکـدا کڕیارەکــە ناچــار دەکــرێ (وَفِي قَــوْلٍ لاَإِجْبــار)لــە فەرموودەیەکیشدا هیچیان ناچار ناکرێن، بەڵکو (فَمَنْ سَلَّمَ) هەر کامـەیان ماڵەکـەیخۆی دایـە دەست ئـەویتر، ئـەو کاتـە (أُجْبِـرَ صَاحِبُهُ) هاوڕێیەکەشـی ناچـار دەکرێ ماڵەکـەی خـۆی بداتەدەست (وَفِي قَـوْلٍ يُجْبَـرانِ) لـە فەرموودەیەکدا هـەردووکیان ناچـار دەکرێن: ماڵەکـەیان ئامادە بکەن و هەر یەکەیان بیداتە دەست ئەویتر.

(قُلْـتُ) ئیمـامی(النـواوی) دەفـەرموێ: (فَـإِنْ کـانَ الـثَّمَنُ مُعَيَّنـاً) ئەگـەر پارەکـەش وەکـو فرۆشـراوەکە دیـارکراو بـێ، لـەو حاڵەتـەدا (سَـقَطَ الْقَـوْلاَنِ الأَوَّلاَنِ) فـەرموودەی یەکـەم و دووەم لا دەچن و (وَأُجْبِرا) هەردووکیان ناچار دەکرێن ماڵەکـەیان بدەنـە دەسـت یـەکتری (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

ئینجا (وَإِذا سَـلَّمَ الْبـائِعُ)هـەر کاتێـك فرۆشـیارەکە فرۆشـراوەکەی دایـە دەسـت کڕیارەکـە (أُجْبِـرَ الْمُشْـتَرِي) کڕیارەکـەش ناچـار دەکـرێ پارەکـەی بداتـە دەسـت فرۆشـیارەکە (إِنْ حَضَرَ الثَّمَنُ) ئەگەر پارەکە لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا حازر بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگـەر پارەکـە حـازر نـەبو، تێبینـی دەکـرێ: (فَـإِنْ کـانَ مُعْسِـراً) ئەگـەر کڕیارەکـە نـەبوویی بـوو، بـۆی نەدەگونجا پارەی فرۆشراوەکە بدا، ئەو کاتـە (فَلِلْبـائِعِ الْفَسْـخُ بِـالْفَلَسِ) فرۆشیارەکە مـافی هەیە: مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە بە هـۆی لاتـیی-نـەبوونیی کڕیارەکـەو فرۆشـراوەکەی وەردەگرێتەوە (أَوْ مُوسِراً) یان ئەگەر کڕیارەکە هەبوویی بـوو و (وَمالُـهُ بِالْبَلَـدِ) لـە شـوێنی مامڵەتەکەدا ماڵی هەبو (أَوْ بِمَسافَةٍ قَرِيبَةٍ) یان لە شـوێنێکی نزیـك ئـەوێ مـاڵی هـەبو، ئـەو کاتە (حُجِرَ عَلَيْهِ فِي أَمْوالِهِ) کڕیارەکە قەدەغـە دەکـرێ لـە دەسـتکاریکردنی گشـت مڵكو ماڵیخۆی (حَتَّى يُسَلِّمَ) تا پارەکە دەداتە فرۆشیارەکە.

بەڵام (فَإِنْ کانَ بِمَسَافَةِ الْقَصْرِ) ئەگەر لە شوێنێکی دوور-بە ئەندازەی هەشتا کیلۆمـەتر و بە سەرەوەتر- کڕیارەکە ماڵی هەبو، ئەو کاتە (لَمْ يُكَلَّفِ الْبائِعُ الصَّبْرَ إِلَـى إِحْضـارِهِ) داوا لە فـرۆشیارەکە ناکرێ خـۆی ڕابگـرێ تا کـڕیارەکە پارەکەی بـۆ دێنـێ، بـەڵکو (وَالأَصَحُّ)

أنَّ لَهُ الْفَسْخَ فَإِنْ صَبَرَ فَالْحَجْرُ كَما ذَكَرْنا، وَلِلْبائِعِ حَبْسُ مَبِيعِهِ حَتَّى يَقْبِضَ ثَمَنَهُ إِنْ خافَ فَوْتَهُ بِلاَ خِلاَف، وَإِنَّمَا الأَقْوالُ إِذَا لَمْ يَخَفْ فَوْتَهُ وَتَنازَعا فِي مُجَرَّدِ الإِبْتِداءِ.

## (بَابُ التَّوْلِيَةِ وَالإِشْراكِ وَالْمُرابَحَةِ)

إِشْتَرَى شَيْئاً ثُمَّ قَالَ لِعالِمٍ بِالثَّمَنِ وَلَّيْتُكَ هَذاالْعَقْدَ فَقَبِلَ لَزِمَهُ مِثْلُ الثَّمَنِ،

---

فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (أنَّ لَهُ الْفَسْخَ) فرۆشیارەکە بۆی هەیە مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە (فَإِنْ صَبَرَ) جا ئەگەر خۆی ڕاگرتو هەڵینەوەشاندەوە، ئەو کاتە (فَالْحَجْرُ كَما ذَكَرْنا) کڕیارەکە قەدەغەی لە سەر دادەندرێ تا پارەکەی دەدا، هەروەك باسمان کرد.

(وَلِلْبائِعِ) فرۆشیارەکە مافی هەیە (حَبْسُ مَبِيعِهِ) فرۆشراوەکەی لە لای خۆی ڕابگرێو نەیداتە دەستیکڕیارەکە (حَتَّى يَقْبِضَ ثَمَنَهُ) تا هەموو پارەکەی وەردەگرێ (إِنْ خافَ فَوْتَهُ) ئەگەر بترسێ پارەکەی بفەوتێو نەیدرێتێ (بِلاَ خِلاَفٍ) لە مەدا هیچ جیاوازی لە نێوان فەرموودەکاندا نیە (وَإِنَّما الأَقْوالُ) بەڵکو فەرموودە جیاوازەکانیڕابرلوو، تەنها (إِذَا لَمْ يَخَفْ فَوْتَهُ) لەو کاتەدا بون: کە نەترسێ پارەکە بفەوتێ، بەلام (وَتَنازَعا فِي مُجَرَّدِ الإِبْتِداءِ) ببێتە کێشەیان: لە تەنها دەست پێکردنی دانە دەست.

ئینجا بزانە: ئەگەر کڕیارەکەش بترسێ فرۆشراوەکە بفەوتێ، ئەویش بۆی هەیە پارەکە نەدا تا هەموو فرۆشراوەکە وەردەگرێ. دیسان بزانە: ئەگەر فرۆشتنەکە بە پارەیەکی حازر نەبێ، بەڵکو بە پارەیەکی قەرز=دواخراو بێ، ئەو کاتە فرۆشیارەکە ناچار دەکرێ دەمودەست فرۆشراوەکە بداتە دەستیکڕیارەکە، واتە: مافی ڕاگرتنی نیە تا ماوەی پارەدانەکە دێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

### ﴿ (بَابُ التَّوْلِيَةِ): باسی کردنە سەرپەرشتکاری مامڵەتو (وَالإِشْراكِ): کردنە هاوبەشی مامڵەتو (وَالْمُرابَحَةِ): قازانج کردن ﴾

١- (التَّوْلِيَةِ): کردنە سەرپەرشتکاری مامڵەت (إِشْتَرَى شَيْئاً) ئەگەر مرۆڤێك شتێکی کڕی (ثُمَّ) ئینجا لە دوای جێگیربوونی مامڵەتەکەو وەرگرتنی فرۆشراوەکە (قَالَ) کڕیارەکە گوتی (لِعالِمٍ بِالثَّمَنِ) بە کەسێکیتر-کە زانستی بە چەندو چۆنیەتی پارەکەی هەبو- (وَلَّيْتُكَ هَذَا الْعَقْدَ) تۆم کردە سەرپەرشتکاری ئەم مامڵەتە (فَقَبِلَ) جا ئەم کەسەش سەرپەرشتکاریەکەی قبوڵ کرد، وەك بڵێ: قبوڵم کرد، یان لێتم کڕیەوە، یان بوومە سەرپەرشتکاری مامڵەتەکە. ئەوە شتەکە دەبێتە مڵکی خۆی، کەوابو: (لَزِمَهُ مِثْلُ الثَّمَنِ) وێنەی هەموو پارەکەی لە سەر واجب دەبێ بیداتە فرۆشیارەکەیدووەم، کەواتە: فرۆشیارەکەی یەکەم مافی نیە داوای پارەکەی لەم سەرپەرشتکارە بکا، چونکە هیچ مامڵەت لە نێوان ئەواندا نەبوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَهُوَ بَيْعٌ فِي شَرْطِهِ وَتَرَتُّبِ أَحْكَامِهِ، لَكِنْ لاَيَحْتَاجُ إِلَى ذِكْرِ الثَّمَنِ، وَلَوْ حُطَّ عَنِ الْمُوَلِّي بَعْضُ الثَّمَنِ انْحَطَّ عَنِ الْمُوَلَّى، وَالإِشْرَاكُ فِي بَعْضِهِ كَالتَّوْلِيَةِ فِي كُلِّهِ إِنْ بَيَّنَ الْبَعْضَ، وَلَوْ أَطْلَقَ صَحَّ وَكَانَ مُنَاصَفَةً، وَقِيلَ لاَ، وَيَصِحُّ بَيْعُ الْمُرَابَحَةِ: بِأَنْ يَشْتَرِيَ بِمِائَةٍ ثُمَّ يَقُولَ بِعْتُكَ بِمَا اشْتَرَيْتُ وَرِبْحِ دِرْهَمٍ لِكُلِّ عَشَرَةٍ أَوْ رِبْحِ دَهْ يَازْدَهْ،

---

(وَهُوَ) ئەو مامڵەتەی سەرپەرشتكاری (بَيْعٌ) فرۆشتنە (فِي شَرْطِهِ) لە مەرج و (وَتَرَتُّبِ أَحْكَامِهِ) دامەزرانی بڕیارەكانی (لَكِنْ لاَيَحْتَاجُ إِلَى ذِكْرِ الثَّمَنِ) بەڵام پێویست بە گوتنی پارەكەی ناكا، چونكە ئاشكرایە: هەر بە پارەكەی كڕینی‌ی دلویەتیە سەرپەرشتكارەكە، كەوابو: (وَلَوْ حُطَّ عَنِ الْمُوَلِّي بَعْضُ الثَّمَنِ) ئەگەر بەشێكی‌پارەكەی لە سەر فرۆشیارەكەی دووەم لادرا (انْحَطَّ عَنِ الْمُوَلَّى) هەمان بەشیش لە سەر سەرپەرشتكارەكە لادەچێ، چونكە سودی كردنە سەرپەرشتكاری ئەمەیە: نرخەكەی بچێتەوە سەر ئەو پارەیەی یەكەمجار فرۆشیارەكەی دووەم پێی كڕیوە، بەڵام-لەگەڵ ئەوەشدا- فرۆشیارەكەی دووەم بۆی هەیە دلوای پارەكەی لە سەرپەرشتكارەكە بكا، هەرچەند فرۆشیارەكەی یەكەمیش دلوای پارەكەی لەوی نەكردبێ، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

٢- (وَالإِشْرَاكُ): كردنە هاوبەش (فِي‌بَعْضِهِ) لە بەشێكی ئەو فرۆشراوەی فرۆشیارەكەی دووەم كڕیویەتی (كَالتَّوْلِيَةِ فِي‌كُلِّهِ) وەك كردنە سەرپەرشتكاریە لە هەموو فرۆشراوەكەدا: كە باسمان كرد، كەواتە: بە ئەندازەی چەندی كردۆتە هاوبەش، بەو ئەندازەیەش لە پارەكەی دەیكەوێتە ئەستۆ (إِنْ بَيَّنَ الْبَعْضَ) بەو مەرجەی بەشەكەی ڕوون بكاتەوە، وەك بڵێ: تۆم كردە هاوبەشی‌خۆم بە نیوەی ئەم شتە، یان بە سێیەكی، یان بە چوارێكی... هتد، ئینجا هاوبەشەكەش قبوڵ بكا.

(وَلَوْأَطْلَقَ) جا ئەگەر-بە بێ‌دیاری‌كردن- گوتی: تۆم كردە هاوبەشی‌خۆم لەم شتەدا. هاوبەشەكەش قبوڵی كرد (صَحَّ) هاوبەشیەكە دروست دەبێ‌و (وكَانَ مُنَاصَفَةً) شتەكە لە نێوانیاندا دەبێتە نیوەو نیوەی پارەكەشی دەكەوێتە سەر هاوبەشەكە (وَقِيلَ لاَ) لە فەرموودەیەكی‌بێ‌هێزدا: دروست نابێ.

٣- (وَيَصِحُّ بَيْعُ الْمُرَابَحَةِ): فرۆشتنی بە قازانج دروستە (بِأَنْ يَشْتَرِيَ بِمِاَةٍ) وەك بە سەد دیرهەم شتێك بكڕێ (ثُمَّ يَقُولَ) ئینجا بڵێتە یەكێكی‌تر-كە زانستی بە چەندو چۆنیەتی پارەكە هەیە-: (بِعْتُكَ بِمَااشْتَرَيْتُ وَرِبْحِ دِرْهَمٍ لِكُلِّ عَشَرَةٍ) فرۆشتمە تۆ بەو پارەیەی پێم كڕیوەو هەم بە قازانجی دیرهەمێك بۆ گشت دە دیرهەمێك (أَوْ) یان بڵێ: (رِبْحِ دَهْ يَازْدَهْ) فرۆشتمە تۆ بە قازانجی دە یازدە، واتە: هەر دەیەك ببێتە یازدە، جا ئەگەر قبوڵی كرد، سەدو دە دیرهەمی دەكەوێتە ئەستۆ.

وَالْمُحاطَّةُ كَبِعْتُ بما اشْتَرَيْتُ وَحَطٌّ دَهْ يازْدَه، وَيُحَطُّ مِنْ كُلِّ أَحَدَعَشَرَ واحِدٌ، وَقِيلَ مِنْ كُلِّ عَشَرَة، وَإذا قالَ بِعْتُ بما اشْتَرَيْتُ لَمْ يَدْخُلْ فيه سوَى الثَّمَن، وَلَوْ قالَ بما قامَ عَلَيَّ، دَخَلَ مَعَ ثَمَنه أُجْرَةُ الْكَيَّالِ وَالدَّلاَّلِ وَالْحارِسِ وَالْقَصَّارِ وَالرَّفَّاءِ وَالصَّبَّاغِ وَقِيمَةُالصِّبْغِ وَسائِرُالْمُؤَنِ الْمُرادَةَ للإسْتِرْباحِ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: هیچ ئەندازەیەك بۆ كەمو زۆریی قازانج دانەندراوە، بەڵكو ئەگەر بەقەد پارەكەی خۆی زیاتریش قازانج بكا، هەر دروستە: وەك شتێك بە سەد دیرهەم بكڕیو بە دوو سەدو بیست دیرهەم بیفرۆشێتەوە، هەروەك لە (نهایة) و(مغنی)دا فەرموویانە ﴿عَنْ عُرْوَةَالْبارِقِي ﷺ: أَنَّهُ إشْتَرَى-لِلنَّبِيِّ ﷺ- شاتَيْنِ بِدينار، فَباعَ أَحَدَهُما بِدينارِ، فَدَعا لَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِالْبَرَكَةِ﴾ حديث صحيح رواه أبودلود، (عُرْوَة) دوو مەڕی بۆ پێغەمبەرﷺ بە یەك دینار كڕین، جا یەكێكیانی بە دینارێك فرۆشتەوەو پێغەمبەرﷺ دوعای بەرەكەتی بۆ كرد.

٤- (وَالْمُحاطَّةُ): فرۆشتنی بە زەرەر دروستە (كَبِعْتُ) وەك بڵێ: فرۆشتمە تۆ (بِما اشْتَرَيْتُ) بەو نرخەی پێم كڕیوە (وَحَطٌّ دَهْ يازْدَه) بە زەرەری دە یازدە، واتە: (وَيُحَطُّ مِنْ كُلِّ أَحَدَ عَشَرَ واحِدٌ) لە هەر یازدەیەك یەكێك دادەشكێندرێو دەبێتە زەرەر (وَقِيلَ مِنْ كُلِّ عَشَرَةٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: لە هەر دەیەك یەكێك دەبێتە زەرەر.

﴿ ئاگاداری ﴾: جگە لێرەش فرۆشتنی بە زەرەر ئەگەر لە بەر خاتری كڕیارەكە بێ، خێری دەگاتێ، بەڵام ئەگەر لە بەر خاتریكڕیارەكە نەبێو نەزانێ خاترگرتن خێرە، ئەو كاتە بەو زەرەرە خێری ناگاتێ، هەروەك (تحفة)و (نهایة)-لە كۆتایی مامڵەتەكانی قەدەغەكراودا- ڕوونیان كردۆتەوە، لە حەدیسێكی بێهێزیشدا هاتوە: ﴿مَاكِسْ عَنْ دِرْهَمِكَ فَإنَّ الْمَغْبُونَ لاَ مَأْجُورٌ وَلاَ مَحْمُودٌ﴾ أخرجه البغوی وأبویعلی، زۆر سەودا بكەو هەوڵ بدە بە پارەیەكی كەم شتومەك بكڕی، چونكە ئەو كەسەی لە مامڵەتدا زەرەر دەكا، نە خێری دەگاتێو نە سوپاسی دەكرێ.

(وَإذا قالَ) هەر كاتێك گوتی (بِعْتُ بِماشْتَرَيْتُ) فرۆشتمە تۆ بەو نرخەی پێم كڕیوە (لَمْ يَدْخُلْ فِيهِ سِوَىالثَّمَنِ) ئەوە جگە لەو پارەیەی پێی كڕیوە هیچیتر ناچێتە گەڵ نرخەكەی، بەڵام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی (بِما قامَ عَلَيَّ) فرۆشتمە تۆ بەو نرخەی لە سەرم وەستاوە. ئەو كاتە (دَخَلَ مَعَ ثَمَنِهِ) دەچێتە گەڵ نرخی پێكڕینی هەر مەسرەفێكی لەو شتەی كردبێ: وەك (أُجْرَةُالْكَيَّالِ) كرێی پێوەر (وَالدَّلاَّلِ) كرێی دەلالو (وَالْحارِسِ) كرێی چاودێرو (وَالْقَصَّارِ)كرێی بەرگشۆرو (وَالرَّفَّاءِ) كرێی پینەكەرو (وَالصَّبَّاغِ) كرێی سبوغكەرو (وَقِيمَةُالصِّبْغِ) نرخی سبوغەكەو (وَسائِرُالْمُؤَنِ الْمُرادَةَ) گشت ئەركەكانیتر: كە مەبەستن (لِلإسْتِرْباحِ) بۆ قازانج كردن، وەكو قەڵەوكردنی ئاژەڵو كرێی دوكانو

وَلَوْ قَصَّرَ بِنَفْسِه أَوْ كالَ أَوْ حَمَلَ أَوْ تَطَوَّعَ بِه، شَخْصٌ لَمْ تَدْخُلْ أُجْرَتُهُ، وَلْيَعْلَما ثَمَنَهُ أَوْ ما قامَ بِهِ فَلَوْ جَهِلَهُ أَحَدُهُما بَطَلَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلْيَصْدُقِ الْبائِعُ فِي قَدْرِ الثَّمَنِ وَالأَجَلِ وَالشِّراءِ بِالْعَرْضِ وَبَيانِ الْعَيْبِ الْحادِثِ عِنْدَهُ، فَلَوْ قالَ بِمِأَةٍ فَبانَ بِتِسْعِينَ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ تُحَطُّ الزِّيادَةُ وَرِبْحُها، وَأَنَّهُ لاَ خِيارَ لِلْمُشْتَرِي، وَلَوْ زَعَمَ أَنَّهُ مِأَةٌ وَعَشَرَةٌ وَصَدَّقَهُ الْمُشْتَرِي لَمْ يَصِحَّ الْبَيْعُ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ صِحَّتُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئوتومبێل‌و ئەو جۆرە شتانە، بەڵام (وَلَوْ قَصَّرَ بِنَفْسِهِ) ئەگەر هەر بەخۆی: شتەکەی شوشتبو (أَوْ كالَ) یان پێوابوی (أَوْ حَمَلَ) یان هەڵیگرتبو (أَوْ تَطَوَّعَ بِهِ شَخْصٌ) یان یەکێك بەخۆڕایی کارێکی لەو کارانە بۆ کردبو، ئەوە (لَمْ تَدْخُلْ أُجْرَتُهُ) کرێی ئەو کارە وەگەڵ نرخەکەی ناکەوێ، چونکە هیچ پارەی بۆ سەرف نەکردوە.

(وَلْيَعْلَما ثَمَنَهُ) با کڕیارەکەو فرۆشیارەکە بزانن پارەکەی چەندە، لەو مەسەلەیەدا کە گوتی: فرۆشتمە تۆ بەو نرخەی پێم کڕیوە (أَوْ ما قامَ بِهِ) یان بزانن: بەچەند وەستاوە، لەو مەسەلەیەدا کە گوتی فرۆشتمە تۆ بەو نرخەی لەسەرم وەستاوە (فَلَوْ جَهِلَهُ أَحَدُهُما) ئەگەر یەکێکیان نەیزانی پارەکە چەندە، یان بەچەند وەستاوە (بَطَلَ) فرۆشتنەکە بەتاڵ دەبێتەوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لەسەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلْيَصْدُقِ الْبائِعُ) هەم واجبە فرۆشیارەکەش ڕاستی بڵێ تا باوەڕی پێ بکرێ (فِي قَدْرِ الثَّمَنِ) دەربارەی ئەندازەی‌ئەو پارەیەی مامڵەتەکەی پێ‌کراوەو، هەم (وَالأَجَلِ) دەربارەی ماوە دانان، هەم (وَالشِّراءِ بِالْعَرْضِ) دەربارەی‌کڕینی بە کەلوپەلێکی جگە لە پارە، هەم (وَبَيانِ الْعَيْبِ الْحادِثِ عِنْدَهُ) دەربارەی ئەو عەیبەی لە لای‌خۆی پەیدا بوە، جا ئەگەر فرۆشیارەکە ڕاستی‌ی نەگوت، کڕیارەکە مافی‌پەشیمانی‌ی هەیە، هەروەك لە(تحفە)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

(فَلَوْ قالَ بِمِأَةٍ) ئەگەر گوتی بە سەد دینارم کڕیوەو بە قازانجی دە یازدە فرۆشتمە تۆ (فَبانَ بِتِسْعِينَ) ئینجا ئاشکرا بو: بە نەوەد دیناری کڕیوە، ئەوە فرۆشتنەکە دروست دەبێ، بەڵام (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ تُحَطُّ الزِّيادَةُ وَرِبْحُها) دە دینارە زیدەکەو قازانجەکە –هەردووکیان– لا دەدرێن‌و بە نەوەدو بە قازانجی نەوەدەکە دەبێتە ملکی کڕیارەکە (وَأَنَّهُ لاَ خِيارَ لِلْمُشْتَرِي) کڕیارەکەش مافی پەشیمانبوونەوەی نیە.

(وَلَوْ زَعَمَ أَنَّهُ مِأَةٌ وَعَشَرَةٌ) ئەگەر لەو مەسەلەیەدا–لە دوای فرۆشتن– فرۆشیارەکە وا تێگەیشت پارەکە سەدو دە دینارە (وَصَدَّقَهُ الْمُشْتَرِي) کڕیارەکەش باوەڕی پێ‌کرد (لَمْ يَصِحَّ الْبَيْعُ فِي الأَصَحِّ) فرۆشتنەکە دروست نابێ (قُلْتُ) ئیمامی(النووی) دەفەرموێ: (الأَصَحُّ صِحَّتُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: فرۆشتنەکە دروست دەبێ، بەڵام دە دینارەکە ناکەوێتە سەر کڕیارەکە، کەوابو: فرۆشیارەکە مافی پەشیمانی‌ی هەیە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

وَإِنْ كَذَّبَهُ وَلَمْ يُبَيِّنْ لِلْغَلَطِ وَجْهاً مُحْتَمَلاً لَمْ يُقْبَلْ قَوْلُهُ وَلاَ بَيِّنَتُهُ، وَلَهُ تَحْلِيفُ الْمُشْتَرِي: أَنَّهُ لاَ يَعْرِفُ ذَلِكَ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ بَيَّنَ فَلَهُ التَّحْلِيفُ، وَالأَصَحُّ سَماعُ بَيِّنَتِه.

## (بابُ الأُصُولِ وَالثِّمارِ)

قالَ بِعْتُكَ هَذِهِ الأَرْضَ أَوِالسَّاحَةَ أَوِالْبُقْعَةَ وَفِيها بِناءٌ وَشَجَرٌ، فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يَدْخُلُ فِي الْبَيْعِ دُونَ الرَّهْنِ،

---

(وَإِنْ كَذَّبَهُ) بەلام ئەگەر –لەو مەسەلەیەدا– کڕیارەکە باوەڕی بە فرۆشیارەکە نەکردو گوتی: درۆ دەکا (وَلَمْ يُبَيِّنْ لِلْغَلَطِ وَجْهاً مُحْتَمَلاً) فرۆشیارەکەش ڕوویێکی گونجاوی بۆ هەڵەکەی خۆی ئاشکرا نەکرد، واتە: هیچ بەڵگەیەکی گونجاوی نەبو (لَمْ يُقْبَلْ قَوْلُهُ) قسەکەی وەرناگیرێ، هەم (وَلاَ بَيِّنَتُهُ) شاهیدیشی وەرناگیرێن، بەلام (وَلَهُ) فرۆشیارەکە مافی هەیە (تَحْلِيفُ الْمُشْتَرِي) کڕیارەکە سوێند بدا: کە (أَنَّهُ لاَ يَعْرِفُ ذَلِكَ) نازانێ پارەکە سەدو دە دینارەو فرۆشیارەکە هەڵەی کردوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَإِنْ بَيَّنَ) بەلام ئەگەر بەڵگەیەکی گونجاوی –لە سەر هەڵەکەی– ئاشکرا کرد، وەك بڵێ: وەکیلەکەم بۆی کڕیبومو بە درۆ نرخەکەی پێ گوتبوم. ئەو کاتە (فَلَهُ التَّحْلِيفُ) بۆی هەیە کڕیارەکە سوێند بدا، هەم (وَالأَصَحُّ سَماعُ بَيِّنَتِهِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: شاهیدەکانیشی وەردەگیرێن.

## ﴿ بابُ الأُصُولِ: **باسی فرۆشتنی بنچینەکانو** (وَالثِّمارِ): **میوەکان** ﴾

(قالَ) ئەگەر فرۆشیارەکە گوتی: (بِعْتُكَ هَذِهِ الأَرْضَ) ئەم زەویەم فرۆشتە تۆ (أَوِالسَّاحَةَ) یان ئەم گۆڕەپانەم فرۆشتە تۆ (أَوِالْبُقْعَةَ) یان ئەم پارچەیەم فرۆشتە تۆ (وَفِيها بِناءٌ وَشَجَرٌ) لەو حاڵەتەشدا زەویەکە خانوو و درەختی تێدابو، یان بیری تێدابو (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب ئەمەیە: (أَنَّهُ يَدْخُلُ فِي الْبَيْعِ) ئەو بیرو خانوو و درەختە وەگەڵ فرۆشتنی زەویەکە دەکەونو دەبنە ملکی کڕیارەکە (دُونَ الرَّهْنِ) بەلام لە ڕەهنکردنیزەویدا خانوو و درەختو بیر وەگەڵ ڕەهن ناکەون.

ئینجا بزانە: هەر مامڵەتێك ملکایەتی بگوازێتەوە: وەك بەخشینو وەقفو وەسیێتو کردنە مارەییو کرێو سولحو عیوەزی خولع، ئەوانە گشتی وەکو فرۆشتنن، بەلام درەختی ووشکو درەختی هەڵکەندراو و ئەو نەمامو شتڵەی بۆ هەڵکەندن داچێندراون، هیچیان وەگەڵ فرۆشتنی زەوی ناکەون، مەگەر درەختە ووشکەکە دیوارێك، یان درەختیتری پێ ڕاگیرابێ، یان کرابێتە کەپری دارەمێو، ئەو کاتە وەگەڵ فرۆشتنی زەویەکە دەکەوێ، هەروەهاش ئاوی ناو بیرەکە –کە لە کاتی فرۆشتنندا لە ناویدایە– مەرجە: ناوی بێنێو بڵێ: ئەم ئاوەی ئێستاشی لەگەڵدابێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

وَأُصُولُ الْبَقْلِ الَّتِي تَبْقَى سَنَتَيْنِ كَالْقَتِّ وَالْهِنْدبا كَالشَّجَرِ، وَلاَ يَدْخُلُ ما يُؤْخَذُ دَفْعَةً كَحِنطَةٍ وَشَعِيرٍ وَسائِرِ الزُّرُوعِ، وَيَصِحُّ بَيْعُ الأَرْضِ الْمَزْرُوعَةِ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلِلْمُشْتَرِي الْخِيارُ إِنْ جَهِلَهُ، وَلاَ يَمْنَعُ الزَّرْعُ دُخُولَ الأَرْضِ فِي يَدِ الْمُشْتَرِي وَضَمانِهِ إِذا حَصَلَتِ التَّخْلِيَةُ فِي الأَصَحِّ،

---

﴿ئاگـاداری﴾: هـەر کاتێـك زەویـەکی فرۆشـت کـە مـافی ئـاودانی لـە ڕوبارێـك، یـان لـە سەرچاوەیەك، یان لە بیرێکی‌گشتی هـەبو، ئـەوە-بێ‌باسکردن- بەشـە ئاوەکەشـی وەگـەڵ فرۆشتنەکەی دەکەوێ، جا ئەگەر ئەم زەویەی فرۆشتە چـەند کەسـێك، ئـەو کاتـەش بەشـی هەر کەسەیان-بەگوێرەی‌خۆی بە پێوانـە- بەشـە ئاوەکـەی بـەر دەکـەوێ، هـەروەها ئەگـەر زەویەکە ئاوی تایبەتی‌خۆی لـە نـاو سنوری خـۆی‌دا بـوو، ئـەو کاتـەش-بێ‌باسـکردن- ئـەم ئاوەی وەگەڵ فرۆشتنی دەکەوێ، بەڵام ئەگەر ئاوەکـە ملکـی تایبـەتی فرۆشیارەکە بـوو و لە دەرەوەی سنوری زەویەکەدا بوو، ئەو کاتە-ئەگەر فرۆشیارەکە نـاوی نـەهێنێ- وەگـەڵ فرۆشتنی زەویەکە ناکەوێ، کەوابو: مەرجە بڵێ: ئەم زەویەم لەگەڵ ئەم ئـاوەم فرۆشـتە تـۆ. یان بڵێ: بە گشت مافێکەوە فرۆشتمە تۆ.

ئینجـا بزانـە: دروسـت نیـە مـافی ئاودانی‌زەویەکـە-بـە بێ‌زەویەکـە- بـە تـەنها بفرۆشـرێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوە.

(وَأُصُولُ الْبَقْلِ الَّتِي تَبْقَى سَنَتَيْنِ) بنچینەی بڕکـی ئـەو سـەوزانەی تـا دوو سـاڵان لـە زەوی‌دا دەمێننەوە، یان کەمتر دەمێنێتەوە، بەڵام جار لە دوای‌جار خـۆی، یـان میوەکـەی دەبڕنـەوە (كَالْقَتِّ) وەکو وێنجەو سلقی گەڵا، هەم (وَ) وەکو (الْهِنْدِباءِ)، هـەم شفتیو خـەیارو کـەرەوزو ئەو جۆرە شتانە، گشتی (كَالشَّجَرِ) وەکـو درەختی‌تـەڕ وەگـەڵ فرۆشـتنی زەوی دەکـەون، بەڵام (وَلاَ يَدْخُلُ) وەگەڵ فرۆشتنی زەوی ناکەوێ (ما يُؤْخَذُ دَفْعَةً) ئەو شتەی تـەنها یـەك جـار دەبڕێتـەوە: (كَحِنطَةٍ وَشَعِيرٍ) وەکـو گـەنمو جـۆو دانەوێڵـەکانی‌تر (وَسـائِرِ الـزُّرُوعِ) گشـت کشتوکاڵەکانی‌تریش: وەك پیازو تووروو سلقی بنك.

(وَيَصِحُّ) دروستە (بَيْعُ الأَرْضِ الْمَزْرُوعَةِ) فرۆشتنی ئەو زەویـەی کشـتوکاڵێکی وەهـای تـێ‌دا چـێندراوە: کـە وەگـەڵ فرۆشـتنی زەویەکـە ناکـەوێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لـە سـەر فـەرموودەی ڕاستی مەزهەب، بـەڵام (وَلِلْمُشْتَرِي الْخِيـارُ) کڕیارەکـە مـافی پەشیمانی‌ی هەیـە (إِنْ جَهِلَـهُ) ئەگـەر نـەیزانیبێ ئـەو زەویـە داچـێندراوە، وەك بـە ماوەیـەکی کـەم لـە پـێش کڕینـی‌دا دیتبێتـی (وَلاَ يَمْنَـعُ الـزَّرْعُ) ئـەو کشـتوکاڵە ڕێگـەی ئـەوە نـاگرێ (دُخُـولَ الأَرْضِ فِـي يَـدِ الْمُشْتَرِي) زەویەکە بکەوێتە دەستی‌کڕیارەکەو (وَضَمانِهِ) بکەوێتە بـن زەمانـەتی کڕیارەکـە (إِذا حَصَلَتِ التَّخْلِيَـةُ) هـەر کاتێك وازلێهێنـانی لـە لایـەن فرۆشیارەکەیەوە هاتـە جـێ (فِـي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

وَالْبَذْرُ كَالزَّرْعِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ أُجْرَةَ لِلْمُشْتَرِي مُدَّةَ بَقاءِ الزَّرْعِ، وَلَوْ باعَ أَرْضاً مَعَ بَــذْرٍ أَوْ زَرْعٍ لاَ يُفْرَدُ بِالْبَيْعِ بَطَلَ فِي الْجَمِيعِ، وَقِيلَ فِيالأَرْضِ قَوْلاَنِ، وَيَدْخُلُ فِيبَيْـعِ الأَرْضِ الْحِجارَةُالْمَخْلُوقَةُ فِيها دُونَ الْمَدْفُونَةِ، وَلاَ خِيارَ لِلْمُشْتَرِي إِنْ عَلِمَ وَيَلْزَمُ الْبائِعَ النَّقْلُ،

---

(وَالْبَذْرُ) تۆوی وەشێندراو لە ناو زەویەفرۆشراوەکەدا (كَالزَّرْعِ) وەك درەخت‌و کشتوکاڵی ڕابردووە، واتە: ئەگەر بەردەوام دەماوە: وەك چواڵەو گوێزو ئەو جۆرە شتانە، یان جار لە دوای جار دەبڕدراوە: وەك کەرەوزو ئەو جۆرە شتانە، ئەو جۆرە تۆوەش وەگەڵ زەویە فرۆشراوەکە دەکەوێو دەبێتە ملکی کڕیارەکە، ئەگەر نا: وەکو گەنم‌و جۆو ئەو جۆرە دانەوێڵانە، ئەوانە وەگەڵ فرۆشتنی زەوی ناکەون.

بەڵام ئاگاداریە: ئەو کشتوکاڵەیڕابردوو و هەم ئەوەی لەم تۆوەش پەیدا دەبێ–هەردوو جۆریان– تا کاتی دروێنەیان‌و برینەوەیان لە زەویەکەدا دەهێڵدرێنەوە، کەوابو: (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَأُجْرَةَ لِلْمُشْتَرِي مُدَّةَ بَقاءِالزَّرْعِ) کڕیارەکە مافی کرێی ئەو ماوەیەی نیە: کە ئەو جۆرە کشتوکاڵانەی تێدا دەمێنێتەوە، تا دەگاتە کاتی دروێنەو برینەوە.

(وَلَوْ باعَ أَرْضاً) ئەگەر زەویەکیداچێندراوی فرۆشت (مَعَ بَذْرٍ) لەگەڵ تۆوێکی وەشێندراو (أَوْ زَرْعٍ) یان لەگەڵ کشتوکاڵێکی چێندراو: کە (لاَ يُفْرَدُ بِالْبَيْعِ) نە تۆوەکەو نە کشتوکاڵەکە بە تەنها نەدەفرۆشران: وەك گشت تۆوێك‌و گشت سلق‌و پیازێکی ژێرخاك‌و گەنم‌و جۆی لە ناو گوڵی خۆیدا، واتە: ئەگەر ئەوانەی لەگەڵ زەویەکەدا وێکڕا فرۆشتن (بَطَلَ فِيالْجَمِيعِ) فرۆشتنەکە لە گشتیاندا بەتاڵە، واتە: نە فرۆشتنی زەویەکە دروست دەبێو نە فرۆشتنی تۆوەکەو کشتوکاڵەکە، چونکە نەدیتراون (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (فِيالأَرْضِ قَوْلاَنِ) دەربارەی دروستبوونی فرۆشتنی زەویەکە دوو فەرموودە هەنە: یەکێکیان دەفەرموێ: فرۆشتنی زەویەکە–بە تەواوی پارەکە– دروست دەبێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر کشتوکاڵەکە بە تەنها دەفرۆشرا: وەك قەرسیل، ئەو کاتە فرۆشتنی لەگەڵ زەویەکەشدا دروست دەبێ، هەروەك لە باسی فرۆشتنی میوەو کشتوکاڵدا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَيَدْخُلُ فِي بَيْـعِ الأَرْضِ) وەگەڵ فرۆشتنی زەوی دەکەوێ (الْحِجارَةُ الْمَخْلُوقَةُ فِيها) ئەو بەردانەی لە زەویەکەدا خوا دروستی کردون: وەك بەردی ڕستم‌و کانگە بەرد، یان خاوەنەکەی تێیدا چەقاندون بۆ دیوارو ڕێکخستنی زەویەکە (دُونَ الْمَدْفُونَةِ) بەڵام ئەو بەردانەی لە زەویەکەدا شاردراونەوە–واتە: یان کراونە کۆمەڵ– ئەوانە وەگەڵ فرۆشتنەکە ناکەون (وَلاَ خِيارَ لِلْمُشْتَرِي) کڕیارەکە مافی پەشیمانیی نیە (إِنْ عَلِمَ) ئەگەر زانیبێتی ئەو بەردانەی تێدا شاردراونەوە، بەڵام (وَيَلْزَمُ الْبائِعَ النَّقْلُ) لە سەر فرۆشیارەکە واجبە:

وَكَذَا إنْ جَهِلَ وَلَمْ يَضُرَّ قَلْعُها، وَإِنْ ضَرَّ فَلَهُ الْخيارُ: فَإنْ أجازَ لَزِمَ الْبائِعَ اَلنَّقْلُ وَتَسْوِيَةُالأرْضِ، وَفِي وُجُوب أُجْرَةِالْمِثْلِ مُدَّةَ النَّقْلِ أوْجُهٌ: أصَحُّها تَجِبُ إنْ نَقَلَ بَعْدَالْقَبْضِ لاَ قَبْلَهُ، وَيَدْخُلُ فِي بَيْعِ الْبُسْتانِ اَلأرْضُ وَالشَّجَرُ وَالْحيطانُ وَكَذَا الْبِناءُ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَفِي بَيْعِ الْقَرْيَةِ اَلأَبْنِيَةُ وَساحاتٌ يُحيطُ بِها السُّورُ، لاَالْمَزارِعُ عَلَىالصَّحيحِ، وَفِي بَيْعِ الدَّارِ اَلأرْضُ

---

بەردەكان دەربێنێو لایانبباو گڵەكەش دەناو قۆرتەكە بكاتەوە (وَكَذَا إنْ جَهِلَ) هەروەها ئەگەر نەشیزانیبێ ئەو بەردانەی تێدانە، مافی پەشیمانیی نیە (وَلَمْ يَضُرَّ قَلْعُها) بەو مەرجەی هەڵكەندنی بەردەكان زیان لە زەویەكە نەدا، كەوابو: فرۆشیارەكە بەردەكان لادەباو گڵەكەش دەناو قۆرتەكە دەكاتەوە، هەروەك گوتمان.

(وَإِنْ ضَرَّ) بەڵام ئەگەر نەیزانیبو ئەو بەردانەی تێدا شاردراونەوە، هەڵكەندنی بەردەكانیش زیانی لە زەویەكە دەدا (فَلَهُ الْخيارُ) ئەو كاتە كڕیارەكە مافی پەشیمانیی هەیە (فَإنْ أجازَ) جا ئەگەر پەشیمان نەبۆوەو مامڵەتەكەی ڕۆیاند (لَزِمَ الْبائِعَ اَلنَّقْلُ) لە سەر فرۆشیارەكە واجبە: بەردەكان دەربێنێو لایانبباو (وَتَسْوِيَةُ الأرْضِ) زەویەكەش ڕێك بخاتەوە، واتە: ئەو گڵەی بە هۆی بەردەكان هاتۆتە دەرەوە دەناو قۆرتەكان بكاتەوە.

(وَفِي وُجُوبِ أُجْرَةِ الْمِثْلِ) دەربارەی واجببوونی كرێی هاوێنەی زەویەكە بۆ كڕیارەكە (مُدَّةَ النَّقْلِ) بۆ ئەو ماوەیەی بەردەكان لادەبا (أوْجُهٌ) چەند فەرموودەیەك هەنە (أصَحُّها) ڕاستترەكەیان: (تَجِبُ) كرێی هاوینە واجب دەبێ: لە سەر فرۆشیارەكە (إنْ نَقَلَ بَعْدَ الْقَبْضِ) ئەگەر لە دوای وەرگرتنی زەویەكە بەردەكانی لابردن (لاَ قَبْلَهُ) بەڵام ئەگەر پێش وەرگرتنی زەویەكە لایبردن كرێیەكە واجب نابێ.

(وَيَدْخُلُ فِيبَيْعِ الْبُسْتانِ) وەگەڵ فرۆشتنی ڕەزو باغ دەكەوێ (اَلأرْضُ) زەویەكەو (وَالشَّجَرُ) درەختی تەڕو (وَالْحيطانُ) دیوارەكانیو پەرژینو كەپری دارەمێو و (وَكَذَاالْبِناءُ) هەروەها ئەو خانووەی دەناو باغەكەدایە، ئەویش وەگەڵ دەكەوێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستیمەزهەب (وَفِي بَيْعِ الْقَرْيَةِ) وەگەڵ فرۆشتنی گوند-دێ دەكەوێ (اَلأَبْنِيَةُ) خانووەكانیو (وَساحاتٌ يُحيطُ بِهاالسُّورُ) هەم ئەو گۆڕەپانانەی شوورەی گوندەكە دەورەی داون (لاَالْمَزارِعُ) بەڵام باغو بێستانەكانی گوندەكە-كە لە دەرەوەن- وەگەڵ فرۆشتنی گوندەكە ناكەون (عَلَىالصَّحيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَفِي بَيْعِ الدَّارِ) وەگەڵ فرۆشتنی خانوو دەكەوێ (اَلأرْضُ) ئەو ئەندازە زەویەی خانووەكەی لە سەر دروست كراوە بەو مەرجەی زەویەكەش ملكی خاوەن خانووەكە بێ، واتە: ئەگەر زەویەكەش ملكی خاوەن خانووەكە نەبو، ئەو كاتە وەگەڵ فرۆشتنی

وَكُلُّ بناء حَتَّى حَمَّامُها، لاَالْمَنقُولُ كَالدَّلْوِ وَالْبَكْـرَةِ وَالسَّـرِيرِ، وَتَـدْخُلُ الأَبْـوابُ الْمَنصُوبَةُ وَحِلَقُها وَالإِجَّاناتُ وَالرَّفُّ وَالسُّلَّمُ الْمُسَمَّرانِ، وَكَذَاالأَسْفَلُ مِـنْ حَجَـرَيِ الرَّحَى عَلَىالصَّحِيحِ وَالأَعْلَى، وَمِفْتاحُ غَلَقٍ مُثْبَتٌ فِيالأَصَحِّ، وَفِي بَيْعِ الدَّابَّـةِ نَعْلُهـا، وَكَذَا ثِيابُ الْعَبْدِ فِي بَيْعِهِ فِيالأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ لاَ تَدْخُلُ ثِيابُ الْعَبْدِ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَرْعٌ) باعَ شَجَرَةً دَخَلَ عُرُوقُها وَوَرَقُها –وَفِي وَرَقِ التُّوتِ

---

خانووەکە ناکەوێ، کەوابو: کڕیارەکە ماڧی پەشیمانی‌ی هەیە، ئەگەر نەیزانیبێ زەویەکە هی خاوەنی‌خانووەکە نیە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(وَكُلُّ بِناءٍ) هەروەها وەگەڵ فرۆشتنی خانوو دەکەوێ گشت ژوورو هۆدەو داڵان‌و بان‌و (حَتَّى حَمَّامُها) تا ژوورەکەی سەرشۆرگەو ئاودەستخانەکان‌و دەستشۆرە پێوە بەستراوەکانیش (لاَالْمَنقُولُ) بەڵام ئەو شتانەی دەگوازرێنەوە، وەگەڵ فرۆشتنی خانوو ناکەون (كَالدَّلْوِ) وەکو دۆلکەی بیرو (وَالْبَكْرَةِ) بەکرەی پەتی بیرو (وَالسَّرِيرِ) تەختەی لە سەر خەوتن‌و کورسی‌و پەیژەی نەبەستراو و پانکەی هەواو پەردەی پەنجەرەو، هەر شتێکی‌تری لەم بابەتە.
(وَتَدْخُلُ الأَبْوابُ الْمَنصُوبَةُ) وەگەڵ فرۆشتنی خانوو دەکەوێ: ئەو دەرگانەی بە خانووەکەوە بەستراون‌و (وَحِلَقُها) ئەڵقەکانی‌و (وَالإِجَّاناتُ) هەم حەوزی سەر شۆرگەو (وَالرَّفُّ) ڕەفتەو (وَالسُّلَّمُ) پەیژە-قادرمەو (الْمُسَمَّرانِ) بەو مەرجەی ڕەفتەو پەیژەکە بە خانووەکەوە بەسترابن (وكَذَا الأَسْفَلُ مِنْ حَجَرَيِ الرَّحَى) هەروەها بەردی بنەوەی دوو بەرداشەکانیش وەگەڵ فرۆشتنی ئاشەکە دەکەوێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لەسەر فەرموودەی ڕاست (وَالأَعْلَى) هەم بەردی سەرەوەش وەگەڵ دەکەوێو (وَمِفْتاحُ غَلَقٍ مُثْبَتٌ) هەم کلیلی کێلونی پێوە بەستراویش وەگەڵ دەکەوێ، بەڵام قوفڵو کلیلەکەی وەگەڵ ناکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.
(وَفِيبَيْعِ الدَّابَّةِ نَعْلُها) لە فرۆشتنی وولاغدا: ناڵەکانیش وەگەڵ فرۆشتن دەکەون، بەڵام زین‌و کورتان‌و لغاو و ڕەشمەکەی وەگەڵ ناکەون (وكَذَا ثِيابُ الْعَبْدِ فِيبَيْعِهِ فِيالأَصَحِّ) هەروەها جل‌وبەرگی کۆیلەش وەگەڵ فرۆشتن دەکەوێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (الأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (لاَ تَدْخُلُ ثِيابُ الْعَبْدِ) جل‌و بەرگو پێڵاوی کۆیلە وەگەڵ فرۆشتنی‌کۆیلەکە ناکەون (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَرْعٌ: لقێك لە باسی فرۆشتنی درەخت ﴾

(باعَ شَجَرَةً) هەر کاتێك درەختێکی تەڕی فرۆشت (دَخَلَ عُرُوقُها) ڕەگەکانیشی وەگەڵ فرۆشتنی دەکەون (وَ) هەم (وَرَقُها) گەڵایەکەشی وەگەڵ دەکەوێ، بەڵام (وَفِي وَرَقِ التُّوتِ

وَجْهٌ- وَأَغْصانُها إلاَّ الْيابِسَ، وَيَصِحُّ بَيْعُها بِشَرْطِ الْقَلْعِ أَوِ الْقَطْعِ وَبِشَرْطِ الإِبْقاءِ، وَالإِطْلاَقُ يَقْتَضِي الإِبْقاءَ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْمَغْرِسُ لَكِنْ يَسْتَحِقُّ مَنْفَعَتَهُ ما بَقِيَتِ الشَّجَرَةُ،

---

وَجْهٌ) لەبارەی گەڵای تووی سپی فەرموودەیەك هەیە: كە وەگەڵ فرۆشتنی درەختەكە ناكەوێ، چونكە كرمی ئاوریشمی پێ پەروەردە دەكرێ (وَأَغْصانُها) هەم لقەكانیشی وەگەڵ فرۆشتنی دەكەون (إلاَّ الْيابِسَ) تەنها لقەووشكەكانی وەگەڵ فرۆشتن ناكەون.

(وَيَصِحُّ بَيْعُها) دروستە: درەختی تەڕو درەختی ووشك بفرۆشرێن: هەر یەكەی (بِشَرْطِ الْقَلْعِ) بە مەرجی هەڵكەندنی (أوِالْقَطْعِ) یان بە مەرجی بڕینی (وَبِشَرْطِ الإِبْقاءِ) هەم بە مەرجی هێشتنەوەشی ئەگەر درەختەكە تەڕ بێ، جا بە هەر مەرجێك بێ، واجبە: مەرجەكە جێبەجێ بكرێ، بەڵام (وَالإِطْلاَقُ) فرۆشتنی بێمەرج، واتە: باسی هەڵكەندن‌و بڕین‌و هێشتنەوەی نەكرابێ (يَقْتَضِي الإِبْقاءَ) وا دەخوازێ درەختەكە بهێشترێتەوە، ئەگەر درەختەكە تەڕ بێ.

﴿ئاگاداری﴾ یەكەم: ئەگەر بە مەرجی بڕین درەختەكە بفرۆشێ، ئەوە ڕەگەكانی وەگەڵ فرۆشتن ناكەون‌و هەر بۆ فرۆشیارەكە دەمێننەوە، كەوابو: درەختەكە لە سەر ڕووی زەوی دەبڕدرێ، بەڵام ئەگەر بە مەرجی هەڵكەندن، یان بە مەرجی هێشتنەوە فرۆشتی، ئەو كاتە ڕەگەكانی وەگەڵ فرۆشتن دەكەون‌و دەبنە ملكی‌كڕیارەكە، كەواتە: بۆ كڕیارەكە دروستە: زەویەكە هەڵكەنێ‌و ڕەگەكانی لە ژێر خاكدا بێنێتە دەر، هەرچەند زیانیش بگاتە زەویەكە، جا هەر نەمام‌و درەختێكی‌تر: كە لە ڕەگەكانی ئەم درەختە بڕوێ-پەیدا ببێ، ئەویش هەر دەبێتە ملكی‌كڕیارەكە‌و وەك دایكەكەی ماڧ هەیە بیهێڵێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر یەكێك درەختێكی بڕی‌و لە ملكی كەسێكی‌تردا بە سەر شتێكدا كەوت‌و لە ناوی برد، ئەوە تۆڵەی لە سەر واجب دەبێ، جیاوازی نیە: بزانێ بە سەر شتەكەدا دەكەوێ، یان نەزانێ، بەڵام ئەگەر لە ملكی خۆیدا درەختێكی بڕی‌و هەر لە ناو ملكی خۆیدا بە سەر شتێكدا كەوت‌و زیانی لێدا، ئەوە ئەگەر دەیزانی بە سەر شتەكەدا دەكەوێ، تۆڵەی لە سەرە، ئەگەر نەیدەزانی، لە سەری نیە، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەكانیدا ڕوون كراوەتەوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْمَغْرِسُ) ئەو شوێنەی-لە زەویدا- درەختەكەی تێدا چێندراوە، وەگەڵ فرۆشتن ناكەوێ‌و نابێتە ملكی كڕیارەكە (لَكِنْ يَسْتَحِقُّ مَنْفَعَتَهُ) بەڵام كڕیارەكە ماڧی سودلێوەرگرتنی شوێنەكەی هەیە (ما بَقِيَتِ الشَّجَرَةُ) تا ئەو

وَلَوْ كانَتْ يابِسَةً لَزِمَ الْمُشْتَرِيَ الْقَلْعُ، وَثَمَرَةُ النَّخلِ الْمَبيــعِ إنْ شُــرِطَتْ لِلْبــائِعِ أَوْ لِلْمُشْتَرِي عُمِلَ بِه، وَإلاَّ: فَإنْ لَمْ يَتَأَبَّرْ مِنها شَيْءٌ فَهِيَ لِلْمُشْتَرِي، وَإلاَّ فَلِلْبــائِعِ، وَمــا يَخْرُجُ ثَمَرُهُ بِلاَ نَوْرٍ كَتِينٍ وَعَنَبٍ: إنْ بَرَزَ ثَمَرُهُ

---

ماوەیەی درەختەکە بە تەڕی دەمێنێ، واتە: ئەگەر درەختەکەی بڕی، یان ووشك بوو، بۆی دروست نیە درەختێکیتر لە شوێنەکەیدا بچێنێ.

(وَلَوْ كانَتْ يابِسَةً) ئەگەر درەختەفرۆشراوەکە –لـە سـەرەتاوە– ووشك بـوو (لَزِمَ الْمُشْتَرِيَ الْقَلْعُ) لە سەر کڕیارەکە واجبە: بە ڕەگەوە هەڵیکەنێ ئەگـەر بـە بێمـەرج فرۆشرابێ، جا ئەگەر بە مەرجی هەڵکەندن، یان بڕین فرۆشرابێ، ئـەو کاتـە واجبـە: مەرجەکـە جێبـەجێ بکرێ، بـەڵام ئەگـەر بـە مـەرجی هێشتنەوە فرۆشـرابێ، ئـەو کاتـە فرۆشـتنەکە بەتاڵـەو دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَثَمَرَةُ النَّخْـلِ الْمَبِيـعِ) میـوەی دارخورمـای فرۆشـراو (إنْ شُـرِطَتْ لِلْبـائِعِ) ئەگـەر بـە مـەرج داندرابێ: هەمووی، یان بەشێکی بۆ فرۆشیارەکە بـێ (أَوْ لِلْمُشْـتَرِي) یـان بـۆ کڕیارەکـە بـێ (عُمِلَ بِهِ) ئەو مەرجە داندراوە ڕەفتاری پـێدەکرێ (وَإلاَّ) بـەڵام ئەگـەر بـۆ هیچیـان بـە مـەرج دانەندرابو، بەڵکو تەنها گوتی: ئەم درەختەم فرۆشتە تـۆ، ئـەو کاتـە تەماشـا دەکـرێ: (فَإنْ لَمْ يَتَأَبَّرْ مِنْهـا شَـيْءٌ) ئەگـەر بـەری دارخورمایـەکان هیچـی لـە کیسـەکەیدا وەدەرنەکـەوتبو، واتە: کیسەی هێشووەکەی لـەت نـەکرابو تـاکو تـۆزی نێـرەی پـێوەربگرێ (فَهِـيَ لِلْمُشْـتَرِي) ئەو میوەیە گشتی لەگەڵ درەختەکە دەبێتـە مڵکـی کڕیارەکە (وَإلاَّ) بەڵام ئەگـەر بەشـێکی کـەمی لێوەدەرکـەوتبو (فَلِلْبـائِعِ) ئـەو کاتـە گشـت میوەکـە –دەرکـەوتوو و دەرنەکـەوتوو– هەمووی بۆ فرۆشیارەکەیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنِ ابْتاعَ نَخْلاً بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهــا لِلْبائِعِ إلاَّ أَنْ يَشْــتَرِطَ الْمُبْتــاعُ﴾ رواه الشيخان، هـەر کەسێك دارخورمایەکی کڕی پـاش دەرکـەوتنی بەرەکـەی، ئـەوە بەرەکـەی بـۆ فرۆشیارەکەیە، مەگـەر کڕیارەکـە بـۆ خـۆی بـە مەرجی دابنێ. واتە: ئەگەر میوەکە دەرنەکەوتبو، ئەو کاتە بۆ کڕیارەکەیە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسـە گشـت میوەیـەکیتر (قیـاس) کراوەتـە سـەر خورما، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: ئەگەر بە مـەرج داندرابێ: بۆ کڕیارەکە بێ، یان بۆ فرۆشیارەکە بێ، ئەو مەرجـە ڕەفتـاری پـێدەکرێ، بـەڵام ئەگـەر بۆ هیچیان بـە مـەرج دانەنـدرابو، تەماشـا دەکـرێ: ئەگـەر لـە کـاتی مامڵـەت بەسـتندا هیچـی دەرنەکـەوتبو، ئـەوە گشـتی بـۆ کڕیارەکەیـە، ئەگـەر دەرکـەوتبو، ئـەوە گشـتی بـۆ فرۆشیارەکەیە.

(وَما يَخْرُجُ ثَمَرُهُ بِلاَ نَـوْرٍ) هـەر درەختێـك میوەکـەی بـە بـێ کڵـوك دەربچـێ (كَتِينٍ وَعِنَبٍ) وەکو درەختی هـەنجیرو ترێو گـوێزو ئەو جۆرانە، تەماشا دەکرێ: (إنْ بَرَزَ ثَمَرُهُ) ئەگـەر

فَلِلْبائِعِ وَإلاَّ فَلِلْمُشْتَرِى، وَما خَرَجَ فِى نَوْرٍ ثُمَّ سَقَطَ كَمِشْمِشٍ وَتُفَّاحٍ: فَلِلْمُشْتَرِى إنْ لَمْ تَنْعَقِدالثَّمَرَةُ، وَكَذَا إن انْعَقَدَتْ وَلَمْ يَتَناثَرالنَّوْرُ فِىالأَصَحِّ، وَبَعْدَ التَّناثُرِ لِلْبائِعِ، وَلَوْ باعَ نَخَلاَتِ بُسْتانٍ مُطْلَعَةً وَبَعْضُها مُؤَبَّرٌ فَلِلْبائِعِ، فَإنْ أَفْرَدَ ما لَمْ يُؤَبَّرْ فَلِلْمُشْتَرِى فِىالأَصَحِّ، وَلَوْ كانَتْ فِى بَساتِينَ فَالأَصَحُّ إِفْرادُ كُلِّ بُسْتانٍ بِحُكْمِه، وَإِذَا بَقِيَتِ الثَّمَرَةُ لِلْبائِعِ: فَإِنْ شَرَطَ الْقَطْعَ لَزِمَهُ، وَإلاَّ

---

له كاتى فرۆشتندا میوەكەى دەركەوتبو (فَلِلْبائِعِ) ئەوە بۆ فرۆشیارەكەیە (وَإلاَّ) بەلاَم ئەگەر دەرنەكەوتبو (فَلِلْمُشْتَرِى) ئەوە بۆ كڕیارەكەیە، وە ئەگەر بەشێكى دەركەوتبو، بەشێكیشى دەرنەكەوتبو: وەكو هەنجیر، ئەوە دەركەوتووەكە بۆ فرۆشیارەكەیەو دەرنەكەوتووەكەشى بۆ كڕیارەكەیە، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَما خَرَجَ فِى نَوْرٍ) ئەو میوەیەى لە ناو كڵۆكدا دەردەچێو (ثُمَّ سَقَطَ) ئینجا كڵۆكەكەى دەوەرێنێ (كَمِشْمِشٍ وَتُفَّاحٍ) وەكو قەیسىو سێو (فَلِلْمُشْتَرِى) ئەوە بۆ كڕیارەكەیە (إنْ لَمْ تَنْعَقِدِ الثَّمَرَةُ) ئەگەر لە كاتى مامڵەت بەستندا میوەكە گرێى نەكردبێ (وَكَذَا) هەروەها میوەكە بۆ كڕیارەكەیە (إنْ انْعَقَدَتْ وَلَمْ يَتَناثَرالنَّوْرُ) ئەگەر گرێى كردبێو كڵۆكەكەى نەوەراندبێ (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەى ڕاستتردا، بەلاَم (وَبَعْدَالتَّناثُرِ) لە پاش گرێكردنو كڵۆك وەراندن (لِلْبائِعِ) بۆ فرۆشیارەكەیە، واتە: ئەگەر هەمووشى دەرنەكەوتبێ، دەركەوتوو و دەرنەكەوتووەكەى گشتى هەر بۆ فرۆشیارەكەیە، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ باعَ نَخَلاَتِ بُسْتانٍ) ئەگەر چەند دارخورمایەكى لە یەك باغدا فرۆشت (مُطْلَعَةً) كیسەى هێشووەكانى بەدەر كەوتبو، ئینجا (وَبَعْضُها مُؤَبَّرٌ) بەشێكى لەت بوو، بەشێكیشى لەت نەبوو (فَلِلْبائِعِ) ئەوە لەتبووەكەو لەتنەبووەكە-گشتى- بۆ فرۆشیارەكەیە، هەروەك ڕابرا (فَإنْ أَفْرَدَ ما لَمْ يُؤَبَّرْ) جا ئەگەر ئەوەى لەت نەبوە بە جیایى فرۆشتى (فَلِلْمُشْتَرِى) ئەو كاتە میوەكە دەبێتە هى كڕیارەكە (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەى ڕاستتردا.

(وَلَوْ كانَتْ فِى بَساتِينَ) ئەگەر دارخورمایەكان لە چەند باغێكدا بون (فَالأَصَحُّ) فەرموودەى ڕاستتر (إِفْرادُ كُلِّ بُسْتانٍ بِحُكْمِه) هەر باغێك بڕیارى سەربەخۆى بۆ دەدرێ، واتە: میوە دەركەوتووى ئەم باغە بۆ فرۆشیارەكەیە، دەرنەكەوتووى ئەو باغەش بۆ كڕیارەكەیە.

(وَإِذَا بَقِيَتِ الثَّمَرَةُ لِلْبائِعِ) جا هەر كاتێك-لەو مەسەلانەىڕابردوودا- میوەكە بۆ فرۆشیارەكە مایەوەو نەبوە ملكىكڕیارەكە، تێبینى دەكرێ: (فَإِنْ شَرَطَ الْقَطْعَ) ئەگەر فرۆشیارەكە لە كاتى فرۆشتن بە مەرجى دانابێ: میوەكەى لێبكاتەوە، ئەو كاتە (لَزِمَهُ) لە سەرى واجبە: لێى بكاتەوە (وَإلاَّ) بەلاَم ئەگەر مەرجى لێكردنەوەى دانەنابو: وەك بڵێ: تا پێگەیشتنى لێى

فَلَهُ تَرْكُهـا إِلَى الْجـدَاد، وَلِكُـلٍّ مِنهُما السَّـقْيُ إِنِ انْتَفَـعَ بِـه الشَّـجَرُ وَالثَّمَـرُ، وَلاَ مَنْـعَ لِلآخَـرِ، وَإِنْ ضَـرَّهُما لَـمْ يَجُـزْ إِلاَّ بِرِضَـاهُما، وَإِنْ ضَـرَّ أَحَـدَهُما وَتَنازَعا فُسِخَ الْعَقْدُ إِلاَّ أَنْ يُسامِحَ الْمُتَضَـرِّرُ، وَقِيـلَ لِطالِـبِ السَّـقْيِ أَنْ يَسْـقِيَ، وَلَوْ كَـانَ الثَّمَـرُ يَمْـتَصُّ رُطُوبَـةَ الشَّـجَرِ لَـزِمَ الْبَـائِعَ أَنْ يَقْطَـعَ أَوْ يَسْـقِيَ.
(فَصْلٌ) يَجُوزُ بَيْعُ الثَّمَرِ بَعْدَ بُدُوِّ صَلاَحِه مُطْلَقاً، وَبِشَرْطِ قَطْعِه، وَبِشَرْطِ إِبْقائِه،

---

ناکەمەوە، یان باسی هیچی نەکردبێ، ئەو کاتە (فَلَهُ تَرْكُها إِلَى الْجَدَادِ) بۆی هەیە میوەکەی بهێڵێتەوە تا کاتی برینەوەی دێ.
(وَلِكُلٍّ مِنْهُما السَّقْيُ) لەو حاڵەتەدا کڕیارەکەو فرۆشیارەکە –هەردووکیان– مافی ئاودانی ئەو درەختە فرۆشراوەیان هەیە (إِنِ انْتَفَعَ بِهِ الشَّجَرُ وَالثَّمَرُ) ئەگەر درەختەکەو میوەکە –هەردووکیان– سود لە ئاودانەکە وەربگرن، کەوابو: (وَلاَ مَنْعَ لِلآخَرِ) ئەوی‌تریان مافی نیە ئەمەیان قەدەغە بکا لە ئاودانی درەختەکە، چونکە هیچ زیانی ناگاتێ.
(وَإِنْ ضَرَّهُما) ئەگەر ئاودانەکە زیانی دەگەیاندە درەختەکەو میوەکە (لَمْ يَجُزْ) بۆ هیچێکیان دروست نیە ئاوی بدا (إِلاَّ بِرِضاهُما) تەنها بە ڕەزامەندی هەردووکیان نەبێ (وَإِنْ ضَرَّ أَحَدَهُما) ئەگەر زیانی بە یەکێکیانی دەگەیاند: تەنها بە درەختەکە، یان تەنها بە میوەکە (وَتَنازَعا) هەردووکیان لە ئاودان‌و ئاونەداندا بووە کێشەیان، ئەو کاتە (فُسِخَ الْعَقْدُ) مامڵەتەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە (إِلاَّ أَنْ يُسامِحَ الْمُتَضَرِّرُ) مەگەر زەرەرمەندەکە چاوپۆشی بکاو بە زیانەکەی ڕازی ببێ، ئەو کاتە هەڵناوەشێندرێتەوە.
(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (لِطالِبِ السَّقْيِ أَنْ يَسْقِيَ) ئەوەی داوای ئاودان دەکا، ئەویان مافی ئاودانی هەیەو گوێ ناداتە زیانی ئەوی‌تر (وَلَوْ كانَ الثَّمَرُ يَمْتَصُّ رُطُوبَةَ الشَّجَرِ) ئەگەر میوەکە تەڕایەتی درەختەکەی دەمژی، ئەو کاتە (لَزِمَ الْبائِعَ) لە سەر فرۆشیارەکە واجبە: (أَنْ يَقْطَعَ) یان میوەکەی لێبکاتەوە (أَوْ يَسْقِيَ) یان درەختەکە ئاو بدا، تاکو کڕیارەکە زیانی نەگاتێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی فرۆشتنی میوە و کشتوکاڵ ﴾

(يَجُوزُ بَيْعُ الثَّمَرِ) فرۆشتنی میوە –کە هەر بەسەر درەختەوە بێ– دروستە (بَعْدَ بُدُوِّ صَلاَحِهِ) پاش دەرکەوتنی پێگەیشتنی، جا فرۆشتنەکەشی دروستە (مُطْلَقاً) بێ مەرجی لێکردنەوەو هێشتنەوەی بێ (وَبِشَرْطِ قَطْعِهِ) هەم دروستە بە مەرجی لێکردنەوەی بێ (وَبِشَرْطِ إِبْقائِهِ) هەم دروستە بە مەرجی هێشتنەوەی بێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُها﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: میوە –بە سەر درەختەوە– بفرۆشرێ تا پێگەیشتنی دەردەکەوێ. واتە: پاش دەرکەوتنی پێگەیشتنی لە هەرسێك حاڵەتدا دروستە.

وَقَبْلَ الصَّلاَحِ: إنْ بِيعَ مُنفَرِداً عَنِ الشَّجَرِ لاَ يَجُوزُ إلاَّ بِشَرْطِ الْقَطْعِ، وَأَنْ يَكُونَ الْمَقْطُوعُ مُنْتفِعاً بِه لاَ كَكُمَّثْرَى، وَقِيلَ إنْ كانَ الشَّجَرُ لِلْمُشْتَرِي جازَ بِلاَشَرْطٍ، قُلْتُ: فَإن كانَ الشَّجَرُ لِلْمُشْتَرِي وَشَرَطْنا الْقَطْعَ لاَ يَجِبُ الْوَفاءُ بِه وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإنْ بِيعَ مَعَ الشَّجَرِ جازَ بِلاَشَرْطٍ وَلاَ يَجُوزُ بِشَرْطِ قَطْعِه، وَيَحْرُمُ بَيْعُ الزَّرْعِ الأَخْضَرِ فِي الأَرْضِ إلاَّ بِشَرْطِ قَطْعِه،

---

ئینجا بزانه: له حاڵەتی فرۆشتنی بێمەرج و له حاڵەتی مەرجی هێشتنەوەدا كڕیارەكە مافی هەیە: تا كاتی بڕینەوە میوەكە لە سەر درەختەكە بهێڵێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَقَبْلَ الصَّلاَحِ) بەڵام پێش دەركەوتنی پێگەیشتنی (إنْ بِيعَ مُنْفَرِداً عَنِ الشَّجَرِ)-ئەگەر میوەكەی سەر درەخت- بە جیا لە درەختەكەی فرۆشرا، واتە: درەختەكەی لەگەڵ نەفرۆشرا، ئەو كاتە (لاَ يَجُوزُ إلاَّ بِشَرْطِ الْقَطْعِ) حەرامەو دروست نیە: بفرۆشرێ تەنها بە مەرجی لێكردنەوەی نەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی ڕابردوو، كەوابو: دەبێ دەمودەست گشتی لێبكاتەوەو (وَأَنْ يَكُونَ الْمَقْطُوعُ مُنْتَفَعاً بِهِ) هەروەها مەرجە ئەو میوەیەی لێدەكرێتەوە سودی لێوەربگیرێ: وەكو پەسیرەو چواڵە (لاَ كَكُمَّثْرَى) نەك وەكو هەرمێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إنْ كانَ الشَّجَرُ لِلْمُشْتَرِي) ئەگەر ئەو درەختەی میوەكەی بە سەرەوەیە ملكی كڕیارەكە بوو، میوەكەشی هی فرۆشیارەكە بوو (جازَ بِلاَ شَرْطٍ) دروستە میوەكە بفرۆشێتە خاوەن درەختەكە بە بێمەرجی لێكردنەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (فَإن كانَ الشَّجَرُ لِلْمُشْتَرِي) جا ئەگەر درەختەكە ملكی كڕیارەكە بوو (وَشَرَطْناالْقَطْعَ) لێكردنەوەشمان بە مەرج دانا (لاَ يَجِبُ الْوَفاءُ بِهِ) واجب نیە: كڕیارەكە مەرجەكە جێبەجێ بكا (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونكە درەختەكەو میوەكە هەردووكی ملكی خۆیەتی.

(وَإنْ بِيعَ مَعَ الشَّجَرِ) ئەگەر میوەكەی سەر درەخت-پێش دەركەوتنی پێگەیشتنی- بە درەختەوە وێكڕا فرۆشران (جازَ بِلأَشَرْطٍ) فرۆشتنەكە دروستە بە بێ هیچ مەرجێك، كەواتە: (وَلاَ يَجُوزُ بِشَرْطِ قَطْعِهِ) دروست نیە لەم حاڵەتەدا بە مەرجی لێكردنەوە بفرۆشرێ، چونكە درەختەكەو میوەكە دەبێتە ملكی كڕیارەكە، كەواتە: نابێ كڕیارەكە لە دەستكاری ملكی خۆی قەدەغە بكرێ.

## ﴿ فرۆشتنی قەرسیل و پەرێز ﴾

(وَيَحْرُمُ بَيْعُ الزَّرْعِ الأَخْضَرِ) حەرامەو دانامەزرێ: فرۆشتنی سەوزەو كشتوكاڵی سەوزی پێنەگەیشتوو (فِي الأَرْضِ) كە لە زەویدا ڕوابێ: وەكو قەرسیل و سەوزەكانی خواردن (إلاَّ بِشَرْطِ قَطْعِهِ) تەنها بە مەرجی بڕینەوەی، یان هەڵكەندنی دروستە، ئینجا بزانە:

فَإِنْ بِيعَ مَعَها أَوْ بَعْدَ إِشْتِدادِالْحَبِّ جازَ بِلاَشَرْطٍ، وَيُشْتَرَطُ لِبَيْعِهِ وَبَيْعِ الثَّمَرِ بَعْدَ بُدُوِّ الصَّلاَحِ ظُهُورُالْمَقْصُودِ: كَتِينٍ وَعِنَبٍ وَشَعِيرٍ،

---

ئەگەر بە مەرجی بڕینەوەی فرۆشتی، ئینجا لە دوای بڕینەوەی لە سەر پنجەکەی ژیاوە، ئەوەی ژیاوەتەوە دەبێتەوە ملکی فرۆشیارەکە.

بەلاّم ئەگەر بە مەرجی هەلکەندن فرۆشتبوی‌و لە دوای هەلکەندن ژیاوە، ئەو کاتە ئەمەشیان هەر بۆ کڕیارەکەیە، هەروەك لە (إبن قاسم)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ بِيعَ مَعَها) جا ئەگەر سەوزەو کشتوکالّی سەوزی پێنەگەیشتوو، لەگەلّ زەویەکە وێکڕا فرۆشران (أَوْ بَعْدَ إِشْتِدادِالْحَبِّ) یان سەوزەو کشتوکالّ لە دوای پێگەیشتن‌و دەنك ڕەقبوونی فرۆشران—واتە: دەنکەکەشی دیار بوو— ئەو کاتە (جازَ بِلاَ شَرْطٍ) فرۆشتنەکە دروستە بە بێ مەرجی لێکردنەوە، چونکە ئەمەش وەك دەرکەوتنی پێگەیشتنی میوەیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر یەکێك کشتوکالّێکی سەوزی—وەکو قەرسیل‌و وێنجەو ئەو جۆرە شتانە— کڕی، تاکو ئاژەلّەکانی بەرەبەرە لێ بلەوەڕێنێ، ڕێگای شەرعی ئەمەیە: کشتوکالّەکە بە مەرجی هەلکەندن بکڕێ‌و زەویەکەش بۆ ماوەیەکی درێژ بە کرێ، یان بە خواستن لە خاوەنەکەی وەربگرێ، تاکو بتوانێ بۆ ماوەیەکی‌درێژ ئاژەلّەکانی لێ بلەوەڕێنێ، چونکە ئەگەر بە مەرجی بڕینەوە بیکڕێ، ئەوە تەنها یەك جار مالّ بڕینەوەی هەیەو، ئەوەی دەژیێتەوە بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە، هەروەك تازە ڕابرا، هەم لە حاشیەکانی (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: فرۆشتنی پەرێز—واتە: ئەو زلّکو قامیش‌و کایەی لە دوای دروێنە لە زەویەکەدا دەمێنێتەوە— دروستە: بە مەرجی بڕینەوەو لابردن بفرۆشرێ وەکو درەختی ووشك کە باسمان کرد، جا ئاشکرایە ئەمەیان ناژیێتەوە، بەلاّم دەبی لە ماوەیەکی عادەتی‌دا گشتی لە زەویەکە لاببا، تاکو زیان بە خاوەن زەویەکە نەگا، جا ئەگەر بیەوێ ئاژەلّی لێ بلەوەڕێنێ، با بۆ ماوەیەکی درێژ زەویەکە—بە کرێ، یان بە خواستن— لە خاوەنەکەی وەربگرێ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (لِبَيْعِهِ) بۆ دروستبوونی فرۆشتنی کشتوکالّ لە دوای دەنك ڕەقبوون، هەم (وَبَيْعِ الثَّمَرِ بَعْدَ بُدُوِّالصَّلاَحِ) بۆ دروستبوونی فرۆشتنی میوە لە دوای دەرکەوتنی پێگەیشتنی (ظُهُورُالْمَقْصُودِ) دەبی مەبەستەکەی دیار بێ‌و لە بەر چاو بێ (كَتِينٍ وَعِنَبٍ) وەکو هەنجیرو ترێ‌و (وَشَعِيرٍ) وەکو جۆی گولّەپێغەمبەرە کە دەنکەکانی لە ناو گولّەکەی‌دا دیارە.

وَما لاَ يُرَى حَبُّهُ كالْحنطَة وَالْعَدَس فِي السُّنْبُلِ لاَيَصِحُّ بَيْعُهُ دُونَ سُنْبُله وَلاَ مَعَهُ فِي الْجَديد، وَلاَ بَأْسَ بِكَمامٍ لاَيُزالُ إلاَّ عنْدَالأَكْلِ، وَمَا لَهُ كمامان كَالْجَوْزِ وَاللَّوْزِ وَالْباقلاَّ يَباعُ فِي قشْره الأَسْفَلِ وَلاَيَصِحُّ فِي الأَعْلَى، وَفِي قَوْلٍ يَصِحُّ إنْ كانَ رَطْباً، وَبُدُوُّ صَلاَحِ الثَّمَرِ ظُهُورُ مَبادئ النَّضْجِ وَالْحَلاَوَة فيما لاَ يَتَلَوَّنُ، وَفِي غَيْرِه بِأَنْ يَأْخُذَ فِي الْحُمْرَة أَوالسَّواد، وَيَكْفِي بُدُوُّ صَلاَحِ بَعْضه وَإنْ قَلَّ،

---

(وَما لاَ يُرَى حَبُّهُ) ئەو کشتوکاڵەی دەنکی دیار نیە (کالْحنطَة وَالْعَدَس) وەکو گەنمو نیسکو جۆی کوردەواری (فِي السُّنْبُلِ) لە گوڵەکەیدا (لاَ يَصِحُّ بَيْعُهُ دُونَ سُنْبُلِه) فرۆشتنی بە بێ گوڵەکەی دروست نیە، هەم (وَلاَ مَعَهُ) بە گوڵەوەش دروست نیە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، چونکە دەنکەکەی -کە مەبەستە- لە ناو گوڵەکەیدا دیار نیە.

بەڵام بە فەرموودەیکۆنی ئیمامی(الشافعی)و لە مەزهەبیئیمامی(حنفی)دا دروستە: دانەویڵە لە ناو گوڵیخۆیدا -بە گوڵەوە- بفرۆشرێ، هەروەك لە (پاشکۆیفرۆشتن)دا رابرا، بەڵگەشیان ئەم حەدیسەیە: ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: گوڵیدانەویڵە بفرۆشرێ تا سپی دەبێو دەنکی رەق دەبێ. واتە: دوایسپیبوونو رەقبوون دروستە گوڵەکە بفرۆشرێ.

(وَلاَ بَأْسَ) هیچ باسێك نیە بۆ دروستبوونی فرۆشتن (بِكَمامٍ) داپۆشین بە هۆی توێکڵێك: کە (لاَ يُزالُ إلاَّ عِنْدَالأَكْلِ) لانادرێت تەنها لە کاتی خواردنی نەبێ: وەك هەنارو مۆزو شفتی (وَما لَهُ كِمامانِ) ئەوەی دوو توێکڵی بە سەر یەکەوە هەنە (كَالْجَوْزِ) وەکو گوێزو (وَاللَّوْزِ) چوالەو (وَالْباقلاَّ) پاقلە (يَباعُ فِي قِشْرِهِ الأَسْفَلِ) هەر یەکێك لەوانە لە توێکڵەکەیبنەوەیدا دەفرۆشرێ (وَلاَ يَصِحُّ فِي الأَعْلَى) لە توێکڵیسەرەوەیدا فرۆشتنی دروست نیە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (يَصِحُّ إنْ كانَ رَطْباً) لە توێکڵیسەرەوەشیدا دروستە بفرۆشرێ ئەگەر تەڕ بێ، سێ مەزهەبەکەیتریش -وەك ئەم فەرموودەیە- رێگەیان داوە: بە تەڕی لە توێکڵی سەرەوەیدا بفرۆشرێ، هەروەك لە(تحفة)و(نهاية)دا روون کراوەتەوە.

(وَبُدُوُّصَلاَحِ الثَّمَرِ) دەرکەوتنی پێگەیشتنی میوە ئەوەیە (ظُهُورُ مَبادِئ النَّضْجِ وَالْحَلاَوَةِ) سەرەتای گەیینو شیرنایەتی دەربکەوێ (فِيمالاَيَتَلَوَّنُ) لەو جۆرە میوەیەی رەنگێکیتر ناگرێ، وەك رۆن ببێو ئاوی تێبگەرێ (وَفِي غَيْرِه) لەوەیتریش کە رەنگ دەگرێ (بِأَنْ يَأْخُذَ فِي الْحُمْرَةِ أَوالسَّوادِ) بەوە دەبێ: کە دەست بە سوری، یان بە رەشی، یان بە زەردی بکا: وەك ترێو هەنجیرو هەڵوژە (وَيَكْفِي بُدُوُّصَلاَحِ بَعْضِه) بۆ دروستبوونی فرۆشتن بەسە: بەشێکی پێگەیشتنی دەربکەوێ (وَإنْ قَلَّ) هەرچەند کەمیش بێ: وەك دەنکێکی بەڵەکەی ترێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثِّمارِ حَتَّى تُزْهَى -أَيْ- تَحْمارُ أَوْ تَصْفارُّ﴾

وَلَوْ باعَ ثَمَرَةَ بُسْتانٍ أَوْ بَساتِينَ بَدا صَلاحُ بَعْضِه فَعَلَى مَاسَبَقَ فِي التَّأْبِيرِ، وَمَنْ باعَ مابَدا صَلاحُهُ لَزِمَهُ سَقْيُهُ قَبْلَ التَّخْلِيَةِ وَبَعْدَها، وَيَتَصرَّفُ مُشْتَرِيه بَعْدَها، وَلَوْ عَرَضَ مُهْلِكٌ بَعْدَها كَبَرَد فَالْجَدِيدُ أَنَّهُ مِنْ ضَمانِ الْمُشْتَرِي،

---

رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: میوەی سەر درەخت بفرۆشرێ تا سۆر دەبێ، یان زەرد دەبێ.

(وَلَوْ باعَ ثَمَرَةَ بُسْتانٍ أَوْ بَساتِينَ) ئەگەر میوەی باغێك، یان میوەی چەند باغێکی فرۆشت: کە (بَدا صَلاحُ بَعْضِه) بەشێکی میوەکە پێگەیشتنی دەرکەوتبو و یەك ڕەگەزیش بوو (فَعَلَى ماسَبَقَ فِي التَّأْبِيرِ) ئەوە –لێرەشدا– لە سەر بڕیاری ڕابردوو لە لەتبوونی کیسەی دارخورمادا ڕەفتار دەکرێ، واتە: لە میوەی یەك باغدا: ئەگەر بەشێکی کەمی ڕەگەزێك پێگەیشتنی دەرکەوتبو، ئەوە گشت ڕەگەزەکە –پێگەیشتوو و پێنەگەیشتوو– بە یەکسانی بڕیاری پێگەیشتنی بۆ دەدرێ، بەڵام ئەگەر ڕەگەزەکە لە چەند باغێکدا بوو، ئەو کاتە هەر باغێك بڕیاری سەربەخۆی هەیە، واتە: ڕەگەزی پێنەگەیشتووی ئەم باغە بڕیاری هەمان ڕەگەزی پێگەیشتووی باغەکەیتری بۆ نادرێو مەرجە: لە فرۆشتندا –بە بڕیار– لێك جیا بکرێنەوە.

(وَمَنْ باعَ مابَدا صَلاحُهُ) هەر کەسێك میوەیەکی، یان کشتوکاڵێکی وەهای فرۆشت: کە پێگەیشتنی دەرکەوتبو و مافی هێشتنەوەشی هەبو: وەك بە مەرجی هێشتنەوە، یان بە بێمەرج فرۆشتبێتی (لَزِمَهُ سَقْيُهُ) لە سەر فرۆشیارەکە واجبە: ئاوی بدا تا کاتی لێکردنەوەی دێ، ئەگەر بەرلو بێ (قَبْلَ التَّخْلِيَةِ وَبَعْدَها) پێش وازلێهێنانو دوای وازلێهێنانی بۆ کڕیارەکە، ئاودانی هەر لە سەر واجبە، بەڵام ئەگەر بە مەرجی لێکردنەوە، یان برینەوە، یان هەڵکەندن فرۆشتبێتی، ئەو کاتە لە دوای وازلێهێنان ئاودانی لە سەر واجب نیە (وَيَتَصَرَّفُ مُشْتَرِيهِ)کڕیاری میوەکەو کشتوکاڵەکە دەستکاریی دەکا بە هەموو جۆرە دەستکاریەك (بَعْدَها) پاش ئەوەی فرۆشیارەکە –بۆ کڕیارەکە– وازی لێدێنێ، چونکە بەم واز لێهێنانە وەرگرتنیفرۆشراوەکە دێتەجێ، هەروەك ڕابرا.

(وَلَوْ عَرَضَ مُهْلِكٌ بَعْدَها) ئەگەر لە دوای وازلێهێنانیفرۆشیارەکە بۆ کڕیارەکە، فرۆشراوەکە بەڵایەکی بە سەردا هاتو لە ناوی برد (كَبَرَدٍ) وەکو تەزرە، یان سەرماو کڵۆ و سوتان، ئەوە (فَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی نوێ: (أَنَّهُ مِنْ ضَمانِ الْمُشْتَرِي) ئەو میوەیەو ئەو کشتوکاڵە لە زامینیی کڕیارەکەدایەو لە کیس خۆی دەڕوا؟ چونکە بە وازلێهێنانیفرۆشیارەکە وەرگرتنی فرۆشراوەکە دێتە جێ ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ﴿: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي ثِمارٍ ابْتاعَها فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقالَ النَّبِيُّﷺ: تَصَدَّقُوا عَلَيْه. فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفاءَ دَيْنِه، فَقالَ

فَلَوْ تَعَيَّبَ بِتَرْكِ الْبائِعِ السَّقْيَ فَلَهُ الْخِيارُ، وَلَوْ بِيعَ قَبْلَ صَلاحِه بِشَرْط قَطْعِه وَلَمْ يَقْطَعْ حَتَّى هَلَكَ فَأَوْلَى بِكَوْنِه مِنْ ضَمانِ الْمُشْتَرِى، وَلَوْ بِيعَ ثَمَرٌ يَغْلِبُ تَلاحُقُهُ وَاخْتِلاطُ حادِثِه بِالْمَوْجُودِ كَتِينٍ وَقِثَّاءٍ لَمْ يَصِحَّ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى الْمُشْتَرِى قَطْعَ ثَمَرِه،

---

النَّبِيُّ ﷺ لِغُرَمائِهِ: خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ لَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ﴾ رواه مسلم، پیاوێك میوەیەكی كڕیبو بەڵایەك هاتە سەر میوەكەو لە ناوی بردو زۆر قەرزدار بو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتی بە خێر بدەنێ. جا شتەكەش بەرەوستی قەرزەكەی نەكرد، پێغەمبەر ﷺ بە خاوەن قەرزەكانی فەرموو: ئەوەندەی هەیە بۆ خۆتانی ببەن‌و هیچی‌ترتان بۆ نابێ. واتە: ئەگەر لە كیس خۆی نەڕۆیشتبایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەدەكرد: شتی بە خێر بدرێتێ بۆ قەرزدانەوە.

ئینجا بزانە: لە حەدیسێكی‌تری (مسلم)دا هاتوە: ﴿حەڵاڵ نیە: هیچ لە كڕیارەكە وەربگرێ﴾. مەبەست ئەوەیە: پێش وەرگرتنی‌فرۆشراوەكە نابێ هیچی لێوەربگرێ، یان وەها خێرە هیچی لێوەرنەگرێ. تاكو دژایەتی لە نێوان هەردوو حەدیسەكاندا نەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(فَلَوْ تَعَيَّبَ) ئەگەر فرۆشراوەكە لە ناو نەچو، بەڵكو عەیبی لێپەیدا بو (بِتَرْكِ الْبائِعِ السَّقْيَ) چونكە فرۆشیارەكە ئاوی نەدابو (فَلَهُ الْخِيارُ) ئەو كاتە كڕیارەكە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە، ئینجا بزانە: ئەگەر پێش وازلێهێنانی بۆ كڕیارەكە لەناو چوو، یان بە هۆی ئاونەدانی‌فرۆشیارەكە لە ناو چوو، ئەوە -لە هەردوو حاڵەتدا- فرۆشیارەكە زامینە، كەواتە: بە هۆی ئەو لەناوچوونە فرۆشتنەكە هەڵدەوەشێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ بِيعَ) ئەگەر میوە، یان كشتوكاڵ فرۆشرا (قَبْلَ صَلاحِهِ) پێش دەركەوتنی پێگەیشتنەكەی، یان دوای دەركەوتنی پێگەیشتنی (بِشَرْطِ قَطْعِهِ) لە هەردوو حاڵەتدا بە مەرجی لێكردنەوە فرۆشرا (وَلَمْ يَقْطَعْ) كڕیارەكەش لێی نەكردەوە (حَتَّى هَلَكَ) تا میوە فرۆشراوەكە لە ناو چوو (فَأَوْلَى بِكَوْنِهِ مِنْ ضَمانِ الْمُشْتَرِى) ئەو كاتە لە پێشترە: كە لە زامینی‌ی‌كڕیارەكەدا بێ‌و لە كیس خۆی بڕوا، چونكە كەمتەرخەمی كردوە.

(وَلَوْ بِيعَ ثَمَرٌ) ئەگەر میوەیەكی، یان كشتوكاڵێكی وەها فرۆشرا: كە (يَغْلِبُ تَلاحُقُهُ) بە ئەغڵەبی بە دوای‌یەكدا پەیدا دەبو (وَاخْتِلاطُ حادِثِهِ بِالْمَوْجُودِ) پەیدابووەكەشی تێكەڵی هەبووەكەی دەبو (كَتِينٍ وَقِثَّاءٍ) وەكو هەنجیرو خیارو ئەو جۆرانە (لَمْ يَصِحَّ) فرۆشتنی ئەو جۆرانە دروست نیە (إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى الْمُشْتَرِى قَطْعَ ثَمَرِهِ) مەگەر بە مەرج دابنێ لە سەر كڕیارەكە: میوەكەی‌خۆی لێبكاتەوە.

وَلَوْ حَصَلَ الإِخْتِلاَطُ فِيما يَنْدُرُ فِيه فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَ يَنْفَسِخُ الْبَيْعُ بَلْ يَتَخَيَّرُ الْمُشْتَرِى، فَإِنْ سَمَحَ لَهُ الْبائِعُ بِما حَدَثَ سَقَطَ خِيارُهُ فِى الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ الْحِنْطَةِ فِى سُنْبُلِها بِصافِيَةٍ وَهُوَ الْمُحاقَلَةُ، وَلاَالرُّطَبِ عَلَى النَّخْلِ بِتَمْرٍ وَهُوَ الْمُزابَنَةُ، وَيُرَخَّصُ فِى الْعَرايا: وَهُوَ بَيْعُ الرُّطَبِ عَلَى النَّخْلِ بِتَمْرٍ فِى الأَرْضِ أَوِالْعِنَبِ فِى الشَّجَرِ بِزَبِيبٍ فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، وَلَوْ زادَ فِى صَفْقَتَيْنِ جازَ،

---

ئینجا (وَلَوْ حَصَلَ الإِخْتِلاَطُ) ئەگەر وەها ڕوویدا: پەیدابووەکەو هەبووەکە تێکەڵ بون (فِيما يَنْدُرُ فِيه) لەو جۆرەی کەم تێکەڵ دەبو، یان لەو جۆرەی زۆر تێکەڵ دەبو (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَيَنْفَسِخُ الْبَيْعُ) فرۆشتنەکە هەڵناوەشێتەوە (بَلْ يَتَخَيَّرُالْمُشْتَرِى) بەڵکو کڕیارەکە سەرپشکە: یان هەڵیدەوەشێنێتەوە، یان دەیبڕوێنێ، بەڵام (فَإِنْ سَمَحَ لَهُ الْبائِعُ بِما حَدَثَ) ئەگەر فرۆشیارەکە لە پەیدابووەکە چاوپۆشی کردو دایە کڕیارەکە، ئەو کاتە (سَقَطَ خِيارُهُ) کڕیارەکە مافیپەشیمانیی نامێنێو دەبی مامڵەتەکە بڕوێنێ (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ يَصِحُّ) حەرامەو دروست نابێ (بَيْعُ الْحِنْطَةِ فِى سُنْبُلِها) گەنم لە ناو گوڵیخۆیدا بفرۆشرێ (بِصافِيَةٍ) بە گەنمێکی پوختەکراو لە کاوکۆتەکەی (وَهُوَالْمُحاقَلَةُ) ئەو جۆرە فرۆشتنە پێی دەگوترێ: (موحاقەلە)= فرۆشتنی پەڵە گەنم بە گەنم (وَلاَالرُّطَبِ عَلَى النَّخْلِ) هەروەها دروست نابێ فرۆشتنی خورمای سەر دارخورما لە گۆترە (بِتَمْرٍ) بە قەسپی لێکراوەی لە گۆترە (وَهُوَالْمُزابَنَةُ) ئەوەش پێی دەگوترێ: (موزابەنە)= یەکتر لادان ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ: عَنِ الْمُحاقَلَةِ وَالْمُزابَنَةِ...وَرَخَّصَ فِى الْعَرايا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: مامڵەتی موحاقەلەو موزابەنە بکرێن و ڕێگەیداوە قرساوەکان بفرۆشرێن.

هەر بە بەڵگەی حەدیسەکە (وَيُرَخَّصُ فِى الْعَرايا) ڕێگە دەدرێ لە فرۆشتنیقرساوەکاندا (وَهُوَ) ئەو فرۆشتنە (بَيْعُ الرُّطَبِ عَلَى النَّخْلِ) فرۆشتنی تەڕەقەسپی سەر دارخورمایە بە قرساندن (بِتَمْرٍ فِى الأَرْضِ) بە قەسپی لێکراوەی ووشکی بە پێوانە (أَوِ الْعِنَبِ فِى الشَّجَرِ) یان فرۆشتنی ترێی سەر دارەمێو بە قرساندن (بِزَبِيبٍ) بە مێوژی بە پێوانە (فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ) ڕێگەدانەکەش لە ئەندازەی کەمتر لە پێنج بارە، بە گوێرەی قرساندنی تەڕەقەسپەکە، یان ترێیەکە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ فِى الْعَرايا فِى خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ دُونَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ڕێگەی فرۆشتنی قرساوەکانی داوە لە ئەندازەی پێنج بار، یان کەمتر. بەڵام (وَلَوْ زادَ فِى صَفْقَتَيْنِ) ئەگەر لە ئەندازەی پێنج بار زیاتری کڕی لە دوو مامڵەتدا (جازَ) دروستە، چونکە هەر مامڵەتێك سەربەخۆیە.

وَيُشْتَرَطُ التَّقَابُضُ بِتَسْلِيمِ الثَّمَرِ كَيْلاً، وَالتَّخْلِيَةِ فِي النَّخْلِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ فِي سَائِرِ الثِّمَارِ، وَأَنَّهُ لاَيَخْتَصُّ بِالْفُقَرَاءِ.

(بَابُ إِخْتِلاَفِ الْمُتَبَايِعَيْنِ)

إذا اتَّفَقَا عَلَى صِحَّةِالْبَيْعِ ثُمَّ اخْتَلَفَا فِي كَيْفِيَتِهِ: كَقَدْرِالثَّمَنِ، أَوْ صِفَتِهِ أَوِالأَجَلِ أَوْ قَدْرِهِ أَوْ قَدْرِالْمَبِيعِ وَلاَ بَيِّنَةَ تَحالَفا،

---

(وَيُشْتَرَطُ التَّقَابُضُ) مەرجە: لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا لە یەکتری وەربگرن بەم شێوەیە: (بِتَسْلِيمِ الثَّمَرِ كَيْلاً) کڕیارەکە قەسپەکەی، یان مێوژەکەی بە پێوان تەسلیمی فرۆشیارەکە بکاو (وَالتَّخْلِيَةِ فِي النَّخْلِ) فرۆشیارەکەش -بۆ کڕیارەکە- واز لە تەڕە قەسپی سەر دارخورمایەکان بێنێ (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ فِي سَائِرِ الثِّمَارِ) ئەو فرۆشتنەی بە قرساندن -جگە لە خورماو ترێ- لە میوەکانیتردا دروست نابێ (وَأَنَّهُ لاَيَخْتَصُّ بِالْفُقَرَاءِ) هەم ئەم جۆرە فرۆشتنەش تایبەت نیە بە گەداو هەژاران -هەرچەند بە هۆی ئەوانیش ڕێگەی دراوە- بەڵکو بۆ دەوڵەمەندانیش دروستە، واللهُ أعْلَمُ.

﴿ بَابُ إِخْتِلاَفِ الْمُتَبَايِعَيْنِ: **باسی کێشەی کڕیارو فرۆشیار** ﴾

**پێشەکی** بزانە: لە هەر مامڵەتێکیتر -وەکو کڕین و فرۆشتن- شتێك لە بەرامبەر شتێك وەربگیرێ، ئەویش هەمان بڕیاری ئەم باسەی لێدێتەجێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(إِذا اتَّفَقَا عَلَى صِحَّةِ الْبَيْعِ) هەر کاتێك کڕیارەکەو فرۆشیارەکە یەکدەنگ بون لە سەر دروستبوون و دامەزرانی مامڵەتەکە (ثُمَّ اخْتَلَفَا) ئینجا بووە کێشەیان (فِي كَيْفِيَتِهِ) لە چۆنیەتی مامڵەتەکەدا (كَقَدْرِالثَّمَنِ) وەك لە ئەندازەی پارەکەدا فرۆشیارەکە بڵێ: دە دینارە. کڕیارەکەش بڵێ: نۆ دینارە. (أَوْ صِفَتِهِ) یان وەك لە سیفەتی پارەکەدا، فرۆشیارەکە بڵێ: بە درشتەم داوێ. کڕیارەکەش بڵێ بە وردە. (أَوِ الأَجَلِ) یان وەك لە بارەی ماوەدا فرۆشیارەکە بڵێ: بێ ماوەیە. کڕیارەکەش بڵێ: بە ماوەیە. (أَوْ قَدْرِهِ) یا وەك لە ئەندازەی ماوەکەدا فرۆشیارەکە بڵێ: بۆ ماوەی مانگێکە. کڕیارەکەش بڵێ: ماوەی دوو مانگە. (أَوْ قَدْرِالْمَبِيعِ) یا وەك لە ئەندازەی فرۆشراوەکەدا فرۆشیارەکە بڵێ: ساعێکە. کڕیارەکەش بڵێ: دوو ساعە. (وَلاَ بَيِّنَةَ) نە فرۆشیارەکەو نە کڕیارەکە هیچیان شاهیدیان نەبو (تَحالَفا) هەردووکیان سوێند بۆ یەکتری دەخۆن، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ﴾رواەمسلم، سوێندخواردن لە سەر داوالێکراوە.

واتە: هەر یەکێك لەو دووانە -لێرەدا- هەم داواکارەو هەم داوالێکراوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

فَيَحْلِفُ كُلٌّ عَلَى نَفْيِ قَوْلِ صاحِبِه وَإِثْباتِ قَوْلِه، وَيُبْدَأُ بِالْبائِعِ، وَفِي قَوْلٍ بِالْمُشْتَرِى، وَفِي قَوْلٍ يَتَساوَيانِ فَيَتَخَيَّرُ الْحاكِمُ، وَقِيلَ يُقْرَعُ، وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ يَكْفِى كُلٌّ واحِدٍ يَمِينٌ تَجْمَعُ نَفْياً وَإِثْباتاً، وَيُقَدَّمُ النَّفْيُ فَيَقُولُ: مَا بِعْتُ بِكَذَا وَلَقَدْ بِعْتُ بِكَذَا، وَإِذَا تَحالَفَا فَالصَّحِيحُ أَنَّ الْعَقْدَ لا يَنْفَسِخُ، بَلْ إِنْ تَراضَيا وَإِلاَّ فَيَفْسَخانِه أَوْ أَحَدُهُما أَوِ الْحاكِمُ، وَقِيلَ إِنَّما يَفْسَخُهُ الْحاكِمُ،

---

(فَيَحْلِفُ كُلٌّ) جا هەر یەکەیان -کڕیارەکەو فرۆشیارەکە- سوێندێك دەخوا (عَلَى نَفْيِ قَوْلِ صاحِبِه) لە سەر وانەبوونی قسەی هاوڕێیەکەیو (وَإِثْباتِ قَوْلِه) لە سەر وابوونی قسەی خۆی (وَيُبْدَأُ بِالْبائِعِ) لەو سوێندەدا سوننەتە یەکەمجار دەست بە فرۆشیارەکە بکرێ (وَفِي قَوْلٍ بِالْمُشْتَرِى) لە فەرموودەیەکدا سوننەتە دەست بە کڕیارەکە بکرێ (وَفِي قَوْلٍ يَتَساوَيانِ) لە فەرموودەیەکدا هەردووکیان یەکسانن، کەوابو: (فَيَتَخَيَّرُ الْحاكِمُ) دادوەر سەرپشکە لەوەی هەر کامیان پێشدا سوێند بدا (وَقِيلَ يُقْرَعُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا پشکە لە نێوانیاندا دەکرێ، هەر کامیان پشکەی بۆ دەرچوو، ئەویان پێشدا سوێند دەدرێ.

(وَالصَّحِيحُ) فەرموودەیڕاست (أَنَّهُ يَكْفِى كُلٌّ واحِدٍ يَمِينٌ) هەر یەکەیان -کڕیارەکەو فرۆشیارەکە- تەنها سوێندێکی بەسە: کە (تَجْمَعُ نَفْياً وَإِثْباتاً) سوێندەکە نەبوونێكو هەبوونێك کۆ بکاتەوە، جا (وَيُقَدَّمُ النَّفْيُ) لەو سوێندخواردنەشدا سوننەتە: نەبوون وەپێش هەبوون بخرێ، کەواتە: (فَيَقُولُ) فرۆشیارەکە لە سوێندەکەیدا دەڵێ: والله (مَا بِعْتُ بِكَذَا وَلَقَدْ بِعْتُ بِكَذَا) بەوەندەم نەفرۆشتوە بەڵکو بەوەندەم فرۆشتوە. کڕیارەکەش دەڵێ: والله بەوەندەم نەکڕیوە بەڵکو بەوەندەم کڕیوە.

ئینجا ئەگەر یەکێکیان ئەوها بە هەبوونو نەبوون سوێندی نەخوارد، ئەوە مافی نامێنێو مافەکە دەدرێتە سوێندخۆرەکە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، بەڵام (وَإِذَا تَحالَفَا) هەر کاتێك هەردووکیان ئەوها سوێندیان خوارد (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست (أَنَّ الْعَقْدَ لا يَنْفَسِخُ) مامڵەتەکە بە خۆی هەڵناوەشێتەوە (بَلْ إِنْ تَراضَيا) بەڵکو ئەگەر هەردووکیان ڕازی بونو لە سەر گوتەی یەکێکیان پێك هاتن، ئەوە مامڵەتەکە وەکو خۆی بەردەوام دەبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر پێك نەهاتنو ڕازی نەبون (فَيَفْسَخانِه) هەردووکیان مامڵەتەکە هەڵدەوەشێننەوە (أَوْ أَحَدُهُما) یان تەنها یەکێکیان هەڵیدەوەشێنێتەوە (أَوِ الْحاكِمُ) یان دادوەر هەڵیدەوەشێنێتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنَّما يَفْسَخُهُ الْحاكِمُ) تەنها دادوەر هەڵیدەوەشێنێتەوە، نەك ئەوان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا اخْتَلَفَ الْبَيِّعانِ وَلَيْسَ بَيْنَهُما بَيِّنَةٌ فَهُوَ مَا يَقُولُ رَبُّ السِّلْعَةِ أَوْ يَتَتارَكانِ: أَى يَفْسَخانِ الْعَقْدَ﴾ رواه اصحاب السنن وصححه الحاكم، هەر کاتێك کڕیارو فرۆشیار بووە کێشەیانو

ثُمَّ عَلَى الْمُشْتَرِي رَدُّ الْمَبِيعِ فَإِنْ كانَ وَقَفَهُ أَوْ أَعْتَقَهُ أَوْ باعَهُ أَوْ كاتَبَهُ أَوْ ماتَ لَزِمَهُ قِيمَتُهُ يَوْمَ التَّلَفِ فِي أَظْهَرِ الأَقْوالِ، وَإِنْ تَعَيَّبَ رَدَّهُ مَعَ أَرْشِهِ، وَإِخْتِلَافُ وَرَثَتِهِما كَهُما، وَلَوْ قالَ: بِعْتُكَهُ بِكَذا، فَقالَ: وَهَبْتَنِيهِ، فَلا تَحالُفَ بَلْ يَحْلِفُ كُلٌّ عَلَى نَفْيِ دَعْوَى الآخَرِ، فَإِذا حَلَفا رَدَّهُ مُدَّعِي الْهِبَةِ بِزَوائِدِهِ، وَلَوِ ادَّعَى صِحَّةَ الْبَيْعِ وَالآخَرُ فَسادَهُ فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُ مُدَّعِي الصِّحَّةِ بِيَمِينِهِ،

---

شاهیدیش لە نێوانیاندا نەبو، ئەوە قسەی فرۆشیارەکە وەردەگیرێ -ئەگەر کڕیارەکە ڕازی بێ- ئەگەر نا: فرۆشتنەکە هەڵدەوەشێننەوە.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای هەڵوەشاندنەوە (عَلَى الْمُشْتَرِي رَدُّ الْمَبِيعِ) لە سەر کڕیارەکە واجبە: فرۆشراوەکە -بۆ فرۆشیارەکە- بگەڕێنێتەوە ئەو شوێنەی لێیەوە وەرگیراوە (فَإِنْ كانَ وَقَفَهُ) جا ئەگەر کڕیارەکە فرۆشراوەکەی وەقف کردبو (أَوْ أَعْتَقَهُ) یان ئازادی کردبو (أَوْ باعَهُ) یان فرۆشتبوی (أَوْ كاتَبَهُ) یان نووسراوی ئازادیی دابوێ (أَوْ ماتَ) یان مردبو، یان بە هەر شێوەیەکیتر لە ناو چوبو، ئەوە (لَزِمَهُ قِيمَتُهُ) لە سەر کڕیارەکە واجبە: نرخی فرۆشراوەکە بداتەوە فرۆشیارەکە (وَهِيَ) نرخی فرۆشراوەکە: کە لە سەری واجبە (قِيمَةُ يَوْمِ التَّلَفِ) نرخەکەی ڕۆژی لەناوچوونی فرۆشراوەکەیە (فِي أَظْهَرِ الأَقْوالِ) لە بەهێزترینی فەرموودەکاندا (وَإِنْ تَعَيَّبَ) ئەگەر فرۆشراوەکە مابو، بەڵام عەیبی لێپەیدا بو، ئەوە (رَدَّهُ مَعَ أَرْشِهِ) فرۆشراوەکە لەگەڵ تۆڵەیعەیبەکە -بۆ فرۆشیارەکە- دەگەڕێنێتەوە.

(وَإِخْتِلَافُ وَرَثَتِهِما) کێشەی میراتگرەکانی کڕیارەکەو فرۆشیارەکە، یان تەنها میراتگری یەکێکیان لەگەڵ ئەویتر (كَهُما) وەك کێشەی کڕیارەکەو فرۆشیارەکەیە: لەو بڕیارانەی ڕابردوودا، چونکە میراتگر جێگری مردووەکەیەتی.

ئینجا بزانە: تا ئێستا باسی ئەوە بوو: هەردووکیان یەکدەنگ بن لە سەر دامەزرانی مامڵەتەکەو لە چۆنیەتیەکەشدا ببێتە کێشەیان، بەڵام (وَلَوْ قالَ بِعْتُكَهُ بِكَذا) ئەگەر فرۆشیارەکە گوتی: فرۆشتومەتە تۆ بە ئەوەندە (فَقالَ) ئەویتریش گوتی: نەتفرۆشتومێ، بەڵکو (وَهَبْتَنِيهِ) پێت بەخشیوم. (فَلا تَحالُفَ) ئەو کاتە وەك شێوەیڕابردوو سوێند بۆ یەکتری ناخۆن (بَلْ يَحْلِفُ كُلٌّ عَلَى نَفْيِ دَعْوَى الآخَرِ) بەڵکو هەر یەکەیان سوێند دەخوا لە سەر وانەبوونی داوایەکەیئەویتر (فَإِذا حَلَفا) جا کە هەردووکیان سوێندیان خوارد (رَدَّهُ مُدَّعِي الْهِبَةِ) ئەوەی داوای پێبەخشینی دەکا، واجبە: شتەکە بگەڕێنێتەوە (بِزَوائِدِهِ) بە گشت زێدەییەکانیەوە، جیاوازی نیە: زێدەییەکانی لێ جیابوبنەوە، یان نا.

(وَلَوِ ادَّعَى صِحَّةَ الْبَيْعِ) ئەگەر یەکێکیان گوتی: فرۆشتنەکە دروستبووەو دامەزراوە (وَالآخَرُ فَسادَهُ) ئەویتریش گوتی: بەتاڵەو دانەمەزراوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەیڕاستتر: (تَصْدِيقُ مُدَّعِي الصِّحَّةِ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە ئەویان دەکرێ کە دەڵێ: دروستبووە. ئەگەر سوێندیش بخوا،

وَلَوِ اشْتَرَى عَبْداً فَجاءَ بِعَبْدٍ مَعِيبٍ لِيَرُدَّهُ فَقالَ الْبائِعُ لَيْسَ هَذَا الْمَبِيعَ، صُدِّقَ الْبائِعُ بِيَمِينِهِ، وَفِي مِثْلِهِ فِي السَّلَمِ يُصَدَّقُ الْمُسْلِمُ فِي الأَصَحِّ.
(بابٌ) اَلْعَبْدُ إِنْ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِي التِّجارَةِ لاَ يَصِحُّ شِراؤُهُ بِغَيْرِ إِذْنِ سَيِّدِهِ فِي الأَصَحِّ، وَيَسْتَرِدُّهُ الْبائِعُ سَواءٌ كانَ فِي يَدِ الْعَبْدِ أَوْ سَيِّدِهِ، فَإِنْ تَلِفَ فِي يَدِهِ تَعَلَّقَ الضَّمانُ بِذِمَّتِهِ، أَوْ فِي يَدِ السَّيِّدِ فَلِلْبائِعِ تَضْمِينُهُ، وَلَهُ مُطالَبَةُ الْعَبْدِ بَعْدَ الْعِتْقِ، وَاقْتِراضُهُ كَشِرائِهِ،

---

(وَلَواشْتَرَى عَبْداً) ئەگەر یەکێك کۆیلەیەکی کڕی، یان شتێکیتری کڕی (فَجاءَ بِعَبْدٍمَعِيبٍ) جا کۆیلەیەکی عەیبداری هێنا (لِيَرُدَّهُ) تاکو بیداتەوە فرۆشیارەکە (فَقالَ الْبائِعُ: لَيْسَ هَذَا الْمَبِيعَ) فرۆشیارەکەش گوتی: ئەمەیان فرۆشراوەکە نیە (صُدِّقَ الْبائِعُ بِيَمِينِهِ) لەو حاڵەتەدا باوەڕ بە فرۆشیارەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا.
بەڵام (وَفِي مِثْلِهِ) لە وێنەی ئەو فرۆشتنەدا (فِي السَّلَمِ) لە مامڵەتی سەلەمدا (يُصَدَّقُ الْمُسْلِمُ) باوەڕ بە سەلەمدەر دەکرێ -کە کڕیارەکەیە- ئەگەر سوێند بخوا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بۆ وێنە: سەلەمدەر سەد دیناری بە سەلەمی پەنجا تەنەکە گەنم دایە جووتیارێك، ئینجا گەنمەکەی وەرگرت، دوایێ گەنمێکی عەیبداری هێنا بیداتەوە جووتیارەکە، جووتیارەکەش گوتی: ئەمە گەنمی من نیە. ئەوە باوەڕ بە سەلەمدەرەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا.

## ﴿ بابٌ: لە باسی مامڵەتی کۆیلە ﴾

(اَلْعَبْدُ) کۆیلە (إِنْ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِي التِّجارَةِ) ئەگەر ئیزنی نەدرێتێ لە بازرگانیکردندا (لاَ يَصِحُّ شِراؤُهُ) کڕینی هیچ شتێکی دروست نابێ (بِغَيْرِ إِذْنِ سَيِّدِهِ) بە بێ ئیزنی گەورەکەی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: (وَيَسْتَرِدُّهُ الْبائِعُ) فرۆشیارەکە داوا دەکا: ماڵە فرۆشراوەکەی بۆ بگەڕێندرێتەوە (سَواءٌ كانَ فِي يَدِ الْعَبْدِ أَوْ سَيِّدِهِ) یەکسانە: فرۆشراوەکە لە دەست کۆیلەکەدا بێ، یان لە دەست گەورەکەی دابێ (فَإِنْ تَلِفَ فِي يَدِهِ) جا ئەگەر ماڵە فرۆشراوەکە لە دەستی کۆیلەکەدا فەوتا بوو (تَعَلَّقَ الضَّمانُ بِذِمَّتِهِ) زامینی ماڵە فەوتاوەکە بە قەرز لە ئەستۆی کۆیلەکەدا دەمێنێ: هەر کاتێك ئازاد کرا داوای ئەو قەرزەی لێدەکرێ (أَوْ فِي يَدِ السَّيِّدِ) یان ئەگەر ماڵەکە لە دەستی گەورەکەیدا فەوتا (فَلِلْبائِعِ تَضْمِينُهُ) فرۆشیارەکە بۆی هەیە گەورەکەی بکاتە زامین، هەم (وَلَهُ مُطالَبَةُ الْعَبْدِ) بۆی هەیە داوای تۆڵەی فرۆشراوەکە لە کۆیلەکە بکا، بەڵام (بَعْدَ الْعِتْقِ) دوای ئازادبوونی، نەك پێش ئازادبوونی (وَاقْتِراضُهُ) شت قەرزکردنی کۆیلە (كَشِرائِهِ) وەك شت کڕینیەتی: بە بێئیزن دروست نابێ.

وَإِنْ أَذِنَ لَهُ فِيالتِّجارَةِ تَصرَّفَ بِحَسَبِ الإِذْنِ، فَإِنْ أَذِنَ فِي نَوْعٍ لَمْ يَتجاوَزْهُ، وَلَيْسَ لَهُ نِكاحٌ وَلاَ يُؤَجِّرُ نَفسَهُ، وَلاَ يَأْذَنُ لِعَبْدِه فِي تِجارَةٍ، وَلاَيَتَصَدَّقُ وَلاَيُعامِلُ سَيِّدَهُ وَلاَيَنْعَزِلُ بِإِباقِه وَلاَيَصِيرُ مَأْذُوناً لَهُ بِسُكُوتِ سَيِّدِه عَلَىتَصَرُّفِه، وَيُقْبَلُ إِقْرارُهُ بِدُيُونِ الْمُعامَلَةِ، وَمَنْ عَرَفَ رِقَّ عَبْدٍ لَمْ يُعامِلْهُ حَتَّى يَعْلَمَ الإِذْنَ بِسَماعِ سَيِّدِه أَوْ بَيِّنَةٍ أَوْ شُيُوعٍ بَيْنَ النَّاسِ، وَفِيالشُّيُوعِ وَجْهٌ، وَلاَ يَكْفِي قَوْلُ الْعَبْدِ، فَإِنْ باعَ مَأْذُونٌ لَهُ وَقَبَضَ الثَّمَنَ فَتَلِفَ فِيَدِه فَخَرَجَتِ السِّلْعَةُ مُسْتَحَقَّةً رَجَعَ الْمُشْتَرِي بِبَدَلِها عَلَىالْعَبْدِ، وَلَهُ مُطالَبَةُالسَّيِّدِ أَيْضاً،

---

(وَإِنْ أَذِنَ لَهُ فِيالتِّجارَةِ) بەلام ئەگەر گەورەکە کۆیلەکەی ئیزن دا لە بازرگانیکردندا (تَصرَّفَ بِحَسَبِ الإِذْنِ) ئەوە بە گوێرەی ئەندازەی ئیزندانەکە بازرگانی دەکا، کەوابو: (فَإِنْ أَذِنَ فِينَوْعٍ) ئەگەر ئیزنیدا لە جۆرە شتێکدا بازرگانی بکا (لَمْ يَتجاوَزْهُ) نابێ لەو جۆرە بە دەر بازرگانی بکا (وَلَيْسَ لَهُ نِكاحٌ) بەو ئیزندانەی بازرگانی بۆی دروست نیە ژن بۆ خۆی بێنێ (وَلاَ يُؤَجِّرُ نَفسَهُ) نابێ خۆی بەکرێ بدا بە بێ ئیزنیگەورەکەی (وَلاَ يَأْذَنُ لِعَبْدِه فِي تِجارَةٍ) نابێ کۆیلەیخۆی-کە بۆ بازرگانی کڕیویەتی- ئیزن بدا لە بازرگانی کردندا (وَلاَيَتَصَدَّقُ) نابێ هیچ شتێك بە خێر بداتە کەسێکیتر، نابێ هیچ شتێك ببەخشێ (وَلاَيُعامِلُ سَيِّدَهُ) نابێ مامڵەت لەگەڵ گەورەی خۆی بکا (وَلاَيَنْعَزِلُ بِإِباقِه) کۆیلە لە سەر کاری بازرگانی لاناچێ بە هۆی خۆ بزرکردنی.

(وَلاَيَصِيرُ مَأْذُوناًلَهُ بِسُكُوتِ سَيِّدِه عَلَى تَصَرُّفِه) کۆیلە بەوە نابێتە ئیزندراو: کە گەورەکەی بێدەنگ بێ لە دەستکاریەکانی (وَيُقْبَلُ إِقْرارُهُ بِدُيُونِ الْمُعامَلَةِ) دانپێداهێنانی کۆیلە وەردەگیرێ دەربارەی قەرزەکانی مامڵەتکردن (وَمَنْ عَرَفَ رِقَّ عَبْدٍ) هەر کەسێك بزانێ ئادەمیزادێك کۆیلەیە (لَمْ يُعامِلْهُ) دروست نیە هیچ مامڵەتێکی ماڵی لەگەڵ بکا (حَتَّى يَعْلَمَ الإِذْنَ) تا دەزانێ ئیزندراوە (بِسَماعِ سَيِّدِه) وەك گوێی لە گەورەکەی بێ: ئیزنی بدا (أَوْ بَيِّنَةٍ) یان شاهیدی ئیزندانی هەبێ (أَوْ شُيُوعٍ بَيْنَ النَّاسِ) یان لە ناو خەڵکدا بڵاو بێتەوە: کە ئیزندراوە (وَفِيالشُّيُوعِ وَجْهٌ) دەربارەی بڵاو بوونەوە فەرموودەیەك هەیە: کە بەس نیە: (وَلاَ يَكْفِي قَوْلُ الْعَبْدِ) قسەی کۆیلە-کە بڵێ: ئیزندراوم- بەس نیە.

(فَإِنْ باعَ مَأْذُونٌ لَهُ) ئەگەر کۆیەلەیەکی ئیزندراو شتێکی فرۆشت (وَقَبَضَ الثَّمَنَ) پارەکەشی وەرگرت (فَتَلِفَ فِي يَدِه) جا پارەکە لە دەست کۆیلەکەدا فەوتا (فَخَرَجَتِ السِّلْعَةُ مُسْتَحَقَّةً) ئینجا دەرکەوت شتەفرۆشراوەکە هی کەسێکیتر بووە (رَجَعَ الْمُشْتَرِي بِبَدَلِها عَلَىالْعَبْدِ) ئەو کاتە کڕیارەکە دەگەڕێتەوە سەر کۆیلەکە تاکو لەجیاتی پارەی فرۆشراوەکە وێنەکەی، یان نرخەکەی لێوەربگرێتەوە (وَلَهُ مُطالَبَةُ السَّيِّدِ أَيْضاً) هەروەها بۆی هەیە داوا لە گەورەیکۆیلەکەش بکا، تاکو تۆڵەی پارەکەی بداتێ

وَقِيلَ لاَ، وَقِيلَ إِنْ كانَ فِي يَدِالْعَبْدِ وَفاءٌ فَلاَ، وَلَواشْتَرَى سِلْعَةً فَفِيمُطالَبَةِالسَّيِّدِ بِثَمَنِها هَذاالْخِلافُ، وَلاَ يَتَعَلَّقُ دَيْنُ التِّجارَةِ بِرَقَبَتِه، وَلاَ بِذِمَّةِسَيِّدِه بَلْ يُؤَدَّى مِنْ مالِ التِّجارَةِ، وَكَذا مِنْ كَسْبِهِ بِاصْطِيادٍ وَنَحْوِهِ فِيالأَصَحِّ، وَلاَ يَمْلِكُ الْعَبْدُ بِتَمْلِيكِ سَيِّدِه فِيالأَظْهَرِ.

(كِتابُ السَّلَمِ)

هُوَ بَيْعُ مَوْصُوفٍ فِيالذِّمَّةِ،

---

(وَقِيلَ لاَ) له فەرموودەیەكی بێهێزدا: بۆی نیە داوا له گەورەكەی بكا (وَقِيلَ إِنْ كانَ فِي يَدِ العَبْدِ وَفاءٌ) له فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەگەر له دەستی كۆیلەكەدا بە ئەندازەی تۆڵەی پارەكە ماڵ هەبێ (فَلاَ) نابێ داوا له گەورەكەی بكا.

(وَلَوِ اشْتَرَى سِلْعَةً) ئەگەر كۆیلەی ئیزندراو كەلوپەلێكی كڕی (فَفِي مُطالَبَةِ السَّيِّدِ بِثَمَنِها) دەربارەی ئەوەی داوا له گەورەكەی بكا: تاكو پارەی فرۆشراوەكە بدا (هَذا الخِلاَفُ) ئەو فەرموودە جیاوازانەیڕابردوو هەنە (وَلاَ يَتَعَلَّقُ دَيْنُ التِّجارَةِ بِرَقَبَتِهِ) قەرزی بازرگانی پەیوەندی بە گەردەنی كۆیلەكەوە نیە: واتە: بە گەردەنیەوە هەڵناواسرێ (وَلاَ بِذِمَّةِ سَيِّدِهِ) هەروەها بە ئەستۆی گەورەكەشی هەڵناواسرێو له سەری نابێتە قەرز (بَلْ يُؤَدَّى مِنْ مالِ التِّجارَةِ) بەڵكو قەرزەكە له ماڵی بازرگانی دەدرێتەوە (وَكَذا مِنْ كَسْبِهِ) هەروەها له بەرهەمی ئیش‌وكاری كۆیلەكەش دەدرێتەوە (بِاصْطِيادٍ وَنَحْوِهِ) كە بە ڕاوكردنو كارەكانیتر وەدەستی دێنێ (فِيالأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ يَمْلِكُ العَبْدُ) كۆیلە نابێتە خاوەن ملك (بِتَمْلِيكِ سَيِّدِهِ) بەوەی گەورەكەی شتێكی بە ملكایەتی بداتێ (فِيالأَظْهَرِ) له فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە ئەو بەخۆی ملكی گەورەكەی خۆیەتی.

﴿ كِتابُ السَّلَمِ: پەڕتوكی سەلەم ﴾

(هُوَ) سەلەم له شەرعدا (بَيْعُ مَوْصُوفٍ فِيالذِّمَّةِ) فرۆشتنی شتێكە له بەر چاو نەبێو ناونیشانی درابێو له ئەستۆی فرۆشیارەكەدا بێ. وەك سەلەمدەر بڵێ: (ئەم سەد دینارەم دا بە تۆ له سەلەمی پەنجا تەنەكە گەنمیقەندەهاری له ڕەمەزاندا تەسلیمم بكە). سەلەم لەگەڵكراویش قبوڵ بكاو هەم له دانیشگەیمامڵەتەكەشدا سەد دینارەكەی لێوەربگرێ.

﴿عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِيالثِّمارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَقالَ ﷺ: مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینەیپیرۆز، لەو كاتدا دانیشتووانی مەدینە سەلەمیان له میوەدا دەكرد بۆ ماوەی ساڵێكو دوو ساڵ، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

يُشْتَرَطُ لَهُ مَعَ شُرُوطِ الْبَيْعِ أُمُورٌ، أَحَدُها: تَسْلِيمُ رَأْسِ الْمالِ فِي الْمَجْلِسِ فَلَوْ أَطْلَقَ ثُمَّ عَيَّنَ وَسَلَّمَ فِي الْمَجْلِسِ جازَ، وَلَوْ أَحالَ بِهِ وَقَبَضَهُ الْمُحالُ فِي الْمَجْلِسِ فَلاَ، وَلَوْ قَبَضَهُ وَأَوْدَعَهُ الْمُسْلِمَ جازَ، وَيَجُوزُ كَوْنُهُ مَنْفَعَةً وَتُقْبَضُ بِقَبْضِ الْعَيْنِ،

---

هەر کەسێك لە شتێكدا سەلەمی کرد، با لە پێوانێكیزاندراودا و لە کێشانێكیزاندراودا بۆ ماوەیەکی دیارکراو سەلەم بكا.

ئینجا بزانە: مامڵەتی سەلەم لەم پێنج ڕوکنانە پێك دێ: (اَلْمُسْلِمُ) سەلەمدەر: کە کڕیارەکەیە. (اَلْمُسْلَمُ إِلَيْهِ) سەلەم لەگەڵکراو: کە فرۆشیارەکەیە. (رَأْسُ الْمالِ) سەرمایە: کە پارەکەیە. (اَلْمُسْلَمُ فِيهِ) سەلەم تێداکراو: کە فرۆشراوەکەیە. (اَلصِّيغَةُ) گوتەی مامڵەتەکە: کە ووشەی سەلەم، یان سەلەف، یان واتەکەیان بە زمانێكیتر.

(يُشْتَرَطُ لَهُ) بە مەرج دادەنرێ بۆ دروستبوونی سەلەم (مَعَ شُرُوطِ الْبَيْعِ) لەگەڵ مەرجەکانیفرۆشتندا: کە ڕابران (أُمُورٌ) حەفت مەرجیتر هەبن:

(أَحَدُها) مەرجییەکەمیان: (تَسْلِيمُ رَأْسِ الْمالِ فِي الْمَجْلِسِ) تەسلیمکردنی هەموو سەرمایە-کە پارەکەیە- لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا (فَلَوْ أَطْلَقَ) جا ئەگەر پارەکەی بە دیارنەکراوی گوت، وەك بڵێ: دە دینارم لە سەلەمی فلان شت دا بە تۆ (ثُمَّ عَيَّنَ) ئینجا پارەکەی دیاری کردو گوتی: ئەم دە دینارە عێراقییە (وَسَلَّمَ فِي الْمَجْلِسِ) هەر لەو دانیشگەشدا پارەکەی تەسلیم کرد (جازَ) مامڵەتەکە دروستە.

(وَلَوْ أَحالَ بِهِ) ئەگەر سەلەمدەرەکە-بە پارەی سەلەم- سەلەم لەگەڵکراوەکەی حەواڵە کردە سەر قەرزدارێكی خۆی، تاکو پارەکەی سەلەم لە قەرزدارەکە وەربگرێ، ئینجا (وَقَبَضَهُ الْمُحالُ فِي الْمَجْلِسِ) سەلەم لەگەڵکراوەکەیحەواڵەکراو هەر لەو دانیشگەدا پارەی لە قەرزدارەکە وەرگرت (فَلاَ) ئەوە دروست نیەو دانامەزرێ، چونکە قەرزدارەکە قەرزەکەی خۆی داوەتەوە، واتە: لە جیاتی سەلەمدەر پارەکە تەسلیم ناکا.

بەلام (وَلَوْ قَبَضَهُ) ئەگەر سەلەم لەگەڵکراوەکە پارەکەی لە سەلەمدەرەکە وەرگرتو (وَأَوْدَعَهُ الْمُسْلِمَ) هەر لەو دانیشگەشدا پارەکەی بە ئەمانەت لە لایسەلەمدەرەکە دانا، یان بە قەرز دایە سەلەمدەرەکە، یان لەجیاتیقەرزێك دایەوە (جازَ) سەلەمەکە دروستە.

(وَيَجُوزُ كَوْنُهُ مَنْفَعَةً) دروستە: سەرمایەی سەلەم-لەجیاتی پارە- سودێكی زاندراو بێ، وەك بڵێ: لە ئێستاوە سودی ساڵێكی ئەم خانووەم دایە تۆ لە سەلەمی هەزار کیلۆ گەنم (وَتُقْبَضُ) ئەو سودەی کراوەتە سەرمایە-ئەگەر تەسلیم بكرێ- وەردەگیرێ (بِقَبْضِ الْعَيْنِ) بە وەرگرتنی خودی ماڵە سوددەرەکە لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا، واتە: لە وێنەیڕابردوودا ئەمەیان خانووەکە تەسلیم بكا، ئەویش وەریبگرێ.

وَإِذَا فُسِخَ السَّلَمُ وَرَأْسُ الْمالِ باقٍ اسْتَرَدَّهُ بِعَيْنِهِ، وَقِيلَ لِلْمُسْلَمِ إِلَيْهِ رَدُّ بَدَلِهِ إِنْ عَيَّنَ فِي الْمَجْلِسِ دُونَ الْعَقْدِ، وَرُؤْيَةُ رَأْسِ الْمالِ تَكْفِي عَنْ مَعْرِفَةِ قَدْرِهِ فِي الأَظْهَرِ. اَلثَّانِي: كَوْنُ الْمُسْلَمِ فِيهِ دَيْناً فَلَوْ قالَ أَسْلَمْتُ إِلَيْكَ هَذَاالثَّوْبَ فِي هَذَاالْعَبْدِ فَلَيْسَ بِسَلَمٍ، وَلاَ يَنْعَقِدُ بَيْعاً فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ قالَ: اشْتَرَيْتُ مِنْكَ ثَوْباً صِفَتُهُ كَذَا بِهَذِهِ الدَّراهِمِ، فَقالَ: بِعْتُكَ، انْعَقَدَ بَيْعاً، وَقِيلَ سَلَماً. اَلثَّالِثُ: اَلْمَذْهَبُ أَنَّهُ إِذَا أَسْلَمَ بِمَوْضِعٍ

---

(وَإِذَا فُسِخَ السَّلَمُ) هەر كاتێك –لە بەر هەر هۆیەك– مامڵەتی سەلەم هەڵوەشێندراوە (وَرَأْسُ الْمالِ باقٍ) خودی سەرمایەكەش –كە وەرگیرابو– هەر مابو، ئەوە (اسْتَرَدَّهُ بِعَيْنِهِ) سەلەمدەرەكە خودی سەرمایەكەی وەردەگرێتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (لِلْمُسْلَمِ إِلَيْهِ رَدُّ بَدَلِهِ) سەلەم لەگەڵكراوەكە بۆی دروستە: لەجیاتیسەرمایەكە (بَدَل)ی بداتەوە (إِنْ عَيَّنَ فِيالْمَجْلِسِ) ئەگەر سەرمایەكە لە دانیشگەكەدا دیاری كرابو (دُونَ الْعَقْدِ) نەك لە مامڵەت بەستنەكەدا.

ئینجا بزانە: ئەگەر سەلەمەكە هەڵوەشێندراوەو سەرمایەكەشی نەمابو، ئەو كاتە ئەگەر وێنەی هەبو وێنەكەی وەردەگیرێتەوە، ئەگەر نا: نرخەكەی وەردەگرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە (وَرُؤْيَةُ رَأْسِ الْمالِ) دیتنی سەرمایەی سەلەم (تَكْفِي عَنْ مَعْرِفَةِ قَدْرِهِ) بەسە، وەبەر زانینی ئەندازەی سەرمایەكە دەكەوێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(اَلثَّانِي) مەرجیدووەم: (كَوْنُ الْمُسْلَمِ فِيهِ دَيْناً) دەبی سەلەم تێداكراوەكە قەرز بێ لە ئەستۆی فرۆشیارەكەدا، كەواتە: (فَلَوْ قالَ) ئەگەر سەلەمدەرەكە گوتی: (أَسْلَمْتُ إِلَيْكَ هَذَا الثَّوْبَ فِي هَذَاالعَبْدِ) ئەم جلەم دایە تۆ لە سەلەمی ئەم كۆیلەیە.(فَلَيْسَ بِسَلَمٍ) ئەو مامڵەتە سەلەم نیە، چونكە فرۆشراوەكە –كە كۆیلەكەیە– لە بەرچاوەو قەرز نیە (وَلاَ يَنْعَقِدُ بَيْعاً) هەم ئەو مامڵەتە بە فرۆشتنیش دانامەزرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە ووشەی سەلەمی بۆ گوتراوە.

بەڵام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی (اشْتَرَيْتُ مِنْكَ ثَوْباً صِفَتُهُ كَذَا بِهَذِهِ الدَّراهِمِ) جلێكم لە تۆ كڕی سیفەتی ئەوهاو ئەوها بێ، بەم دیرهەمانە (فَقالَ بِعْتُكَ) فرۆشیارەكەش گوتی: فرۆشتمە تۆ (انْعَقَدَ بَيْعاً) ئەم مامڵەتە بە فرۆشتن دادەمەزرێ، چونكە ووشەیفرۆشتنی بۆ گوتراوە (وَقِيلَ سَلَماً) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بە سەلەم دادەندرێ، چونكە فرۆشراوەكە قەرزەو لە بەرچاو نیە.

(اَلثَّالِثُ) مەرجیسێیەم: دیاریكردنی شوێنی تەسلیمكردن، لە بارەی ئەم مەرجە (اَلْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستیمەزهەب ئەمەیە (أَنَّهُ إِذَا أَسْلَمَ بِمَوْضِعٍ) ئەگەر لە شوێنێكی

لاَيَصْلُحُ للتَّسْليمِ أَوْ يَصْلُحُ وَلِحَمْلِه مُؤْنَةٌ اُشْتِرِطَ بَيانُ مَحَلِّ التَّسْليمِ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَيَصِحُّ حالاًّ وَمُؤَجَّلاً، فَإِنْ أَطْلَقَ انْعَقَدَ حالاًّ وَقيلَ لاَيَنْعَقِدُ، وَيُشْتَرَطُ الْعِلْمُ بالأَجَلِ: فَإِنْ عَيَّنَ شُهُورَالْعَرَبِ أَوِ الْفُرْسِ أَوِ الرُّومِ جازَ، وَإِنْ أَطْلَقَ حُمِلَ عَلَىالْهِلاَلِيِّ، فَإِنِ انْكَسَرَ شَهْرٌ

---

وەهادا سەلەمی کرد: کە (لاَ يَصْلُحُ لِلتَّسْلِيمِ) نەدەگونجا سەلەم تێداکراوەکەی لێ تەسلیم بکرێ (أَوْ يَصْلُحُ) یان دەگونجا، بەلام (وَلِحَمْلِهِ مُؤْنَةٌ) هێنانی بۆ ئەو شوێنە ئەرك‌و ماندووبوونی هەبو، لەو حاڵەتانەدا (اُشْتُرِطَ بَيانُ مَحَلِّ التَّسْلِيمِ) بە مەرج داندراوە: شوێنی تەسلیمکردنی سەلەم تێداکراوەکە دیاری بکرێ.

(وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر شوێنەکە بۆ تەسلیمکردن دەگونجاو هێنانی سەلەم تێداکراویش ئەرك‌و ماندووبوونی نەبو (فَلاَ) دیاری‌کردنی شوێنەکە مەرج نیەو هەر ئەو شوێنەی مامڵەتەکەی لێبەستراوە، ئەوێ دەبێتە شوێنی تەسلیمکردنی.

ئینجا بزانە: ئەگەر شوێنی‌دیارکراو–بە هۆی وێرانبوون، یان بە هۆیەکی‌تر– کەڵکی لێ تەسلیمکردنی نەما، ئەو کاتە نزیکترین شوێنی گونجاو دەبێتە شوێنی تەسلیمکردن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

مەرجی‌چوارەم: دیاری‌کردنی کاتی تەسلیمکردن، ئەگەر سەلەمەکە ماوەی بۆ داندرابێ، چونکە (وَيَصِحُّ) سەلەم دروستە (حالاًّ) هەر بۆ ئەم کاتەی ئێستا، ئەگەر سەلەم تێداکراوەکەی دەست بکەوێ‌و بتوانێ–لە دوای پارە وەرگرتن– یەکسەر بچێ بیهێنێ (وَمُؤَجَّلاً) هەم بۆ کاتێکی لەمەودواش سەلەم دروستە.

(فَإِنْ أَطْلَقَ) جا ئەگەر لە مامڵەتی سەلەمدا باسی ئێستاو لەمەودوا نەکرا، ئەو کاتە (انْعَقَدَ حالاًّ) بۆ ئەم کاتەی ئێستا دادەمەزرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: (لاَ يَنْعَقِدُ) دانامەزرێ.

(وَ) هەر کاتێك سەلەمەکە بۆ کاتێکی لەمەودوا بوو (يُشْتَرَطُ الْعِلْمُ بِالأَجَلِ) بە مەرج دادەندرێ: هەردوو لا زانستیان هەبێ بە ماوەی سەلەمەکە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی رابردوو، هەم مەرجە: ماوەکەش بە رێکی دیاری بکرێ، کەواتە: دروست نیە بڵێ: تا زستان، یان تا درەوێنە.

(فَإِنْ عَيَّنَ شُهُورَالْعَرَبِ أَوِالْفُرْسِ أَوِالرُّومِ) جا ئەگەر–لە مامڵەتەکەدا– مانگەکانی عەرەبی، یان فارسی، یان رۆمی دیاری کردن: وەك بڵێ: بە ماوەی چوار مانگی عەرەبی (جازَ) سەلەمەکە دروستە (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر هیچیانی دیاری نەکردو تەنها گوتی بە ماوەی چوار مانگ، ئەوە (حُمِلَ عَلَىالْهِلاَلِيِّ) واتەی مانگەکە دەهێندرێتە سەر مانگی ئیسلامی: کە دەکەوێتە نێوان دوو مانگی یەکشەوە (فَإِنِ انْكَسَرَ شَهْرٌ) جا ئەگەر لەو مانگانە مانگێك

حُسِبَ الْبَاقِي بِالأَهِلَّةِ وَتُمِّمَ الأَوَّلُ ثَلاثِينَ، وَالأَصَحُّ صِحَّةُ تَأْجِيلِهِ بِالْعِيدِ وَجُمَادَى، وَيُحْمَلُ عَلَى الأَوَّلِ.
(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ كَوْنُ الْمُسْلَمِ فِيهِ مَقْدُوراً عَلَى تَسْلِيمِهِ عِنْدَ وُجُوبِ التَّسْلِيمِ، فَإِنْ كَانَ يُوجَدُ بِبَلَدٍ آخَرَ صَحَّ إِنِ اعْتِيدَ نَقْلُهُ لِلْبَيْعِ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ أَسْلَمَ فِيمَا يَعُمُّ فَانْقَطَعَ فِي مَحِلِّهِ لَمْ يَنْفَسِخْ فِي الأَظْهَرِ، فَيَتَخَيَّرُ الْمُسْلِمُ بَيْنَ فَسْخِهِ وَالصَّبْرِ حَتَّى يُوجَدَ، وَلَوْ عَلِمَ قَبْلَ الْمَحِلِّ انْقِطَاعَهُ عِنْدَهُ

---

دەشکاوە؟ چونکە لە ناو مانگەکەدا مامڵەتەکە کرابو (حُسِبَ الباقِي بِالأَهِلَّةِ) ئەوانیتر بە مانگی یەکشەوە دەژمێردرێنو (وَتُمِّمَ الأَوَّلُ ثَلاَثِينَ) یەکەمەکەش-کە شکاوەتەوە- سی ڕۆژی بۆ تەواو دەکرێ، لە دوای مانگەکانیتر.
(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (صِحَّةُ تَأْجِيلِهِ) دروستە ماوە بۆ سەلەم دابندرێ (بِالْعِيدِ) بە هاتنی جەژنو (وَجُمادَى) هەم بە مانگی (جومادا)ییەکەم، یان دووەم، هەم مانگی کانوونی یەکەمو دووەم (وَيُحْمَلُ عَلَى الأَوَّلِ) واتەی ئەوانەش دەهێندرێتە سەر سەرەتای کاتەکە، واتە: یەکەم شەوی جەژنو یەکەم شەوی مانگەکان.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانیتری سەلەم ﴾

مەرجیپێنجەم: (يُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (كَوْنُ الْمُسْلَمِ فِيهِ مَقْدُوراً عَلَى تَسْلِيمِهِ) سەلەم تێداکراوەکە توانای تەسلیمکردنی بە سەردا هەبێ (عِنْدَ وُجُوبِ التَّسْلِيمِ) لە کاتی واجببوونی تەسلیمکردنیدا (فَإِنْ كانَ يُوجَدُ بِبَلَدٍ آخَرَ) جا ئەگەر سەلەم تێداکراوەکە لە شوێنێکیتردا دەست دەکەوت (صَحَّ) سەلەمی تێدا دروست دەبێ (إِنِ اعْتِيدَ نَقْلُهُ لِلْبَيْعِ) ئەگەر عادەت بێ ئەو جۆرە شتە بۆ فرۆشتن بهێندرێتە شوێنی تەسلیمکردن (وَإِلَّا) بەلام ئەگەر عادەت نەبو-بۆ فرۆشتن- بهێندرێ (فَلاَ) سەلەمی تێدا دروست نابێ، چونکە توانای بە سەردا نیە.
(وَلَوْ أَسْلَمَ فِيما يَعُمُّ) ئەگەر سەلەمی لە شتێکی وەهادا کرد: کە لە گشتی ئەو شوێنەدا هەبو، بەلام (فَانْقَطَعَ فِي مَحِلِّهِ) کە کاتی تەسلیمکردنی هات، شتەکە بڕاوەو نەما (لَمْ يَنْفَسِخْ) سەلەمەکە هەڵناوەشێتەوە، هەرچەند نەمانیشی بە هۆی کەمتەرخەمیو دواخستنی سەلەم لەگەڵکراوەکەش بێ: وەك لە کاتی دیارکراودا تەسلیمی نەکردبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (فَيَتَخَيَّرُ الْمُسْلِمُ ) جا لەو حاڵەتەدا سەلەمدەرەکە سەرپشکە: (بَيْنَ فَسْخِهِ) لە نێوان هەڵوەشاندنەوەی سەلەمەکە، سەرمایەکەشی وەربگرێتەوە (وَالصَّبْرِ حَتَّى يُوجَدَ) یان خۆی ڕابگرێو چاوەڕوان بکا تا شتەکە دەست دەکەوێ.
بەلام (وَلَوْ عَلِمَ قَبْلَ الْمَحِلِّ) ئەگەر پێش هاتنی کاتیتەسلیمکردن، سەلەمدەرەکە زانی (انْقِطاعَهُ عِنْدَهُ) لە کاتی واجببوونیتەسلیمکردندا ئەو سەلەم تێداکراوە دەبڕێتەوە، ئەوە

فَلاَ خيارَ قَبْلَهُ فِي الأَصَحِّ، وَكَوْنُهُ مَعْلُومَ الْقَدْرِ كَيْلاً أَوْ وَزْناً أَوْ عَدّاً أَوْ ذَرْعاً، وَيَصِحُّ الْمَكِيلُ وَزْناً وَعَكْسَهُ، وَلَوْ أَسْلَمَ فِي مِأَةِ صاعِ حِنْطَةٍ عَلَى أَنَّ وَزْنَها كَذا لَمْ يَصِحَّ، وَيُشْتَرَطُ الْوَزْنُ فِي الْبِطِّيخِ وَالْباذِنْجانِ وَالْقِثّاءِ وَالسَّفَرْجَلِ وَالرُّمّانِ، وَيَصِحُّ فِي الْجَوْزِ وَاللَّوْزِ بِالْوَزْنِ فِي نَوْعٍ يَقِلُّ اخْتِلافُهُ، وَكَذا كَيْلاً فِي الأَصَحِّ، وَيُجْمَعُ فِي اللَّبِنِ بَيْنَ الْعَدِّ وَالْوَزْنِ، وَلَوْ عَيَّنَ مِكْيالاً فَسَدَ إِنْ لَمْ يَكُنْ مُعْتاداً

---

(فَلا خِيارَ قَبْلَهُ) پێش هاتنی‌کاتەکە مافی پەشیمانی‌ی نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە کاتی واجببوونی‌تەسلیمکردندا سەلەم تێداکراوەکە بە پارەیەکی گران دەست دەکەوت، ئەو کاتە واجبە وەدەستی بێنێ، هەرچەندە بە زیاتر لە نرخی وێنەی خۆیشی بیکڕێ، هەروەك لە (تحفة)دا–بە پێچەوانەی (نهایة)و(مغنی)– فەرموویەتی.

مەرجی‌شەشەم: (وكَوْنُهُ مَعْلُومَ الْقَدْرِ) بە مەرج دانراوە: سەلەم تێداکراوەکە ئەندازەی زانراو بێ: (كَيْلاً) بە پێوانە (أَوْ وَزْناً) یان بە کێشانە (أَوْ عَدّاً) یان بە ژمارە (أَوْ ذَرْعاً) یان بە گەز، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو، واتە: ژمارەو گەز قیاس کراونەتە سەر پێوانەو کێشان (وَيَصِحُّ الْمَكِيلُ وَزْناً) دروستە شتی بە پێوانە بە کێشان سەلەمی تێدا بکرێ، هەم (وَعَكْسَهُ) بە پێچەوانەوەش دروستە (وَلَوْ أَسْلَمَ فِي مِأَةِ صاعِ حِنْطَةٍ) ئەگەر سەلەمی لە سەد ساعی گەنمدا کرد (عَلَى أَنَّ وَزْنَها كَذا) کە کێشەکەی ئەوەندە بێ (لَمْ يَصِحَّ) ئەو جۆرە سەلەمە دروست نابێ، چونکە کەم دەست دەکەوێ.

(وَيُشْتَرَطُ الْوَزْنُ) کێشان بە مەرج دادەنرێ: (فِي الْبِطِّيخِ) لە گندۆرە–کاڵەکو لە شفتیو (وَالْباذِنْجانِ) لە باینجانو (وَالْقِثّاءِ) لە خەیارو تەرۆزیو (وَالسَّفَرْجَلِ) لە بەهێو (وَالرُّمّانِ) لە هەنارو ئەو جۆرە شتانەی لە بەر قەبارەیان بە پێوانە ناگونجێو لە بەر جیاوازیش بە ژماردن ناگونجێ (وَيَصِحُّ فِي الْجَوْزِ وَاللَّوْزِ بِالْوَزْنِ) سەلەم لە گوێزو چوالەدا بە کێشان دروستە (فِي نَوْعٍ يَقِلُّ اخْتِلافُهُ) لە جۆرێکی وەهادا: کە جیاوازی‌ی کەم بێ (وَكَذا كَيْلاً) هەروەها بە پێوانەش تێیاندا دروستە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترردا.

هەروەها لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا بە ژماردنیش لە گوێزو هێلکەدا دروستە، هەروەك لە (الهداية)دا فەرموویەتی. (وَيُجْمَعُ فِي اللَّبِنِ) لە سەلەمی خشتدا دەبی کۆ بکرێتەوە (بَيْنَ الْعَدِّ وَالْوَزْنِ) لە نێوان ژماردنو کێشاندا.

(وَلَوْ عَيَّنَ مِكْيالاً) ئەگەر–تەنها– یەك ڕبە، یان یەك گەز، یان یەك تەرازووی دیاری کرد (فَسَدَ) سەلەمەکە بەتاڵ دەبێتەوە (إِنْ لَمْ يَكُنْ مُعْتاداً) ئەگەر هەر یەك لەو دیارکراوانەی ڕابردوو عادەت نەبن، چونکە وا دەبێ لە پێش هاتنی کاتی تەسلیمکردن ئەو دیارکراوانە

وَإلاّ فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ أَسْلَمَ فِي ثَمَرِ قَرْيَةٍ صَغِيرَةٍ لَمْ يَصِحَّ، أَوْ عَظِيمَةٍ صَحَّ فِي الأَصَحِّ، وَمَعْرِفَةُ الأَوْصَافِ الَّتِي يَخْتَلِفُ بِهَا الْغَرَضُ اخْتِلاَفاً ظَاهِراً، وَذِكْرُهَا فِي الْعَقْدِ عَلَى وَجْهٍ لاَ يُؤَدِّي إِلَى عِزَّةِ الْوُجُودِ، فَلاَ يَصِحُّ فِيمَا لاَ يَنْضَبِطُ مَقْصُودُهُ كَالْمُخْتَلِطِ الْمَقْصُودِ الأَرْكَانِ كَهَرِيسَةٍ وَمَعْجُونٍ وَغَالِيَةٍ وَخُفٍّ وَتِرْيَاقٍ مَخْلُوطٍ، وَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ فِي الْمُخْتَلِطِ الْمُنْضَبِطِ كَعَتَّابِيٍّ وَخَزٍّ وَجُبْنٍ وَأَقِطٍ وَشَهْدٍ وَخَلِّ تَمْرٍ أَوْ زَبِيبٍ،

---

نامێنن‌و کێشە ڕوو دەدا (وَإلا) بەڵام ئەگەر عادەت بون‌و ئەندازەکەیان دەزانـدرا (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) سەلەمەکە بەتاڵ نابێتەوە لە فەرمووده‌ی ڕاستتردا.

(وَلَوْ أَسْلَمَ فِي ثَمَرِ قَرْيَةٍ صَغِيرَةٍ) ئەگەر سەلەمی کرد لە میوەی گوندێکی‌بچووکدا (لَمْ يَصِحَّ) سەلەمەکە دروست نابێ، چونکە وا دەبێ میوەکەی لـە بەر کەمی دەبڕێتـەوەو نامێنـێ (أَوْ عَظِيمَةٍ) یان لە میوەی گوندێکی‌گەورەدا سەلەمی کرد (صَحَّ) ئـەو کاتـە دروسـت دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە مەترسی بڕانەوەی نیە.

مەرجی‌حەفتەم: (وَمَعْرِفَةُ الأَوْصَافِ الَّتِي) ناسـینی ئـەو جـۆرە سـیفەتانەی-سـەلەم تێداکراوەکە- کە (يَخْتَلِفُ بِهَا الْغَرَضُ) مەبەستیان پێ دەگۆڕێ (اِخْتِلاَفاً ظَاهِراً) گۆڕانێکی بە ئاشکرا (وَذِكْرُهَا فِي الْعَقْدِ) هەم مەرجە ئەو سیفەتانە لـە مامڵـەت بەستنەکەدا بگوترێن (عَلَى وَجْهٍ لاَ يُؤَدِّي إِلَى عِزَّةِ الْوُجُودِ) بـە جـۆرێکی وەهـا: نەبێتـە هـۆی کـەم دەستکەوتنی سەلەم تێداکراوەکە:

کـەوابو: (فَـلاَ يَصِـحُّ) سـەلەم دروسـت نیـە (فِيمَا لاَ يَنْضَبِطُ مَقْصُودُهُ) لـەو جـۆرە شـتەی مەبەستەکەی بـە ڕێکـی دیـار نابێ (كَـالْمُخْتَلِطِ) وەك ئـەو جـۆرە شـتەی لـە چـەند بەشـێك تێکەڵـەو (الْمَقْصُودِ الأَرْكَانِ) بەشـەکانیش هـەموو مەبەسـتن (كَهَرِيسَـةٍ) وەك هەریسـەو (وَمَعْجُونٍ) شـێلدراوی تێکـەڵ لـە شـەکرو شتی‌تر (وَغَالِيَـةٍ) بـۆنی تێکـەڵ لـە چـەند بۆنێك‌و (وَخُفٍّ) خوففەو پێڵاوی دروستکراو بە پشـت‌و ناواخنـەو (وَتِرْيَاقٍ مَخْلُوطٍ) دەرمـانی تێکـەڵ لە چەند دەرمانێك.

(وَالأَصَحُّ) بە فـەرموودەی ڕاسـتتر (صِحَّتُهُ) سـەلەم دروسـتە (فِي الْمُخْتَلِطِ الْمُنْضَبِطِ) لـەو تێکەڵەی بەشەکانی بە ڕێکی دەزانـدرێن‌و بەشەکانیشی هـەموو مەبەسـتن (كَعَتَّـابِيٍّ) وەك ئەو جلەی لە ئاوریشم‌و لۆکە دروست دەکرێ‌و (وَخَزٍّ) هەم ئەو جلەی لـە ئاوریشم‌و خـوری دروست دەکرێ، چونکە بـە ئاسـانی بەشـەکانی دەزانـدرێ (وَ) هـەروەها لـەو تێکەڵەشدا دروسـتە: کـە بـە تـەنها بەشـێکی مەبەسـتەو بەشەکانی‌تریشـی بـۆ چاککردنی ئـەو بەشـە تێکەڵ کراون: وەك (جُبْنٍ) پەنیر (وَأَقِطٍ) کەشـك (وَشَهْدٍ) شانەی هـەنگوین (وَخَلِّ تَمْرٍ أَوْ زَبِيبٍ) سرکەی قەسپ، یان مێوژ، کە بە تێکەڵکردنی‌ئاو دروست دەکرێ.

لاَالْخُبْزِ فِي الأَصَحِّ عِنْدَ الأَكْثَرِينَ، وَلاَ يَصِحُّ فِيمَا يَنْدُرُ وُجُودُهُ كَلَحْمِ الصَّيْدِ بِمَوْضِعِ الْعِزَّةِ، وَلاَ فِيما لَوِ اسْتَقْصَي وَصْفُهُ عَزَّ وُجُودُهُ كَاللُّؤْلُؤِ الْكِبارِ وَالْيَواقِيت، وَجارِيَةٍ وَأُخْتِها أَوْ وَلَدِها.

(فَرْعٌ) يَصِحُّ فِي الْحَيَوَان، فَيُشْتَرَطُ فِي الرَّقِيقِ ذِكْرُ نَوْعِه كَتُرْكِيٍّ، وَلَوْنِه كَأَبْيَضَ وَيَصِفُ بَياضَهُ بِسُمْرَةٍ أَوْ شُقْرَةٍ، وَذُكُورَتِه وَأُنُوثَتِه، وَسِنِّه، وَقَدِّه طُولاً وَقِصَراً، وَكُلُّهُ عَلَى التَّقْرِيب، وَلاَ يُشْتَرَطُ ذِكْرُ الْكَحَلِ وَالسِّمَنِ وَنَحْوِهِما فِي الأَصَحِّ،

---

(لاَالْخُبْزِ) بەلام سەلەم لە ناندا دروست نیە (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (عِنْدَ الأَكْثَرِينَ) لە لای زۆرترینی زانایانی ئایینی.

بەلام لە فەرموودەیەکی‌تردا-کە (إمام الحرمين)و چەند زانایەکی‌تر بە ڕاستیان داناوە-: سەلەم لە ناندا دروستە، چونکە ئەندازەی کارتێکردنی ئاگرەکەی دیارەو خوێیەکەشی بۆ چاککردنەو مەبەست نیە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَلاَ يَصِحُّ) سەلەم دروست نیە (فِيما يَنْدُرُ وُجُودُهُ) لەو جۆرە شتەی کەم دەست دەکەوێ (كَلَحْمِ الصَّيْدِ) وەك گۆشتی نێچیر (بِمَوْضِعِ الْعِزَّةِ) لە شوێنێکی وەهادا: کە کەم دەست بکەوێ (وَلاَ فِيما) هەم لەو شتەشدا دروست نیە: کە (لَوْ اسْتُقْصِيَ وَصْفُهُ) ئەگەر هەموو سیفەتەکانی بگوترێن (عَزَّ وُجُودُهُ) کەم دەست بکەوێ (كَاللُّؤْلُؤِالْكِبارِ) وەك لوئلوئی گەورەو (وَالْيَواقِيتِ) یاقوت، هەم (وَجارِيَةٍ وَأُخْتِها) جاریەکو خوشکەکەی (أَوْ وَلَدِها) یان منداڵەکەی وێکڕا، یان مەڕو بەرخەکەی، چونکە کەم وێکڕا کۆ دەبنەوە.

﴿ فَرْعٌ: لقێك لە باسی سەلەمی ئاژەڵو خواردەمەنی ﴾

(يَصِحُّ فِي‌الْحَيَوَانِ) سەلەم لە ئاژەڵدا دروستە، ئەگەر بە مەرجی ئاوسی نەبێ (فَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەنرێ (فِي‌الرَّقِيقِ) لە کۆیلەی سەلەم تێداکراودا (ذِكْرُ نَوْعِهِ) باسی جۆرەکەی بکرێ (كَتُرْكِيٍّ) وەك بڵێ کۆیلەکە تورکی بێ (وَلَوْنِهِ كَأَبْيَضَ) باسی ڕەنگی بکا، وەك بڵێ: سپی بێ (وَيَصِفُ بَياضَهُ) وەسفی سپیاییەکەشی بکا: (بِسُمْرَةٍ) ئەسمەر بێ (أَوْ شُقْرَةٍ) یان لە نێوان زەردو سوری بێ (وَذُكُورَتِهِ وَأُنُوثَتِهِ) باسی نێرو مێیایەتیشی بکا (وَسِنِّهِ) باسی تەمەنیشی بکا (وَقَدِّهِ طُولاً وَقِصَراً) باسی بالایەکەیشی بکا: درێژ بێ، یان کورت بێ (وَكُلُّهُ عَلَى‌التَّقْرِيبِ) گشت سیفەتو تەمەنو بالایەکەی لە سەر نزیکی بێ.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) مەرج نیە (ذِكْرُالْكَحَلِ) باسی چاو ڕەشی بکاو (وَالسِّمَنِ) باسی قەڵەوی بکا (وَنَحْوِهِما) ئەوەی وەك ئەو دووانە بێ: وەك چاو گەورەیی‌و مل ئەستوری (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَفِي الإِبِلِ وَالْخَيْلِ وَالْبِغالِ وَالْحَميرِ: اَلـذُّكُورَةُ وَالأُنُوثَـةُ وَالسِّـنُّ وَاللَّـوْنُ وَالنَّـوْعُ، وَفِي الطَّيْرِ: اَلنَّوْعُ وَالصِّغَرُ وَكِبَرُ الْجُثَّةِ، وَفِي اللَّحْمِ: لَحْمُ بَقَرٍ أَوْ ضَأْنٍ أَوْ مَعْزٍ ذَكَرٍ خَصِـيٍّ رَضِيعٍ مَعْلُوفٍ أَوْ ضِدِّها، مِنْ فَخِذٍ أَوْ كَتِفٍ أَوْ جَنْبٍ، وَيُقْبَلُ عَظْمُهُ عَلَى الْعـادَةِ، وَفِـي الثِّيابِ: اَلْجِنْسُ وَالطُّولُ وَالْعَرْضُ وَالْغِلَظُ وَالدِّقَّةُ وَالصَّفاقَةُ وَالرِّقَّةُ وَالنُّعُومَةُ وَالْخُشُـونَةُ، وَمُطْلَقُهُ يُحْمَلُ عَلَى الْخامِ، وَيَجُوزُ فِي الْمَقْصُورِ وَماصُبِغَ غَزْلُهُ قَبْـلَ النَّسْـجِ كَـالْبُرُودِ، وَالأَقْيَسُ صِحَّتُهُ فِي الْمَصْبُوغِ بَعْدَهُ، قُلْتُ: الأَصَحُّ مَنْعُهُ وَبِهِ قَطَعَ الْجُمْهُورُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(وَفِي الإِبِلِ وَالْخَيْلِ وَالْبِغالِ وَالْحَميرِ) لە سەلەمی ووشترو ئەسپو هێسترو کەردا، مەرجە: (اَلذُّكُورَةُ وَالأُنُوثَةُ) نێرو مێیایەتی بگوترێ (وَالسِّنُّ) تەمەنو (وَاللَّوْنُ) ڕەنگو (وَالنَّوْعُ) جۆری بگوترێ (وَفِي الطَّيْرِ) لە باڵندەشدا مەرجە: (اَلنَّوْعُ) جۆری بگوترێ (وَالصِّغَرُ وَكِبَرُ الْجُثَّةِ) بچووکیو گەورەیی لاشەی بگوترێ.

(وَفِي اللَّحْمِ) لە سەلەمیگۆشتدا مەرجە: (لَحْمُ بَقَرٍ) بڵێ: گۆشتی ڕەشە وولاغە (أَوْ ضَأْنٍ) یان مەڕە (أَوْ مَعْزٍ) یان بزنە (ذَكَرٍ) نێرە (خَصِيٍّ) خەسێندراوە (رَضِيعٍ) شیرخۆرە (مَعْلُوفٍ) ئەلفی دراوەتێ (أَوْ ضِدِّها) یان دژی ئەوانەیڕابردوو (مِنْ فَخِذٍ) گۆشتی ڕانە (أَوْ كَتِفٍ) یان گۆشتی شانە (أَوْ جَنْبٍ) یان گۆشتی تەنیشتە (وَيُقْبَلُ عَظْمُهُ عَلَى الْعادَةِ) واجبە: ئێسقانەکانیشی لەگەڵ گۆشتەکە وەربگیرێ، بە گوێرەی عادەتیگۆشت فرۆشتن: وەك ناوکیخورما لەگەڵ خورما.

(وَفِي الثِّيابِ) لە سەلەمیجلوبەرگدا، مەرجە: (اَلْجِنْسُ) ڕەگەزەکەی بگوترێ: لۆکەیە، یان خورییە، هەروەها جۆرو شوێنی لێدروستکردنیشی بگوترێ (وَالطُّولُ وَالْعَرْضُ) درێژیو پانیی بگوترێ (وَالْغِلَظُ وَالدِّقَّةُ) ئەستوریو باریکیی داوەکەی بگوترێو (وَالصَّفاقَةُ وَالرِّقَّةُ) پڕیو تەنکیی چنینی بگوترێو (وَالنُّعُومَةُ وَالْخُشُونَةُ) نەرمیو زبریی بگوترێ (وَمُطْلَقُهُ) سەلەم لەم قوماشەدا کە باسی هیچی تێدا نەکرابێ (يُحْمَلُ عَلَى الْخامِ) واتەی دەهێندرێتە سەر ئەو قوماشەی نەکراوەتە جلوبەرگ.

(وَيَجُوزُ) سەلەم دروستە (فِي الْمَقْصُورِ) لە جلوبەرگی گازرکراو-شۆردراودا (وَما صُبِغَ غَزْلُهُ قَبْلَ النَّسْجِ) هەم لەو جۆرەشدا دروستە: کە پێش چنین داوەکەی ڕەنگ کرابێ (كَالْبُرُودِ) وەك پەشتەماڵەکانو بەرماڵەکان (وَالأَقْيَسُ صِحَّتُهُ فِي الْمَصْبُوغِ بَعْدَهُ) قیاس ئەوهایە لەو جۆرەشدا دروست بێ: کە دوای چنین ڕەنگ کرابێ (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: (الأَصَحُّ) فەرموودەیڕاستتر (مَنْعُهُ) سەلەمی ڕەنگکراوی دوای چنین دروست نیە (وَبِهِ قَطَعَ الْجُمْهُورُ) هەر بەو دروستنەبوونەش کۆمەڵە زۆرەکەی زانایان براندویەتیانەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ)، جا مەبەستیش ئەو جۆرە ڕەنگەیە: کە لاشەی هەبێو کونەکانی نێوان داوەکانی جلەکە

وَفِي التَّمْرِ: لَوْنُهُ وَنَوْعُهُ وَبَلَدُهُ وَصِغَرُ الْحَبَّاتِ وَكِبَرُهَا وَعِتْقُهُ وَحَدَاثَتُهُ، وَالْحِنْطَةُ وَسَائِرُ الْحُبُوبِ كَالتَّمْرِ، وَفِي الْعَسَلِ: جَبَلِيٌّ أَوْ بَلَدِيٌّ صَيْفِيٌّ أَوْ خَرِيفِيٌّ أَبْيَضُ أَوْ أَصْفَرُ، وَلاَ يُشْتَرَطُ الْعِتْقُ وَالْحَدَاثَةُ، وَلاَ يَصِحُّ فِي الْمَطْبُوخِ وَالْمَشْوِيِّ، وَلاَ يَضُرُّ تَأْثِيرُ الشَّمْسِ، وَالأَظْهَرُ مَنْعُهُ فِي رُؤُوسِ الْحَيَوَانِ، وَلاَيَصِحُّ فِي مُخْتَلِفٍ: كَبُرْمَةٍ مَعْمُولَةٍ وَجِلْدٍ وَكُوزٍ وَطَسٍّ وَقُمْقُمٍ وَمَنَارَةٍ وَطِنْجِيرٍ وَنَحْوِهَا،

---

بگرێ، بەڵام ئەگەر تەنها ڕەنگ بۆ لاشەی نەبێ، ئەو کاتە دروستە، هەروەك لە (القليوبي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِي التَّمْرِ) لە سەلەمی قەسپدا مەرجە: (لَوْنُهُ) ڕەنگەکەی بگۆترێو (وَنَوْعُهُ) جۆرەکەی بگۆترێ (وَبَلَدُهُ) شوێنەکەشی بگۆترێو (وَصِغَرُ الْحَبَّاتِ وَكِبَرُهَا) گەورەیی‌و بچوکیی دەنکەکانی بگۆترێو (وَعِتْقُهُ وَحَدَاثَتُهُ) کۆنی‌و نوێیی بگۆترێ (وَالْحِنْطَةُ وَسَائِرُ الْحُبُوبِ كَالتَّمْرِ) گەنم‌و گشت دانەوێڵەیەکی‌تریش وەکو قەسپ وایە، لە مەرجەکانیڕابردوودا.

(وَفِي الْعَسَلِ) لە سەلەمی‌هەنگویندا مەرجە: (جَبَلِيٌّ أَوْ بَلَدِيٌّ) دیاری بکرێ: کێوییە، یان ئاوەدانی‌یە (صَيْفِيٌّ أَوْ خَرِيفِيٌّ) هاوینی‌یە، یان پاییزی‌یە (أَبْيَضُ أَوْ أَصْفَرُ) سپی‌یە، یان زەردە، بەڵام (وَلاَ يُشْتَرَطُ الْعِتْقُ وَالْحَدَاثَةُ) بە مەرج دانەندراوە: کۆنی‌و نوێیی بگۆترێ، چونکە هەنگوین بە کۆنی ناگۆڕێ.

(وَلاَ يَصِحُّ) سەلەم دروست نیە (فِي الْمَطْبُوخِ) لە شتی‌کوڵاودا (وَالْمَشْوِيِّ) لە شتی‌برژاودا، واتە: لە گشت ئەو شتەی ئەندازەی کارتێکردنی ئاگری دیار نەبێ، بەڵام ئەگەر ئەندازەی کارتێکردنی ئاگرەکەی دیار بوو: وەك شەکرو دۆشاو و گەچ‌و ڕەژوو و ئەو جۆرە شتانە، ئەوە سەلەمی تێدا دروستە، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَلاَ يَضُرُّ تَأْثِيرُ الشَّمْسِ) کارتێکردنی گەرمای ڕۆژ زیانی نیە.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (مَنْعُهُ) سەلەم دروست نیە (فِي رُؤُوسِ الْحَيَوَانِ) لە سەرو پێی ئاژەڵدا، بەڵام لە فەرموودەکەی‌تردا: سەلەم لە سەرو پێی ئاژەڵدا بە کێشان دروستە، بەو مەرجەی لە خوری‌و موەکەی پاك بکرێتەوە، هەروەك لە (نهاية)و(مغنی)دا فەرموویانە.

(وَلاَ يَصِحُّ) سەلەم دروست نیە (فِي مُخْتَلِفٍ) لەو شتەدا کە بەشەکانی لێك جیاواز بێ (كَبُرْمَةٍ مَعْمُولَةٍ) وەك دیزەو کوپەی بە دەست دروست کراین (وَجِلْدٍ) هەم لە پێستەشدا دروست نیەو (وَكُوزٍ) هەم لە گۆزەو (وَطَسٍّ) لە تەشتو (وَقُمْقُمٍ) لە مەسینەو (وَمَنَارَةٍ) لە چرادانەو (وَطِنْجِيرٍ) قاپلەمەو (وَنَحْوِهَا) لە هەر شتێکی وەکو ئەوانیش بەشەکانیان لێك جیا بن، سەلەمی تێدا دروست نابێ.

وَيصِحُ فِىالأَسْطالِ الْمُرَبَّعَةِ وَفِيما صُبَّ مِنْها فِى قَالَبٍ، وَلاَ يُشْتَرَطُ ذِكْرُ الْجَوْدَةِ وَالرَّداءَةِ فِىالأَصَحِّ، وَيُحْمَلُ مُطْلَقُهُ عَلَىالْجَيِّدِ، وَيُشْتَرَطُ مَعْرِفَةُ الْعاقِدَيْنِ الصِّفاتِ، وَكَذَا غَيْرُهُما فِىالأَصَحِّ.

(فَصْلٌ) لاَ يَصِحُّ أَنْ يَسْتَبْدِلَ عَنِ الْمُسْلَمِ فِيهِ غَيْرَ جِنْسِهِ وَنَوْعِهِ، وَقِيلَ يَجُوزُ فِى نَوْعِهِ وَلاَ يَجِبُ قَبُولُهُ،

---

بەلام (وَيَصِحُ) سەلەم دروستە (فِىالأَسْطالِ الْمُرَبَّعَةِ) لە سەتڵەكانی چوارگۆشەداو (وَفِيما صُبَّ مِنْها فِى قَالَبٍ) هەم لە گشت ئەوانەیڕابردووشدا كە لە ناو قالب داڕێژرابن، واتە: بە یەك ئەندازە دروست كرابن، سەلەمیان تێدا دروست دەبێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ لە مەرجیدووەمدا ڕابرا: كە دەبی سەلەم تێداكراوەكە قەرز بێ، جا بە هۆی ئەو مەرجەیە سەلەم لە خواردەمەنیدا دروست نیە ئەگەر سەرمایەكەشی خواردەمەنی بێ، هەرچەند ڕەگەزەكەشیان لێك جیاواز بێ، كەوابو: لە سەلەمی خواردەمەنیدا مەرجە: سەرمایەكەی شتێكیتری جگە لە خواردەمەنی بێ.

هەروەهاش سەلەم لە پارەو زێڕو زیودا دروست نیە، ئەگەر سەرمایەكەشی پارە، یان زێڕ، یان زیو بێ، هەرچەند ڕەگەزیشیان لێك جیاواز بێ، كەوابو: لە سەلەمی ئەوانەشدا مەرجە: سەرمایەكەی شتێكیتری جگە لە زێڕو زیو و پارە بێ، هەروەك لە (المجموع) لە ڕیبادا، لە سەرچاوەكانیتریشدا لێرەدا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) لەو شتەی سەلەمی تێدا دەكرێ، بە مەرج دانانرێ (ذِكْرُ الْجَوْدَةِ وَالرَّداءَةِ) باسی چاكیو خراپی بكرێ (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَيُحْمَلُ مُطْلَقُهُ عَلَى الْجَيِّدِ) جا ئەگەر باسی هیچیان نەكرا، ئەوە واتەی ئەهێندرێتە سەر باشەكەی (وَيُشْتَرَطُ مَعْرِفَةُ الْعاقِدَيْنِ الصِّفاتِ) هەروەها بە مەرج دادەنرێ: هەردوو مامڵەتچیەكان گشت سیفەتەكانی بە مەرج داندراو بناسن (وَكَذَا غَيْرُهُما) هەروەها مەرجە: دوو كەسی دادپەروەر -جگە لەوان- سیفەتەكانی بناسن (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، تاكو لە كاتی كێشەدا بگەڕێنەوە لای ئەو دوو دادپەروەرانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گۆڕینەوەی سەلەم تێداكراو ﴾

(لاَ يَصِحُّ) بەتاڵەو دروست نیە (أَنْ يَسْتَبْدِلَ عَنِ الْمُسْلَمِ فِيهِ) سەلەم تێداكراوەكە بگۆڕێتەوەو شتێكیتری لە جیاتی وەربگرێ: كە (غَيْرَ جِنْسِهِ) شتەكە ڕەگەزی سەلەم تێداكراوەكە نەبێ: وەك گەنم لە جیاتی جۆ (وَنَوْعِهِ) یان جۆری سەلەم تێداكراوەكە نەبێ: وەك گەنمی قەندەهاری لە جیاتی ڕەشكۆڵ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (يَجُوزُ فِى نَوْعِهِ) گۆڕین لە جۆرێكی سەلەم تێداكراودا دروستە، بەلام (وَلاَ يَجِبُ قَبُولُهُ) واجب نیە:

وَيَجُوزُ أَرْدَأَ مِنَ الْمَشْرُوطِ وَلاَ يَجِبُ، وَيَجُوزُ أَجْوَدَ وَيَجِبُ قَبُولُـهُ فِي الأَصَـحِّ، وَلَـوْ أَحْضَرَهُ قَبْلَ مَحِلِّهِ فَامْتَنَعَ الْمُسْلِمُ مِنْ قَبُولِهِ لِغَرَضٍ صَحِيحٍ: بِأَنْ كانَ حَيَوانـاً أَوْ وَقْـتَ غارَةٍ لَمْ يُجْبَرْ، وَإِلاَّ: فَإِنْ كانَ لِلْمُؤَدِّي غَرَضٌ صَحِيحٌ كَفَكِّ رَهْنٍ أُجْبِرَ، وَكَذَا لِمُجَـرَّدِ غَرَضِ الْبَراءَةِ فِي الأَظْهَرِ،

---

سەلەمدەرەکە قبوڵی بکا، هەروەها (وَيَجُوزُ أَرْدَأَ مِنَ الْمَشْرُوطِ) دروستە جۆرێکی سەلەم تێداکراوی خراپتر بدا، بەڵام (وَلاَ يَجِبُ) واجب نیە: سەلەمدەرەکە قبوڵی بکا، چونکە لە ماڵی خۆی کەمترە، هەروەها (وَيَجُوزُ أَجْوَدَ) دروستە جۆرێکی سەلەم تێداکراوی چاکتر بدلو (وَيَجِبُ قَبُولُـهُ) واجبە: سەلەمدەرەکەش قبوڵی بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە منەتێکی وای تێدا نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر بیەوێ سەلەم تێداکراوەکە بگۆڕێتەوەو گوناهباریش نەبێ، ڕێگای شەرعی ئەمەیە: هەردووکیان مامڵەتی سەلەم هەڵبوەشێننەوە، ئینجا سەلەمدەرەکە- لە جیاتی سەرمایەکەی- شتەکە لە سەلەم لەگەڵکراوەکە وەربگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَحْضَرَهُ) ئەگەر سەلەم لەگەڵکراوەکە سەلەم تێداکراوەکەی بۆ سەلەمدەرەکە هێنا (قَبْلَ مَحِلِّهِ) پێش ئەوەی کاتی تەسلیمکردنی هاتبێ (فَامْتَنَعَ الْمُسْلِمُ مِنْ قَبُولِهِ) سەلەمدەرەکەش قبوڵی نەکردو لێی وەرنەگرت (لِغَرَضٍ صَحِيحٍ) چونکە لەو قبوڵنەکردنەدا مەبەستێکی دروستی هەبو (بِأَنْ كانَ حَيَواناً) وەك سەلەم تێداکراوەکە ئاژەڵ بێو ئەرکی بەخێوکردنی بوێ (أَوْ وَقْتَ غارَةٍ) یان کاتی تالانو ڕاوڕوت بوو، لەو حاڵەتانەدا (لَمْ يُجْبَرْ) زۆری لێناکرێ تا قبوڵی بکا، چونکە زیانی دەگاتێ.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر سەلەمدەرەکە لەو قبوڵنەکردنەدا هیچ مەبەستێکی دروستی نەبو، تەماشا دەکرێ: (فَإِنْ كانَ لِلْمُؤَدِّي غَرَضٌ صَحِيحٌ) ئەگەر سەلەم لەگەڵکراوەکە-لەو هێنانە- مەبەستێکی دروستی هەبو (كَفَكِّ رَهْنٍ) وەك بەرهەڵدانی ماڵێکی ڕەهنکراو، یان زامینێك، یان مەترسی بڕانی ئەو ڕەگەزەی هەبێ لە کاتیخۆیدا، لەو حاڵەتانەدا (أُجْبِرَ) سەلەمدەرەکە زۆری لێدەکرێ تا قبوڵی بکا.

(وَكَذَا) هەروەها سەلەمدەرەکە زۆری لێدەکرێ تا قبوڵی بکا (لِمُجَرَّدِ غَرَضِ الْبَراءَةِ) ئەگەر مەبەستی سەلەم لەگەڵکراوەکە تەنها ئەوە بێ: ماڵی سەلەمدەرەکەی لە ئەستۆدا نەمێنێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

هەروەهاش خاوەن قەرز ناچار دەکرێ گشت ئەو جۆرە قەرزانە وەربگرێتەوە: کە کاتی دانەوەیان هاتوە، هەروەك لە پاشکۆیقەرزدا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تعالَى.

وَلَوْ وَجَدَ الْمُسْلِمُ اَلْمُسْلَمَ إِلَيْهِ بَعْدَالْمَحلِّ فِي غَيْرِمَحَلِّ التَّسْلِيمِ لَمْ يَلْزَمْهُ الأداءُ إِنْ كانَ لِنَقْلِهِ مُؤْنَةٌ، وَلاَ يُطالِبُهُ بقيمَتِه للْحَيْلُولَةِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَإِن امْتَنَعَ مِنْ قَبُولِهِ هُناكَ لَمْ يُجْبَرْ إِنْ كانَ لِنَقْلِهِ مُؤْنَةٌ، أَوْ كانَ الْمَوْضِعُ مَخُوفاً، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ إِجْبارُهُ.
(فَصْلٌ) اَلإِقْراضُ مَنْدُوبٌ،

---

(وَلَوْ وَجَدَ الْمُسْلِمُ الْمُسْلَمَ إِلَيْهِ) ئەگەر سەلەمدەرەکە سەلەم لەگەڵکراوەکەی دیت (بَعْدَ الْمَحلِّ) پاش هاتنی کاتی تەسلیمکردن (فِي غَيْرِ مَحَلِّ التَّسْلِيمِ) لە شوێنێکیتری جگە لە شوێنی تەسلیمکردن (لَمْ يَلْزَمْهُ الأداءُ) سەلەم لەگەڵکراوەکە لە سەری واجب نیە: لەو شوێنەدا سەلەم تێداکراوەکەی بداتێ (إِنْ كانَ لِنَقْلِهِ مُؤْنَةٌ) ئەگەر گواستنەوەی سەلەم تێداکراوەکە-لە شوێنیتەسلیمکردن بۆ ئەو شوێنە- مەسرەفی بوێو سەلەمدەرەکەش نەیدا، بەڵام ئەگەر سەلەمدەرەکە مەسرەفی گواستنەوەی بدا، یان مەسرەفی نەدەویا، ئەو کاتە لە سەری واجبە: لەو شوێنە تەسلیمی بکا، چونکە هیچ زیانی ناگاتێ.
جا هەر لەم مەسەلەیەدا: (وَلاَ يُطالِبُهُ بِقِيمَتِهِ) سەلەمدەرەکە مافی نیە داوای نرخی سەلەم تێداکراوەکە لە سەلەم لەگەڵکراوەکە بکا (لِلْحَيْلُولَةِ) بە هۆی ئەوەی-لە کاتیخۆیدا-ماڵەکەی تەسلیم نەکردوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە گۆڕینەوەی سەلەم تێداکراو دروست نیە، هەروەك ڕابرا.
دیسان هەر لەو مەسەلەیەدا (وَإِنْ) ئەگەر سەلەم لەگەڵکراوەکە سەلەم تێداکراوەکەی هێنا شوێنێکیتری جگە لە شوێنی تەسلیمکردن، بەڵام (امْتَنَعَ مِنْ قَبُولِهِ هُناكَ) سەلەمدەرەکە لەو شوێنەدا قبوڵی نەکردو لێی وەرنەگرت، ئەوە (لَمْ يُجْبَرْ) زۆری لێناکرێ تا وەری بگرێ (إِنْ كانَ لِنَقْلِهِ مُؤْنَةٌ) ئەگەر گواستنەوەی لەو شوێنەوە-بۆ شوێنی تەسلیمکردن- مەسرەفی بوێو سەلەم لەگەڵکراوەکەش بۆی نەیگوازێتەوە (أَوْ كانَ الْمَوْضِعُ مَخُوفاً) یان ئەگەر شوێنەکە، یان ڕێگایەکە بە ترس بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر مەسرەفی گواستنەوەی نەدەویاو ڕێگەو شوێنەکەش بە ترس نەبو، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ إِجْبارُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: سەلەمدەرەکە زۆری لێدەکرێ تا وەریبگرێو ئەو قەرزە لە ئەستۆی سەلەم لەگەڵکراوەکە لابچێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی قەرزدان ﴾

واتە: شتێك بە ملکایەتی بداتە کەسێك، تاکو ئەویش وێنەی شتەکەی لەجیاتی بداتەوە.
(اَلإِقْراضُ) قەرزدان (مَنْدُوبٌ) سوننەتەو قەرزدەرەکە خێری دەگاتێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَافْعَلُوا الْخَيْرَ﴾ کاری چاکە بکەن. هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ أَخِيهِ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيا نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيامَةِ، وَاللهُ فِي عَوْنِ

وَصِيغَتُهُ أَقْرَضْتُكَ أَوْ أَسْلَفْتُكَ، أَوْ خُذْهُ بِمِثْلِهِ، أَوْ مَلَّكْتُكَهُ عَلَى أَنْ تَرُدَّ بَدَلَـهُ، وَيُشْـتَرَطُ قَبُولُهُ فِي الأَصَحِّ، وَفِي الْمُقْرِضِ أَهْلِيَةُ التَّبَرُّعِ،

---

الْعَبْدِ مَادامَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك تەنگانەیەکی دونیا لە سەر برای خۆی لاببا، خوای گەورە تەنگانەیەکی قیامەتی لە سەر لادەبا، خوای گەورە بەردەوام لە یارمەتیدانی بەندەی خۆیدایە هەتا بەندە لە یارمەتیدانی برای خۆیدا بێ. واتە: قەرز وەرگرەکە تووشی تەنگانەو پێویستی بووە، بۆیێ داوای قەرز دەکا.

ئینجا بزانە: ئەگەر قەرزوەرگرەکە ناچار بوو بۆ قەرزکردن، ئەو کاتە قەرزدانەکە واجبە، بەڵام ئەگەر بزانێ: قەرزەکە لە حەرام بە کار دێنێ، ئەو کاتە قەرزدانەکە حەرامە، ئینجا ئەگەر قەرزوەرگرەکە ناچار نەبو و ئومێدی توانینی قەرزدانەوەشی نەبو، ئەو کاتە قەرز وەرگرتن حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَعْظَمَ الذُّنُوبِ عِنْدَاللهِ أَنْ يَلْقاهُ بِها عَبْدٌ بَعْدَالْكَبائِرِالَّتِي نَهَىاللهُ عَنْها أَنْ يَمُوتَ رَجُلٌ وَعَلَيْـهِ دَيْنٌ لايَدَعُ لَهُ قَضاءً﴾ رواه أبوداود بسند صالح، بە ڕاستی گەورەترین گوناه لە لای خوای گەورە – لە دوای گوناهە گەورەکان – ئەوەیە بەندە بمرێو قەرزی لە سەر بێ، هیچ لە دوای خۆی بەجێ نەهێڵێ بۆ قەرزدانەوە.

ڕوکنەکانی قەرز چوارن: (اَلْمُقْرِضُ) قەرزدەر. (اَلْمُقْتَرِضُ) قەرزوەرگر–قەرزدار. (اَلْمُقْرَضُ)ماڵە قەرزکراوەکە. (اَلصِّيغَةُ) گوتەی قەرزدان.

ئینجا (وَصِيغَتُهُ) گوتەی قەرزدان: (أَقْرَضْتُكَ أَوْ أَسْلَفْتُكَ) ئەم شتەم بە قەرز دا بە تۆ (أَوْ خُذْهُ بِمِثْلِهِ) یان بیبە بە وێنەی خۆی (أَوْ مَلَّكْتُكَهُ عَلَى أَنْ تَرُدَّ بَدَلَهُ) یان کردمە ملکی تۆ، تاکو وێنەکەیم بدەیتەوە (وَيُشْتَرَطُ قَبُولُهُ) بە مەرج دادەندرێ قەرزوەرگرەکەش قبوڵی بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: چەند زانایەك فەرموویانە: گوتەی قەرزدان مەرج نیە: نە لە لایەن قەرزدەر، نە لە لایەن قەرزوەرگر، واتە: ئەگەر گوتی: ئەو شتەم بە قەرز بدێ. ئەویش شتەکەی دایێ، یان کەسێکی ناردە لای و ئەویش ماڵەکەی بە قەرز بۆ نارد، ئەو قەرزەش دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەروەها ئەگەر نووسراوێکی بۆ بنێرێو ئەویش قەرزەکەی بۆ بنێرێ، ئەوەش دروستە، هەروەك لە (المهذب)دا فەرموویەتی، کەوابو: لە ڕێگای تەلەفۆنو بێتەلیش قەرزکردن دروستە.

(وَفِي الْمُقْرِضِ) لەبارەی قەرزدەرەکەش بە مەرج دادەندرێ (أَهْلِيَةُ التَّبَرُّعِ) بە شەرع شیاوی ماڵبەخشین بێ، واتە: بالغو عاقڵ بێو قەدەغەی دەستکاریماڵی لە سەر نەبێو زۆرلێکراو نەبێ، هەم ماڵە بە قەرزدراوەکەش ملکی خۆی بێ، کەواتە: مندالو شێتو قەدەغەکراو و

وَيَجُوزُ إِقْراضُ ما يُسْلَمُ فيه إلاَّ الْجارِيَةَالَّتي تَحِلُّ لِلْمُقْتَرِضِ فِي الأَظْهَرِ، وَما لاَ يُسْلَمُ فِيهِ لاَ يَجُوزُ إِقْراضُهُ فِي الأَصَحِّ، وَيَرَدُّ الْمِثْلَ فِي الْمِثْلِيِّ، وَفِي الْمُتَقَوِّمِ الْمِثْلَ صُورَةً، وَقِيلَ الْقِيمَةَ،

---

زۆرلێکرلو، هیچیان قەرزدانیان دروست نابێ، هەروەها مەرجە: قەرزوەرگرەکەش بالغو عاقڵ بێو زۆرلێکرلو نەبێ.

(وَ) لە بارەی ماڵە بە قەرزدرلوەکەش (يَجُوزُ إِقْراضُ ما يُسْلَمُ فِيهِ) دروستە بە قەرزدانی هەر شتێکی سەلەمی تێدا دروست بێ ﴿عَنْ أَبِي رافِعٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْراً، ثُمَّ رَدَّ خِياراً رُباعِيّاً وَقالَ: إِنَّ خِيارَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضاءً﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ ووشترێکی پێنج ساڵەی بە قەرز-لە پیاوێك- وەرگرت، ئینجا ووشترێکی شەش ساڵەیباشتری دایەوەو فەرمووی: باشترتان ئەو کەسەیە جوانتر قەرز بداتەوە.

(إلاَّ الْجارِيَةَالَّتي تَحِلُّ لِلْمُقْتَرِضِ) تەنها ئەو (جارية)یە نەبێ کە بۆ قەرزوەرگرەکە حەڵاڵە، ئەو دروست نیە بە قەرز بدرێ، نەوەك جیماعی لەگەڵ بکاو بیگەڕێنێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَما لاَ يُسْلَمُ فِيهِ) هەر شتێك سەلەمی تێدا دروست نەبێ (لاَ يَجُوزُ إِقْراضُهُ) بە قەرزدانیشی دروست نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، بەڵام بە قەرزدانی نان-هەر جۆرێك بێ- دروستە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَرَدُّ الْمِثْلَ فِي الْمِثْلِيِّ) لە کاتی قەرزدانەوەدا، واجبە: وێنەی بە قەرزدراوەکە بدرێتەوە، ئەگەر وێنەی هەبێ، واتە: بە پێوان، یان بە کێشان (وَفِي الْمُتَقَوِّمِ) وەلەو قەرزەش کە وێنەی نیە، بەڵام دەقرسێندرێو نرخی بۆ دادەندرێ (الْمِثْلَ صُورَةً) واجبە: وێنەی شکلی خۆی بدرێتەوە، وەك ووشترەکەی حەدیسی تازە ڕابرا (وَقِيلَ الْقِيمَةَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا نرخەکەی دەدرێتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر پارەیەکی بە قەرز وەرگرت، ئینجا کاربەدەست پارەکەی لەکار خستو ڕەواجی نەما، ئەوە تەماشا دەکا: ئەگەر پارەکە نرخی هەبو، نرخەکەش زۆر کەم نەبو، ئەو کاتە واجبە: وێنەی پارەکە لە قەرز بداتەوە، بەڵام ئەگەر نرخی نەبو، یان نرخی زۆر کەم بوو، ئەو کاتە واجبە: نرخی پارەکە لە قەرز بداتەوە، واتە: نرخی نزیکترین ڕۆژی لەکارکەوتنی لە کاتی دانەوەی قەرزەکە، هەروەك لە حاشیەکانی (القليوبي)و (البجيرمي)دا ڕوون کرلوەتەوە.

دووەم: هەر کەسێك بە بێئیزنیقەرزدارەکە قەرزەکەی بۆ بداتەوە، ئەوە قەرزەکە لە ئەستۆی قەرزدارەکە لادەچێ، بەڵام ئەو کەسە مافی نیە بگەڕێتەوە سەر قەرزدارەکەو وێنەی قەرزەکەی لێوەربگرێتەوە.

وَلَوْ ظَفرَ بِهِ فِيغَيْرِ مَحَلّ الإقْراضِ وَلِلنَّقْلِ مُؤْنَةٌ طَالَبَهُ بِقِيمَةِ بَلَـدِالإقْراضِ، وَلاَ يَجُـوزُ بِشَرْطِ رَدٍّ صَحِيحٍ عَنْ مُكَسَّرٍ أَوْ زِيادَة،

هەروەها ئەگەر یەکێك ماوەی چەند ساڵێك برایخۆیو منداڵەکانی برایەکەی بەخێو کردنو برایەکەشی بێدەنگ بو، ئەویش مافی نیە ئەرکی بەخێوکردنەکە لە برایەکەی وەربگرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ئەو دوو مەسەلەی ڕوون کردونەوە.

سێیەم: قەرزانەی مانگانەو حەفتانە دروستە-کە ناو دەبرێ بە جومعانە -وەك کۆمەڵێك پیاو، یان ئافرەت ڕێك بکەونو یەکێکیان لە هەموو مانگێکدا، یان لە هەموو حەفتەیەکدا ئەندازەیەکی پارە لە گشتیان وەربگرێ، ئینجا کۆی ئەو پارەیە-بە نۆبەت- لە هەر مانگێکدا، یان لە هەر حەفتەیەکدا بداتە یەکێکیان تا کۆتاییان دێ، هەروەك لە (القليوبي)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ ظَفرَ بِهِ) ئەگەر قەرزدەرەکە گەیشتە قەرزدارەکە (فِي غَيْرِ مَحَلُّ الإقْراضِ) لە شوێنێکیتری جگە لە شوێنی قەرزدانەکە (وَلِلنَّقْلِ مُؤْنَةٌ) گواستنەوەی قەرزەکەش-لە شوێنی قەرزدان بۆ ئەو شوێنە- مەسرەفی دەویا (طَالَبَهُ بِقِيمَةِ بَلَدِالإقْراضِ) ئەو کاتە قەرزدەرەکە مافی هەیە داوای نرخی قەرزەکەی لە قەرزدارەکە بکا: بە گوێرەی نرخی شوێنی قەرزدانەکە، نەك نرخی شوێنی بەیەکگەیشتنەکە.

جا ئەگەر-لەو شوێنەدا- نرخی قەرزەکەی لێوەرگرت، ئەوە کێشەکە دەبڕێتەوە، واتە: ئەگەر هەردووکیان گەڕانەوە شوێنی قەرزدان، نە قەرزدەرەکە مافی هەیە داوای قەرزەکەی بکا، نە قەرزدارەکەش مافی هەیە داوای گەڕاندنەوەی نرخەکە بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی ڕیبای قەرز ﴾

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە بە قەرزدانی پارەو شتیتریش (بِشَرْطِ رَدٍّ صَحِيحٍ عَنْ مُكَسَّرٍ) بە مەرجی دانەوەی درشتە لەجیاتی وردە (أَوْ زِيادَةٍ) یان بە مەرجی دانەوەی زیادەیەك لە سەر ئەندازەیخۆی، یان بە مەرجی دانەوەی باش لە جیاتی خراپ، یان بە مەرجی خزمەتی بکا، یان کوڕەکەی فێری خوێندن بکا، یان بە هەر مەرجێکیتر: کە سودێکی قەرزدەرەکەی تێدا بێ، بە بەڵگەی فەرموودەی(صحابة)کانیداهاتوو.

جیاوازی نیە: بەقەرزدراوەکە پارە بێ، یان خواردەمەنی بێ، یان شتێکیتر بێ: وەکو ئاژەڵو بەردو دارو ئاسن، واتە: بەو جۆرە مەرجانەیڕابردوو مامڵەتی قەرزەکە بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێتە ڕیبا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: ئەو پارەیەی بانکی دەوڵەت بە قەرز دەیداتە خەڵکی: بۆ خانوو دروستکردنو پێویستیەکانیتر، بە مەرجی: لە ئەندازەیقەرزەکە زیاتر بدەنەوە بانکەکە، ئەوەش

بێگومان ڕیبایە؟ چونکە لە حەدیسەکەی‌ڕابردوو لە ڕیبادا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿فَمَنْ زادَ أَوْ اسْتَزادَ فَقدْ أَرْبَى، اَلآخِذُ وَالْمُعْطِي فِيهِ سَواءٌ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك زێدە بدا، یان زێدە وەربگرێ، بە ڕاستی ڕیبای کردوە، زێدەوەرگرەکەو زێدەدەرەکە لە تاواندا یەکسانن. هەم ﴿عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ وَأُبَيٍّ بن كَعْبٍ وَعَبْدالله بن سَلامٍ وَابْن عبَّاسٍ﴿: كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ مَنْفَعَةً فَهُوَ رِبا﴾ رواه البيهقي بمعناه، هەر قەرزێك سودێك بۆ قەرزدەرەکە ڕابکێشێ، ئەوە ڕیبایە.

جا بزانە: لە (زادَ، اسْتَزادَ)ی حەدیسەکە وەردەگیرێ: ئەگەر زێدەییەکە کەمیش بێ هەر ڕیبایە، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿دِرْهَمُ رِباً يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ -وَهُوَ يَعْلَمُ- أَشَدُّ مِنْ سِتَّةٍ وَثَلاثِينَ زَنْيَةً﴾ رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح، دیرهەمێکی ڕیبا کە مرۆڤ دەیخوا -بشزانێ ڕیبایە- گوناهی توندترە لە سی‌و شەش زینا.

جا ئەوانەی دەڵێن: (بۆ پێویستیی خانوو دروستکردن ئەو ڕیبایە دروستە).! گوتەکەیان ڕاست نیە؟ چونکە پێویستی وەکو ناچاری نیەو بە هۆی پێویستی وەرگرتنی ڕیبا دروست نیە، مەگەر ئەوان جیاوازی نێوان ناچاری و پێویستی نەکەن!؟:

## ﴿ پێناسەی (ضَرُورَة)و (حاجَة) ﴾

(ضَرُورَة)=ناچاری بە حاڵەتێك ئەگوترێ: ئەگەر حەرامەکە وەرنەگرێ، بە هیلاك بچێ، یان نزیکی بەهیلاکچوون بکا. ئەم ناچاری‌یە -بۆ ناچاربووەکە- وەرگرتنی‌حەرام حەڵاڵ ئەکا.

(حاجَة)=پێویستی‌بە حاڵەتێك ئەگوترێ: ئەگەر حەرامەکە وەرنەگرێ، زۆر ماندوو و بە ئازاری بکا، بەڵام بەهیلاك نەچێ. بەم پێویستی‌یە حەرام حەڵاڵ نابێ، هەروەك (الإمام السيوطي) لە (الأشباه والنظائر)دا پێناسەی کردوە.

(وَلَوْ رَدَّ هَكَذَا) ئەگەر قەرزدارەکە -لەخۆیەوە- زیاتری، یان باشتری دایەوە (بِلاَ شَرْطٍ) بە بێمەرج دانان (فَحَسَنٌ) ئەوە کارێکی جوانەو خێری دەگاتێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿خِيارُكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضاءً﴾ی‌ڕابردوو لە حەدیسی ووشترە بەقەرزدراوەکەدا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بەو مەرجە قەرزەکەی بداتێ: کە لە شوێنێکی‌تر بیداتەوە، ئەوەش مامڵەتی قەرزەکە بەتاڵ دەکاتەوەو دەبێتە ڕیبا، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە ﴿عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَة عَبْدالله بن مَسْعُودٍ رضي الله عنهما: قالَ لِي عاصِمُ بن عَدِيّ: أُعْطِيكَ تَمْراً هَهُنا وَأَتَوَفَّى تَمْرَكَ بِخَيْبَرَ، فَسَأَلْتُ عُمَرَ﴿ عَنْ ذَلِكَ؟ فَنَهاها عَنْهُ وَقالَ: كَيْفَ بِالضَّمانِ فِيما بَيْنَ ذَلِكَ؟﴾ رواه‌النسفي في طِلْبةالطلبة، (عاصم) بە (زینب)ی گوت: من لێرە هەندێك قەسپ بە قەرز دەدەمە تۆ، ئینجا لە خەیبەر قەسپەکەی تۆ وەردەگرمەوە. جا (زینب) ئەو پرسیارەی

وَلَوْ شَرَطَ مُكَسَّراً عَنْ صَحِيحٍ، أَوْ أَنْ يُقْرِضَهُ غَيْرَهُ لَغَاالشَّرْطُ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُفْسِدُالْعَقْدَ، وَلَوْ شَرَطَ أَجَلاً فَهُوَ كَشَرْطِ مُكَسَّرٍ عَنْ صَحِيحٍ إِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْمُقْرِضِ غَرَضٌ، وَإِنْ كانَ كَزَمَنِ نَهْبٍ

---

له ئیمامی(عمر ﷺ) کرد؟ ئەویش لەو قەرزە قەدەغەی کردو فەرمووی: زامینی‌ی گواستنەوەی قەسپەکە لێرەوە بۆ خەیبەر چۆنە؟. واتە: لادانی ئەرکی گواستنەوەکە سودێك بۆ قەرزدەرەکە ڕادەکێشێو دەبێتە ڕیبا.

بەلام له مەزهەبی ئیمام(أحمد)دا: ئەگەر هەلگرتنی قەرزەکە-بۆ ئەو شوێنە- مەسرەفی بوێ، ئەو کاتە دروست نیە، وە ئەگەر مەسرەفی نەوێ، ئەو کاتە بەو مەرجەش دروستە، هەروەك لە (مغني ابن قدامة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ شَرَطَ مُكَسَّراً عَنْ صَحِيحٍ) ئەگەر-بە پێچەوانەی‌ڕابردوو- قەرزدەرەکە بە مەرجی دانا: قەرزوەرگرەکە لە جیاتی درشتە وردەی بداتەوە، یان بە مەرجی دانا (أن يُقْرِضَهُ غَيْرَهُ) جگە لەو شتە شتێکی‌تریش بە قەرز بداتە قەرزوەرگرەکە (لَغَاالشَّرْطُ) ئەو مەرجە پووچەڵ دەبێو جێبەجێ ناکرێ، بەلام (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَيُفْسِدُالْعَقْدَ) ئەو مەرجە مامڵەتی قەرز بەتاڵ ناکاتەوەو قەرزدانەکە دروست دەبێ، چونکە مەرجەکە هیچ سودێك بۆ قەرزدەرەکە ڕاناکێشێ، بەلام ئەگەر بە مەرج دابندرێ، قەرزوەرگرەکەش شتێك بە قەرز بداتە قەرزدەرەکە ئەوە دروست نابێ، چونکە سودی قەرزدەرەکەی تێدایە، هەروەك لە(الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: لە مامڵەتی کڕینو فرۆشتندا دروستە: شتومەك-تا ماوەیەکی‌دیارکرلو-بە پارەیەکی‌قەرز بفرۆشرێ، بەلکو ئەگەر ماوەی‌قەرزەکە نەزاندرێ، فرۆشتنەکەش دروست نابێ، هەروەك لە باسی(پارەی‌فرۆشراوەکە)دا ڕابرا، ئینجا تا ماوەدیارکراوەکە تەولو نەبێ، دروست نیە فرۆشیارەکە داوای قەرزەکەی لە کڕیارەکە بکا، بەلام لە مامڵەتی قەرزدا بە پێچەوانەوەیە، واتە: دروست نیە قەرزدانەکە بۆ ماوەیەکی‌دیارکرلو بێ، کەوابو: بۆ قەرزدەرەکەش دروستە هەموو کاتێك داوای قەرزەکەی لە قەرزدارەکە بکا.

جا لە سەر ئەو بڕیارە: (وَلَوْ شَرَطَ أَجَلاً) ئەگەر قەرزدەرەکە ماوەیەکی بە مەرج دانا، کە لەو ماوەیەدا قەرزەکەی بدرێتەوە (فَهُوَ) ئەو مەرجە (كَشَرْطِ مُكَسَّرٍ عَنْ صَحِيحٍ) وەك مەرجی دانەوەی وردەیە لەجیاتی درشتە، واتە: قەرزدانەکە دروست دەبێ، بەلام مەرجەکە پوچەڵ دەبێو جێبەجێ ناکرێ (إِنْ لَمْ يَكُنْ لِلْمُقْرِضِ غَرَضٌ) بەو مەرجەی قەرزدەرەکە-لەو ماوەدانانەدا- هیچ مەبەستێکی وەهای نەبێ: سودێکی پێ بگا، چونکە (وَإِنْ كانَ) ئەگەر قەرزدەرەکە-لەو ماوەدانانەدا- مەبەستی بوو سودێکی پێ‌بگا (كَزَمَنِ نَهْبٍ) وەك لە کاتی تالانو ڕاوڕوتدا شتێك بە قەرز بدا تا ماوەیەك بە مەبەستی ئەوەی لەو

**فَكَشَرْطِ صَحِيحٍ عَنْ مُكَسَّرٍ فِي الأَصَحِّ، وَلَهُ شَرْطُ رَهْنٍ وَكَفِيلٍ، وَيَمْلِكُ الْقَرْضَ بِالْقَبْضِ، وَفِي قَوْلٍ بِالتَّصَرُّفِ، وَلَهُ الرُّجُوعُ فِي عَيْنِهِ مادامَ باقِياً بحالهِ فِي الأَصَحِّ.**

---

ماوەیەدا شتەكە بپارێزرێ، لەو حاڵەتەدا (فَكَشَرْطِ صَحِيحٍ عَنْ مُكَسَّرٍ) وەك مەرجی دانەوەی دروشتەیە لە جیاتی وردە، واتە: بە هۆی ئەو مەرجە قەرزدانەكە بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێتە ڕیبا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە قەرزەكە سودێك بۆ قەرزدەرەكە ڕادەكێشێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: لەو حاڵەتەی ماوەدانان سودی قەرزدەرەكەی تێدا نیەو قەرزەكەش بەتاڵ نابێتەوە-هەرچەند مەرجەكە پووچەڵە- بەڵام سوننەتە: قەرزدارەكە وەفادار بێو لە ماوەی دیاركراودا قەرزەكەی بداتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەروەها لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا: ماوەدانان لە قەرزدانیشدا دروستەو جێگیر دەبێ، واتە: جێبەجێ دەكرێ، هەروەك لە حاشیەی(القلیوبی)و(عمیرة)دا فەرموویانە.

(وَلَهُ) بۆ قەرزدەرەكە دروستە (شَرْطُ رَهْنٍ وكَفِيلٍ) بە مەرج دابنێ قەرزوەرگرەكە بارمتەیەك دابنێ، یان كەفیلێك بێنێ، یان شاهید بگرێ، چونكە ئەو مەرجە بۆ متمانەپێكردنە.

(وَيَمْلِكُ الْقَرْضَ) قەرزوەرگرەكە دەبێتە خاوەنی شتەقەرزكراوەكە (بِالْقَبْضِ) بە وەرگرتنی قەرزكراوەكە، هەرچەند دەستكاریشی نەكا (وَفِي قَوْلٍ بِالتَّصَرُّفِ) لە فەرموودەیەكدا بە دەستكاریكردنی دەبێتە خاوەنی (وَلَهُ الرُّجُوعُ فِي عَيْنِهِ) قەرزدەرەكەش بۆی دروستە: خودی قەرزكراوەكە-لە دوایوەرگرتن- لە قەرزدارەكە وەربگرێتەوە (مادامَ باقِياً بِحالِهِ) مادام خودیقەرزكراوەكە-وەك خۆی- لە ملكایەتیقەرزدارەكەدا مابێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها بۆ قەرزدارەكەش دروستە: خودیقەرزكراوەكە بۆ قەرزدەرەكە بگەڕێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، واللهُ أعْلَمُ.

﴿ پاشكۆ ﴾ یەكەم: هەر قەرزێك كاتیدانەوەی هاتبێ، جا قەرزدارەكە، یان میراتگرێكی قەرزدارەكە قەرزەكە بداتەوە، ئەوە خاوەن قەرزەكە ناچار دەكرێ: یان قەرزەكە وەربگرێتەوە، یان گەردنیقەرزدارەكە ئازاد بكا، بەو مەرجەی ئەركی گواستنەوەی نەوێو شوێنەكەو ڕێگایەكەش بە ترس نەبن، هەروەك لە كۆتایی (سلم) لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: هەر كاتێك قەرزدارەكە قەرزەكەی لە بەردەستی خاوەن قەرزەكە دانا، بە شێوەیەكی وەها: كە دەستی دەگەیشتە قەرزەكەو دەیزانی ئەمە قەرزی خۆیەتی، هیچ شتێكیش ڕێگای وەرگرتنی لێنەدەگرت، ئەم دانانە بە وەرگرتنەوە دادەندرێو ئەستۆی

## (كِتابُ الرَّهْنِ)

**لاَيَصِحُّ إلاَّ بإيجَابٍ وَقَبُولٍ، فَإِنْ شُرِطَ فِيهِ مُقْتَضاهُ كَتَقَدُّمِ الْمُرْتَهِنِ بِهِ**

قەرزدارەکە لەو قەرزە ئازاد دەبێ، هەرچەند خاوەن قەرزەکەش قبوڵی نەکاو بڵێ: وەری‌ناگرمەوە. هەروەك لە (تحفة)و(نهاية) لە باسی(فرۆشراو پێش وەرگرتنی) ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: قەرزدانو قەرزدانەوەو گەردەن ئازادکردن ئاشکرا دەبن: بە شاهیدیی دوو پیاو، یان پیاوێکو دوو ئافرەت، یان پیاوێکو سوێندخواردن، هەروەك لە (كتاب الشّهادات)دا ڕوون دەکرێتەوە، إن شاءَ اللهُ تعالَى، جا ئەگەر هەردوو لا بووە کێشەیان: قەرزدەرەکە گوتی: ئەم شتەم بە قەرز داوەتە تۆ. ماڵوەرگرەکەش گوتی: بە بەخشین داومتێ.–هیچ لایەکیش شاهیدی نەبو– ئەوە ماڵوەرگرەکە سوێند دەخواو باوەڕی پێ دەکرێ، هەروەك لە (تحفة) لە سەرتایقەرزدا ڕوون کراوەتەوە.

### ﴿ كِتابُ الرَّهْنِ: پەڕتوكی ڕەهن-بارمتە دانان ﴾

واتە: قەرزدارێك شتێك بکاتە بارمتەی قەرزەکەی، تاکو–ئەگەر قەرزەکە نەدراوە– لەو شتە قەرزەکە بدرێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾ ئەگەر لە سەفەردا بونو مامڵەتێکی قەرزتان لەگەڵ یەکتری کردو نووسەرێکتان دەست نەکەوت قەرزەکە بنوسێ، بۆ متمانەیقەرزدانەوە بارمتەیەك وەریگرن. ﴿وعَنْ عائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ النَّبيَّ ﷺ اشْتَرَى طَعاماً مِنْ يَهُودِيٍّ إلى أجَلٍ وَرَهَنَهُ دِرْعاً مِنْ حَدِيدٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ هەندێك جۆی بە قەرز لە جولەکەیەك کڕیو زرێیەکی ئاسنی بە بارمتەی قەرزەکە دانا. واتە: سەفەرو دەستنەکەوتنی نووسەر مەرج نیە.

ئینجا بزانە: ڕوکنەکانی ڕەهن پێنجن: (اَلرَّاهِنُ) ڕەهندەر: کە قەرزدارەکەیەو بارمتەکە دادەنێ. (اَلْمُرْتَهِنُ) ڕەهنوەرگر: کە خاوەنی قەرزەکەیەو بارمتەکە وەردەگرێ. (اَلْمَرْهُونُ) ڕەهنکراو: ئەو شتەی بە بارمتە دادەندرێ. (اَلْمَرْهُونُ بِهِ) ڕەهن بۆکراو: کە قەرزەکەیە. (اَلصِّيغَةُ) گوتەی ڕەهن وێدانو قبوڵکردن.

(لاَيَصِحُّ) ڕەهن دروست نابێ (إلاَّ بإيجابٍ وَقَبُولٍ) تەنها بە گوتەی وێدانو قبوڵکردن نەبێ، وەك ئەمە بڵێ: ئەم شتەم کردە بارمتەی ئەو قەرزەی تۆ کە لە سەر منە. ئەویش بڵێ: قبوڵم کرد.

(فَإِنْ شُرِطَ فِيهِ مُقْتَضاهُ) جا ئەگەر لە ڕەهنەکەدا مەرجێکی وەها داندرا: کە ڕەهنەکە ئەو مەرجەی دەخواست (كَتَقَدُّمِ الْمُرْتَهِنِ) وەك بە مەرجی ڕەهنوەرگرەکە لە هەموو خاوەن قەرزەکان لە پێشتر بێ (بِهِ) بە ڕەهنکراوەکە، واتە: پێش هەموویان قەرزەکەی وی لەو

أَوْ مَصْلَحَةٌ لِلْعَقْد كَالإِشْهاد أَوْ مالاَ غَرَضَ فيه صَحَّ الْعَقْدُ، وَإِنْ شُرِطَ مايَضُـرُّالْمُرْتَهِن بَطَلَ الرَّهْنُ، وَإِنْ نَفَعَ الْمُرْتَهِن وَضَرَّالرَّاهِنَ كَشَرْط مَنْفَعَته لِلْمُـرْتَهِن بَطَـلَ الشَّـرْطُ، وَكَذَاالرَّهْنُ فِيالأَظْهَر، وَلَوْ شُرِطَ أَنْ تَحْدُثَ زَوائِدُهُ مَرْهُونَةً فَالأَظْهَرُ فَسـادُ الشَّـرْطِ، وَأَنَّهُ مَتَى فَسَدَ فَسَدَالْعَقْدُ، وَشَرْطُ الْعاقد كَوْنُهُ مُطْلَقَ التَّصَرُّف فَلاَ يَرْهَنُ الْـوَلِيُّ مـالَ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُون، وَلاَ يَرْتَهِنُ لَهُما إِلاَّ لِضَرُورَة أَوْ غِبْطَة ظاهِرَة،

---

ڕەهنکراوە بدرێتەوە (أَوْ مَصْلَحَةٌ لِلْعَقْد) یان بەرژەوەندیەکی مامڵەتەکە بە مەرج داندرا (كَالإِشْهاد) وەك شاهیدگرتن (أَوْ مالاَ غَرَضَ فيه) یان مەرجێکی وەها داندرا: کە هیچ مەبەست نەبو: وەك بەو مەرجەی ئاژەڵە ڕەهنکراوەکە ئەو جۆرە خواردنە بخوا (صَحَّ الْعَقْدُ) لە هەرسێك بەشەکاندا مامڵەتی ڕەهن دروست دەبێ، بەڵام مەرجەکەی سێیەم جێبەجێ ناکرێ.

(وَإِنْ شُرِطَ مايَضُرُّ الْمُرْتَهِنَ) ئەگەر مەرجێکی وەها داندرا: کە زیانی لە ڕەهنوەرگرەکە دەدا: وەك بە مەرجی ڕەهنکراوەکە نەفرۆشرێ، یان بە زیاتر لە نرخیخۆی بفرۆشرێ (بَطَلَ الرَّهْنُ) ڕەهنەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

(وَإِنْ نَفَعَ الْمُرْتَهِنَ) ئەگەر مەرجەکە سودی دەدا ڕەهنوەرگرەکە، بەڵام (وَضَرَّالرَّاهِنَ) زیانی لە ڕەهندەرەکە دەدا: (كَشَرْط مَنْفَعَته لِلْمُرْتَهِن) وەك بە مەرجی سودیڕەهنکراوەکە بۆ ڕەهنوەرگرەکە بێ (بَطَلَ الشَّرْطُ) مەرجەکە بەتاڵ دەبێتەوە (وَكَذَاالرَّهْنُ) هەروەها مامڵەتی ڕەهنکەش بەتاڵ دەبێتەوە (فِيالأَظْهَر) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَلَوْ شُرِطَ أَنْ تَحْدُثَ زَوائِدُهُ مَرْهُونَةً) ئەگەر بە مەرج داندرا: هەر زێدەییەکی لە ڕەهنکراوەکە پەیدا ببێ–وەك میوەو بێچوویڕەهنکراوەکە– ئەویش ڕەهنکراو بێ (فَالأَظْهَرُ فَسادُالشَّرْط) لە فەرموودەی بەهێزتر: مەرجەکە بەتاڵ دەبێ (وَأَنَّهُ مَتَى فَسَدَ) هەر کاتێکیش مەرجەکە بەتاڵ بو (فَسَدَالْعَقْدُ) مامڵەتی ڕەهنەکەش بەتاڵ دەبێ.

(وَشَرْطُ الْعاقد) مەرجی مامڵەتکەر، واتە: ڕەهندەرو ڕەهنوەرگر، ئەوەیە (كَوْنُهُ مُطْلَقَ التَّصَرُّف) دەستکاریکردنی لە ماڵیخۆیدا دروست بێ، کەوابو: (فَلاَ يَرْهَنُ الْوَلِيُّ مالَ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُون) دروست نیەو نابێ: سەرپەرشتکار ماڵی منداڵو شێت بە ڕەهن دابنێ، هەم (وَلاَ يَرْتَهِنُ لَهُما) نابێ ڕەهنیشیان بۆ وەربگرێ (إِلاَّ لِضَرُورَة) تەنها لە بەر ناچاری دروستە: وەك بۆ پێویستیەکی منداڵەکە، یان شێتەکە قەرزێك وەربگرێو ملکێکی ئەوان بە ڕەهنی ئەو قەرزە دابنێ تا بەرهەمیملکەکە پەیدا دەبێو قەرزەکە دەداتەوە (أَوْ غِبْطَة ظاهِرَة) هەم لە بەر قازانجێکیئاشکراش دروستە: وەك بە نرخێکیبەرز ملکیئەوان بە قەرز بفرۆشێو شتێك بە ڕەهنی ئەو قەرزە بۆ ئەوان وەربگرێ.

وَشَرْطُ الرَّهْنِ كَوْنُهُ عَيْناً فِي الأَصَحِّ، وَيَصِحُّ رَهْنُ الْمُشاعِ وَالأُمِّ دُونَ وَلَدِها وَعَكْسُهُ، وَعِنْدَ الْحاجَةِ يُباعانِ وَيُوَزَّعُ الثَّمَنُ، وَالأَصَحُّ أَنْ تُقَوَّمَ الأُمُّ وَحْدَها ثُمَّ مَعَ الْوَلَدِ فَالزَّائِدُ قِيمَتُهُ، وَرَهْنُ الْجانِي وَالْمُرْتَدِّ كَبَيْعِهِما، وَرَهْنُ الْمُدَبَّرِ وَالْمُعَلَّقِ عِتْقُهُ بِصِفَةٍ يُمْكِنُ سَبْقُها حُلُولَ الدَّيْنِ باطِلٌ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ رَهَنَ ما يَسْرُعُ فَسادُهُ: فَإِنْ أَمْكَنَ تَجْفِيفُهُ كَرُطَبٍ فَعَلَ، وَإِلاَّ فَإِنْ رَهَنَهُ بِدَيْنٍ حالٍّ أَوْ مُؤَجَّلٍ يَحِلُّ قَبْلَ فَسادِهِ أَوْ شَرَطَ بَيْعَهُ وَجَعْلَ الثَّمَنِ رَهْناً صَحَّ، وَيُباعُ

---

(وَشَرْطُ الرَّهْنِ) مەرجی ڕەهنكرلو (كَوْنُهُ عَيْناً) دەبی شتێكی وەها بێ: فرۆشتنی دروست بێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەواتە: ڕەهنكردنی قەرز دروست نیە، بەلام (وَيَصِحُّ رَهْنُ الْمُشاعِ) دروستە: ڕەهنكردنی بەشە بەربلاوەكەی‌خۆی لە ماڵێكی‌هاوبەشدا.

(وَالأُمِّ دُونَ وَلَدِها) هەم دروستە دایكێكی كۆیلە ڕەهن بكرێ بە بێ‌منداڵەكەی (وَعَكْسُهُ) بە پێچەوانەوەش دروستە (وَعِنْدَ الْحاجَةِ) ئینجا لە كاتی پێویستی بۆ قەرزدانەوە (يُباعانِ) دایكەكەو منداڵەكە هەردووكیان وێكڕا دەفرۆشرێن (وَيُوَزَّعُ الثَّمَنُ) پارەكەش بە سەر هەردووكیاندا بەش دەكرێ‌و بەشە پارەی ڕەهنكراوەكە بۆ خاوەن قەرزەكەیە، هەروەك دەفەرموێ: (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی‌ڕاستتر (أَنْ تُقَوَّمَ الأُمُّ وَحْدَها) جارێك دایكەكە بە تەنها دەقرسێندرێ (ثُمَّ مَعَ الوَلَدِ) ئینجا جارێكی‌تریش لەگەڵ منداڵەكەی دەقرسێندرێ (فَالزَّائِدُ) ئەو ئەندازەیەی ئەمجارە لە نرخی‌دایكەكە زیادی كردوە (قِيمَتُهُ) نرخی‌منداڵەكەیە.

(وَرَهْنُ الْجانِي) ڕەهنكردنی كۆیلەی تاوانكار، هەم (وَالْمُرْتَدِّ) كۆیلەی كافربوو (كَبَيْعِهِما) وەك فرۆشتنیان وایە: كە بە درێژی باس كران (وَرَهْنُ الْمُدَبَّرِ) ڕەهنكردنی ئەو كۆیلەی ئازادی‌ی بە مردنی گەورەكەیەوە بەستراوە، هەم (وَالْمُعَلَّقِ عِتْقُهُ بِصِفَةٍ) ئەو كۆیلەی ئازادی‌ی بە سیفەتێكی وەها بەستراوە: كە (يُمْكِنُ سَبْقُها حُلُولَ الدَّيْنِ) دەگونجێ پێش هاتنی كاتی قەرزدانەوە سیفەتەكە بێتەجێ (باطِلٌ عَلَى الْمَذْهَبِ) هەردووكی بەتاڵە، لە سەر فەرموودەی ڕاستی‌مەزهەب.

(وَلَوْ رَهَنَ ما يَسْرُعُ فَسادُهُ) ئەگەر شتێكی وەهای ڕەهن كرد كە زوو خراپ دەبو، ئەوە (فَإِنْ أَمْكَنَ تَجْفِيفُهُ) ئەگەر دەگونجا ووشك بكرێتەوە (كَرُطَبٍ) وەكو خورماو ترێ (فَعَلَ) دەبی خاوەنەكەی ووشكی بكاتەوە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر نەدەگونجا ووشك بكرێتەوە، ئەوە (فَإِنْ رَهَنَهُ بِدَيْنٍ حالٍّ) ئەگەر ڕەهنی كردبو بۆ قەرزێكی دەست بەجێ (أَوْ مُؤَجَّلٍ) یان بۆ قەرزێكی دواخراو، بەلام (يَحِلُّ قَبْلَ فَسادِهِ) پێش خراپبوونی كاتی دانەوەی دەهات (أَوْ شَرَطَ بَيْعَهُ) یان بە مەرجی دانابو: لە كاتی مەترسی‌خراپبووندا بیفرۆشێ‌و (وَجَعْلَ الثَّمَنِ رَهْناً) پارەكەیشی بكرێتە ڕەهنكراو (صَحَّ) لە حاڵەتانەدا ڕەهنەكە دروست دەبێ‌و (وَيُباعُ

عِنْدَ خَوْفِ فَسادِهِ وَيَكُونُ ثَمَنُهُ رَهْناً، وَإِنْ شَرَطَ مَنْعَ بَيْعِهِ لَمْ يَصِحَّ، وَإِنْ أَطْلَقَ فَسَدَ فِي الأَظْهَرِ، وَإِنْ لَمْ يُعْلَمْ هَلْ يَفْسُدُ قَبْلَ الأَجَلِ صَحَّ فِي الأَظْهَرِ، وَإِنْ رَهَنَ مالاً يَسْرُعُ فَسادُهُ فَطَرَأَ ما عَرَّضَهُ لِلْفَسادِ كَحِنْطَةٍ ابْتَلَّتْ لَمْ يَنْفَسِخِ الرَّهْنُ بِحالٍ، وَيَجُوزُ أَنْ يَسْتَعِيرَ شَيْئاً لِيَرْهَنَهُ، وَهُوَ فِي قَوْلٍ عارِيَّةٌ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ ضَمانُ دَيْنٍ فِي رَقَبَةِ ذٰلِكَ الشَّيْءِ فَيُشْتَرَطُ ذِكْرُ جِنْسِ الدَّيْنِ وَقَدْرِهِ وَصِفَتِهِ، وَكَذَا الْمَرْهُونُ عِنْدَهُ فِي الأَصَحِّ،

---

(عِنْدَ خَوْفِ فَسادِهِ) لە كاتی مەترسی خراپبوونیدا دەفرۆشرێو (وَيَكُونُ ثَمَنُهُ رَهْناً) پارەكەشی دەبێتە ڕەهنكراو.

بەڵام (وَإِنْ شَرَطَ مَنْعَ بَيْعِهِ) ئەگەر بە مەرجی دانا: نەفرۆشرێ (لَمْ يَصِحَّ) ڕەهنەكە دروست نابێ (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر هیچ مەرجێكی دانەنا (فَسَدَ) ڕەهنەكە بەتاڵ دەبێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَإِنْ لَمْ يُعْلَمْ) ئەگەر لەو حاڵەتەدا نەزاندرا (هَلْ يَفْسُدُ قَبْلَ الأَجَلِ) ئایا خراپ دەبێ پێش ئەوەی كاتی دانەوەی قەرزەكە بێ، یان نا (صَحَّ) ڕەهنەكە دروست دەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَإِنْ رَهَنَ مالاً يَسْرُعُ فَسادُهُ) ئەگەر شتێكی وەهای ڕەهن كرد كە زوو خراپ نەدەبو، بەڵام (فَطَرَأَ ما عَرَّضَهُ لِلْفَسادِ) حاڵەتێكی وەهای بەسەر هات: تووشی خراپبوونی كرد (كَحِنْطَةٍ ابْتَلَّتْ) وەك گەنمێكی ڕەهنكراو تەڕ ببێ، ئەوە (لَمْ يَنْفَسِخِ الرَّهْنُ بِحالٍ) ڕەهنەكە هەڵناوەشێتەوە بە هیچ حاڵەتێك، بەڵكو -ئەگەر نەگونجا ووشك بكرێتەوە- واجبە بفرۆشرێو پارەكەی بكرێتە ڕەهنكراو، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ أَنْ يَسْتَعِيرَ شَيْئاً) دروستە: شتێك بە خواستن وەربگرێ (لِيَرْهَنَهُ) تاكو بە ڕەهنی قەرزەكەی دابنێ (وَهُوَ فِي قَوْلٍ عارِيَّةٌ) لە فەرموودەیەكدا: ئەو مامڵەتەیخواستن -لە دوای ڕەهنكردن- هەر بە (عارية) خواستن دەمێنێتەوە، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ) ئەو مامڵەتە بە خواستن نامێنێتەوە، بەڵكو (ضَمانُ دَيْنٍ) زامینیی قەرزێكە لە لایەن خاوەنی ماڵخواستراوەكە (فِي رَقَبَةِ ذٰلِكَ الشَّيْءِ) زامینیەكەش لە گەردەنی ئەو شتە خواستراوەدایەو هیچ لە ئەستۆی خاوەن ماڵەكەدا نیە، واتە: ئەگەر ماڵە خواستراوەكە فەوتا، یان بەرەوەستی قەرزدانەوەكەی بە تەواوەتی نەدەكرد، خاوەنەكەی هیچ قەرزدانەوەی لە سەر نیە.

كەوابو: (فَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی ئەو ماڵخواستنە بە مەرج دادەندرێ (ذِكْرُ جِنْسِ الدَّيْنِ) ڕەگەزی قەرزەكەی بۆ خاوەن ماڵەكە باس بكاو (وَقَدْرِهِ) هەم ئەندازەی قەرزەكەو (وَصِفَتِهِ) سیفەتی قەرزەكەو (وَكَذَا الْمَرْهُونُ عِنْدَهُ) هەم ناوی ئەو كەسەشی بۆ باس بكا: كە ماڵخواستراوەكەی -بە ڕەهن- لە لا دادەندرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

فَلَوْ تَلف فِي يَدِالْمُرْتَهِنِ فَلاَ ضَمانَ، وَلاَ رُجُوعَ لِلْمالِكِ بَعْدَ قَبْضِ الْمُرْتَهِنِ، فَإِذا حَلَّ الدَّيْنُ أَوْ كانَ حالاًّ رُوجِعَ الْمالِكُ لِلْبَيْعِ، وَيُباعُ إِنْ لَمْ يَقْضِ الدَّيْنُ ثُمَّ يَرْجِعُ الْمالِكُ بِما بِيعَ بِهِ.
(فَصْلٌ) شَرْطُ الْمَرْهُونِ بِهِ كَوْنُهُ دَيْناً ثابِتاً لازِماً فَلاَ يَصِحُّ بِالْعَيْنِ الْمَغْصُوبَةِ وَالْمُسْتَعارَةِ فِي الأَصَحِّ وَلاَ بِما سَيُقْرِضُهُ، وَلَوْ قالَ: أَقْرَضْتُكَ هَذِهِ الدَّراهِمَ وَارْتَهَنْتُ بِها عَبْدَكَ، فَقالَ: اقْتَرَضْتُ وَرَهَنْتُ، أَوْ قالَ: بِعْتُكَهُ بِكَذا وَارْتَهَنْتُ الثَّوْبَ بِهِ،

---

(فَلَوْ تَلِفَ فِي يَدِالْمُرْتَهِنِ) جا ئەگەر ماڵە خواستراوەکە لە دەستی ڕەهنوەرگرەکەدا فەوتا (فَلاَ ضَمانَ) زامینی لە سەر هیچێکیان نیە: نە ڕەهندەرەکەو نە ڕەهنوەرگرەکە (وَلاَ رُجُوعَ لِلْمالِكِ) خاوەنی ماڵە خواستراوەکە مافی پەشیمانبوونەوەی نیە (بَعْدَ قَبْضِ الْمُرْتَهِنِ) پاش ئەوەی ڕەهنوەرگرەکە ماڵەکەی وەرگرتبێ؛ چونکە ئەگەر پەشیمان ببێتەوە سودی ڕەهنەکە نامێنێ.
(فَإِذا حَلَّ الدَّيْنُ) جا هەر کاتێك کاتی قەرزدانەوە هات (أَوْ كانَ حالاًّ) یان هەر قەرزەکە دەست بەجێ بوو (رُوجِعَ الْمالِكُ لِلْبَيْعِ) دەبی-بۆ فرۆشتنی ماڵە خواستراوەکە- پرسی خاوەنەکەی بکرێ، ئینجا (وَيُباعُ) ماڵە خواستراوەکە دەفرۆشرێ، تاکو قەرزەکەی لێ بدرێتەوە (إِنْ لَمْ يَقْضِ الدَّيْنُ) ئەگەر قەرزەکە نەدرابێتەوە: لە لایەن قەرزدارەکە، یان لە لایەن خاوەن ماڵەکە، یان لە لایەن کەسێکیتر (ثُمَّ) ئینجا لە دوای فرۆشتنی ماڵەکە (يَرْجِعُ الْمالِكُ) خاوەن ماڵەکە دەگەڕێتەوە سەر ڕەهندەرە قەرزدارەکە (بِما بِيعَ بِهِ) بۆ ئەوەی ئەندازەی ئەو پارەیەی لێوەربگرێتەوە: کە ماڵە خواستراوەکەی پێفرۆشراوە، جیاوازی نیە: پارەکە لە نرخیخۆی کەمتر بێ، یان زیاتر بێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی ڕەهن بۆکراو ﴾

(شَرْطُ الْمَرْهُونِ بِهِ) مەرجی ئەو مافەی ڕەهنی بۆ کراوە (كَوْنُهُ دَيْناً ثابِتاً) دەبی قەرزێکی دامەزراو بێ، واتە: بوبێتە قەرز، هەم (لاَزِماً) پێویست بێ: بدرێ، کەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ بِالْعَيْنِ الْمَغْصُوبَةِ) دروست نیە: ڕەهن دابندرێ بۆ شتێکیزەوتکراو، هەم (وَالْمُسْتَعارَةِ) بۆ شتێکیخواستراو (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەوانە قەرز نین (وَلاَ بِما سَيُقْرِضُهُ) هەروەها دروست نیە ئێستا ڕەهن دابندرێ بۆ ئەو قەرزەی لەمەودوا بە قەرزی دەداتێ، چونکە لە کاتی ڕەهن داناندا قەرزەکە نەبۆتە قەرز.
بەڵام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر قەرزدەرەکە گوتی: (أَقْرَضْتُكَ هَذِهِ الدَّراهِمَ وَارْتَهَنْتُ بِها عَبْدَكَ) ئەم دیرهەمانەم بە قەرز دانە تۆ و کۆیلەکەتم بە ڕەهنی ئەو دیرهەمانە قبوڵ کرد (فَقالَ) قەرزوەرگرەکەش گوتی: (اقْتَرَضْتُ وَرَهَنْتُ) قەرزەکەم قبوڵ کردو کۆیلەکەم ڕەهنی ئەو قەرزە کرد (أَوْ قالَ) یان فرۆشیارەکە گوتی: (بِعْتُكَهُ بِكَذا وَارْتَهَنْتُ الثَّوْبَ بِهِ) ئەم شتەم

فَقالَ اشْتَرَيْتُ وَرَهَنْتُ، صَحَّ فِى الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ بِنُجُومِ الْكِتابَةِ وَلاَ بِجُعْلِ الْجَعالَةِ قَبْلَ الْفَراغِ، وَقِيلَ يَجُوزُ بَعْدَ الشُّرُوعِ، وَيَجُوزُ بِالثَّمَنِ فِى مُدَّةِالْخِيارِ، وَبِالدَّيْنِ رَهْنٌ بَعْدَ رَهْنٍ، وَلاَ يَجُوزُ أَنْ يَرْهَنَهُ الْمَرْهُونَ عِنْدَهُ بِدَيْنٍ آخَرَ فِى الْجَدِيدِ، وَلاَ يَلْزَمُ إِلاَّ بِقَبْضِهِ مِمَّنْ يَصِحُّ عَقْدُهُ، وَتَجْرِى فِيهِ النِّيابَةُ لَكِنْ لاَ يَسْتَنِيبُ الرَّاهِنَ وَلاَ عَبْدَهُ،

---

بەوەنده پارەیە فرۆشتە تۆ و ئەم جلەشم بە رەهنی پارەکەی قبوڵ کرد (فَقالَ) کڕیارەکەش گوتی (اشْتَرَيْتُ وَرَهَنْتُ) لێتم کڕی‌و جلەکەشم کردە رەهنی‌پارەکەی (صَحَّ) لە هەردوو مەسەلەکاندا رەهنەکە دروستە (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی راستتردا.

(وَ)هەروەها (لاَ يَصِحُّ بِنُجُومِ الْكِتابَةِ) دروست نیە رەهن دابندرێ بۆ بەشە قەرزەکانی نووسراوپێدانی کۆیلە (وَلاَ) هەروەها دروست نیە رەهن دابندرێ (بِجُعْلِ الْجَعالَةِ) بۆ کرێی کارێکی نادیار، وەك کرێی دۆزینەوەی شتی ونبوو (قَبْلَ الْفَراغِ) پێش تەواوبوونی کارەکە، وەك بڵێ: هەر کەسێك ئاژەڵە ونبووەکەم بۆ بدۆزێتەوە دینارێکی دەدەمێ. پیاوێکیش بڵێ: رەهنێك بۆ دینارکە دابنێ من دەیدۆزمەوە. ئەوە دروست نیە، چونکە لە کاتی رەهن داناندا پێویست نیە دینارەکە بدرێ؟ نەوەك کارەکە تەواو نەکرێ، یان مامڵەتەکە هەڵبوەشێننەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (يَجُوزُ بَعْدَ الشُّرُوعِ) دروستە–لە دوای دەست پێکردنی کارەکە– رەهن دابندرێ.

(وَيَجُوزُ بِالثَّمَنِ فِى مُدَّةِ الْخِيارِ) دروستە: رەهن دابندرێ بۆ پارەی فرۆشراوێك لە ماوەی پەشیمانبوونەوەدا، چونکە سەر ئەکێشێتە لای پێویستبوون (وَبِالدَّيْنِ رَهْنٌ بَعْدَ رَهْنٍ) هەروەها دروستە بۆ یەك قەرز رەهنێکی‌تر لە دوای رەهنەکەی‌تر دابندرێ، جا هەردووکیان وەها بڕیاریان بۆ دەدرێ: کە بە یەکەوە رەهن کراون.

(وَلاَ يَجُوزُ أَنْ يَرْهَنَهُ الْمَرْهُونَ عِنْدَهُ) ئەو رەهنکراوەی هێشتا هەر لە لای‌رەهنوەرگرەکە لە رەهندایە، دروست نیە: رەهنی بکاتەوە هەر لە لای ئەوی (بِدَيْنٍ آخَرَ) بۆ قەرزێکی‌تری جگە لە قەرزی پێشوو (فِى الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا.

(وَلاَ يَلْزَمُ) مامڵەتی رەهن جێگیر نابێ (إِلاَّ بِقَبْضِهِ) تەنها بە وێدان‌و وەرگرتن جێگیر دەبێ، بە بەڵگەی ئایەتەکە (مِمَّنْ يَصِحُّ عَقْدُهُ) وێدان‌و وەرگرتنەکەش لەو کەسانەوە بن: کە مامڵەتی رەهنیان دروست بێ، واتە: منداڵ‌و شێت‌و قەدەغەکراو و زۆرلێکراو نەبن.

(وَتَجْرِى فِيهِ النِّيابَةُ) لە مامڵەتی رەهندا جێنشینی رەوایە: لە وێدان‌و لە وەرگرتندا (لَكِنْ لاَ يَسْتَنِيبُ الرَّاهِنَ) بەڵام نابێ رەهنوەرگرەکە–بۆ وەرگرتنی رەهنەکە– رەهندەرەکە بکاتە جێنیشی خۆی، هەم (وَلاَ عَبْدَهُ) نابێ کۆیلەی رەهندەرەکەش بکاتە جێنیشی‌خۆی

وَفِي الْمَأْذُونِ لَهُ وَجْهٌ، وَيَسْتَتِيبُ مُكَاتَبَهُ، وَلَوْ رَهَنَ وَدِيعَةً عِنْدَ مُودَعٍ أَوْ مَغْصُوباً عِنْدَ غَاصِبٍ لَمْ يَلْزَمْ مَا لَمْ يَمْضِ زَمَنُ إِمْكَانِ قَبْضِهِ، وَالأَظْهَرُ اشْتِرَاطُ إِذْنِهِ فِي قَبْضِهِ، وَلاَ يُبْرِئُهُ ارْتِهَانُهُ عَنِ الْغَصْبِ، وَيُبْرِئُهُ الإِيدَاعُ فِي الأَصَحِّ، وَيَحْصُلُ الرُّجُوعُ عَنِ الرَّهْنِ قَبْلَ الْقَبْضِ بِتَصَرُّفٍ يُزِيلُ الْمِلْكَ: كَهِبَةٍ مَقْبُوضَةٍ وَبِرَهْنٍ مَقْبُوضٍ وَكِتَابَةٍ وَكَذَا تَدْبِيرُهُ

---

(وَفِي الْمَأْذُونِ لَهُ وَجْهٌ) دەربارەی کۆیلەی ئیزندراو فەرموودەیەك هەیە: کە دروست بێ (وَيَسْتَتِيبُ مُكَاتَبَهُ) دروستە نووسراو پێدراوی ڕەهندەرەکە بکاتە جێنیشی خۆی.

(وَلَوْ رَهَنَ وَدِيعَةً) ئەگەر ماڵێکی بە ئەمانەت داندراوی کردە ڕەهنی قەرزێك (عِنْدَ مُودَعٍ) لە لای ئەمیندارەکە (أَوْ مَغْصُوباً عِنْدَ غَاصِبٍ) یان ماڵێکی زەوتکراوی کردە ڕەهنی قەرزێك لە لای زەوتکەرەکە: وەك قەرزێك وەربگرێ لە ئەمیندارەکە، یان لە زەوتکەرەکە، ئینجا بڵێ: ئەو ئەمانەتەی لە لای تۆیە، یان ئەو زەوتکراوەی لە لای تۆیە ڕەهنی ئەو قەرزە بێ. ئەوە ڕەهنەکە دروستە، بەڵام (لَمْ يَلْزَمْ) جێگیر نابێ (مَا لَمْ يَمْضِ زَمَنُ إِمْكَانِ قَبْضِهِ) تا ئەوەندە ماوەیە بە سەر ڕەهنکەدا دەڕوا: کە بگونجێ -لەو ماوەیەدا- ڕەهندەرەکە ماڵەکە بداتە ڕەهنوەرگرەکەو ئەویش وەری بگرێ (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (اشْتِرَاطُ إِذْنِهِ فِي قَبْضِهِ) مەرجە: ڕەهندەرەکە ئیزن بدا ڕەهنکراوەکە وەربگیرێ.

(وَلاَ يُبْرِئُهُ ارْتِهَانُهُ عَنِ الْغَصْبِ) قبوڵکردنی زەوتکراوەکە بە ڕەهن، زەوتکەرەکە ئازاد ناکا لە زامینی زەوتکردن، چونکە زەوتکراوەکە هەر لە ژێردەستی خۆیدایەو نەیگەڕاندۆتەوە بۆ خاوەنەکەی، بەڵام (وَيُبْرِئُهُ الإِيدَاعُ) دانانی زەوتکراوەکە -بە ئەمانەت- لە لای زەوتکەرەکە، ئازادی ئەکا لە زامینی، وەك بڵێ: تۆم کردە ئەمیندار لە سەر ئەو ماڵە زەوتکراوەی لە لای تۆیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: گوتمان هەر کاتێك ڕەهنکراوەکە وەرگیرا، ئەوە مامڵەتی ڕەهن جێگیر دەبێ، کەواتە: ڕەهندەرەکە مافی پەشیمانیی نیە، بەڵام ئەگەر وەرنەگیرابو، ئەوە دەتوانێ بە قسە بڵێ: من پەشیمانم.

(وَ)هەروەهاش (يَحْصُلُ الرُّجُوعُ) پەشیمانی دێتە جێ (عَنِ الرَّهْنِ قَبْلَ الْقَبْضِ) لە مامڵەتی ڕەهن پێش وەرگرتنی ڕەهنکراوەکە (بِتَصَرُّفٍ يُزِيلُ الْمِلْكَ) بە هەر دەستکاریکردنێکی ڕەهندەرەکە: کە ملکایەتی لا ببا (كَهِبَةٍ مَقْبُوضَةٍ) وەك ڕەهنکراوەکە -پێش وەرگرتن- ببەخشێو پێبەخشکراوەکەش وەری بگرێ، یان ڕەهنکراوەکە -پێش وەرگرتن- بفرۆشێ (وَ) هەروەها پەشیمانی دێتە جێ (بِرَهْنٍ مَقْبُوضٍ) بە ڕەهنکردنی کە وەربگیرێ (وَكِتَابَةٍ) هەم بە نووسراو پێدانی کۆیلە ڕەهنکراوەکە (وَكَذَا تَدْبِيرُهُ) هەروەها بە ئازادی دوای مردن

فِي‌الأَظْهَرِ، وَبِإِحْبَالِها، لاَ الْوَطْءِ وَالتَّزْوِيجِ، وَلَوْ ماتَ الْعاقِدُ قَبْلَ الْقَبْضِ أَوْ جُنَّ، أَوْ تَخَمَّرَ الْعَصِيرُ أَوْ أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ يَبْطُلِ الرَّهْنُ فِي‌الأَصَحِّ، وَلَيْسَ لِلرَّاهِنِ الْمُقْبِضِ تَصَرُّفٌ يُزِيلُ الْمِلْكَ، لَكِنْ فِي‌إِعْتاقِهِ أَقْوالٌ أَظْهَرُها: يَنْفُذُ مِنَ الْمُوسِرِ وَيَغْرَمُ قِيمَتَهُ يَوْمَ عِتْقِهِ رَهْناً، وَإِذَا لَمْ نُنَفِّذْهُ فَانْفَكَّ لَمْ يَنْفُذْ فِي‌الأَصَحِّ، وَلَوْ عَلَّقَهُ بِصِفَةٍ فَوُجِدَتْ وَهُوَ رَهْنٌ فَكَالإِعْتاقِ، أَوْ بَعْدَهُ نَفَذَ عَلَى‌الصَّحِيحِ، وَلاَ رَهْنُهُ لِغَيْرِهِ،

---

(فِي‌الأَظْهَرِ) له فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا (وَبِإِحْبَالِها) هه‌م به ئاوسکردنی(جارية)ڕه‌هنکراوه‌که (لاَالْوَطْءِ وَالتَّزْوِيجِ) نه‌ك ته‌نها جیماع له‌گه‌ڵکردنی‌و ماره بڕینی.

(وَلَوْ ماتَ الْعاقِدُ قَبْلَ الْقَبْضِ) ئه‌گه‌ر پێش وه‌رگرتنی‌ڕه‌هنکراوه‌که، مامڵه‌تکه‌ره‌که مرد، واته: ڕه‌هنده‌ره‌که، یان ڕه‌هنوه‌رگره‌که (أَوْ جُنَّ) یان شێت بو (أَوْ تَخَمَّرَ الْعَصِيرُ) یان شه‌ربه‌ته ڕه‌هنکراوه‌که بووه شه‌ڕاب (أَوْ أَبَقَ العَبْدُ) یان کۆیله‌ڕه‌هنکراوه‌که خۆی ون کرد (لَمْ يَبْطُلِ الرَّهْنُ) له هیچ حاڵه‌تێکدا مامڵه‌تی ڕه‌هن به‌تاڵ نابێته‌وه (فِي‌الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستتردا.

(وَلَيْسَ لِلرَّاهِنِ الْمُقْبِضِ) له ڕه‌هنده‌ره‌که حه‌ڕامه—پاش ئه‌وه‌ی ڕه‌هنکراوه‌که‌ی دایه ده‌ست ڕه‌هنوه‌رگره‌که— (تَصَرُّفٌ يُزِيلُ الْمِلْكَ) هه‌ر ده‌ستکاریه‌کی ملکایه‌تی لاببا: وه‌ك فرۆشتن‌و به‌خشین‌و وه‌قفکردن، واته: ئه‌وانه هیچیان دروست نابن (لَكِنْ فِي إِعْتاقِهِ أَقْوالٌ) به‌ڵام له باره‌ی ئازادکردنی کۆیله‌ڕه‌هنکراوه‌که، چه‌ند فه‌رمووده‌یه‌ك هه‌نه:

(أَظْهَرُها) به هێزتریان ئه‌مه‌یه (يَنْفُذُ مِنَ الْمُوسِرِ) ئازادکردنه‌که له خاوه‌نێکی ده‌وڵه‌مه‌ند دروست ده‌بێ‌و جێبه‌جێ ده‌کرێ (وَيَغْرَمُ قِيمَتَهُ يَوْمَ عِتْقِهِ رَهْناً) نرخی کۆیله‌که—له ڕۆژی ئازادکردنی— له تۆڵه‌ی کۆیله‌که ده‌بێته بارمته (وَإِذَا لَمْ نُنَفِّذْهُ) جا هه‌ر کاتێك ئازادکردنه‌که به دروستبوویی دانه‌نێین، چونکه خاوه‌نه‌که‌ی نه‌بوویی بوو (فَانْفَكَّ) ئینجا ڕه‌هنه‌که‌ش به‌رهه‌ڵ بو، چونکه له قه‌رزه‌که گه‌ردنی ئازاد کرا، یان دایه‌وه (لَمْ يَنْفُذْ) ئێستاش ئازادکردنه‌که دروست نابێ (فِي‌الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستتردا.

(وَلَوْ عَلَّقَهُ بِصِفَةٍ) ئه‌گه‌ر ئازادکردنی کۆیله‌که‌ی به سیفه‌تێکه‌وه هه‌ڵواسی بو، وه‌ك بڵێ: هه‌ر کاتێك کوڕه‌که‌م له سه‌فه‌ر گه‌ڕاوه، تۆ ئازادی (فَوُجِدَتْ وَهُوَ رَهْنٌ) ئینجا سیفه‌ته‌که هاته جێ، واته: کوڕه‌که‌ی گه‌ڕاوه، کۆیله‌که‌ش هه‌ر له ڕه‌هندا بوو، ئه‌وه (فَكَالإِعْتاقِ) وه‌ك ئازادکردن وایه: له ده‌وڵه‌مه‌ند دروست ده‌بێ، له نه‌بوویی دروست نابێ (أَوْ بَعْدَهُ) یان له دوای هه‌ڵوه‌شانده‌وه‌ی ڕه‌هنه‌که سیفه‌ته‌که هاته جێ (نَفَذَ) ئازادکردنی کۆیله‌که دروست ده‌بێ‌و جێبه‌جێ ده‌کرێ (عَلَى‌الصَّحِيحِ) له‌سه‌ر فه‌رمووده‌ی ڕاست.

(وَلاَ رَهْنُهُ لِغَيْرِهِ) حه‌ڕامه‌و دروست نیه: ڕه‌هنکراو—که هه‌ر له ڕه‌هندا بێ— ڕه‌هنی بکا له لای که‌سێکی‌تر، هه‌روه‌ك له لای ڕه‌هنوه‌رگره‌که‌ش دروست نه‌بو و باسمان کرد.

وَلاَ التَّزْوِيجُ وَلاَ الإجارَةُ إنْ كانَ الدَّينُ حالاً أَوْ يَحلُّ قَبْلَها، وَلاَ الْوَطْءُ فَإنْ وَطِئَ فَالْوَلَدُ حُرٌّ، وَفي نُفوذِالإِسْتيلاَدِ أَقْوالُ الإعْتاق، فَإِنْ لَمْ نُنَفِّذْهُ فَانْفَكَّ نَفَذَ في الأَصَحِّ، فَلَوْ ماتَتْ بِالْوِلاَدَة غرِمَ قِيمَتَها رَهْناً في الأَصَحِّ، وَلَهُ كُلُّ انْتِفاعٍ لاَ يَنْقُصُهُ كَالرُّكُوبِ وَالسُّكْنَى، لاَ الْبِناءُ وَالْغِراسُ، فَإنْ فَعَلَ

---

(وَلاَ التَّزْوِيجُ) هەم دروست نیە (جاریـة) ڕەهنكراوەكە مارە ببڕی (وَلاَ الإجارَةُ) هەروەها دروست نیە ڕەهنكراوەكە بە كرێ بدا (إنْ كانَ الدَّينُ حالاً) ئەگەر قەرزەكە دەست بەجێ بێ (أَوْ يَحلُّ قَبْلَها) یان پێش تەواوبوونی ماوەی بەكرێدانەكە، كاتی قەرزدانەوەكە دەهات (وَلاَ الوَطْءُ) هەم دروست نیە: جیماع لەگەڵ (جاریـة)ی ڕەهنكراو بكا (فَإِنْ وَطِىءَ) جا ئەگەر خاوەنەكەی جیماعی لەگەڵ كردو ئاوسی كرد (فَالْوَلَدُ حُرٌّ) ئەو منداڵەی لەو جیماعە دەبێ، ئازادەو بە نەژادیش منداڵی خاوەنەكەیە.

(وَفي نُفُوذِ الإِسْتِيلاَدِ أَقْوالُ الإِعْتاقِ) لە بارەی بوونی (جاریـة)كەش بە (أم الولَد) فەرموودەكانی ئازادكردنیڕابردوو هەنە، بەهێزتریان ئەگەر خاوەنەكە هەبوویی بوو، (جاریة)كە دەبێتە (أم الولَد) ئەگەر نا: نا. (فَإِنْ لَمْ نُنَفِّذْهُ) جا ئەگەر بڵێین نابێتە (أم الولَد) چونكە خاوەنەكەی نەبوویی بوو (فَانْفَكَّ) ئینجا ڕەهنەكەش بەرهەڵ بو (نَفَذَ فيالأَصَحِّ) لە دوای هەڵوەشانەوە دەبێتە (أم الولَد) لە فەرموودەی ڕاستتردا (فَلَوْ ماتَتْ بِالوِلاَدَةِ) ئەگەر ئەو (جاریـة) ئاوسكراوە بە هۆی منداڵ لێبوون مرد (غَرِمَ قِيمَتَها رَهْناً) ئەوە نرخی (جاریة)كە -لە تۆڵە- دەكاتە بارمتە (فيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

### ﴿ سودەكانی ڕەهنكراوەكە ﴾

(وَلَهُ) بۆ ڕەهندەرەكە دروستەو حەلاڵە (كُلُّ انْتِفاعٍ) گشت سودێك لە ماڵە ڕەهنكراوەكەی وەربگرێ، بە شێوەیەكی وەها: كە (لاَ يَنْقُصُهُ) ئەو سودوەرگرتنە نرخی ڕەهنكراوەكە كەم نەكاتەوە (كَالرُّكُوبِ) وەكو سواری وولاغو ئوتۆمبێلە ڕەهنكراوەكە، هەم (وَالسُّكْنَى) نیشتەجێبوون لە ناو ملكەڕەهنكراوەكەدا، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿الظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِه إِذَا كانَ مَرْهُوناً، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِه إِذا كانَ مَرْهُوناً﴾ رواه البخاري، پشتی وولاغە ڕەهنكراوەكە-لە لایەن خاوەنەكەی- بۆ سواری بە كار ئەهێندرێ بە هۆی بەخێوكردنی، هەم شیری گوانی ئاژەڵە ڕەهنكراوەكە-لە لایەن خاوەنەكەی- دەخورێتەوە بە هۆی بەخێوكردنی.

كەواتە: ئەگەر بە مەرج دابندرێ: سودەكانی ڕەهنكراوەكە بۆ ڕەهنوەرگرەكە بێ، ئەوە حەڕامەو مامڵەتەكەش بەتاڵ دەبێتەوە، هەروەك لە سەرەتای ئەم باسەدا ڕابرا.

(لاَالْبِناءُ) بەڵام بۆ ڕەهندەرەكە دروست نیە: خانوو لە ناو زەویە ڕەهنكراوەكەدا بكا، هەم (وَالْغِراسُ) بۆی دروست نیە درەختی تێدا بچێنێ (فَإِنْ فَعَلَ) جا ئەگەر خانووی تێدا

**لَمْ يُقْلَعْ قَبْلَ الأَجَلِ وَبَعْدَهُ يُقْلَعُ إِنْ لَمْ تَفِ الأَرْضُ بِالدَّيْنِ وَزادَتْ بِهِ، ثُمَّ إِنْ أَمْكَنَ الإِنْتِفاعُ بِغَيْرِ اسْتِرْدادٍ لَمْ يَسْتَرِدَّ وَإِلاَّ فَيَسْتَرِدُّ، وَيُشْهِدُ إِنِ اتَّهَمَهُ، وَلَهُ بِإِذْنِ الْمُرْتَهِنِ ما مَنَعْناهُ، وَلَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ تَصَرُّفِ الرَّاهِنِ، فَإِنْ تَصَرَّفَ جاهِلاً بِرُجُوعِهِ فَكَتَصَرُّفِ وَكِيلٍ جَهِلَ عَزْلَهُ،**

---

کرد، یان درەختی تێدا چاند (لَمْ يُقْلَعْ قَبْلَ الأَجَلِ) ئەو درەختو خانووە-پێش هاتنی کاتی قەرزدانەوە- لانادرێن، چونکە دەگونجێ: قەرزەکە لە شتێکیتر بدرێتەوە.

بەڵام (وَبَعْدَهُ) لە دوای هاتنی کاتیقەرزەدانەوە (يُقْلَعُ) واجبە: درەختو خانووەکە لابدرێن (إِنْ لَمْ تَفِ الأَرْضُ بِالدَّيْنِ) ئەگەر نرخی زەویەکە بەرووەستی قەرزەکەی نەکردو (وَزادَتْ بِهِ) بە لادانی درەختو خانووەکەش نرخی زیاد دەبو، واتە: ئەگەر نرخی زەویەکە بەرووەستی قەرزەکەی دەکرد، یان بە لادانی ئەوانە نرخی زیاد نەدەبو، یان خاوەنەکە ئیزنیدا: زەویەکەو درەختەکە، یان زەویەکەو خانووەکە وێکڕا بفرۆشرێن، لەو حاڵەتانەدا درەختو خانووەکە لانادرێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای ئەوەی ڕەهنوەرگرەکە ڕەهنەکەی وەرگرت (إِنْ أَمْكَنَ الإِنْتِفاعُ) ئەگەر گونجا: ڕەهندەرەکە سود لە ڕەهنکراوەکەی وەربگرێ (بِغَيْرِ اسْتِرْدادٍ) بێ ئەوەی ڕەهنکراوەکە-لە ڕەهنوەرگرەکە- وەربگرێتەوە: وەك دۆشینی ئاژەڵی ڕەهنکراو، ئەوە (لَمْ يَسْتَرِدَّ) ڕەهنکراوەکە وەرناگرێتەوە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەگونجا لە لای ڕەهنوەرگرەکە سودی لێوەربگرێ: وەك وڵاغی سواریو خانوو و ئەو جۆرە شتانە، ئەو کاتە (فَيَسْتَرِدُّ) ڕەهندەرەکە-بۆ سود لێوەرگرتن- ڕەهنکراوەکە وەردەگرێتەوە، ئینجا هەر کاتێکیش سودەکەی لێوەرگرتو هیچیتر پێویستیی نەما، ئەوە دەیگەڕێنێتەوە لای ڕەهنوەرگرەکە (وَيُشْهِدُ) ڕەهنوەرگرەکەش دوو شاهید لە سەر ڕەهندەرەکە دەگرێ: کە ڕەهنکراوەکەی گەڕاندۆتەوە لایخۆی (إِنِ اتَّهَمَهُ) ئەگەر متمانەی پێنەکرد.

(وَلَهُ) بۆ ڕەهندەرەکە دروستە (بِإِذْنِ الْمُرْتَهِنِ) بە ئیزنی ڕەهنوەرگرەکە (ما مَنَعْناهُ) گشت ئەو دەستکارییو سودانەی لێمان قەدەغە کردبون (وَلَهُ) هەم بۆ ڕەهنوەرگرەکەش دروستە (الرُّجُوعُ) لە ئیزندانەکەی پەشیمان ببێتەوە (قَبْلَ تَصَرُّفِ الرَّاهِنِ) پێش دەستکاریەکانی ڕەهندەرەکە (فَإِنْ تَصَرَّفَ) جا ئەگەر ڕەهندەرەکە دەستکاریەکی ڕەهنکراوەکەی کرد (جاهِلاً بِرُجُوعِهِ) لەو حاڵەتەشدا نەیدەزانی ڕەهنوەرگرەکە پەشیمان بۆتەوە (فَكَتَصَرُّفِ وَكِيلٍ جَهِلَ عَزْلَهُ) ئەوە وەك دەستکاری وەکیلێکە: کە نەیزانیبێ لە وەکیلایەتی لادراوە، واتە: بەتاڵەو جێبەجێ ناکرێ.

وَلَوْ أَذِنَ فِي بَيْعِهِ لِيُعَجِّلَ الْمُؤَجَّلَ مِنْ ثَمَنِهِ لَمْ يَصِحَّ الْبَيْعُ، وَكَذَا لَوْ شَرَطَ رَهْنَ الثَّمَنِ فِي الأَظْهَرِ.
(فَصْلٌ) إِذا لَزِمَ الرَّهْنُ فَالْيَدُ فِيهِ لِلْمُرْتَهِنِ وَلاَ تُزالُ إِلاَّ لِلإِنْتِفاعِ كَما سَبَقَ وَلَوْ شَرَطا وَضْعَهُ عِنْدَ عَدْلٍ جازَ، أَوْ عِنْدَ اثْنَيْنِ وَنَصًّا عَلَى اجْتماعِهِما عَلَى حِفْظِهِ أَوالإِنْفِرادِ بِهِ فَذاكَ، وَإِنْ أَطْلَقا فَلَيْسَ لأَحَدِهِما الإِنْفِرادُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ ماتَ الْعَدْلُ أَوْ فُسِّقَ جَعَلاهُ حَيْثُ يَتَّفِقانِ، وَإِنْ تَشاحَّا وَضَعَهُ الْحاكِمُ عِنْدَ عَدْلٍ،

---

(وَلَوْ أَذِنَ فِي بَيْعِهِ) ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە ئیزنیدا ڕەهندەرەکە: ڕەهنکراوەکە بفرۆشێ (لِيُعَجِّلَ الْمُؤَجَّلَ مِنْ ثَمَنِهِ) تاکو لە پارەی فرۆشراوەکە زوو قەرزەکەی بداتەوە، هێشتاش کاتی دانەوەی نەهاتبو (لَمْ يَصِحَّ الْبَيْعُ) ئەو فرۆشتنە دروست نابێ (وَكَذَا) هەروەها فرۆشتنەکە دروست نابێ (لَوْ شَرَطَ رَهْنَ الثَّمَنِ) ئەگەر بە مەرجی دانابێ: پارەی فرۆشراوەکە لە جێی وی بە ڕەهن دابندرێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی فرۆشتن و کاروبارەکانی تری ڕەهنکراوەکە ﴾

(إِذا لَزِمَ الرَّهْنُ) هەر کاتێك مامڵەتی ڕەهن جێگیر بوو: بە هۆی وێدان و وەرگرتن (فَالْيَدُ فِيهِ لِلْمُرْتَهِنِ) مافی دەست بەسەرداگرتنی ڕەهنکراوەکە بۆ ڕەهنوەرگرەکەیە (وَلاَ تُزالُ) دەستی ڕەهنوەرگرەکە لە سەر ڕەهنکراوەکە لانادرێ (إِلاَّ لِلإِنْتِفاعِ) تەنها بۆ سود لێوەرگرتن نەبێ، ئینجا لە دوای سود لێوەرگرتن دەگەڕێندرێتەوە ژێر دەستی ڕەهنوەرگرەکە (كَما سَبَقَ) هەروەك تازە ڕابرا.

(وَلَوْ شَرَطا وَضْعَهُ عِنْدَ عَدْلٍ) ئەگەر هەردوو لا بە مەرجیان دانا: ڕەهنکراوەکە لە لای دادپەروەرێك دابندرێ (جازَ) دروستە، هەروەها ئەگەر هەردوو لا ڕێك بکەون کە لە لای ڕەهندەرەکە دابندرێ، ئەوەش دروستە.

(أَوْ عِنْدَ اثْنَيْنِ) یان بە مەرجیان دانا: لە لای دوو دادپەروەران دابندرێ و (وَنَصًّا عَلَى اجْتِماعِهِما عَلَى حِفْظِهِ) هەردوو لا دەقی ئەو مەرجەیان دانا: کە هەردوو دادپەروەرەکان وێکرا بیپارێزن (أَوالإِنْفِرادِ بِهِ) یان تەنها تەنها بیپارێزن (فَذاكَ) ئەوە دیارەو بەگوێرەی مەرجەکە ڕەفتار دەکرێ، بەڵام (وَإِنْ أَطْلَقا) ئەگەر بە بێهیچ مەرجێك دایاننا (فَلَيْسَ لأَحَدِهِما الإِنْفِرادُ) ئەوە هیچیکیان مافی نیە بە تەنها بیپارێزێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَلَوْ ماتَ الْعَدْلُ) جا ئەگەر دادپەروەرەکە مرد (أَوْ فُسِّقَ) یان بووە فاسق، ئەو کاتە (جَعَلاهُ حَيْثُ يَتَّفِقانِ) بۆ لای کێ ڕێك بکەون لە لای ئەوی دایدەنێن، بەڵام (وَإِنْ تَشاحَّا) ئەگەر هەردوو لا بووە کێشەیان، ئەو کاتە (وَضَعَهُ الْحاكِمُ عِنْدَ عَدْلٍ) دادوەر لە لای دادپەروەرێك دایدەنێ، تاکو کێشەکە ببڕێتەوە.

وَيَسْتَحِقُّ بَيْعَ الْمَرْهُونِ عِنْدَ الْحاجَةِ، وَيُقَدَّمُ الْمُرْتَهِنُ بِثَمَنِهِ وَيَبِيعُهُ الرَّاهِنُ أَوْ وَكِيلُهُ بِإِذْنِ الْمُرْتَهِنِ، فَإِنْ لَمْ يَأْذَنْ قالَ لَهُ الْحاكِمُ: تَأْذَنُ أَوْ تُبْرِئُ، وَلَوْ طَلَبَ الْمُرْتَهِنُ بَيْعَهُ فَأَبَى الرَّاهِنُ أَلْزَمَهُ الْقاضِي قَضاءَ الدَّيْنِ أَوْ بَيْعَهُ، فَإِنْ أَصَرَّ باعَهُ الْحاكِمُ، وَلَوْ باعَهُ الْمُرْتَهِنُ بِإِذْنِ الرَّاهِنِ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ باعَ بِحَضْرَتِهِ صَحَّ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ شُرِطَ أَنْ يَبِيعَهُ الْعَدْلُ جازَ، وَلاَ يُشْتَرَطُ مُراجَعَةُ الرَّاهِنِ فِي الأَصَحِّ، فَإِذا باعَ فَالثَّمَنُ عِنْدَهُ مِنْ ضَمانِ الرَّاهِنِ

---

(وَيَسْتَحِقُّ بَيْعَ الْمَرْهُونِ) ڕەهندەرەکە مافی هەیە ڕەهنکراوەکە بفرۆشێ (عِنْدَ الْحاجَةِ) هەر کاتێ پێویستی بە فرۆشتنی هەبێ: بۆ قەرزدانەوەکە، یان لە ترسی خراپبوونی (وَيُقَدَّمُ الْمُرْتَهِنُ بِثَمَنِهِ) ئینجا کە فرۆشرا، ڕەهنوەرگرەکە وەپێش گشت خاوەن قەرزەکان دێخرێو قەرزەکەی وی لە پارەی فرۆشراوەکە دەدرێتەوە.

(وَيَبِيعُهُ الرَّاهِنُ أَوْ وَكِيلُهُ) ڕەهندەرەکە، یان وەکیلەکەی وی ڕەهنکرلوەکە دەفرۆشێ (بِإِذْنِ الْمُرْتَهِنِ) بە ئیزنی ڕەهنوەرگرەکە (فَإِنْ لَمْ يَأْذَنْ) جا ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە ئیزنی نەدا ڕەهنکراوەکە بفرۆشرێ، ئەو کاتە (قالَ لَهُ الْحاكِمُ) دادوەر پێی دەڵێ: (تَأْذَنُ أَوْ تُبْرِيءُ) یان دەبێ ئیزن بدەی بفرۆشرێ، یان دەبێ گەردەنیقەرزدارەکە ئازاد بکەی لە قەرزەکەت. جا ئەگەر هەر سوور بوو، ئەو کاتە دادوەر ئیزن دەدا ڕەهندەرەکە بیفرۆشێ، یان هەر بەخۆی دەیفرۆشێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ طَلَبَ الْمُرْتَهِنُ بَيْعَهُ) ئەم جارە: ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە داوای فرۆشتنی ڕەهنکراوەکەی کرد (فَأَبَى الرَّاهِنُ) بەڵام ڕەهندەرەکە نەیفرۆشت، ئەو کاتە (أَلْزَمَهُ الْقاضِي) قازی زۆری لێدەکا: کە (قَضاءَ الدَّيْنِ) قەرزەکەی بداتەوە (أَوْ بَيْعَهُ) یان ڕەهنکراوەکە بفرۆشێ (فَإِنْ أَصَرَّ) جا ئەگەر هەر سوور بوو، ئەو کاتە (باعَهُ الْحاكِمُ) دادوەر دەیفرۆشێو لە پارەی فرۆشراوەکە قەرزەکە دەداتەوە (وَلَوْ باعَهُ الْمُرْتَهِنُ بِإِذْنِ الرَّاهِنِ) ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە—بە ئیزنی ڕەهندەرەکە— ڕەهنکراوەکەی فرۆشت، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ إِنْ باعَ بِحَضْرَتِهِ صَحَّ) ئەگەر بە ئامادەبوونی ڕەهندەرەکە فرۆشتبێتی، دروستە (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر ئامادە نەبوبێ، فرۆشتنەکە دروست نابێ.

(وَلَوْ شُرِطَ) ئەگەر لە مامڵەتیڕەهندا بە مەرج داندرابو: کە (أَنْ يَبِيعَهُ الْعَدْلُ) دادپەروەر ڕەهنکراوەکە بفرۆشێ، ئەوە (جازَ) دروستە، هەم (وَلاَ يُشْتَرَطُ مُراجَعَةُ الرَّاهِنِ) بە مەرج دانانرێ ئیزنی ڕەهندەرەکە وەربگیرێ بۆ فرۆشتنی ڕەهنکراوەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (فَإِذا باعَ) جا هەر کاتێك دادپەروەرەکە ڕەهنکراوەکەی فرۆشتو پارەکەی وەرگرت (فَالثَّمَنُ عِنْدَهُ مِنْ ضَمانِ الرَّاهِنِ) ئەوە پارەی لای دادپەروەرەکە، هەر

حَتَّى يَقْبِضَهُ الْمُرْتَهِنُ، وَلَوْ تَلِفَ ثَمَنُهُ فِي يَدِ الْعَدْلِ ثُمَّ اُسْتُحِقَّ الْمَرْهُونُ فَإِنْ شَاءَ الْمُشْتَرِي رَجَعَ عَلَى الْعَدْلِ، وَإِنْ شَاءَ عَلَى الرَّاهِنِ وَالْقَرَارُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَبِيعُ الْعَدْلُ إِلاَّ بِثَمَنِ مِثْلِهِ حَالاًّ مِنْ نَقْدِ بَلَدِهِ، فَإِنْ زَادَ رَاغِبٌ قَبْلَ انْقِضَاءِ الْخِيَارِ فَلْيَفْسَخْ وَلْيَبِعْهُ، وَمُؤْنَةُ الْمَرْهُونِ عَلَى الرَّاهِنِ، وَيُجْبَرُ عَلَيْهَا لِحَقِّ الْمُرْتَهِنِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلاَ يُمْنَعُ رَاهِنٌ مِنْ مَصْلَحَةِ الْمَرْهُونِ كَفَصْدٍ وَحِجَامَةٍ،

---

لە زامینیی ڕەھندەرەکە دەبێ (حَتَّى يَقْبِضَهُ الْمُرْتَهِنُ) تا ڕەھنوەرگرەکە پارەکەی لێوەردەگرێ.

(وَلَوْ تَلِفَ ثَمَنُهُ فِي يَدِ الْعَدْلِ) ئەگەر پارەی فرۆشراوەکە لە دەستی دادپەروەرەکەدا فەوتا (ثُمَّ اُسْتُحِقَّ الْمَرْهُونُ) ئینجا ڕەھنکراوەفرۆشراوەکەش بە ماڵی خەڵك دەرچو، ئەو کاتە (فَإِنْ شَاءَ الْمُشْتَرِي) ئەگەر کڕیارەکە حەز دەکا (رَجَعَ عَلَى الْعَدْلِ) با بگەڕێتەوە سەر دادپەروەرەکەو پارەکەی لێوەربگرێتەوە (وَإِنْ شَاءَ عَلَى الرَّاهِنِ) ئەگەر حەزیش دەکا بگەڕێتەوە سەر ڕەھندەرەکە، چونکە (وَالْقَرَارُ عَلَيْهِ) ئەنجامی بڕیارەکەش هەر لە سەر ڕەھندەرەکە جێگیر دەبێ، واتە: ئەگەر فرۆشیارەکە پارەکە لە دادپەروەرەکە وەربگرێتەوە، دادپەروەرەکەش ئەندازەی پارەکە لە ڕەھندەرەکە وەردەگرێتەوە، بەو مەرجەی کەمتەرخەمیی نەکردبێ، ئەگینا: هەر دادپەروەرەکە زامنەو بڕیارەکە لە سەر ئەو جێگیر دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَلاَ يَبِيعُ الْعَدْلُ) نابێ دادپەروەرەکە ماڵەڕەھنکراوەکە بفرۆشێ (إِلاَّ بِثَمَنِ مِثْلِهِ) تەنها دەبێ بە نرخی وێنەیخۆی بیفرۆشێو هەم (حالاً) بە پارەیەکیحازرو (مِنْ نَقْدِ بَلَدِهِ) بە پارەی وڵاتەکەی ڕەھنکراوەکەش بێ (فَإِنْ زَادَ رَاغِبٌ) جا ئەگەر-جگە لە کڕیارەکە-یەکێکیتر نرخێکی زیاتری بە ڕەھنکراوەکە دەدا (قَبْلَ انْقِضَاءِ الْخِيَارِ) پێش ئەوەی پەشیمانیی دانیشگە، یان مەرج کۆتایی بێ (فَلْيَفْسَخْ) واجبە دادپەروەرەکە مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوەو (وَلْيَبِعْهُ) هەم بەو نرخە زیادە بیفرۆشێتەوە یەکێکیان، واتە: یان زیادکەرەکە، یان کڕیارەکە، ئەگەر حەز دەکا.

(وَمُؤْنَةُ الْمَرْهُونِ) ئەرکی پاراستنو بەخێوکردنی ڕەھنکراوەکە (عَلَى الرَّاهِنِ) لە سەر ڕەھندەرەکەیە، بە (إجماع) زانایانیئیسلامو حەدیسەکەیڕابردوو (وَيُجْبَرُ عَلَيْهَا) ڕەھندەرەکە زۆری لێدەکرێ: ئەو ئەرکە بدا (لِحَقِّ الْمُرْتَهِنِ) لە بەر خاتری مافی ڕەھنوەرگرەکە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَلاَ يُمْنَعُ رَاهِنٌ مِنْ مَصْلَحَةِ الْمَرْهُونِ) نابێ ڕەھندەرەکە قەدەغە بکرێ لەو کارەی بەرژەوەندی ڕەھنکراوەکەی تێدایە (كَفَصْدٍ) وەك خوێن لێبەردانو (وَحِجَامَةٍ) خوێن لێگرتنو دەرمانکردن.

وَهُوَ أَمانَةٌ فِي يَدِالْمَرْتَهِنِ، وَلاَ يَسْقُطُ بِتَلَفِه شَيْءٌ مِنْ دَيْنِه، وَحُكْمُ فاسِدِالْعُقُود حُكْمُ صَحِيحِها فِيالضَّمان، وَلَوْ شَرطَ كَوْنُ الْمَرْهُونِ مَبِيعاً لَهُ عِنْدَالْحُلُول فَسَدَ، وَهُوَ قَبْلَ الْمَحَلِّ أَمانَةٌ، وَيُصَدَّقُ الْمُرْتَهِنُ فِي دَعْوَىالتَّلَفِ بِيَمِينِه، وَلاَ يُصَدَّقُ فِيالرَّدِّ عِنْدَالأَكْثَرِينَ، وَلَوْ وَطِيءَ الْمُرْتَهِنُ الْمَرْهُونَةَ بِلاَ شُبْهَةٍ فَزانٍ،

---

(وَهُوَ) شتیڕەهنكرلو (أَمانَةٌ فِي يَدِالْمَرْتَهِنِ) بە ئەمانەت لە دەستی ڕەهنوەرگرەكەدایە، واتە: ئەگەر فەوتا، یان عەیبدار بوو، ڕەهنوەرگرەكە نابێتە زامین، بەو مەرجەی كەمتەرخەمیی نەكردبێ، ئەگینا: دەبێتە زامین، هەروەك لە (تحفه) دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لاَيُغْلَقُ الرَّهْنُ مِنْ راهِنِه، لَهُ غُنْمُهُ وَعَلَيْهِ غُرْمُهُ﴾ رواه الدارقطني والحاكم ورجاله ثقات، نابێ ڕەهنكرلوەكە لە خاوەنەكەی قەدەغە بێ، سودی ڕەهنكراوەكە هەر بۆ خاوەنەكەیەتیو فەوتانو ئەركی بەخێوكردنی هەر لە سەر خاوەنەكەیەتی.

(وَلاَ يَسْقُطُ بِتَلَفِهِ شَيْءٌ مِنْ دَيْنِهِ) بە هۆی فەوتانی ڕەهنكراوەكە هیچ بەشێكی قەرزەكە– لە سەر ڕەهندەرەكە– لاناچێ.

(وَحُكْمُ فاسِدِالْعُقُودِ) بڕیاریشەرعی لەو مامڵەتانەی بەتاڵو دانەمەزراون (حُكْمُ صَحِيحِها) وەك بڕیاری مامڵەتەكانی دروستو دامەزراوە (فِيالضَّمانِ) لە بارەی زامین بوونو زامین نەبوون، كەوابو: مامڵەتیڕەهن دروست بوبێ، یان نا، ڕەهنوەرگرەكە نابێتە زامین، بەڵام مامڵەتی كڕینو فرۆشتن دروست بوبێ، یان نا، كڕیارەكە هەر زامین دەبێ.

جا لە سەر ئەو بنچینەیە: (وَلَوْشَرطَ) ئەگەر لە مامڵەتیڕەهندا بە مەرج داندرا: (كَوْنُ الْمَرْهُونِ مَبِيعاً لَهُ) ڕەهنكرلوەكە فرۆشرلوی ڕەهنوەرگرەكە بێ (عِنْدَالْحُلُولِ) كە كاتی دانەوەیقەرزەكە هات، ئەوە (فَسَدَا) هەردوو مامڵەتەكە بەتاڵ دەبن، واتە: ڕەهنەكە بەتاڵە، چونكە كاتی بۆ داندرلوە، فرۆشتنەكەش بەتاڵە، چونكە بە هاتنی كاتی قەرزدانەوەكەوە بەسترلوە، كەوابو: (وَهُوَقَبْلَ الْمَحِلِّ أَمانَةٌ) ئەو ڕەهنكرلوە پێش هاتنی كاتی قەرزدانەوە بە بڕیاریئەمانەت لە لایڕەهنوەرگرەكەیە، چونكە ڕەهنێكی بەتاڵە، بەڵام لە دوای هاتنی كاتیقەرزدانەوە بە بڕیاریزامینی لە لایەتی، چونكە فرۆشتنێكی بەتاڵە.

(وَيُصَدَّقُ الْمُرْتَهِنُ) باوەڕ بە ڕەهنوەرگرەكە دەكرێ (فِي دَعْوَىالتَّلَفِ) ئەگەر گوتی ڕەهنكراوەكە فەوتاوە (بِيَمِينِه) بە سوێندخواردن باوەڕی پێ دەكرێ، بەڵام (وَلاَ يُصَدَّقُ فِي الرَّدِّ) لەبارەی گەڕاندنەوەی ڕەهنكراوەكە–بۆ لای ڕەهندەرەكە– بە سوێند باوەڕی پێ ناكرێ (عِنْدَ الأَكْثَرِينَ) لە لای زۆرترینی زانایان، كەوابو: دەبی شاهیدی هەبێ.

(وَلَوْ وَطِيءَ الْمُرْتَهِنُ الْمَرْهُونَةَ) ئەگەر ڕەهنوەرگرەكە جیماعی لەگەڵ (جارية)ڕەهنكراوەكە كرد (بِلاَ شُبْهَةٍ) بە قەسدیو بێ هەڵە (فَزانٍ) ئەوە بە زیناكەر دادەندرێو سزای زینای

وَلاَ يُقبَلُ قَوْلُهُ: جهِلْتُ تَحرِيْمَهُ، إلاَّ أَنْ يَقرُبَ إسْلاَمُهُ أَوْ يَنْشأَ ببادِيَةٍ بَعِيدَةٍ عَنِ الْعُلَمَاءِ، وَإنْ وَطِيءَ بِإذْنِ الرَّاهِنِ قُبِلَ دَعْوَاهُ جَهْلَ التَّحْرِيمِ فِي الأَصَحِّ فَلاَ حَدَّ، وَيَجِبُ الْمَهْرُ إنْ أَكْرَهَهَا، وَالْوَلَدُ حُرٌّ نَسِيبٌ، وَعَلَيْهِ قِيمَتُهُ لِلرَّاهِنِ، وَلَوْ أُتْلِفَ الْمَرْهُونُ وَقُبِضَ بَدَلُهُ صَارَ رَهْناً، وَالْخَصْمُ فِي الْبَدَلِ الرَّاهِنُ، فَإنْ لَمْ يُخَاصِمْ لَمْ يُخَاصِمِ الْمُرْتَهِنُ فِي الأَصَحِّ، فَلَوْ وَجَبَ قِصَاصٌ اقْتَصَّ الرَّاهِنُ وَفَاتَ الرَّهْنُ، فَإنْ وَجَبَ الْمَالُ بِعَفْوِهِ أَوْ بِجِنَايَةِ خَطَإٍ

---

له سەره (وَلاَ يُقبَلُ قَوْلُهُ جهِلْتُ تَحْرِيمَهُ) لێی وەرناگیرێ کە بڵێ: نەمزانیوە جیماع کردن حەرامە (إلاَّ أَنْ يَقرُبَ إسْلاَمُهُ) مەگەر تازە موسوڵمان بوبێ (أَوْ يَنْشأَ ببادِيَةٍ بَعِيدَةٍ عَنِ الْعُلَمَاءِ) یان لە شوێنێکی دوور لە زانایانی ئاینی پێگەیشتبێ، لەو حاڵەتانەدا سزای زینای لە سەر لادەچێ.

(وَإنْ وَطِيءَ بِإذْنِ الرَّاهِنِ) ئەگەر بە ئیزنی ڕەهندەرەکە جیماعی لەگەڵ (جارية) ڕەهنکراوەکە کرد، ئەوە (قُبِلَ دَعْوَاهُ جَهْلَ التَّحْرِيمِ) لێی وەردەگیرێ کە بڵێ: نەمزانیوە حەرامە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: (فَلاَ حَدَّ) سزای زینای لەسەر نیە (وَيَجِبُ الْمَهْرُ) مارەیی (جارية)کەی لە سەر واجب دەبێ (إنْ أَكْرَهَهَا) ئەگەر زۆری لێکردبێ: لە سەر جیماع کردن (وَ) هەر کاتێك بە جیماع کردن سزای زینای نەکەوێتە سەر (الْوَلَدُ حُرٌّ نَسِيبٌ) ئەو منداڵەش کە لە جیماعەکەدا پەیدا دەبێ، ئازادەو منداڵی جیماعکەرەکەیە، کەوابو: (وَعَلَيْهِ قِيمَتُهُ لِلرَّاهِنِ) لە سەری واجبە: نرخی ئەو منداڵە لە تۆڵە بداتە ڕەهندەرەکە، چونکە کۆیلایەتی ئەو منداڵەی لە دەست چواندوە.

(وَلَوْ أُتْلِفَ الْمَرْهُونُ) ئەگەر ڕەهنکراوەکە فەوتێندرا (وَقُبِضَ بَدَلُهُ) تۆڵەی فەوتێندراوەکەش لە تاوانکارەکە وەرگیرا، ئەوە (صَارَ رَهْناً) ئەو وەرگیراوە لە خۆیەوە دەبێتە ڕەهنکراو لە جیاتی فەوتێندراوەکە (وَالْخَصْمُ فِي الْبَدَلِ الرَّاهِنُ) ئەو کێشەچیەی داوای تۆڵەی فەوتێندراوەکە دەکا: تەنها ڕەهندەرەکەیە، کەواتە: (فَإنْ لَمْ يُخَاصِمْ) ئەگەر ڕەهندەرەکە داوای تۆڵەی نەکرد (لَمْ يُخَاصِمِ الْمُرْتَهِنُ) نابێ ڕەهنوەرگرەکەش داوای بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو خاوەنی ڕەهنکراوەکە نیە.

(فَلَوْ وَجَبَ قِصَاصٌ) جا ئەگەر بە هۆی کوشتنی کۆیلە ڕەهنکراوەکە کوشتنەوەی لە تۆڵە واجب بو، چونکە مرۆڤکوژەکەش کۆیلە بوو، ئەو کاتە (اقْتَصَّ الرَّاهِنُ) ڕەهندەرەکە –لە تۆڵە– دەیکوژێ‌و (وَفَاتَ الرَّهْنُ) ڕەهنەکەش دەفەوتێ، چونکە هیچی لەجیاتی وەرنەگیراوە.

بەلام (فَإنْ وَجَبَ الْمَالُ) ئەگەر لەو کوشتنەدا ماڵێك واجب بو بدرێ (بِعَفْوِهِ) چونکە ڕەهندەرەکە مرۆڤکوژەکەی لە کوشتن عەفو کرد (أَوْ بِجِنَايَةِ خَطَإٍ) یان کوشتنەکە بە

لَمْ يَصِحَّ عفوُهُ عَنْهُ وَلا إبراءُ الْمُرتَهِنِ الْجانِيَ، وَلاَ يَسْرِي الرَّهْنُ إلَى زِيادَتِهِ الْمُنفَصِلَةِ كَثَمَرَةٍ وَوَلَدٍ، فَلَوْ رَهَنَ حامِلاً وَحَلَّ الأَجَلُ وَهِيَ حامِلٌ بِيعَتْ، وَإنْ وَلَدَتْهُ بِيعَ مَعَها فِي الأَظْهَرِ، فَإنْ كانَتْ حامِلاً عِنْدَالْبَيْعِ دُونَ الرَّهْنِ فالوَلَدُ لَيْسَ بِرَهْنٍ فِي الأَظْهَرِ.

(فَصْلٌ) جَنَى الْمَرْهُونُ قُدِّمَ الْمَجْنِيُّ عَلَيْهِ، فَإنْ اُقْتُصَّ أَوْ بِيعَ لَهُ بَطَلَ الرَّهْنُ،

---

هەڵە بوو، ئەو كاتە (لَمْ يَصِحَّ عفوُهُ عَنْهُ) دروست نیە ڕەهندەرەكە لەو ماڵەی عەفوی بكا، چونكە مافی ڕەهنوەرگرەكەی پێوە بەستراوە، هەم (وَلاَ إبْراءُ الْمُرْتَهِنِ الْجانِيَ) دروست نیە ڕەهنوەرگرەكەش تاوانكارەكە ئازاد بكا: نە لە كوشتنو نە لە ماڵەكە، چونكە ئەو خاوەن نیە.

(وَلاَ يَسْرِيالرَّهْنُ إلَى زِيادَتِهِ الْمُنْفَصِلَةِ) بڕیاری ڕەهن ناڕواتە لای ئەو زێدەییانەی لە ڕەهنكراوەكە جیا دەبنەوە (كَثَمَرَةٍ) وەك میوەی درەختەڕەهنكراوەكەو (وَوَلَدٍ) بێچووی ئاژەڵە ڕەهنكراوەكە، بەڵام دەڕواتە لای ئەو زێدەییانەی جیا نابنەوە: وەك قەڵەویو گەورەبوون.

(فَلَوْ رَهَنَ حامِلاً) جا ئەگەر ئاژەڵێكی ئاوسی ڕەهن كردو (وَحَلَّ الأَجَلُ) ئینجا كاتی دانەوەیقەرزەكەی هاتو (وَهِيَ حامِلٌ) ئاژەڵەكەش هەر ئاوس بوو، ئەوە (بِيعَتْ) بە ئاوسی دەفرۆشرێ تاكو قەرزەكەی لێ بدرێتەوە.

(وَ) هەروەها (إنْ وَلَدَتْهُ) ئەگەر ئاژەڵەكە زابێ (بِيعَ مَعَها) بێچووەكەی لەگەڵ خۆی دەفرۆشرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام (فَإنْ كانَتْ حامِلاً عِنْدَ الْبَيْعِ) ئەگەر لە كاتی فرۆشتنیدا ئاژەڵەكە ئاوس بوو (دُونَ الرَّهْنِ) نەك لە كاتیڕەهنكردنیدا، ئەو كاتە (فَالْوَلَدُ لَيْسَ بِرَهْنٍ) بێچووەكەی ناو زگی بە ڕەهنكراو دانانرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە لە دوای ڕەهنكردندا پەیدا بووە، كەوابو: تا زگەكەی دانەنێ نابێ بفرۆشرێ، مەگەر ڕەهندەرەكە ڕازی بێ، ئەو كاتە بە ئاوسی دەفرۆشرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی فەوتانو بەرهەڵبوونی ڕەهنكراوەكە ﴾

(جَنَىالْمَرْهُونُ) هەر كاتێك كۆیلە ڕەهنكراوەكە تاوانێكی دەستدرێژیی كردە سەر ئادەمیزادێك: بە كوشتن، یان بە لە ناوبردنی ئەندامێك، ئەوە (قُدِّمَ الْمَجْنِيُّ عَلَيْهِ) ئادەمیزادەكەی دەستدرێژیی كراوەتە سەر، وەپێش ڕەهنوەرگرەكە دێخرێ بۆ تۆڵە وەرگرتن، كەوابو: (فَإنْ اُقْتُصَّ) ئەگەر كۆیلە تاوانكارەكە -لە تۆڵە- كوژرا (أَوْ بِيعَ لَهُ) یان بۆ تۆڵەیتاوانەكە فرۆشرا (بَطَلَ الرَّهْنُ) ڕەهنەكە بەتاڵ دەبێتەوە، چونكە ڕەهنكراوەكە نەماوە.

وَإِنْ جَنَى عَلَى سَيِّدِه فَاقْتَصَّ بَطَلَ، وَإِنْ عُفِيَ عَلَى مَالٍ لَمْ يَثْبُتْ عَلَى الصَّحِيحِ فَيَبْقَى رَهْناً، وَإِنْ قَتَلَ مَرْهُوناً لِسَيِّدِه عِنْدَ آخَرَ فَاقْتَصَّ بَطَلَ الرَّهْنَان، وَإِنْ وَجَبَ مَالٌ تَعَلَّقَ بِهِ حَقُّ مُرْتَهِنِ الْقَتِيلِ فَيُباعُ وَثَمَنُهُ رَهْنٌ، وَقِيلَ يَصِيرُ رَهْناً، فَإِنْ كانا مَرْهُونَيْنِ عِنْدَ شَخْصٍ بِدَيْنٍ واحِدٍ نَقَصَتِ الْوَثِيقَةُ، أَوْ بِدَيْنَيْنِ وَفِي نَقْلِ الْوَثِيقَةِ غَرَضٌ نُقِلَتْ، وَلَوْ تَلِفَ مَرْهُونٌ بِآفَةٍ بَطَلَ،

---

(وَإِنْ جَنَى عَلَى سَيِّدِهِ) ئەگەر كۆیلە ڕەهنكراوەكە دەستدرێژیی كردە سەر گەورەكەی خۆیو كوشتی، یان ئەندامێكی لە ناوبرد (فَاقْتُصَّ) ئینجا –لە تۆڵە– كوژرا، یان ئەندامەكەی لێكراوە (بَطَلَ) ڕەهنەكە بەتاڵ دەبێتەوە، بەلام (وَإِنْ عُفِيَ عَلَى مَالٍ) ئەگەر لە تاوانكارەكە بوردرا بەو مەرجەی لە خوێنیتاوانەكە هەندێك مال بدا (لَمْ يَثْبُتْ) ئەو ماڵەی ناكەوێتە سەر (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، كەوابو: (فَيَبْقَى رَهْناً) كۆیلە تاوانكارەكە هەر بە ڕەهنكراوی دەمێنێتەوە.

(وَإِنْ قَتَلَ مَرْهُوناً لِسَيِّدِهِ عِنْدَ آخَرَ) ئەگەر ئەم كۆیلەڕەهنكراوە كۆیلەیەكیتریڕەهنكراوی كوشت: كە ئەویش گەورەكەیخۆی لە لای یەكێكیتر ڕەهنی كردبو (فَاقْتُصَّ) ئینجا گەورەكەش تاوانكارەكەی –لە تۆڵە– كوشت، ئەوە (بَطَلَ الرَّهْنَانِ) هەردووك ڕەهنەكان بەتاڵ دەبنەوە، چونكە هەردووك كۆیلەكان فەوتان، بەلام (وَإِنْ وَجَبَ مَالٌ) ئەگەر بە هۆی تاوانەكە ماڵ واجب بو: وەك لە كوشتن لێی ببوردرێ لە بەرامبەر ئەو ماڵە، ئەو كاتە (تَعَلَّقَ بِهِ حَقُّ مُرْتَهِنِ الْقَتِيلِ) مافی ڕەهنوەرگرەكەیكوژراوەكە بەو ماڵەوە دەبەسترێ، كەوابو: (فَيُبَاعُ) كۆیلەتاوانكارەكە دەفرۆشرێو (وَثَمَنُهُ رَهْنٌ) پارەكەشی دەبێتە ڕەهنكراو لە جێی كوژراوەكە (وَقِيلَ يَصِيرُ رَهْناً) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: خودی تاوانكارەكە لە جێی كوژراوەكە دەبێتە ڕەهنكراو، واتە: نافرۆشرێ.

(فَإِنْ كانا مَرْهُونَيْنِ عِنْدَ شَخْصٍ) جا ئەگەر تاوانكارەكەو كوژراوەكە هەردووكیان لەلای مرۆڤێك ڕەهن كرابون (بِدَيْنٍ واحِدٍ) بۆ یەك قەرز، ئەوە (نَقَصَتِ الْوَثِيقَةُ) تەنها بارمتەییەكە كەم دەبێتەوە، واتە: ڕەهنەكە بەتاڵ نابێتەوە.

(أَوْ بِدَيْنَيْنِ) یان بۆ دوو قەرز هەردووكیان ڕەهن كرابونو (وَفِي نَقْلِ الْوَثِيقَةِ غَرَضٌ) گواستنەوەی بارمتەیی قەرزی تاوانكارەكە بۆ قەرزی كوژراوەكە سودێكی ڕەهنوەرگرەكەی تێدا بوو (نُقِلَتْ) ئەو كاتە تاوانكارەكە –بە بارمتەیی– دەگوازرێتەوە لای قەرزی كوژراوەكە، واتە: دەفرۆشرێو پارەكەی لە جێی كوژراوەكە دەبێتە ڕەهن.

(وَلَوْ تَلِفَ مَرْهُونٌ بِآفَةٍ) ئەگەر ڕەهنكراوەكە بە هۆی ڕوداوێك –لە خۆیەوە– فەوتا (بَطَلَ) مامڵەتی ڕەهن بەتاڵ دەبێتەوە.

وَيَنْفَكُّ بِفَسْخِ الْمُرْتَهِنِ وَبِالْبَراءَةِ مِنَ الدَّيْنِ، فَإِنْ بَقِيَ شَــيْءٌ مِنْــهُ لَــمْ يَنْفَــكَّ شَــيْءٌ مِنَ الرَّهْنِ، وَلَوْ رَهَنَ نِصْفَ عَبْدٍ بِدَيْنٍ وَنِصْفَهُ بِآخَرَ فَبرِئَ مِنْ أَحَدِهِما انْفَــكَّ قِسْــطُهُ، وَلَوْ رَهَناهُ فَبرِئَ أَحَدُهُما انْفَكَّ نَصِيبُهُ.

(فَصْلٌ) اخْتَلَفا فِي الرَّهْنِ أَوْ قَدْرِهِ صُدِّقَ الرَّاهِنُ بِيَمِينِهِ إِنْ كانَ رَهْنَ تَبَرُّعٍ، وَإِنْ شُــرِطَ فِي بَيْعٍ تَحالَفا،

---

(وَ) هەروەها (يَنْفَكُ) مامڵەتی ڕەهن هەڵدەوەشێتەوەو ڕەهنکراوەکە بەرەڵ دەبێ (بِفَسْخِ الْمُرتَهِنِ) بە هەڵوەشاندنەوەی ڕەهنوەرگرەکە، هەرچەندە ڕەهندەرەکەش ڕازی نەبێ.

(وَ) هــەروەها مامڵــەتی ڕەهــن هەڵدەوەشــێتەوە (بِـالْبَراءَ ةِ مِـنَ الـدَّيْنِ) بـە ئــازادبوونی قەرزدارەکە لە هەموو قەرزەکە: وەك بـە خـۆی هـەموو قەرزەکـە بداتـەوە، یـان یـەکێکی‌تر بۆی بداتەوە، یان خاوەن قەرزەکە گەردەنی ئازاد بکا لە هەموو قەرزەکە.

بەلام (فَإِنْ بَقِيَ شَيْءٌ مِنْهُ) ئەگەر بەشێکی کەم قەرزەکـەی لـە سـەر مابێ، ئـەو کاتـە (لَـمْ يَنْفَكَّ شَيْءٌ مِنَ الرَّهْنِ) هـیچ بەشـێك لـە ڕەهنکراوەکـە بەرەڵ نابـێو گشـتی بـە ڕەهنکـراو دەمێنێتەوە تا هەموو قەرزەکە دەداتەوە.

(وَلَوْ رَهَنَ نِصْفَ عَبْدٍ بِدَيْنٍ) ئەگەر نیوەی کۆیلەیەکی، یان نیوەی بـاغێکی کـردە ڕەهنـی قەرزێك (وَنِصْفَهُ بِآخَرَ) نیوەکەی‌تریشی کردە ڕەهنی‌قەرزێکی‌تر (فَبرِئَ مِنْ أَحَدِهِما) ئینجا قەرزدارەکە لە قەرزێکیان ئازاد بو، ئەوە (انْفَكَّ قِسْطُهُ) بەشی قـەرزە ئازادبووەکەشی لـە ڕەهنکراوەکە بەرەڵ دەبـێو بەشـی قەرزەکەی‌تریشـی هـەر بـە ڕەهـن دەمێنێتـەوە (وَلَـوْ رَهَنَـاهُ) ئەگـەر دوو کـەس بـاغێکی هاوبەشـیان لـە ڕەهـنی قــەرزێك دانـا: کـە لـە سـەر هەردووکیان بوو (فَبَرِئَ أَحَدُهُما) ئینجا یەکێکیان لە قەرزەکەی‌خۆی ئازاد بـو، ئـەوە (انْفَكَّ نَصِيبُهُ) بەشە باغەکەی خۆیشی لە ڕەهنەکە بەرەڵ دەبێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی کێشەی ڕەهندەرو ڕەهنوەرگر﴾

(اخْتَلَفا فِيالرَّهْنِ) هەر کاتێك ڕەهندەرەکـەو ڕەهنوەرگرەکە بـووە کێشـەیان لـە بنچینـەی ڕەهنەکـەدا، ئەمـە دەیگـوت: ڕەهنـت کردومـێ. ئـەویش دەیگـوت: ڕەهـنم نـەکردوە. (أَوْ قَدْرِهِ) یـان لـە ئەنـدازەی ڕەهنەکـە بـووە کێشـەیان، ئەمـە دەیگـوت: ڕەهنکراوەکـە دوو خـانووە. ئـەویش دەیگـوت تـەنها یـەك خـانووە. لـەو مەسـەلانەدا-ئەگـەر شـاهید نـەبو- (صُدِّقَ الـرَّاهِنُ بِيَمِينِـهِ) ڕەهندەرەکـە سـوێند دەخـواو بـاوەڕی پـێدەکرێ (إِنْ كـانَ رَهْـنَ تَبَرُّعٍ) ئەگەر ڕەهنەکە بە پیـاوەتی کرابـێ، واتـە: لـە مامڵـەتی کڕینو فرۆشتندا بـە مـەرج دانەندرابێ، بەلام (وَإِنْ شُرِطَ فِي بَيْعٍ) ئەگەر ڕەهنەکـە پیـاوەتی نـەبو، بـەڵکو لـە مامڵـەتی فـرۆشتندا بە مـەرج داندرابو، ئەو کاتە (تَحالَفا) هەردووکیان سوێند بۆ یـەکتری دەخـۆن:

وَلَو ادَّعَى أَنَّهُما رَهَناهُ عَبْدَهُما بِمأةٍ وَصَدَّقَهُ أَحَدُهُما فَنَصيبُ الْمُصَدِّقِ رَهْنٌ بِخَمْسينَ، وَالْقَوْلُ في نَصيبِ الثّاني قَوْلُهُ بِيَمينِه، وَتُقْبَلُ شَهادَةُالْمُصَدِّقِ عَلَيْهِ، وَلَو اخْتَلَفا في قَبْضِه: فَإِنْ كانَ في يَدِالرَّاهِنِ أَوْ في يَدِالْمُرْتَهِنِ وَقالَ الرَّاهِنُ غَصَبْتَهُ صُدِّقَ الرَّاهِنُ بِيَمينِه، وَكَذا إِنْ قالَ أَقْبَضْتُهُ عَنْ جِهَةٍ أُخْرَى فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ أَقَرَّ بِقَبْضِه ثُمَّ قالَ لَمْ يَكُنْ إِقْرارِي عَنْ حَقيقَةٍ فَلَهُ تَحْليفُهُ، وَقيلَ لايُحَلِّفُهُ إِلاَّ أَنْ يَذْكُرَ لإِقْرارِه تَأْويلاً

---

کە قسەکەی خۆی ڕاستەو قسەی بەرامبەرەکەی ڕاست نیە. ئینجا ڕەهنەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە.

(وَلَو ادَّعَى أَنَّهُما رَهَناهُ عَبْدَهُما بِمأةٍ) ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە داوای کرد: کە ئەم دوو کەسانە کۆیلەیەکی خۆیان-لە لای ئەو- کردۆتە ڕەهنی سەد دیناری قەرز (وَصَدَّقَهُ أَحَدُهُما) لەو دووانەش تەنها یەکێکیان گوتی: باوەڕی پێدەکەمو ڕاست ئەکا. ئەویتریش گوتی: ڕاست ناکا. ئەوە (فَنَصيبُ الْمُصَدِّقِ رَهْنٌ بِخَمْسينَ) بەشی باوەڕکەرەکە دەبێتە ڕەهنی پەنجا دینار: کە نیوەی قەرزەکەیە (وَالْقَوْلُ في نَصيبِ الثّاني) ئەو قسەیەی کە وەردەگیرێ لەبارەی بەشەکەی هاوبەشیدووەم (قَوْلُهُ بِيَمينِه) هەر قسەکەیخۆیەتیو بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ کە بڵێ: من ڕەهنم نەکردوە. بەڵام (وَتُقْبَلُ شَهادَةُ الْمُصَدِّقِ عَلَيْهِ) شاهیدی باوەڕکەرەکەش وەردەگیرێ لە سەر ئەو هاوبەشەیدووەم، جا ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە لەگەڵ ئەو شاهیدیە سوێند بخوا، یان شاهیدێکیتریشی هەبو، ئەو کاتە گشت ماڵە هاوبەشەکە دەبێتە ڕەهن.

(وَلَو اخْتَلَفا في قَبْضِه) ئەگەر ڕەهندەرەکەو ڕەهنوەرگرەکە لە بارەی وەرگرتنی ڕەهنکراوەکە بووە کێشەیان، ئەوە (فَإِنْ كانَ في يَدِالرَّاهِنِ) ئەگەر ڕەهنکراوەکە لە دەستی ڕەهندەرەکەدا بوو (أَوْ في يَدِالْمُرْتَهِنِ) یان لە دەستی ڕەهنوەرگرەکەدا بوو، بەلام (وَقالَ الرَّاهِنُ غَصَبْتَهُ) ڕەهندەرەکە گوتی: داگیرت کردوە. لە هەردوو مەسەلەدا (صُدِّقَ الرَّاهِنُ بِيَمينِه) ڕەهندەرەکە سوێند دەدرێو باوەڕی پێدەکرێ (وَكَذا) هەروەها ڕەهندەرەکە بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ (إِنْ قالَ) ئەگەر گوتی: (أَقْبَضْتُهُ عَنْ جِهَةٍ أُخْرَى) ئەو شتەم لە ڕوویەکیترەوە داوەتە دەست تۆ: وەك ئەمانەت، یان بەکرێدان، یان بە خواستن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ أَقَرَّ بِقَبْضِه) ئەگەر ڕەهندەرەکە دانینا: کە ڕەهنوەرگرەکە ڕەهنکراوەکەی وەرگرتوە (ثُمَّ قالَ لَمْ يَكُنْ إِقْرارِي عَنْ حَقيقَةٍ) ئینجا گوتی ئەو دانهێنانەم بە ڕاستی نەبو، ئەو کاتە (فَلَهُ) ڕەهندەرەکە مافی هەیە (تَحْليفُهُ) ڕەهنوەرگرەکە سوێند بدا: کە ڕەهنکراوەکەی وەرگرتوە (وَقيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لا يُحَلِّفُهُ إِلاَّ أَنْ يَذْكُرَ لإِقْرارِه تَأْويلاً) نابێ

كَقَوْلِه: أَشْهَدْتُ عَلَى رَسْمِ الْقَبالَة، وَلَوْ قالَ أَحَدُهُما جَنَى الْمَرْهُونُ وَأَنْكَرَ الآخَرُ صُدِّقَ الْمُنْكِرُ بِيمِينه، وَلَوْ قالَ الرَّاهِنُ جَنَى قَبْلَ الْقَبْضِ فَالأَظْهَرُ تَصْديقُ الْمُرْتَهِنِ بِيَمِينه فِي إِنْكارِه، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِذَا حَلَفَ غَرِمَ الرَّاهِنُ لِلْمَجْنِيِّ عَلَيْه، وَأَنَّهُ يَغْرَمُ الأَقَلَّ مِنْ قِيمَةِ الْعَبْدِ وَأَرْشِ الْجِنايَة، وَأَنَّهُ لَوْ نَكَلَ الْمُرْتَهِنُ رُدَّت الْيَمِينُ عَلَى الْمَجْنِيِّ عَلَيْه لاَ عَلَى الرَّاهِنِ، فَإِذَا حَلَفَ بِيعَ فِي الْجِنايَة، وَلَوْ أَذِنَ فِي بَيْعِ الْمَرْهُونِ فَبِيعَ وَرَجَعَ عَنِ الإِذْنِ وَقالَ رَجَعْتُ قَبْلَ الْبَيْعِ وَقالَ الرَّاهِنُ بَعْدَهُ، فَالأَصَحُّ

---

سوێندی بدا، ئەگەر ڕەهندەرەکە بۆ دانهێنانەکەیخۆی واتەیەکی گونجاو بڵێ (كَقَوْلِه) وەك بڵێ: (أَشْهَدْتُ عَلَى رَسْمِ الْقَبالَةِ) ئەو دانهێنانەم شاهیدگرتن بوو لە سەر ئەو نووسراوەی پێش بەستنی مامڵەتەکە دەنوسرێو ئیمزا دەکرێ، واتە: ئینجا لە دوای نوسینیشاهیدیو ئیمزاکردن، مامڵەتەکە بە ڕێگایەکیشەرعی دەبەسترێ.

(وَلَوْ قالَ أَحَدُهُما جَنَى الْمَرْهُونُ) ئەگەر یەکێکیان گوتی: کۆیلە ڕەهنکراوەکە تاوانێکی دەستدرێژیی کردوە (وَأَنْكَرَ الآخَرُ) ئەویتریش گوتی وا نیە (صُدِّقَ الْمُنْكِرُ بِيَمِينِه) ئەوەی دەڵێ وا نیە، سوێند دەدرێو باوەڕی پێ دەکرێ (وَلَوْ قالَ الرَّاهِنُ) ئەگەر ڕەهندەرەکە گوتی (جَنَى قَبْلَ الْقَبْضِ) پێش وەرگرتن دەستدرێژیی کردوە. ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (تَصْدِيقُ الْمُرْتَهِنِ بِيَمِينِهِ فِي إِنْكارِهِ) ڕەهنوەرگرەکە سوێند دەخواو باوەڕی پێدەکرێ کە بڵێ: نەمزانیوە دەستدرێژیی کردبێ.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ إِذَا حَلَفَ) هەر کاتێك ڕەهنوەرگرەکە سوێندی خوارد (غَرِمَ الرَّاهِنُ لِلْمَجْنِيِّ عَلَيْهِ) دەبێ ڕەهندەرەکە تۆڵەی دەستدرێژیەکە بداتە ئەو کەسەی دەستدرێژیی کراوەتە سەر (وَأَنَّهُ يَغْرَمُ الأَقَلَّ مِنْ قِيمَةِ الْعَبْدِ وَأَرْشِ الْجِنايَةِ) کامەیان کەمترە: لە نرخی کۆیلەکەو لە تۆڵەی تاوانەکە، ئەو کەمترە لە تۆڵە دەدا (وَأَنَّهُ لَوْ نَكَلَ الْمُرْتَهِنُ) ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە سوێندی نەخوارد (رُدَّتِ الْيَمِينُ عَلَى الْمَجْنِيِّ عَلَيْهِ) سوێندەکە دەگەڕێندرێتەوە سەر ئەو کەسەی دەستدرێژیی کراوەتە سەر (لاَ الرَّاهِنِ) ناگەڕێندرێتەوە سەر ڕەهندەرەکە (فَإِذَا حَلَفَ) جا هەر کاتێك سوێندی خوارد (بِيعَ فِي الْجِنايَةِ) کۆیلەکە بە هۆی تاوانەکە دەفرۆشرێو تۆڵەی تاوانەکەی لە پارەکەی دەدرێ.

(وَلَوْ أَذِنَ فِي بَيْعِ الْمَرْهُونِ) ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە ئیزنیدا: ڕەهندەرەکە ڕەهنکراوەکە بفرۆشێ (فَبِيعَ) ئینجا فرۆشرا (وَرَجَعَ عَنِ الإِذْنِ) ئەویش لە ئیزندانەکەی پەشیمان بۆوەو (وَقالَ رَجَعْتُ قَبْلَ الْبَيْعِ) گوتی: پێش فرۆشتنی لە ئیزندانەکەم پەشیمان بومەوە، کەواتە: فرۆشتنەکەی بەتاڵەو دروست نەبوە (وَقالَ الرَّاهِنُ بَعْدَهُ) ڕەهندەرەکەش گوتی: دوای فرۆشتن پەشیمان بویەوە، کەواتە: فرۆشتنەکەی دروست بووە، ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە

تَصْديقُ الْمُرْتَهِنِ، وَمَنْ عَلَيْهِ أَلْفانِ بِأَحَدِهِما رَهْنٌ فَأَدَى أَلْفاً وَقالَ أَدَّيْتُهُ عَنْ أَلْفِ الرَّهْنِ صُدِّقَ بِيَمينِه، وَإِنْ لَمْ يَنْوِ شَيْئاً جَعَلَهُ عَمّا يَشاءُ، وَقيلَ يُقَسَّطُ.
(فَصْلٌ) مَنْ ماتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ تَعَلَّقَ بِتَرِكَتِه تَعَلُّقَهُ بِالْمَرْهُونِ، وَفي قَوْلٍ كَتَعَلُّقِ الأَرْشِ بِالْجانِي، فَعَلَى الأَظْهَرِ يَسْتَوِي الدَّيْنُ الْمُسْتَغْرِقُ وَغَيْرُهُ فِي الأَصَحِّ،

---

فەرموودەی ڕاستتر: (تَصْديقُ الْمُرْتَهِنِ) ڕەهنوەرگرەکە سوێنددەخواو باوەڕی پێ دەکرێ.
(وَمَنْ عَلَيْهِ أَلْفانِ) هەر کەسێك دوو هەزار دینار قەرزی لە سەر بوو (بِأَحَدِهِما رَهْنٌ) بۆ هەزارێکیان ڕەهنێکی دانابو (فَأَدَى أَلْفاً) ئینجا قەرزی هەزارێکی دایەوەو (وَقالَ أَدَّيْتُهُ عَنْ أَلْفِ الرَّهْنِ) گوتی: ئەوەی داومەتەوە، لە جیاتی هەزارەکەی ڕەهن بۆکراو بوو، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمينِهِ) ڕەهندەرەکە سوێند دەخواو باوەڕی پێ دەکرێ، کەوابو: ڕەهنکراوەکە بەرهەڵ دەبێ (وَإِنْ لَمْ يَنْوِ شَيْئاً) ئەگەر لە حاڵەتی دانەوەی ئەو هەزارە، مەبەستی هیچیانی نەبو، ئەو کاتە (جَعَلَهُ عَمّا يَشاءُ) بە دڵیخۆی لە جیاتی کامەیان حەز دەکا، بڕیاری بۆ دەدا (وَقيلَ يُقَسَّطُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەو هەزارە لە نێوان هەردوو هەزارەکەدا بەش دەکرێو لە هەر یەکەو نیوەی لە سەر لادەچێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پەیوەندی قەرز بە میراتەوە ﴾

(مَنْ ماتَ) هەر کەسێك مرد (وَعَلَيْهِ دَيْنٌ) لەو حاڵەتەشدا قەرزی لە سەر بوو (تَعَلَّقَ بِتَرِكَتِهِ) ئەو قەرزە بە میراتەکەیەوە دەبەسترێو میراتەکەش دەبێتە ڕەهنکراوێکی شەرعی (تَعَلُّقَهُ بِالْمَرْهُونِ) وەك بەسترانی قەرز بە ماڵێکی ڕەهنکراویدەستکرد: کە بە درێژی باسمان کرد (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: ئەو قەرزە بە میراتەکەوە دەبەسترێ (كَتَعَلُّقِ الأَرْشِ بِالْجانِي) وەك بەسترانی تۆڵەیکوشتن بە گەردەنی ئەو کۆیلەیەی مرۆڤەکەی کوشتوە.
(فَعَلَى الأَظْهَرِ) جا لە سەر فەرموودەی بەهێزتر: (يَسْتَوِي الدَّيْنُ الْمُسْتَغْرِقُ وَغَيْرُهُ) یەکسانە: ئەو قەرزەی هەموو میراتەکە وەبنەخۆی دەگرێو ئەوەی لە میراتەکە کەمترە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەواتە: ئەگەر بەشێك لە قەرزەکە لە سەر مردووەکە مابێ، حەرامەو دروست نابێ: میراتگر دەستکاری میراتەکە بکا، جیاوازی نیە: میراتگرەکان زۆر بن، یان تەنها یەك کەس بێ، بەڵام هەر کاتێك میراتگرێك -بەگوێرەی بەشە میراتەکەی خۆی- بەشە قەرزەکەیخۆی دایەوە، ئەوە بەشە میراتەکەی وی لە ڕەهن بەرهەڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
﴿ ئاگاداری ﴾: لەم باسەدا جیاوازی قەرزی ئادەمیزادو قەرزی خوای گەورە نیە: وەك زەکاتو کەففارەتو نەزرو حەج، جا -بۆ وێنە- ئەگەر زەکاتو قەرزی ئادەمیزاد وێکڕا لە سەر مردووێك کۆبونەوە، واجبە: زەکاتەکە پێشدا بدرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

وَلَوْ تَصرَّفَ الْوارثُ وَلاَ دَيْنَ ظاهرٌ فَظَهَرَ دَيْنٌ بِرَدِّ مَبيعٍ بعَيْب فَالأَصَحُّ أَنَّـهُ لاَ يَتَبَيَّنُ فَسادُ تَصرُّفه لَكنْ إنْ لَمْ يُقْضَ الدَّيْنُ فُسِخَ، وَلاَ خلاَفَ أَنَّ للْوارث إمْساكَ عَيْنِ التَّركَة وَقَضاءَ الدَّيْنِ منْ ماله، وَالصَّحيحُ أَنَّ تَعلُّقَ الدَّيْنِ بِالتَّركَةِ لاَ يَمْنَعُ الإرْثَ فَـلاَ يَتعلَّـقُ بِزَوائد التَّركَة كَكَسْبٍ وَنَتاجٍ.

---

﴿فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ بِالْقَضاءِ﴾ رواه الشيخان، قەرزی خوای گەورە لەپێشترە بدرێتەوە. هەروەك لە باسی زەکاتی قەرزدا ڕوونمان کردەوە، هەروەها ئەگەر یەکێك مردبێ‌و لە ژیانیا حەجی لە سەر واجب بوبێ، ئەوە میراتگرەکەی قەدەغە دەکرێ: دەستکاری میراتەکە بکا، تا حەج بۆ مردووەکەی دەکرێ -هەروەك چەند زانایەك وەهایان فەرمووە- یان تا کرێی حەج بۆکردنی تەسلیمی یەکێك دەکرێ تاکو حەجی بۆ بکا، هەروەك چەند زانایەکی‌تر وەهایان فەرموەو لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَلَوْ تَصرَّفَ الْوارثُ) ئەگەر میراتگرەکە دەستکاریەکی میراتەکەی کرد: وەك فرۆشتن (وَلاَ دَيْنَ ظاهرٌ) لەو حاڵەتەشدا هیچ قەرزێك دیار نەبو (فَظَهَرَ دَيْنٌ) ئینجا لە پاشان قەرزێك پەیدا بوو (بِرَدِّ مَبيعٍ بِعَيْبٍ) بە هۆی گەڕاندنەوەی فرۆشراوێکی‌عەیبدار: کە لە ژیانی مردووەکەدا پارەکەی نەمابو، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يَتَبَيَّنُ فَسادُ تَصرُّفِهِ) بەوە ئاشکرا نابێ: کە دەستکاریەکەی بەتاڵە (لَكنْ إنْ لَمْ يُقْضَ الدَّيْنُ) بەڵام ئەگەر ئەو قەرزە پەیدابووە نەدراوە (فُسِخَ) دەستکاریەکەی‌میراتگرەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە، تاکو خاوەن قەرزەکە بگاتە مالی خۆی.

ئینجا بزانە: ئەگەر میراتگرەکە بە ئیزنی خاوەن قەرزەکان -بۆ قەرزدانەوە- میراتەکە بفرۆشێ، ئەو کاتە فرۆشتنەکەی دروست دەبێ، بەو مەرجەی فرۆشتنەکە بە نرخی هاووێنە بێ‌و بە ئیزنی گشت خاوەن قەرزەکان بێ، جا ئەگەر یەکێکیان ئامادە نەبو، ئەو کاتە بە ئیزنی قازی دەیفرۆشێ، هەروەك لە (تحفه)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلاَ خلاَفَ) زانایان هیچ جیاوازییان لەوەدا نیە: کە (أَنَّ لِلْوارِثِ) بۆ میراتگرەکە دروستە: (إمْساكَ عَيْنِ التَّركَةِ) خودی میراتەکە بۆ خۆی وەربگرێ‌و (وَقَضاءَ الدَّيْنِ منْ مالِهِ) لە مالّی خۆیشی قەرزەکەی سەر مردووەکە بداتەوە (وَالصَّحيحُ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ تَعلُّقَ الدَّيْنِ بِالتَّركَةِ) ئەو بەسترانەی قەرزەکە بە میراتەکەوە (لاَ يَمْنَعُ الإرْثَ) ڕێگای میراتگرتن ناگرێ، واتە: میراتەکە دەبێتە ملکی‌میراتگرەکان، کەوابو: (فَلاَ يَتَعلَّقُ بِزَوائدِالتَّركَةِ) قەرزەکە بە زێدەبیەکانی میراتەکەوە نابەسترێتەوە (كَكَسْبٍ وَنَتاجٍ) وەك کرێی کارکردنی بە میراتگراوەکەو بێچووەکانی ئاژەڵی بەمیراتگراو، چونکە ئەوانە -لە دوای مردن- لە ملکی میراتگرەکەدا پەیدا بوینەو گشتی دەبنە ملکی میراتگرەکە.

## (كِتابُ التَّفْلِيسِ)

## مَنْ عَلَيْهِ دُيُونٌ حالَّةٌ زائِدَةٌ عَلَى مالِهِ يُحْجَرُ عَلَيْهِ بِسُؤالِ الْغُرَماءِ،

﴿ **پاشكۆ** ﴾ يەكەم: هەر كاتێك شتێكی دۆزیەوەو كردیە ملكی خۆی، ئینجا مرد، ئەو شتە دۆزراوەیە بە میراتەكەیەوە نابەسترێتەوە، بەڵام ئەگەر مردووەكە ماڵێكی، یان قەرزی كەسێكی ونبووی لە سەر بوو: كە شوێنی دیار نەبو، لە دۆزینەوەشی بێئومێد بووین، ئەو قەرزە دەدرێتە دەست قازی، جا ئەگەر قازی نەبو، یان خائن بوو و بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتاری نەدەكرد-وەك ئەم سەردەمە- ئەو كاتە دەدرێتە دەست باوەڕپێكراوێكی لێزان، تاكو بۆ (بَيْتُ الْمالِ) سەرفی بكا، یان هەر میراتگرەكە بەخۆی ئەو كارە ئەنجام دەدا، جا ئەگەر بەخۆیشی هەژار بوو، ئەو كاتە دروستە بەشی هەژارێكیش لەو ماڵە، یان لەو قەرزە بۆ خۆی دابنێ، هەم دووریش نیە: ئەو مەسەلەیەش وەك مەسەلەی یەتیمی بێسەرپەرشتكار بێ-و-ئەگەر باوەڕ پێكراوێك نەبو- پیاوماقوڵانی شوێنەكە، جێبەجێكردنی سەرفكردنەكەی بخەنە ئەستۆی خۆیان، هەروەك لە (تحفة) و (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: هەر كاتێك میراتگرێكیقەرزدارەكە قەرزەكەی دلوە خاوەن قەرزەكە، واجبە: لێی وەریگرێتەوە، هەروەك-بە درێژی- لە پاشكۆی قەرزدا ڕوون كراوە ، هەروەها سوننەتە: بە زووترین كات قەرزی مردووەكە بدرێتەوە، چونكە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، گیانی مرۆڤی ئیماندار بە هۆی قەرزەكەی قەدەغە دەكرێ لە چوونە بەهەشت. ئەم باسە لە پەڕتووكی مردووەكاندا درێژتر ڕوون كراوەتەوە.

### ﴿ كِتابُ التَّفْلِيسِ: پەڕتوكی قەدەغە دانان لە سەر قەرزدار ﴾

(مَنْ عَلَيْهِ دُيُونٌ) هەر كەسێك قەرزێك، یان چەند قەرزێكی ئادەمیزادی لە سەر بێ، كە (حالَّةٌ) كاتی دانەوەیان هاتبێ‌و (زائِدَةٌ عَلَى مالِهِ) ئەندازەی قەرزەكەش زۆرتر بێ لە هەموو ملكو ماڵەكەی، ئەو قەرزدارە (يُحْجَرُ عَلَيْهِ) واجبە: لە لایەن قازی قەدەغەی لە سەر دابندرێ، تاكو دەستكاری ملكو ماڵەكەی نەكا، وەك بڵێ: (فلانكەسم قەدەغە كرد لە دەستكاریكردنی ملكو ماڵی خۆی).

ئینجا كە ئەو قەدەغەیەش دادەنێ (بِسُؤالِ الْغُرَماءِ) بە داواكردنیخاوەن قەرزەكان دایدەنێ ﴿عَنْ كَعْبِ بن مالكٍ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ حَجَرَ عَلَى مُعاذٍ مالَهُ وَباعَهُ فِي دَيْنٍ كانَ عَلَيْهِ وَقَسَمَهُ بَيْنَ غُرَمائِهِ، فَقالَ: لَيْسَ لَكُمْ إِلَّا ذَلِكَ﴾ رواه الدارقطني وصححه الحاكم، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی دانا لە سەر (معاذ) بە هۆی ئەو قەرزەی لە سەری بوو، ماڵەكەی فرۆشتو

وَلاَ حَجْرَ بِالْمُؤَجَّلِ، وَإِذا حُجِرَ بِحالٍّ لَمْ يَحِلَّ الْمُؤَجَّلُ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ كانَتِ الدُّيُونُ بِقَدْرِ الْمالِ فَإِنْ كانَ كَسُوباً يُنْفِقُ مِنْ كَسْبِهِ فَلاَ حَجْرَ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ كَسُوباً وَكانَتْ نَفَقَتُهُ مِنْ مالِهِ فَكَذَا فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَحْجُرُ بِغَيْرِ طَلَبٍ فَلَوْ طَلَبَ بَعْضُهُمْ وَدَيْنُهُ قَدْرٌ يُحْجَرُ بِهِ

---

پارەکەی لە نێوان خاوەن قەرزەکاندا بەش کرد، ئینجا فەرمووی: ئێستا تەنها ئەوەندەتان بۆ هەیە. واتە: ئەو قەرزەی لە سەری ماوە، چاوەڕوان بکەن.

(وَلاَحَجْرَ بِالْمُؤَجَّلِ) هیچ قەدەغەیەك دانانـدرێ بە هۆی قـەرزێك: کە کاتی دانەوەی نەهاتبێ، چونکە ئێستا دلوای قەرزەکەی لێناکرێ (وَإِذا حُجِرَ بِحالٍّ) هەر کاتێك قەدەغەی لە سەر دانـدرا بە هۆی قـەرزێك کە کاتی دانەوەی هاتبێ (لَمْ يَحِلَّ الْمُؤَجَّلُ) بەو قەدەغەدانانە کاتی دانەوەی قـەرزە دواخراوەکان نایـێو هەر لە ئەستۆی قەرزدارەکەدا دەمێننەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

بەڵام ئەگەر قەرزدارەکە بمرێ، ئەو کاتە بە هۆی مردن قـەرزە دواخراوەکانیش کاتی دانەوەیان دێ، چونکە ئەستۆی قەرزدارەکە بە مـردن وێران دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ كانَتِ الدُّيُونُ بِقَدْرِ الْمالِ) بەڵام ئەگەر قـەرزەکان بە ئەندازەی مڵكو ماڵی قەرزدارەکە بون، تەماشا دەکرێ: (فَإِنْ كانَ كَسُوباً) ئەگەر قەرزدارەکە کاروکاسبی دەکردو (يُنْفِقُ مِنْ كَسْبِهِ) لە کارو کاسبیەکەشی خۆیو خێزانەکەی بەخێو دەکرد، ئەوە (فَلاَ حَجْرَ) پێویست نیە قەدەغە لە سەر قەرزدارەکە دابنـدرێ، بەڵکو قـازی فـەرمانی پـێ دەکـا: قەرزەکە بداتەوە. جا ئەگەر نەیداوە، ئەو کاتە قازی ماڵەکەی لێدەفرۆشێ، یان جارجارە لێی دەدلو دەیخاتە بەندیخانە تا قەرزەکە دەداتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيُّ الْواجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ﴾ رواه البخاري وأحمد وأبوداود، قەرز نەدانەوەی مرۆڤیهەبوویی باسکردنو سزادانی حەڵاڵ دەکا.

(وَإِنْ لَمْ يَكُنْ كَسُوباً) بەڵام ئەگەر کاروکاسبی نەدەکردو (وَكانَتْ نَفَقَتُهُ مِنْ مالِهِ) خۆیو خێزانەکەشی لەو ماڵە بەخێو دەکرد (فَكَذَا) لەو حاڵەتەش قەدەغەی لە سەر دانانـدرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە خاوەن قـەرزەکان دەتوانن ئێستا دلوای قەرزەکانیانی لێبکەن.

(وَلاَ يَحْجُرُ بِغَيْرِ طَلَبٍ) نابێ قـازی قەدەغە لە سەر قەرزدارەکە دابنێ بە بێداواکردنی خاوەن قەرزەکان (فَلَوْ طَلَبَ بَعْضُهُمْ) جا ئەگەر تەنها یەکێکیان دلوای قەدەغەدانانی کردو (وَدَيْنُهُ قَدْرٌ يُحْجَرُ بِهِ) قەرزەکەشی ئەندازەیەکی وەها بوو: قەدەغەی پێدادەندرا، چونکە

حَجَرَ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَيُحْجَرُ بِطَلَبِ الْمُفْلِسِ فِي الأَصَحِّ، فَإِذَا حُجِرَ تَعَلَّقَ حَقُّ الْغُرَمَاءِ بِمَالِه، وَأَشْهَدَ عَلَى حَجْرِهِ لِيُحْذَرَ، وَلَوْ بَاعَ أَوْ وَهَبَ أَوْ أَعْتَقَ فَفِي قَوْلٍ يُوقَفُ تَصَرُّفُهُ، فَإِنْ فَضَلَ ذَلِكَ عَلَى الدَّيْنِ نَفَذَ وَإِلاَّ لَغَا، وَالأَظْهَرُ بُطْلاَنُهُ، فَلَوْ بَاعَ مَالَهُ لِغُرَمَائِهِ بِدَيْنِهِمْ بَطَلَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ بَاعَ سَلَماً أَوِ اشْتَرَى فِي الذِّمَّةِ فَالصَّحِيحُ صِحَّتُهُ وَيَثْبُتُ فِي ذِمَّتِه،

---

له ملّكو ماڵەكەی زۆرتر بوو (حَجَرَ) ئەو كاتەش قەدەغەی لە سەر دادەنێ (وَإِلاَّ) بەلاّم ئەگەر قەرزەكەی لە ملّكو ماڵەكەی كەمتر بوو (فَلاَ) قەدەغەی لە سەردانانێ.

(وَ) هەروەها (يُحْجَرُ) قەدەغە لە سەر قەرزدارەكە دادەنرێ (بِطَلَبِ الْمُفْلِسِ) بە داواكردنی خودی قەرزدارەكە، واتە: بەخۆی داوا لە قازی بكا: قەدەغەی لە سەر دابنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(فَإِذَا حُجِرَ) جا هەر كاتێك قەدەغە لە سەر قەرزدارەكە داندرا (تَعَلَّقَ حَقُّ الْغُرَمَاءِ بِمَالِهِ) مافی خاوەن قەرزەكان بە ملّكو ماڵەكەیەوە دەبەسترێو هیچ دەستكاریەكی قەدەغەكراوەكەش لە ملّكو ماڵەكەیدا دروست نابێ، كەواتە: دروست نیە قەدەغەكراوەكە گەردنی قەرزدارەكانی خۆیشی لە قەرزەكەی ئازاد بكا (وَأَشْهَدَ عَلَى حَجْرِهِ) سوننەتە قازی شاهید بگرێ لەسەر قەدەغە دانانەكەی (لِيُحْذَرَ) تاكو خەڵك خۆی لێ بپارێزنو هیچ مامڵەتێكی لەگەڵ نەكەن.

(وَلَوْ بَاعَ) ئەگەر لە دوای قەدەغەكردن شتێكی فرۆشت (أَوْ وَهَبَ) یان بەخشیی (أَوْ أَعْتَقَ) یان كۆیلەیەكی ئازاد كرد (فَفِي قَوْلٍ يُوقَفُ تَصَرُّفُهُ) لە فەرموودەیەكدا ئەو دەستكاریەی ڕادەگیرێ: (فَإِنْ فَضَلَ ذَلِكَ عَلَى الدَّيْنِ) جا ئەگەر ئەو دەستكاریە لە قەرزەكەی زیاد بوو، چونكە ماڵەكەی بە نرخێكی بەرز فرۆشرا، یان لە قەرزێك گەردەنی ئازاد كرا (نَفَذَ) دەستكاریەكەی بە دروستبوویی دادەنرێ (وَإِلاَّ) ئەگەر زیاد نەبو (لَغَا) بە بەتاڵبوو دادەنرێ، بەلاّم (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (بُطْلاَنُهُ) ئەو دەستكاریەیڕابردووی گشتی لە ئێستاوە بەتاڵەو هیچی جێبەجێ ناكرێ.

(فَلَوْ بَاعَ مَالَهُ لِغُرَمَائِهِ بِدَيْنِهِمْ) ئەگەر لە دوای قەدەغەكردن قەرزدارەكە ملّكو ماڵەكەی خۆی فرۆشتە خاوەن قەرزەكان بە قەرزەكەی خۆیان (بَطَلَ) ئەو فرۆشتنەش بەتاڵەو دانامەزرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلاّم لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەو فرۆشتنە دروست دەبێ، هەروەك لە (نهاية) و(مغنى)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ بَاعَ سَلَماً) ئەگەر شتێكی بە سەلەم فرۆشت (أَوِ اشْتَرَى فِي الذِّمَّةِ) یان شتێكی بە قەرز كڕی (فَالصَّحِيحُ صِحَّتُهُ) بە فەرموودەی ڕاست: ئەو مامڵەتە بە قەرزانەی دروست دەبنو (وَيَثْبُتُ فِي ذِمَّتِهِ) سەلەم تێداكراوەكەو پارەیفرۆشراوەكە لە ئەستۆیدا جێگیر دەبێ.

وَيَصِحُ نِكاحُهُ وَطَلاَقُهُ وَخُلْعُهُ وَاقْتِصاصُهُ وَإِسْقاطُهُ، وَلَوْ أَقَرَّ بِعَيْنٍ أَوْ دَيْنٍ وَجَبَ قَبْلَ الْحَجْرِ فَالأَظْهَرُ قَبُولُهُ فِي حَقِّ الْغُرَماءِ، وَإِنْ أَسْنَدَ وُجُوبَهُ إِلَى مَابَعْدَالْحَجْرِ بِمُعامَلَةٍ أَوْ مُطْلَقاً لَمْ يُقْبَلْ فِي حَقِّهِمْ، وَإِنْ قالَ عَنْ جِنايَةٍ قُبِلَ فِي الأَصَحِّ، وَلَهُ أَنْ يَرُدَّ بِالْعَيْبِ ما كانَ اشْتَراهُ إِنْ كانَتِ الْغِبْطَةُ فِي الرَّدِّ، وَالأَصَحُّ تَعَدِّي الْحَجْرِ إِلَى ماحَدَثَ بَعْدَهُ بِالإِصْطِيادِ وَالْوَصِيَّةِ وَالشِّراءِ إِنْ صَحَّحْناهُ،

---

(وَيَصِحُ نِكاحُهُ وَطَلاَقُهُ) ژن هێنانو تەڵاقدانیشی دروست دەبن (وَ) هەروەها (خُلْعُهُ) تەڵاقدانی بە پارەو (وَاقْتِصاصُهُ) کوشتنی لە تۆڵەو (وَإِسْقاطُهُ) لێبوردنی لە کوشتنەکە، ئەوانەش گشتی دروست دەبن.

(وَلَوْ أَقَرَّ) ئەگەر قەرزدارەکە دانی‌نا: (بِعَيْنٍ) بە خودی ماڵێکو گوتی: ملکی فلانکەسە (أَوْ دَيْنٍ) یان دانی‌نا بە قەرزێك: کە (وَجَبَ قَبْلَ الْحَجْرِ) قەرزەکە پێش قەدەغەدانان لە سەری واجب بووە بۆ فلانکەس (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (قَبُولُهُ فِي حَقِّ الْغُرَماءِ) ئەو دانهێنانانەی لێوەردەگیرێ دەرهەق خاوەن قەرزەکان، واتە: خاوەن ماڵەکە خودی ماڵەکە بۆ خۆی دەباو خاوەن قەرزەکەش پاڵەپەستەی خاوەن قەرزەکانی‌تر دەکا لەو ماڵەی‌دا: کە قەدەغەی لەسەردانراوە.

بەڵام (وَإِنْ أَسْنَدَ وُجُوبَهُ إِلَى ما بَعْدَالْحَجْرِ) ئەگەر دانی‌نا بە قەرزێکی وەها: کە لە دوای قەدەغەدانان لە سەری واجب بوبێ (بِمُعامَلَةٍ) بە هۆی مامڵەتێك (أَوْ مُطْلَقاً) یان بە بێ مامڵەت، ئەو کاتە (لَمْ يُقْبَلْ فِي حَقِّهِمْ) دەرهەق خاوەن قەرزەکان ئەو دانهێنانەی لێوەرناگیرێ، بەڵکو تەنها دەرهەق خۆی لێی وەردەگیرێو لە دوای لاچوونی قەدەغەکە ئەو قەرزەشی لێوەردەگیرێتەوە، بەڵام (وَإِنْ قالَ عَنْ جِنايَةٍ) ئەگەر بڵێ: ئەم قەرزەم بە هۆی تاوانێك لە سەر واجب بووە (قُبِلَ) ئەوە دەرهەق خاوەن قەرزەکانیش لێی وەردەگیرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا:، کەواتە: ستەم لێکراوەکەش پاڵەپەستەی خاوەن قەرزەکان دەکا لە ماڵی قەرزدارەکەدا.

(وَلَهُ) بۆ قەرزدارەکە دروستە (أَنْ يَرُدَّ بِالْعَيْبِ ما كانَ اشْتَراهُ) ئەو شتەی پێش قەدەغەکردن کڕیویەتی بە هۆی عەیبداری بیگەڕێنێتەوە سەر فرۆشیارەکە (إِنْ كانَتِ الْغِبْطَةُ فِي الرَّدِّ) ئەگەر قازانج لەو گەڕاندنەوەیەدا هەبێ (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (تَعَدِّي الْحَجْرِ إِلَى ماحَدَثَ بَعْدَهُ) ئەو قەدەغەکردنە دەڕواتە سەر ئەو ملکو ماڵەش: کە لە دوای قەدەغەدانانەکە پەیدا بووە: (بِالإِصْطِيادِ) بە هۆی ڕاوکردنو (وَالْوَصِيَّةِ) بە هۆی وەسێتو (وَالشِّراءِ) بە هۆی کڕینی بە قەرز (إِنْ صَحَّحْناهُ) ئەگەر–بە فەرموودەی ڕاستتر– ئەو کڕینە بە درووستبوو دابنێن.

وَأنَّهُ لَيسَ لبائعه أنْ يَفسَخَ وَيَتَعلَّقَ بِعَيْنِ مَتاعِهِ إنْ عَلِمَ الْحالَ، وَإنْ جَهِلَ فَلَهُ ذلِكَ، وَأنَّهُ إذا لَمْ يُمْكِنِ التَّعلُّقُ بِها لاَ يُزاحِمُ الْغُرَماءَ بِالثَّمَنِ.
(فَصْلٌ) يُبادِرُ الْقاضِي بَعْدَالْحَجْرِ بِبَيْعِ مالِهِ وَقَسْمِهِ بَيْنَ الْغُرَماءِ وَيُقَدِّمُ ما يَخافُ فَسادَهُ، ثُمَّ الْحَيَوانَ ثُمَّ الْمَنْقُولَ ثُمَّ الْعَقارَ، وَلْيَبِعْ بِحَضْرَةِ الْمُفْلِسِ وَغُرَمائِهِ كُلَّ شَيْءٍ فِي سُوقِهِ بِثَمَنِ مِثْلِهِ حالاًّ مِنْ نَقْدِالْبَلَدِ، ثُمَّ إنْ كانَ الدَّيْنُ غَيْرَ جِنْسِ النَّقْدِ وَلَمْ يَرْضَ الْغَرِيمُ إلاَّ بِجِنْسِ حَقِّهِ

---

(وَأنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (لَيسَ لِبائِعِهِ أنْ يَفسَخَ) ئەو کەسەی لە دوای قەدەغەکردن بە قەرز شتی فرۆشتۆتە قەرزدارەکە، بۆی دروست نیە: فرۆشتنەکە هەڵبوەشێنێتەوەو (وَيَتَعلَّقَ بِعَيْنِ مَتاعِهِ) دەست بە خودی کەلوپەلە فرۆشراوەکەیەوە بگرێو بیباتەوە (إنْ عَلِمَ الْحالَ) ئەگەر زانیبێتی ئەو قەرزدارە قەدەغەی لە سەر داندراوە، بەڵام (وَإنْ جَهِلَ) ئەگەر نەیزانیبێ (فَلَهُ ذلِكَ) ئەو کاتە بۆی دروستە فرۆشتنەکە هەڵبوەشێنێتەوەو خودی ماڵەکەی خۆی بباتەوە (وَأنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (إذا لَمْ يُمْكِنِ التَّعلُّقُ بِها) هەر کاتێك نەگونجا دەست بە خودی ماڵەکەیەوە بگرێو بیباتەوە (لاَ يُزاحِمُ الْغُرَماءَ بِالثَّمَنِ) نابێ پاڵەپەستەی خاوەن قەرزەکانیش بکا بە پارەی فرۆشراوەکە، چونکە لە دوای قەدەغەدانان ئەو قەرزە پەیدا بووە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی فرۆشتنی ماڵی قەرزداری قەدەغەکراو ﴾

(يُبادِرُالْقاضِي بَعْدَالْحَجْرِ) سوننەتە: قازی -لە دوای قەدەغەدانان- پەلە بکا (بِبَيْعِ مالِهِ) بە فرۆشتنی ملکو ماڵی قەدەغەکراوەکە (وَقَسْمِهِ بَيْنَ الْغُرَماءِ) پارەی فرۆشراوەکەش بە سەر خاوەن قەرزەکاندا بەش بکا بەگوێرەی قەرزەکانیان، هەم (وَيُقَدِّمُ ما يَخافُ فَسادَهُ) ئەو جۆرە شتەش پێشدا بفرۆشێ کە لە خراپبوونی دەترسێ: وەك میوە (ثُمَّ الْحَيَوانَ) ئینجا ئاژەڵەکان بفرۆشێ (ثُمَّ الْمَنْقُولَ) ئینجا ئەو جۆرە شتەی دەگوازرێتەوە (ثُمَّ الْعَقارَ) ئینجا خانوو و باغو زەوی.

(وَلْيَبِعْ بِحَضْرَةِ الْمُفْلِسِ) سوننەتە ئەو شتانە بفرۆشێ بە ئامادەبوونی قەرزدارەکەو، هەم (وَغُرَمائِهِ) بە ئامادەبوونی خاوەن قەرزەکانیش (كُلَّ شَيْءٍ فِي سُوقِهِ) هەر شتەی لە بازاڕی خۆیدا بفرۆشێ (بِثَمَنِ مِثْلِهِ) بە پارەی هاووێنەی خۆی، یان زیاتر (حالاًّ) بە پارەیەکی حازر: کە (مِنْ نَقْدِالْبَلَدِ) لە پارەی شوێنەکە بێ.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوایفرۆشتن (إنْ كانَ الدَّيْنُ غَيْرَ جِنْسِ النَّقْدِ) ئەگەر قەرزەکە ڕەگەزێکیتری جگە لە ڕەگەزی پارەی فرۆشراوەکە بوو و (وَلَمْ يَرْضَ الْغَرِيمُ إلاَّ بِجِنْسِ حَقِّهِ) خاوەن قەرزەکەش تەنها بە ڕەگەزی قەرزەکەی خۆی ڕازی دەبو، ئەو کاتە

اشتَرَى، وَإنْ رَضيَ جازَ صَرْفُ النَّقد إلَيْه إلاّ فى السَّلَم، وَلاَ يُسَلِّمُ مَبيعاً قَبْلَ قَبْض ثَمَنه، وَما قَبضَهُ قَسَّمَهُ بَيْنَ الْغُرَماء إلاّ أنْ يَعْسُرَ لقلّته فَيُؤَخِّرُهُ ليَجْتَمعَ، وَلاَ يُكَلَّفُونَ بَيِّنَةً بأنْ لا غَريمَ غَيْرُهُمْ، فَلَوْ قَسَّمَ فَظَهَرَ غَريمٌ شارَكَ بالْحصَّة، وَقيلَ تُنْقَضُ الْقسْمَةُ، وَلَوْ خَرَجَ شَيْءٌ -باعَهُ قَبْلَ الْحَجْر- مُسْتَحَقّاً وَالثَّمَنُ تالفٌ فَكَدَيْنٍ ظَهَرَ، وَإن اسْتُحقَّ شَيْءٌ باعَهُ الْحاكمُ قُدِّمَ الْمُشْتَري بالثَّمَن، وَفي قَوْلٍ يُحاصُّ الْغُرَماءَ،

---

(اشتَرَى) واجبە: ڕەگەزی قەرزەکەی‌خۆی بۆی بکڕێ. بەلام (وَإنْ رَضيَ) ئەگەر خاوەن قەرزەکە بە ڕەگەزی پارەی فرۆشراوەکەش ڕازی دەبو (جازَ صَرْفُ النَّقد إلَيْه) ئەو کاتە دروستە: پارەی فرۆشراوەکەی لەجیاتی قەرزەکەی بدرێتێ (إلاّ في السَّلَم) تەنها لە مامڵەتی سەلەمدا نەبێ، چونکە گۆڕینەوەی سەلەم تێداکراو دروست نیە، هەروەك ڕابرا، کەواتە: واجبە: سەلەم تێداکراوەکەی بۆ پەیدا بکا.

(وَلاَ يُسَلِّمُ مَبيعاً قَبْلَ قَبْضِ ثَمَنه) نابێ قازی هیچ فرۆشراوێك پێش وەرگرتنی پارەکەی تەسلیمی کڕیارەکە بکا (وَما قَبَضَهُ) هەر پارەیەکیشی وەرگرت (قَسَّمَهُ بَيْنَ الْغُرَماء) لە نێوان خاوەن قەرزەکاندا بەشی دەکا: بەگوێرەی قەرزەکانیان (إلاّ أنْ يَعْسُرَ لقلّته) مەگەر بەشکردنەکەی زەحمەت بێ، بە هۆی کەمی پارەکە، ئەو کاتە (فَيُؤَخِّرُهُ ليَجْتَمعَ) بەشکردنەکە دوا دەخا تا پارەکە کۆدەبێتەوە.

(وَلاَ يُكَلَّفُونَ بَيِّنَةً) خاوەن قەرزەکان داوای شاهیدیان لێناکرێ: (بأنْ لا غَريمَ غَيْرُهُمْ) کە جگە لەخۆیان هیچ خاوەن قەرزیتر نیە، بەلام (فَلَوْقَسَّمَ) ئەگەر قازی ماڵەکەی بەش کرد (فَظَهَرَ غَريمٌ) ئینجا خاوەن قەرزێکیتریش ئاشکرا بوو (شارَكَ بالْحصَّة) ئەم خاوەن قەرزەش دەبێتە هاوبەشی ئەوانیتر: بەگوێرەی بەشە قەرزەکەی خۆی (وَقيلَ) لە فەرموودەی بێهێزدا: (تُنْقَضُ الْقسْمَةُ) بەشکردنەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە.

(وَلَوْ خَرَجَ شَيْءٌ -باعَهُ قَبْلَ الْحَجْر- مُسْتَحَقّاً) ئەگەر قەدەغەکراوەکە -پێش قەدەغەکردن- شتێکی فرۆشتبو، شتەکەش بە ماڵی‌خەڵکی دەرچوو (وَالثَّمَنُ تالفٌ) پارەکەش -کە وەری‌گرتبو- نەمابو، ئەوەش (فَكَدَيْنٍ ظَهَرَ) وەکو قەرزێکە: کە لە دوای قەدەغەکردن ئاشکرا بوبێ، واتە: کڕیارەکەش دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان، بەلام ئەگەر پارەکە مابو، ئەو کاتە پارەکە دەگەڕێندرێتەوە.

(وَإن اسْتُحقَّ شَيْءٌ باعَهُ الْحاكمُ) ئەگەر شتێك کە دادوەر فرۆشتبێتی، بە ماڵی‌خەڵکی دەرچوو، ئەو کاتە (قُدِّمَ الْمُشْتَري بالثَّمَن) کڕیارەکە وەپێش خاوەن قەرزەکان دێخرێو پارەکەی دەدرێتەوە (وَفي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (يُحاصُّ الْغُرَماءَ) ئەم کڕیارەش هاوبەشی‌ی خاوەن قەرزەکانی‌تر دەکا.

وَيُنفِقُ عَلَى مَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ حَتَّى يُقَسَّمَ مالَهُ إِلاَّ أَنْ يَستَغنِيَ بِكَسْبٍ، وَيُباعُ مَسكَنُهُ وَخادِمُهُ فِي الأَصَحِّ وَإِنِ احْتاجَ إِلَى خادِمٍ لِزَمانَتِهِ وَمَنصِبِهِ، وَيُتْرَكُ لَهُ دَسْتُ ثَوْبٍ يَلِيقُ بِهِ: وَهُوَ قَمِيصٌ وَسَراوِيلُ وَعِمامَةٌ وَمُكَعَّبٌ وَيُزادُ فِي الشِّتاءِ جُبَّةٌ وَيُترَكُ لَهُ قُوتُ يَوْمِ الْقِسْمَةِ لِمَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ بَعْدَ الْقِسْمَةِ أَنْ يَكْتَسِبَ أَوْ يُؤَجِّرَ نَفْسَهُ لِبَقِيَّةِ الدَّيْنِ، وَالأَصَحُّ وُجُوبُ إِجارَةِ أُمِّ وَلَدِهِ وَالأَرْضِ الْمَوْقُوفَةِ عَلَيْهِ،

---

(وَ) لەدوای قەدەغەدانان (يُنفِقُ عَلَى مَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ) واجبە قازی-بە ماڵی قەدەغەكراوەكە- ئەو كەسانە بەخێو بكا: كە بەخێوكردنیان لە سەر قەدەغەكراوەكەیە (حَتَّى يُقَسَّمَ مالَهُ) تا ماڵەكەی بەش دەكا (إِلاَّ أَنْ يَستَغنِيَ بِكَسْبٍ) مەگەر قەدەغەكراوەكە پێویستی بەو ماڵە نەبێ بە هۆی كەسابەتی خۆی، ئەو كاتە لە كەسابەتەكەی بەخێو دەكرێن.

(وَ) هەركاتێك-بۆ قەرزدانەوە- ماڵیقەرزدارەكە بفرۆشرێ، ئەوە (يُباعُ مَسكَنُهُ) خانووی قەرزدارەكە دەفرۆشرێو هەم رایەخو قەروێلەشی دەفرۆشرێن، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە (وَخادِمُهُ) هەم كۆیلەخزمەتكارەكەیو شتیسواریشی دەفرۆشرێ: وەك وولاغو ئوتومبێل (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا (وَإِنِ احْتاجَ إِلَى خادِمٍ) هەرچەند پێویستی بەخزمەتكارو شتی سواریش هەبێ (لِزَمانَتِهِ) لە بەر دەردەدارییو (وَمَنصِبِهِ) پلە بەرزیی.

بەڵام (وَيُتْرَكُ لَهُ دَسْتُ ثَوْبٍ يَلِيقُ بِهِ) دەستە جلێكی بۆ دەهێڵدرێتەوە: كە شیاوی ئەو بێ (وَهُوَ) دەستە جلەكەش لە شەرعدا ئەمەیە: (قَمِيصٌ) كراسو چاكەت (وَسَراوِيلُ) دەرپێ (وَعِمامَةٌ) مێزەر (وَمُكَعَّبٌ) پێڵاو (وَيُزادُ فِي الشِّتاءِ جُبَّةٌ) لە زستانیشدا قاپوتێك، یان قەمسەڵەیەك زیاد دەكرێ (وَ) هەروەها (يُتْرَكُ لَهُ قُوتُ يَوْمِ الْقِسْمَةِ) مەسرەفی ڕۆژی بەشكردنی ماڵەكەشی بۆ دەهێڵدرێتەوە (لِمَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ) بۆ ئەو كەسانەی مەسرەفی بەخێوكردنیانی لە سەریەتی، هەروەها ئەو كتێبانەی زانا پێویستی پێیان هەیە بۆی دەهێڵدرێتەوە، چەكو كەرستەی جەنگیش بۆ جەنگاوەری جیهاد دەهێڵدرێنەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَيْسَ عَلَيْهِ بَعْدَ الْقِسْمَةِ) لە دوای بەشكردنیماڵەكە لە سەر قەرزدارەكە واجب نیە (أَنْ يَكْتَسِبَ) كەسابەت بكا (أَوْ يُؤَجِّرَ نَفْسَهُ) یان خۆی بەكرێ بدا (لِبَقِيَّةِ الدَّيْنِ) بۆ دانەوەی ئەو بەشە قەرزەی لە سەری ماوە، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ ئەگەر قەرزدارەكە نەبوویی بوو، دەبێ چاوەڕوانی هەبوویی بكرێ. هەم بە بەڵگەی ﴿لَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ﴾یڕابردوو لە حەدیسی (معاذ)دا.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (وُجُوبُ إِجارَةِ أُمِّ وَلَدِهِ) واجبە: (جاریة)كەی خۆی كە دایكی منداڵە بە كرێ بدا، هەم (وَالأَرْضِ الْمَوْقُوفَةِ عَلَيْهِ) ئەو زەویەی وەقفی كراوەتە

وَإِذَا ادَّعَى أَنَّهُ مُعْسِرٌ أَوْ قَسَّمَ مالَهُ بَيْنَ غُرَمائه وَزَعَمَ أَنَّهُ لاَيَمْلكُ غَيْرَهُ وَأَنْكَرُوا فَإِنْ لَزِمَهُ الدَّيْنُ فِي مُعامَلَة مالٍ كَشراء أَوْ قَرْضٍ فَعَلَيْه الْبَيِّنَةُ، وَإِلاَّ فَيُصَدَّقُ بِيمينه فِي الأَصَحِّ، وَتُقْبَلُ بَيِّنَةُالإِعْسارِ فِي الْحالِ، وَشَرْطُ شاهده خبْرَةُ باطنه، وَلْيَقُلْ: هُوَ مُعْسِرٌ، وَلاَ يُمَحِّضُ النَّفْيَ كَقَوْله: لاَ يَمْلكُ شَيْئاً، وَإِذَا ثَبَتَ إِعْسارُهُ لَمْ يَجُزْ حَبْسُهُ وَلاَ مُلاَزَمَتُهُ، بَلْ يُمْهَلُ حَتَّى يُوسِرَ، وَالْغَرِيبُ الْعاجِزُ عَنْ بَيِّنَة الإِعْسارِ يُوَكِّلُ الْقاضي به مَنْ يَبْحَثُ عَنْ حاله،

---

سەر، واجبە: بە كرێی بدا، واتە: ئەو دووانە فرۆشتنیان دروست نابێ، بەڵام واجبە: بە كرێ بدرێن‌و لە كرێیەكانیان قەرز بدرێتەوە.

(وَإِذَا ادَّعَى أَنَّهُ مُعْسِرٌ) هەر كاتێك قەرزدارەكە گوتی: من نەبوویيم، واتە: هیچم نیە قەرزەكەم پێ بدەمەوە (أَوْ قَسَّمَ مالَهُ بَيْنَ غُرَمائه) یان هەر كاتێك قازی ماڵەكەی ئەوی لە نێوان خاوەن قەرزەكاندا بەش كردو بەرووەستی هەموو قەرزەكانی نەركردو (وَزَعَمَ أَنَّهُ لاَ يَمْلكُ غَيْرَهُ) قەرزدارەكەش گوتی: جگە لەو ملكو ماڵە هیچیترم نیە (وَأَنْكَرُوا) خاوەن قەرزەكانیش گوتیان: وا نیە. ئەوە (فَإِنْ لَزِمَهُ الدَّيْنُ فِيمُعامَلَة مالٍ) ئەگەر قەرزەكەی بە هۆی مامڵەتیماڵێك كەوتبێتە سەری (كَشراءٍ) وەكو كڕین (أَوْ قَرْضٍ) یان قەرزكردن، لەو حاڵەتەدا (فَعَلَيْه الْبَيِّنَةُ) لە هەردوو مەسەلەكەدا قەرزدارەكە لە سەریەتی شاهید بێنێ: كە نەبوویيە، یان هیچیتری نیە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە هۆی مامڵەتیماڵێك نەبو، بەڵكو بە هۆی زامینیو تاوانو مارەیی ژنو ئەو جۆرە شتانە بوو، ئەوكاتە (فَيُصَدَّقُ بِيمينه) قەرزدارەكە لە سەر قسەكەیخۆی سوێند دەخواو باوەڕی پێدەكرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَتُقْبَلُ بَيِّنَةُ الإِعْسارِ فِي الْحالِ) قبوڵ دەكرێ دوو پیاو شاهیدی بدەن: ئەو قەرزدارە ئێستا نەبوویيە (وَشَرْطُ شاهده) مەرجی شاهیدی ئەو نەبوویيە ئەوەیە (خبْرَةُ باطنه) خەبەردار بێ لە وەزعی پەنهانی ئەو قەرزدارە: بە هۆی دراوسێیەتی، یان هاوڕێیەتی (وَلْيَقُلْ) با لە شاهیدیەكەیدا بڵێ: (هُوَ مُعْسِرٌ) ئەو قەرزدارە نەبوویيە (وَلاَ يُمَحِّضُ النَّفْيَ) نابێ بە نەبوونێكی ڕووت شاهیدی بدا (كَقَوْله: لاَ يَمْلكُ شَيْئاً) وەك بڵێ: هیچی نیە. بەڵكو دەڵێ: جگە لە ئەركی بەخێوكردنی ئەمڕۆی خۆیو خێزانی هیچیتری نیە.

(وَإِذَا ثَبَتَ إِعْسارُهُ) ئینجا هەر كاتێك ئیسبات بوو ئەو قەرزدارە نەبوویيە (لَمْ يَجُزْ حَبْسُهُ) دروست نیە بەند بكرێو (وَلاَ مُلاَزَمَتُهُ) هەم دروست نیە لە ژێر چاودێری دابندرێ (بَلْ يُمْهَلُ حَتَّى يُوسِرَ) بەڵكو مۆڵەت دەدرێ تا ماڵێكی دەبێ قەرزەكەی پێ بداتەوە، بە بەڵگەی ئایەتەكەیڕابردوو (وَالْغَرِيبُ الْعاجِزُ عَنْ بَيِّنَة الإِعْسارِ) ئەو قەرزدارەی نامۆیەو ناتوانێ شاهیدی نەبوویی بێنێ بەند دەكرێ، ئینجا (يُوَكِّلُ الْقاضي به مَنْ يَبْحَثُ عَنْ حاله) واجبە:

فَـــــإِذَا غَلَـــــبَ عَلَى ظَنِّـــــهِ إِعسَـــــارُهُ شَـــــهِدَ بِـــــهِ.
(فَصْلٌ) مَنْ باعَ وَلَمْ يَقْبِضِ الثَّمَنَ حَتَّى حُجِرَ عَلَى الْمُشْتَرِى بِالْفَلَسِ فَلَهُ فَسْـخُ الْبَيْـعِ وَاسْتِرْدادُ الْمَبِيعِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ خِيارَهُ عَلَى الْفَوْرِ،

---

قـازی دوو كـەس ڕابسـپێرێ تـاكو لـە حـاڵو وەزعـی ژیـانی بكۆڵنـەوە (فَـإِذَا غَلَـبَ عَلَـى ظَنِّـهِ إِعسارُهُ) جا هەر كاميان بە زۆری دڵی دەچوو ئەو قەرزدارە نەبوويیە، ئـەو كاتـە (شَـهِدَ بِـهِ) شاهيدی بە نەبوويیقەرزدارەكە دەدا، نەوەك هەر لە بەنديخانەدا بمێنێتەوە.

﴿ ئاگـــاداری ﴾: هـــەر كاتێـك قەرزدارێكیهـــەبوويی داوای قەرزدانـــەوەی لێكـرا، واجبـــە: بـــەگوێرەی توانـا بـــە پەلـە قەرزەكـە بداتـــەوە، ئـــەگينا: گوناهبـار دەبـێ، پێغەمبـــەرﷺ دەفـــەرموێ: ﴿مَطْلُ الْغَنِـــيِّ ظُلْـــمٌ﴾ رواه الشيخان، درێژەپێـدانی قەرزنەدانـەوەی مرۆڤـی هەبوويی زۆرداریيـە. جـا ئەگـەر هـەبوويی بـوو و قەرزەكـەی نـەدا وە، ئـەو كاتـە دروسـتە بخرێتە بەنديخانـە، هـەروەك لـە سـەرەتای ئـەم باسـەدا بەڵگـەمان هێنـاوە، ئينجا كرێی بەنديخانەو خواردنیڕۆژانەيیو كرێیچاودێر-كشتی- لە مـاڵی بەندكراوەكـە دەژمێـردرێ، بەڵام نەخۆشو ڕێبوارو منداڵو ئافرەتیداپۆشراو، ئەوانـە نابـێ بەنـد بكرێن، هـەروەك لـە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە بـاسی پەشيمانبوونەوە لە مامڵەتی مرۆڤیقەدەغەكراوكە ﴾

(مَنْ باعَ) هەر كەسێك شتێكی فرۆشت (وَلَمْ يَقْبِضِ الثَّمَنَ) پارەكەشی وەرنـەگرت (حَتَّـى حُجِرَ عَلَى الْمُشْتَرِى بِالْفَلَسِ) تـا قەدەغـە لـە سـەر كڕيارەكـە دانـدرا بـە هـۆی نـەبوويی (فَلَـهُ فَسْـخُ الْبَيْـعِ) ئـەوە بـۆی دروسـە فرۆشـتنەكە هەڵبوەشێنێتەوەو (وَاسْتِرْدادُالْمَبِيعِ) فرۆشـراوەكەی خۆی وەربگرێتەوە، پێغەمبەرﷺدەفـەرموێ: ﴿مَنْ أَدْرَكَ مالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ فَهُـوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك بكاتـەوە خـودی مـاڵیخۆی لـە لای كڕيـارێكی وەها: كە بە هۆی قەرزداری قەدەغەی لە سەر داندرابێ، ئەو-بۆ بردنـەوەی ماڵەكـەیخۆی- لە خاوەن قەرزەكان لەپێشترە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر كڕيارەكە قەدەغەی لە سەر دانەنـدرابو، بـەڵام لـە حاڵـەتی نـەبوويیدا مـرد، ئـەو كاتـەش فرۆشـيارەكە مـافی هەيـە فرۆشـتنەكە هەڵبوەشێنێتەوەو فرۆشـراوەكەی خۆی بباتـەوە، هەروەك لە (تحفة) و(نهاية)دا فەرموويانـە، بـەڵام ئەگـەر نـەمرد و قەدەغەشـی لـە سـەر دانەنـدرابو، ئـەو كاتـە دروسـت نيـە فرۆشـيارەكە پەشـيمان ببێتـەوە، هـەروەك لـە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاسـتتر: (أَنَّ خِيـارَهُ عَلَىالْفَوْرِ) پەشـيمانبوونەوەی فرۆشـيارەكە دەمودەستەو دەبی دەستبەجێ بڵێ: فرۆشتنەكەم هەڵوەشاندەوە.

وَأَنَّهُ لاَ يَحْصُلُ الْفَسْخُ بِالْوَطْءِ وَالإِعْتاقِ وَالْبَيْعِ، وَلَهُ الرُّجُوعُ فِي سائِرِالْمُعاوَضاتِ كَالْبَيْعِ، وَلَهُ شُرُوطٌ: مِنها كَوْنُ الثَّمَنِ حالاً، وَأَنْ يَتَعَذَّرَ حُصُولُهُ بِالإِفْلاسِ، فَلَو امْتَنَعَ مِنْ دَفْعِ الثَّمَنِ مَعَ يَسارِهِ أَوْ هَرَبَ فَلاَ فَسْخَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قالَ الْغُرَماءُ لاَ تَفْسَخْ وَنُقَدِّمُكَ بِالثَّمَنِ فَلَهُ الْفَسْخُ، وَكَوْنُ الْمَبِيعِ باقِياً فِي مِلْكِ الْمُشْتَرِي، فَلَوْ فاتَ أَوْ كاتَبَ الْعَبْدَ فَلاَ رُجُوعَ، وَلاَ يَمْنَعُ التَّزْوِيجُ، وَلَوْ تَعَيَّبَ بِآفَةٍ أَخَذَهُ ناقِصاً أَو ضارَبَ بِالثَّمَنِ،

---

(وَأَنَّـهُ لاَ يَحْصُلُ الْفَسْخُ) بـه فـەرمووده‌ی ڕاستتر: هەڵوەشاندنەوە نایەتـە جێ (بِـالْوَطْءِ) بـه جیماع کردن‌و (وَالإِعْتاقِ) بە ئازادکردنی(جاریە)کەو (وَالْبَيْـعِ) بـه فرۆشتنی ماڵەکە(وَلَـهُ الرُّجُوعُ فِي سائِرِ الْمُعاوَضاتِ كَالْبَيْعِ) بۆی دروستە پەشیمان ببێتەوە لە گشت ئەو مامڵەتانـەی-وەکو فرۆشتن- شتێکیان لە بەرامبەر وەردەگیرێ: وەك بەکرێدان‌و قەرزو سەلەم.

(وَلَهُ شُرُوطٌ) پەشیمانبوونەوەکەی‌ڕابردوو، چەند مەرجێکی هەنە: (مِنْها) یـەکێکیان: (كَـوْنُ الثَّمَنِ حالاً)ئەوەیە فرۆشتنەکە بە پارەیەکی حازر بـێ‌و قـەرز نـەبێ. (وَ) مـەرجی‌دووەمیان: (أَنْ يَتَعَذَّرَ حُصُولُهُ بِالإِفْلاسِ) بە هۆی نەبوویی کڕیارەکـە نـەگونجێ پـارەی فرۆشـراوەکەی دەست بکەوێ، کەوابو: (فَلَوِامْتَنَعَ مِـنْ دَفْـعِ الـثَّمَنِ مَـعَ يَسـارِهِ) ئەگـەر کڕیارەکـە هـەبوویی بوو، بەڵام بە قەسدی پارەکەی نـەدەدا (أَوْ هَـرَبَ) یـان ڕایکردو خـۆی شاردەوە، یـان لـه حاڵەتی هەبوویی‌دا مرد، بەڵام میراتگرەکەی پارەکەی نەدەدا، لەو مەسەلانەدا (فَـلاَ فَسْـخَ) مـافی هەڵوەشـاندنەوەی نیـە (فِي‌الأَصَـحِّ) لـه فەرموودەی‌ڕاسـتتردا، کـەوابو: لـه ڕێگـەی کاربەدەستێکەوە پارەکەی خۆی داوا دەکاو وەری‌دەگرێ.

(وَلَوْ قالَ الْغُرَماءُ) ئەگەر خاوەن قـەرزەکان گوتیانـه فرۆشیارەکە: (لاَ تَفْسَخْ) فرۆشتنەکە هەڵمەوەشێنەوە (وَنُقَدِّمُكَ بِالثَّمَنِ) ئێمە پێشدا-لە ماڵی‌قەرزدارەکە، یـان لـه ماڵی‌خۆمـان- پارەکەی تۆ دەدەین، ئەو کاتەش (فَلَهُ الْفَسْخُ) مافی هەڵوەشـاندنەوەی هەیـە، چونکە ئـەو پێشخستنە منەتی تێدایە.

(وَ) مەرجی‌سێیەمیان: (كَـوْنُ الْمَبِيـعِ باقِيـاً فِـي مِلْـكِ الْمُشْـتَرِي) خـودی فرۆشـراوەکە لـه ملکایـەتی کڕیارەکـەدا مابـێ، بـه بەڵگـەی حەدیسـەکە، کـەوابو: (فَلَـوْ فـاتَ) ئەگـەر فرۆشراوەکەی لە ملکدا نەمابێ: وەك فرۆشتبێتی، یـان وەقفـی کردبێ، یـان بەخشیبێتی، یان مردبێ (أَوْ كاتَبَ الْعَبْدَ) یان نووسراوی لەگەڵ کۆیلەکە کردبو، یان ئـازادی کردبـو، ئـەو کاتـە (فَـلاَ رُجُـوعَ)مـافی پەشـیمانی‌ی نیـە، بـەڵام (وَلاَ يَمْنَـعُ التَّـزْوِيجُ) مـارەبڕینی (جاریـة) فرۆشراوەکە ڕێگای پەشیمانی ناگرێ.

(وَلَوْ تَعَيَّبَ بِآفَةٍ) ئەگـەر فرۆشراوەکە بـه هـۆی ڕوداوێك عەیبـدار بوبـێ، ئـەو کاتـه (أَخَـذَهُ ناقِصاً) فـرۆشیارەکە بە ناتەواوی وەری‌دەگرێتەوە (أَو ضـارَبَ بِالـثَّمَنِ) یـان بەگـوێرەی

أَوْ بِجِنَايَةِ أَجْنَبِيٍّ أَوِالْبَائِعِ فَلَهُ أَخْذُهُ وَيُضَارِبُ مِنْ ثَمَنِهِ بِنِسْبَةِ نَقْصِ الْقِيمَةِ، وَجِنَايَةُالْمُشْتَرِي كَآفَةٍ فِيالأَصَحِّ، وَلَوْ تَلِفَ أَحَدُالْعَبْدَيْنِ ثُمَّ أَفْلَسَ أَخَذَ الْبَاقِيَ وَضَارَبَ بِحِصَّةِ التَّالِفِ، فَلَوْ كَانَ قَبَضَ بَعْضَ الثَّمَنِ رَجَعَ فِيالْجَدِيدِ فَإِنْ تَسَاوَتْ قِيمَتُهُما وَقَبَضَ نِصْفَ الثَّمَنِ أَخَذَالْبَاقِيَ بِبَاقِيالثَّمَنِ، وَفِيقَوْلٍ يَأْخُذُ نِصْفَهُ بِنِصْفِ بَاقِيالثَّمَنِ وَيُضَارِبُ بِنِصْفِهِ، وَلَوْ زَادَالْمَبِيعُ زِيَادَةً مُتَّصِلَةً كَسِمَنٍ وَصَنْعَةٍ

---

پارەکەی دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان لە ماڵو ماڵی قەرزدارەکەدا (أَوْ بِجِنَايَةِ أَجْنَبِيٍّ أَوِالْبَائِعِ) یان ئەگەر فرۆشراوەکە بە دەستدرێژی بێگانەیەك، یان بە دەستدرێژی فرۆشیارەکە عەیبدار بوبێ، ئەوکاتەش (فَلَهُ أَخْذُهُ) بۆی دروستە فرۆشراوەکە وەربگرێتەوەو هەم (وَيُضَارِبُ مِنْ ثَمَنِهِ بِنِسْبَةِ نَقْصِ الْقِيمَةِ) بەگوێرەی کەمبوونەوەی نرخەکەشی ببێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان لە ماڵی قەرزدارەکەدا، جیاوازی نیە قەرزدارەکە: تۆڵەی دەستدرێژیەکەی لە تاوانکارەکە وەرگرتبێ، یان نا.

(وَجِنَايَةُ الْمُشْتَرِي) دەستدرێژیی کڕیارەکە (كَآفَةٍ) وەك ڕوداوێکە: کە باسمان کرد (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَلَوْ تَلِفَ أَحَدُ الْعَبْدَيْنِ) ئەگەر لە دوو کۆیلە فرۆشراوەکان، یان لە دوو ئاژەڵە فرۆشراوەکان یەکێکیان فەوتا (ثُمَّ أَفْلَسَ) ئینجا کڕیارەکە بە هۆی نەبوویی قەدەغەی لە سەر داندرا، ئەو کاتە (أَخَذَ الْبَاقِيَ) فرۆشیارەکە ئەو فرۆشراوەی ماوە، وەریدەگرێتەوەو (وَضَارَبَ بِحِصَّةِ التَّالِفِ) بە بەشە پارەی فەوتاوەکەش دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان لە ماڵی قەرزدارەکەدا.

(فَلَوْ كَانَ قَبَضَ بَعْضَ الثَّمَنِ) جا ئەگەر فرۆشیارەکە بەشێکی پارەکەی وەرگرتبو و بەشێکیشی وەرنەگرتبو، ئەو کاتەش (رَجَعَ) دروستە پەشیمان ببێتەوە (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا (فَإِنْ تَسَاوَتْ قِيمَتُهُما) جا لەو حاڵەتەدا ئەگەر نرخی هەردوو ئاژەڵە فرۆشراوەکان یەکسان بوو (وَقَبَضَ نِصْفَ الثَّمَنِ) نیوەی پارەکەشی وەرگرتبو، نیوەیشی وەرنەگرتبو، ئەو کاتە (أَخَذَ الْبَاقِيَ بِبَاقِيالثَّمَنِ) ئەو ئاژەڵەی ماوە، وەریدەگرێتەوە لە جیاتی ئەو نیوە پارەیەی لە سەر کڕیارەکە ماوە، ئەو نیوە پارەیەی وەریشی گرتوە لەجیاتی ئاژەڵە فەوتاوەکە دەبێ (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (يَأْخُذُ نِصْفَهُ بِنِصْفِ بَاقِي الثَّمَنِ) نیوەی ئەو فرۆشراوەی ماوە، وەریدەگرێتەوە لەجیاتی نیوەی ئەو نیوە پارەیەی ماوەو (وَيُضَارِبُ بِنِصْفِهِ) بە نیوەکەیتریش–کە چوارێکی هەموو پارەکەیە– دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان.

(وَلَوْ زَادَالْمَبِيعُ) ئەگەر فرۆشراوەکە زێدەبیەکی لێپەیدا بوو (زِيَادَةً مُتَّصِلَةً) زێدەبیەکەش هەر بە فرۆشراوەکەوە بوو (كَسِمَنٍ) وەك قەڵەویو گەورەبوونو (وَصَنْعَةٍ) فێربوونی

فازَ الْبائِعُ بها، وَالْمُنْفَصِلَةُ كَالثَّمَرَةِ وَالْوَلَدِ لِلْمُشْتَرِى، وَيَرْجِعُ الْبائِعُ فِي الأَصْلِ، فَإِنْ كانَ الْوَلَدُ صَغِيراً وَبَذَلَ الْبائِعُ قِيمَتَهُ أَخَذَهُ مَعَ أُمِّه، وَإِلاّ فَيُباعانِ وَتُصْرَفُ إِلَيْه حِصَّةُ الأُمِّ، وَقِيلَ لاَ رُجُوعَ، فَإِنْ كانَتْ حامِلاً عِنْدَ الرُّجُوعِ دُونَ الْبَيْعِ أَوْ عَكْسَهُ فَالأَصَحُّ تَعَدِّى الرُّجُوعِ إِلَى الْوَلَدِ، وَاسْتِتارُ الثَّمَرِ بِكِمامِه وَظُهُورُهُ بِالتَّأْبِيرِ قَرِيبٌ مِنْ اسْتِتارِ الْجَنِينِ وَانْفِصالِه وَأَوْلَى بِتَعَدِّى الرُّجُوعِ، وَلَوْ غَرَسَ الأَرْضَ أَوْ بَنَى: فَإِنْ اتَّفَقَ الْغُرَماءُ وَالْمُفْلِسُ عَلَى تَفْرِيغِها فَعَلُوا

---

پیشە، ئەوە (فازَ البائِعُ بِها) بۆ فرۆشیارەکەیەو هیچیش لە بەرامبەر نادا، بەڵام (وَالْمُنْفَصِلَةُ) ئەو زیادەییانەی لە فرۆشراوەکە جیا بونەتەوە (کَالثَّمَرَةِ وَالْوَلَدِ) وەك میوەو بێچوو، ئەوانە (لِلْمُشْتَرِى) بۆ کڕیارەکەنە، کەوابو: (وَیَرْجِعُ البائِعُ فِی الأَصْلِ) فرۆشیارەکە تەنها بنچینەی فرۆشراوەکە وەردەگرێتەوە.

(فَإِنْ کانَ الْوَلَدُ صَغِیراً) جا ئەگەر بێچووی (جاریة) فرۆشراوەکە بچووك بوو و (وَبَذَلَ البائِعُ قِیمَتَهُ) فرۆشیارەکەش نرخی بێچووەکەی دەدا، ئەو کاتە (أَخَذَهُ مَعَ أُمِّه) بێچووەکەش لەگەڵ دایکەکەی وەردەگرێتەوە (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر نرخی بێچووەکەی نەدا (فَیُباعانِ) ئەو کاتە هەردووکیان دەفرۆشرێن‌و (وَتُصْرَفُ إِلَیْهِ حِصَّةُ الأُمِّ) بەشە پارەی دایکەکەی دەدرێتێ‌و بەشە پارەی بێچووەکەش بۆ قەرزدارەکەیە (وَقِیلَ) لە فەرموودەی بێ‌هێزدا: ئەگەر نرخی بێچووەکەی نەدا (لاَ رُجُوعَ) مافی پەشیمانی‌ی نیە.

(فَإِنْ کانَتْ حامِلاً عِنْدَ الرُّجُوعِ) جا ئەگەر ئاژەڵەکە لە کاتی پەشیمانبوونەوەدا ئاوس بوو (دُونَ الْبَیْعِ) بەڵام لە کاتی فرۆشتنی‌دا ئاوس نەبو (أَوْ عَکْسَهُ) یان بە پێچەوانەوە: لە کاتی فرۆشتنی‌دا ئاوس بوو، بەڵام لە کاتی‌پەشیمانبوونەوەدا ئاوس نەبو، واتە: زابو، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر لە هەردوو مەسەلەدا: (تَعَدِّى الرُّجُوعِ إِلَى الْوَلَدِ) پەشیمانبوونەوەکەی دەگاتە بێچووەکەی‌و لەگەڵ دایکەکەی وەری‌دەگرێتەوە.

(وَاسْتِتارُ الثَّمَرِ بِکِمامِهِ) داپۆشرانی میوە بە بەرگەکەی خۆی‌و (وَظُهُورُهُ بِالتَّأْبِیرِ) دەرکەوتنی بە هۆی لەتبوونی بەرگەکەی (قَرِیبٌ مِنَ اسْتِتارِ الْجَنِینِ وَانْفِصالِه) نزیکە لە داپۆشرانی بێچوو لە زگی‌دایکی‌داو جیابوونەوەی لە زگی‌دایکی‌و (وَأَوْلَى بِتَعَدِّى الرُّجُوعِ) لەپێشترە کە پەشیمانی‌ی بگاتێ، واتە: ئەگەر لە کاتی فرۆشتنی‌دا خودی میوەکە هەبو، لە کاتی پەشیمانیشدا بە تەواوی دەرکەوتبو، ئەوە لەگەڵ درەختەکە وەری‌دەگرێتەوە.

(وَلَوْغَرَسَ الأَرْضَ) ئەگەر قەرزدارەکە زەویەکی کڕی‌و درەختی لە زەویەکەدا چاند (أَوْبَنَى) یان خانووی تێدا کرد، ئینجا پێش ئەوەی پارەکە بدا، قەدەغەی لە سەر داندرا، ئەو کاتە (فَإِنْ اتَّفَقَ الْغُرَماءُ وَالْمُفْلِسُ عَلَى تَفْرِیغِها) ئەگەر خاوەن قەرزەکان‌و قەرزدارەکە ڕێك کەوتن: درەخت‌و خانووەکە لە زەویەکەدا لابدرێن (فَعَلُوا) ئەوە لایاندەبەن‌و

وَأَخَذَها، وَإِن امْتَنَعُوا لَمْ يُجْبَرُوا، بَلْ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ وَيَتَمَلَّكَ الْغِراسَ وَالْبِناءَ بِقِيمَتِه، وَلَهُ أَنْ يَقْلَعَ وَيَضْمَنَ أَرْشَ النَّقْصِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لَيْسَ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ فِيها وَيَبْقَى الْغِراسُ وَالْبِناءُ لِلْمُفْلِسِ، وَلَوْ كانَ الْمَبِيعُ حِنْطَةً فَخَلَطَها بِمِثْلِها أَوْ دُونِها فَلَهُ أَخْذُ قَدْرِ الْمَبِيعِ مِنَ الْمَخْلُوطِ، أَوْ بِأَجْوَدَ فَلا رُجُوعَ فِي الْمَخْلُوطِ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ طَحَنَها أَوْ قَصَّرَ الثَّوْبَ فَإِنْ لَمْ تَزِدِ الْقِيمَةُ رَجَعَ وَلاَ شَيْءَ لِلْمُفْلِسِ، وَإِنْ زادَتْ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُباعُ وَلِلْمُفْلِسِ مِنْ ثَمَنِه بِنِسْبَةِ ما زادَ،

---

(وَأَخَذَها) فرۆشیارەکەش زەویەکەی وەردەگرێتەوە، بەڵام (وَإِن امْتَنَعُوا) ئەگەر ڕازی نەبون: درەختو خانووەکە لە زەویەکەدا لابدرێن، ئەوە (لَمْ يُجْبَرُوا) ناچار ناکرێن (بَلْ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ) بەڵکو فرۆشیارەکە مافی هەیە زەویەکەی وەربگرێتەوە، هەم (وَيَتَمَلَّكَ الْغِراسَ وَالْبِناءَ بِقِيمَتِه) درەختو خانووەکەش بۆ خۆی وەربگرێ: هەر یەکەی بە نرخی خۆی، هەم (وَلَهُ أَنْ يَقْلَعَ) بۆی هەیە درەختو خانووەکە لابباو (وَيَضْمَنَ أَرْشَ النَّقْصِ) تۆڵەی کەمبوونەوەی نرخی دارو بەردو خۆڵی درەختو خانووەکەش بداتە قەرزدارەکە، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ لَيْسَ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ فِيها) فرۆشیارەکە بۆی دروست نیە: تەنها زەویەکە وەربگرێتەوەو (وَيَبْقَى الْغِراسُ وَالْبِناءُ لِلْمُفْلِسِ) درەختو خانووەکەش-هەر لە زەویەکەدا- بۆ قەرزدارەکە بمێنێتەوە، چونکە دەبی درەختو خانووەکە بۆ قەرزدانەوە بفرۆشرێن، بە بێزەویەکەش نرخێکی تەواو ناکەنو زیان دەگاتە قەرزدارەکە.

(وَلَوْ كانَ الْمَبِيعُ حِنْطَةً) ئەگەر فرۆشراوەکە گەنم بوو (فَخَلَطَها بِمِثْلِها أَوْ دُونِها) کڕیارەکەش تێکەڵی گەنمێکیتری وەك خۆی، یان خراپتری کرد، ئەوە (فَلَهُ أَخْذُ قَدْرِ الْمَبِيعِ مِنَ الْمَخْلُوطِ) فرۆشیارەکە بۆی دروستە ئەندازەی گەنمەفرۆشراوەکەی لەو تێکەڵکراوە وەربگرێتەوە (أَوْ بِأَجْوَدَ) یان ئەگەر تێکەڵی گەنمێکی باشتری کردبو، ئەو کاتە (فَلا رُجُوعَ فِي الْمَخْلُوطِ) مافی پەشیمانیی لە تێکەڵکراوەکەدا نیە، بەڵکو بە گوێرەی پارەی فرۆشراوەکە، دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان لە ماڵی قەرزدارەکەدا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَلَوْ طَحَنَها) ئەگەر کڕیارەکە گەنمە فرۆشراوەکەی هاڕیبو (أَوْ قَصَّرَ الثَّوْبَ) یان جلە فرۆشراوەکەی شۆردبو، ئەو کاتە: (فَإِنْ لَمْ تَزِدِ الْقِيمَةُ) ئەگەر بەو هاڕینو شۆردنە نرخی زیاد نەبوبێ (رَجَعَ) فرۆشیارەکە وەریدەگرێتەوەو (وَلاَ شَيْءَ لِلْمُفْلِسِ) قەرزدارەکەش هیچی نادرێتێ، بەڵام (وَإِنْ زادَتْ) ئەگەر نرخی زیاد بوبێ، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ يُباعُ) ئەو فرۆشراوە دەفرۆشرێو (وَلِلْمُفْلِسِ مِنْ ثَمَنِه بِنِسْبَةِ مازادَ)

وَلَوْ صَبَغَهُ بِصَبْغِهِ فَإِنْ زَادَتِ الْقِيمَةُ قَدْرَ قِيمَةِ الصَّبْغِ رَجَعَ وَالْمُفْلِسُ شَرِيكٌ بِالصَّبْغِ، أَوْ أَقَلَّ فَالنَّقْصُ عَلَى الصَّبْغِ، أَوْ أَكْثَرَ فَالأَصَحُّ أَنَّ الزِّيَادَةَ لِلْمُفْلِسِ، وَلَوِاشْتَرَى مِنْهُ الصَّبْغَ وَالثَّوْبَ رَجَعَ فِيهِمَا إِلاَّ أَنْ لاَ تَزِيدَ قِيمَتُهُمَا عَلَى قِيمَةِالثَّوْبِ فَيَكُونُ فَاقِداً لِلصَّبْغِ، وَلَوِ اشْتَرَاهُمَا مِنْ إِثْنَيْنِ فَإِنْ لَمْ تَزِدْ قِيمَتُهُ مَصْبُوغاً عَلَى قِيمَةِالثَّوْبِ فَصَاحِبُ الصَّبْغِ فَاقِدٌ،

---

قەرزدارەکەش بەگوێرەی نرخە زیادەکە، لە پارەی فرۆشراوەکەی دەدرێتێ (وَلَوْ صَبَغَهُ بِصَبْغِهِ) ئەگەر قەرزدارەکە فرۆشراوەکەی ڕەنگ کردبو لە سەر ئەرکی خۆی، ئەو کاتە: (فَإِنْ زَادَتِ الْقِيمَةُ) ئەگەر نرخیفرۆشراوەکە -بە هۆی ڕەنگکردن- زیادی کردبو، زیادکردنەکەش (قَدْرَ قِيمَةِالصَّبْغِ) بە ئەندازەی نرخی ڕەنگەکە بوو: وەك فرۆشراوەکە نرخی چوار دیرهەم بێو بە هۆی ڕەنگکردن نرخی ببێتە شەش دیرهەم، نرخی ڕەنگەکەش بە تەنها دوو دیرهەم بوو، ئەو کاتە (رَجَعَ) فرۆشیارەکە جلە ڕەنگکراوەکەی وەردەگرێتەوەو (وَالْمُفْلِسُ شَرِيكٌ بِالصَّبْغِ) قەرزدارەکەش هاوبەشیەتی بە ئەندازەی نرخی ڕەنگەکە -کە دوو دیرهەمە- کەواتە: یان دەبی فرۆشیارەکە پارەی ڕەنگەکە بدا، یان ڕەنگکراوەکە بفرۆشرێو دوو دیرهەم نرخی ڕەنگەکە بدرێتە قەرزدارەکە.

(أَوْ أَقَلَّ) یان نرخە زیادەکە لە ئەندازەی نرخی ڕەنگەکە کەمتر بوو، ئەو کاتە (فَالنَّقْصُ عَلَى الصَّبْغِ) کەمیەکە لە سەر ڕەنگەکەیە، کەواتە: ئەگەر لەم مەسەلەیەدا نرخی بووە پێنج دیرهەم، ئەوە تەنها دیرهەمێك بەشی قەرزدارەکەیە (أَوْ أَكْثَرَ) یان نرخە زیادەکە لە ئەندازەی نرخی ڕەنگەکەش زیاتر بوو: وەك بگاتە هەشت دیرهەم، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الزِّيَادَةَ لِلْمُفْلِسِ) نرخی زیادەکە گشتی بۆ قەرزدارەکەیە، کەواتە: لێرەدا چوار دیرهەمی دەدرێتێ.

(وَلَوِ اشْتَرَى مِنْهُ الصَّبْغَ وَالثَّوْبَ) ئەگەر قەرزدارەکە جلەکەو ڕەنگەکەی وێکڕا لێکڕی بون، ئینجا قەدەغەی لە سەر داندرا، ئەو کاتەش (رَجَعَ فِيهِمَا) فرۆشیارەکە هەردووکیان وەردەگرێتەوە (إِلاَّ أَنْ لاَ تَزِيدَ قِيمَتُهُمَا عَلَى قِيمَةِالثَّوْبِ) مەگەر نرخی جلەکەو ڕەنگەکە وێکڕا لە نرخی خودی جلەکە زیاتر نەبێ، ئەوە (فَيَكُونُ فَاقِداً لِلصَّبْغِ) فرۆشیارەکە ڕەنگەکەی لە دەست چووە، کەوابو: جلەکە وەردەگرێتەوەو بەگوێرەی نرخی ڕەنگەکەش دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان.

(وَلَوِ اشْتَرَاهُمَا مِنْ إِثْنَيْنِ) ئەگەر جلەکەو ڕەنگەکەی -بە جیا- لە دوو کەسان کڕیبون، ئەو کاتە(فَإِنْ لَمْ تَزِدْ قِيمَتُهُ مَصْبُوغاً عَلَى قِيمَةِ الثَّوْبِ) ئەگەر نرخی جلەکە بەڕەنگکراوی زیادی نەکردبو لە نرخی خودیجلەکە بەڕەنگنەکراوی، ئەوە (فَصَاحِبُ الصَّبْغِ فَاقِدٌ) خاوەن ڕەنگەکە ڕەنگەکەی لە دەست چووەو بە پارەی ڕەنگەکەی دەبێتە هاوبەشی

وَإنْ زَادَتْ بِقَــدْرِ قِيمَةِالصَّــبْغِ اشْــتَرَكا، وَإنْ زادَتْ عَلَــى قِيمَتِهِمَـا فَالأَصَــحُّ أَنَّ الْمُفْلِــسَ شَــرِيكٌ لَهُمَـا بِالزِّيَـادَةِ.

(بابُ الْحجْرِ)

مِنْهُ حَجْرُ الْمُفْلسِ لِحَقِّ الْغُرَماءِ، وَالرَّاهِنِ لِلْمُرْتَهِنِ، وَالْمَرِيضِ لِلْوَرَثَةِ، وَالْعَبْدِ لِسَـيِّدِهِ، وَالْمُرْتَدِّ لِلْمُسْلِمِينَ، وَلَها أَبْوابٌ: وَمَقْصُودُ الْبابِ حَجْرُ الْمَجْنُونِ وَالصَّبِيِّ وَالْمُبَذِّرِ،

---

خاوەن قەرزەکان، خاوەن جلەکەش جلەکەی خۆی وەردەگرێتەوە. بەڵام (وَإنْ زَادَتْ بِقَدْرِ قِيمَةِ الصَّبْغِ) ئەگەر بە ئەندازەی نرخی ڕەنگەکە، نرخی جلەکەش زیادی کردبو، ئەوکاتە (اشْتَرَكا) هەردوو فرۆشیارەکە دەبنە هاوبەشی یەکتری، واتە: نرخی جلەکە بۆ خاوەنەکەیەتی‌و نرخی ڕەنگەکەش بۆ خاوەنەکەیەتی (وَإنْ زادَتْ عَلَىقِيمَتِهِمـا) ئەگەر نرخەکە لە ئەندازەی نرخی جلەکەو ڕەنگەکە زیاتر بوو، ئەوە (فَالأصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أنَّ الْمُفْلِسَ شَرِيكٌ لَهُما بِالزِّيادَةِ) قەرزدارەکەش هاوبەشی هەردوو فرۆشیارەکەیە: بە گوێرەی زێدەییەکە.

﴿ بابُ الْحجْرِ: باسی قەدەغەکردن لە دەستکاریکردنی مڵك‌و ماڵ ﴾

(مِنْهُ) بەشێکی ئەو قەدەغەکردنە (حَجْرُالْمُفْلِسِ) قەدەغەکرنی قەرزدارە (لِحَقِّ الْغُرَماءِ) لە بەر مافی خاوەن قەرزەکان، هەروەك ڕابرا، هەم (وَالرَّاهِنِ) قەدەغەکردنی ڕەهنەدەرە (لِلْمُرْتَهِنِ) لە بەر مافی ڕەهنوەرگر، هەروەك ڕابرا، هەم (وَالْمَرِيضِ) قەدەغەکردنی مرۆڤی نەخۆشە لە بارەی زیاتر لە سێیەکی ماڵی خۆی (لِلْوَرَثَةِ) لە بەر مافی میراتگرەکان، هەروەك لە باسی وەسێتدا ڕوون کراوەتەوە، هەم (وَالعَبْدِ) قەدەغەکردنی کۆیلەیە (لِسَيِّدِهِ) لە بەر مافی گەورەکەی‌خۆی هەروەك ڕابرا، هەم (وَالْمُرْتَدُّ) قەدەغەکردنی موسوڵمانی کافربووە (لِلْمُسْلِمِينَ) لە بەر مافی موسوڵمانان، هەروەك لە باسی کافر بووندا ڕوون کراوەتەوە (وَلَها أبْوابٌ) ئەوانەش چەند باسێکی‌خۆیان هەنە: هەندێکیان ڕابران‌و هەندێکیشیان لەمەودوا دێن، إنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

﴿ ئاگاداری ﴾: (فتوا)دەری نەزان و فاسق، هەم ئەوەی فێڵە ناشەرعیەکان بە خەڵکی دەڵێ، واجبە: قەدەغەیان لە سەر دابنرێ، هەروەك لە (الدرالمنتقى)دا فەرموویەتی. جا ئەوەش بێنەوە بیرت کە ئیمامی(النواوی) فەرمووی: نەرمی‌و ئاسانکاری لە(فتوا)دا حەرامە. هەروەك لە(پێشەکی، بەرگی‌یەکەم)دا ڕوونمان کردەوە.

ئینجا (وَمَقْصُودُالْبابِ) مەبەستی ئەم باسە (حَجْرُالْمَجْنُونِ) قەدەغەکردنی مرۆڤی شێتە، هەم (وَالصَّبِيِّ) قەدەغەکردنی منداڵە، هەم (وَالْمُبَذِّرِ) قەدەغەکردنی ئەو مرۆڤەیە: کە ماڵی‌خۆی بە فیڕۆ دەدا: کە پێی دەگوترێ (سَفِيه)، خوای‌گەورە دەفەرموێ:

فَبالْجُنُون تَنسَلبُ الْولاَياتُ وَاعْتبارُ الأَقْوال، وَيرْتَفعُ بالإِفاقَة، وَحَجْرُ الصَّبيِّ يرْتَفعُ بِبُلُوغه رَشيداً، وَالْبُلوغُ باسْتكْمالِ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً،

---

﴿فَإِنْ كَانَ الَّذِى عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لاَيَسْتَطِيعُ أَنْ يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ﴾ ئەو کەسەی مافی لە سەرە، ئەگەر (سفیه)—واتە: ماڵ بەفیڕۆدەر— بوو، یان بێهێز بوو: وەك منداڵ، یان نەیئەتوانی بڵێ، بە هۆی شێتی، یان لاڵی، هەر یەکێك لەوانە با سەرپەرشتکارەکەی بڵێو نووسەرەکەش بنوسێ. واتە: چونکە ئەوانە قەدەغەیان لە سەر داندراوە.

(فَبالْجُنُونِ) جا بە هۆی شێتبوونی مرۆڤ (تَنْسَلِبُ الْوِلاَياتُ) گشت سەرپەرشتکاریەکی شەرعی لادەچێ، هەم (وَاعْتِبارُالأَقْوالِ) ئیعتباریش بە هیچ گوتەیەکی ناکرێ: وەك موسوڵمانبوون و کافربوون و گشت مامڵەتێکیتری دونیایی.

ئینجا بزانە: منداڵی نەفام وەکو شێت وایە، واتە: هیچ مامڵەتێکی دونیای دروست نابێ، ئیسلامبوون و کافربوونیشی دروست نابێ، بەڵام منداڵی فامیدە خواپەرستیەکانی دروست دەبن، هەروەها بۆ دیاری پێداناردن و بۆ بانگکردنە سەر زیافەت قسەکانی ڕەچاو دەکرێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

دیسان بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: ئیسلامبوونی منداڵ —بە بێئیزنی سەرپەرشتکارەکەی— دروست دەبێ، هەم کڕین و فرۆشتن و ئەو جۆرە مامڵەتانەشی بە ئیزنی سەرپەرشتکارەکەی دروست دەبن، بەو مەرجەی مەبەستی کڕین و فرۆشتن بزانێ، هەروەك لە (مجمع الأنهر)دا فەرموویەتی.

(وَيَرْتَفِعُ) قەدەغە لە سەر شێت لادەچێ (بِالإِفاقَةِ) بە چاکبوونەوەی لە شێتیەکەی، هەروەها (وَحَجْرُالصَّبِيِّ يَرْتَفِعُ) قەدەغەکردنی منداڵیش لادەچێ (بِبُلُوغِهِ رَشِيداً) بە بلۆغبوونی لە حاڵەتێکیوەهادا: کە بۆ دین و دونیای بگونجێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوالَهُمْ﴾ ئەگەر منداڵەکان بلۆغیان بوو و گونجانی دین و دونیاتان لێ دیتن، ماڵەکەیخۆیانیان بدەنەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ﴾ حديث صحيح رواه اصحاب السنن، نووسینی تاوان لە سەر سێ کەسان لادراوە: لە سەر خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەرمنداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا چاك دەبێتەوە.

## ﴿ باسی بلۆغبوونی منداڵ ﴾

(وَالْبُلُوغُ) بلۆغبوونی نێر و مێ بە یەکێك لەم دووانە دەبێ، یەکەم: (بِاسْتِكْمالِ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً) بە تەواوکردنی پانزە ساڵی مانگی: کە هەر ساڵێك لە دوانزە مانگیئیسلامی پێك دێو

أَوْ خُرُوجِ الْمَنِيِّ، وَوَقْتُ إِمْكانِهِ اسْتِكْمالُ تِسْعِ سِنِينَ، وَنَباتُ الْعانَةِ يَقْتَضِي الْحُكْمَ بِبُلُوغِ وَلَدِ الْكافِرِ لاَالْمُسْلِمِ فِي الأَصَحِّ، وَتَزِيدُالْمَرْأَةُ حَيْضاً وَحَبَلاً، وَالرُّشْدُ صَلاَحُ الدِّينِ وَالْمالِ، فَلاَ يَفْعَلُ مُحَرَّماً يُبْطِلُ الْعَدالَةَ،

---

دەکاتە (٣٥٤) ڕۆژ ﴿عَنْ ابْنِ عمر رَضِىَ اللهُ عَنهما: عُرِضْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ وَأَنا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعُرِضْتُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ فَأَجازَنِي﴾ رواه الشيخان، (ابن عمر) فەرمووی: لە جەنگی(ئوحود) منیان هێنا لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش ڕێگای نەدام بچمە جەنگ؟ چونکە تەمەنم چواردە ساڵان بوو، بەڵام لە جەنگی(خندق) ڕێگەی دام بچمە جەنگ؟ چونکە تەمەنم پانزە ساڵان بوو، واتە: گەورە بوبوم.

دووەم: (أَوْ خُرُوجِ الْمَنِيِّ) یان بە هاتنەدەرەوەی(مَنی)، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الأَطْفالُ مِنْكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا﴾ هەر کاتێك منداڵەکان گەیشتنە حاڵەتی (مَنی)هاتن، با ئیزن وەربگرن. هەروەها لە حەدیسی سێ کەسەکەیڕابردووشدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ﴾. واتە: (إحتلام) بە هاتنەدەرەوەی(مَنی) دەگوترێ.

(وَوَقْتُ إِمْكانِهِ) کاتی گونجانی هاتنەدەرەوەی(مَنی) لە نێر و لە مێ (اسْتِكْمالُ تِسْعِ سِنِينَ) تەواوکردنی نۆ ساڵیمانگییە، کەواتە: هەر کاتێك لە تەمەنی نۆ ساڵیو بەو لاوە–کوڕ، یان کچ– (مَنی)ی هاتە دەرەوە، یان تەمەنی پانزە ساڵیمانگییان تەواو کرد، ئەوە هەردووکیان بڕیاری بلۆغبوونیان بۆ دەدرێ، واتە: لە قۆناغی منداڵی دەردەچنو دەگەنە قۆناغی گەورەیی.

(وَنَباتُ الْعانَةِ) پەیدابوونی مووی زبر لە بەری نێر و مێ، نیشانەیەکی وەهایە: کە (يَقْتَضِي الْحُكْمَ بِبُلُوغِ وَلَدِالْكافِرِ) وا دەگەیەنێ: بڕیاری بلۆغبوون بۆ منداڵی کافران بدرێ (لاَ الْمُسْلِمِ) نەك منداڵیموسوڵمانان (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(وَتَزِيدُالْمَرْأَةُ) ئافرەت دوو شتیتری زیاد لە پیاو هەنە: کە بلۆغی پێ دەبێ: یەکەم: (حَيْضاً) هەر کاتێك لە تەمەنی نۆ ساڵیو بەولاوە خوێنی حەیز ببینێ. دووەم: (وَحَبَلاً) هەر کاتێك ئاوس بوو، واتە: بە یەکێك لەو دووانەش ئافرەت بلۆغی دەبێ.

(وَالرُّشْدُ) پێناسەی ڕەشیدی، واتە: گونجان ئەمەیە: (صَلاَحُ الدِّينِ وَالْمالِ) بۆ بەرژەوەندی ئایینوماڵیخۆی بگونجێ.

کەوابو: (فَلاَ يَفْعَلُ مُحَرَّماً) نابێ نە بە کردارو نە بە گوفتار حەرامێکی وەها بکا: کە (يُبْطِلُ الْعَدالَةَ) دادپەروەریەتی هەڵبوەشێنێتەوە: وەك گوناهێکی گەورە بکا، یان بەردەوام بێ لە سەر گوناهە بچووکەکان بە حاڵەتێکی وەها: خواپەرستیەکەی زاڵ نەبێ بە سەرگوناهەکانیدا.

وَلاَ يُبَذِّرُ بِأَنْ يُضَيِّعَ الْمالَ باحْتِمالِ غَبْنٍ فاحِشٍ فِي الْمُعامَلَةِ أَوْ رَمْيِهِ فِي بَحْرٍ أَوْ إِنْفاقِهِ فِي مُحَرَّمٍ، وَالأَصَحُّ أَنَّ صَرْفَهُ فِي الصَّدَقَةِ وَوُجُوهِ الْخَيْرِ وَالْمَطاعِمِ وَالْمَلابِسِ الَّتِي لاَ تَليقُ بحالِه لَيْسَ بِتَبْذيرٍ، وَيُخْتَبَرُ رُشْدُ الصَّبِيِّ وَيَخْتَلِفُ بِالْمَراتِبِ: فَيُخْتَبَرُ وَلَدُ التَّاجِرِ بِالْبَيْعِ وَالشِّراءِ وَالْمُماكَسَةِ فيهِما، وَوَلَدُ الزَّرَّاعِ بِالزِّراعَةِ وَالنَّفَقَةِ عَلَى الْقُوَّامِ بِها، وَالْمُحْتَرِفُ بِما يَتَعَلَّقُ بِحِرْفَتِه، وَالْمَرْأَةُ بِما يَتَعَلَّقُ بِالْغَزْلِ وَالْقُطْنِ وَصَوْنِ الأَطْعِمَةِ عَنِ الْهِرَّةِ وَنَحْوِها، وَيُشْتَرَطُ تَكَرُّرُ الإِخْتِبارِ مَرَّتَيْنِ أَوْ أَكْثَرَ،

---

(وَ) لەبارەی مالّیش (لاَ يُبَذِّرُ) مالّی خۆی بە فیڕۆ نەدا (بِأَنْ يُضَيِّعَ الْمالَ) وەك مالّی خۆی لە دەست بدا (بِاحْتِمالِ غَبْنٍ فاحِشٍ) بە هۆی ڕازیبوون بە زەرەرێکی زۆر (فِي الْمُعامَلَةِ) لە کڕین‌و فرۆشتندا (أَوْ رَمْيِهِ فِي بَحْرٍ) یان مالّی‌خۆی فڕێبداتە ناو دەریا (أَوْ إِنْفاقِهِ فِي مُحَرَّمٍ) یان مالّی‌خۆی لە شتی حەڕام خەرج بکا.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ صَرْفَهُ فِي الصَّدَقَةِ) خەرجکردنی مالّ بە سەر هەژاراندا‌و (وَوُجُوهِ الْخَيْرِ) بۆ کاروباری چاکەو (وَالْمَطاعِمِ) بۆ خواردن‌و (وَالْمَلابِسِ الَّتِي) بۆ جل‌و بەرگێکی وەها: کە (لاَ تَليقُ بِحالِهِ) شیاوی وەزعی خۆی نەبن (لَيْسَ بِتَبْذيرٍ) هیچێکیان بەفیڕۆدان نیە.

(وَيُخْتَبَرُ رُشْدُالصَّبِيِّ) واجبە: لە لایەن سەرپەرشتکارەکەوە گونجانی مندالّ بۆ ئایین‌و دونیای تاقی بکرێتەوە (وَيَخْتَلِفُ بِالْمَراتِبِ) تاقیکردنەوەکەش بە گوێرەی وەزعی مندالّەکە دەگۆڕێ، کەوابو: (فَيُخْتَبَرُ وَلَدُالتَّاجِرِ) مندالّی بازرگان تاقی دەکرێتەوە (بِالْبَيْعِ وَالشِّراءِ) بە کڕین‌و فرۆشتن‌و (وَالْمُماكَسَةِ فِيهِما) هەم بە سەودا‌و خۆگیرکردن لە کڕین‌وفرۆشتندا بۆ قازانج کردن.

(وَوَلَدُالزَّرَّاعِ) مندالّی کشتوکالّکەریش تاقی دەکرێتەوە (بِالزِّراعَةِ) بە داچاندنی کشتوکالّ‌و (وَالنَّفَقَةِ عَلَىالْقُوَّامِ بِها) هەم بە مەسرەف کردن لە کرێکارەکانی بەرژەوەندی کشتوکالّ: وەك جووتیارو پاسەوان‌و ئاودەر (وَالْمُحْتَرِفُ) مندالّی‌پیشەکاریش تاقی دەکرێتەوە (بِما يَتَعَلَّقُ بِحِرْفَتِهِ) بەو جۆرە شتەی پەیوەندی بە پیشەکەیەوە هەیە.

(وَالْمَرْأَةُ) هەروەها ئافرەتیش تاقی دەکرێتەوە (بِما يَتَعَلَّقُ بِالْغَزْلِ وَالْقُطْنِ) بەو شتانەی پەیوەندی بە ڕستن‌و لۆکەوە هەیە: وەك ڕستن‌و تەشی‌و پەڕەکردن، هەم (وَصَوْنِ الأَطْعِمَةِ عَنِ الْهِرَّةِ) پاراستنی خۆراك لە پشیلەو (وَنَحْوِها) لە شتی وەکو پشیلەش: وەك مشك‌و مریشك (وَيُشْتَرَطُ تَكَرُّرُ الإِخْتِبارِ مَرَّتَيْنِ أَوْ أَكْثَرَ) بە مەرج دادەندرێ: دوو جار، یان زیاتر تاقی‌کردنەوەکە دووبارە ببێتەوە.

وَوَقْتُهُ قَبْلَ الْبُلُوغِ، وَقِيلَ بَعْدَهُ، فَعَلَى الأَوَّلِ الأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ عَقْدُهُ بَلْ يُمْتَحَنُ فِي الْمُماكَسَةِ فَإِذَا أَرادَ الْعَقْدَ عَقَدَ الْوَلِيُّ، فَلَوْ بَلَغَ غَيْرَ رَشِيد دامَ الْحَجْرُ، وَإِنْ بَلَغَ رَشِيداً انْفَكَّ بِنَفْسِ الْبُلُوغِ وَأُعْطِيَ مالَهُ، وَقِيلَ يُشْتَرَطُ فَكُّ الْقاضِي، فَلَوْ بَذَّرَ بَعْدَ ذَلِكَ حُجِرَ عَلَيْهِ، وَقِيلَ يَعُودُ الْحَجْرُ بِلاَ إِعادَة، وَلَوْ فُسِّقَ لَمْ يُحْجَرْ عَلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ حُجِرَ عَلَيْهِ لِسَفَه طَرَأَ فَوَلِيُّهُ الْقاضِي، وَقِيلَ وَلِيُّهُ فِي الصِّغَرِ،

---

(وَوَقْتُهُ) كاتی ئەو تاقیکردنەوەیە (قَبْلَ الْبُلُوغِ) پێش بلۆغبوونی منداڵەکەیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَى﴾ یەتیمەکان تاقی بکەنەوە. واتە: چونکە ئەگەر بلۆغی بوو، یەتیمیی نامێنێ (وَقِيلَ بَعْدَهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە دوای بلۆغبوونە (فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودە یەکەمەکەی بەهێز (الأَصَحُّ أَنَّهُ لاَيَصِحُّ عَقْدُهُ) مامڵەت بەستنی منداڵەکە دروست نابێ (بَلْ يُمْتَحَنُ فِي الْمُماكَسَةِ) بەڵکو لە سەوداکردنەکەدا تاقی دەکرێتەوە (فَإِذَا أَرادَ الْعَقْدَ) جا هەر کاتێك ویستی مامڵەتەکە ببەستێ (عَقَدَ الْوَلِيُّ) سەرپەرشتکارەکەی مامڵەتەکە دەبەستێ.

(فَلَوْ بَلَغَ غَيْرَ رَشِيدٍ) جا ئەگەر منداڵەکە بلۆغی بوو لە حاڵەتێکی‌وەهادا: کە بۆ دین‌و دونیای نەدەگونجا (دامَ الْحَجْرُ) ئەوە لە دوای بلۆغبوونیش قەدەغەکردنەکەی هەر بەردەوام دەبێ، بەڵام (وَإِنْ بَلَغَ رَشِيداً) ئەگەر بلۆغی بوو و بۆ دین‌و دونیاشی دەگونجا، ئەو کاتە (انْفَكَّ الْحَجْرُ) قەدەغەکەی لە سەر لادەچێ (بِنَفْسِ الْبُلُوغِ) بە خودی بلۆغبوونەکە، کەوابو: (وَأُعْطِيَ مالَهُ) ماڵەکەی‌خۆی دەدرێتەوە دەستی (وَقِيلَ يُشْتَرَطُ فَكُّ الْقاضِي) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا مەرجە: قازی قەدەغەکە لاببا.

(فَلَوْ بَذَّرَ بَعْدَ ذَلِكَ) جا ئەگەر لە دوای بلۆغبوون‌و گونجانەکە ماڵی‌خۆی بەفیڕۆ دەدا، ئەو کاتەش (حُجِرَ عَلَيْهِ) لە لایەن قازی‌یەوە قەدەغەی لە سەر دادەندرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَعُودُ الْحَجْرُ بِلاَ إِعادَةٍ) قەدەغەکردنەکەی دێتەوە سەر بێ ئەوەی لە سەری دابندرێتەوە (وَلَوْ فُسِّقَ) ئەگەر لە دوای بلۆغبوون‌و گونجان فاسق بو، ئەو کاتە (لَمْ يُحْجَرْ عَلَيْهِ) قەدەغەی لە سەر دانانرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە پێشینەکان قەدەغەیان لە سەر فاسقەکان دانەناوە.

(وَمَنْ حُجِرَ عَلَيْهِ) هەر کەسێك قەدەغەی لە سەر داندرابێ (لِسَفَهٍ طَرَأَ) بە هۆی (سەفیە)ی، واتە: ماڵ بە فیڕۆدانێك کە لە دوای بلۆغبوون هاتبێتە سەری، ئەوە (فَوَلِيُّهُ الْقاضِي) سەرپەرشتکارەکەی وی قازی‌یە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (وَلِيُّهُ فِي الصِّغَرِ) سەرپەرشتکارەکەی هەر ئەو سەرپەرشتکارەی سەردەمی منداڵیەتی.

وَلَوْ طَرَأَ جُنُونٌ فَوَلِيُّهُ وَلِيُّهُ فِي الصِّغَرِ، وَقِيلَ الْقَاضِي، وَلاَ يَصِحُّ مِنَ الْمَحْجُورِ عَلَيْهِ لِسَفَهٍ بَيْعٌ وَلاَ شِرَاءٌ وَلاَ إِعْتَاقٌ وَهِبَةٌ وَنِكَاحٌ بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهِ، فَلَوِ اشْتَرَى أَوِ اقْتَرَضَ وَقَبَضَ وَتَلِفَ الْمَأْخُوذُ فِي يَدِهِ أَوْ أَتْلَفَهُ فَلاَ ضَمَانَ فِي الْحَالِ وَلاَ بَعْدَ فَكِّ الْحَجْرِ، سَوَاءٌ عَلِمَ حَالَهُ مَنْ عَامَلَهُ أَوْ جَهِلَ، وَيَصِحُّ بِإِذْنِ الْوَلِيِّ نِكَاحُهُ، لاَ التَّصَرُّفُ الْمَالِيُّ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ إِقْرَارُهُ بِدَيْنٍ قَبْلَ الْحَجْرِ أَوْ بَعْدَهُ، وَكَذَا بِإِتْلاَفِ الْمَالِ فِي الأَظْهَرِ، وَيَصِحُّ بِالْحَدِّ وَالْقِصَاصِ، وَطَلاَقُهُ وَخُلْعُهُ وَظِهَارُهُ وَنَفْيُهُ النَّسَبَ بِلِعَانٍ،

---

(وَلَوْ طَرَأَ جُنُونٌ) ئەگەر لە دوای بلۆغبوون شێتی بە سەردا هات، واتە: شێت بوو، ئەوە (فَوَلِيُّهُ) سەرپەرشتکارەکەی (وَلِيُّهُ فِي الصِّغَرِ) هەر ئەو سەرپەرشتکارەی سەردەمی منداڵیەتی (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (الْقَاضِي) سەرپەرشتکاری وی قازییە.

(وَلاَ يَصِحُّ مِنَ الْمَحْجُورِ عَلَيْهِ لِسَفَهٍ) ئەو کەسەی بە هۆی ماڵ بە فیڕۆدان قەدەغەی لە سەر داندراوە، لێی دروست نابێ (بَيْعٌ وَلاَ شِرَاءٌ) هیچ کڕینو هیچ فرۆشتنێك (وَلاَ إِعْتَاقٌ) هیچ کۆیلە ئازادکردنێكو (وَهِبَةٌ) هیچ بەخشینێك (وَ) هەروەها (نِكَاحٌ) مارەبڕینی بۆ خۆیشی دروست نیە (بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهِ) بە بێئیزنی سەرپەرشتکارەکەی.

(فَلَوِاشْتَرَى) جا ئەگەر قەدەغەکراوەکە شتێکی کڕی (أَوِ اقْتَرَضَ) یان شتێکی قەرز کرد (وَقَبَضَ) شتەکەشی وەرگرتو (وَتَلِفَ الْمَأْخُوذُ فِي يَدِهِ) ئەو شتە وەرگیراوەش لە دەستی خۆیدا فەوتا (أَوْ أَتْلَفَهُ) یان بەخۆی فەوتاندی (فَلاَ ضَمَانَ فِي الْحَالِ) ئێستا نابێتە زامین (وَلاَ بَعْدَ فَكِّ الْحَجْرِ) هەروەها لە دوای لاچوونی قەدەغەش نابێتە زامین (سَوَاءٌ) جیاوازی نیەو یەکسانە (عَلِمَ حَالَهُ مَنْ عَامَلَهُ) ئەو کەسەی مامڵەتی لەگەڵ کردوە زانیبی قەدەغەی لەسەر داندراوە (أَوْ جَهِلَ) یان نەیزانیبێ.

(وَيَصِحُّ بِإِذْنِ الْوَلِيِّ) دروست دەبێ: بە ئیزنی وەلیەکەی (نِكَاحُهُ) ژن مارەکردنی سەفیهەکە (لاَ التَّصَرُّفُ الْمَالِيُّ) بەلام دەستکاریەکانی ماڵی دروست نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَلاَ يَصِحُّ) دروست نابێ: (إِقْرَارُهُ بِدَيْنٍ قَبْلَ الْحَجْرِ) دانپێداهێنانی سەفیهەکە: بە قەرزێك کە پێش قەدەغەکردن کەوتبێتە سەری (أَوْ بَعْدَهُ) یان پاش قەدەغەکردن (وَكَذَا) هەروەها دانپێداهێنانی دروست نابێ (بِإِتْلاَفِ الْمَالِ) بە فەوتاندنی ماڵێك (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

بەلام (وَيَصِحُّ بِالْحَدِّ) دانپێداهێنان بە سزای تاوان دروست دەبێ، هەم (وَالْقِصَاصِ) بە کوشتنی لە تۆڵەش دروست دەبێ (وَ) هەروەها (طَلاَقُهُ) تەلاقدانی دروست دەبێو (وَخُلْعُهُ) تەلاقی بەرامبەر وەرگرتنی ماڵێك دروست دەبێو (وَظِهَارُهُ) زیهاری دروست دەبێو (وَنَفْيُهُ النَّسَبَ بِلِعَانٍ) هەم نەفیکردنی منداڵیشی بە لەعنەتکردن دروست دەبێ: وەك بڵێ: ئەم منداڵە هی من نیە.

وَحُكْمُهُ فِي الْعِبادَةِ كَالرَّشِيدِ لَكِنْ لاَ يُفَرِّقُ الزَّكَاةَ بِنَفْسِهِ، وَإِذَا أَحْرَمَ بِحَجٍّ فَرْضٍ أَعْطَى الْوَلِيُّ كِفايَتَهُ لِثِقَةٍ يُنْفِقُ عَلَيْهِ فِي طَرِيقِهِ، وَإِنْ أَحْرَمَ بِتَطَوُّعٍ وَزادَتْ مُؤْنَةُ سَفَرِهِ عَنْ نَفَقَتِهِ الْمَعْهُودَةِ فَلِلْوَلِيِّ مَنْعُهُ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ كَمُحْصَرٍ فَيَتَحَلَّلُ، قُلْتُ: وَيَتَحَلَّلُ بِالصَّوْمِ إِنْ قُلْنا لِدَمِ الإِحْصارِ بَدَلٌ لأَنَّهُ مَمْنُوعٌ مِنَ الْمالِ، وَلَوْ كانَ لَهُ فِي طَرِيقِهِ كَسْبٌ قَدْرَ زِيادَةِ الْمُؤْنَةِ لَمْ يَجُزْ مَنْعُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

(فَصْلٌ) وَلِيُّ الصَّبِيِّ أَبُوهُ ثُمَّ جَدُّهُ ثُمَّ وَصِيُّهُما ثُمَّ الْقاضِي،

---

(وَحُكْمُهُ فِي الْعِبادَةِ) بڕیاری شەرع لە بارەی سەفیهەکە: لە خواپەرستندا (كَالرَّشِيدِ) وەك مرۆڤی ڕەشید وایە، واتە: خواپەرستیەکانی دروستن (لَكِنْ) بەلاّم (لاَ يُفَرِّقُ الزَّكَاةَ بِنَفْسِهِ) نابێ –بێئیزنی وەلیەکەی– زەکاتیخۆی بەش بکا (وَإِذَا أَحْرَمَ بِحَجٍّ فَرْضٍ) هەر کاتێك سەفیهەکە ئیحرامی بەست بە حەجێکیواجب (أَعْطَى الْوَلِيُّ كِفايَتَهُ لِثِقَةٍ) سەرپەرشتکارەکە ئەرکی حەج کردنەکەی دەداتە دەست باوەڕ پێکراوێك (يُنْفِقُ عَلَيْهِ فِي طَرِيقِهِ) تاکو لە ڕێگای حەجدا مەسرەفی بەخێوکردنی بداتێ تا دەگەڕێتەوە.

(وَإِنْ أَحْرَمَ بِتَطَوُّعٍ) هەر کاتێك سەفیهەکە ئیحرامی بەست بە حەجی سوننەت (وَزادَتْ مُؤْنَةُ سَفَرِهِ) ئەرکی سەفەری حەجەکەی زیاتر بوو (عَنْ نَفَقَتِهِ الْمَعْهُودَةِ) لە ئەرکی بەخێوکردنی ماڵەوەی (فَلِلْوَلِيِّ مَنْعُهُ) بۆ سەرپەرشتکارەکەی دروستە: قەدەغەی بکا لە حەج کردن (وَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ كَمُحْصَرٍ) ئەم قەدەغەکراوەش وەك قەدەغەکراوی حەج وایە: کە باسمان کرد، کەوابو: (فَيَتَحَلَّلُ) ئیحرامی خۆی دەشکێنێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (وَيَتَحَلَّلُ بِالصَّوْمِ) ئیحرامی خۆی دەشکێنێو بەڕۆژوو دەبێ (إِنْ قُلْنا لِدَمِ الإِحْصارِ بَدَلٌ) ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر بڵێین: خوێنی قەدەغەکردنیحەج جێگری هەیە (لأَنَّهُ مَمْنُوعٌ مِنَ الْمالِ) چونکە سەفیهەکە قەدەغەکراوە ماڵیخۆی خەرج بکا، بەلاّم (وَلَوْ كانَ لَهُ فِي طَرِيقِهِ كَسْبٌ) ئەگەر سەفیهەکە لە ڕێگای حەجدا کەسابەتێکی وەهای دەکرد: کە (قَدْرَ زِيادَةِ الْمُؤْنَةِ) بە ئەندازەی ئەرکە زێدەکە دەبو، ئەوە (لَمْ يَجُزْ مَنْعُهُ) دروست نیە قەدەغەی بکا لە حەج کردن (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی(وَلِيّ): سەرپەرشتکاری منداڵ و شێت ﴾

(وَلِيُّ الصَّبِيِّ) سەرپەرشتکاری منداڵ–چ نێر، چ مێ– هەروەها سەرپەرشتکاری شێت–چ نێر، چ مێ– هەروەك ڕابرا (أَبُوهُ) باوکی خۆیەتی (ثُمَّ) ئینجا ئەگەر باوکی نەبو (جَدُّهُ) باپیرەی خۆیەتی، واتە: باوکی باوکو بە سەرەوەتر (ثُمَّ) ئینجا لە دوای باپیرە (وَصِيُّهُما) سەروەسێتی باوکو باپیرە، واتە: ئەو پیاوەی باوك، یان باپیرە دایناوە تاکو سەرپەرشتی منداڵەکە بکا (ثُمَّ) ئینجا ئەگەر سەروەسێت نەبو (الْقاضِي) ئەو کاتە قازی،

یان ئەمیندارێکی قازی سەرپەرشتی منداڵەکە دەکا، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلسُّلْطانُ وَلِيُّ مَنْ لاَوَلِيَّ لَهُ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، کاربەدەست سەرپەرشتکاری ئەو کەسەیە: کە سەرپەرشتکاری نیە.

(وَلاَ تَلِي الأُمُّ) دایك نابێتە سەرپەرشتکاری شێتو منداڵ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لە فەرموودەیەکیتردا: ئەگەر باوکو باپیرە نەبون، ئەو کاتە دایك دەبێتە سەرپەرشتکاری منداڵەکەو شێتەکە، بەڵکو دایك لە سەروەسێتەکەی باوکو باپیرەش لەپێشترە بۆ سەرپەرشتی منداڵەکە، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ ماڵ چاککردنەوەی شێت و یەتیم ﴾

هەر منداڵێك، یان هەر شێتێك باوکو باپیرەی نەمابن، ئەوە بۆ خزمە نێرینەکانی –وەکو براو مام– دروستە: شێتەکەو منداڵەکە بە ماڵی ئەوان بەخێو بکەن، بەڵکو ئەگەر قازی بە شەرعی ئیسلام ڕەفتاری نەدەکرد، واجبە: خزمە نێرینەکانو پیاوماقوڵانیشوێنەکە، یان خاوەن دەسەڵاتێکیشوێنەکە دەستکاری ماڵی شێتو منداڵ بخەنە ئەستۆی خۆیان، واتە: یەکێکی ئەمینو موسوڵمان بکەنە سەرپەرشتکاری ئەوان، هەرچەند بە کرێش بێ.

جا ئەگەر بە(تَقْلید)ی فەرموودە بێهێزەکەیڕابردوو: دایکیمنداڵەکە بکەنە سەرپەرشتکار –بە کرێ، یان بێکرێ– ئەوە باشتریشە، بەو مەرجەی دایکەکە ئەمینو موسوڵمان بێ، کەواتە: کرێی سەرپەرشتکار لە ماڵی شێتەکەو منداڵەکە دیاری دەکەن.

ئینجا بزانە: بۆ سەرپەرشتکارەکە دروستە: خواردەمەنیىخۆی تێکەڵی خواردەمەنیی شێتەکەو منداڵەکە بکا، بەو مەرجەی بەرژەوەندی ئەوانی تێدا بێ، جا لەو حاڵەتەدا بۆ سەرپەرشتکارەکە دروستە: میوانداری بەو ماڵە تێکەڵە بکاو بە خێریش بیداتە خەڵك، بەو مەرجەی شێتەکەو منداڵەکە ئەندازەی مافیخۆیان بۆ بمێنێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە، جا لە کوردستاندا بەم تێکەڵکردنە دەگوترێ: (ماڵ چاککردنەوەی یەتیم).

**﴿ ئاگاداری ﴾**: ئەگەر منداڵێك، یان شێتێك باوکی، یان دایکی، یان برایەکی بکوژرێ، یان ماڵی بفەوتێندرێ، یان زیانێکی لاشەیی لێبدرێ: وەك بریندار بکرێ، یان ئەندامێکی بشکێندرێ، ئەوە بۆ سەرپەرشتکارەکەی دروست نیە: تاوانکارەکە ببورێ، یان لەو تۆڵەی شەرع دیاریی کردوە، کەمتری لێوەربگرێ، بە بەڵگەی ئایەتەکەیداهاتوو، جیاوازی نیە سەرپەرشتکارەکە: باوك، یان باپیرە بێ، یان کەسێکیتر بێ، جا ئەگەر تاوانەکە کوشتنەوەی لە تۆڵەی بۆ داندرابێ، ئەو کاتە واجبە: چاوەڕوانی بلۆغبوونی

وَيَتصرَّفُ الْوَلِيُّ بِالْمَصْلَحَة، وَيَبْنِي دُورَهُ بالطِّينِ وَالآجُرّ لاَاللَّبْنِ وَالْجِصّ، وَلاَ يَبِيعُ عَقارَهُ إلاَّ لحاجَة أَوْ غِبْطَة ظاهِرَة، وَلَهُ بَيْعُ ماله بعَرْضٍ وَنَسيئَة للْمَصْلَحَة، وَإِذَا باعَ نَسيئَةً أَشْهَدَ وَارْتَهَنَ بِه، وَيَأْخُذُ لَهُ بِالشُّفْعَة أَوْ يَتْرُكُ بِحَسَب الْمَصْلَحَة، وَيُزَكِّي مالَهُ، وَيُنْفِقُ عَلَيْه بِالْمَعْرُوف،

---

منداڵەکەو چاکبوونەوەی شێتەکە بکرێ، هەروەك لە پەڕتوکی بریندارکردنو کوشتندا ئەو مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تعالَى.

کەوابو: (وَيَتَصرَّفُ الْوَلِيُّ بِالْمَصْلَحَةِ) واجبە: سەرپەرشتکارەکە بە گوێرەی بەرژەوەندی شێتەکەو منداڵەکە دەستکاری ماڵەکەیان بکا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ نزیك ماڵی یەتیم مەکەون تەنها بە ڕێگایەکی چاکتر نەبێ.

کەوابو: واجبە مڵکو ماڵەکەی بپارێزێو بە ئەندازەی زەکاتو بەخێوکردن قازانجی لێوەدەست بێنێ.

هەم (وَيَبْنِيدُورَهُ) خانووەکانیشیان بۆ دروست بکا (بِالطِّينِ وَالآجُرِّ) بە قوڕو خشتی سورکراوە (لاَ اللَّبْنِ وَالْجِصِّ) نەك بە خشتیقوڕو گەچ، بەڵام زۆر لە زانایان ئەو فەرموودەیان هەڵبژاردوە: کە بەگوێرەی عادەتی شوێنەکە خانووەکە دروست دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يَبِيعُ عَقَارَهُ) نابێ سەرپەرشتکارەکە زەمینو باغی هیچێکیان بفرۆشێ (إِلاَّ لِحاجَةٍ) تەنها لەبەر پێویستی ئەوان نەبێ: وەك ترسی ستەمکارو ترسی خراپبوون (أَوْ غِبْطَةٍ ظاهِرَةٍ) یان لەبەر قازانجێکی ئاشکرا: وەك بە زیاتر لە پارەی هاوێنەی خۆی بیفرۆشێ، یان بەو پارەیە شتێکی باشتریان بۆ بکڕێتەوە.

(وَلَهُ بَيْعُ مالِهِ) هەروەها بۆ سەرپەرشتکارەکە دروستە: ماڵی منداڵو شێت بفرۆشێ (بِعَرْضٍ) بە کەلوپەلێکی جگە لە پارە، هەم (وَنَسِيئَةٍ) دروستە بە قەرزیش بیفرۆشێ (لِلْمَصْلَحَةِ) لە بەر بەرژەوەندی، بەڵام (وَإِذَا باعَ نَسِيئَةً) هەر کاتێك بە قەرزی فرۆشت (أَشْهَدَ) واجبە: دوو شاهید بگرێو هەم (وَارْتَهَنَ بِهِ) واجبە بارمتەش بۆ قەرزەکە وەربگرێ.

(و) هەروەها (يَأْخُذُ لَهُ بِالشُّفْعَةِ) سەرپەرشتکارەکە مڵکە هاوبەشەکەی ئەوان بە (شوفعە) بۆیان وەردەگرێتەوە (أَوْ يَتْرُكُ) یان وەریناگرێتەوە (بِحَسَبِ الْمَصْلَحَةِ) واجبە: بە گوێرەی بەرژەوەندی لەو دووانە یەکێکیان بکا (وَيُزَكِّي مالَهُ) هەم واجبە: زکاتەکەشیان بۆ بدا، هەروەك لە باسی زەکاتدا ڕابرا (وَيُنْفِقُ عَلَيْهِ بِالْمَعْرُوفِ) بەگوێرەی لێوەشانەوەو عادەتی شوێنەکە بە ماڵەکەیخۆیان بەخێویان دەکا.

فَإِذا ادَّعَى بَعْدَ بُلُوغِهِ عَلَـى الأَبِ وَالْجَـدِّ بَيْعـاً بِـلاَ مَصْـلَحَةٍ صُـدِّقا بِـالْيَمِينِ، وَإِنِ ادَّعـــاهُ عَلَى الْوَصِـــيِّ وَالأَمِـــينِ صُـــدِّقَ هُـــوَ بِيَمِينِـــهِ.

(بَابُ الصُّلْحِ)

هُوَ قِسْمانِ: أَحَدُهُما يَجْرِى بَيْنَ الْمُتَداعِيَيْنِ، وَهُوَ نَوْعانِ، أَحَدُهُما: صُلْحٌ عَلَى إِقْـرارٍ، فَإِنْ جَرَى عَلَى عَيْنٍ غَيْرِ الْمُدَّعاةِ فَهُوَ بَيْعٌ بِلَفْظِ الصُّلْحِ

---

(فَإِذا ادَّعَى بَعْدَ بُلُوغِهِ عَلَى الأَبِ وَالْجَدِّ) جا هەر کاتێك -منداڵەکە- لە دوای بلۆغبوون، یان لە دوای چاکبوونەوەی لە شێتی، داوایەکی لە سەر باوکی، یان لە سەر باپیرەی هەبو: کە ئەوان (بَيْعـاً بِلاَمَصْلَحَةٍ) ماڵی ئەویان فرۆشتوە بە بێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی -لەو حاڵەتەشدا هیچ شاهیدێك نەبو- ئەوە (صُدِّقا بِالْيَمِينِ) باوەڕ بە باوکو باپیرە دەکرێ ئەگەر سوێند بخۆن، بەڵام (وَإِنِ ادَّعاهُ عَلَى الْوَصِيِّ وَالأَمِينِ) ئەگەر داوایەکەی لە سەر سەروەسیێتو ئەمیندارەکە بوو، ئەو کاتە (صُدِّقَ هُوَ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە منداڵەباڵغەکەو شێتەچاکبۆوەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخۆن.

## ﴿ بَابُ الصُّلْحِ: باسی سولح کردن ﴾

واتە: پێکهاتن بۆ نەهێشتنی کێشەی دوو کەس، یان زیاتر، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ پێکهاتن باشترە. هەم پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلصُّلْحُ جـائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ صُلْحاً حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَـلَّ حَرامـاً﴾ رواه الترمذي وابن حبان وصححاه، پێکهاتن لە نێوان موسوڵمانانیدا دروستە، تەنها پێکهاتنێك نەبێ: کە حەرامی پێ حەڵاڵ بکرێ، یان حەڵاڵی پێ حەرام بکرێ.

(هُوَ) سولح کردن (قِسْمانِ) دوو بەشە (أَحَدُهُما) بەشی یەکەمیان: (يَجْرِى بَيْنَ الْمُتَداعِيَيْنِ) ئەو پێکهاتنەیە: کە لە نێوان داواکارو داوا لێکراودا دێتە جێ (وَهُوَ) پێکهاتنی نێوان داواکارو داوا لێکراو (نَوْعانِ) دوو جۆرن: (أَحَدُهُما) جۆری یەکەمیان: (صُلْحٌ عَلَى إِقْرارٍ) پێکهاتنێکە لە سەر دانپێداهێنانی داوالێکراوەکە دەستی پێ دەکرێ، یان لە سەر هەبوونی شاهیدی داواکارەکە دەستی پێ دەکرێ، جا ئەم جۆرەیان چوار حاڵەتی هەنە:

**حاڵەتی یەکەم:** (فَإِنْ جَرَى عَلَى عَيْنٍ) ئەگەر پێکهاتنەکە هاتە جێ لە سەر وەرگرتنی شتێکی تری (غَيْرِ الْمُدَّعاةِ) جگە لە شتەکەی داواکراو، وەك داواکار بڵێ: ئەم خانووە هی منە. ئەویش بڵێ: ڕاست دەکەی. یان شاهیدی هەبێ، ئینجا داوالێکراو بڵێ: خانووەکەتم لێ مەستێنەوە، لە جیاتی خانووەکەت ئەم ئۆتۆمبیلەمت دەدەمێ. (فَهُوَ بَيْعٌ) ئەو جۆرە پێکهاتنە دروستەو کڕینو فرۆشتنێکە (بِلَفْظِ الصُّلْحِ) بە ووشەی سولح ڕووی داوەو پێی دەگوترێ: (صُلحُ الْمُعاوَضَةِ)، واتە: پێکهاتنی گۆڕینەوە.

تَثْبُتُ فيه أَحْكامُهُ: كَالشُّفْعَة وَالرَّدِّ بالْعَيْب وَمَنْعِ تَصَرُّفه قَبْلَ قَبْضه وَاشْتِراط التَّقابُض إن اتَّفقا في علَّة الرِّبا، أَوْ عَلَى مَنْفَعَة فَإجارَةٌ تَثْبُتُ أَحْكامُها، أَوْ عَلَى بَعْضِ الْعَيْنِ الْمُدَّعاة فَهِبَةٌ لبَعْضها لصاحب الْيَد فَتَثْبُتُ أَحْكامُها، وَلاَ يَصِحُّ بلَفْظ الْبَيْع، وَالأَصَحُّ صحَّتُهُ بلَفْظ الصُّلْح، وَلَوْ قالَ منْ غَيْر سَبْق خُصُومَة صالحْني عَنْ دارِكَ بكَذا فالأصَحُّ بُطْلانُهُ،

---

کەوابو: (تَثْبُتُ فيه أَحْكامُهُ) گشت بڕیارەکانی کڕینو فرۆشتنی بۆ دەبێ (كَالشُّفْعَة) وەك بە شوفعە وەرگرتنەوەی هاوبەشو (وَالرَّدِّ بالْعَيْب) هەم گەڕاندنەوەی وەرگیراوەکە بە هۆی عەیبداری، هەم پەشیمانبوونەوەکانی مەرجو دانیشگەو (وَمَنْعِ تَصَرُّفه قَبْلَ قَبْضه) هەم وەك قەدەغەی دەستکاریکردنیوەرگیراوەکە پێش وەرگرتنیو (وَاشْتِراطِ التَّقابُضِ) هەم وەك مەرجی لێکوەرگرتن پێش لێکجیابوونەوە (إن اتَّفقا في علَّة الرِّبا) ئەگەر هەردوو گۆڕدراوەکان هۆکاری ڕیبایان وەکو یەکتری بون: وەك لەجیاتی جۆ، گەنم وەربگرێ.

حاڵەتی دووەم: (أَوْ عَلَى مَنْفَعَة) یان ئەگەر پێکهاتنەکە هاتە جێ لە سەر وەرگرتنی سودێك لەجیاتی شتەداوکراوەکە، وەك بڵێ: خانووەکەتم لێمەستێنەوە، لەجیاتی خانووەکەت بۆ ماوەی ساڵێك کار بەم ئۆتۆمبیلەم بکە. (فَإجارَةٌ) ئەو پێکهاتنەش دروستەو بەکرێدانی دلواکراوەکەیە، کەوابو: (تَثْبُتُ أَحْكامُها) بڕیارەکانیبەکرێدانی بۆ دەبێ کە لە باسی بەکرێداندا باس کراون، ئەوەش هەر پێی دەگوترێ: (صُلْحُ الْمُعاوَضَة) پێکهاتنیگۆڕینەوە.

حاڵەتیسێیەم: (أَوْ عَلَى بَعْضِ الْعَيْنِ الْمُدَّعاة) یان ئەگەر پێکهاتنەکە هاتە جێ لە سەر وەرگرتنەوەی بەشێکی شتەداواکراوەکە، وەك بڵێ: نیوەی خانووەکەتم لێوەریگرەو لە نیوەکەیتر بمبورە. (فَهِبَةٌ لبَعْضها لصاحب الْيَد) ئەو پێکهاتنە دروستەو بەخشینی بەشێکیداواکراوەکەیە بە خاوەن دەستەکەو پێی دەگوترێ: (صُلْحُ الْحَطيطَة) پێکهاتنی داشکاندن، کەوابو: (فَتَثْبُتُ أَحْكامُها) بڕیارەکانی بەخشینی بۆ دەبێ: کە لە باسی بەخشیندا باس کراون.

کەوابو: (وَلاَ يَصِحُّ بلَفْظ الْبَيْع) بە ووشەی فرۆشتن ئەم پێکهاتنەی داشکاندن دروست نابێ، چونکە هیچی لەجیاتی وەرنەگیراوە، بەڵام (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (صحَّتُهُ بلَفْظ الصُّلْح) بە ووشەی سولح ئەم پێکهاتنەیداشکاندن دروست دەبێ.

(وَلَوْ قالَ منْ غَيْر سَبْق خُصُومَة) ئەگەر بە بێڕوودانی هیچ کێشەیەك گوتی (صالحْني عَنْ دارِكَ بكَذا) سولحم لەگەڵ بکە لەجیاتی خانووەکەت بەوەندە پارەیە (فالأصَحُّ بُطْلانُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر ئەم پێکهاتنە پوچەڵەو دانەمەزراوە، چونکە پێشدا هیچ کێشەیەك ڕووی نەداوە.

وَلَوْ صالَحَ مِنْ دَيْنٍ عَلَى عَيْنٍ صَحَّ، فَإِنْ تَوافَقا فِي عَلَّةِ الرِّبا اُشْتُرِطَ قَبْضُ الْعِوَضِ فِي الْمَجْلِسِ، وَإِلاَّ فَإِنْ كانَ الْعِوَضُ عَيْناً لَمْ يُشْتَرَطْ قَبْضُهُ فِي الْمَجْلِسِ فِي الأَصَحِّ، أَوْ دَيْناً اُشْتُرِطَ تَعْيِينُهُ فِي الْمَجْلِسِ، وَفِي قَبْضِهِ الْوَجْهانِ، وَإِنْ صالَحَ مِنْ دَيْنٍ عَلَى بَعْضِهِ فَهُوَ إِبْراءٌ عَنْ باقِيهِ

---

**حاڵەتی چوارەم:** (وَلَوْ صالَحَ مِنْ دَيْنٍ) ئەگەر سولحی کرد لە قەرزێك (عَلَى عَيْنٍ) لە سەر وەرگرتنی شتێك لەجیاتی‌قەرزەکە (صَحَّ) ئەو پێکهاتنەش دروست دەبێ‌و هەر بە(صُلْحُ الْمُعاوَضَةِ) پێکهاتنی‌گۆڕینەوە ناو دەبرێ (فَإِنْ تَوافَقا فِي عَلَّةِ الرِّبا) جا ئەگەر قەرزەکەو شتەوەرگیراوەکە لە هۆکاری ڕیبادا وەکو یەکتری بون (اشْتُرِطَ قَبْضُ الْعِوَضِ فِي الْمَجْلِسِ) بە مەرج داندراوە: ئەو شتەی لەجیاتی‌قەرزەکەیە –پێش لێکجیابوونەوە– لە دانیشگەی پێکهاتنەکەدا وەربگیرێ ئەوەك ڕیبا ڕوویدا:

بۆ وێنە: ئەگەر ژنێك بە مێردەکەی گوت: ئەوە سولحم لەگەڵ کردی لە نۆزدە میسقال زێڕی مارەییەکەم بە دە هەزار دیناری عێراقی. ئەوە مەرجە: دە هەزار دینارەکە –پێش لێکجیابوونەوە– لە دانیشگەی پێکهاتنەکەدا وەربگرێ، ئەگینا: دەبێتە ڕیبا.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە هۆکاری ڕیبادا وەکو یەکتری نەبون، ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ كانَ الْعِوَضُ عَيْناً) ئەگەر ئەو شتەی لەجیاتی‌قەرزەکە وەردەگیرێ، شتێکی بەرچاو بوو، واتە: قەرز نەبو: وەك ژنەکە لەجیاتی نۆزدە میسقالەکە خانووێك، یان نۆزدە مەڕ، یان مانگایەك وەربگرێ، ئەوە (لَمْ يُشْتَرَطْ قَبْضُهُ فِي الْمَجْلِسِ) مەرج نیە لە دانیشگەی پێکهاتنەکەدا شتەکە وەربگرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(أَوْ دَيْناً) یان ئەگەر ئەو شتەی لەجیاتی‌قەرزەکە وەردەگیرێ، ئەویش هەر قەرز بوو: وەك لەجیاتی نۆزدە میسقالەکە هەزار کیلۆ گەنم قەرز بێ لە سەر مێردەکەی، ئەوە (اُشْتُرِطَ تَعْيِينُهُ فِي الْمَجْلِسِ) بە مەرج داندراوە: لە دانیشگەی پێکهاتنەکەدا شتە قەرزەکە دیاری بکرێ، بەڵام (وَفِي قَبْضِهِ) لە بارەی وەرگرتنی قەرزەکە لە دانیشگەی پێکهاتنەکەدا (الْوَجْهانِ) دوو فەرموودەکە هەنە: ڕاستترەکەیان: مەرج نیە پێش لێکجیابوونەوە وەربگیرێ.

(وَإِنْ صالَحَ مِنْ دَيْنٍ) ئەگەر لە قەرزێك سولحی کرد (عَلَى بَعْضِهِ) لە سەر وەرگرتنی بەشێکی قەرزەکە: وەك بڵێ: ئەوە سولحم لەگەڵ کردی لەو نۆزدە میسقال زێڕەی مارەییم تەنها دە میسقالم بدێ. ئەم پێکهاتنەش دروستەو –وەکو بەخشین– بەشێکە لە (صُلْحُ الْحَطِيطَةِ) پێکهاتنی‌داشکاندن، چونکە (فَهُوَ إِبْراءٌ عَنْ باقِيهِ) ئەو داشکاندنە گەردەن ئازادکردنە لەو بەشەقەرزەی ماوە، بۆیێ هەم پێی دەگوترێ: (صُلْحُ الإِبْراءِ) پێکهاتنی گەردن ئازادکردن.

وَيَصِحُّ بِلَفْظِ الإبْراءِ وَالْحَطِّ وَنَحْوِهما وَبِلَفْظِ الصُّلْحِ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ صالَحَ مِنْ حالٍّ عَلَى مُؤَجَّلٍ مِثْلِه أَوْ عَكَسَ لَغا، فَإِنْ عَجَّلَ الْمُؤَجَّلَ صَحَّ الأَداءُ، وَلَوْ صالَحَ مِنْ عَشَرَةٍ حالَّةٍ عَلَى خَمْسَةٍ مُؤَجَّلَةٍ بَرِئَ مِنْ خَمْسَةٍ وَبَقِيَتْ خَمْسَةٌ حالَّةٌ، وَلَوْ عَكَسَ لَغا.
اَلنَّوْعُ الثَّانِي: اَلصُّلْحُ عَلَى الإِنْكارِ،

---

کەوابو: (وَيَصِحُّ بِلَفْظِ الإبْراءِ) پکهاتنەکە بە ووشەی گەردن ئازادکردن دروست دەبیٌ و هەم (وَالْحَطِّ) بە ووشەی داشکاندن دروست دەبیٌ و هەم (وَنَحْوِهِما) بەوەی وەکو ئەم دوو ووشەیەش بیٌ: وەك لیٌتم بورد، یان چاوپۆشیم لیٌت کرد، یان فرێمدا (وَبِلَفْظِ الصُّلْحِ) هەم بە ووشەی سولحیش دروست دەبیٌ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرمودەی ڕاستردا.
جا ئەگەر بە ووشەی سولح بیٌ: ئەوە قبولکردنیشی مەرجە، بەلام لە ووشەکانیتردا قبولکردن مەرج نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
﴿ ئاگاداری ﴾: بە هیچ جۆرێك دروست نیە مندالٌ و شێت سولح بکەن و ئەو کەسانە ببورن کە دەستدرێژییان کردۆتە سەر مالٌی ئەوان، یان ئەندامێکی ئەوان، هەروەك لە پەرتووکی کوشتندا روونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تعالى.
(وَلَوْ صالَحَ مِنْ حالٍّ) ئەگەر سولحی کرد لە قەرزێکی وەها: کە کاتی دانەوەی هاتبو (عَلَى مُؤَجَّلٍ مِثْلِهِ) لە سەر وەرگرتنی قەرزێکی دواخراوی وەکو خۆی، وەك بلیٌ: سولحم لەگەلٌ کردی ئەم قەرزەم ئێستا مەدەوە پاش دوو مانگیتر قەرزێکی وەکو ویم بدەوە (أَوْ عَكَسَ) یان بە پێچەوانەوە گوتی: ئەو قەرزەی پاش دوو مانگیتر کاتی دانەوەی دیٌ، ئێستا بمدەوە (لَغا) لە هەر دووکیاندا پێکهاتنەکە پووچەلٌ دەبێتەوەو دروست نابیٌ، کەوابو: بڕیاری هەردوو قەرزەکان وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەلام (فَإِنْ عَجَّلَ الْمُؤَجَّلَ) ئەگەر قەرزدارەکە قەرزدانەوەکەی وەپێش خستو ئێستا دایەوە (صَحَّ الأَداءُ) قەرزدانەوەکە دروست دەبیٌ.
(وَلَوْ صالَحَ مِنْ عَشَرَةٍ حالَّةٍ) ئەگەر سولحی کرد لە دە دیناری قەرز: کە کاتیدانەوەی هاتبو (عَلَى خَمْسَةٍ مُؤَجَّلَةٍ) لە سەر وەرگرتنی پێنج دیناریدواخراو (بَرِئَ مِنْ خَمْسَةٍ) قەرزدارەکە لە پێنج دینار گەردەنی ئازاد دەبیٌ و (وَبَقِيَتْ خَمْسَةٌ حالَّةٌ) پێنج دیناری حازریشی لە ئەستۆدا دەمێنیٌ، بەلام (وَلَوْ عَكَسَ) ئەگەر بە پێچەوانەوە گوتی: ئەو دە دینارە قەرزەی پاش دوو مانگیتر کاتی دانەوەی دیٌ سولحم لەگەلٌ کردی لە سەر پێنج دیناری ئێستای حازر بمدەیٌ (لَغا) ئەو پێکهاتنەش پووچەلٌ دەبێتەوە، چونکە لە بەرامبەر وەپێشخستنی کاتەکە وازی لە پێنجەکەیتر هێناوەو کاتەکەشی وەپێش نایەخریٌ.
(اَلنَّوْعُ الثَّانِي) جۆری دووەمی سولح: (اَلصُّلْحُ عَلَى الإِنْكارِ) سولح کردنێکە لە سەر دانەهێنانی داوالێکراوەکە دەستی پیٌدەکریٌ، کە لەو حالٌەتەشدا داواکار هیچ بەلگەیەکی

فَيَبْطُلُ إنْ جَرَى عَلَىنَفْسِ الْمُدَّعَى، وَكَذَا إنْ جَـرَى عَلَىبَعْضِـهِ فِىالأَصَـحِّ، وَقَوْلُـهُ: صالحْنى عَلَىالدَّارِالَّتى تَدَّعِيها لَيْسَ إقْراراً فِىالأَصَحِّ. اَلْقِسْمُ الثَّانى: يَجْرى بَيْنَ الْمُـدَّعِى وَالأَجْنَبِىِّ: فَإنْ قالَ وَكِّلْنى الْمُدَّعَىعَلَيْهِ فِىالصُّلْحِ وَهُوَ مُقِرٌّ لَكَ صَحَّ، وَلَوْ صالَحَ لِنَفْسِـهِ وَالْحالَةُ هَذِه صَحَّ وَكَأَنَّهُ اشْتَراهُ، وَإنْ كانَ مُنْكِراً وَقالَ الأَجْنَبِيُّ هُوَ مُبْطِلٌ فِى إنْكارِهِ

---

شەرعیی نەبێ (فَيَبْطُلُ) ئەو پێکهاتنە بەتاڵەو دروست نابێ (إنْ جَرَى عَلَى نَفْسِ الْمُدَّعَى) ئەگەر پێکهاتنەکە بێتەجێ لە سەر وەرگرتنی خودیدلواکراوەکە: وەك کێشەکەیان لە سەر خانوویەك بێ، دلوالێکراویش دان نەهێنێ، ئینجا خانووەکە بدرێتە دلواکار، یان بدرێتە دلوالێکرلو، یان شتێکیتر لە جیاتیخانووەکە بدرێتە یەکێکیان، ئەوە دروست نیە.

(وَكَذَا) هەروەها دروست نیە (إنْ جَرَى عَلَى بَعْضِهِ) ئەگەر پێکهاتنەکە لە سەر وەرگرتنی بەشێکیدلواکراوەکەش بێتەجێ: وەك نیوەی خانووەکە (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَقَوْلُهُ) قسەی داوا لێکراو پاش داننەهێنانی کە بڵێ: (صالحْنى عَلَىالدَّارِ الَّتى تَدَّعِيها) سولحم لەگەڵ بکە لە سەر ئەو خانووەی داوای دەکەی (لَيْسَ إقْراراً) ئەو گوتەیە نابێتە دانهێنان (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: لە هەر سێك مەزهەبەکەیتردا: سولح کردن لە حاڵەتی داننەهێنانیشدا دروستە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(اَلْقِسْمُ الثَّانِى) بەشی دووەمی سولح کردن (يَجْرِى بَيْنَ الْمُدَّعِى وَالأَجْنَبِىِّ) پێکهاتنێکە لە نێوان داواکارو بێگانەیەك دێتەجێ (فَإنْ قالَ) جا ئەگەر بێگانەکە بە داواکارەکەی گوت: (وَكِّلْنى الْمُدَّعَىعَلَيْهِ فِىالصُّلْحِ) داوا لێکراوەکە منی کردۆتە وەکیلی خۆی لەم پێکهاتنەدا، هەم (وَهُوَ مُقِرٌّ لَكَ) داوا لێکراوەکەش دان بە ماڤی تۆدا دەهێنێ. یان گوتی: من دەزانم ماڤی تۆیە، جا ئەم شتەش هی داوالێکراوەکەیە لە جیاتی مافەکەی خۆت لێم وەربگرە. ئینجا داواکارەکەش سولحی کرد، واتە: شتەکەی داوالێکراوەکەی لە وەکیلەکە وەرگرت (صَحَّ) ئەو پێکهاتنە دروستە، چونکە لە گشت مامڵەتێکدا قسەی مرۆڤ وەردەگیرێ: کە بڵێ: من وەکیلی فلانکەسم.

(وَلَوْ صالَحَ لِنَفْسِهِ) هەروەها ئەگەر بێگانەکە سولحەکەی بۆ خۆی کرد، واتە: شتێکیخۆی دایە دلواکارەکە لە جیاتیمافەکەی (وَالْحالَةُ هَذِهِ) حاڵەتەکەش هەر حاڵەتیڕابردوو بوو، واتە: گوتی دلوالێکرلو دان بە مافیتۆدا دەهێنێ، یان هیتۆیە (صَحَّ) ئەو پێکهاتنەش دروستەو (وَكَأَنَّهُ اشْتَراهُ) وای لێ دێ بێگانەکە شتەدلواکرلوەکەی—لە دلواکار—کڕیوە بۆ خۆی.

(وَإنْ كانَ مُنْكِراً) بەڵام ئەگەر دلوالێکرلوەکە دانی نەدەهێنا بە مافی دلواکارەکەو (وَقالَ الأَجْنَبِىُّ هُوَ مُبْطِلٌ فِىإنْكارِهِ) بێگانەکەش بە دلواکارەکەی گوت: دلوالێکرلوەکە ناهەقە لەو

فَهُوَ شِراءُ مَغْصُوب فَيُفَرَقُ بَيْنَ قُدْرَتِهِ عَلَى انْتِزاعِهِ وَعَدَمِها، وَإِنْ لَمْ يَقُلْ هُوَ مُبْطِلٌ لَغا الصُّلْحُ.
(فَصْلٌ) اَلطَّرِيقُ النّافِذُ لاَ يُتَصَرَّفُ فِيهِ بِما يَضُرُّ الْمارَّةَ، وَلاَ يُشْرَعُ فِيهِ جَناحٌ وَلاَ ساباطٌ يَضُرُّهُمْ، بَلْ يُشْتَرَطُ ارْتِفاعُهُ بِحَيْثُ يَمُرُّ تَحْتَهُ مُنْتَصِباً، وَإِنْ كانَ مَمَرَّ الْفُرْسانِ وَالْقَوافِلِ فَلْيَرْفَعْهُ بِحَيْثُ يَمُرُّ تَحْتَهُ الْمَحْمِلُ عَلَى الْبَعِيرِ مَعَ أَخْشابِ الْمِظَلَّةِ، وَيَحْرُمُ الصُّلْحُ عَلَى إِشْراعِ الْجَناحِ،

---

داننەهێنانەدا، تۆ ڕاست دەکەی، بەڵام سولح لەگەڵ من بکە، ئەم شتەی خۆمت لە جیاتی دەدەمێ. ئینجا دواکارەکە سولحی لەگەڵ بێگانەکە کرد (فَهُوَ شِراءُ مَغْصُوبٍ) ئەو سولحەش کڕینی شتێکی زەوتکراوە، کەوابوو: (فَيُفَرَقُ بَيْنَ قُدْرَتِهِ عَلَى انْتِزاعِهِ) بڕیاری دروستبوون لێك جیادەکرێتەوە: ئەگەر بێگانەکە توانای سەندنەوەی دواکراوەکەی هەبێ، ئەوە سولحەکە دروست دەبێ (وَعَدَمِها) ئەگەر توانایشی نەبێ، دروست نابێ، بەڵام (وَإِنْ لَمْ يَقُلْ هُوَ مُبْطِلٌ) ئەگەر بێگانەکە نەڵێ دواڵێکراوەکە ناهەقە (لَغا الصُّلْحُ) پێکهاتنەکە پوچەڵ دەبێو دانامەزرێ، چونکە شتێکی وەهای کڕیوە کە نەیزانیوە ملکی ئەوە، یان نا.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی باڵە پەستە لە سەر مافەکانی هاوبەش ﴾**

(اَلطَّرِيقُ النّافِذُ) هەر ڕێگایەکو هەر کۆڵانێك کە هەردوو سەری دەربچێ (لاَ يُتَصَرَّفُ فِيهِ) نابێ دەستکاریی تێدا بکرێ (بِما يَضُرُّ الْمارَّةَ) بە دەستکارییەکی وەها: زیان لەو کەسانە بدا کە هاتوچۆی تێدا دەکەن، هەم (وَلاَ يُشْرَعُ فِيهِ جَناحٌ) نابێ هیچ زێدە بانێك بە سەر ئاسمانی ڕێگاو کۆڵانەکەدا بهێندرێتە دەرەوە، هەم (وَلاَ ساباطٌ) نابێ ساباتیشی لە سەر دروست بکرێ (واتە: بانێکی وەها: کە لە سەر دوو دیوار داندرابێ) بە شێوەیەکی وەها: کە (يَضُرُّهُمْ) زێدە بانەکەو ساباتەکەی سەر دیوارەکان زیان لەو کەسانە بدا: کە هاتوچۆی بە ژێردا دەکەن (بَلْ يُشْتَرَطُ ارْتِفاعُهُ) بەڵکو-بۆ دروستبوون- بە مەرج دادەندرێ: بانەکە بەرز بێ (بِحَيْثُ يَمُرُّ تَحْتَهُ مُنْتَصِباً) بە شێوەیەکی وەها: مرۆڤی پیادە بە ڕاستبوویی لە ژێریدا بڕواو ئەگەر شتێکیشی لە سەر سەری دانابێ، نەگاتە بانەکە.

(وَإِنْ كانَ مَمَرَّ الْفُرْسانِ وَالْقَوافِلِ) ئەگەر ڕێگاکەش ڕێگای ڕابردنی سوارو کاروانەکان بوو (فَلْيَرْفَعْهُ) واجبە زێدە بانەکە بەرز بکا (بِحَيْثُ يَمُرُّ تَحْتَهُ الْمَحْمِلُ عَلَى الْبَعِيرِ) بە شێوەیەکی وەها: کەژاوەی سەر ووشتر لە ژێریدا بڕوا (مَعَ أَخْشابِ الْمِظَلَّةِ) لەگەڵ دارەکانی سێبەرگەی سەر کەژاوەکە، کەواتە: ئەگەر ڕێگاکە جادەی ئۆتومبێل بوو، مەرجە: لۆریی گەورەی بارکراو لە ژێریدا بڕوا، هەروەك لە (تحفة) دەفامێتەوە.

(وَيَحْرُمُ الصُّلْحُ) حەرامە پێکهاتن بە وەرگرتنی شتێك لە خاوەن خانووەکە (عَلَى إِشْراعِ الْجَناحِ) لە سەر هێنانە دەرەوەی زێدە بانەکە، واتە: پێکهاتنەکە حەرامە: هەم بۆ

وَأَنْ يَبْنِيَ فِي الطَّرِيقِ دَكَّةً، أَوْ يَغْرِسَ شَجَرَةً، وَقِيلَ إِنْ لَمْ يَضُرَّ جازَ، وَغَيْرُالنَّافِذِ يَحْـرُمُ الإِشْراعُ إِلَيْهِ لِغَيْرِأَهْلِه، وَكَذَا لِبَعْضِ أَهْلِهِ فِي الأَصَحِّ إِلاَّ بِرِضاالْباقِينَ، وَأَهْلُهُ مَـنْ نَفَـذَ بابُ دارِهِ إِلَيْهِ لاَ مَنْ لاَصَقَهُ جِدارُهُ،

---

دانیشتووانی شوێنەکەو هەم بۆ گەورەی موسوڵمانانیش، چونکە ئەگەر زێدەبانەکەی بۆ دروست بێ، ئەوە مافێکی‌شەرعی‌ی خۆیەتی، ئەگەر بۆی دروست نەبێ، ئەوە بە پارە حەلاڵ نابێ.

(وَ) هەروەها حەرامە (أَنْ يَبْنِيَ فِي‌الطَّرِيقِ دَكَّةً) سەکۆ، یان دوکان لە ڕێگادا دروست بکا، هەرچەند ڕێگاکەش بەرین بێ (أَوْ يَغْرِسَ شَجَرَةً) یان درەختێکی تێدا بچێنێ، چونکە ڕێگاکە بەرتەسک دەبێ، کەواتە: ئەگەر لقی درەختێك دەهاتەوە سەر ڕێگاو زیانی لە هاتوچۆ دەدا، واجبە: لابېردرێ، یان ببڕدرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (إِنْ لَمْ يَضُرَّ) ئەگەر زیان لە خەڵکی نەدا (جازَ) دروستە.

ئینجا بزانە: دروستە کەرستەی خانوو دروستکردن لە سەر ڕێگا دابندرێ تا ئەو ماوەیەی دەگوازرێتەوە سەر زەمینی خانووەکە، بەو مەرجەی ئەندازەی تێدا ڕابردن بمێنێ، بەلام دروست نیە: وولاغی لێ ببەسترێتەوە، یان شتی پیسی فڕێ بدرێتە سەر، یان ئاوی سەرشۆرگە بەرەڵ بداتە ڕێگایەکی تەسک، هەروەك لە (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها دروست نیە: زێدەبان بە سەر هەوای مزگەوتو قوتابخانەو شوێنە گشتیەکانی‌تردا بهێندرێتە دەرەوە، هەرچەند زیانیشی نەبێ، هەروەك لە (تحفة) و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَغَيْرُالنَّافِذِ) ئەو کۆڵانەی سەرەکەی‌تری دەرناچێ، واتە: گیراوە (يَحْرُمُ الإِشْراعُ إِلَيْهِ لِغَيْرِ أَهْلِه) جگە لە خەڵکی‌کۆڵانەکە، بۆ گشت کەسێکی‌تر حەرامە: زێدە بانێك دەربێنێتە سەر ئاسمانی‌کۆڵانەکە، هەرچەند زیانیشی نەبێ.

(وَكَذَا لِبَعْضِ أَهْلِهِ) هەروەها بۆ هەندێکی خەڵکی کۆڵانەکەش حەرامە (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (إِلاَّ بِرِضاالْباقِينَ) تەنها بە ڕازی‌بوونی دانیشتووەکانی‌تر نەبێ، واتە: ئەگەر ئەوانی‌تر ڕازی بن، ئەو کاتە دروستە زێدە بانەکە بباتە دەرەوە.

(وَأَهْلُهُ) مەبەست بە خەڵکی کۆڵانەکە (مَنْ نَفَذَ بابُ دارِهِ إِلَيْهِ) ئەو کەسەیە: کە دەرگای خانووەکەی بە لای کۆڵانەکەدا کرابێتەوە (لاَ مَنْ لاَصَقَهُ جِدارُهُ) نەك ئەو کەسەی دیواری خانووەکەی بە لای کۆڵانەکەوەیەو هیچ دەرگایشی لە دیوارەکەدا نەکراوەتەوە، واتە: ئەمەیان بە خەڵکی کۆڵانەکە دانانرێ.

ئینجا بزانە: دروستە مرۆڤ بە ملکی کەسێکی‌تردا ڕابرێ بەو مەرجەی بەو ڕابردنەی وی نەبێتە ڕێگەو بەگوێرەی عادەتیش چاو پۆشی‌ی لێبکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَهَلِ الْإِسْتِحْقاقُ فِي كُلِّها لِكُلِّهِمْ أَمْ تَخْتَصُّ شِرْكَةُ كُلِّ واحِدٍ بِما بَيْنَ رَأْسِ الدَّرْبِ وَبابِ دارِهِ؟ وَجْهانِ: أَصَحُّهُمَا الثّانِي، وَلَيْسَ لِغَيْرِهِمْ فَتْحُ بابٍ إِلَيْهِ لِلإِسْتِطْراقِ، وَلَهُ فَتْحُهُ إِذَا سَمَّرَهُ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ لَهُ فِيهِ بابٌ فَفَتَحَ آخَرَ أَبْعَدَ مِنْ رَأْسِ الدَّرْبِ فَلِشُرَكائِهِ مَنْعُهُ، وَإِنْ كانَ أَقْرَبَ إِلَى رَأْسِهِ وَلَمْ يَسُدَّ الْبابَ الْقَدِيمَ فَكَذَلِكَ، وَإِنْ سَدَّهُ فَلاَ مَنْعَ، وَمَنْ لَهُ داران تَفْتَحانِ إِلَى دَرْبَيْنِ مَسْدُودَيْنِ،

---

(وَهَلِ الإِسْتِحْقاقُ فِي كُلِّها لِكُلِّهِمْ) ئایا مافی هەموو كۆلانەكە بۆ هەموو دانیشتووانیەتی (أَمْ تَخْتَصُّ شِرْكَةُ كُلِّ واحِدٍ) یان تایبەتە هاوبەشیەتی هەر یەكێكیان (بِما بَيْنَ رَأْسِ الدَّرْبِ وَبابِ دارِهِ؟) بە نێوان سەری كۆلانەكەو دەرگای خانووەكەی؟ (وَجْهانِ) دوو فەرموودە هەنە: (أَصَحُّهُمَا الثّانِي) ڕاسترەكەیان دووەمەكەیە، كە دەفەرموێ: هاوبەشیەكەی تایبەتە بە نێوان سەریكۆلانەكەو دەرگایخانووەكەی، چونكە هەر ئەو ئەندازەیە شوێنی هاتوچۆی خۆیەتیو بەولاوەتر مافی نیە.

(وَلَيْسَ لِغَيْرِهِمْ) دروست نیە: بۆ بێگانەیەكی جگە لە خەڵكی كۆلانەكە بە بێئیزنی ئەوان (فَتْحُ بابٍ إِلَيْهِ) دەرگایەك بە لای كۆلانەكەدا بكاتەوە (لِلإِسْتِطْراقِ) بۆ هاتوچۆ كردن، بەڵام بە ئیزنی خەڵكی كۆلانەكە دروستە، جا هەر كاتێكیش حەز بكەن دروستە: لە ئیزنەكەیان پەشیمان ببنەوەو دەرگاكەی پێ دابخەن.

(وَ) هەروەها (لَهُ فَتْحُهُ) بۆی دروستە دەرگاكە بكاتەوە (إِذَا سَمَّرَهُ) ئەگەر بە بزمار بیبەستێو هاتوچۆی تێدا نەكا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها بۆ بێگانەكە دروستە دەلاقەیەك بۆ ڕۆناكی لە دیوارەكەیدا بە لای كۆلانەكەدا بكاتەوە، هەرچەند پەنجەرەشی تێنەگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَمَنْ لَهُ فِيهِ بابٌ) هەر كەسێك لەو كۆلانەدا دەرگایەك، یان سولكەیەكی هەبو (فَفَتَحَ آخَرَ) ئینجا دەرگایەكیتریشی كردەوە (أَبْعَدَ مِنْ رَأْسِ الدَّرْبِ) دوورتر لە سەری كۆلانەكە، واتە: بە لای كۆتایی كۆلانەكەدا كردیەوە (فَلِشُرَكائِهِ مَنْعُهُ) بۆ گشت هاوبەشەكانی لای كۆتایی كۆلانەكە دروستە: قەدەغەی بكەن، هەرچەند دەرگاكەیتریشی داخستبێ.

(وَ) هەروەها (إِنْ كانَ أَقْرَبَ إِلَى رَأْسِهِ) ئەگەر دەرگاكە بەرەو سەری كۆلانەكەش نزیكتر بوو و (وَلَمْ يَسُدَّ الْبابَ الْقَدِيمَ) دەرگا كۆنەكەشی دانەخستبو (فَكَذَلِكَ) بۆ گشت هاوبەشەكانی لای كۆتاییكۆلانەكە دروستە: قەدەغەی بكەن، بەڵام (وَإِنْ سَدَّهُ) ئەگەر دەرگا كۆنەكەی داخستو دەرگایەكیتری بە لای سەری كۆلانەكەدا كردەوە (فَلاَمَنْعَ) دروست نیە قەدەغەی بكەن.

(وَمَنْ لَهُ دارانِ) هەر كەسێك دوو خانووی هەبن (تَفْتَحانِ إِلَى دَرْبَيْنِ مَسْدُودَيْنِ) هەردوو خانووەكان پشتیان پێكەوەبێ، هەر یەكەشیان –بە جیا– بە لای كۆلانێكی گیراودا دەرگای

أَوْ مَسْدُود وَشارِعٍ فَفَتَحَ باباً بَيْنَهُما لَمْ يُمْنَعْ فِي‌الأَصَحِّ، وَحَيْثُ مُنِعَ فَتْحُ الْباب فَصالَحَهُ أَهْلُ الدَّرْب بمالٍ صَحَّ، وَيَجُوزُ فَتْحُ الْكَوّات، وَالْجدارُ بَيْنَ مالِكَيْنِ قَدْ يَخْتَصُّ به أَحَدُهُما، وَقَدْ يَشْتَرِكان فيه، فالْمُخْتَصُّ لَيْسَ للآخَرِ وَضْعُ الْجُذُوعِ عَلَيْهِ بغَيْرِ إذْنٍ فِي‌الْجَديد، وَلاَ يُجْبَرُ الْمالِكُ، فَلَوْ رَضِيَ بِلاَعِوَضٍ فَهُوَ إعارَةٌ

---

دەكرلوە (أَوْ مَسْدُودٍ وَشارِعٍ) یان یەكێكیان بە لای كۆڵانێكی گیرلودلو ئەوی‌تریشیان بەرەو ڕێگەیەكی‌كراوەدا دەرگای كرابۆوە (فَفَتَحَ باباً بَيْنَهُما) ئینجا دەرگایەكی‌تریشی-جگە لەو دوو دەرگایە- لە نێوان هەردوو خانووەكاندا كردەوە، تاكو لەم خانووەوە هاتوچۆ بكا بۆ ئەو خانووە (لَمْ يُمْنَعْ فِي‌الأَصَحِّ) نابێ قەدەغە بكرێ لە فەرموودەی‌ڕاستتردا، چونكە ئەگەر دیواری نێوان هەردوو خانووەكانیش لاببا‌و بیانكاتە یەك خانوو، هەر نابێ قەدەغە بكرێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَحَيْثُ مُنِعَ فَتْحُ الْبابِ) هەر كاتێك-بە شەرع- قەدەغە كرا: لە كردنەوەی دەرگا (فَصالَحَهُ أَهْلُ الدَّرْبِ) ئینجا خەڵكی كۆڵانەكە لەگەڵی پێك هاتن: ڕێگای دەرگاكردنەوەی بدەن (بِمالٍ) بەرامبەر وەرگرتنی هەندێك ماڵ (صَحَّ) پێكهاتنەكە دروستە‌و ماڵەكەش بە سەر ژمارەی خانووەكاندا بەش دەكرێ بەگوێرەی پێوانەكەیان (وَيَجُوزُ فَتْحُ الْكَوّاتِ) بۆ خاوەن دیوارەكە دروستە: دەلاقەی دوودەر لە دیوارەكەی‌دا بكاتەوە، جیاوازی نیە: پەنجەرەی تێ‌دابنێ، یان نا، بەرەو كۆڵان بێ، یان نا.

## ﴿ دیواری نێوان دوو خانوو ﴾

(وَالْجِدارُ بَيْنَ مالِكَيْنِ) دیوارێك كە لە نێوان دوو خاوەندا بێ (قَدْ يَخْتَصُّ بِهِ أَحَدُهُما) هەندێ جار تایبەتە بە یەكێكیان (وَقَدْ يَشْتَرِكانِ فِيهِ) هەندێ جاریش هاوبەشن لە دیوارەكەدا:

(فَالْمُخْتَصُّ) جا دیواری تایبەت بە یەكێكیان (لَيْسَ لِلآخَرِ وَضْعُ الْجُذُوعِ عَلَيْهِ) بۆ ئەوی‌تریان دروست نیە دارەكانی بانی خانووی‌خۆی لە سەر دیوارەكەی وی دابنێ، یان دیواری لە سەر بكا (بِغَيْرِ إِذْنٍ) بە بێ‌ئیزنی خاوەن دیوارەكە (فِي‌الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی (الشافعی)دا (وَلاَ يُجْبَرُ الْمالِكُ) خاوەن دیوارەكەش زۆری لێ‌ناكرێ بۆ ئەوەی ڕێگای بدا: دارەكانی لە سەر دیوارەكەی دابنێ، یان دیوار لە سەر دیوارەكەی بكا، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَحِلُّ مالُ امْرِىءٍ مُسْلِمٍ إِلاَّبِطِيبِ نَفْسٍ مِنْهُ﴾ رواه‌الحاكم علی‌شرط الشیخین، بۆ هیچ كەسێك ماڵی موسوڵمانێك حەڵاڵ نیە تەنها بە دڵخۆشی‌خۆی نەبێ.

(فَلَوْ رَضِيَ بِلاَعِوَضٍ) جا ئەگەر خاوەن دیوارەكە ڕازی بوو: ئەوی‌تر دیوارێك، یان دارەكانی لە سەر دیوارەكەی وی دابنێ بە خۆڕایی (فَهُوَ إِعارَةٌ) ئەوە بە خواستن

وَلَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ الْبناء عَلَيْه، وَكَذَا بَعْدَهُ فِي الأَصَحِّ، وَفائدَةُ الرُّجُوعِ تَخْييرُهُ بَيْنَ أَنْ يُبْقيَهُ بأجْرَة أَوْ يَقْلَعَ وَيَغْرَمَ أَرْشَ نَقْصه، وَقِيلَ فائدَتُهُ طَلَبُ الأُجْرَة فَقَطْ، وَلَوْ رَضِيَ بوَضْعِ الْجُذُوعِ وَالْبناء عَلَيْها بعوَض فَإِنْ آجَرَ رَأْسَ الْجدار للْبناء فَهُوَ إجارَةٌ، وَإِنْ قالَ بعْتُهُ للْبناء عَلَيْه أَوْ بعْتُهُ حَقَّ الْبناء عَلَيْه فَالأَصَحُّ أَنَّ هَذَا الْعَقْدَ فيه شَوْبُ بَيْعٍ وَإجارَة، فَإِذَا بَنَى فَلَيْسَ لمالك الْجدار نَقْضُهُ بحال،

---

ديوارەكەی وێداوە، كەوابو: (وَلَهُ الرُّجُوعُ قَبْلَ الْبِناءِ عَلَيْهِ) بۆ خاوەن ديوارەكە دروستە: پەشيمان ببێتەوە پێش ئەوەی ئەویتر ديوارەكەی لە سەر دروست بكا، يان دارەكانی دابنێتە سەر ديوارەكە.

(وكَذَا بَعْدَهُ) هەروەها لە دوای دانانی دارەكان و لە دوای دروستكردنی ديوارەكەش بۆی دروستە پەشيمان ببێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَفائِدَةُ الرُّجُوعِ) سودی پەشيمانبوونەوەشی ئەمەیە (تَخْيِيرُهُ) خاوەن ديوارەكە ئەویتر دەكاتە سەرپشك (بَيْنَ أَنْ يُبْقِيَهُ بِأُجْرَةٍ) لە نێوان ئەوەی ديوارەكەی، يان دارەكانی لە سەر ديوارەكەی وی بهێڵێتەوە بە كرێ (أَوْ يَقْلَعَ) يان ديوارەكەو دارەكانی لابباو (وَيَغْرَمَ أَرْشَ نَقْصِهِ) خاوەن ديوارەكەش تۆڵەی كەموكورییەكەی بداتێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (فائِدَتُهُ) سودی پەشيمانبوونەوە (طَلَبُ الأُجْرَةِ فَقَطْ) تەنها داواكردنی كرێیە، هيچیتر نيە.

(وَلَوْ رَضِيَ بِوَضْعِ الْجُذُوعِ وَالْبِناءِ عَلَيْها) ئەگەر خاوەن ديوارەكە ڕازی بو: ئەویتر دارەكانی بانیخۆی لە سەر ديوارەكەی وی دابنێ، يان ديوارێك لە سەر ديوارەكەی وی بكا (بِعِوَضٍ) بەرامبەر وەرگرتنی شتێك، ئەوە تەماشا دەكەين:

(فَإِنْ آجَرَ رَأْسَ الْجِدارِ لِلْبِناءِ) ئەگەر خاوەنەكە سەرەديوارەكەیخۆی بە كرێ دابيتێ بۆ ئەوەی ديواری لە سەر بكا، يان دارەكانی لە سەر دابنێ (فَهُوَ إِجارَةٌ) ئەوە مامڵەتی بەكرێدانە، بەڵام (وَإِنْ قالَ بِعْتُهُ لِلْبِناءِ عَلَيْهِ) ئەگەر خاوەنەكە گوتی: سەرە ديوارەكەم فرۆشتە تۆ بۆ ئەوەی ديواری لە سەر بكەی، يان داری بانیخۆتی لە سەر دابنێی (أَوْ بِعْتُ حَقَّ الْبِناءِ عَلَيْهِ) يان گوتی: مافی خانوو دروستكردن لە سەر ئەم ديوارەم فرۆشتە تۆ (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ هَذَاالْعَقْدَ) ئەو مامڵەت بەستنە (فِيهِ شَوْبُ بَيْعٍ وَإِجارَةٍ) لە فرۆشتن و بەكرێدان تێكەڵە، چونكە وەكو فرۆشتن ماوەكەی بەردەوامە، وەكو بەكرێدانيش تەنها سودی ديوارەكە مەبەستە.

(فَإِذَا بَنَى) جا هەر كاتێك بەكرێگرەكە، يان كڕيارەكە ديوارەكەی لە سەر ديواری خاوەنەكە دروست كرد، يان دارەكانی بانی خۆی لە سەر ديوارەكەی دانان (فَلَيْسَ لِمالِكِ الْجِدارِ نَقْضُهُ بِحالٍ) خاوەن ديوارەكە بۆی دروست نيە: ديوارەكەی كڕيارەكە، يان ديوارەكەی

وَلَوِ انْهَدَمَ الْجدارُ فَأعادَهُ مالكُهُ فَلِلْمُشتَرى إعادَةُ الْبناء، وَسَــواءٌ كــانَ الإِذْنُ بِعَــوَضٍ أَوْ بغَيْره يُشْتَرَطُ بيانُ قَدْرِ الْمَوضِعِ الْمَبْنِيِّ عَلَيْه طُولاً وَعَرْضاً، وَسَمْكُ الْجُـدْرانِ وَكَيْفيَّتِهـا، وَكَيْفِيَّةُ السَّقْفِ الْمَحْمُول عَلَيْها، وَلَوْ أذنَ فِيالْبناء عَلَىأرْضه كَفَى بَيانُ قَــدْرِمَحَلِّ الْبنَــاء، وَأَمَّاالْجدارُالْمُشْتَرَكُ فَلَيْسَ لأحَدهما وَضْعُ جُذُوعِه عَلَيْه بغَيْرِ إِذْن فيالْجَديد، وَلَيْس لَــهُ أَنْ يَتِدَ فيه وَتِداً أَوْ يَفتَحَ كَوَّةً إلاَّ بإذْنه، وَلَهُ أَنْ يَستَنِدَ إِلَيْه وَيُسْنِدَ مَتاعاً لاَ يَضُرُّ،

---

بەکرێگرەکە هەڵبوەشێنێ، یان دارەکانی لاببا بە هیچ جۆرێك، واتـە: نـە بـە خۆڕایی‌و نـە بـە تۆڵە، کەوابو: (وَلَوِ انْهَدَمَ الْجِدارُ) ئەگەر دیوارەکـە ڕوخـا (فَأعـادَهُ مالِكُـهُ) ئینجا خاوەنەکـەی دووبـارە دروسـتی کـردەوە (فَلِلْمُشْـتَرِي إعـادَةُ الْبِنـاءِ) بـۆ کڕیارەکـەو بـۆ بەکرێگرەکـەش دروستە: دیوارەکەی خۆی لە سەر ئـەو دیـوارە نوێیـە دروسـت بکاتـەوە، یـان دارەکـانی لـە سەر دابنێتەوە، چونکە ئەو مافەی بۆ جێگیر بوە.

کەوابو: ئەگەر خاوەنەکە دیوارەکەی دروست نەکردەوە، بـەڵام کڕیارەکـە، یـان بەکرێگرەکـە ویستی لە سەر ئەرکی‌خۆی لـە بناغـەوە دروسـتی بکاتـەوە، ئـەوە ڕێگـای دەدرێتـێ‌و دیـوارە نوێیەکەش دەبێتە ملکی خۆی، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی.

(وَسَواءٌ كانَ الإِذْنُ بِعَـوَضٍ أَوْ بِغَيْـرِهِ) یەکسـانە ئیزندانەکـەی‌ڕابردوو بـە پـارە بـێ، یـان بـە خۆڕایی بێ، لە هەردوو حاڵەتدا (يُشْتَرَطُ بِيانُ قَدْرِالْمَوضِعِ الْمَبْنِيِّ عَلَيْهِ) بە مـەرج دانـدراوە: دیاری بکرێ ئەندازەی ئەو شوێنەی دیوارەکەی لـە سـەر دەکرێ، یـان دارەکـانی لـە سـەر دادەندرێن، واتە: (طُولاً) درێژییەکەی‌و (وَعَرْضاً) بەرینی‌یەکەی‌و (وَسَمْكِ الْجُدْرانِ) بـەرزی دیوارەکان‌و (وَكَيْفِيَّتِها) چۆنیەتیەکەیان‌و (وَكَيْفِيَّـةِ السَّقْفِ الْمَحْمُولِ عَلَيْهـا) چۆنیەتی ئـەو بانەی لە سەر دیوارەکانیش دادەندرێ، گشتی دیاری بکرێن.

بەڵام (وَلَوْ أذِنَ فِيالْبِناءِ عَلَى أرْضِهِ) ئەگەر ئیزنی‌دا: لـە سـەر زەویەکـەی وی خانووێك دروست بکا، جا بە خۆڕایی، یان بە پارە ئیزنی بدا (كَفَى بَيانُ قَدْرِ مَحَلِّ الْبِنـاءِ) دیاری‌کردنی ئەنـدازەی شوێنی خانوو لە سەر دروستکردن بەسە، واتە: لە ڕووی بەرینی‌و درێژیەوە.

(وَأَمَّاالْجِدارُالْمُشْـتَرَكُ) بـەڵام دیـواری هاوبـەش لـە نێـوان دوو کەسـاندا (فَلَـيْسَ لأحَـدِهِما) دروست نیە بۆ هیچێکیان (وَضْعُ جُذُوعِهِ عَلَيْـهِ) دارەکـانی بـانی‌خۆی لـە سـەر دابنـێ (بِغَيْـرِ إِذْنٍ) بە بێ‌ئیزنی هاوبەشەکەی‌تر (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا (وَلَيْسَ لَـهُ أَنْ يَتِـدَ فِيـهِ وَتِداً) هەم بۆی دروست نیە مێخ لە دیوارەکەدا بکوتـێ (أَوْ يَفْـتَحَ كَـوَّةً) یـان دەلاقـەی تـێ‌دا بکاتەوە (إلاَّ بِإِذْنِهِ) تەنها بە ئیزنی هاوبەشەکەی‌تر دروستە.

(وَلَهُ أَنْ يَسْتَنِدَ إِلَيْهِ) بۆ هاوبەشەکە دروستە پاڵ وەدیوارەکە بدلو (وَيُسْنِدَ مَتاعـاً لاَ يَضُـرُّ) هەم دروستەپاڵی شتێکی وەهاشی وێبدا: کە زیان لە دیوارەکە نەدا.

وَلَهُ ذَلِكَ فِي جِدارِ الأَجْنَبِيِّ، وَلَيْسَ لَهُ إِجْبارُ شَرِيكِهِ عَلَى الْعِمارَةِ فِي الْجَدِيدِ، فَإِنْ أَرادَ إِعادَةَ مُنْهَدِمٍ بِآلَةٍ لِنَفْسِهِ لَمْ يُمْنَعْ، وَيَكُونُ الْمُعادُ مِلْكَهُ يَضَعُ عَلَيْهِ ماشاءَ وَيَنْقُضُهُ إِذا شاءَ، وَلَوْ قالَ الآخَرُ لاَ تَنْقُضْهُ وَأَغْرَمُ لَكَ حِصَّتِي، لَمْ تَلْزَمْهُ إِجابَتُهُ، وَإِنْ أَرادَ إِعادَتَهُ بِنُقْضِهِ الْمُشْتَرَكِ فَلِلآخَرِ مَنْعُهُ، وَلَوْ تَعاوَنا عَلَى إِعادَتِهِ بِنُقْضِهِ عادَ مُشْتَرَكاً كَما كانَ، وَلَوِ انْفَرَدَ أَحَدُهُما وَشَرَطَ لَهُ الآخَرُ زِيادَةً جازَ وَكانَتْ فِي مُقابَلَةِ عَمَلِهِ فِي نَصِيبِ الآخَرِ،

---

(وَلَهُ ذَلِكَ فِي جِدارِ الأَجْنَبِيِّ) ئەو پاڵویدانە لە دیواری بێگانەشدا دروستە. (وَلَيْسَ لَهُ) هاوبەش مافی نیەو بۆی دروست نیە (إِجْبارُ شَرِيكِهِ عَلَى الْعِمارَةِ) هاوبەشەکەیتر ناچار بکاو زۆری لێبکا: بۆ چاککردنەوەی دیوارو خانوو و بیرو جۆگەو ئەو جۆرە شتە هاوبەشانە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(الشافعی)دا.

بەڵام لە فەرموودەی کۆنیدا: هاوبەشەکە ناچار دەکرێ بۆ چاککردنەوەی ملکە هاوبەشەکە، تاکو ملکەکە لە کار نەکەوێ، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(فَإِنْ أَرادَ إِعادَةَ مُنْهَدِمٍ) جا ئەگەر هاوبەشێك ویستی دیوارێکی ڕووخاوی هاوبەش دروست بکاتەوە (بِآلَةٍ لِنَفْسِهِ) بە کەرستەیەکی تایبەتی خۆی (لَمْ يُمْنَعْ) قەدەغە ناکرێ و ڕێگای دەدرێتێ (وَيَكُونُ الْمُعادُ مِلْكَهُ) دروستکراوەکەش دەبێتە ملکی خۆی (يَضَعُ عَلَيْهِ ما شاءَ) هەر شتێکی حەز بکا لە سەر دیوارەکەی دادەنێ (وَيَنْقُضُهُ إِذا شاءَ) هەر کاتێکیش حەز بکا هەڵیدەوەشێنێ.

ئینجا بزانە: ئەم ڕێگادانە تەنها تایبەتە بە دیوار-نەك بە خانوو- هەم لەو حاڵەتەشدا ڕێگای دەدرێتێ کە هاوبەشەکەیتر لەگەڵی دروست نەکاتەوە، هەروەك لە (تحفە)و حاشیەکانیدا ڕوون کراوەتەوە (وَلَوْ قالَ الآخَرُ) ئەگەر هاوبەشەکەیتر پێی گوت (لاَ تَنْقُضْهُ) ئەم دیوارە نوێکراوەیە هەڵمەوەشێنە (وَأَغْرَمُ لَكَ حِصَّتِي) بەشە مەسرەفەکەی خۆمت دەدەمەوە (لَمْ تَلْزَمْهُ إِجابَتُهُ) لە سەری واجب نیە بە گوێی بکا.

(وَإِنْ أَرادَ إِعادَتَهُ بِنُقْضِهِ الْمُشْتَرَكِ) ئەگەر هاوبەشەکە ویستی بە کەرستە هاوبەشەکەی کۆنی دیوارەکە نوێ بکاتەوە (فَلِلآخَرِ مَنْعُهُ) بۆ هاوبەشەکەیتر دروستە: قەدەغەی بکاو ڕێگای نەدا، بەڵام (وَلَوْ تَعاوَنا عَلَى إِعادَتِهِ بِنُقْضِهِ) ئەگەر هەردووکیان یارمەتی یەکتریان داو بە کەرستە کۆنەکە دیوارەکەیان دروست کردەوە، ئەو کاتە (عادَ مُشْتَرَكاً كَما كانَ) وەك جاران دەبێتەوە هاوبەش لە نێوانیاندا.

(وَلَوِ انْفَرَدَ أَحَدُهُما) ئەگەر تەنها یەکێکیان بە ئیزنی ئەویتر بە کەرستە کۆنەکە دیوارەکەی دروست کردەوە (وَشَرَطَ لَهُ الآخَرُ زِيادَةً) هاوبەشەکەیتریش -لە بەرامبەر کارەکەی- بەشێکی زیادی بۆ دانا (جازَ) ئەوە دروستە (وَكانَتْ فِي مُقابَلَةِ عَمَلِهِ فِي نَصِيبِ الآخَرِ) زێدەییەکەش دەبێتە کرێ لە بەرامبەر کارەکەی لە بەشی هاوبەشەکەیتردا.

وَيَجُوزُ أَنْ يُصالِحَ عَلَى إِجْراءِ الْماءِ وَإِلْقاءِ الثَّلْجِ فِي مِلْكِهِ عَلَى مالٍ، وَلَوْ تَنازَعا جِداراً بَيْنَ مِلْكَيْهِما فَإِنِ اتَّصَلَ بِبِناءِ أَحَدِهِما بِحَيْثُ يُعْلَمُ أَنَّهُما بُنِيا مَعاً فَلَهُ الْيَدُ،

---

(وَيَجُوزُ أَنْ يُصالِحَ) دروستە لەگەڵ دراوسێیەکەی پێك بێ (عَلَى إِجْراءِ الْماءِ) لە سەر ڕەوانەکردنی ئاو بە ناو جۆگەو ملکی دراوسێیەکەیدا بۆ ناو ملکی خۆی (وَ) هەم لەگەڵی پێك بێ لە سەر ئەوەی (إِلْقاءِ الثَّلْجِ فِي مِلْكِهِ) بەفری سەربانی خۆی فڕێبداتە ناو ملکی دراوسێیەکەی، یان ئاوی باران بە سەر بانەکەیدا بڕژێنێ، بەو مەرجەی هیچ شوێنێکی تر نەبێ (عَلَى مالٍ) پێکهاتنەکەش لە سەر وەرگرتنی ماڵێك بێ، جیاوازی نیە: مامڵەتەکە بەکرێدان بێ، یان فرۆشتنی مافەکە بێ، هەروەك لە مەسەلەی دیوارەکەدا ڕوون کراوە.

ئینجا بزانە: پێکهاتن دروستە لە سەر وەرگرتنی ماڵێك بەرامبەر خەوتن لە ملکی کەسێکی تردا، یان پیسایی‌کردن، یان فڕێدانی زبڵ و ئەو جۆرە شتانە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها بزانە: بەکرێدان و فرۆشتنی مافی ڕابردنیش بە ناو ملکی خۆیدا دروستە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لقی درەختەکانی، یان ڕەگەکانیان چوونە سەر هەوای ملکی کەسێکی تر، ئەوە ناچار دەکرێ لایانببا، جا ئەگەر لاینەبردن، با خاوەن ملکەکە بەخۆی لایانببا، جا ئەگەر نەگونجا لایانببا، ئەو کاتە بۆ خاوەن ملکەکە دروستە -بە بێ‌ئیزنی قازی- بیانبڕێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بە هیچ جۆرێك پێکهاتن دروست نیە لە سەر هێشتنەوەی لق و ڕەگەکانی درەختەکان لە بەرامبەر وەرگرتنی ماڵ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

دیسان بزانە: ئەو ئەمامانەی لە ڕەگەکانی درەختەکە پەیدا دەبن، گشتی هی خاوەنی درەختەکەیەو نابنە هی خاوەنی زەویەکە، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

## ﴿ کێشەی دیواری نێوان دوو خانوو ﴾

(وَلَوْ تَنازَعا جِداراً) ئەگەر دوو کەس بووە کێشەیان لە سەر دیوارێك (بَيْنَ مِلْكَيْهِما) دیوارەکەش لە نێوان ملکی هەردووکیاندا بوو و هیچیان شاهیدیان نەبو، تەماشا دەکەین: (فَإِنِ اتَّصَلَ بِبِناءِ أَحَدِهِما) ئەگەر دیوارەکە بە ملکی یەکێکیانەوە بوو (بِحَيْثُ يُعْلَمُ أَنَّهُما بُنِيا مَعاً) بە شێوەیەکی وەها: دەزاندرا دیوارەکەو ملکەکە بە یەکەوە دروست کراون: وەك بەردو خشتەکانی قوڕنەی دیوارەکە لەگەڵ ملکەکە تێك ونابن، ئەوە (فَلَهُ الْيَدُ) خاوەن دەستی دیوارەکە بۆ خاوەن ملکەکەیە، کەواتە: سوێند ئەدرێ و بەو سوێندە بڕیار دەدرێ: دیوارەکە هی ئەوە، بەڵام ئەگەر تەنها یەکێکیان شاهیدی هەبێ، ئەو کاتە بەگوێرەی شاهیدیەکە بڕیار بۆ خاوەن شاهیدەکە دەدرێ.

وَإِلاَّ فَلَهُما، فَإِنْ أَقامَ أَحَدُهُما بَيِّنَةً قُضِيَ لَهُ، وَإِلاَّ حَلَفا، فَإِنْ حَلَفا أَوْ نَكَلاَ جُعِلَ بَيْنَهُما، وَإِنْ حَلَفَ أَحَدُهُما قُضِيَ لَهُ، وَلَوْ كانَ لأَحَدِهِما عَلَيْهِ جُذُوعٌ لَمْ يُرَجَّحْ، وَالسَّقْفُ بَيْنَ عُلْوِّهِ وَسُفْلِ غَيْرِهِ كَجِدارٍ بَيْنَ مِلْكَيْنِ فَيُنْظَرُ: أَيُمْكِنُ إِحْداثُهُ بَعْدَالْعُلْوِّ؟ فَيَكُونُ فِي يَدِهِما، أَوْ لاَ؟ فَلِصاحِبِ السُّفْلِ.

---

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر دیوارەکە بە ملکی هیچێکیانەوە نەونابو، یان بە یەکسانی بە ملکی هەردووکیانەوە ونابو (فَلَهُما) ئەو کاتە خاوەن دەستیەکە بۆ هەردووکیانە، کەوابو: تەماشا دەکەین: (فَإِنْ أَقامَ أَحَدُهُما بَيِّنَةً) ئەگەر تەنها یەکێکیان شاهیدی هێنا: کە دیوارەکە هی خۆیەتی (قُضِيَ لَهُ) بەو شاهیدیە بڕیار دەدرێ دیوارەکە گشتی هی ئەوە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچێکیان شاهیدی نەبو، یان هەردووکیان شاهیدیان هەبو، ئەو کاتە (حَلَفا) هەردووکیان سوێند دەخۆن‌و هەر یەکەیان لە سوێندەکەیدا دەڵێ: (والله مافی ئەو نیوەیەت نیە، ئەو نیوەی بن دەستی تۆش هی منە). واتە: لێرەدا شاهیدی هەردووکیان لەکار دەکەون.

(فَإِنْ حَلَفا) جا ئەگەر هەردووکیان سوێندیان خوارد (أَوْ نَكَلاَ) یان هیچێکیان سوێندیان نەخوارد (جُعِلَ بَيْنَهُما) دیوارەکە دەدرێتە هەردووکیان بە نیوەیی (وَإِنْ حَلَفَ أَحَدُهُما) ئەگەر تەنها یەکێکیان سوێندی خوارد (قُضِيَ لَهُ) بڕیار دەدرێ: کە دیوارەکە گشتی هی سوێندخۆرەکەیە.

بەڵام (وَلَوْ كانَ لأَحَدِهِما عَلَيْهِ جُذُوعٌ) ئەگەر لەو دوو کەسانە یەکێکیان دارەکانی خانووی لە سەر دیوارەکە هەبو، یان دەلاقەو ڕەفتەی لە دیوارەکەدا هەبو (لَمْ يُرَجَّحْ) بەو جۆرە شتە بێهێزانە بەهێز ناکرێ‌و نابێتە نیشانەی خاوەن دەستی، بەڵام دارەکانی سەر دیوارەکەش لانابردرێن، هەرچەندە نەشزاندرێ بە چ مافێك داندراون، چونکە وادێتە بەرچاو کە بە مافێکی‌شەرعی داندرابن، کەوابو: مافی هێشتنەوەیان بەردەوام دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایە)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالسَّقْفُ) بانی خانووی دوو نهۆم: کە (بَيْنَ عُلْوِّهِ) کەوتبێتە نێوان سەرەوەی یەکێکیان‌و (وَسُفْلِ غَيْرِهِ) بنەوەی ئەوی‌تر (كَجِدارٍ بَيْنَ مِلْكَيْنِ) وەك دیواری نێوان دوو ملك وایە (فَيُنْظَرُ) تەماشا دەکرێ: (أَيُمْكِنُ إِحْداثُهُ بَعْدَالْعُلْوِّ؟) ئایا دەگونجێ ئەم بانە لە دوای بانەکەی لای سەرەوە دروست کرابێ؟ وەك دیوارەکان کون کرابن‌و دارەکانی تێندرابن‌و سەرپۆش کرابێ (فَيَكُونُ فِي يَدِهِما) لەو حاڵەتەدا بانەکە لە دەست هەردووکیاندا دەبێ، واتە: بۆ لایەنی بنەوە دەبێتە بان، بۆ لایەنی سەرەوەش دەبێتە زەمین (أَوْ لاَ) یان نەدەگونجا پەیدا بوبێ (فَلِصاحِبِ السُّفْلِ) ئەو کاتە بۆ خاوەنی لای خوارەوەیە.

## (بَابُ الْحَوالَةِ)

**يُشْتَرَطُ لَها رِضا الْمُحيلِ وَالْمُحْتالِ، لاَالْمُحالِ عَلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ تَصِحُّ عَلَى مَنْ لاَ دَيْنَ عَلَيْهِ، وَقِيلَ تَصِحُّ بِرِضاهُ، وَتَصِحُّ بِالدَّيْنِ اللاَّزِمِ، وَعَلَيْهِ، وَالْمِثْلِيِّ وَكَذَاالْمُتَقَوِّمِ**

---

### ﴿ بَابُ الْحَوالَةِ: باسی حەوالە ﴾

واتــە: گواســتنەوەیقەرزێك لــە ئەســتۆی قەرزدارێکــەوە بــۆ ئەســتۆیقەرزدارێکیتر. پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِـيءٍ فَلْيَتْبَـعْ﴾ رواه الشيخان، دواخستنی قەرزدانـەوەی مرۆڤیهـەبوویی ستەمو زۆرداریـیە، وە هـەر کاتێك یەکێکتان حەوالە کرا بۆ سەر قەرزدارێکی هەبوویی با بچێ.

ئینجا بزانە: حەوالە لە شەش ڕوکن پێك دێ: (اَلْمُحِيـلُ) حەوالەکـەر. (اَلْمُحْتَـالُ) حەوالـەکرلو. (اَلْمُحَـالُ عَلَيْـهِ) حەوالەبۆسـەرکرلو. (دَيْـنُ الْمُحِيـلِ) قەرزیحەوالەکەرەکـە. (دَيْـنُ الْمُحْتَـالِ) قەرزیحەوالەکرلوەکە. (اَلصِّيغَةُ) گوتەی حەوالەکردن.

بۆ وێنە: ڕزگار پەنجا دینار قەرزداری نەوزادە، نەوزادیش پـەنجا دینـار قـەرزداری ئـازادە، ئینجا نەوزاد بلێته ئازاد: وا تۆم حەوالـە کرد بۆ سـەر ڕزگار بـەو قـەرزەی لـە سـەر منت هەیە، لێی وەریگرەوە. ئینجا ئەویش –بە گوتن– قبولّ بکا.

(يُشْتَرَطُ لَها) بە مەرج دادەنرێ بۆ دروستبوونی حەوالـە: (رِضـاالْمُحِيلِ) حەوالەکـەر ڕازی بـێ، واتە: ئەو قـەرزدارەی خـاوەن قەرزەکـە دەنێرێ (وَالْمُحْتَـالِ) هـەم حەوالـەکرلو ڕازی بـێ، واتـە: خاوەن قەرزینێردرلو (لاَالْمُحالِ عَلَيْهِ) بەلاّم مـەرج نیـە: حەوالەبۆسـەرکرلو ڕازی بـێ، واتـە: ئـەو قەرزدارەی خاوەن قەرزەکەی نێردرلوەتە سەر (فِيالأَصَحِّ) لـە فـەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ناچارە قەرزەکە بداتەوە ئەمە، یان ئەوە.

کـەوابو: ئەگـەر حەوالەبۆسـەرکرلوەکە مـردووش بـێ، حەوالەکـە دروست دەبـێ، هـەروەك لـە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: لە میراتەکەی قەرزەکە دەدرێتەوە.

(وَلاَ تَصِحُّ عَلَى مَنْ لاَدَيْنَ عَلَيْهِ) حەوالە دروست نابێ: بۆ سـەر ئـەو کەسـەی قـەرزی لـە سـەر نـەبێ (وَقِيلَ) لـە فەرموودەیـەکی بـێهێزدا (تَصِحُّ بِرِضَـاهُ) حەوالەکـە بـە ڕەزامەنـدی وی دروست دەبێ (وَتَصِحُّ) حەوالـە دروسـت دەبـێ (بِالدَّيْنِ اللاَّزِمِ) بـەو جۆرە قـەرزەی واجبـەو پەشـیمانی تـێدا نیـە: وەك کڕیارەکـە بلێتـە فرۆشـیارەکە: تـۆم حەوالـە کـرد بـۆ سـەر فلانکەس پارەی فرۆشراوەکەتی لێوەریگرە.

(وَعَلَيْهِ) هەم حەوالە بـۆ سـەر قـەرزی واجبیش دروستە، وەك فرۆشیارەکە خـاوەن قـەرزێك حەوالە بکا بۆ سەر کڕیارەکە، کە بـە هـۆی کڕینەکە قەرزەکـەی کەوتۆتـە ئەسـتۆ (وَالْمِثْلِيُّ) هـەم حـەوالە بە قـەرزێکی هـاووێنەش دروسـت دەبێ: وەك پـارەو دانەوێڵـە (وَكَـذَا الْمُـتَقَوِّمِ)

فِي الأَصَحِّ، وَبِالثَّمَنِ فِي مُدَّةِالْخِيارِ، وَعَلَيْهِ فِيالأَصَحِّ، وَالأَصَحُّ صِحَّةُ حَوالَـةِالْمُكاتَبِ سَيِّدَهُ بِالنُّجُومِ دُونَ حَوالَةِالسَّيِّدِ عَلَيْهِ، وَيُشْتَرَطُ الْعِلْمُ بِما يُحالُ بِهِ وَعَلَيْهِ قَدْراً وَصِـفَةً، وَفِيقَوْلٍ تَصِحُّ بِإِبِلِ الدِّيَةِ وَعَلَيْها، وَيُشْتَرَطُ تَساوِيهِما جِنْساً وَقَدْراً وَكَذا حُلُولاً وَأَجَـلاً وَصِحَّةً وَكَسْراً فِيالأَصَحِّ، وَيَبْرَأُ بِالْحَوالَةِ الْمُحِيلُ عَنْ دَيْنِ الْمُحْتالِ وَالْمُحالُ عَلَيْهِ عَنْ دَيْنِ الْمُحِيلِ، وَيَتَحَوَّلُ حَقُّ الْمُحْتالِ إِلَى ذِمَّةِ الْمُحالِ عَلَيْهِ، فَإِنْ تَعَذَّرَ بِفَلَسٍ أَوْ جَحْدٍ

---

هەروەها بە قەرزێکی قرسێندراویش دروست دەبێ: وەك ئاژەڵو جلوبەرگ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَبِالثَّمَنِ فِي مُدَّةِالْخِيارِ) هەم حەواڵە دروستە بە پارەی فرۆشراوێك لە ماوەی پەشیمانیدا: وەك کڕیارەکە فرۆشیارەکە حەواڵە بکا بۆ سەر یەکێکیتر (وَعَلَيْهِ) هەم بۆ سەر پارەی فرۆشراوەکەش لە ماوەی پەشیمانیدا دروستە: وەك فرۆشیارەکە یەکێکیتر حەواڵە بکا بۆ سەر کڕیارەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (صِحَّةُ حَوالَةِ الْمُكاتَبِ سَيِّدَهُ) دروستە: کۆیلەی نووسراو پێدراو گەورەکەی خۆی حەواڵە بکا (بِالنُّجُومِ) بە بەشەکانی پارەی نووسراوەکە (دُونَ حَوالَـةِ السَّيِّدِ عَلَيْـهِ) بەلام دروست نیە: گەورەکە یەکێکیتر حەواڵە بکا بۆ سەر کۆیلەکە.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (الْعِلْمُ) حەواڵەکەرەکەو حەواڵەکراوەکە زانستیان هەبێ (بِما يُحالُ بِهِ) بەو قەرزەی حەواڵەی پێدەکرێ، هەم (وَعَلَيْهِ) بەو قەرزەش کە حەواڵەی بۆ سەر دەکرێ (قَـدْراً) لـە ڕووی ئەنـدازەوە (وَصِـفَةً) لـە ڕووی ڕەگـەزو جـۆرەوە (وَفِي قَـوْلٍ) لـە فەرموودەیەکدا: (تَصِحُّ بِإِبِلِ الدِّيَةِ) حەواڵە دروست دەبێ: بەو ووشترانەی لـە خـوێنی مرۆڤـی کوژراو دەدرێنو (وَعَلَيْها) هەم بۆ سەر ووشترەکانیش حەواڵە دروست دەبێ.

(وَ) هەروەها (يُشْتَرَطُ تَساوِيهِما) بە مەرج دادەنـدرێ هـەردوو قـەرزەکان–حەواڵەپێکراوەکەو حەواڵەبۆسەرکراوەکە–: یەکسان بن (جِنْساً) لە ڕەگەزو (وَقَـدْراً) لـە ئەندازەدا (وَكَذا حُلُولاً) هەروەها لە حازریدلو (وَأَجَلاً) لە ماوەدا، واتـە: هـەردووکیان وەکو یـەکتر کـاتی دانـەوەیان هاتبێ (وَصِحَّةً وَكَسْراً) لە درشتەییو لە ووردەییدلو لـە چاکیو لـە خراپـیدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيَبْرَأُ بِالْحَوالَةِ) بـە هـۆی حەواڵـە ئـازاد دەبێ: (الْمُحِيلُ عَنْ دَيْنِ الْمُحْتـالِ) حەواڵەکەرەکـە لـە قەرزی حەواڵەکراوەکـە، هـەم (وَالْمُحـالُ عَلَيْـهِ) حەواڵەبۆسـەرکراوەکەش ئـازاد دەبێ (عَنْ دَيْنِ الْمُحِيلِ) لە قەرزی حەواڵەکەرەکە (وَيَتَحَوَّلُ حَـقُّ الْمُحْتـالِ) مـافی حەواڵەکراوەکـە دەگوازرێتـەوە (إِلَى ذِمَّةِ الْمُحالِ عَلَيْهِ) بۆ ئەستۆی حەواڵەبۆسەرکراوەکە.

(فَـإِنْ تَعَـذَّرَ) جـا ئەگـەر نـەگونجا حەواڵەکراوەکـە قەرزەکـەی لـە حەواڵەبۆسـەرکراوەکە وەربگـرێتەوە (بِفَلَسٍ) بە هـۆی قـەدەغەیقەرزداری (أَوْ جَحْدٍ) یان بـە هـۆی دانـنـەهێنان بـە

وَحَلَفَ وَنَحْوِهِما لَمْ يَرْجِعْ عَلَىالْمُحِيلِ، فَلَوْ كانَ مُفْلِساً عِنْدَالْحَوالَةِ وَجَهِلَهُ الْمُحْتالُ فَلاَ رُجُوعَ لَهُ، وَقِيلَ لَهُ الرُّجُوعُ إنْ شَرِطَ يَسارُهُ، وَلَوْ أَحالَ الْمُشْتَرِى بالثَّمَنِ فَرَدَّ الْمَبِيعَ بِعَيْبٍ بَطَلَتْ فِيالأَظْهَرِ، أَوِ الْبائِعُ بِالثَّمَنِ فَوُجِدَ الرَّدُّ لَمْ تَبْطُلْ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلَوْ باعَ عَبْداً وَأَحالَ بِثَمَنِه ثُمَّ اتَّفَقَ الْمُتَبايِعانِ وَالْمُحْتالُ عَلَىحُرِّيَّتِه أَوْ ثَبَتَتْ بِبَيِّنَةٍ بَطَلَتِ الْحَوالَةُ،

---

قەرزەکەو (وَحَلَفَ) سوێندیشی خوارد: کە قەرزەکەی لە سەر نیە (وَنَحْوِهِما) یان بە هۆیەکیتری وەك ئەو دووانە: وەك بە هۆی مردن، یان بە زۆرداری قەرزەکەی نەداتێ، ئەوە (لَمْ يَرْجِعْ عَلَىالْمُحِيلِ) لەو حاڵەتانەدا نابێ حەواڵەکراوەکە بگەڕێتەوە سەر حەواڵەکەرەکە، چونکە بە هۆی قبولکردنیحەواڵە، قەرزەکەی لە ئەستۆیحەواڵەکەرەکە لاچووەو کێشەی لەگەڵ ئەودا بڕاوەتەوە، واتە: وەك شتێکی لەجیاتیقەرزەکەی لێوەرگرتبێو شتەکەش لە دەستی خۆیدا بفەوتێ، قبولکردنی حەواڵەش ئەوەیە.

(فَلَوْ كانَ مُفْلِساً عِنْدَالْحَوالَةِ) جا ئەگەر حەواڵەبۆسەرکراوەکە لە کاتی حەواڵەکردندا قەدەغەی قەرزداریی لە سەر داندرابو (وَجَهِلَهُ الْمُحْتالُ) حەواڵەکراوەکەش نەیزانیبو (فَلاَ رُجُوعَ لَهُ) ئەو کاتەش مافی گەڕانەوەی نیە بۆ سەر حەواڵەکەرەکە، چونکە کەمتەرخەمی لە خۆیەتی (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لَهُ الرُّجُوعُ إنْ شَرِطَ يَسارُهُ) مافی گەڕانەوەی هەیە ئەگەر دەوڵەمەندی حەواڵەبۆسەرکراوەکە بە مەرج داندرابێ.

(وَلَوْ أَحالَ الْمُشْتَرِى بالثَّمَنِ) ئەگەر کڕیارەکە فرۆشیارەکەی حەواڵە کردە سەر یەکێکیتر، تاکو پارەی فرۆشراوەکەی لێوەربگرێ (فَرَدَّ الْمَبِيعَ بِعَيْبٍ) ئینجا کڕیارەکە –بە هۆی عەیبێك– فرۆشراوەکەی گەڕاندەوە (بَطَلَتْ) حەواڵەکەش بەتاڵ دەبێتەوە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە پارەکە نەماوە، بەڵام (أَوِالْبائِعُ) ئەگەر فرۆشیارەکە خاوەن قەرزێکی حەواڵە کردە سەر کڕیارەکە (بِالثَّمَنِ) تاکو پارەی فرۆشراوەکەی لێوەربگرێ (فَوُجِدَالرَّدُّ) ئینجا گەڕاندنەوەی فرۆشراوەکە بە هۆی عەیبێك هاتە جێ (لَمْ تَبْطُلْ) ئەو کاتە حەواڵەکە بەتاڵ نابێتەوە (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، کەوابو: هەر کاتێك کڕیارەکە پارەکەی تەسلیمی حەواڵەکراوەکە کرد، دەگەڕێتەوە سەر فرۆشیارەکەو وێنەی پارەکەی لێدەستێنێتەوە.

(وَلَوْ باعَ عَبْداً) ئەگەر کۆیلەیەکی فرۆشت (وَأَحالَ بِثَمَنِهِ) فرۆشیارەکەش خاوەن قەرزێکی حەواڵە کردە سەر کڕیارەکە، تاکو پارەکەی لێوەربگرێ (ثُمَّ اتَّفَقَ الْمُتَبايِعانِ وَالْمُحْتالُ عَلَى حُرِّيَّتِهِ) ئینجا کڕیارەکەو فرۆشیارەکەو حەواڵەکراوەکە یەکدەنگ بون: کە ئەو کۆیلەیە لە کاتی فرۆشتنیدا ئازاد بووە (أَوْ ثَبَتَتْ بِبَيِّنَةٍ) یان بە هۆی شاهید ئازادیەکەی ئاشکرا بو (بَطَلَتِ الْحَوالَةُ) حەواڵەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

وَإِنْ كَذَّبَهُما الْمُحْتالُ وَلاَ بَيِّنَةَ حَلَّفاهُ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ ثُمَّ يَأْخُذُ الْمالَ مِنَ الْمُشْتَرِي، وَلَوْ قالَ الْمُسْتَحَقُّ عَلَيْهِ وَكَّلْتُكَ لِتَقْبِضَ لِي، وَقالَ الْمُسْتَحِقُّ: أَحَلْتَنِي، أَوْ قالَ: أَرَدْتُ بِقَوْلِي أَحَلْتُكَ: الْوَكالَةَ، وَقالَ الْمُسْتَحِقُّ: بَلْ أَرَدْتَ الْحَوالَةَ، صُدِّقَ الْمُسْتَحَقُّ عَلَيْهِ بِيَمِينِهِ، وَفِي الصُّورَةِ الثّانِيَةِ وَجْهٌ، وَإِنْ قالَ أَحَلْتُكَ فَقالَ وَكَّلْتَنِي صُدِّقَ الثّانِي بِيَمِينِهِ.

(بابُ الضَّمانِ)

---

بەلام (وَإِنْ كَذَّبَهُما الْمُحْتالُ) ئەگەر حەوالەکراوەکە کڕیارەکەو فرۆشیارەکەی بە درۆزن دانان و گوتی: ئازاد نیە (وَلاَ بَيِّنَةَ) هیچ شاهیدیش نەبو، ئەو کاتە (حَلَّفاهُ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ) حەوالەکراوەکە سوێند دەدەن: کە نازانێ کۆیلەکە ئازادە (ثُمَّ يَأْخُذُ الْمالَ مِنَ الْمُشْتَرِي) ئینجا حەوالەکراوەکە پارەکەی لە کڕیارەکە وەردەگرێ.

(وَلَوْ قالَ الْمُسْتَحَقُّ عَلَيْهِ) ئەگەر قەرزدارەکە بە خاوەن قەرزەکەی گوت: من تۆم حەوالە نەکردوە، بەڵکو (وَكَّلْتُكَ لِتَقْبِضَ لِي) من تۆم کردۆتە وەکیلی‌خۆم تاکو قەرزەکەم بۆ من وەربگریەوە. (وَقالَ الْمُسْتَحِقُّ أَحَلْتَنِي) خاوەن قەرزەکەش گوتی: نا، بەڵکو حەوالەت کردوم تاکو بۆ خۆم وەری‌بگرمەوە. (أَوْ قالَ) یان قەرزدارەکە گوتی: (أَرَدْتُ بِقَوْلِي: أَحَلْتُكَ الْوَكالَةَ) مەبەستم بە ووشەی حەوالەکردن وەکیلایەتی بوو (وَقالَ الْمُسْتَحِقُّ بَلْ أَرَدْتَ الْحَوالَةَ) خاوەن قەرزەکەش گوتی: نا، بەڵکو مەبەستت حەوالە بوو. لەو مەسەلانەدا (صُدِّقَ الْمُسْتَحَقُّ عَلَيْهِ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە قەرزدارەکە دەکرێ بە هۆی سوێندخواردنی (وَفِي الصُّورَةِ الثّانِيَةِ وَجْهٌ) لە مەسەلەی دووەمدا فەرموودەیەك هەیە: کە باوەڕ بە خاوەن قەرزەکە دەکرێ.

(وَإِنْ قالَ أَحَلْتُكَ) ئەگەر قەرزدارەکە گوتی: من تۆم حەوالە کردوەو هیچ مافت لە سەر من نەماوە. (فَقالَ وَكَّلْتَنِي) خاوەن قەرزەکەش گوتی: نا، بەڵکو منت کردۆتە وەکیلی خۆت تاکو قەرزەکەت بۆ تۆ وەربگرمەوەو قەرزەکەی من لە ئەستۆی تۆدا ماوە. (صُدِّقَ الثّانِي بِيَمِينِهِ) لێرەدا باوەڕ بە خاوەن قەرزەکە دەکرێ بە هۆی سوێندخواردنی، ئینجا کە سوێندی خوارد حەوالەکە لادەچێو قەرزەکەی خۆی لە قەرزدارەکە وەردەگرێتەوە.

﴿ بابُ الضَّمانِ: **باسی زامینی** ﴾

واتە: مافی سەر کەسێکی‌تر بخاتە ئەستۆی خۆی: ئەگەر ئەو نەیدلوە، خۆی بیداتەوە، یان ئامادەکردنی کەسێك، یان ماڵێك لە کاتێکی‌تایبەتی‌دا بخاتە سەر شانی خۆی. ﴿عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: لَزِمَ رَجُلٌ غَرِيماً لَهُ بِعَشَرَةِ دَنانِيرَ فَقالَ: وَاللهِ لاَ أُفارِقُكَ حَتّى تَقْضِيَنِي أَوْ تَأْتِيَنِي بِحَمِيلٍ، فَتَحَمَّلَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَضاها عَنْهُ﴾ رواه أبوداود وابن ماجە بسند صالح، پیاوێك

شَرْطُ الضَّامِنِ: اَلرُّشْدُ، وَضَمانُ مَحْجُورعَلَيْه بفَلَسٍ كَشرائه، وَضَمانُ عَبْـدٍ بغَيْـرِ إِذْنِ سَيِّده باطلٌ فِىالأَصَحِّ، وَيَصِحُّ بِإِذْنه: فَإِنْ عَيَّنَ لِلأَداءِ كَسْبَهُ أَوْ غَيْرَهُ قَضَـى مِنْـهُ، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ كانَ مَأْذُوناً لَهُ فِىالتِّجارَةِ تَعَلَّقَ بِما فِى يَده وَما يَكْسِبُهُ بَعْـدَالإِذْنِ، وَإِلاَّ فَبِما يَكْسِبُهُ، وَالأَصَحُّ اشْتِراطُ مَعْرِفَةِ الْمَضْمُونِ لَهُ، وَأَنَّهُ لاَيُشْتَرَطُ قَبُولُهُ وَرِضاهُ،

---

قەرزدارێکی خۆی گرتبو چونکە دە دیناری قەرزدار بوو، گوتی: (والله) لێت جیا نابمەوە تا دەمدەیەوە، یان تا زامینێکم بۆ دێنی، ئینجا پێغەمبەرﷺ بووە زامینی، جا پیاوەکە بۆی نەگونجا قەرزەکە بداتەوە، پێغەمبەرﷺ قەرزەکەی بۆ دلوە.

ئینجا بزانە: زامینی لەم پێنج ڕوکنانە پێك دێ: (ضـامِن) زامین: کە مافەکە دەخاتە ئەستۆی خۆی. (مَضْمُونُ لَهُ) زامینیبۆکرلو: کە خاوەن مافەکەیە. (مَضْمُونُ عَنْـهُ) زامینی لەجیاتکراو: کە ماف لەسەرەکەیە. (مَضْمُون) زامینکرلو: کە خودی مافەکەیـە. (اَلصِّيغَةُ): گۆتەی زامینی.

(شَرْطُ الضَّـامِنِ) مـەرجی زامینەکـە (اَلرُّشْـدُ) ڕەشیدییە، واتـە: بـۆ دیـن‌و دونیـای خـۆی بگونجێ، کەواتە: زامینیی منداڵ‌و شێت‌و زۆرلێکرلو و قەدەغـەکرلو دروسـت نابـێ، بـەلام (وَضَمانُ مَحْجُورِ عَلَيْهِ بِفَلَسٍ) زامینـیی ئـەو کەسـەی کـە بـە هۆیقـەرزداری قەدەغـەی لـە سەر داندراوە (كَشِرائِهِ) وەکو کڕینە بە قەرزەکەی وایە، واتە: دروست دەبێ.

(وَضَـمانُ عَبْدٍ بِغَيْـرِ إِذْنِ سَيِّدِهِ باطِـلٌ) زامینـیی کۆیلـە بـە بێئیزنی گەورەکـەی بەتاڵـە (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام (وَيَصِـحُّ بِإِذْنِـهِ) بـە ئیزنـی گەورەکـەی دروسـت دەبێ (فَإِنْ عَيَّنَ لِـلأَداءِ كَسْـبَهُ) جا ئەگـەر گەورەکـەی –بۆ دانـەوەی ماڵەکـە– کەسـابەتی کۆیلەکەی دیاری کرد (أَوْ غَيْرَهُ) یان شتێکیتری دیـاری کـرد: وەك بازرگـانی (قَضَـى مِنْـهُ) لـەو دیـارکرلوە مافەکـەی دەداتـەوە (وَإِلاَّ) ئەگـەر هیچـی بـۆ دیـاری نـەکرد (فَالأَصَحُّ) بـە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ إِنْ كانَ مَأْذُونـاً لَـهُ فِـى التِّجارَةِ) ئەگـەر کۆیلەکـە ئیـزن درابـێ بـۆ بازرگانیکردن، ئەوە (تَعَلَّقَ بِما فِي يَدِهِ) تۆڵـەی زامینیەکـە دەبەسـترێتەوە بـەو ماڵـەی لـە دەستیدایەو (وَمايَكْسِبُهُ بَعْدَالإِذْنِ) هەم بـەو کەسـابەتەی لـە دوایئیزندانەکـە دەیکـا (وَإِلاَّ) بـەلام ئەگـەر بـۆ بازرگـانی ئیـزن نـەدرابو (فَبِمـا يَكْسِـبُهُ) ئـەوە بـە کەسـابەتەکەیەوە دەبەسترێتەوە.

(وَالأَصَـحُّ) فـەرموودەی ڕاسـتتر (اشْـتِراطُ مَعْرِفَةِالْمَضْـمُونِ لَـهُ) مەرجـە: زامینەکـە خـودی زامینیبۆکراوەکە بناسێ، چونکە ئەو خاوەنی مافەکەیە، خاوەن مافەکانیش لێك جیـاوازن –لە دواکردنی مافیخۆیان– لە توندی‌و نەرمیدا، بەلام (وَأَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ قَبُولُهُ وَرِضـاهُ) بـە مەرج دانانذرێ: زامینیبۆکرلوەکە زامینیەکە قبوڵ بکاو پێی ڕازی بێ.

وَلاَ يُشْتَرَطُ رِضَاالْمَضْمُونِ عَنْهُ قَطْعاً وَلاَ مَعْرِفَتُهُ فِيالأَصَحِّ، وَيُشْتَرَطُ فِيالْمَضْمُونِ كَوْنُهُ ثابتاً، وَصَحَّحَ الْقَدِيمُ ضَمانَ ما سَيَجِبُ، وَالْمَذْهَبُ صِحَّةُ ضَمان الدَّرْك بَعْدَ قَبْضِ الثَّمَنِ، وَهُوَ أَنْ يَضْمَنَ لِلْمُشْتَرِي الثمَنَ إِنْ خَرَجَ الْمَبِيعُ مُسْتَحَقّاً أَوْ مَعِيباً أَوْ ناقِصاً لِنَقْصِ الصَّنْجَةِ،

---

(وَلاَ يُشْتَرَطُ رِضا الْمَضْمُونِ عَنْهُ قَطْعاً) هەروەهاش بە مەرج دانانـدرێ زامـینی لەجیاتیکراوەکە ڕازی بێ، چونکە ئەو قەرزدارەو دروستیشە: کەسێك-بە بێ‌ئیزن- قەرزی کەسێکی‌تر بداتەوە، کەوابو: (وَلاَ مَعْرِفَتُهُ) ناسینیشی مەرج نیە (فِیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، جیاوازیش نیە: زامینی لەجیاتکراوەکە زیندوو بێ، یان مردوو بێ ﴿عَنْ جابِر‌ﷺ: أَتَيْنا رَسُولَ اللهِ‌ﷺ بِجَنازَةٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقالَ: أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟ قُلْنا: دِيناران. فَانْصَرَفَ، فَقالَ أَبوقتادَةَ: اَلدِّيناران عَلَيَّ. فَقَالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: حَقُّ الْغَرِيمِ وَبَرِئَ مِنْهُماالْمَيِّتُ؟ قالَ: نَعَمْ. فَصَلَّى عَلَيْهِ﴾ حديث صحيح رواه أحمد وأبوداود، مردوویێکمان هێنا لای پێغەمبەر‌ﷺ تاکو نوێژی جەنازەی لە سەر بکا، ئەویش فەرمووی: ئایا هیچ قەرزی لە سەرە؟ گوتمان: دوو دینار قەرزدارە. پێغەمبەر‌ﷺ نوێژی لە سەر نەکرد، جا (أبوقتادة) بووە زامینی‌و گوتی: دوو دینارەکە لە سەر من بن بیاندەمەوە. پێغەمبەر‌ﷺ فەرمووی: مافی خاوەن قەرزەکە کەوتە سەر تۆ و مردووەکەش لە دوو دینارەکە ئازاد بوو؟ گوتی: بەڵێ. جا پێغەمبەر‌ﷺنوێژی لە سەر کرد. واتە: لە حەدیسەکەدا باسی ناسینی مردووەکەو ڕازی‌بوونی نەکراوە.

(وَيُشْتَرَطُ فِيالْمَضْمُونِ) بە مەرج دادەندرێ: لە مافە زامینکراوەکەدا: یەکەم: (كَوْنُهُ ثابِتاً) مافێکی جێگیر بێ، بەڵام (وَصَحَّحَ الْقَدِيمُ) فەرموودەی کۆن بە دروستبووی داناوە: (ضَمانَ ما سَيَجِبُ) زامینیی ئەو مافەی لەمەودوا واجب دەبێ، وەك بڵێ: (ئەم شتە بفرۆشە فلانکەس من زامینی پارەکەم). یان بڵێ: (سەد دینار بە قەرز بدە فلانکەس من زامینی قەرزەکەم). ئەوە لە سەر فەرموودەی کۆن دەبێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کرلوەتەوە.

(وَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (صِحَّةُ ضَمانِ الدَّرْكِ) دروستە: زامینیی داواکردنی مامڵەت پێکراو (بَعْدَ قَبْضِ الثَّمَنِ) لە دوای وەرگرتنی پارەکە (وَهُوَ) زامینیی داوا کردن ئەمەیە: (أَنْ يَضْمَنَ لِلْمُشْتَرِي الثَّمَنَ) بۆ کڕیارەکە ببێتە زامینی پارەکەی (إِنْ خَرَجَ الْمَبِيعُ مُسْتَحَقّاً) ئەگەر فرۆشراوەکە بە ماڵی کەسێکی‌تر دەرچوو (أَوْ مَعِيباً) یان عەیبدار دەرچوو (أَوْ ناقِصاً) یان ناتەواو دەرچوو (لِنَقْصِ الصَّنْجَةِ) لەبەر ناتەواوی بارسەنگەکەی: وەك کیلۆ، یان گەز، یان ڕبەکەی ناتەواو بێ.

وَكَوْنُهُ لاَزِماً لاَ كَنُجُومِ كتابَة، وَيَصِحُّ ضَمانُ الثَّمَنِ فِي مُدَّةِالْخِيارِ فِيالأَصَحِّ، وَضَمانُ الْجُعْلِ كَالرَّهْنِ بِه، وَكَوْنُهُ مَعْلُوماً فِيالْجَدِيد، وَالإِبْراءُ مِنَ الْمَجْهُولِ باطِلٌ فِيالْجَدِيد،

---

دووەم: (وَكَوْنُهُ لاَزِماً) هەروەها مەرجە: مافە زامینکراوەکە واجب بوبێ، هەرچەندە جێگیریش نەبوبێ: وەکو پارەی فرۆشراوێکی وەرنەگیراو، یان مارەیی ژن پێش جیماع کردن (لاَ كَنُجُومِ كِتابَةٍ) نەك وەکو بەشەکانی پارەی نووسراو پێدان، چونکە واجب نیە کۆیلەکە بیدا (وَيَصِحُّ ضَمانُ الثَّمَنِ فِي مُدَّةِ الْخِيارِ) دروستە ببێتە زامینی پارەی فرۆشراوەکە بۆ فرۆشیارەکە لە ماوەی پەشیمانیدا (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَضَمانُ الْجُعْلِ) هەروەها دروستە ببێتە زامینی کرێی جەعالە، لە پاش تەواوبوونی کارەکە (كَالرَّهْنِ بِهِ) هەروەك ڕەهن دانانیش بۆ ئەو کرێیە دروست بوو.

سێیەم: (وَكَوْنُهُ مَعْلُوماً) هەروەها مەرجە مافە زامینکراوەکە زاندراو بێ لە لایەن زامینەکەوە: لە ڕووی ڕەگەزو جۆرو ئەندازەوە (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، کەواتە: زامینیی مافی نەزاندراو دروست نابێ، بەلام لە فەرموودەی کۆندا: زانینی زامینکراو مەرج نیە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

## ﴿ باسی گەردەن ئازادکردن ﴾

(وَالإِبْراءُ) گەردەن ئازادکردن (مِنَ الْمَجْهُولِ) لە شتی نەزاندراو (باطِلٌ) بەتاڵەو ئازاد نابێ، واتە: لە دونیادا، بەلام بۆ قیامەت ئازاد دەبێ، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، بەلام لە فەرموودەی کۆندا: گەردەن ئازادکردن لە شتی نەزاندراویش دروست دەبێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: دروستە لە بەرامبەر گەردەن ئازادکردن شتێك بداتە خاوەن مافەکە، کەوابو: هەر کاتێك خاوەن ماف گەردەنی ئازاد کرد، شتەکە دەبێتە ملکی خۆی، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەو مافەی گەردەنی لێ ئازاد دەکرێ، مەرجە: قەرز بێ، واتە: گەردەن ئازادکردن لە شتی بەرچاو دروست نابێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە، وەك بلێ: (**گەردەنت ئازاد بێ لەو پەڕتووکەی لێمت داگیر کردوە**). ئەوە دروست نیە، بەڵکو دەبی بلێ: (**بە تۆم بەخشی**).

هەروەها مەرجە: ئازادکەرو ئازادکراوەکە هەردووکیان ئەندازەو ڕەگەزو جۆری مافەکە بزانن، لەو حاڵەتەی ئازادکردنەکە ئاڵوگۆڕی تێدایە، وەك بلێ: (**ئەگەر لە مارەییەکەت گەردەنم ئازاد بکەی تەڵاقت بکەوێ**).

بەلام ئەگەر ئاڵوگۆڕی تێدا نەبێ، ئەو کاتە مەرج نیە: ئازادکراوەکە زانستی بە مافەکە هەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

إلاَّ مِنْ إبِلِ الدِّيَةِ، وَيَصِحُّ ضَمانُها في الأَصَحِّ، وَلَوْ قالَ ضَمِنْتُ ما لَكَ عَلَى زَيْدٍ مِنْ دِرْهَمٍ إِلَى عَشَرَةٍ فَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ وَأَنَّهُ يَكُونُ ضامِناً لِعَشَرَةٍ، قُلْتُ: الأَصَحُّ لِتِسْعَةٍ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئینجا بزانە: ئەگەر دەیویست لە قەرزێکی نەزانراو گەردەنی ئازاد بکا، با ژمارەیەکی وەها بڵێ: کە بێگومان لە ئەندازەی قەرزەکە زیاتر بێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، وەك بڵێ: (لە دینارێك تا دە هەزار دینار گەردنت ئازاد بێ).

هەروەها واجبە: مرۆڤ گەردەنی خۆی بەو کەسانەش ئازاد بکا، کە غەیبەتی کردون، یان ئابڕووی بردون، یان ستەمی لێکردون، جا ئەگەر خاوەن مافەکە بە بێوەرگرتنی ماڵ گەردەنی ئازاد نەدەکرد، با شتێکی بداتێ تا گەردەنی ئازاد بکا، جا ئەگەر غەیبەتەکە نەگەیشتبوە غەیبەتکراوەکە، ئەوەندە بەسە: پەشیمان ببێتەوەو دوعای لێخۆشبوونی گوناهیش بۆ غەیبەتکراوەکە بکا.

دیسان بزانە: گەردەن ئازادکردنی منداڵ پێش بلۆغبوون بە هیچ جۆرێك دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کرانەوە.

(إلاَّ مِنْ إبِلِ الدِّيَةِ) تەنها لە ووشترەکانی خوێنی مرۆڤی‌کوژراو گەردەن ئازادکردن دروست دەبێ، هەرچەند نەشزاندرێ چۆنن (وَيَصِحُّ ضَمانُها) هەم دروستە: یەکێك ببێتە زامینی ووشترەکانیش (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر بڵێ: (ضَمِنْتُ مالَكَ عَلَى زَيْدٍ) بوومە زامینی ئەو قەرزەی‌تۆ کە لە سەر زەیدە (مِنْ دِرْهَمٍ إِلَى عَشَرَةٍ) لە دیرهەمێك تا دە دیرهەم ( فَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەو زامینی‌یە دروستە، هەروەك ئەو جۆرە گەردەن ئازادکردنەش دروست بوو (وَأَنَّهُ) ئەو مرۆڤە (يَكُونُ ضامِناً لِعَشَرَةٍ) دەبێتە زامینی دە دیرهەم (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (الأَصَحُّ لِتِسْعَةٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: دەبێتە زامینی نۆ دیرهەم (وَاللهُ أَعْلَمُ).

کەوابو: ئەگەر بڵێ: (گەردەنت ئازاد بێ لە دیرهەمێك تا دە دیرهەم). یان بڵێ: (لە دیرهەمێك تا دە دیرهەم نەزری تۆم کرد). ئەوە گەردەنی لە نۆ دیرهەم ئازاد کردوەو، هەم نۆ دیرهەمی نەزر کردوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کەفالەت ﴾

واتە: ئامادەکردنی کەسێك لە لای کەسێك لە کاتو شوێنێکی دیارکرلودا، بخاتە سەر شانی خۆی. جا ئەمەیان پێی دەگوترێ: (كَفِيلْ). وە ئەوەی ئامادە دەکرێ، پێی دەگوترێ: (مَكْفُول) کەفالەتکراو. ئەوەی لە لایشی ئامادە دەکرێ، پێی دەگوترێ: (مَكْفُولٌ لَهُ) کەفالەت بۆکراو.

(فَصْلٌ) اَلْمَذْهَبُ صِحَّةُ كَفالَةِ الْبَدَن، فَإِنْ كَفَلَ بَدَنَ مَنْ عَلَيْه مالٌ لَمْ يُشْتَرَط الْعِلْمُ بِقَدْرِه، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مِمَّا يَصِحُّ ضَمانُهُ، وَالْمَذْهَبُ صِحَّتُها بِبَدَنِ مَنْ عَلَيْه عُقُوبَةٌ لآدَمِيٍّ: كَقِصاصٍ وَحَدِّ قَذْفٍ، وَمَنْعُها فِي حُدُودِ اللهِ تَعالَى، وَتَصِحُّ بِبَدَنِ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ وَمَحْبُوسٍ وَغائِبٍ وَمَيِّتٍ لِيُحْضِرَهُ فَيُشْهَدَ عَلَى صُورَتِه، ثُمَّ إِنْ عَيَّنَ مَكانَ التَّسْلِيمِ تَعَيَّنَ، وَإِلاَّ فَمَكانُها، وَيَبْرَأُ الْكَفِيلُ بِتَسْلِيمه فِي مَكانِ التَّسْلِيمِ

---

(اَلْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستیمەزهەب: (صِحَّةُ كَفالَةِالْبَدَنِ) کەفیلایەتی لاشە دروستەو بەشێکە لە زامینیو خەڵك پێویستی پێیەتی: (فَإِنْ كَفَلَ بَدَنَ مَنْ عَلَيْهِ مالٌ) جا ئەگەر بووە کەفیلی لاشەیکەسێکی وەها: کە ماڵێکی لە سەر بوو، یان لە لایبوو (لَمْ يُشْتَرَطِ الْعِلْمُ بِقَدْرِهِ) بە مەرج دانانرێ ئەندازەیماڵەکە بزانرێ، بەڵام (وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مِمَّايَصِحُّ ضَمانُهُ) بە مەرج دادەنرێ: ماڵەکەی سەر کەفالەتکراوەکە لەو جۆرە بێ: زامینیی دروست بێ، کەوابو: دروستە: ببێتە کەفیلی لاشەیمرۆڤێکی قەرزدار تاکو لە کاتو شوێنێکی دیارکراودا لە لایکەسێك ئامادەی بکا، هەرچەندە نەشزانێ ئەندازەی قەرزەکە چەندە.

(وَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (صِحَّتُها بِبَدَنِ مَنْ عَلَيْهِ عُقُوبَةٌ لآدَمِيٍّ) کەفیلایەتی دروستە: بە لاشەی ئەو کەسەی سزایەکی ئادەمیزادێکی لە سەرە (كَقِصاصٍ) وەك کوشتنی لە تۆڵەی کوشتنێكو (وَحَدِّ قَذْفٍ) سزای بوختان پێکردن (وَمَنْعُها فِي حُدُودِ اللهِ تَعالَى) هەر بەو فەرموودەیە کەفیلایەتی قەدەغەیەو دروست نیە: لە سزایەکی مافی خوای گەورە: وەکو زیناو شەڕاب خواردنەوە، بەڵام لە فەرموودەیەکیتردا: لە سزایەکانی مافی خوای گەورەشدا کەفیلایەتی دروستە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَتَصِحُّ) کەفیلایەتی دروستە (بِبَدَنِ صَبِيٍّ) بە لاشەی منداڵو (وَمَجْنُونٍ) شێتو (وَمَحْبُوسٍ) بەندکراو و (وَغائِبٍ) نادیارو (وَمَيِّتٍ) مردو و (لِيُحْضِرَهُ) تاکو مردووەکە ئامادە بکا (فَيُشْهَدَ عَلَى صُورَتِهِ) بۆ ئەوەی شاهیدی لە سەر ڕەنگو لاشەکەی بدرێ، ئەگەر ناو و نەژادی نەزانرێو ژێر خاکیش نەکرابێو لاشەکەشی نەگۆڕابێ، ئەگینا: کەفالەتەکە دروست نابێ، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(ثُمَّ إِنْ عَيَّنَ مَكانَ التَّسْلِيمِ) ئینجا ئەگەر کەفیلەکە شوێنی تەسلیمکردنیکەفالەتکراوەکەی دیاری کردبو (تَعَيَّنَ) ئەوە دەبێ هەر لەو شوێنە دیارکراوەدا ئامادەی بکا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچ شوێنێکی دیاری نەکردبو (فَمَكانُها) ئەوە هەر شوێنی کەفالەت لێکردنەکە دەبێتە دیارکراو، واتە: لەوێدا ئامادەی دەکا.

ئینجا (وَيَبْرَأُالْكَفِيلُ) کەفیلەکە –لە کەفیلایەتی– ئازاد دەبێ: (بِتَسْلِيمِهِ) بەوەی کەفالەتکراوەکە تەسلیمی کەفالەت بۆکراوەکە بکا (فِي مَكانِ التَّسْلِيمِ) لەو شوێنەدا کە بۆ

بِلاَحائِلٍ كَمُتَغَلِّب، وَبِأنْ يَحْضُرَ الْمَكْفُولُ وَيَقُولَ سَلَّمْتُ نَفْسي عَنْ جِهَةِ الْكَفِيلِ، وَلاَ يَكْفي مُجَرَّدُ حُضُورِه، فَإنْ غابَ لَمْ يَلْزَمِ الْكَفِيلَ إحْضارُهُ إنْ جَهِلَ مَكانَهُ، وَإلاَّ فَيَلْزَمُهُ، وَيُمْهَلُ مُدَّةَ ذَهاب وَإِياب، فَإِنْ مَضَتْ وَلَمْ يُحْضِرْهُ حُبِسَ، وَقِيلَ إنْ غابَ إلَى مَسافَةِ الْقَصْرِ لَمْ يَلْزَمْهُ إحْضارُهُ،

---

تەسلیمکردن دیاریکراوە (بِلاَحائِلٍ) بە بێهیچ پەردەو ڕێگرتنێك، واتە: ئەگەر قەدەغەیەك ھەبو: (كَمُتَغَلِّبٍ) وەك خاوەن دەسەڵاتێك ڕێگا نەدا کەفالەتکراوەکە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کەفالەت بۆکراوەکە، ئەو کاتە کەفیلەکە ئازاد نابێ، ھەرچەند ئامادەشی بکا.

(وَ) ھەروەھا کەفیلەکە- لە کەفیلایەتی- ئازاد دەبێ: (بِأنْ يَحْضُرَ الْمَكْفُولُ) بەوەی کەفالەتکراوەکە-بەخۆی- لە شوێنی دیارکراودا ئامادە بێو (وَيَقُولَ) بە کەفالەت بۆکراوەکە بڵێ: (سَلَّمْتُ نَفْسِي عَنْ جِهَةِ الْكَفِيلِ) ئەوە خۆم تەسلیمی تۆ کرد لە لایەن کەفیلەکەمەوە. کەوابو: (وَلاَ يَكْفِي مُجَرَّدُ حُضُورِهِ) تەنھا ئامادەبوونی لە شوێنەکەدا بەس نیە، ئەگەر نەڵێ: لە لایەن کەفیلەکەمەوە خۆم تەسلیم کردوی.

(فَإِنْ غابَ) جا ئەگەر کەفالەتکراوەکە دیار نەبو و ڕۆیشتبوە شوێنێکیتر (لَمْ يَلْزَمِ الْكَفِيلَ إِحْضارُهُ) لە سەر کەفیلەکە واجب نیە: بیھێنێتەوەو ئامادەی بکا (إِنْ جَهِلَ مَكانَهُ) ئەگەر نەیدەزانی لە کوێیە، چونکە عوزری بە دەستە، کەوابو: بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر دەیزانی لە کوێیە (فَيَلْزَمُهُ) واجبە: بیھێنێتەوەو ئامادەی بکا (وَيُمْهَلُ مُدَّةَ ذَهابٍ وَإِيابٍ) کەفیلەکە مۆڵەتی دەدرێتێ بۆ ماوەی چوونو گەڕانەوەی بە گوێرەی عادەتی شوێنەکە.

(فَإِنْ مَضَتْ) جا ئەگەر ماوەکەی تەواو بوو (وَلَمْ يُحْضِرْهُ) کەفالەتکراوەکەشی نەھێناو ئامادەی نەکرد (حُبِسَ) کەفیلەکە بەند دەکرێو لە بەندیخانە ئازاد ناکرێ تا دەزانین: کەفالەتکراوەکە مردوە، یان لە لای خاوەن دەسەڵاتێك خۆی پەنا داوە، یان بۆ شوێنێکی نەزانراو ڕایکردوە، واتە: لەو حاڵەتانەدا کەفیلەکە-لە بەندیخانە- ئازاد دەکرێ.

ھەروەھا ئەگەر کەفیلەکە-لەخۆیەوە- قەرزەکەی بداتەوە، ئەو کاتەش لە بەندیخانە ئازاد دەکرێ، ھەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێھێزدا (إِنْ غابَ إِلَى مَسافَةِ الْقَصْرِ) ئەگەر ڕۆیشتبووە شوێنێکی دووری بە ئەندازەی کورتکردنەوەی نوێژ (لَمْ يَلْزَمْهُ إِحْضارُهُ) واجب نیە: ئامادەی بکا.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەرکی بە سەفەرچوونی کەفیلەکەو گەڕانی بە دوای کەفالەتکراوەکەدا گشتی لە سەر کەفیلەکەیە، ھەروەھاش ئەرکی سەفەری کەفالەتکراوەکەش لە سەر خۆیەتی، ھەروەك لە (تحفة)و (نھایة)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِذَا ماتَ وَدُفِنَ لاَ يُطالَبُ الْكَفِيلُ بِالْمالِ، وَأَنَّـهُ لَـوْ شُـرِطَ فِي الْكَفالَـةِ: أَنَّهُ يَغْرَمُ الْمالَ إِنْ فـاتَ التَّسْـلِيمُ بَطَلَـتْ، وَأَنَّهـا لاَ تَصِـحُّ بِغَيْرِرِضـاالْمَكْفُولِ.
(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ فِي الضَّمانِ وَالْكَفالَةِ لَفْظٌ يُشْعِرُ بِالْتِزامٍ:

---

دووهم: کەفیلەکە –ڕاستەوخۆ– داوای ماڵەکەی لێناکرێ، بەڵکو بەند دەکرێ، جا ئەگەر –لەخۆیەوە– لە ترسی بەندکردن ماڵەکەی داوە خاوەن مافەکە، ئەو کاتە دروست نیە بەند بکرێ، ماڵەکەش وەك قەرزێك دەبێتە ملکی خاوەن مافەکە، واتە: هەر کاتێك کەفالەتکراوەکە ئامادە بوو، یان مرد، ئەو کاتە کەفیلەکە ماڵەکەیخۆی لە خاوەن مافەکە وەردەگرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.
(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ إِذَا ماتَ) هەر کاتێك کەفالەتکراوەکە مرد و (وَدُفِنَ) ناشترا، یان بۆ شوێنێکی نەزاندراو ڕایکرد، لەو حاڵەتانەدا (لاَ يُطالَبُ الْكَفِيلُ بِالْمالِ) داوای ماڵەکە لە کەفیلەکە ناکرێ، بەڵکو –لەو حاڵەتانەدا– ئەگەر بەندیش کرابێ، واجبە: ئازاد بکرێ، هەروەك ڕابرا.
ئینجا بزانە: ئەگەر کەفیلەکە بمرێ، کەفالەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە، واتە: کەفالەت بۆکراوەکە هیچ مافێکی لە میراتی ئەودا نیە، بەڵام ئەگەر کەفالەت بۆکراوەکە بمرێ، ئەو کاتە کەفالەتەکە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکو مافەکەی دەبێتە هی میراتگرەکانی، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.
(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (لَوْ شُرِطَ فِي الْكَفالَةِ) ئەگەر لە کەفالەتەکەدا بە مەرج دانرا: (أَنَّهُ يَغْرَمُ الْمالَ) کەفیلەکە ئەو ماڵە بداتەوە: کە لە سەر کەفالەتکراوەکەیە (إِنْ فاتَ التَّسْلِيمُ) ئەگەر تەسلیمکردنی کەفالەتکراوەکە لە دەست چوو (بَطَلَتْ) بە هۆی ئەو مەرجە کەفالەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە.
(وَأَنَّها لاَتَصِحُّ) هەر بە فەرموودەیڕاستتر: کەفالەت دروست نابێ (بِغَيْرِ رِضاالْمَكْفُولِ) بە بێڕەزامەندی کەفالەتکراوەکە، یان سەرپەرشتکارەکەی وی، چونکە ئەگەر ئیزن نەدا، لە سەری واجب نابێ لەگەڵ کەفیلەکە لە شوێنی دیارکراودا ئامادە ببێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گۆتەی دامەزراندنی زامینی و کەفالەت ﴾

(يُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ: (فِي الضَّمانِ) لە زامینـی ماڵو (وَالْكَفالَةِ) لە کەفیلایەتی لاشەدا (لَفْظٌ) ووشەیەکی وەها بگوترێ: کە (يُشْعِرُ بِالْتِزامٍ) بگەیەنێ مافەکەی خستۆتە ملی خۆی.
ئینجا بزانە: نووسینیش وەکو گۆتنە ئەگەر نیەتی لەگەڵدا بێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

كَضَمِنْتُ دَيْنَكَ عَلَيْهِ أَوْ تَحَمَّلْتُهُ أَوْ تَقَلَّدْتُهُ أَوْ تَكَفَّلْتُ بِبَدَنِهِ، أَوْ أَنَا بِالْمَالِ أَوْ بِإِحْضَارِ الشَّخْصِ ضَامِنٌ أَوْ كَفِيلٌ أَوْ زَعِيمٌ أَوْ حَمِيلٌ، وَلَوْ قَالَ أُؤَدِّي الْمَالَ أَوْ أُحْضِرُ الشَّخْصَ فَهُوَ وَعْدٌ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ تَعْلِيقُهُمَا بِشَرْطٍ، وَلاَ تَوْقِيتُ الْكَفَالَةِ، وَلَوْ نَجَّزَهَا وَشَرَطَ تَأْخِيرَ الإِحْضَارِ شَهْراً جَازَ، وَأَنَّهُ يَصِحُّ ضَمَانُ الْحَالِّ مُؤَجَّلاً أَجَلاً مَعْلُوماً، وَأَنَّهُ يَصِحُّ ضَمَانُ الْمُؤَجَّلِ حَالاً، وَأَنَّهُ لاَ يَلْزَمُهُ التَّعْجِيلُ،

---

(كَـ) وەك بڵێ: (ضَمِنْتُ دَيْنَكَ عَلَيْهِ) بوومە زامینی قەرزی تۆ كە لە سەر فلاَنكەسە (أَوْ تَحَمَّلْتُهُ) یان بڵێ: من باری قەرزەكەتم هەلگرت (أَوْ تَقَلَّدْتُهُ) یان بڵێ: قەرزەكەتم خستە گەردەنی خۆم (أَوْ) یان لە كەفالەتدا بڵێ: (تَكَفَّلْتُ بِبَدَنِهِ) بوومە كەفیلی لاشەی فلاَنكەس (أَوْ) یان بڵێ: (أَنَا بِالْمَالِ) من بەو ماڵەی لە سەر فلاَنە زامینم (أَوْ بِإِحْضَارِ الشَّخْصِ ضَامِنٌ) یان بڵێ: من بە ئامادەكردنی مرۆڤەكە زامینم (أَوْ كَفِيلٌ) یان كەفیلم (أَوْ زَعِيمٌ) یان ماڵدەرێكی گەورەم (أَوْ حَمِيلٌ) یان بار هەڵگرم.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (أُؤَدِّي الْمَالَ) من ماڵەكە دەدەم (أَوْ) یان گوتی (أُحْضِرُ الشَّخْصَ) مرۆڤەكە ئامادە دەكەم (فَهُوَ وَعْدٌ) ئەو گوتەیە گفتدانێكە واجب نیە جێبەجێ بكرێ، واتە: بەو جۆرە ووشەیە زامینیو كەفیلایەتی دانامەزرێ، چونكە ماف خستنەملی تێدا نیە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ تَعْلِيقُهُمَا بِشَرْطٍ) دروست نیە زامینیو كەفالەت بە مەرجێكەوە ببەسترێن، وەك بڵێ: هەر كاتێك سەری مانگ هات من زامینم، یان كەفیلم (وَلاَ تَوْقِيتُ الْكَفَالَةِ) هەروەها ماوە دانانیش بۆ كەفیلایەتیو بۆ زامینی دروست نیە، وەك بڵێ: من كەفیلم تا مانگێك، یان زامینم تا ساڵێك. بەلاَم (وَلَوْ نَجَّزَهَا) ئەگەر -بە بێبەستنەوە- بڕیاری كەفیلایەتی داو (وَشَرَطَ تَأْخِيرَ الإِحْضَارِ شَهْراً) لە بڕیارەكەدا بە مەرجی دانا: ماوەی مانگێك ئامادەكردنی مرۆڤەكە دوا بخا (جَازَ) ئەوە دروستە، وەك بڵێ: من كەفیلم بە ئامادەكردنی لاشەی فلاَنكەس لە دوای مانگێك ئامادەی دەكەم.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (يَصِحُّ ضَمَانُ الْحَالِّ مُؤَجَّلاً) دروستە زامینیی قەرزێكی حازر بە زامینیەكی كات بۆدانراو: كە (أَجَلاً مَعْلُوماً) كاتەكەش زانراو بێ، وەك بڵێ: من كەفیلی ئەم قەرزەتم كە ئێستا كاتیدانەوەی هاتوە لە دوای مانگێك دەتدەمەوە.

(وَ) هەروەها (أَنَّهُ يَصِحُّ ضَمَانُ الْمُؤَجَّلِ حَالاً) بە فەرموودەی ڕاستتر دروستە زامینیی ئەو قەرزەی كاتی دانەوەی نەهاتوە بە زامینیەكیحازر، وەك بڵێ: من زامینی ئەو قەرزەتم كە پاش مانگێك كاتیدانەوەی دێ ئێستا دەتدەمەوە، بەلاَم (وَأَنَّهُ لاَيَلْزَمُهُ التَّعْجِيلُ) بە فەرموودەیڕاستتر: لەم مەسەلەیدووەمەدا لە سەری واجب نیە: بە پەلە قەرزەكە بداتەوە.

وَلِلْمُسْتَحِقِّ مُطالَبَةُ الضَّامِنِ وَالأَصيلِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ بِشَرْطِ بَراءَةِ الأَصيلِ، وَلَوْ أَبْرَأَ الأَصيلَ بَرِئَ الضَّامِنُ، وَلاَ عَكْسَ، وَلَوْ ماتَ أَحَدُهُما حَلَّ عَلَيْهِ دُونَ الآخَرِ، وَإِذا طالَبَ الْمُسْتَحِقُّ الضَّامِنَ فَلَهُ مُطالَبَةُ الأَصيلِ بِتَخْليصِهِ بِالأَداءِ إِنْ ضَمِنَ بِإِذْنِهِ،

---

(وَلِلْمُسْتَحِقِّ) بۆ خاوەن مافەکەو بۆ میراتگرەکەی دروستە (مُطالَبَةُ الضَّامِنِ) داوای مافەکەی لە زامینەکە بکا، هەم (وَالأَصيلِ) داواش لە خودی ماف لەسەرەکە بکا: بە یەکەوەو بە جیاجیا، چونکە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿الزَّعِيمُ غارِمٌ﴾ رواه الترمذي وحسنه، کەفیل تۆڵەژمێرە. واتە: ئەگەر قەرزدارەکە نەیدلوە، واجبە: ئەو بیداتەوە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ) زامینیو کەفالەت هیچێکیان دروست نابن (بِشَرْطِ بَراءَةِ الأَصيلِ) بە مەرجی ئازادیی ماف لەسەرەکە.

(وَلَوْ أَبْرَأَ الأَصيلَ) ئەگەر خاوەن مافەکە ماف لەسەرەکەی -لە مافەکە- ئازاد کرد، ئەو کاتە (بَرِئَ الضَّامِنُ) زامینەکەش ئازاد دەبێ، چونکە مافەکە لاچووە، بەڵام (وَلاَ عَكْسَ) بە پێچەوانەوە نابێ، واتە: ئەگەر خاوەن مافەکە زامینەکەی -لە زامینی، یان لە مافەکە- ئازاد کرد، ئەو کاتە ماف لەسەرەکە ئازاد نابێو مافەکەی هەر لەسەر دەمێنێ.

(وَلَوْ ماتَ أَحَدُهُما) ئەگەر -لە زامینەکەو لە ماف لەسەرەکە- یەکێکیان مرد (حَلَّ عَلَيْهِ) قەرزی دواخراو -تەنها- لە سەر مردووەکە دەبێتە حازر، چونکە بە هۆی مردن ئەستۆیەکەی وێران بووەو قەرزەکە دەکەوێتە سەر میراتەکەی (دُونَ الآخَرِ) لە سەر ئەویتر -کە زیندووەکەیە- نابێتە حازر.

جا ئەگەر ماف لەسەرەکە بمرێ، ئەوە دروستە زامینەکە داوا لە خاوەن مافەکە بکا: مافەکەیخۆی لە میراتی ماف لەسەرەکە وەربگرێتەوە، یان گەردەنی ئازاد بکا؟ نەوەك میراتەکەی بفەوتێو تۆڵەی مافەکەی پێوەرنەگیرێتەوە.

بەڵام ئەگەر زامینەکە بمرێو خاوەن مافەکەش لە میراتەکەی وی مافی خۆی وەرگرت، نابێ میراتگرەکانی زامینەکە ئێستا بگەڕێنەوە سەر ماف لەسەرەکە، بەڵکو کە کاتی قەرزدانەوە داهات، ئەو کاتە دەگەڕێنەوەو تۆڵەی مافەکە لە ماف لەسەرەکە وەردەگرنەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِذا طالَبَ الْمُسْتَحِقُّ الضَّامِنَ) هەر کاتێك خاوەن مافەکە داوای مافەکەی لە زامینەکە کرد (فَلَهُ مُطالَبَةُ الأَصيلِ) بۆ زامینەکەش دروستە: داوا لە ماف لەسەرەکە بکا (بِتَخْليصِهِ بِالأَداءِ) مافەکەی بداتەوە خاوەن مافەکەو لە زامینیەکە ڕزگاری بکا (إِنْ ضَمِنَ بِإِذْنِهِ) ئەگەر بە ئیزنی ماف لەسەرەکە بوبێتە زامین.

وَالأصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُطالِبُهُ قَبْلَ أَنْ يُطالَبَ، وَللضَّامِنِ الرُّجُوعُ عَلَى الأَصِيلِ إِنْ وُجِدَ إِذْنُهُ فِي الضَّمانِ وَالأَداءِ، وَإِنِ انْتَفَى فِيهِما فَلاَ، وَإِنْ أَذِنَ فِي الضَّمانِ فَقَطْ رَجَعَ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ عَكْسَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ أَدَّى مُكَسَّراً عَنْ صِحاحٍ أَوْ صالَحَ عَنْ مِأَةٍ بِثَوْبٍ قِيمَتُهُ خَمْسُونَ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ إِلاَّ بِما غَرِمَ، وَمَنْ أَدَّى دَيْنَ غَيْرِهِ بِلاَ ضَمانٍ وَلاَ إِذْنٍ فَلاَ رُجُوعَ،

---

بەلام (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يُطالِبُهُ قَبْلَ أَنْ يُطالَبَ) نابێ زامینەکە داوای مافدانەوەی لێبکا، پێش ئەوەی داوای مافەکە لەوی بکرێ.

ئینجا (وَللضَّامِنِ) هەر کاتێك زامینەکە لە ماڵیخۆی مافەکەی داوە خاوەن مافەکە، بۆی هەیە (الرُّجُوعُ عَلَى الأَصِيلِ) بگەڕێتەوە سەر ماف لەسەرەکەو چەندی لەجیاتی داوەتەوە، ئەوەندەی لێوەربگرێتەوە (إِنْ وُجِدَ إِذْنُهُ فِي الضَّمانِ وَالأَداءِ) ئەگەر ماف لەسەرەکە ئیزنی هەبوبێ: لە زامینیو لە مافدانەوەکەدا، بەلام (وَإِنِ انْتَفَى فِيهِما) ئەگەر لە زامینیو لە مافدانەوەکەدا ئیزنی نەبوبێ (فَلاَ) زامینەکە هیچ مافێکی نیە بگەڕێتەوە سەر ماف لەسەرەکە بۆ ئەوەی چەندی داوە لێی وەربگرێتەوە، چونکە لە خۆیەوە-بە خۆڕایی- مافەکەی داوەتەوە.

(وَإِنْ أَذِنَ فِي الضَّمانِ فَقَطْ) ئەگەر ماف لەسەرەکە-تەنها - ئیزنی دابو: ببێتە زامینو ئیزنی نەدابو مافەکەی لەجیاتی بداتەوە، ئەو کاتە (رَجَعَ) دەگەڕێتەوە سەر ماف لەسەرەکەو چەندی لەجیاتی داوە لێی وەردەگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئیزنی زامینیی هەیەو زامینیش هۆی دانەوەیە.

بەلام (وَلاَ عَكْسَ) بە پێچەوانەوە نابێ، واتە: ئەگەر بێئیزن بوە زامین، بەلام ئیزنیدا: مافەکەی لەجیاتی بداتەوە، ئەو کاتە نابێ زامینەکە مافەکەی لێوەربگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بە هۆی زامینیەکی ئیزننەدراو قەرزەکەی داوەتەوە، بەلام لە فەرموودەکەیتردا: بۆی هەیە لێی وەربگرێتەوە، چونکە بە ئیزنی وی مافەکەی داوەتەوە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَدَّى مُكَسَّراً عَنْ صِحاحٍ) ئەگەر زامینەکە پارەی وردەی لەجیاتی درشتە دایەوە (أَوْ صالَحَ عَنْ مِأَةٍ) یان سولحی کرد لەجیاتی سەد دینار (بِثَوْبٍ قِيمَتُهُ خَمْسُونَ) پارچە جلێکی دایەوە کە نرخی پەنجا دینار بوو (فَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ إِلاَّ بِما غَرِمَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەوەی داویە، تەنها ئەوی لە ماف لەسەرەکە وەردەگرێتەوە، واتە: وردەکەو پەنجا دینارەکە، چونکە هەر ئەوەندەی لە دەست چووە.

(وَمَنْ أَدَّى دَيْنَ غَيْرِهِ) هەر کەسێك قەرز بۆ قەرزدارێك بداتەوە (بِلاَ ضَمانٍ وَلاَ إِذْنٍ) بێزامینیو بێئیزندانی قەرزدارەکە، ئەوە قەرزەکە لە سەر قەرزدارەکە لادەچێ، بەلام (فَلاَ رُجُوعَ)

وَإِنْ أَذِنَ بِشَرْطِ الرُّجُوعِ رَجَعَ، وَكَذَا إِنْ أَذِنَ مُطْلَقاً فِي الأَصَحِّ، وَالأَصَحُّ أَنَّ مُصَالَحَتَهُ عَلَى غَيْرِ جِنْسِ الدَّيْنِ لاَ تَمْنَعُ الرُّجُوعَ، ثُمَّ إِنَّمَا يَرْجِعُ الضَّامِنُ وَالْمُؤَدِّي إِذَا أَشْهَدَا بِالأَدَاءِ

---

کەسەکە بۆی نیە بگەڕێتەوە سەر قەرزدارەکەو ئەوەندەی بۆی داوەتەوە لێی وەربگرێتەوە، بەڵکو لە کیس خۆی دەچێ، چونکە لە حەدیسەکەی (جابر)ی ڕابردوودا پێغەمبەرﷺ بە(أبوقتادة)ی فەرموو: ﴿حَقُّ الْغَرِيمِ وَبَرِئَ مِنْهُمَاالْمَيِّتُ﴾ مافی خاوەن قەرزەکە کەوتە سەر تۆ، مردووەکەش لە دوو دینارەکە ئازاد بو. واتە: چونکە (أبوقتادة) پێشدا زامین نەبو و ئیزنی مردووەکەشی وەرنەگرتبو، بۆیێ دوو دینارەکە لە کیس خۆی ڕۆیشت و قەرزەکەش لە سەر مردووەکە لاچوو.

(وَإِنْ أَذِنَ بِشَرْطِ الرُّجُوعِ) ئەگەر قەرزدارەکە کەسێکی ئیزن دا: قەرزەکەی بۆ بداتەوە بەو مەرجەی بگەڕێتەوەو لێی وەربگرێتەوە، ئەو کاتە (رَجَعَ) مافی هەیە بگەڕێتەوە سەری‌و ئەوەندەی بۆی داوەتەوە، لێی وەربگرێتەوە.

(وَكَذَا) هەروەها مافی وەرگرتنەوەی هەیە (إِنْ أَذِنَ مُطْلَقاً) ئەگەر قەرزدارەکە ئیزنی دابێ‌و باسی گەڕانەوە سەریشی نەکردبێ‌و بێ‌ئیزن نەبوبێتە زامین (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بە بێ‌زامینی بە مەبەستی لێوەرگرتنەوەو بە ئیزنی‌قەرزدارەکە قەرزەکەی داوەتەوە.

ئینجا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ مُصَالَحَتَهُ عَلَى غَيْرِ جِنْسِ الدَّيْنِ) سولح کردنی ئیزندراوەکە لە سەر شتێکی‌تر: کە ڕەگەزی قەرزەکە نەبێ، واتە: ئەگەر لەجیاتی قەرزەکە شتێکی‌تری داوە خاوەن قەرزەکە، ئەوە (لاَ تَمْنَعُ الرُّجُوعَ) ڕێگای گەڕانەوەو وەرگرتنەوە ناگرێ، کەواتە: لە قەرزەکەو لەو شتەی لە جیاتی‌ی داوە، کامەیان کەمترە، ئەویان لە قەرزدارەکە وەردەگرێتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بڵێتە یەکێکی‌تر: (ئالیک بدە ئاژەڵەکەم). یان بڵێ: (بە پارە لە دیلی ڕزگارم بکە). یان بڵێ: (قەرزەکەم بۆ بدەوە). یان بڵێ: (ژنەکەم بەخێو بکە). لەو مەسەلانەدا –بە بێ‌مەرج– مافی هەیە بگەڕێتەوە سەری‌و مەسرەفەکەی لێوەربگرێتەوە، بەڵام ئەگەر بڵێ: (خانووەکەم بۆ نوێ بکەوە). یان بڵێ: (قەرزی فلانکەس بدەوە). ئەوە ئەگەر بە مەرجی دانابێ لێی وەربگرێتەوە، مافی هەیە لێی وەربگرێتەوە، ئەگەر نا: نا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای مافدانەوەکە (إِنَّمَا يَرْجِعُ الضَّامِنُ وَالْمُؤَدِّي) زامینەکەو ئەو کەسەی قەرزەکەی–بە ئیزن– داوەتەوە، تەنها لە حاڵەتێکی وەهادا دەگەڕێنەوە سەر ماف لەسەرەکە (إِذَا أَشْهَدَا بِالأَدَاءِ) ئەگەر بۆ مافدانەوەکە شاهیدیان گرتبێ: جا شاهیدەکە

رَجُلَيْنِ أَوْ رَجُلاً وَامْرَأَتَيْنِ، وَكَذَا رَجُلٌ لِيَحْلِفَ مَعَهُ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ لَمْ يُشْهِدْ فَلاَ رُجُوعَ إِنْ أَدَّى فِي غَيْبَةِ الأَصِيلِ وَكَذَّبَهُ، وَكَذَا إِنْ صَدَّقَهُ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ صَدَّقَهُ الْمَضْمُونُ لَهُ أَوْ أَدَّى بِحَضْرَةِ الأَصِيلِ رَجَعَ عَلَى الْمَذْهَبِ.

(كِتَابُ الشَّرِكَةِ)

هِيَ أَنْوَاعٌ: شَرِكَةُ الأَبْدَانِ كَشَرِكَةِ الْحَمَّالِينَ وَسَائِرِ الْمُحْتَرِفَةِ

---

(رَجُلَيْنِ) دوو پیاو بن (أَوْ رَجُلاً وَامْرَأَتَيْنِ) یان پیاوێکو دوو ئافرەت بن (وَكَذَا رَجُلٌ) هەروەها پیاوێکیش بەسە (لِيَحْلِفَ مَعَهُ) تاکو لەگەڵ شاهیدی پیاوەکە سوێند بخوا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(فَإِنْ لَمْ يُشْهِدْ) جا ئەگەر زامینەکە هیچ شاهیدی نەگرتبو (فَلاَ رُجُوعَ) مافی گەڕانەوەسەری نیە (إِنْ أَدَّى فِي غَيْبَةِ الأَصِيلِ) ئەگەر لە حاڵەتی ئامادەنەبوونی ماف لەسەرەکە مافەکەی دابێتەوەو (وَكَذَّبَهُ) ماف لەسەرەکەش باوەڕی پێنەکا (وَكَذَا إِنْ صَدَّقَهُ) هەروەها ئەگەر باوەڕیشی پێبکا مافی نیە بگەڕێتەوە سەری (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەگەر داوای مافەکەی لێبکرێ، شاهیدی مافدانەوەی نیە.

بەڵام (فَإِنْ صَدَّقَهُ الْمَضْمُونُ لَهُ) ئەگەر زامین بۆکراوەکە -کە خاوەن مافەکەیە- ئەو، یان میراتگرەکەی باوەڕی پێکردو گوتی: ڕاستە مافەکەی دلومەتەوە (أَوْ أَدَّى بِحَضْرَةِ الأَصِيلِ) یان بە ئامادەبوونی ماف لەسەرەکە مافەکەی داوە، لەو دوو حاڵەتەدا (رَجَعَ) دەگەڕێتەوە سەر ماف لەسەرەکەو لێی وەردەگرێتەوە، هەرچەندە شاهیدیش نەبێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە لە مەسەلەی یەکەمدا خاوەن ماف دانی بە ماف وەرگرتنەوەدا هێناوەو ناتوانێ داوای مافەکەی لێبکا، لە دووەمەکەشدا کەمتەرخەمی لە ماف لەسەرەکەوەیە: کە شاهیدی نەگرتوە.

﴿ كِتَابُ الشَّرِكَةِ: پەرتوکی هاوبەشیەتی ﴾

واتە: هەبوونی مافێك لە شتێکدا بۆ دوو کەس، یان زیاتر، پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکی (قُدسِي)دا دەفەرموێ: ﴿يَقُولُ اللهُ تَعالَى: أَنا ثالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مَالَمْ يَخُنْ أَحَدُهُما صاحِبَهُ، فَإِذا خانَهُ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِما﴾ رواه أبوداود وصححه الحاكم: خوایگەورە دەفەرموێ: من هاوڕێی سێیەمینی دوو هاوبەشەکانم تا خیانەت لەگەڵ یەکتری ناکەن، جا هەر کاتێك یەکێکیان خیانەتی لەگەڵ ئەویتر کرد، من لە نێوانیان دەردەچم. واتە: بەرەکەت لە ماڵەکەیاندا ناهێڵم. (هِيَ) هاوبەشی (أَنْوَاعٌ) چوار جۆرن:

یەکەم: (شَرِكَةُ الأَبْدَانِ) هاوبەشیی لاشەکان (كَشَرِكَةِ الْحَمَّالِينَ) وەکو هاوبەشیی بارهەلگرەکانو (وَسَائِرِ الْمُحْتَرِفَةِ) گشت پیشەکارانیتریش: وەکو بەرگدروو و دارتاشو

لِيَكُونَ بَيْنَهُما كَسْبُهُما مُتَساوِياً أَوْ مُتَفاوِتاً مَعَ اتِّفاقِ الصَّنْعَةِ أَوِ اخْتِلافِها، وَشَرِكَةُالْمُفاوَضَةِ لِيَكُونَ بَيْنَهُما كَسْبُهُما وَعَلَيْهِما ما يَعْرِضُ مِنْ غُرْمٍ، وَشَرِكَةُالْوُجُوهِ بِأَنْ يَشْتَرِكَ الْوَجِيهانِ لِيَبْتاعَ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُما بِمُؤَجَّلٍ لَهُما فَإِذَا باعَا كانَ الْفاضِلُ عَنِ الأَثْمانِ بَيْنَهُما، وَهَذِهِ الأَنْواعُ باطِلَةٌ، وَشَرِكَةُالْعِنانِ صَحِيحَةٌ، وَيُشْتَرَطُ فِيها

---

دەڵاڵەکانو...هتد (لِيَكُونَ بَيْنَهُما كَسْبُهُما مُتَساوِيا) تاکو ئەو ماڵەی بە پیشەکەیان وەدەستی دێنن لە نێوانیاندا بە یەکسانی بێ (أَوْ مُتَفاوِتاً) یان لێك جیاواز بێ، واتە: بەشی هەندێکیان لە هەندێکیان زیاتر بێ، جا جیاوازی نیە: (مَعَ اتِّفاقِ الصَّنْعَةِ) پیشەکەیان وەکو یەکتری بێ (أَوِ اخْتِلافِها) یان لێك جیا بێ، ئەم جۆرە هاوبەشیە دروست نیە، چونکە فریودانی تێدایە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا دروستە، هەروەك لە (مجمع الأنهر)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵگەشی ئەم حەدیسەیە: ﴿عَنْ ابنِ مَسْعودﷺ: اشْتَرَكْتُ أَنا وَعَمّارٌ وَسَعْدٌ فِيما نُصِيبُ يَوْمَ بَدْرٍ، فَجاءَ سَعْدٌ بِأَسِيرَيْنِ وَلَمْ أَجِىءْ أَنا وَعَمّارٌ بِشَيْءٍ﴾ رواه أبوداود بسند منقطع، (عبدالله) فەرمووی: منو (عمار)و (سعد) بوینە هاوبەشییەکتری لەو شتەی لە غەزای (بدر) دەستمان دەکەوێ، جا (سعد) دوو دیلی گرتنو هێنانی، ئێمەش هیچمان نەهێنا.

دووەم: (وَشَرِكَةُالْمُفاوَضَةِ) هاوبەشیی یەکسانی: وەك ببنە هاوبەش (لِيَكُونَ بَيْنَهُما كَسْبُهُما) تاکو ئەوەی بە ماڵیخۆیان، یان بەلاشەیخۆیان وەدەستی دێنن لە نێوانیاندا بە یەکسانی بێ، هەم (وَعَلَيْهِما ما يَعْرِضُ مِنْ غُرْمٍ) لە سەر هەردووکیان بێ: ژماردنی ئەو زەرەرەی دێتە سەریان، بە هۆی زەوتکردنو فەوتانو زەرەرەکانیتر.

سێیەم: (وَشَرِكَةُالْوُجُوهِ) هاوبەشیی پیاوماقوڵان (بِأَنْ يَشْتَرِكَ الْوَجِيهانِ) وەك دوو کەسی متمانەپێکراو ببنە هاوبەش (لِيَبْتاعَ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُما بِمُؤَجَّلٍ) تاکو هەر یەکەیان شتێك بە قەرز بکڕێ (لَهُما) شتە کڕاوەکەی هەر یەکەشیان بۆ هەردووکیان بێ (فَإِذَا باعَا) جا هەر کاتێك شتەکانیان فرۆشتو پارەی فرۆشیارەکانیان دلوە (كانَ الْفاضِلُ عَنِ الأَثْمانِ بَيْنَهُما) ئەوەی لە پارەی فرۆشیارەکانیش زیاد بێ، لە نێوانیاندا بە هاوبەشی بێ.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا ئەو دوو جۆرە هاوبەشیانەش وەکو جۆرییەکەم دروستن، بەڵام (وَهَذِهِ الأَنْواعُ) ئەو هەرسێك جۆرانە لە مەزهەبی ئیمامی(الشافعی)دا (باطِلَةٌ) بەتاڵنو دروست نابن، کەوابو: هەر کەسەیان ئەوەی بە لاشەو بە ماڵی خۆی وەدەستی هێناوە تەنها بۆ خۆیەتی.

چوارەم: (وَشَرِكَةُ الْعِنانِ) هاوبەشیماڵییە، واتە: لە ماڵێکیاندا ببنە هاوبەش تاکو بازرگانیی پێبکەن (صَحِيحَةٌ) ئەوە دروستە، بە (إجماع) زانایانی ئیسلام (وَيُشْتَرَطُ فِيها)

لَفظٌ يَدُلُّ عَلَى الإِذْنِ فِي التَّصرُّف، فَلَوْ اقْتصرَ عَلَى اشْتَرَكْنا لَمْ يَكْفِ فِي الأَصَحِّ، وَفِيهِمَا أَهْلِيَّةُ التَّوْكِيلِ وَالتَّوَكُّلِ، وَتَصِحُّ فِي كُلِّ مِثْلِيٍّ دُونَ الْمُتَقَوِّمِ، وَقِيلَ تَخْتَصُّ بِالنَّقْدِ الْمَضْرُوبِ، وَيُشْتَرَطُ خَلْطُ الْمالَيْنِ بِحَيْثُ لاَ يَتَمَيَّزان، وَلاَ يَكْفِي الْخَلْطُ مَعَ اخْتِلاَفِ جِنْسٍ، أَوْ صِفَةٍ كَصِحاحٍ وَمُكَسَّرَةٍ، هَذَا إِذَا أَخْرَجا مالَيْنِ وَعَقَدا، فَإِنْ مَلَكا مُشْتَرَكاً بِإِرْثٍ وَشِراءٍ وَغَيْرِهِما

---

به مەرج دادەندرێ لە هاوبەشی‌ماڵی‌دا (لَفظٌ) ووشەیەکی وەها بگوترێ: کە (يَدُلُّ عَلَى الإِذْنِ) بەڵگەو نیشانە بێ لە سەر ئیزندانی هەر یەکەیان بۆ ئەوی‌تر (فِي التَّصرُّفِ) لە دەستکاری‌کردنی ماڵەکە: بە کڕینو فرۆشتن، کەوابو: (فَلَو اقْتَصَرَ عَلى اشْتَرَكْنا) ئەگەر تەنها ئەوەندەیان بە یەکتری گوت: بوینە هاوبەش (لَمْ يَكْفِ) ئەوەندە بەس نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵکو مەرجە: هەردووکیان بڵێنە یەکتری: ئیزنم دای مامڵەت لەو ماڵەدا بکەی.

(وَ) هەروەها بە مەرج دادەندرێ (فِيهِما) لە هەردوو هاوبەشەکاندا (أَهْلِيَّةُ التَّوْكِيلِ وَالتَّوَكُّلِ) بە شەرع بتوانێ: وەکیل وەربگرێو هەم ببێتە وەکیلی کەسێکی‌تر لە دەستکاری‌ماڵی‌دا، چونکە هەر یەکەیان وەکیلی هاوبەشەکەی‌ترەو هەم هاوبەشەکەشی کردۆتە وەکیلی خۆی.

(وَتَصِحُّ) هاوبەشی دروست دەبێ (فِي كُلِّ مِثْلِيٍّ) لە گشت شتێکی هاووێنەیی‌دا: کە لە حاڵەتی تێکەڵی‌دا لێك جیا نەکرێنەوە: وەکو پارەو دانەوێڵە (دُونَ الْمُتَقَوِّمِ) بەڵام لەو شتانەدا دروست نابێ: کە نرخیان بۆ دادەندرێ: وەك کەلوپەلو ئاژەڵو جلوبەرگ، چونکە ناگونجێ ئەو جۆرە شتانە بە شێوەیەکی وەها تێکەڵ بکرێن: کە لێك جیا نەکرێنەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: (تَخْتَصُّ بِالنَّقْدِ الْمَضْرُوبِ) هاوبەشی تایبەتە بە پارەی سکە لێدراو.

(وَيُشْتَرَطُ خَلْطُ الْمالَيْنِ) بە مەرج دادەندرێ پێش مامڵەت بەستنەکە: ماڵەکەیان تێکەڵ بکەن (بِحَيْثُ لاَ يَتَمَيَّزانِ) بە جۆرێکی وەها: کە لێك جیا نەکرێنەوە، کەوابو: (وَلاَ يَكْفِي الْخَلْطُ مَعَ اخْتِلاَفِ جِنْسٍ) تێکەڵکردنی ئەو دوو ماڵانە بەس نیە کە ڕەگەزیان لێك جیا بێ: وەکو زێڕو زیو (أَوْ صِفَةٍ) یان سیفەتیان لێك جیا بێ (كَصِحاحٍ وَمُكَسَّرَةٍ) وەك پارەی درشتەو وردە، یان پارەی دوو وولات.

(هَذَا) بە مەرج دانانی تێکەڵکردن (إِذَا أَخْرَجا مالَيْنِ) لەو کاتەدایە: کە هەردووکیان ماڵی خۆیان بێنن‌و (وَعَقَدا) مامڵەتی هاوبەشیەتی ببەستن، بەڵام (فَإِنْ مَلَكا مُشْتَرَكاً) ئەگەر هەردووکیان ماڵێکی هاوبەشیان وێکرا بووە مڵك: وەك (بِإِرْثٍ) بە هۆی میراتگرتن ببنە خاوەنی‌ماڵەکە (وَشِراءٍ) هەم وەکو بە کڕینو (وَغَيْرِهِما) جگە لەو دوانەش وەکو شتێکیان

وَأَذِنَ كُلٌّ لِلآخَرِ فِي التِّجارَةِ فِيهِ تَمَّتِ الشَّرِكَةُ، وَالْحِيلَةُ فِي الشَّرِكَةِ فِي الْعُرُوضِ أَنْ يَبِيعَ كُلٌّ واحِدٍ بَعْضَ عَرْضِهِ بِبَعْضِ عَرْضِ الآخَرِ وَيَأْذَنَ لَهُ فِي التَّصَرُّفِ، وَلاَ يُشْتَرَطُ تَساوِي قَدْرِ الْمالَيْنِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ الْعِلْمُ بِقَدْرِهِما عِنْدَ الْعَقْدِ، وَيَتَسَلَّطُ كُلٌّ مِنْهُما عَلَى التَّصَرُّفِ بِلاَ ضَرَرٍ: فَلاَ يَبِيعُ نَسِيئَةً وَلاَ بِغَيْرِ نَقْدِ الْبَلَدِ وَلاَ بِغَبْنٍ فاحِشٍ وَلاَ يُسافِرُ بِهِ وَلاَ يُبْضِعُهُ بِغَيْرِ إِذْنٍ، وَلِكُلٍّ فَسْخُهُ مَتَى شاءَ،

---

بە هاوبەشی پێببەخشرێ، ئینجا (وَأَذِنَ كُلٌّ لِلآخَرِ فِي التِّجارَةِ فِيهِ) هەر یەکەشیان ئەوی‌تری ئیزندا: بازرگانی لەو ماڵەدا بکا، ئەوە (تَمَّتِ الشَّرِكَةُ) هاوبەشیەکە تەواودەبێو دامەزراوە، چونکە مەبەستی‌تێکەڵیەکە هاتۆتە جێ.

(وَالْحِيلَةُ) ڕێگایەکی شەرعی (فِي الشَّرِكَةِ فِي الْعُرُوضِ) دەربارەی هاوبەشی لە کەلوپەلدا ئەمەیە: (أَنْ يَبِيعَ كُلٌّ واحِدٍ بَعْضَ عَرْضِهِ) هەر هاوبەشێك بەشێکی‌کەلوپەلەکەی خۆی بفرۆشێتە ئەوی‌تر (بِبَعْضِ عَرْضِ الآخَرِ) بە بەشێکی کەلوپەلەکەی ئەوی‌تر، ئینجا (وَيَأْذَنَ لَهُ فِي التَّصَرُّفِ) هەر یەکەیان –لەدوای لێکوەرگرتن– ئەوی‌تر ئیزن بدا: لە دەستکاری‌کردنی ماڵەکەیان. ڕێگایەکی‌تریش ئەمەیە: هەریەکەیان بەشێکی ماڵەکەی خۆی بفرۆشێتە ئەوی‌تر بە قەرز، ئینجا قەرزەکەیان وەبەر یەکتری بێخن.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی هاوبەشی بە مەرج دانانرێ (تَساوِي قَدْرِ الْمالَيْنِ) ئەندازەی ماڵەکانی هەردووکیان یەکسان بێ (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ الْعِلْمُ بِقَدْرِهِما عِنْدَ الْعَقْدِ) بە مەرج دانانرێ –لە کاتی مامڵەت بەستندا– بزاندرێ ئەندازەی ماڵەکەیان چەندە، ئەگەر بگونجێ لەمەودوا بزاندرێ.

(وَيَتَسَلَّطُ كُلٌّ مِنْهُما عَلَى التَّصَرُّفِ) لە دوای ئیزندان هەر یەکەیان دەبێتە خاوەن دەسەڵات لە سەر دەستکاری‌کردن لە ماڵە هاوبەشەکەدا، بەو مەرجەی (بِلاَ ضَرَرٍ) دەستکاریەکە بێزیان بێ، کەوابو: (فَلاَ يَبِيعُ نَسِيئَةً) نابێ هیچێکیان ماڵەکە بە قەرز بفرۆشێ (وَلاَ بِغَيْرِ نَقْدِ الْبَلَدِ) هەم نابێ بە پارەیەکی‌تری –جگە لە پارەی‌شوێنەکە– بیفرۆشێ (وَلاَ بِغَبْنٍ فاحِشٍ) نابێ کڕین‌و فرۆشتن بە زەرەرێکی ناشیرن بکا.

(وَلاَ يُسافِرُ بِهِ) نابێ ماڵە هاوبەشەکە لەگەڵ خۆیا بباتە سەفەر، بەڵام ئەگەر ترسی فەوتانی ماڵەکەی هەبێ، ئەو کاتە دروستە لەگەڵ خۆیا بیباتە شوێنێکی‌تر (وَلاَ يُبْضِعُهُ) نابێ بیداتە دەست کەسێکی‌تر تاکو –بۆ ئەوان– کاری تێدا بکا، جا ئەو قەدەغەکراوانەی‌ڕابردوو، گشتی (بِغَيْرِ إِذْنٍ) بە بێ‌ئیزنی هاوبەشەکەی‌تر دروست نینە، واتە: ئەگەر هاوبەشەکە –هەر کامەیان– ئیزن بدا، ئەوە دروستە.

(وَلِكُلٍّ فَسْخُهُ) بۆ گشت هاوبەشێك –بە تەنها– دروستە: مامڵەتی هاوبەشیەتی هەڵبوەشێنێتەوە (مَتَى شاءَ) هەر کاتێك حەز بکا.

وَيَنعَزِلاَن عَنِ التَّصَرُّف بفَسْخهما، فَإنْ قالَ أحَدُهُما عَزَلْتُكَ أوْ لاَ تَتصَرَّفْ فِي نَصِيبِي لَمْ يَنعَزِلَ الْعازِلُ، وَتَنفَسِخُ بمَوْت أحَدهما وَبجُنُونه وَبِإغْمائـه، وَالـرِّبْحُ وَالْخُسْـرانُ عَلَىقَدْرِالْمالَيْنِ تَساوَيَاَ فِيالْعَمَلِ أوْ تَفاوَتاَ، فَإنْ شَرَطا خِلاَفَهُ فَسَدَالْعَقْدُ فَيَرْجِـعُ كُـلٌ عَلَىالآخَرِ بأُجْرَةعَمَله فِي ماله،

---

(وَيَنْعَـزِلاَنِ عَـنِ التَّصَـرُّفِ) هـەردووك هاوبەشـەكان لـە كـار دەكـەونو دەسـەلأتی دەستكاریمالەكەیان نامێنـێ (بِفَسْخِهِما) بـە هـۆی هەڵوەشاندنەوەی هـەردووكیان، یـان تـەنها یـەكێكیان، واتـە: هـەر كاتێـك هـەردووكیان، یـان تـەنها یـەكێكیان مامڵـەتی هاوبەشیەكەی هەڵوەشاندەوە، بۆ هیچێكیان دروست نابێ دەستكاری ماڵە هاوبەشەكە بكا.

(فَـإِنْ قـالَ أحَـدُهُما) جا ئەگـەر هیچێكیان هەڵینەوەشاندەوە، بـەلأم تـەنها یـەكێكیان بـە هاوبەشـەكەیتری گـوت (عَزَلْتُـكَ) تـۆم لـە هاوبەشـی لادا (أَوْ) یـان گـوتی (لاَ تَتَصَـرَّفْ فِـي نَصِيبِي) دەستكاری لە بەشەكەی مندا نەكەی، ئەوە (لَمْ يَنْعَزِلِ الْعازِلُ) لادەرەكە–كـە ئـەو قسانەی كردوە– لە دەسەڵات لاناچێو مافی دەستكاریی دەمێنێ.

(وَ) هـەروەها (تَنْفَسِـخُ) شـەریكایەتی هەڵدەوەشێتەوە (بِمَـوْتِ أحَـدِهِما) بـە هـۆی مردنـی یەكێك لـە هاوبەشـەكان، هـەم (وَبِجُنُونِـهِ) بـە هـۆی شێتبوونی، هـەم (وَبِإِغْمائِـهِ) بـە هـۆی بێهۆشبوونی، واتە: ئەگەر هاوبەشێك مرد، یان شێت بوو، یـان بـێهۆش بـوو، ئـەو كاتـە هاوبەشیەكە هەڵدەوەشێتەوەو نابێ هاوبەشەكەیتر دەستكاریماڵەهاوبەشەكە بكا.

(وَالرِّبْحُ وَالْخُسْرانُ) قازانجو زەرەری ماڵە هاوبەشەكە (عَلَـى قَـدْرِالْمالَيْنِ) لـە سـەر ئەنـدازەی ماڵەكانیانە، نەك بـەگوێرەی كارەكـەیان، واتـە: ئەگـەر مـاڵی یـەكێك سـەد دینـار بـێ، هـی ئـەویتریش دوو سـەد دینـار بـێ، ئـەوە بەشـێكی قازانجەكە بـۆ خـاوەن سـەدەكەیەو دوو بەشیش بـۆ خـاوەن دوو سـەدەكەیە، هـەروەهاش بەشـێكی زەرەرەكـە لـە سـەر خـاوەنی سـەدەكەیەو، دوو بەشـیش لەسـەر خـاوەنی دوو سـەدەكەیە، جیـاوازی نیـە: (تَسـاوَيَاَ فِيالْعَمَلِ) هاوبەشەكان بە یەكسانی كار لە ماڵەكەدا بكەن (أَوْ تَفاوَتاَ) یان جیـاواز بـن: وەك یەكێكیان زیاتر كار بكا، یان لێزانتر بێ.

(فَإِنْ شَرَطا خِلاَفَهُ) جا ئەگەر بە مەرجیان دانا بە دژی بڕیاریبڕابردوو بـێ: وەك ماڵەكـەیان یەكسـان بـێو قـازانجی یـەكێكیان زیاتر بـێ، یـان بـە پێچـەوانەوە بـێ، ئـەوە (فَسَدَالْعَقْدُ) مامڵەتی هاوبەشیەتی بەتاڵ دەبێتەوەو دروست نابێ، كەوابو: (فَيَرْجِعُ كُلٌ عَلَىالآخَرِ) هـەر یـەكێكیان لـە هاوبەشـەكان دەگـەڕێتـەوە سـەر هاوبەشـەكەیتر ( بِـأُجْرَةِ عَمَلِـهِ فِـي مالِـهِ) كرێی كاركردنی لە ماڵەكەیدا لێوەردەگرێ، واتە: ئەمـەیان لەو وەردەگـرێو ئەویشیان

وَتَنفُذُالتَّصَرُّفاتُ، وَالرِّبحُ عَلَى قَدْرِالْمالَيْنِ، وَيَدُ الشَّرِيكِ يَدُ أمانَة: فَيُقْبَلُ قَوْلُهُ فِيالرَّدِّ وَالْخُسْرانِ وَالتَّلَف، فَإنْ ادَّعاهُ بِسَبَب ظاهِرٍ طُولِبَ بِبَيِّنَة بالسَّبَبِ ثُمَّ يُصَدَّقُ فِيالتَّلَف بِهِ، وَلَوْ قالَ مَنْ فِي يَدِهِ الْمالُ هُوَ لِي، وَقالَ الآخَرُ مُشْتَرَكٌ، أَوْ بِالْعَكْسِ صُدِّقَ صاحِبُ الْيَدِ،

---

لەم وەردەگرێ (وَ) هەروەها: لە هاوبەشیی نادروستدا (تَنفُذُالتَّصَرُّفاتُ) دەستکاریەکانی گشت هاوبەشەکانیش لە ماڵەکەدا جێبەجێ دەبێ، چونکە یەکتریبیان ئیزن داوە.

(وَ) هەروەها (اَلرِّبْحُ) قازانجو زەرەری ئەو هاوبەشیەی نادروستە (عَلَى قَدْرِالْمالَيْنِ) لە سەر ئەندازەی ماڵەکانیانە، وەکو هاوبەشیی دروستبوو.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا دروستە: ماڵەکانیان یەکسان بێو بەشە قازانجی یەکێکیان زیاتر بێ، هەروەها بە پێچەوانەوەش دروستە، چونکە وا دەبێ: هاوبەشێك لێزانترە، یان زیاتر کار دەکاو بە یەکسانی ڕازی نابێ، هەروەك لە کتێبەکانی خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ باسی کێشەی هاوبەشەکان ﴾

(وَيَدُالشَّرِيكِ) دەستیهاوبەش لە سەر بەشیهاوبەشەکەیتر (يَدُأمانَةٍ) دەستی ئەمینداریە، جیاوازی هاوبەشیی دروستو نادروست نیە، کەوابو: (فَيُقْبَلُ قَوْلُهُ) قسەی هاوبەشەکە وەردەگیرێو بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ: (فِيالرَّدِّ) لە بارەی گەڕاندنەوەی بەشی هاوبەشەکەیتر بۆ خودی هاوبەشەکە (وَالْخُسْرانِ) هەم لە بارەی زەرەرکردنیش بە سوێند باوەڕی پێ دەکرێ.

ئینجا بزانە: ئەوەی لێی دەدزرێو ئەوەی لە گومرگ لێی دەستێندرێ، ئەوەش بە زەرەر دادەندرێ، هەروەك لە (الشبراملسی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالتَّلَف) هەروەها لە بارەی لەناوچوونی ماڵە هاوبەشەکەش بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ (فَإنِ ادَّعاهُ بِسَبَبٍ ظاهِرٍ) جا ئەگەر گوتی ماڵەکە بە هۆیەکی ئاشکرا لەناو چووە: وەك سوتانو لافاو، ئەوە (طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ بالسَّبَبِ) داوای شاهیدی لێدەکرێ: کە ئەو هۆیە ڕووی داوە (ثُمَّ يُصَدَّقُ فِيالتَّلَفِ بِهِ) ئینجا بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ: کە بە هۆیەکە ماڵەکە فەوتاوە.

(وَلَوْ قالَ مَنْ فِي يَدِهِ الْمالُ) ئەگەر ئەو هاوبەشەی ماڵەکەی لە دەستە، گوتی: (هُوَ لِي) ئەو ماڵە گشتی هی خۆمە (وَقالَ الآخَرُ مُشْتَرَكٌ) هاوبەشەکەیتریش گوتی: هەردووکمان لەو ماڵەدا هاوبەشین (أَوْ بِالْعَكْسِ) یان بە پێچەوانەوە، خاوەن دەستەکە گوتی: هەردووکمان لەو ماڵەدا هاوبەشین، ئەویتریش گوتی: گشتی هی منە. ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (صُدِّقَ صاحِبُ الْيَدِ) خاوەن دەستەکە بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ، چونکە لە دەستدابوون نیشانەیەکی ملکایەتیە.

وَلَوْ قالَ اقْتَسَمْنا وَصارَ لِي صُدِّقَ الْمُنْكِرُ، وَلَوِ اشْتَرَى وَقَالَ اشْتَرَيْتُهُ لِلشَّرِكَةِ أَوْ لِنَفْسِي وكَذَّبَهُ الآخَرُ صُدِّقَ الْمُشْتَرِي.

---

بەڵام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر خاوەن دەستەکە گوتی: (اقْتَسَمْنا وَصارَ لِي) ماڵەکەمان بەش کردوەو ئەمەی لە ژێر دەستمە بوەتە ماڵی من. هاوبەشەکەیتریش گوتی: بەشمان نەکردوەو هەردووکمان تێیدا هاوبەشین. ئەوە (صُدِّقَ الْمُنْكِرُ) بە سوێند باوەڕ بەوەیان دەکرێ کە دەڵێ بەش نەکراوە.

(وَلَواشْتَرَى) ئەگەر هاوبەشێك شتێکی کڕی (وَقَالَ اشْتَرَيْتُهُ لِلشَّرِكَةِ) شتەکەم بۆ هاوبەشیەتی کڕیوە (أَوْ) یان گوتی: (لِنَفْسِي) بۆ خۆم کڕیومە (وكَذَّبَهُ الآخَرُ) هاوبەشەکەی تریش گوتی: ڕاست ناکەی. ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا (صُدِّقَ الْمُشْتَرِي) باوەڕ بە کڕیارەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا، چونکە ئەو مەبەستی خۆی زیاتر دەزانێ.

### ﴿ پاشکۆ: لە بارەی هاوبەشیەتی خێزانیو چەند مەسەلەیەکیتر ﴾

یەکەم: وا ڕوو دەدا یەکێك دەمرێو میراتەکەیو کۆمەڵێك منداڵی لە پاش بەجێ دەمێنێ، جا ئەگەر هاتو: یەکێکیان بەو میراتە -پێش بەشکردن- ژنی هێنا، یان حەجی کرد، یان هەر مەسرەفێکیتری کرد، ئەوە یەتیمەکان مافیان هەیە ئەندازەی بەشیخۆیانی لێ وەربگرنەوە، هەروەها ئەوانەی گەورەنەو ئیزنیان نەداوە، یان بە مەرجی لێوەرگرتنەوە ئیزنیان دابو، ئەوانیش مافیان هەیە ئەندازەی بەشی خۆیانی لێوەربگرنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکی بالغو عاقڵ -بە بێمەرج- ئیزنی بدا، ئەوە مافی وەرگرتنەوەی نیە، هەروەك لە (الشبراملسی)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەگەر میراتگرێك گوتی: ئەم شتە تایبەتی خۆمە، شتەکەش لە دەستیخۆیدا بوو، یان گوتی: بۆ خۆم -بە قەرز، یان بە ماڵیخۆم- کڕیومە. یان گوتی: بۆ هاوبەشیەتی -بە قەرز، یان بە ماڵیمیراتەکە- کڕیومە. لەو مەسەلانەدا -ئەگەر شاهید نەبێ- بە سوێند باوەڕی پێدەکرێ، هەروەك لە کێشەی هاوبەشەکاندا تازە ڕابرا.

دووەم: ئەگەر ژنو مێرد، یان میراتگرەکانیان -لە بارەی کەلوپەلی ناو ماڵ- بووە کێشەیان، ئەوە هەر کامەیان شاهیدی هەبێ کەلوپەلەکەی دەبرێتێ، ئەگەر نا: ئەوە کەلوپەلەکە لە دەست هەردووکیاندایە، کەوابو: هەردووکیان سوێند دەخۆنو کەلوپەلەکە لە نێوانیاندا دەکرێتە هاوبەش بە نیوەیی، جا ئەگەر تەنها یەکێکیان سوێندی خوارد، ئەو کاتە گشتی دەبرێتە سوێندخۆرەکە، ئینجا لێرەدا جیاوازی نیە: شتەکە بۆ هەردووکیان بگونجێ: وەکو پارە، یان تەنها بۆ مێردەکە بگونجێ: وەکو چەك، یان تەنها بۆ ژنەکە: وەکو خشڵ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا -لە باسی (إقرار)دا ڕوون کراوەتەوە.

## (كتابُ الْوَكالَة)

**شَرْطُ الْمُوَكِّلِ صِحَّةُ مُباشَرَتِهِ مَا وَكَّلَ فِيهِ بِمِلْكٍ أَوْ وِلاَيَةٍ، فَلاَ يَصِحُّ تَوْكِيلُ صَبِيٍّ وَلاَ مَجْنُونٍ**

---

سێیەم: بۆ هیچ هاوبەشێك –پێش بەشكردن– دروست نیە: هیچ بەشێكی خۆی لە ماڵە هاوبەشەكە ببا، مەگەر هاوبەشەكەیتر ئیزنی بدا، یان ڕقەكاری بكاو لەگەڵی بەش نەكا، ئەو كاتە دروستە: بەشی خۆی لە ماڵی هاوێنەیی ببا: وەكو گەنمو پارە، بەڵام لە هیچ حاڵەتێكدا –پێش بەشكردن– بۆی دروست نیە بەشیخۆی لە ماڵی قرسێندراودا ببا: وەكو جلوبەرگو ئاژەڵ.

جا هەر یەكێك لە هاوبەشەكان بەشێكی شتێكی هاوبەش لە كەسێك وەربگرێتەوە، ئەوە گشتیان تێیدا دەبنەوە هاوبەش، تەنها لە پارەی فرۆشراودا نەبێ، واتە: ئەگەر دوو كەس شتێكی هاوبەشیان فرۆشتە یەكێكیتر، ئەوە بۆ هەر یەكەیان دروستە بە تەنها بەشە پارەكەی خۆی لە كڕیارەكە وەربگرێو ئەویتر لەگەڵی نابێتەوە هاوبەش، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەكانیدا لێرەو لە (باسی بەشكردن)دا ڕوون كراوەتەوە.

چوارەم: ئەگەر پیاوێك بە شوانێكی گوت: ئەم مەڕەم بۆ قەڵەو بكە، نیوەی بۆ تۆ. یان ئەم دوو مەڕەم بەخێو بكە، یەكێكیان بۆ تۆ. ئەم مامڵەتە دروست نابێ–واتە: شوانەكە نابێتە هاوبەشی پیاوەكە– بەڵكو مافی كرێی هاوێنەی هەیە بە هۆی بەخێوكردنی نیوەكەی پیاوەكە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتیو، لە باسی (إجارة)شدا بە درێژی ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءَ اللهُ تعالَى.

## ﴿ كِتابُ الْوَكالَةِ: پەڕتوكی وەكیلایەتی ﴾

واتە: كاری خۆی بداتە دەست یەكێكیتر: تاكو لە حاڵەتی ژیانیدا لە جیاتیی بكا ﴿عَنْ عُرْوَةَ الْبارِقِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مَعَهُ بِدِينارٍ يَشْتَرِي لَهُ أُضْحِيَّةً...﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ دینارێكی بە (عروة)دا نارد، تاكو قوربانیەكی بۆ بكڕێ بە وەكیلایەتی.

ئینجا بزانە: وەكیلایەتی لەم چوار ڕوكنانە پێك دێ: (مُوَكِّل): وەكیلگر. (وَكِيل): بریكار. (مُوَكَّلٌ فيه): كاری وەكیل تێداگراو. (صِيغَةٌ): گوتەی وەكیلگرتن.

(شَرْطُ الْمُوَكِّلِ) مەرجی وەكیلگرەكە، ئەمەیە (صِحَّةُ مُباشَرَتِهِ ما وَكَّلَ فِيهِ) دروست بێ: بە خۆی –ڕاستەوخۆ– ئەو كارە بكا: كە بریكاری تێدا گرتوە، جا (بِمِلْكٍ) بە هۆی ملكایەتی بێ: وەك بیكاتە وەكیل تاكو ماڵەكەی بفرۆشێ (أَوْ وِلاَيَةٍ) یان بە هۆی دەسەڵاتداریەتی شەرعی بێ: وەك بیكاتە وەكیل تاكو كیژەكەی مارە ببڕێ، كەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ تَوْكِيلُ صَبِيٍّ) دروست نابێ وەكیلگرتنی منداڵ، هەم (وَلاَ مَجْنُونٍ) هی شێت، چونكە بەخۆیان ناتوانن كاری خۆیان ئەنجام بدەن.

وَلاَ الْمَرْأَةَ وَالْمُحرِمِ فِيالنِّكاحِ، وَيَصِحُّ تَوْكِيلُ الْوَلِيِّ في حَقِّ الطِّفْلِ، وَيُسْتَثْنَى تَوْكِيلُ الأَعْمَى فِيالْبَيْعِ وَالشِّراء فَيَصِحُّ، وَشَرْطُ الْوَكِيلِ صِحَّةُ مُباشَرَتِهِ التَّصَرُّفَ لِنَفْسِهِ، لاَ صَبِيٌّ وَمَجْنُون، وَكَذَا الْمَرْأَةُ وَالْمُحْرِمُ فِيالنِّكاحِ، لَكِنْ الصَّحِيحُ إعْتِمادُ قَوْلِ صَبِيٍّ فِيالإِذْنِ فِي دُخُولِ دارٍ وَإِيصالِ هَدِيَّةٍ، وَالأَصَحُّ صِحَّةُ تَوْكِيلِ عَبْدٍ فِي قَبُولِ نِكاحٍ وَمَنْعُهُ فِيالإِيجابِ،

---

(وَلاَ الْمَرْأَةِ) هەم دروست نیە: ئافرەتو (وَالْمُحرِمِ) ئەوەی لە ژێر ئیحرامدایە: یەکێکیتر بکەنە وەکیلی خۆیان (فِي النِّكاحِ) لە مارەبڕیندا، چونکە دروست نیە: نە ئافرەتو نە ئیحرامدار بە خۆیان مارە ببڕن.

هەروەهاش دروست نیە: پیاوی (فاسق) یەکێکیتر بکاتە وەکیلی خۆی بۆ مارەبڕینی کیژەکەی، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، واتە: بەڵام ئەگەر (تقلید)ی ئەو زانایانە بکا: کە ڕێگەیان داوە پیاوی (فاسق) ببێتە (وەلی). ئەو کاتە دروست دەبێ: پیاوێکیتر بکاتە وەکیلی خۆی، هەروەك لە مارەبڕیندا ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَيَصِحُّ تَوْكِيلُ الْوَلِيِّ) دروستە سەرپەرشتکار وەکیل بگرێ (فِي حَقِّ الطِّفْلِ) لەبارەی منداڵ تاکو دەستکاری ماڵەکەی بکا، یان مارەی ببڕێ (وَيُسْتَثْنَى) جیا دەکرێتەوە لەو (قاعدة)ی ڕابردوو (تَوْكِيلُ الأَعْمَى فِيالْبَيْعِ وَالشِّراءِ) وەکیلگرتنی مرۆڤی کوێر لە کڕینو فرۆشتندا (فَيَصِحُّ) وەکیلگرتنەکەی دروست دەبێ، هەرچەندە دروستیش نیە بە خۆی کڕینو فرۆشتن بکا.

(وَشَرْطُ الْوَكِيلِ) مەرجی وەکیلەکەش ئەمەیە: (صِحَّةُ مُباشَرَتِهِ التَّصَرُّفَ لِنَفْسِهِ) دروست بێ -ڕاستەوخۆ- بۆ خۆی ئەو کارە بکا: کە تێیدا کراوەتە وەکیل، کەوابو: (لاَ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ) دروست نیە منداڵو شێت ببنە وەکیلی کەسێکیتر (وَكَذَا الْمَرْأَةُ وَالْمُحْرِمُ فِي عَقْدِ النِّكاحِ) هەروەها دروست نیە: ئافرەتو پیاوی ژێر ئیحرام ببنە وەکیل بۆ مارەبڕینی ئافرەت، چونکە -بە شەرع- ناتوانن کارەکە بکەن.

کەوابو: دروست نیە: پیاوی (فاسق) -پێش (تقلید)کردن- ببێتە وەکیلی مارەبڕین، هەروەك لە باسی مارەبڕیندا ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعالَى (لَكِنْ الصَّحِيحُ) بەڵام فەرموودەی ڕاست ئەمەیە (إعْتِمادُ قَوْلِ صَبِيٍّ) دروستە: پشت بە قسەی منداڵ ببەسترێ (فِيالإِذْنِ فِي دُخُولِ دارٍ) لە ئیزندانی چوونە ناو خانوو، هەم (وَإِيصالِ هَدِيَّةٍ) لە گەیاندنی دیاریدا.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (صِحَّةُ تَوْكِيلِ عَبْدٍ فِي قَبُولِ نِكاحٍ) دروستە: کۆیلە بکرێتە وەکیل بۆ قبوڵکردنی مارەبڕین، بەڵام (وَمَنْعُهُ فِيالإِيجابِ) دروست نیە: بکرێتە وەکیل بۆ مارەبڕین، هەروەها دروستە ئافرەت بکرێتە وەکیل بۆ تەڵاقدانی ئافرەتێکیتر.

وَشَرْطُ الْمُوَكَّلِ فِيهِ أَنْ يَمْلِكَهُ الْمُوَكِّلُ: فَلَوْ وَكَّلَ بِبَيْعِ عَبْدٍ سَيَمْلِكُهُ وَطَلاَقِ مَنْ سَيَنْكِحُهَا بَطَلَ فِي الأَصَحِّ، وَأَنْ يَكُونَ قَابِلاً لِلنِّيَابَةِ، فَلاَ يَصِحُّ فِي عِبَادَةٍ إِلاَّ الْحَجَّ وَتَفْرِقَةَ زَكَاةٍ وَذَبْحَ أُضْحِيَةٍ، وَلاَ فِي شَهَادَةٍ وَإِيلاَءٍ وَلِعَانٍ وَسَائِرِ الأَيْمَانِ، وَلاَ فِي الظِّهَارِ فِي الأَصَحِّ،

---

هەروەها دروستە دەوڵەمەندێك، یان هەژارێك ببێتە وەكیلی هەژارێك بۆ وەرگرتنی زەكات، هەروەها دروستە منداڵ بكرێتە وەكیل: بۆ بەشكردنی زەكاتو بۆ سەربڕینیقوربانیو بۆ حەجی سوننەت، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا دروستە: منداڵی فامیدە بكرێتە وەكیل، هەروەك لە كتێبەكانی خۆیاندا فەرموویانە.

(وَشَرْطُ الْمُوَكَّلِ فِيهِ) مەرجی وەكیل تێداكراو، یەكەم: (أَنْ يَمْلِكَهُ الْمُوَكِّلُ) وەكیلگرەكە خاوەنی وەكیل تێداكراوەكە بێ، لە كاتی وەكیلگرتندا، جا خاوەنیەكەی بە هۆی ملكایەتی بێ، یان بە هۆی دەسەڵاتداریەتی شەرعی، كەوابو: (فَلَوْ وَكَّلَ بِبَيْعِ عَبْدٍ سَيَمْلِكُهُ) ئەگەر كردیە وەكیلی خۆی بۆ فرۆشتنی كۆیلەیەك كە لەمەودوا دەبێتە ملكی (وَطَلاَقِ مَنْ سَيَنْكِحُهَا) یان كردیە وەكیلی خۆی بۆ تەڵاقدانی ژنێك كە لەمەودوا مارەی دەكا (بَطَلَ) ئەو وەكیلگرتنە بەتاڵەو دانامەزرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە دەسەڵاتی شەرعیی بە سەردا نیە.

دووەم: (وَأَنْ يَكُونَ قَابِلاً لِلنِّيَابَةِ) دەبی وەكیل تێداكراوەكە قبوڵی جێگریی بكا، كەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ فِي عِبَادَةٍ) وەكیلگرتن لە خواپەرستی لاشەییدا دروست نابێ، چونكە مەبەست لە خواپەرستی لاشەیی تاقیكردنەوەی خودی مرۆڤەكەیە.

(إِلاَّ الْحَجَّ) تەنها حەجو عومرە نەبێ، لەواندا وەكیلایەتی دروستە، هەروەك لە حەجی پەككەوتوودا ڕوون كراوە (وَتَفْرِقَةَ زَكَاةٍ) هەم لە بەشكردنی زەكاتو نەزرو كەففارەتیشدا وەكیلگرتن دروستە (وَذَبْحَ أُضْحِيَةٍ) هەم لە سەربڕینیقوربانیشدا دروستە، چونكە ئەوانە خواپەرستی ماڵین ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَحَرَ ثَلاَثاً وَسِتِّينَ وَأَمَرَ عَلِيّاً أَنْ يَذْبَحَ الْبَاقِيَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ شەستو سێ ووشتری سەربڕینو فەرمانی بە ئیمامی(علی) كرد: سیوحەفتەكەیتر سەر ببڕێ. واتە: سەد ووشتری كردنە قوربانی.

(وَ) هەروەها (لاَ فِي شَهَادَةٍ) وەكیلگرتن لە شاهیدیدانندا دروست نیە، هەم (وَإِيلاَءٍ) لە سوێندی جیماع نەكردندا دروست نیە، هەم (وَلِعَانٍ) لە لەعنەت لێككردنی ژنو مێردا دروست نیە، هەم (وَسَائِرِ الأَيْمَانِ) لە هیچ سوێندخواردنەكانیتریشدا وەكیلگرتن دروست نیە، هەروەها لە نەزركردنو لە هەڵواسینیتەلاقیشدا دروست نیە، هەم (وَلاَ فِي الظِّهَارِ) لە زیهاریشدا دروست نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، كەواتە: لە هیچ گوناهكردنێكدا وەكیلگرتن دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَيَصِحُّ فِي طَرَفَيْ بَيْعٍ، وَهِبَةٍ، وَسَلَمٍ، وَرَهْنٍ، وَنِكَاحٍ، وَطَلاَقٍ، وَسَائِرِ الْعُقُودُ وَالْفُسُوخِ، وَقَبْضِ الدُّيُونِ وَإِقْبَاضِهَا وَالدَّعْوَى وَالْجَوَابِ، وَكَذَا فِي تَمَلُّكِ الْمُبَاحَاتِ كَالإِحْيَاءِ وَالإِصْطِيَادِ وَالإِحْتِطَابِ فِي الأَظْهَرِ، لاَ فِي الإِقْرَارِ فِي الأَصَحِّ، وَيَصِحُّ فِي اسْتِيفَاءِ عُقُوبَةِ آدَمِيٍّ كَقِصَاصٍ وَحَدِّ قَذْفٍ، وَقِيلَ لاَ يَجُوزُ إِلاَّ بِحَضْرَةِ الْمُوَكِّلِ،

---

(وَيَصِحُّ) وەكیلگرتن دروست دەبێ (فِي طَرَفَيْ بَيْعٍ) لە هەردوو لایەكەی كڕینو فرۆشتندا، هەم (وَهِبَةٍ) لە بەخشینو (وَسَلَمٍ) لە سەلەمو (وَرَهْنٍ) لە ڕەهنو (وَنِكَاحٍ) لە مارەبڕین، واتە: تاكو وەكیلەكە یەكێكی لەو مامڵەتانە بۆ بكا، یان بۆی قبوڵ بكا.

(وَ) هەروەها (طَلاَقٍ) وەكیلگرتن دروستە بۆ تەڵاقدانی ژنەكەی، هەرچەند وەكیلەكەش ئافرەت بێ (وَسَائِرِ الْعُقُودُ) هەم بۆ گشت مامڵەت بەستنەكانیتریش وەكیلگرتن دروستە، وەك زامینیو سولحو هاوبەشیو حەواڵەو وەكیلایەتیو بەكرێدانو باغەوانیو شوفعەو... هتد، هەم (وَالْفُسُوخِ) بۆ گشت هەڵوەشاندنەوەكانیش دروستە: وەك هەڵوەشاندنەوەی سپاردنو خواستنو جەعالەو كڕینو فرۆشتن...هتد.

هەم (وَقَبْضِ الدُّيُونِ) بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكانیش وەكیلگرتن دروستەو (وَإِقْبَاضِهَا) بۆ قەرز وێدانیش دروستە، هەم بۆ گەردەن ئازادكردنیش -لە قەرز- وەكیلگرتن دروستەو (وَالدَّعْوَى) هەم وەكیلگرتن دروست دەبێ، بۆ داواكردنی ماڵ، یان سزای ئادەمیزادان (وَالْجَوَابِ) هەم بۆ وەڵامدانەوەی داوایەكانیش دروستە، هەرچەند لایەنەكەیتریش پێی ناخۆش بێ.

(وَكَذَا فِي تَمَلُّكِ الْمُبَاحَاتِ) هەروەها وەكیلگرتن دروستە بۆ بە ملككردنی شتە حەڵاڵەكان: (كَالإِحْيَاءِ) وەك زیندووكردنەوەی زەمینیمردوو و (وَالإِصْطِيَادِ) ڕاوكردنو (وَالإِحْتِطَابِ) دار هێنان (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (لاَ فِي الإِقْرَارِ) بەڵام لە دانپێداهێناندا وەكیلگرتن دروست نیە، وەك بڵێ: تۆم كردە وەكیلی خۆم تاكو لە جیاتی من دان بێنی: من ئەوەندەی فڵانكەس قەرزدارم (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيَصِحُّ) وەكیلگرتن دروست دەبێ (فِي اسْتِيفَاءِ عُقُوبَةِ آدَمِيٍّ) بۆ وەرگرتنی سزای مافی ئادەمیزاد: (كَقِصَاصٍ) وەك كوشتنی لە تۆڵەی كوشتنێكو (وَحَدِّ قَذْفٍ) سزای بوختان پێكردن (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (لاَ يَجُوزُ إِلاَّ بِحَضْرَةِ الْمُوَكِّلِ) دروست نیە سزایەكە وەریگرێ تەنها بە ئامادەبوونی وەكیلگرەكە نەبێ، هەروەها بۆ كاربەدەستیش دروستە: وەكیل بگرێ بۆ وەرگرتنی سزای مافی خوای گەورە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿أُغْدُ يَاأُنَيْسُ عَلَى إِمْرَأَةِهَـذَا فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا﴾ رواه الشيخان، ئەی (أُنَيْس) بڕۆ لای ژنی ئەم پیاوە، ئەگەر دانی بە زینادا هێنا، بەردبارانی بكە.

وَلْيَكُنِ الْمُوَكَّلُ فِيهِ مَعْلُوماً مِنْ بَعْضِ الْوُجُوهِ، وَلاَ يُشْتَرَطُ عِلْمُهُ مِنْ كُلِّ وَجْهٍ، فَلَوْ قَالَ وَكَّلْتُكَ فِي كُلِّ قَلِيلٍ وَكَثِيرٍ أَوْ فِي كُلِّ أُمُورِي أَوْ فَوَّضْتُ إِلَيْكَ كُلَّ شَيْءٍ لَمْ يَصِحَّ، وَإِنْ قَالَ فِي بَيْعِ أَمْوَالِي وَعِتْقِ أَرِقَّائِي صَحَّ، وَإِنْ وَكَّلَهُ فِي شِرَاءِ عَبْدٍ وَجَبَ بَيَانُ نَوْعِهِ، أَوْ دَارٍ وَجَبَ بَيَانُ الْمَحَلَّةِ وَالسِّكَّةِ، لاَ قَدْرِ الثَّمَنِ فِي الأَصَحِّ، وَيُشْتَرَطُ مِنَ الْمُوَكِّلِ لَفْظٌ

---

سىٚيەم: (وَلْيَكُنِ الْمُوَكَّلُ فِيهِ مَعْلُوماً) دەبى وەكيل تێداگرلوەكە زاندراو بێ (مِنْ بَعْضِ الْوُجُوهِ) لە چەند ڕوويێكەوە (وَلاَ يُشْتَرَطُ عِلْمُهُ مِنْ كُلِّ وَجْهٍ) بەلام زانينى لە هەموو ڕوويێكەوە بە مەرج داناندرێ.

(فَلَوْ قَالَ وَكَّلْتُكَ فِي كُلِّ قَلِيلٍ وَكَثِيرٍ) جا ئەگەر گوتى: تۆم كردە وەكيلى خۆم لە گشت زۆرو كەمێكى خۆمدا (أَوْ) يان گوتى: (فِي كُلِّ أُمُورِي) تۆم كردە وەكيلى خۆم لە گشت كارێكى خۆمدا (أَوْ) يان گوتى (فَوَّضْتُ إِلَيْكَ كُلَّ شَيْءٍ) گشت شتێكى خۆمم دايە دەستى تۆ، يان تۆ وەكيلى منى چى حەز دەكەى بيكە. لەو مەسەلانەدا (لَمْ يَصِحَّ) وەكيلگرتنەكە دروست نابێ، ئەوەك وەكيلەكە كارێكى وا بكا: كە وەكيلگرەكە ڕازى نەبێ.

بەلام (وَإِنْ قَالَ) ئەگەر گوتى: (فِي بَيْعِ أَمْوَالِي وَعِتْقِ أَرِقَّائِي) تۆم كردە وەكيلى خۆم لە فرۆشتنى ملكو ماڵەكانمدلو لە ئازادكردنى كۆيلەكانمدا، يان لە وەرگرتنەوەى قەرزەكانمدا، ئەوە (صَحَّ) وەكيلگرتنەكە دروستە.

ئينجا بزانە: ئەگەر گوتى تۆم كردە وەكيلىخۆم گەردەنى فلانكەس ئازاد بكە لە گشت قەرزەكانم. ئەوەش دروستە، بەلام مەرجە: وەكيلگرەكە ئەندازەى قەرزەكان بزانێ، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموويەتى.

(وَإِنْ وَكَّلَهُ فِي شِرَاءِ عَبْدٍ) ئەگەر كرديە وەكيل بۆ كڕينى كۆيلەيەك (وَجَبَ بَيَانُ نَوْعِهِ) واجبە: جۆرى كۆيلەكەى بۆ ديارى بكا: لە چ گەلێك بێ (أَوْ دَارٍ) يان ئەگەر كرديە وەكيلى خۆى بۆ كڕينىخانوو (وَجَبَ بَيَانُ الْمَحَلَّةِ) واجبە: گەڕەكەكەى بۆ ديارى بكا، هەم (وَالسِّكَّةِ) كۆلانەكەشى بۆ ديارى بكا (لاَ قَدْرِالثَّمَنِ) بەلام دياريكردنى ئەندازەى پارە لە كڕينى هيچ شتێكدا مەرج نيە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەى ڕاستردا، كەوابو: ئەگەر گوتى: بە هەر نرخێك بێ: كەم، يان زۆر بۆم بكڕە، ئەو كاتە دروستە: بە زياتر لە نرخى هاوێنەى خۆى بيكڕێ.

هەروەها ئەگەر گوتى: تۆ وەكيلى منى هەر ژنێك حەز دەكەى لێم مارە ببڕە. ئەوەش دروستەو بە بۆچوونى خۆى ژنێكى بۆ مارە دەكا، هەروەك لە (تحفة)و حاشيەكانىدا ئەو دوو مەسەلەيە ڕوون كراونەوە.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونى وەكيلايەتى بە مەرج دادەندرێ (مِنَ الْمُوَكِّلِ لَفْظٌ) لە لاى وەكيلگرەكەوە قسەيەكى وەها بگوترێ، يان بنووسرێ: كە

يَقْتَضِى رِضاهُ: كَوَكَّلْتُكَ فِى كَذَا أَوْ فَوَّضْتُهُ إِلَيْكَ أَوْ أَنْتَ وَكيلى فيه، فَلَوْ قَالَ بِعْ أَوْ أَعْتِقْ حَصَلَ الإِذْنُ، وَلاَ يُشْتَرَطُ الْقَبولُ لَفظاً، وَقيلَ يُشتَرَطُ، وَقيلَ يُشتَرَطُ فى صِيَغِ الْعُقُود كَوَكَّلْتُكَ، دُونَ صِيَغِ الأَمْرِ كَبِعْ وَأَعْتِقْ، وَلاَ يَصِحُّ تَعْليقُها بِشَرْطٍ فِى الأَصَحِّ، فَإِنْ نَجَّزَها وَشَرَطَ لِلتَّصَرُّفِ شَرْطاً

---

(يَقْتَضِى رِضاهُ) بگەیەنێو نیشانە بێ: لە سەر ڕازیبوونی وەكیلگرەكە: بەو كارەی كە وەكیلەكە لە جیاتیی دەیكا (كَ) وەك بڵێ: (وَكَّلْتُكَ فِى كَذَا) تۆم كردە وەكیلی خۆم لەو كارەدا (أَوْ فَوَّضْتُهُ إِلَيْكَ) یان ئەو كارەم دا دەستی تۆ (أَوْ أَنْتَ وَكِيلِى فِيهِ) یان تۆ وەكیلی منی لەو كارە، یان تۆم لە جێی خۆم دانا لەو كارەدا (فَلَوْ قَالَ) جا ئەگەر -تەنها- گوتی: (بِعْ) ئەو شتەم بۆ بفرۆشە، یان بۆم بكڕە (أَوْ أَعْتِقْ) یان كۆیلەكەم ئازاد بكە، ئەوە (حَصَلَ الإِذْنُ) ئیزندانەكە دێتە جێ، كڕینو فرۆشتنەكەو ئازادكردنەكە دروست دەبن.

ئینجا بزانە: نووسینو هەواڵ ناردن بەسە بۆ دروستبوونی وەكیلایەتی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، واتە: مەرج نیە: وەكیلو وەكیلگرەكە لە یەك دانیشگەدا بن، كەوابو: ئەگەر نامەی نووسی، یان هەواڵی ناردو گوتی: فلانكەسم كردە وەكیلیخۆم لەم كارەدا، ئەوە وەكیلایەتی دروست دەبێ (وَلاَ يُشْتَرَطُ الْقَبُولُ لَفظاً) بە مەرج دانانرێ وەكیلەكە بە گۆتن وەكیلایەتی قبوڵ بكا، بەڵكو ئەوە مەرجە: بە گۆتن وەكیلایەتی ڕەد نەكاتەوەو نەڵێ: قبوڵ ناكەم، یان كارەكە ناكەم. واتە: ئەگەر قسەیەكی وەهای گوت، ئەو كاتە وەكیلایەتی بەتاڵ دەبێتەوە، جا ئەگەر پەشیمان بۆوە، واجبە: گۆتەی وەكیلگرتن نوێ بكرێتەوە، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو لەو حاڵەتەدا بوو: كە وەكیلەكە بە خۆڕایی -وەكیلایەتی- بكا، بەڵام ئەگەر بە كرێ بیكا، ئەو كاتە واجبە -بە گۆتن- وەكیلایەتی قبوڵ بكا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يُشْتَرَطُ) قبوڵكردن بە مەرج دادەندرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يُشْتَرَطُ فِى صِيَغِ الْعُقُودِ) قبوڵكردن لە ووشەكانی مامڵەت بەستندا بە مەرج دادەندرێ (كَ) وەك بڵێ: (وَكَّلْتُكَ) تۆم كردە وەكیلی خۆم (دُونَ صِيَغِ الأَمْرِ) بەڵام لە ووشەكانی فەرماندا بە مەرج دانانرێ (كَ) وەك بڵێ: (بِعْ) بفرۆشە (وَأَعْتِقْ) ئازاد بكا.

(وَلاَ يَصِحُّ تَعْلِيقُها بِشَرْطٍ) دروست نیە وەكیلایەتی بە مەرجێكەوە هەڵبواسرێ، وەك بڵێ: هەر كاتێك باوكم هاتەوە، یان سەری مانگ هات، تۆم كردە وەكیلی خۆم. واتە: وەكیلایەتی بەتاڵە (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (فَإِنْ نَجَّزَها) ئەگەر بە ووشەیەكی بڕایەوە كردیە وەكیلو (وَشَرَطَ لِلتَّصَرُّفِ شَرْطاً) بۆ دەستكاریكردنیشی

جازَ، وَلَوْ قالَ وَكَّلْتُكَ وَمَتى عَزَلْتُكَ فَأَنْتَ وَكيلي صَحَّتْ فِي الْحالِ فِي الأَصَحِّ، وَفي عَوْدِهِ وَكيلاً بَعْدَ الْعَزْلِ الْوَجْهانِ في تَعْليقِها، وَيَجْرِيانِ في تَعْليقِ الْعَزْلِ. (فَصْلٌ) اَلْوَكيلُ بِالْبَيْعِ مُطْلَقاً لَيْسَ لَهُ الْبَيْعُ بِغَيْرِ نَقْدِالْبَلَدِ، وَلاَبِنَسيئَةٍ وَلاَبِغَبْنٍ فاحِشٍ، وَهُوَ مَا لاَيُحْتَمَلُ غالِباً، فَلَوْ بَاعَ عَلَىأَحَدِ هٰذِهِ الأَنْواعِ

---

مەرجێکی دانا، وەك بڵێ: تۆم کردە وەکیلی خۆم خانووەکەم بۆ بفرۆشە، بەڵام تا دوای مانگێکیتر مەیفرۆشە. ئەوە (جازَ) دروستە، هەروەها دروستە: ماوەشی بۆ دابنێ، وەك بڵێ: تا ماوەی مانگێك تۆ وەکیلی منی لەو کارەدا. کەوابو: هەر کاتێك مانگێك تەولو بو، وەکیلەکە لە وەکیلایەتی دەکەوێو مافی دەستکاریی نامێنێ.

ئینجا بزانە: لەو حاڵەتانەی وەکیلایەتی -بە شەرع- بەتاڵو نادروستە، دەستکاریەکانی وەکیلەکە -بە هۆی ئیزندانەکە- دروست دەبن، ئەگەر لە کاتی دەستکاریەکەدا ئیزندانەکە مابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلَوْ قالَ وَكَّلْتُكَ) ئەگەر گوتی: تۆم کردە وەکیلی خۆمو (وَمَتى عَزَلْتُكَ فَأَنْتَ وَكيلي) هەر کاتێکیش لە وەکیلایەتی لامدای تۆ هەر وەکیلی منی (صَحَّتْ فِي الْحالِ) ئێستا وەکیلایەتیەکە دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام (وَفي عَوْدِهِ وَكيلاً بَعْدَ الْعَزْلِ) لە بارەی بوونەوەی بە وەکیل لە دوای لادانەکە (الْوَجْهانِ فِي تَعْليقِها) ئەوو دوو فەرموودەی لە هەڵواسینی وەکیلایەتیدا هەبون لێرەشدا هەنە، ڕاستترەکەیان: نابێتەوە وەکیل (وَيَجْرِيانِ) ئەو دوو فەرموودانە دێنە جێ (في تَعْليقِ الْعَزْلِ) لە هەڵواسینی لادانەکەدا، وەك بڵێ: تۆ وەکیلی منی لەو کارەدا، جا هەر کاتێك باوکم هاتەوە تۆم لە وەکیلایەتی لادا. بە فەرموودەی ڕاستتر: بە هاتنەوەی باوکی لە وەکیلایەتی ناکەوێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لەباسی چۆنیەتی دەستکاریەکانی وەکیل ﴾

(اَلْوَكيلُ بِالْبَيْعِ مُطْلَقاً) ئەوەی کراوەتە وەکیل بۆ فرۆشتنێکی بێ مەرجو ناتۆرە (لَيْسَ لَهُ الْبَيْعُ بِغَيْرِ نَقْدِالْبَلَدِ) بۆی دروست نیە: بە پارەیەکیتری -جگە لە پارەی شوێنەکە- شتەکە بفرۆشێ، هەم (وَلاَ بِنَسيئَةٍ) نابێ بە قەرز بیفرۆشێ، هەرچەند لە نرخی خۆیشی زیاتر بکا، هەم (وَلاَ بِغَبْنٍ فاحِشٍ) نابێ بە زەرەرێکی ناشیرین بیفرۆشێ:

(وَهُوَ) زەرەری ناشیرین ئەمەیە: (مالاَ يُحْتَمَلُ غالِباً) کە بە ئەغلەبی خەڵك پێی ڕازی نەبێ: وەك دوو دیرهەم لە دە دیرهەمدا، بەڵام ئەگەر کەم بوو: وەك دیرهەمێك لە دە دیرهەم، یان بەگوێرەی عادەتی شوێنەکە، ئەو کاتە دروستە بیفرۆشێ.

(فَلَوْ بَاعَ عَلَىأَحَدِ هٰذِهِ الأَنْواعِ) جا ئەگەر وەکیلەکە شتێکی بە یەکێك لەو جۆرانەیڕابردوو فرۆشت، واتە: بە پارەیەکی بێگانە، یان بە قەرز، یان بە زەرەرێکی ناشیرین، ئەوە

وَسَلَّمَ الْمَبِيعَ ضمنَ، فَإِنْ وَكَّلَهُ لِيَبِيعَ مُؤَجَّلاً وَقَدَّرَ الأَجَلَ فَذَاكَ، وَإِنْ أَطْلَقَ صَحَّ فِي الأَصَحِّ وَحُمِلَ عَلَى الْمُتَعَارَفِ فِي مِثْلِهِ، وَلاَيَبِيعُ لِنَفْسِهِ وَوَلَدِهِ الصَّغِيرِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَبِيعُ لأَبِيهِ وَإِبْنِهِ الْبَالِغِ،

---

فرۆشتنەکە دروست نابێو (وَ) هەر کاتێك (سَلَّمَ الْمَبِيعَ) فرۆشراوەکەشی تەسلیمی کڕیارەکە کرد (ضَمِنَ) خودیوەکیلەکە دەبێتە زامینیفرۆشراوەکە، چونکە بە فرۆشتنێکی نادروست فرۆشراوەکەی تەسلیمی کڕیارەکە کردوە، کەوابو: واجبە: نرخەکەی ڕۆژی تەسلیمکردنیی بداتە وەکیلگرەکە، بەڵام ئەگەر فرۆشراوەکە مابێ، ئەو کاتە واجبە: وەریبگرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ وَكَّلَهُ لِيَبِيعَ مُؤَجَّلاً) جا ئەگەر کردیە وەکیل تاکو بە قەرز بۆی بفرۆشێ، هەم (وَقَدَّرَ الأَجَلَ) ئەندازەی ماوەکەشی بۆ دیاری کرد (فَذَاكَ) ئەوە دیارە، بەڵام (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر ئەندازەکەی دیاری نەکرد، ئەوەش (صَحَّ) وەکیلایەتیەکە دروستە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردلو (وَحُمِلَ عَلَى الْمُتَعَارَفِ فِي مِثْلِهِ) ماوەی بە قەرزدانەکەش دەهێندرێتە سەر عادەتی خەڵکی لە وێنەی فرۆشراوەکەدا، واتە: خەڵك ئەو جۆرە شتەی بۆ ماوەی چەند ڕۆژ، یان چەند مانگ-بە قەرز- دەفرۆشت، نابێ وەکیلەکە بۆ ماوەیەکی زیاتر بیفرۆشێ، جا ئەگەر بە قەرزی فرۆشت، واجبە: شاهیدیش بگرێ لە سەر بە قەرز فرۆشتنەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يَبِيعُ لِنَفْسِهِ) دروست نیە: وەکیلەکە شتەکە بفرۆشێتە خۆی، هەم (وَوَلَدِهِ الصَّغِيرِ) دروست نیە: بیفرۆشێتە منداڵە نەبالغەکەی خۆی، هەم دروست نیە: وەکیلەکە شتێك لە خۆی، یان لە منداڵە نەبالغەکەی بکڕێ بۆ وەکیلگرەکە.

ئینجا بزانە: منداڵە شێتەکەشی وەکو نەبالغەکەیە، هەم لە دروستنەبوونی ئەو کڕینو فرۆشتنەدا جیاوازی نیە: وەکیلگرەکە ئیزنی بدلو ئەندازەی پارەکەشی بۆ دیاری بکا، یان نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەروەها دروست نیە وەکیلەکە وەکیلێك بۆ خۆی، یان بۆ منداڵەکەی بگرێو بە خۆیشی لە جیاتی وەکیلگرەکە کڕینەکە، یان فرۆشتنەکە بکا، هەروەك لە (ابن قاسم)و (القليوبي)دا فەرموویانە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ يَبِيعُ لأَبِيهِ وَإِبْنِهِ الْبَالِغِ) دروستە وەکیلەکە شتەکە بفرۆشێتە باوكو باپیرەو دایكو داپیرەو کوڕو کچەبالغەکانیو نەوەیە بالغەکانی، هەم دروستە شتیشیان لێبکڕێ بۆ وەکیلگرەکەی، ئینجا بزانە: مامڵەتەکانیتریش-کە بە وێدانو قبوڵکردن دەبەسترێن- وەکو کڕینو فرۆشتن بڕیاریان بۆ دەدرێ، هەروەك لە (القليوبي)دا فەرموویەتی.

وَأَنَّ الْوَكِيلَ بِالْبَيْعِ لَهُ قَبْضُ الثَّمَنِ وَتَسْلِيمُ الْمَبِيعِ، وَلاَيُسَلِّمُهُ حَتَّى يَقْبِضَ الثَّمَنَ، فَإِنْ خالَفَ ضَمِنَ، وَإِذَا وَكَّلَهُ فِي شِراءٍ لاَيَشْتَرِي مَعِيباً، فَإِن اشْتَراهُ فِي الذِّمَّةِ وَهُوَ يُساوِي مَعَ الْعَيْبِ ما اشْتَراهُ بِهِ وَقَعَ عَنِ الْمُوَكِّلِ إِنْ جَهِلَ الْعَيْبَ، وَإِنْ عَلِمَهُ فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ لَمْ يُساوِهِ لَمْ يَقَعْ عَنْهُ إِنْ عَلِمَهُ، وَإِنْ جَهِلَهُ وَقَعَ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الْوَكِيلَ بِالْبَيْعِ) ئەوەی کراوەتە وەکیل بۆ فرۆشتنی شتێك (لَهُ قَبْضُ الثَّمَنِ) بۆی دروستە پارەی فرۆشراوەکە وەربگرێو هەم (وَتَسْلِيمُ الْمَبِيعِ) فرۆشراوەکەش تەسلیمی کڕیارەکە بکا، بەلاَم (وَلاَ يُسَلِّمُهُ) نابێ فرۆشراوەکەی تەسلیم بکا (حَتَّى يَقْبِضَ الثَّمَنَ) تا پارەکەی وەردەگرێ.

کەوابو: (فَإِنْ خالَفَ) ئەگەر وەکیلەکە -پێش وەرگرتنی پارەکە- فرۆشراوەکەی تەسلیم کرد (ضَمِنَ) وەکیلەکە دەبێتە زامینی فرۆشراوەکەو دەبێ نرخەکەی بداتە وەکیلگرەکە، جا هەر کاتێك پارەی فرۆشراوەکەی بۆ وەکیلگرەکە وەرگرت، پارەکەی خۆی لێوەردەگرێتەوە، بەلاَم ئەگەر بە زۆرلێکردن فرۆشراوەکەی تەسلیمی کڕیارەکە کرد، ئەو کاتە نابێتە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِذَا وَكَّلَهُ فِي شِراءٍ) هەر کاتێك کردیە وەکیل لە کڕینی شتێکدا (لاَ يَشْتَرِي مَعِيباً) نابێ شتی عەیبدار بۆ وەکیلگرەکە بکڕێ (فَإِنِ اشْتَراهُ فِي الذِّمَّةِ) جا ئەگەر هاتو شتە عەیبدارەکەی بە قەرز کڕی (وَهُوَ يُساوِي مَعَ الْعَيْبِ ماشْتَراهُ بِهِ) لە ڕاستیشدا شتەکە-بە عەیبەوە- ئەو نرخەی دەکرد، ئەوە (وَقَعَ عَنِ الْمُوَكِّلِ) کڕینەکە بۆ وەکیلگرەکە دادەمەزرێو مافی پەشیمانیشی هەیە (إِنْ جَهِلَ الْعَيْبَ) ئەگەر وەکیلەکە بە عەیبەکەی نەزانیبێ، بەلاَم (وَإِنْ عَلِمَهُ) ئەگەر بە عەیبەکەی زانیبێ، ئەوە (فَلاَ) کڕینەکە بۆ وەکیلگرەکە دانامەزرێ، بەلکو بۆ خودی وەکیلەکە دادەمەزرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَ) هەروەها (إِنْ لَمْ يُساوِهِ) ئەگەر شتەکە-بە عەیبەوە- ئەو نرخەی نەدەکرد، ئەو کاتەش (لَمْ يَقَعْ عَنْهُ) بۆ وەکیلگرەکە دانامەزرێ، بەلکو بۆ خودی وەکیلەکە دادەمەزرێ (إِنْ عَلِمَهُ) ئەگەر وەکیلەکە بە عەیبەکەی زانیبێ، بەلاَم (وَإِنْ جَهِلَهُ) ئەگەر وەکیلەکە بە عەیبەکەی نەزانیبێ، ئەو کاتە (وَقَعَ) بۆ وەکیلگرەکە دادەمەزرێو مافی پەشیمانیشی هەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەی ڕابردوو لە حاڵەتی کڕینێکی بە قەرز بوو، بەلاَم ئەگەر کڕینەکە بە خودی ماڵی وەکیلگرەکە بێو وەکیلەکەش بە عەیبەکەی زانیبێ، ئەو کاتە کڕینەکە بەتاڵەو بۆ هیچێکیان دانامەزرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَإِذَا وَقَعَ لِلْمُوَكِّلِ فَلِكُلٍّ مِنَ الْوَكِيلِ وَالْمُوَكِّلِ الرَّدُّ، وَلَيْسَ لِلْوَكِيلِ أَنْ يُوَكِّلَ بِلاَ إِذْنٍ إِنْ تَأَتَّى مِنْهُ ما وُكِّلَ فيه، وَإِنْ لَمْ يَتَأَتَّ لِكَوْنِه لاَ يُحْسِنُهُ أَوْ لاَ يَلِيقُ به فَلَهُ التَّوْكِيلُ، وَلَوْ كَثُرَ وَعَجَزَ عَنِ الإِتْيان بِكُلِّه فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يُوَكِّلُ فيما زادَ عَلَى الْمُمْكِنِ، وَلَوْ أَذِنَ فِي التَّوْكِيلِ وَقالَ: وَكِّلْ عَنْ نَفْسِكَ، فَفَعَلَ فَالثَّانِي وَكِيلُ الْوَكِيلِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَنْعَزِلُ بِعَزْلِه وَانْعِزالِه، وَإِنْ قالَ: وَكِّلْ عَنِّي، فَالثَّانِي وَكِيلُ الْمُوَكِّلِ،

---

ئینجا (وَإِذَا وَقَعَ لِلْمُوَكِّلِ) هەر كاتێك كڕینە بە قەرزەكە -لە هەردوو مەسەلەی نەزانیندا- بۆ وەكیلگرەكە دامەزرابێ، ئەوە (فَلِكُلٍّ مِنَ الْوَكِيلِ وَالْمُوَكِّلِ الرَّدُّ) بۆ وەكیلەكەو بۆ وەكیلگرەكە دروستە: -بە هۆی عەیبەكە- شتەكە بگەڕێننەوە بۆ فرۆشیارەكە، بەڵام ئەگەر كڕینەكە بۆ وەكیلەكە دامەزرابێ ئەو كاتە مافی گەڕاندنەوەی نیە، چونكە زانیویە عەیبدارەو كەمتەرخەمی لە خۆیەتی، هەروەك لە باسی پەشیمانیدا ڕابرا.

## ﴿ وەكیلگرتنی وەكیل ﴾

(وَلَيْسَ لِلْوَكِيلِ أَنْ يُوَكِّلَ بِلاَ إِذْنٍ) بۆ وەكیلەكە دروست نیە: وەكیلێك بگرێ بە بێ ئیزنی وەكیلگرەكە (إِنْ تَأَتَّى مِنْهُ ما وُكِّلَ فِيه) ئەگەر لێی دەهات ئەو كارە بكا: كە تێیدا كراوەتەوە وەكیل، بەڵام (وَإِنْ لَمْ يَتَأَتَّ) ئەگەر كارەكەی لێنەدەهات: (لِكَوْنِهِ لاَ يُحْسِنُهُ) چونكە باش نەیدەزانی بیكا (أَوْ لاَ يَلِيقُ بِهِ) یان لێی نەدەوەشاوە بیكا، یان ماندووبوونێكی زیاد لە عادەتی تووش دەبو، لەو حاڵەتانەدا (فَلَهُ التَّوْكِيلُ) بۆی هەیە وەكیلێكیتر لە بری وەكیلگرەكەی بگرێ، تاكو كارەكە بكا.

(وَ) هەروەها (لَوْ كَثُرَ) ئەگەر ئەو كارەی تێیدا كراوەتە وەكیل زۆر بوو و (وَعَجَزَ عَنِ الإِتْيانِ بِكُلِّه) توانای نەبو گشتی بەخۆی بكا، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّهُ يُوَكِّلُ) وەكیلەكە -لە بری وەكیلگرەكە- وەكیلێكیتر دەگرێ (فِيما زادَ عَلَى الْمُمْكِنِ) لەو كارانەدا: كە لە توانایی زیاترن و ناگونجێ بیانكا.

(وَلَوْ أَذِنَ فِي التَّوْكِيلِ) ئەگەر وەكیلگرەكە ئیزنیدا: وەكیل بگرێو (وَقالَ وَكِّلْ عَنْ نَفْسِكَ) بە وەكیلەكەی گوت: لە بری خۆت وەكیل بگرە (فَفَعَلَ) وەكیلەكەش وەكیلێكیتری گرت، ئەوە (فَالثَّانِي) وەكیلەكەی دووەم (وَكِيلُ الْوَكِيلِ) دەبێتە وەكیلی وەكیلەكە (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يَنْعَزِلُ) دووەمەكە لە كار لادەچێ (بِعَزْلِهِ) بەوەی وەكیلەكە لە كار لابیداو، هەم (وَانْعِزالِهِ) بە لەكاركەوتنی وەكیلەكەش وەكیلی دووەم لە كار دەكەوێ: وەك وەكیلەكە بمرێ، یان شێت ببێ، هەروەها وەكیلگرەكەش دەتوانێ دووەمەكە لە كار لابدا، هەروەك دەتوانێ وەكیلەكەش لابدا.

(وَإِنْ قالَ وَكِّلْ عَنِّي) ئەگەر وەكیلگرەكە بە وەكیلەكەی گوت: لە بری من وەكیل بگرە، ئەو كاتە (فَالثَّانِي وَكِيلُ الْمُوَكِّلِ) وەكیلەكەی دووەم وەكیلی وەكیلگرەكەیە.

وَكَذَا لَوْ أَطْلَقَ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: وَفِي هاتَيْنِ الصُّورَتَيْنِ لاَيَعْزِلُ أَحَدُهُما الآخَرَ، وَلاَ يَنْعَزِلُ بِانْعِزالِه، وَحَيْثُ جَوَّزْنا لِلْوَكِيلِ التَّوْكِيلَ يُشْتَرَطُ أَنْ يُوَكِّلَ أَميناً إِلاَّ أَنْ يُعَيِّنَ الْمُوَكِّلُ غَيْرَهُ، وَلَوْ وَكَّلَ أَميناً فَفَسَّقَ لَمْ يَمْلِكِ الْوَكِيلُ عَزْلَهُ فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) قالَ: بِعْ لِشَخْصٍ مُعَيَّنٍ أَوْ فِي زَمَنٍ أَوْ مَكانٍ مُعَيَّنٍ تَعَيَّنَ، وَفِي الْمَكانِ وَجْهٌ إِذَا لَمْ يَتَعَلَّقْ بِهِ غَرَضٌ،

---

(وَكَذَا لَوْ أَطْلَقَ) هەروەها ئەگەر وەكیلگرەكە تەنها بڵێ: وەكیل بگرە، واتە: نەڵێ: لە بری من، یان لە بری خۆت، ئەو كاتەش دووەمەكە وەكیلی وەكیلگرەكەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) دەفەرموێ: (وَفِي هاتَيْنِ الصُّورَتَيْنِ) لە هەردوو وێنەكەیڕابردوودا، كە بڵێ: لە بری من، یان هیچ نەڵێ (لاَ يَعْزِلُ أَحَدُهُما الآخَرَ) لە وەكیلەكان هیچێكیان ئەویتر لە كار لانادا (وَلاَ يَنْعَزِلُ بِانْعِزالِهِ) هەم هیچێكیان بە لەكاركەوتنی ئەویتر لە كار ناكەوێ.
(وَحَيْثُ جَوَّزْنا لِلْوَكِيلِ التَّوْكِيلَ) هەر كاتێك -بە شەرع- ڕێگە بدەینە وەكیلەكە بۆ وەكیلگرتن (يُشْتَرَطُ أَنْ يُوَكِّلَ أَميناً) بە مەرج دادەندرێ: مرۆڤێكی ئەمین بكاتە وەكیل (إِلاَّ أَنْ يُعَيِّنَ الْمُوَكِّلُ غَيْرَهُ) مەگەر وەكیلگرەكە یەكێكی نائەمین دیاری بكا، ئەو كاتە بە گوێرەی دیاریكردنی وی وەكیل دەگرێ، بەڵام ئەگەر تەنها وەكیلەكە دەیزانی ئەو دیاركراوە (فاسقە)، وەكیلگرەكە نەیدەزانی، ئەو كاتە نابێ بیكاتە وەكیل، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَلَوْ وَكَّلَ أَميناً) ئەگەر وەكیلەكە وەكیلێكی ئەمینی گرت (فَفَسَّقَ) ئینجا بووە (فاسق)، ئەوە (لَمْ يَمْلِكِ الْوَكِيلُ عَزْلَهُ) وەكیلەكە ناتوانێ لە كار لایبدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە وەكیلەكە بۆ وەكیلگرتن ئیزن دراوەو بۆ لادان ئیزن نەدراوە، بەڵام ئەگەر لە بریخۆی وەكیلی گرتبو، ئینجا وەكیلەكە بووە (فاسق)، ئەو كاتە دەتوانێ لایبدا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی دیاریكردنی دەستكاریەكانی وەكیل ﴾

(قالَ) هەر كاتێك وەكیلگرەكە بە وەكیلەكەی گوت: (بِعْ لِشَخْصٍ مُعَيَّنٍ) ماڵەكەم بفرۆشە فڵانكەس (أَوْ فِي زَمَنٍ أَوْ مَكانٍ مُعَيَّنٍ) یان لە فڵانە ڕۆژە، یان لە فڵانە شوێنەدا بیفرۆشە، ئەوە (تَعَيَّنَ) كەسەكەو كاتەكەو شوێنەكە لە سەر وەكیلەكە دەبێتە مەرجو دروست نیە: بیفرۆشێتە كەسێكیتر، یان لە كاتو شوێنێكیتردا بیفرۆشێ، بەڵام (وَفِي الْمَكانِ وَجْهٌ) لە بارەی دیاریكردنی شوێن فەرموودەیەك هەیە: كە نابێتە مەرج (إِذَا لَمْ يَتَعَلَّقْ بِهِ غَرَضٌ) ئەگەر مەبەستێكی ڕاستی وەكیلگرەكە پەیوەندی بە دیاریكردنی شوێنەكەوە نەبێ.

وَإِنْ قالَ بِعْ بِمِأَة لَمْ يَبِعْ بِأَقَلّ، وَلَهُ اَنْ يَزِيدَ إِلاّ أَنْ يُصَرِّحَ بِالنَّهْيِ، وَلَوْ قالَ اشْتَرِ بِهٰذَاالدِّينارِ شاةً وَوَصَفَها فَاشْتَرَى بِه شاتَيْنِ بِالصِّفَة، فَإِنْ لَمْ تُساوِ وَاحِدَةٌ دِيناراً لَمْ يَصِحَّ الشِّراءُ لِلْمُوَكِّلِ، وَإِنْ ساوَتْهُ كُلُّ واحِدَة فَالأَظْهَرُ الصِّحَّةُ وَحُصُولُ الْمِلْكِ فِيهِما لِلْمُوَكِّلِ، وَلَوْ أَمَرَهُ بِالشِّراءِ بِمُعَيَّنٍ فَاشْتَرَى فِي الذِّمَّة لَمْ يَقَعْ لِلْمُوَكِّلِ وَكَذَا عَكْسُهُ فِي الأَصَحِّ، وَمَتَى خالَفَ الْمُوَكَّلُ فِي بَيْعِ مالِه أَوِالشِّراءِ بِعَيْنِه فَتَصَرُّفُهُ باطِلٌ،

---

(وَإِنْ قالَ بِعْ بِمِأَة) ئەگەر وەکیلگرەکە گوتی: بە سەد دینار بیفرۆشە. ئەوە (لَمْ يَبِعْ بِأَقَلّ) نابێ بە کەمتر بیفرۆشێ، بەڵام (وَلَهُ اَنْ يَزِيدَ) بۆی هەیە بە زیاتر بیفرۆشێ (إِلاّ أَنْ يُصَرِّحَ بِالنَّهْيِ) مەگەر بە ئاشکرا قەدەغەی بکاو بڵێ: بە زیاتر مەیفرۆشە. ئەو کاتە نابێ بە زیاتر بیفرۆشێ، ئینجا بزانە: کڕین وەکو فرۆشتن وایە: لە گشت ئەو بڕیارانەی‌ڕابردوودا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ قالَ: اشْتَرِ بِهٰذَاالدِّينارِ شاةً) ئەگەر گوتی: بەم دینارە مەڕێکم بۆ بکڕە (وَوَصَفَها) جۆری مەڕەکەشی دیاری کرد (فَاشْتَرَى بِه شاتَيْنِ بِالصِّفَة) ئینجا وەکیلەکەش دوو مەڕی لەو جۆرەی بە دینارەکە کڕین، ئەوە (فَإِنْ لَمْ تُساوِ وَاحِدَةٌ دِيناراً) ئەگەر مەڕێکیان بە تەنها دینارێکی نەدەکرد (لَمْ يَصِحَّ الشِّراءُ لِلْمُوَكِّلِ) کڕینەکە بۆ وەکیلگرەکە دروست نابێ، بەڵکو ئەگەر بە خودی دینارەکە مەڕەکانی کڕیبن کڕینەکەش بەتاڵە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، بەڵام (وَإِنْ ساوَتْهُ كُلُّ واحِدَة) ئەگەر هەر یەکەیان بە تەنها دینارێکی دەکرد، ئەوە (فَالأَظْهَرُالصِّحَّةُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: کڕینەکە دروستەو (وَحُصُولُ الْمِلْكِ فِيهِما لِلْمُوَكِّلِ) ملکایەتی لە هەردوو مەڕەکانیشدا بۆ وەکیلگرەکە دەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (عروةالبارقي)ی‌ڕابردوو، لە مەرجی‌چوارەمی مامڵەت پێکراودا.

(وَلَوْ أَمَرَهُ بِالشِّراءِ بِمُعَيَّنٍ) ئەگەر فەرمانی پێ‌کرد بە خودی ماڵێك شتەکە بکڕێ، وەك بڵێ: بە خودی ئەم پارەیە بۆم بکڕە (فَاشْتَرَى فِي الذِّمَّة) وەکیلەکەش بە قەرز بۆی کڕی، ئەوە (لَمْ يَقَعْ لِلْمُوَكِّلِ) کڕینەکە بۆ وەکیلگرەکە دانامەزرێ، بەڵکو بۆ خودی وەکیلەکە دادەمەزرێ (وَكَذَا عَكْسُهُ) هەروەها پێچەوانەکەشی دروست نابێ، وەك بڵێ: بە قەرز بۆم بکڕەو ئەمەش لە قەرزەکەی بدە. ئەویش بە خودی‌شتەکە کڕی، ئەو فرۆشتنە بەتاڵەو بۆ هیچێکیان دانامەزرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَمَتَى خالَفَ الْمُوَكَّلَ) هەر کاتێك وەکیلەکە دژی ئیزندانی وەکیلگرەکەی کرد (فِي بَيْعِ مالِه) لەبارەی فرۆشتنی ماڵەکەی (أَوِالشِّراءِ بِعَيْنِه) یان لەبارەی کڕین بە خودی ماڵەکەی، ئەوە (فَتَصَرُّفُهُ باطِلٌ) دەستکاریەکەی وەکیلەکە -لە کڕینو فرۆشتنەکەدا- بەتاڵو دانەمەزراوە.

وَلَو اشتَرَى فِي الذِّمَّة وَلَمْ يُسَمِّ الْمُوَكِّلَ وَقَعَ لِلْوَكِيلِ، وَإِنْ سَمَّاهُ فَقالَ الْبائِعُ: بِعْتُكَ، فَقالَ: اشْتَرَيْتُ لِفُلاَنٍ، فَكَذَا فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ قالَ بِعْتُ مُوَكِّلَكَ زَيْداً، فَقالَ اشْتَرَيْتُ لَهُ، فَالْمَذْهَبُ بُطْلاَنُهُ، وَيَدُ الْوَكيلِ يَدُ أَمانَةٍ وَإِنْ كانَ بِجُعْلٍ، فَإِنْ تَعَدَّى ضَمِنَ وَلاَ يَنْعَزِلُ فِي الأَصَحِّ،

---

ئینجا هەر لە حاڵەتی دژ بە ئیزندانەکەدا (وَلَو اشْتَرَى فِي الذِّمَّةِ) ئەگەر شتێکی بە قەرز کڕی‌و بە بێ‌ئیزن لە نرخی خۆی زیاتری پێ‌دا، یان دژایەتیەکی‌تری کرد (وَلَمْ يُسَمِّ الْمُوَكِّلَ) لە کڕینەکەشدا ناوی وەکیلگرەکەی نەهێنا، ئەوە (وَقَعَ لِلْوَكِيلِ) کڕینەکە بۆ وەکیلەکە دادەمەزرێ (وَ) هەروەها (إِنْ سَمَّاهُ) ئەگەر ناوی وەکیلگرەکەش بێنێ: (فَقالَ الْبائِعُ: بِعْتُكَ) وەك فرۆشیارەکە بڵێ: فرۆشتمە تۆ (فَقالَ اشْتَرَيْتُ لِفُلاَنٍ) وەکیلەکەش بڵێ: بۆ فلانکەس کڕیم (فَكَذَا) ئەوەش هەر بۆ وەکیلەکە دادەمەزرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا، چونکە بە دژی ئیزندانی وەکیلگرەکەی دەستکاریی کردوە.

ئینجا بزانە: لە گشت مامڵەت بەستنێکدا -جگە لە مارەبڕین- مەرجە: گفتوگۆی مامڵەتەکە لەگەڵ وەکیلەکەدا بکرێ، هەم مەرجە: وەکیلەکەش ناوی وەکیلگرەکەی بێنێ، یان بە دڵ نیەتی وەکیلگرەکە بێ، کەوابو: (وَإِنْ قالَ) ئەگەر فرۆشیارەکە گوتی (بِعْتُ مُوَكِّلَكَ زَيْداً) ئەمەم فرۆشتە وەکیلگرەکەت کە ناوی (زەید)ە (فَقالَ: اشْتَرَيْتُ لَهُ) وەکیلەکەش گوتی: لێتم کڕی بۆ (زەید). ئەوە (فَالْمَذْهَبُ بُطْلاَنُهُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: مامڵەتەکە بەتاڵە، چونکە گفتوگۆیەکە لەگەڵ وەکیلەکەدا نەبوە، کەوابو: ئەگەر بڵێ: فرۆشتمە تۆ بۆ فلانکەس، وەکیلەکەش بڵێ: قبوڵم کرد بۆ فلانکەس، ئەوە دروست دەبێ ؛ هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە قبولکردنی بەخشین‌و وەقف‌و وەسیێت‌و خواستن‌و ئەمانەتدا، واجبە: وەکیلەکە ناوی وەکیلگرەکە بێنێ‌و بڵێ: بۆ فلانکەس قبوڵم کرد، هەروەها لە مارەبڕیندا دروست نیە: گفتوگۆیەکە لەگەڵ وەکیلەکەدا بکرێ، بەڵکو واجبە: بۆ وەکیلگرەکە بکرێ‌و ناویشی بگوترێ، هەروەك لە(باسی مارەبڕین)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تعالَى.

(وَيَدُ الْوَكيلِ) دەستی وەکیلەکە لە سەر ئەو شتەی تێیدا کراوەتەوە وەکیل (يَدُ أَمانَةٍ) دەستی ئەمانەتە (وَإِنْ كانَ بِجُعْلٍ) هەرچەند وەکیلایەتیەکەشی بە کرێ بێ‌و بە خۆڕایی نەبێ، کەواتە: ئەگەر -بێ‌کەمتەرخەمی- ماڵەکە بفەوتێ، وەکیلەکە نابێتە زامن‌و تۆڵەی لە سەر نیە، بەڵام (فَإِنْ تَعَدَّى) ئەگەر دوژمنکاری، یان کەمتەرخەمی‌ی کرد: وەك بێ‌ئیزن جلەکە دەبەر بکا، یان سواری وولاغەکە ببێ، یان نەیپارێزێ، یان لە شوێنێك دایبنێ‌و لە بیری بچێ، یان نەزانێ چۆن لێی ون بوە، ئەوە (ضَمِنَ) دەبێتە زامن‌و دەبێ تۆڵەی بژمێرێ، بەڵام (وَلاَ يَنْعَزِلُ) وەکیلەکە -بە هۆی دوژمنکاری‌و کەمتەرخەمی- لە وەکیلایەتی لاناچێ ئەگەر وەکیلگرەکە لاینەدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

وَأَحْكامُ الْعَقْد تَتَعَلَّقُ بِالْوَكِيلِ دُونَ الْمُوَكِّلِ فَيُعْتَبَرُ فِي الرُّؤْيَةِ وَلُـزُومِ الْعَقْـدِ بِمُفارَقَـةِ الْمَجْلِسِ وَالتَّقابُضِ فِي الْمَجْلِسِ -حَيْثُ يُشْتَرَطُ- اَلْوَكِيلُ دُونَ الْمُوَكِّلِ، وَإِذا اشْـتَرَى الْوَكِيلُ طالَبَهُ الْبائِعُ بِالثَّمَنِ إِنْ كانَ دَفَعَهُ إِلَيْه الْمُوَكِّلُ، وَإِلاَّ فَلا إِنْ كانَ الـثَّمَنُ مُعَيَّنـاً، وَإِنْ كانَ فِي الذِّمَّة طالَبَهُ إِنْ أَنْكَرَ وَكالَتَهُ أَوْ قالَ لاَ أَعْلَمُها، وَإِنْ اعْتَرَفَ بِها طالَبَهُ أَيْضـاً فِي الأَصَحِّ كَما يُطالِبُ الْمُوَكِّلَ، وَيَكُونُ الْوَكِيلُ كَضامِنٍ وَالْمُوَكِّلُ كَأَصِيلٍ، وَإِذا قَـبَضَ الْوَكِيلُ بِالْبَيْعِ الثَّمَنَ وَتَلِفَ فِي يَدِه وَخَرَجَ

---

(وَأَحْكامُ الْعَقْد) بڕیارەکانی مامڵەت بەستن (تَتَعَلَّقُ بِالْوَكِيلِ) پەیوەندییان بە وەکیلەکەوە هەیە (دُونَ الْمُوَكِّلِ)نەك بە وەکیلگرەکە، کەوابو: (فَيُعْتَبَرُ) ڕەچاو دەکرێ: (فِي الرُّؤْيَةِ) لە دیتنی فرۆشراوەکەو (وَلُزُومِ الْعَقْدِ بِمُفارَقَةِ الْمَجْلِسِ) هەم لە چەسپاندنی مامڵەتەکە بە لێك جیابوونەوەی دانیشگەو (وَالتَّقابُضِ فِي الْمَجْلِسِ) هەم لە لێکوەرگرتن لە دانیشگەدا (حَيْثُ يُشْتَرَطُ) لەو مامڵەتەی لە یەکتری وەرگرتنی تێدا مەرجە: وەکو ڕیبادار، لە گشت ئەوانەدا (اَلْوَكِيلُ) وەکیلەکە ڕەچاو دەکرێ (دُونَ الْمُوَكِّلِ) نەك وەکیلگرەکە، کەوابو: تەنها وەکیلەکە مافی پەشیمانیی دانیشگەو مەرجی هەیە، هەرچەند وەکیلگرەکەش مامڵەتەکە بڕوێنێو پێی ڕازی بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِذا اشْتَرَى الْوَكِيلُ) هەر کاتێك وەکیلەکە شتێکی -بۆ وەکیلگرەکە- کڕی (طالَبَهُ الْبائِعُ بِالثَّمَنِ) فرۆشیارەکە داوای پارەکەی لە وەکیلەکە دەکا (إِنْ كانَ دَفَعَهُ إِلَيْهِ الْمُوَكِّلُ) ئەگەر وەکیلگرەکە پارەکەی دابێتە وەکیلەکە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر پارەکەی نەدابێتێ (فَلاَ) نابێ داوا لە وەکیلەکە بکا (إِنْ كانَ الثَّمَنُ مُعَيَّناً) ئەگەر پارەکە دیارکراو بێ، بەڵکو داوا لە وەکیلگرەکە دەکا.

بەڵام (وَإِنْ كانَ فِي الذِّمَّةِ) ئەگەر پارەکە دیارکراو نەبو، بەڵکو قەرز بوو (طالَبَهُ) ئەو کاتەش داوای پارەکە لە وەکیلەکە دەکا (إِنْ أَنْكَرَ وَكالَتَهُ) ئەگەر فرۆشیارەکە بڵێ: تۆ وەکیل نی (أَوْ قالَ: لاَ أَعْلَمُها) یان فرۆشیارەکە گوتی: من نازانم تۆ وەکیلی، بەڵام (وَإِنِ اعْتَرَفَ بِها) ئەگەر فرۆشیارەکە دانی هێنا بە وەکیلایەتی وەکیلەکە، ئەو کاتەش (طالَبَهُ أَيْضاً) وەك مەسەلەکەیتر داوای پارەکە لە وەکیلەکە دەکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (كَما يُطالِبُ الْمُوَكِّلَ) هەروەك بۆی دروستە داوای پارەکەی لە وەکیلگرەکەش بکاو (وَيَكُونُ الْوَكِيلُ كَضامِنٍ) وەکیلەکە -لێرەدا- وەکو زامینێکەو (وَالْمُوَكِّلُ كَأَصِيلٍ) وەکیلگرەکەش وەکو ماف لەسەرێکە، واتە: ئەگەر وەکیلەکە پارەکەی دایە فرۆشیارەکە، ئەو کاتە پارەکەی خۆی لە وەکیلگرەکە وەردەگرێتەوە.

(وَإِذا قَبَضَ الْوَكِيلُ بِالْبَيْعِ الثَّمَنَ) هەر کاتێك وەکیلێکی شت فرۆشتن پارەی فرۆشراوەکەی وەرگرتو (وَتَلِفَ فِي يَدِهِ) پارەکەش لە دەستی ئەودا فەوتاو (وَخَرَجَ

الْمَبِيعُ مُسْتَحَقاً رَجَعَ عَلَيْهِ الْمُشْتَرِي وَإِنِ اعْتَرَفَ بِوَكَالَتِهِ فِي الأَصَحِّ، ثُمَّ يَرْجِعُ الْوَكِيلُ عَلَى الْمُوَكِّلِ، قُلْتُ: وَلِلْمُشْتَرِي الرُّجُوعُ عَلَى الْمُوَكِّلِ ابْتِداءً فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) اَلْوَكَالَةُ جائِزَةٌ مِنَ الْجانِبَيْنِ فَإِذَا عَزَلَهُ الْمُوَكِّلُ فِي حُضُورِهِ أَوْ قَالَ رَفَعْتُ الْوَكَالَةَ أَوْ أَبْطَلْتُها أَوْ أَخْرَجْتُكَ مِنها إِنْعَزَلَ، فَإِنْ عَزَلَهُ وَهُوَ غائِبٌ إِنْعَزَلَ فِي الْحالِ، وَفِي قَوْلٍ لاَ، حَتَّى يَبْلُغَهُ الْخَبَرُ،

---

(الْمَبِيعُ مُسْتَحَقاً) فرۆشراوەکەش بە ماڵی کەسێکیتر دەرچو، لەو حاڵەتەدا (رَجَعَ عَلَيْهِ الْمُشْتَرِي) کڕیارەکە دەگەڕێتەوە سەر وەکیلەکە، تاکو تۆڵەی پارە فەوتاوەکەی لێ وەربگرێتەوە (وَإِنِ اعْتَرَفَ بِوَكَالَتِهِ) هەرچەند کڕیارەکە دان بە وەکیلایەتیشیدا بهێنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (ثُمَّ يَرْجِعُ الْوَكِيلُ عَلَى الْمُوَكِّلِ) ئینجا وەکیلەکەش دەگەڕێتەوە پارەکەی لە وەکیلگرەکە وەردەگرێتەوە.
(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفەرموێ: (وَلِلْمُشْتَرِي الرُّجُوعُ عَلَى الْمُوَكِّلِ ابْتِداءً) کڕیارەکە بۆی دروستە -هەر لە سەرەتاوە- بگەڕێتەوە سەر وەکیلگرەکەو پارەکەی لە ئەو وەربگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی لەکارکەوتن و کێشەی وەکیل ﴾

(اَلْوَكالَةُ) وەکیلایەتی (جائِزَةٌ مِنَ الْجانِبَيْنِ) مامڵەتێکی نەچەسپاوە: لە لایەن وەکیل و وەکیلگرەکەوە، کەواتە: هەر کامەیان حەز بکا: دەتوانێ -بە تەنها- هەڵیبوشێنێتەوە، هەرچەند وەکیلایەتیەکەش بە کرێ بێ، بەڵام بەو مەرجەی بە ووشەی بەکرێگرتن مامڵەتەکە نەبەسترابێ، ئەگینا: هیچێکیان ناتوانێ -بە تەنها- هەڵیبوەشێنێتەوە.
هەروەها ئەگەر -لە حاڵەتی دیارنەبوونی وەکیلگرەکە- وەکیلەکە بزانێ: ئەگەر خۆی لە وەکیلایەتی لابدا، زۆردارێك دەست بە سەر ماڵەکەدا دەگرێ، یان بێشەرعیەکیتر ڕوودەدا، ئەو کاتەش حەرامەو دروست نابێ: خۆی لە وەکیلایەتی لابدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(فَإِذَا عَزَلَهُ الْمُوَكِّلُ فِي حُضُورِهِ) جا هەر کاتێك وەکیلگرەکە وەکیلەکەی لە کار لادا، لەو حاڵەتەش وەکیلەکە لە وێ حازر بوو، وەك بڵێ: تۆم لە کار لادا (أَوْ قَالَ: رَفَعْتُ الْوَكالَةَ) یان گوتی: وەکیلایەتیەکەم هەڵگرت (أَوْ أَبْطَلْتُها) یان بەتاڵم کردەوە (أَوْ أَخْرَجْتُكَ مِنْها) یان تۆم لە وەکیلایەتی دەرکرد، بەو ووشانە (إِنْعَزَلَ) وەکیلەکە لە کار دەکەوێ.
(فَإِنْ عَزَلَهُ وَهُوَغائِبٌ) جا ئەگەر وەکیلگرەکە وەکیلەکەی لە کار لادا، لەو حاڵەتەش وەکیلەکە نادیار بوو، ئەو کاتەش (إِنْعَزَلَ فِي الْحالِ) هەر ئەو دەم لەکار دەکەوێ و پێویست ناکا بزانێ لادراوە، بەڵام (وَفِي قَوْلٍ: لاَ، حَتَّى يَبْلُغَهُ الْخَبَرُ) لە فەرموودەیەکدا: لە کار ناکەوێ تا هەواڵی لەکارخستنی دەگاتێ.

وَلَوْ قالَ عَزَلْتُ نَفْسِي أَوْ رَدَدْتُ الْوَكالَةَ انْعَزَلَ، وَيَنْعَزِلُ بِخُرُوجِ أَحَدِهِما عَنْ أَهْلِيَةِ التَّصَرُّفِ بِمَوْتٍ أَوْ جُنُونٍ وَكَذَا إِغْماءٌ فِي الأَصَحِّ، وَبِخُرُوجِ مَحَلِّ التَّصَرُّفِ عَنْ مِلْكِ الْمُوَكِّلِ، وَإِنْكارُ الْوَكِيلِ الْوَكالَةَ لِنِسْيانٍ أَوْ لِغَرَضٍ فِي الإِخْفاءِ لَيْسَ بِعَزْلٍ، فَإِنْ تَعَمَّدَ وَلاَ غَرَضَ انْعَزَلَ،

---

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر وەکیلەکە -بەخۆی- گوتی (عَزَلْتُ نَفْسِي) خۆم لە کار لادا (أَوْ رَدَدْتُ الْوَكالَةَ) یان گوتی: وەکیلایەتیەکەم ڕەد کردەوە، یان هەڵموەشاندەوە (انْعَزَلَ) هەر ئەو دەمە لە کار دەکەوێ، هەرچەند وەکیلگرەکەش لەوێ نەبێ.

(وَ)هەروەها (يَنْعَزِلُ) وەکیلەکە لە کار دەکەوێ (بِخُرُوجِ أَحَدِهِما عَنْ أَهْلِيَةِ التَّصَرُّفِ) بەوەی یەکێکیان لە دەسەڵاتداریەتی دەستکاری بچێتە دەر (بِمَوْتٍ) بە هۆی مردن (أَوْ جُنُونٍ) یان شێتی (وَكَذَا إِغْماءٌ) هەروەها بێهۆشی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: هەر کاتێك -لە وەکیلەکەو لە وەکیلگرەکە- یەکێکیان مرد، یان شێت بوو، یان بێهۆش بوو، وەکیلایەتیەکە هەڵدەوەشێتەوەو وەکیلەکە لە کار دەکەوێ، بەڵام لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە هۆی بێهۆشی لە کار ناکەوێ.

ئینجا بزانە: وەکیلی بەردبارانیشەیتانەکان -بە هۆی بێهۆشبوونی وەکیلگرەکە- لە کار ناکەوێ، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها وەکیلەکە لە کار دەکەوێ (بِخُرُوجِ مَحَلِّ التَّصَرُّفِ عَنْ مِلْكِ الْمُوَكِّلِ) بەوەی شوێنی دەستکاریەکە لە ملکایەتی وەکیلگرەکەدا نەمێنێ: وەك وەکیلگرەکە شتەکە بفرۆشێ، یان ببیەخشێ، یان وەقفی بکا، جا ئەگەر دووبارەش ببێتەوە ملکی وەکیلگرەکە، وەکیلایەتیەکە بۆ وەکیلەکە ناگەڕێتەوە.

(وَإِنْكارُ الْوَكِيلِ الْوَكالَةَ) داننەهێنانی وەکیلەکە: بە وەکیلایەتیەکە (لِنِسْيانٍ) لە بەر لەبیرچوون (أَوْ لِغَرَضٍ فِي الإِخْفاءِ) یان مەبەستێکی لە شاردنەوەی وەکیلایەتیدا هەبێو بڵێ: من وەکیلی فلان نیم (لَيْسَ بِعَزْلٍ) نابێتە لەکارلادانی خۆی، بەڵام (فَإِنْ تَعَمَّدَ) ئەگەر بە قەسدی وا بڵێو لە بیری نەچوبێو (وَلاَ غَرَضَ) هیچ مەبەستێکیشی نەبێ، ئەو کاتە (انْعَزَلَ) بەو داننەهێنانە لە کار دەکەوێ، ئینجا بزانە: داننەهێنانی وەکیلگرەکەش وەکو داننەهێنانی وەکیلەکەیە: لە گشت ئەو باسانەیڕابردوودا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە دوای لەکارلادان، یان لە دوای لەکارکەوتن-بە هەر هۆیەك- هیچ دەستکاریەکی وەکیلەکەو هیچ مامڵەتێکی دروست نابێ، هەرچەند نەشیزانیبێ لادراوە، یان لەکار کەوتوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَإِذَا اخْتَلَفا فِي أَصْلِها أَوْ صِفَتِها بِأَنْ قالَ: وَكَّلْتَنِي فِي الْبَيْعِ نَسِيئَةً أَوالشِّراءِ بِعِشْرِينَ، فَقالَ: بَلْ نَقْداً أَوْ بِعَشَرَةٍ، صُدِّقَ الْمُوَكِّلُ بِيَمِينِه، وَلَوْ اشْتَرَى جارِيَةً بِعِشْرِينَ وَزَعَمَ أَنَّ الْمُوَكِّلَ أَمَرَهُ فَقالَ: بَلْ بِعَشَرَةٍ، وَحَلَفَ، فَإِنْ اشْتَرَى بِعَيْنِ مالِ الْمُوَكِّلِ وَسَمَّاهُ فِي الْعَقْدِ أَوْ قالَ بَعْدَهُ اشْتَرَيْتُهُ لِفُلَانٍ وَالْمالُ لَهُ وَصَدَّقَهُ الْبائِعُ فَالْبَيْعُ باطِلٌ، وَإِنْ كَذَّبَهُ حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ بِالْوَكالَةِ

---

جا ئەگەر لە دواى دەستكاریكردن وەكیلگرەكە گوتی: پێش دەستكاریكردن وەكیلەكەم لە كار لادابو. ئەوە ئەگەر شاهید نەهێنێ باوەڕی پێناكرێ، كەوابو: پێویستە بۆ لەكارلادانی وەكیلەكە: وەكیلگرەكە شاهید بگرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَإِذَااخْتَلَفا فِيأَصْلِها) هەر كاتێك وەكیلەكەو وەكیلگرەكە بووە كێشەیان: لە بنچینەی وەكیلایەتیدا، وەك وەكیلگرەكە بڵێ: تۆم نەكردۆتە وەكیلی خۆم (أَوْ صِفَتِها) یان لە شێوەی وەكیلایەتیدا (بِأَنْ قالَ: وَكَّلْتَنِي فِيالْبَيْعِ نَسِيئَةً) وەك وەكیلەكە بڵێ: منت كردۆتە وەكیل لە فرۆشتنی بە قەرزدا (أَوْ) یان منت كردۆتە وەكیل (فِيالشِّراءِ بِعِشْرِينَ) لە كڕینیدا بە بیست دینار (فَقالَ بَلْ) وەكیلگرەكەش گوتی بەڵكو تۆم كردۆتە وەكیل (نَقْداً) بە حازر بیفرۆشی (أَوْ بِعَشَرَةٍ) یان گوتی: تۆم كردۆتە وەكیل بە دە دینار بیكڕی. لەو مەسەلانەدا (صُدِّقَ الْمُوَكِّلُ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە وەكیلگرەكە دەكرێ ئەگەر سوێند بخوا.

﴿ ئاگاداری ﴾: وەكیلایەتی بە شاهیدیی دوو پیاو ئاشكرا دەبێ، هەروەك لە باسی شاهیدیدا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(وَلَواشْتَرَىجارِيَةً بِعِشْرِينَ) ئەگەر وەكیلەكە كۆیلەیەك، یان شتێكیتری كڕی بە بیست دیناڕو (وَزَعَمَ أَنَّ الْمُوَكِّلَ أَمَرَهُ) گوتی: وەكیلگرەكە فەرمانی داومێ بە بیست دینار بیكڕم (فَقالَ بَلْ بِعَشَرَةٍ) وەكیلگرەكەش گوتی: بەڵكو ئیزنم دابوی بە دە دینار بیكڕی. لەو حاڵەتەشدا هیچیكیان شاهیدی نەبو (وَحَلَفَ) وەكیلگرەكەش سوێندی خوارد، ئەوە تەماشا دەكەین:

(فَإِن اشْتَرَى بِعَيْنِ مالِ الْمُوَكِّلِ) ئەگەر بە خودیماڵی وەكیلگرەكە شتەكەی كڕیبو، هەم (وَسَمَّاهُ فِيالْعَقْدِ) لە مامڵەت بەستنەكەشدا ناوی وەكیلگرەكەی هێنابو (أَوْ قالَ بَعْدَهُ) یان لە دوایكڕینەكە گوتی: (اشْتَرَيْتُهُ لِفُلَانٍ وَالْمالُ لَهُ) ئەو شتەم بۆ فلانكەس كڕیوەو ماڵەكەش -كە پارەكەیە- هیئەوە (وَصَدَّقَهُ الْبائِعُ) فرۆشیارەكەش باوەڕی پێكرد، ئەوە (فَالْبَيْعُ باطِلٌ) لە هەردوو مەسەلەدا فرۆشتنەكە بەتاڵەو دروست نابێ.

بەلام (وَإِنْ كَذَّبَهُ) ئەگەر فرۆشیارەكە باوەڕی پێنەكردو گوتی: بۆ خۆت كڕیوتە. یان گوتی: تۆ وەكیل نی. ئەو كاتە (حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ بِالْوَكالَةِ) فرۆشیارەكە سوێند دەخوا

وَوَقَعَ الشِّراءُ لِلْوَكيلِ، وَكَذَا إِن اشتَرَى فِي الذِّمَّة وَلَمْ يُسَمِّ الْمُوَكِّلَ وَكَـذَا إِنْ سَـمَّاهُ وَكَذَّبَهُ الْبائعُ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ صَدَّقَهُ بَطَلَ الشِّراءُ، وَحَيْثُ حُكِـمَ بالشِّـراءِ لِلْوَكيـلِ يُستَحَبُّ لِلْقاضي أَنْ يَرْفُقَ بالْمُوَكِّلِ لِيَقولَ لِلْوَكيلِ: إنْ كُنتُ أَمَرْتُـكَ بعِشْـرينَ فَقَـدْ بِعْتُكَها بِها، وَيقُولُ هُوَ: اشْتَرَيْتُ، لِتَحِلَّ لَهُ، وَلَوْ قالَ أَتَيْتُ بِالتَّصَـرُّفِ الْمَـأْذُون فِيـهِ وَأَنْكَرَ الْمُوَكِّلُ صُدِّقَ الْمُوَكِّلُ، وَفِي قَوْلِ الْوَكيلُ، وَقَوْلُ الْوَكيلِ فِي تَلَفِ الْمالِ مَقْبُـولٌ بِيَمينِهِ وَكَذَا فِي الرَّدِّ، وَقِيلَ إِنْ كانَ بِجُعْلٍ فَلا،

---

لە سەر نەزانینی وەكیلایەتیەكە، ئینجا (وَوَقَـعَ الشِّراءُ لِلْوَكيـلِ) كڕینەكە بۆ وەكیلەكە دادەمەزرێ (وَكَذَا) هەروەها كڕینەكە بۆ وەكیلەكە دادەمەزرێ (إنِ اشتَرَى فِي الذِّمَّـةِ) ئەگەر شتەكەی بە قەرز كڕیبێو (وَلَمْ يُسَمِّ الْمُوَكِّلَ) لە مامڵەت بەستنەكەدا ناوی وەكیلگرەكەی نەهێنابێ (وكَذَا إِنْ سَمَّاهُ) هەروەها ئەگەر-لە كڕینە بە قەرزەكەدا- ناویشی هێنابێ، بەلام (وَكَذَّبَهُ الْبائعُ) فرۆشیارەكە باوەڕی پێنەكردبێ، ئەو كاتەش فرۆشتنەكە هەر بۆ وەكیلەكە دادەمەزرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەلام (وَإِنْ صَـدَّقَهُ) ئەگەر فرۆشیارەكە باوەڕی پێ كردبێ ئەو كاتە (بَطَلَ الشِّراءُ) فرۆشتنەكە بەتاڵ دەبێتەوەو بۆ هیچێكیان دانامەزرێ.

(وَحَيْثُ حُكِمَ بِالشِّراءِ لِلْوَكيلِ) هەر كاتێك بڕیار بدرێ: كە كڕینەكە بۆ وەكیلەكە دامەزراوە (يُسْتَحَبُّ لِلْقاضِـي) بۆ قازی وەها سوننەتە (أَنْ يَرْفُـقَ بِالْمُوَكِّـلِ) بە نەرمی لەگەڵ وەكیلگرەكە بدوێ (لِيَقُولَ لِلْوَكيـلِ) تاكو وەكیلگرەكە بڵێتە وەكیلەكە: (إِنْ كُنْتُ أَمَرْتُكَ بِعِشْرِينَ) ئەگەر من فەرمانم پێكردبوی بە بیست دینار ئەم شتە-یان ئەم كۆیلەیە- بكڕی (فَقَدْ بِعْتُكَها بِها) ئەوە فرۆشتمەوە تۆ بە بیست دینار (وَيَقُولُ هُوَ) وەكیلەكەش بڵێ: (اشْتَرَيْتُ) لێتم كڕی. (لِتَحِلَّ لَهُ) تاكو شتەكە بۆ وەكیلەكە حەلاڵ بێ، چونكە ئەو واتیدەگا: شتەكەی بۆ وەكیلگرەكەی كڕیوە.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر وەكیلەكە گوتی: (أَتَيْتُ بِالتَّصَرُّفِ الْمَأْذُونِ فِيـهِ) ئەو دەستكاریەی من كردومە تێیدا ئیزندراوم (وَأَنْكَرَ الْمُوَكِّلُ) وەكیلگرەكەش گوتی: وانیە، ئیزن نەدراوی. لێرەشدا (صُدِّقَ الْمُوَكِّلُ) باوەڕ بە وەكیلگرەكە دەكرێ ئەگەر سوێند بخوا (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكدا (الْوَكيلُ) باوەڕ بە وەكیلەكە دەكرێ.

(وَقَوْلُ الْوَكيلِ فِي تَلَفِ الْمالِ) قسەی وەكیلەكە لەبارەی فەوتانی ماڵەكە، وەك بڵێ: ماڵەكە فەوتاوە (مَقْبُولٌ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردنەكەی لێی وەردەگیرێو باوەڕی پێدەكرێ (وَكَذَا فِي الرَّدِّ) هەروەها لەبارەی گەڕاندنەوەی ماڵەكەش-بۆ وەكیلگرەكە- بە سوێند باوەڕی پێ دەكرێ، (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (إِنْ كانَ بِجُعْلٍ فَلاَ) ئەگەر وەكیلایەتیەكە بە كرێ بێ، لەبارەی گەڕاندنەوە باوەڕی پێ ناكرێ.

وَلَوِ ادَّعَى الرَّدَّ عَلَى رَسُولِ الْمُوَكِّلِ وَأَنْكَرَ الرَّسُولُ صُدِّقَ الرَّسُولُ، وَلاَ يَلْزَمُ الْمُوَكِّلَ تَصْدِيقُ الْوَكِيلِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قَالَ قَبَضْتُ الثَّمَنَ وَتَلِفَ وَأَنْكَرَ الْمُوَكِّلُ صُدِّقَ الْمُوَكِّلُ إِنْ كَانَ قَبْلَ تَسْلِيمِ الْمَبِيعِ، وَإِلاَّ فَالْوَكِيلُ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ وَكَّلَهُ بِقَضَاءِ دَيْنٍ فَقَالَ قَضَيْتُهُ وَأَنْكَرَ الْمُسْتَحِقُّ صُدِّقَ الْمُسْتَحِقُّ بِيَمِينِهِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَ يُصَدَّقُ الْوَكِيلُ عَلَى الْمُوَكِّلِ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ،

---

جا بزانە: ئەو باوەڕ پێكردنەی ڕابردوو لەو حاڵەتەدا بوو كە بڵێ: دلوەتە دەست وەكیلگرەكە، بەڵام (وَلَوادَّعَى الرَّدَّ عَلَى رَسُولِ الْمُوَكِّلِ) ئەگەر وەكیلەكە گوتی: ماڵەكەم دلوەتە دەست ئەو كەسەی وەكیلگرەكە ناردبوی (وَأَنْكَرَ الرَّسُولُ) نێردراوەكەش گوتی: وا نیەو نەتدلوەتەوە من. لەو حاڵەتەشدا هیچ شاهید نەبو، ئەوە (صُدِّقَ الرَّسُولُ) باوەڕ بە نێردراوەكە دەكرێ، بە هۆی سوێندخواردنی، هەم ( وَلاَ يَلْزَمُ الْمُوَكِّلَ تَصْدِيقُ الْوَكِيلِ) لە سەر وەكیلگرەكەش واجب نیە: باوەڕ بە وەكیلەكە بكا (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونكە وەكیلەكە دەڵێ: ماڵەكەم دلوەتە كەسێكی‌تر–جگە لە وەكیلگرەكە–كەوابو: لەو جۆرە مەسەلانەدا لە سەر وەكیلەكە واجبە: شاهید بگرێ، تاكو لە كێشەكەیدا سەركەوتوو بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر وەكیلەكە گوتی: (قَبَضْتُ الثَّمَنَ وَتَلِفَ) پارەی فرۆشراوەكەم وەرگرتو پارەكەش فەوتا (وَأَنْكَرَ الْمُوَكِّلُ) وەكیلگرەكەش گوتی: پارەكەت وەرنەگرتوە. ئەوە (صُدِّقَ الْمُوَكِّلُ إِنْ كَانَ قَبْلَ تَسْلِيمِ الْمَبِيعِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە وەكیلگرەكە دەكرێ ئەگەر كێشەكەی پێش تەسلیمكردنی فرۆشراوەكە بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر كێشەكەی دوای تەسلیمكردنی فرۆشراوەكە بێ (فَالْوَكِيلُ) ئەو كاتە بە سوێند باوەڕ بە وەكیلەكە دەكرێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَلَوْ وَكَّلَهُ بِقَضَاءِ دَيْنٍ) ئەگەر كردیە وەكیل بۆ ئەوەی قەرزێكی بۆ بداتەوەو بە ئەندازەی قەرزەكەش ماڵێكی دایە دەستی وەكیلەكە (فَقَالَ قَضَيْتُهُ) ئینجا وەكیلەكەش گوتی: قەرزەكەم داوەتەوە خاوەن قەرزەكە (وَأَنْكَرَ الْمُسْتَحِقُّ) خاوەن قەرزەكەش گوتی: نەیداوەمەوە. لێرەشدا هیچ شاهید نەبو، ئەوە (صُدِّقَ الْمُسْتَحِقُّ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە خاوەن قەرزەكە دەكرێ، ئینجا هەر كاتێك سوێندی خوارد، قەرزەكەی خۆی لە وەكیلگرەكە داوا دەكاتەوە، نەك لە وەكیلەكە.

(وَ) هەر كاتێك–لەم مەسەلەیەدا– وەكیلگرەكەش ئەندازەی قەرزەكە لە وەكیلەكە داوا بكاتەوە، ئەوە (الأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: (أَنَّهُ لاَ يُصَدَّقُ الْوَكِيلُ عَلَى الْمُوَكِّلِ) وەكیلەكە لە سەر حیسابی وەكیلگرەكە باوەڕی قەرزدانەوەی پێ ناكرێ (إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ) تەنها

وَقَيِّمُ الْيَتِيمِ إِذَا ادَّعَى دَفْعَ الْمالِ إِلَيْهِ بَعْدَ الْبُلُوغِ يَحْتَاجُ إِلَى بَيِّنَةٍ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَيْسَ لِوَكِيلٍ وَلاَ مُودَعٍ أَنْ يَقُولَ بَعْدَ طَلَبِ الْمالِكِ: لاَ أَرُدُّ الْمالَ إِلاَّ بِإِشْهادٍ، فِي الأَصَحِّ، وَلِلْغاصِبِ وَمَنْ لاَ يُقْبَلُ قَوْلُهُ فِي الرَّدِّ ذَلِكَ، وَلَوْ قالَ رَجُلٌ: وَكَّلَنِي الْمُسْتَحِقُّ بِقَبْضِ مالِهِ عِنْدَكَ مِنْ دَيْنٍ أَوْ عَيْنٍ، وَصَدَّقَهُ فَلَهُ دَفْعُهُ إِلَيْهِ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ يَلْزَمُهُ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ عَلَى وَكالَتِهِ، وَلَوْ قالَ: أَحالَنِي عَلَيْكَ، وَصَدَّقَهُ وَجَبَ الدَّفْعُ فِي الأَصَحِّ.

---

بە دوو شاهید، یان بە شاهیدێكو سوێندخواردن باوەڕی پێ دەكرێ، كەوابو: لەو جۆرە مەسەلانەدا پێویستە: وەكیلەكە شاهید بگرێ، تاكو سەركەوتوو بێ.

(وَقَيِّمُ الْيَتِيمِ) سەرپەرشتكاری یەتیم (إِذَا ادَّعَى دَفْعَ الْمالِ إِلَيْهِ بَعْدَالْبُلُوغِ) هەر كاتێك بڵێ:ماڵی یەتیمەكەم لە دوای بلۆغبوونی دلومەتەوە خۆی، ئەوە (يَحْتَاجُ إِلَى بَيِّنَةٍ) پێویستی بە شاهید هەیەو بە سوێند باوەڕی پێ ناكرێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلَيْسَ لِوَكِيلٍ) هیچ وەكیلێك بۆی نیەو (وَلاَ مُودَعٍ) هەم ئەو كەسەی شتێكی بە ئەمانەت لە لا داندراوە، ئەویش بۆی نیە (أَنْ يَقُولَ بَعْدَ طَلَبِ الْمالِكِ) لە دوای ئەوە كە خاوەنەكە ماڵەكەیخۆی داوا دەكاتەوە، بڵێ: (لاَ أَرُدُّالْمالَ إِلاَبِإِشْهادٍ) ماڵەكەت نادەمەوە تەنها بە شاهیدگرتن نەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە وەكیلو هەم گشت ئەمیندارێكیتریش لەبارەی گەڕاندنەوەیماڵ بۆ خاوەنەكەی بە سوێند باوەڕی پێ دەكرێ، هەروەك ڕابرا.

بەڵام (وَلِلْغاصِبِ) بۆ زەوتكەرو هەم (وَمَنْ لاَ يُقْبَلُ قَوْلُهُ فِي الرَّدِّ) بۆ ئەو كەسەش كە لەبارەی گەڕاندنەوە بە سوێند باوەڕی پێ ناكرێ: وەك ڕەهنوەرگرو بەكرێگرو قەرزدارو ماڵخواز، گشتیان (ذَلِكَ) بۆیان هەیە ماڵەكە نەدەنەوە خاوەنەكەی تا شاهید دەگرن، چونكە ئەوانە بە سوێندخواردن باوەڕیان پێ ناكرێ.

(وَلَوْ قالَ رَجُلٌ) ئەگەر پیاوێك بە یەكێكیتری گوت: (وَكَّلَنِيالْمُسْتَحِقُّ بِقَبْضِ مالِهِ عِنْدَكَ) فڵانە خاوەن ماڵ منی كردۆتە وەكیلیخۆی تاكو ئەو ماڵەیوی -كە لە لایتۆیە- لێتی وەربگرمەوە (مِنْ دَيْنٍ أَوْ عَيْنٍ) جیاوازی نیە ماڵەكە: قەرز بێ، یان كەلوپەل بێ (وَصَدَّقَهُ) ئەویش باوەڕی پێكرد (فَلَهُ دَفْعُهُ إِلَيْهِ) بۆی دروستە ماڵەكەی بداتە دەست، بەڵام (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّهُ لاَ يَلْزَمُهُ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ) لە سەری واجب نابێ: بیداتە دەست، تەنها بە شاهیدیی دوو پیاو نەبێ، كە شاهیدی بدەن: (عَلَىوَكالَتِهِ) لە سەر وەكیلایەتی پیاوەكە.

(وَلَوْ قالَ: أَحالَنِي عَلَيْكَ) ئەگەر پیاوێك بە قەرزدارێكی گوت: خاوەن قەرزەكە منی حەواڵەی سەر تۆ كردوە (وَصَدَّقَهُ) قەرزدارەكەش باوەڕی پێكرد (وَجَبَ الدَّفْعُ فِي الأَصَحِّ) واجبە: قەرزەكەی بداتە دەست، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

قُلْتُ: وَإِنْ قالَ: أَنا وارِثُـهُ، وَصَـدَّقَهُ وَجَـبَ الـدَّفْعُ عَلَى الْمَـذْهَبِ وَاللهُ أَعْلَـمُ.

(كِتابُ الإِقْرارِ)

يَصِحُّ مِنْ مُطْلَقِ التَّصَرُّفِ، وَإِقْرارُ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُونِ لاغٍ، فَإِنْ ادَّعَى الْبُلُوغَ بِـالإِحْتِلامِ مَعَ الإِمْكانِ

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفـەرموێ: (وَإِنْ قـالَ) ئەگـەر پیاوێك گوتیـە قـەرزدارێك، یـان گوتیە ئەمینداریك: (أنا وارِثُهُ) تەنها من میراتگری خاوەن قەرزەکەمە. یان گوتی: تـەنها مـن میراتگـری خـاوەنی ئەمانەتەکەمـە. واتـە: هـیچ میراتگریتـری نیـە (وَصَـدَّقَهُ) قەرزدارەکـەش، یـان ئەمیندارەکـەش بـاوەڕی پـێکرد (وَجَـبَ الـدَّفْعُ) واجبە: قەرزەکـەو ئەمانەتەکەی بداتە دەست (عَلَى الْمَذْهَبِ) لەسەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَاللهُ أَعْلَمُ).

﴿ كِتابُ الإِقْرارِ: **پەڕتوکی ئیقرار** ﴾

واتـە: دانهێنـان بـە مـافی کەسـێکیتر لـە سـەر خـۆی. ئینجـا بزانـە: جیـاوازی نیـە دان پێداهێنراوەکە مافی خوایگەورە بێ: وەکو زینـاو شـەڕابخواردنەوە، یـان مـافی ئـادەمیزاد بێ: وەکو قەرزو کوشتن. واتە: مرۆڤ بە هەر کامێکیـان دان بهێنـێ، بڕیـاری شـەرعیی ئـەو مافەی لە سەر جێبەجێ دەکرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿أُغْدُ يَاأُنَيْسُ عَلَـى امْرَأَةِهَـذا فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْها﴾ رواه الشيخان، ئـەی (ئونـەیس) بڕۆ لای ژنـی ئـەم پیـاوە، ئەگـەر دانی بە زینادا هێنا، بەردبارانی بکە.

ئینجا بزانە: دانهێنان لەم چوار ڕوکنانـە پێك دێ: (اَلْمُقِرُّ) دانهێنـەر: کـە دان بـە مافەکـەدا دێنـێ. (اَلْمُقَرُّلَـهُ) دان بـۆهێنراو: کـە دانـی بـۆ بـە مافەکـەدا هێنـراوە. (اَلْمُقَرُّبِـهِ) دان پێداهێنراو: کە مافەکەیە. (اَلصِّيغَةُ): گوتـەی دانهێنانەکە.

ئینجا (يَصِحُّ) دانهێنان دروست دەبێ (مِنْ مُطْلَقِ التَّصَرُّفِ) لەو کەسەی ڕێگـای دەسـتکاری مڵكو مـاڵی درابێ، واتـە: بـالغو عـاقڵ بێو قەدەغـەی لـە سـەر نـەبێو زۆری لێنـەکرابێ، کەوابو: (وَإِقْرارُالصَّبِيِّ وَالْمَجْنُونِ) دانهێنـانی منداڵو شێت (لاغٍ) پووچـەڵو کـەڵکی نیـە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّـى يَسْـتَيْقِظَ وَعَـنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَبْلُغَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ حديث صحيح رواه اصحاب السنن، نووسینی داواکاری لە سەر سێ کەسـان لادراوە: لـە سـەر خـەوتوو تـا هەشیار دەبێتـەوە، لـە سـەر منداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا چاك دەبێتەوە.

(فَإِنْ ادَّعَى الْبُلُوغَ بِالإِحْتِلامِ) جا ئەگەر منداڵ –چ کوڕ، چ کچ– گوتی: بـە هـۆی (مَنـی)هـاتن بلۆغم بووە: لە خەودا، یان لـە بـە ئاگـاییدا، یـان کـچ گوتی: خوێنی حـەیزم هـاتوە (مَعَ الإِمْكانِ) دەشکـونجا قسەی منداڵەکە ڕاست بێ؟ چونکە تەمەنی نۆ ساڵی تـەواو کردبو،

صُدِّقَ وَلاَ يُحَلَّفُ، وَإِنْ ادَّعاهُ بالسِّنِّ طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ، وَالسَّفِيهُ وَالْمُفْلِسُ سَبَقَ حُكْمُ إِقْرارِهما، وَيُقْبَلُ إِقْرارُ الرَّقِيقِ بِمُوجِبِ عُقُوبَةٍ، وَلَوْ أَقَرَّ بِدَيْنِ جِنايَةٍ لاَ تُوجِبُ عُقُوبَةً فَكَذَّبَهُ السَّيِّدُ تَعَلَّقَ بِذِمَّتِهِ دُونَ رَقَبَتِهِ، وَإِنْ أَقَرَّ بِدَيْنِ مُعامَلَةٍ لَمْ يُقْبَلْ عَلَى السَّيِّدِ إِنْ لَمْ يَكُنْ مَأْذُوناً لَهُ فِي التِّجارَةِ، وَيُقْبَلُ إِنْ كانَ، وَيُؤَدَّى مِنْ كَسْبِهِ وَما فِي يَدِهِ، وَيَصِحُّ إِقْرارُ الْمَرِيضِ مَرَضَ الْمَوْتِ لأَجْنَبِيٍّ وَكَذا لِوارِثٍ

---

ئەوە (صُدِّقَ) باوەڕ بە منداڵەکە دەکرێ‌و (وَلاَ يُحَلَّفُ) سوێندیش نادرێ: لە سەر هاتنی (مَنی)و خوێنی‌حەیز.

بەڵام (وَإِنِ ادَّعاهُ بِالسِّنِّ) ئەگەر منداڵەکە -کوڕ، یان کچ- گوتی: بە ساڵ، واتە: بە تەولوبوونی تەمەنی پانزە ساڵی بلۆغم بوە، ئەو کاتە (طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ) منداڵەکە داوای شاهیدی لێ‌دەکرێ، واتە: دەبی دوو پیاو شاهیدی بدەن: (ئەم منداڵە بە ساڵ بلۆغی بووە). بەڵام ئەگەر چوار ئافرەتیش شاهیدی بدەن: کە لە فڵانە ڕۆژدا ئەم منداڵە لە دایک بووە. ئەو کاتەش بە پابەندی لە دایکبوونەکە ساڵەکانیش ئاشکرا دەبن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالسَّفِيهُ)ماڵ بەفیڕۆدەر، هەم (وَالْمُفْلِسُ) قەرزداری قەدەغەکرلو (سَبَقَ حُكْمُ إِقْرارِهِما) بڕیاری دانهێنانیان لە باسی خۆیاندا ڕابرا (وَيُقْبَلُ إِقْرارُ الرَّقِيقِ بِمُوجِبِ عُقُوبَةٍ) دانهێنانی کۆیلە وەردەگیرێ بەو جۆرە تاوانەی سزای هەیە: وەك زیناو کوشتن‌و...هتد (وَلَوْ أَقَرَّ بِدَيْنِ جِنايَةٍ لاَ تُوجِبُ عُقُوبَةً) ئەگەر کۆیلە دانی هێنا بە قەرزی تاوانێکی وەها: کە سزای نیە، بەڵکو تۆڵەی هەیە: وەکو زەوتکردن‌و بریندارکردن (فَكَذَّبَهُ السَّيِّدُ) گەورەکەش گوتی: درۆ دەکا (تَعَلَّقَ بِذِمَّتِهِ) قەرزەکە دەکەوێتە ئەستۆی کۆیلەکە (دُونَ رَقَبَتِهِ) بە گەردەنیەوە نابەسترێ.

(وَإِنْ أَقَرَّ بِدَيْنِ مُعامَلَةٍ) ئەگەر کۆیلەکە دانی‌هێنا بە قەرزی مامڵەتێك: وەك کڕین‌وفرۆشتن (لَمْ يُقْبَلْ عَلَى السَّيِّدِ) ئەو دانهێنانە لە سەر حیسابی گەورەکەی وەرناگیرێ (إِنْ لَمْ يَكُنْ مَأْذُوناً لَهُ فِي التِّجارَةِ) ئەگەر کۆیلەکە ئیزن نەدرابێ: بازرگانی بکا، کەوابو: قەرزەکە دەکەوێتە ئەستۆی کۆیلەکە، بەڵام (وَيُقْبَلُ إِنْ كانَ) دانهێنانەکەی لە سەر حیسابی گەورەکەی وەردەگیرێ ئەگەر ئیزن درابێ بۆ بازرگانی‌کردن، کەوابو: (وَيُؤَدَّى مِنْ كَسْبِهِ وَما فِي يَدِهِ) قەرزەکە لە کەسابەتی کۆیلەکەو لەو ماڵەی لە دەستی دایە دەدرێتەوە.

(وَيَصِحُّ إِقْرارُ الْمَرِيضِ مَرَضَ الْمَوْتِ) دانهێنانی نەخۆش-کە دەردی پێ‌مردنی بێ- دروست دەبێ‌و وەردەگیرێ: (لأَجْنَبِيٍّ) بۆ بێگانەیەك کە میراتگر نەبێ (وَكَذا لِوارِثٍ) هەروەها دانهێنانەکەی بۆ میراتگرەکەشی وەردەگیرێ‌و دروست دەبێ، هەرچەند میراتگرەکانی‌تریش

عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ أَقَرَّ فِي صِحَّتِهِ بِدَيْنٍ وَفِي مَرَضِهِ لِآخَرَ لَمْ يُقَدَّمِ الأَوَّلُ، وَلَوْ أَقَرَّ فِي صِحَّتِهِ أَوْ مَرَضِهِ وَأَقَرَّ وَارِثُهُ بَعْدَ مَوْتِهِ لِآخَرَ لَمْ يُقَدَّمِ الأَوَّلُ فِي الأَصَحِّ، وَلَا يَصِحُّ إِقْرَارُ مُكْرَهٍ، وَيُشْتَرَطُ فِي الْمُقَرِّ لَهُ أَهْلِيَّةُ اسْتِحْقَاقِ الْمُقَرِّ بِهِ، فَلَوْ قَالَ لِهَذِهِ الدَّابَّةِ عَلَيَّ كَذَا فَلَغْوٌ، فَإِنْ قَالَ بِسَبَبِهَا لِمَالِكِهَا وَجَبَ،

---

باوەڕ نەکەن (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، جا لە هەردوو مەسەلەی بێگانەو میراتگردا جیاوازی نیە دان پێداهێنراوەکە: قەرز بێ، یان کەلوپەل بێ.

بەڵام چەند زانایەك ئەو فەرموودەیان هەڵبژاردوە: کە دانهێنانی نەخۆشی‌دەردی پێ‌مردن بۆ میراتگرەکەی قبوڵ ناکرێ ئەگەر تۆمەتی لێبکرێ، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ أَقَرَّ فِي صِحَّتِهِ بِدَيْنٍ) ئەگەر کەسێك لە حاڵەتی‌ساغی‌دا دانی‌هێنا بە قەرزی‌کەسێك، هەم (وَفِي مَرَضِهِ لِآخَرَ) لە حاڵەتی نەخۆشیشی‌دا دانی هێنا بە قەرزی یەکێکی‌تر، ئەوە (لَمْ يُقَدَّمِ الأَوَّلُ) قەرزی یەکەمەکەیان وەپێش دووەمەکە ناخسترێ، بەڵکو هەردووکیان یەکسانن (وَ) هەروەها (لَوْ أَقَرَّ فِي صِحَّتِهِ أَوْ مَرَضِهِ) ئەگەر کەسێك لە حاڵەتی‌ساغی، یان نەخۆشی‌دا دانی‌هێنا بە قەرزی‌کەسێك، هەم (وَأَقَرَّ وَارِثُهُ بَعْدَ مَوْتِهِ لِآخَرَ) میراتگرەکەشی لە دوای مردنی دانی‌هێنا بە قەرزی کەسێکی‌تر لە سەر مردووەکە، لێرەشدا (لَمْ يُقَدَّمِ الأَوَّلُ) یەکەمەکەیان وەپێش دووەمەکە ناخسترێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە میراتگرەکەش جێنیشی مردووەکەیە.

(وَلَا يَصِحُّ إِقْرَارُ مُكْرَهٍ) دانهێنانی زۆرلێکراو -بە ناهەق- تاکو دان بهێنێ دروست نابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأُ وَالنِّسْيَانُ وَمَااسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ حديث حسن رواه ابن ماجه وغيره، لابراوە لە سەر ئوممەتی من: تاوانی هەڵەو لەبیرچوون‌و زۆرلێکردن.

ئینجا بزانە: ئەگەر زۆرلێکردنەکە بە ناهەق نەبێ: وەك دانی بە شتێکی نەزانراودا هێنابێ‌و زۆری لێبکرێ تاکو ڕوونی بکاتەوە، ئەو کاتە دروست دەبێ، هەروەها ئەگەر لە سەر ڕاست گوتن زۆری لێبکرێ: وەك تۆمەتێکی پێکرابێ‌و لێی بدرێ تاکو ڕاستی بڵێ، ئەوەش دروست دەبێ، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا لێدانەکە حەرامە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُشْتَرَطُ فِي الْمُقَرِّ لَهُ) بە مەرج دادەندرێ ئەو کەسەی بۆی دان بە مافەکەدا ئەهێندرێ: (أَهْلِيَّةُ اسْتِحْقَاقِ الْمُقَرِّ بِهِ) لەوانە بێ: دان پێداهێنراوەکەی بدرێتێ‌و دانپێداهێنانەکە بە درۆ دەرنەچێ، کەوابو: (فَلَوْ قَالَ لِهَذِهِ الدَّابَّةِ عَلَيَّ كَذَا) ئەم وڵاغە ئەم شتەی لە سەر من هەیە (فَلَغْوٌ) ئەو دانپێداهێنانە پوچەڵە، چونکە وڵاغ نابێتە خاوەن ملك، بەڵام (فَإِنْ قَالَ: بِسَبَبِهَا لِمَالِكِهَا) ئەگەر گوتی: بە هۆی ئەم وڵاغە، خاوەنەکەی ئەو شتەی لە سەر منە (وَجَبَ) ئەوە واجبە: شتەکە بداتە خاوەنەکەی.

وَلَوْ قالَ لحَمْلِ هِنْد كَذَا بِإرْث أوْ وَصِيَّةٍ لَزِمَهُ، وَإنْ أسْنَدَهُ إلَىجِهَةٍ لاَ تُمْكِنُ فِي حَقِّه فَلَغْوٌ، وَإنْ أطْلَقَ صَحَّ فِيالأظْهَرِ، وَإذَا كَذَّبَ الْمُقَرُّلَهُ الْمُقِرَّ تُرِكَ الْمالُ فِي يَدِه فِيالأصَحِّ، فَإنْ رَجَعَ الْمُقِرُّ فِي حالِ تَكْذِيبِه وَقالَ غَلِطْتُ قُبِلَ قَوْلُهُ فِي الأصَحِّ.
(فَصْلٌ) قَوْلُهُ: لِزَيْدٍ كَذَا، صِيغَةُ إقْرارٍ، وَقَوْلُهُ: عَلَيَّ وَفِي ذِمَّتِي، لِلدَّيْنِ، وَمَعِي وَعِنْدِي، لِلْعَيْنِ،

---

(وَلَوْ قالَ: لِحَمْلِ هِنْدٍ كَذَا بِإرْثٍ أوْ وَصِيَّةٍ) ئەگەر گوتی: کۆرپەی ناو زگی ئەو ئافرەتە ئەو شتەی لە سەر من هەیە، بە هۆی میراتی باوکی، یان بە هۆی وەسێت. ئەوە (لَزِمَهُ) شتەکەی دەکەوێتە سەر، چونکە دەگونجێ کۆرپەی ناو زگ میراتی هەبێ، بەڵام (وَإنْ أسْنَدَهُ إلَى جِهَةٍ لاَ تُمْكِنُ فِي حَقِّه) ئەگەر مافەکەی دایە پاڵ هۆیەکی وەها: کە دەرهەق کۆرپەکە نەدەگونجا، وەك بڵێ: کۆرپەکە سەد دیناری بە قەرز داومێ (فَلَغْوٌ) ئەو وەپاڵدانە پوچەڵە، بەلام (وَإنْ أطْلَقَ) ئەگەر بێ وەپاڵدان گوتی: سەد دیناری ئەو کۆرپەیەم لە سەرە. ئەوە (صَحَّ) دانپێداهێنانەکە دروستە، واتە: پارەکەی دەکەوێتە سەر (فِيالأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.
(وَإذَا كَذَّبَ الْمُقَرُّلَهُ الْمُقِرَّ) هەر کاتێك دان بۆهێنراوەکە، واتە: ئەو کەسەی بۆی دان بە مافەکەدا هێنراوە، گوتی: دانهێنەرەکە درۆ دەکا، هیچ مافێکی منی لە سەر نیە. ئەوە (تُرِكَ الْمالُ فِي يَدِه) ماڵەکە لە دەست دانهێنەرەکەدا دەهێڵدرێتەوەو لێی وەرناگیرێو هەر بە ملکیخۆی دادەندرێ، هەم داوای قەرزەکەشی لێناکرێ ئەگەر دانی بە قەرزێکدا هێنابێ (فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: (فَإنْ رَجَعَ الْمُقِرُّ فِي حالِ تَكْذِيبِه) ئەگەر–لەو حاڵەتەی وەدرۆخستنەوەدا– دانهێنەرەکە لە دانپێداهێنانەکەی پەشیمان بۆوەو (وَقالَ: غَلِطْتُ) گوتی: هەڵەم کردبو، یان بە قەسدی درۆم کردبو (قُبِلَ قَوْلُهُ) قسەکەی وەردەگیرێ (فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە دانپێداهێنانەکەی بەتاڵ بۆتەوەو ماڵەکەش هەر لە ملکایەتی خۆیدا ماوەتەوە.

### ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گۆتەی دانپێداهێنان ﴾

بزانە: مەرجە دانپێداهێنانەکە بە گۆتەیەکی وەها، یان بە نووسینێکی وەها بێ: کە بگەیەنێ مافێکی لە سەرە، کەوابو: (قَوْلُهُ لِزَيْدٍ كَذَا) ئەگەر بڵێ: ئەو شتە بۆ زەیدە. ئەوە (صِيغَةُ إقْرارٍ) ووشەی دانپێداهێنانە (وَقَوْلُهُ) ئەگەر بڵێ: (عَلَيَّ) ئەو شتەی فلانکەس لە سەر منە (وَفِي ذِمَّتِي) یان لە ئەستۆمدایە. ئەوەش (لِلدَّيْنِ) دانپێداهێنانەو بۆ قەرز بە کار دێ (وَمَعِي) ئەگەر بڵێ: ئەو شتەی فلانکەس لەگەڵمە (وَعِنْدِي) یان لە لامە. ئەوەش (لِلْعَيْنِ) دانپێداهێنانەو بۆ کەلوپەل بە کار دێ.

وَلَوْ قالَ: لِي عَلَيْكَ أَلْفٌ، فَقالَ زِنْ أَوْ خُذْ أَوْ زِنْهُ أَوْ خُذْهُ أَوْ اخْتِمْ عَلَيْه أَوْ اجْعَلْهُ فِـي كِيسكَ، فَلَيْسَ بِإقْرارٍ، وَلَوْ قالَ: بَلَى أَوْ نَعَمْ أَوْ صَدَقْتَ أَوْ أَبْرَأْتَنِي مِنْهُ أَوْ قَضَيْتُهُ أَوْ أَنـا مُقِرٌّ بِه، فَهُوَ إِقْرارٌ، وَلَوْ قالَ: أَنا مُقِرٌّ أَوْ أَنا أُقِرُّ بِه، فَلَيْسَ بِإقْرارٍ، وَلَوْ قالَ: أَلَـيْسَ لِـي عَلَيْكَ كَذَا؟ فَقالَ: بَلَى أَوْ نَعَمْ، فَإقْرارٌ، وَفِي نَعَمْ وَجْهٌ، وَلَوْ قالَ: اقْضِ الأَلْفَ الَّذِي لِي عَلَيْكَ، فَقالَ: نَعَمْ أَوْ أَقْضِي غَداً أَوْ أَمْهِلْنِي يَوْماً أَوْ حَتَّى أَقْعُدَ أَوْ أَفْتَحَ الْكِيسَ أَوْ أَجِـدَ، فَإقْرارٌ فِي الأَصَحِّ،

(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ فِي الْمُقَرِّبِه أَنْ لاَ يَكُونَ مِلْكاً لِلْمُقِرِّ، فَلَوْ قالَ: دارِي أَوْ ثَوْبِي أَوْ دَيْنِي

---

(وَلَوْ قالَ: لِي عَلَيْكَ أَلْفٌ) ئەگەر یەکێك گوتی: کاك ئازاد هەزار دینارم لە سەر تۆیە (فَقالَ) ئازادیش لە وەڵامدا گوتی: (زِنْ) بکێشە، یان بژمێرە (أَوْ خُذْ) یان بگرە (أَوْ زِنْهُ) یان بیکێشە (أَوْ خُذْهُ) یان بیگرە (أَوِ اخْتِمْ عَلَيْهِ) یان مۆری لە سەر بدە (أَوِ اجْعَلْهُ فِي كِيسِكَ) یان بیخە ناو کیسەی خۆت (فَلَيْسَ بِإقْرارٍ) ئەو وەڵامدانەوەیە نابێتە دانپێداهێنان، بەڵام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر لە وەڵامدا گوتی: (بَلَى أَوْ نَعَمْ) بەڵێ وایە (أَوْ صَدَقْتَ) یان ڕاست ئەکەی (أَوْ أَبْرَأْتَنِي مِنْهُ) یان لە هەزارەکە گەردەنت ئازاد کردوم، یان گەردەنم ئازاد بکە (أَوْ قَضَيْتُهُ) یان دلومەتەوە (أَوْ أَنا مُقِرٌّ بِهِ) یان من دان بە هەزارەکەدا ئەهێنم (فَهُوَ إِقْرارٌ) ئەو وەڵامدانەوەیە دەبێتە دانپێداهێنان، بەڵام (وَلَوْ قالَ:) ئەگەر لە وەڵامدا گوتی: (أَنا مُقِرٌّ) من دانهێنەرم (أَوْ أَنا أُقِرُّ بِهِ) یان لەمەودوا من دان بە هەزارەکەدا ئەهێنم. (فَلَيْسَ بِإقْرارٍ) ئەوە نابێتە دانپێداهێنان.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر بە ئازادی گوت: (أَلَيْسَ لِي عَلَيْكَ كَذَا؟) ئایا من سەد دینارم لە سەر تۆ نییە؟ (فَقالَ: بَلَى أَوْ نَعَمْ) ئازادیش لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ (فَإقْرارٌ) ئەو وەڵامە دانپێداهێنانە (وَفِي نَعَمْ وَجْهٌ) لەبارەی بەڵێ فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: کە نابێتە دانپێداهێنان (وَلَوْ قالَ: اقْضِ الأَلْفَ الَّذِي لِي عَلَيْكَ) ئەگەر گوتی: ئەو هەزار دینارەی من لە سەر تۆم هەیە، بمدەوە (فَقالَ: نَعَمْ) ئازادیش گوتی: بەڵێ (أَوْ أَقْضِي غَداً) یان گوتی: سبەینێ دەتدەمەوە (أَوْ أَمْهِلْنِي يَوْماً) یان ڕۆژێك مۆڵەتم بدە (أَوْ حَتَّى أَقْعُدَ) یان تا دادەنیشم (أَوْ أَفْتَحَ الْكِيسَ) یان تا کیسەکەم دەکەمەوە (أَوْ أَجِدَ) یان تا دەستم دەکەوێ، یان تا کلیلەکەم دێنم (فَإقْرارٌ) ئەوانە گشتی دانپێداهێنانە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی دان پێداهێنراو: کە مافەکەیە ﴾

(يُشْتَرَطُ فِي الْمُقَرِّبِهِ) بە مەرج دادەنرێ لە دان پێداهێنراوەکەدا: (أَنْ لاَ يَكُونَ مِلْكاً لِلْمُقِرِّ) نابێ مڵکی دانهێنەرەکە بێ، لە کاتی دانهێناندا، کەوابو: (فَلَوْ قالَ: دارِي أَوْ ثَوْبِي أَوْ دَيْنِي

الَّذي عَلَى زَيْد لعَمْرو، فَهُوَ لَغْوٌ، وَلَوْ قالَ: هَذَا لفُلاَن وَكانَ ملْكي إِلَى أَنْ أَقْرَرْتُ بـــه، فَأَوَّلُ كَلاَمه إِقْرارٌ وَآخرُهُ لَغْوٌ، وَلْيَكُنِ الْمُقَرُّبه في يَدالْمُقرِّ ليُسَلَّمَ بالإقْرار للْمُقَرِّلَهُ، فَلَوْ أَقَرَّ وَلَمْ يَكُنْ في يَده ثُمَّ صارَ عُملَ بمُقْتَضَىالإقْرار، فَلَوْ أَقَرَّ بحُرِّيَّة عَبْد في يَدغَيْره ثُـمَّ اشْتَراهُ حُكمَ بحُرِّيَّته، ثُمَّ إنْ كانَ قالَ هُوَ حُرُّالأَصْل فَشراؤُهُ افْتداء، وَإِنْ قـالَ أَعْتَقَـهُ فَافْتداءٌ منْ جهَته وَبَيْعٌ منْ جهَةالْبائع عَلَىالْمَذْهَب فَيَثْبُتُ فيه الْخيارَان للْبـائع فَقَـطْ، وَيَصحُّ الإِقْرارُ بالْمَجْهُول فإذَا قالَ: لَهُ عَلَيَّ شَيْءٌ، قُبلَ تَفْسيرُهُ بكُلِّ ما يُتَمَوَّلُ وَإِنْ قَلَّ،

---

(الَّذِي عَلَى زَيْدٍ لِعَمْرٍو) ئەگەر گوتی: خانووی خۆم، یان جلی خۆم، یان قـەرزی خـۆم کـە لـە سەر زەیدە، بۆ عەمرە (فَهُوَ لَغْوٌ) ئەوە پوچەڵەو بە کەڵك نایێ.

(وَلَوْ قالَ هَذَا لِفُلاَنٍ وَكانَ مِلْكِي إِلى أَنْ أَقْرَرْتُ بِهِ) ئەگەر گوتی: ئەمە هی فلانکەسـە، پێشـدا ملْکی من بوو، تا دانم پێدا هێنا، ئەوە (فَأَوَّلُ كَلاَمِهِ إِقْرارٌ وَآخِرُهُ لَغْوٌ) سـەرەتای قسـەکەی دانپێداهێنانەو کۆتاییەکەشی پوچەڵە.

(وَلْيَكُنِ الْمُقَرُّبِهِ فِي يَدِالْمُقِرِّ) هەم دەبـێ دان پێداهێنراوەکـە لـە دەسـتی دانهێنەرەکـەدا بـێ (لِيُسَلَّمَ بِالإِقْرارِ لِلْمُقَرِّلَهُ) تاکو بە هۆی دانهێنانەکـە تەسلیمی دان بۆهێنراوەکـە بکرێ (فَلَوْ أَقَرَّ وَلَمْ يَكُنْ فِي يَدِهِ) جا ئەگەر دانی بە شتێکدا هێنـاو شتەکەش لـە دەسـتیخۆیدا نـەبو (ثُمَّ صـارَ) ئینجا هاتـە دەسـتی خـۆی (عُمِـلَ بِمُقْتَضَـىالإِقْرارِ) بـەگوێرەی دانپێداهێنانەکـە ڕەفتار دەکرێو شتەکە دەدرێتە دان بۆهێنراوەکە.

(فَلَوْ أَقَرَّ بِحَرِّيَّةِ عَبْدٍ فِي يَدِ غَيْرِهِ) ئەگەر دانی هێنـا بـە ئـازادیی کۆیلەیـەك کـە لـە دەسـتی کەسێکیتردا بوو (ثُمَّ اشْتَراهُ) ئینجا بە خۆی کۆیلەکەی کڕی، ئـەوە (حُكِـمَ بِحُرِّيَّتِـهِ) بڕیـار دەدرێ: کـە کۆیلەکـە ئـازادە (ثُـمَّ) ئینجـا تەماشـادەکەین: (إِنْ كـانَ قـالَ: هُـوَ حُرُّالأَصْـلِ) ئەگەر لە دانهێنانەکەدا گوتبێتی: ئەو کۆیلەیە لە بنچینەدا ئـازادە. ئـەوە (فَشِـراءُهُ افْتِـداءٌ) کڕینەکـەی ڕزگارکردنـە لـە ژێـر دەسـتی گـەورەکـەی، بـەڵام (وَإِنْ قـالَ: أَعْتَقَـهُ) ئەگـەر لـە دانهێنانەکـەدا گـوتبێتی: ئـازادی کـردوە. ئـەوە (فَافْتِـداءٌ مِـنْ جِهَتِـهِ) لـە لای کڕیارەکـەوە کڕینەکـەی ڕزگارکردنـەو (وَبَيْـعٌ مِـنْ جِهَـةِ الْبـائِعِ) لـە لای فرۆشـیارەکەش فرۆشـتنە (عَلَـى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، کـەوابو:(فَيَثْبُـتُ فِيـهِ الْخِيـارَانِ لِلْبـائِعِ فَقَـطْ) هەردوو پەشیمانیی دانیشگەو مەرج تەنها بۆ فرۆشیارەکە دەبن، بۆ کڕیارەکە نابن.

(وَيَصِـحُّ الإِقْـرارُ بِـالْمَجْهُولِ) دانهێنـان بـە شـتێکی نەزانـدراودا دروسـت دەبـێو داوای ڕوونکردنـەوەی لێدەکرێ، کـەوابو: (فَـإِذَا قـالَ: لَـهُ عَلَـيَّ شَـيْءٌ) هـەر کاتێـك گـوتی: ئـازاد شتێکی لە سەر من هەیە. ئەوە (قُبِلَ تَفْسِيرُهُ بِكُلِّ مـا يُتَمَـوَّلُ وَإِنْ قَـلَّ) لێی قبـوڵ دەکرێ: شتەکە بە هـەر مـاڵێك ڕوون بکاتەوە، هـەرچەند ماڵەکەش کەم بێ، وەك بڵـێ: مـەبەسـتم

وَلَوْ فَسَّرَهُ بما لايُتَموَّلُ لَكِنَّهُ منْ جنسه كَحَبَّةحنطَة، أَوْ بما يَحلُّ اقْتناؤُهُ كَكَلْب مُعَلَّم وَسَرْجين قُبلَ فيالأَصَحِّ، وَلايُقْبَلُ بما لايُقْتَنى كَخنْزير وَكَلْب لاَ نَفْعَ فيه، وَلاَ بعيادَة وَرَدِّ سَلامٍ، وَلَوْ أَقَرَّ بمالٍ أَوْ مالٍ عَظيمٍ أَوْ كَبيرٍ أَوْ كَثيرٍ قُبلَ تَفْسيرُهُ بما قَلَّ منْهُ، وَكَذَا بالْمُسْتَوْلَدَة فيالأَصَحِّ، لابكَلْب وَجلْد مَيْتَة، وَقَوْلُهُ: لَهُ كَذَا، كَقَوْله: شَيْءٌ، وَقَوْلُهُ: شَيْءٌ شَيْءٌ أَوْ كَذا كَذَا، كَما لَوْ لَمْ يُكَرِّرْ، وَلَوْ قالَ: شَيْءٌ وَشَيْءٌ أَوْ كَذا وكَذا، وَجَبَ شَيْئانِ، وَلَوْ قالَ: كَذَا درْهَماً أَوْ رَفَعَ الدِّرْهَمَ أَوْ جَرَّهُ، لَزِمَهُ درْهَمٌ،

---

یەك فلس بوو. (وَ) هەروەها (لَوْ فَسَّرَهُ بِما لاَ یُتَمَوَّلُ) ئەگەر شتەكەی ڕوون كردەوە بە شتێكی وەها: كە بە ماڵ دانەندرا (لَكِنَّهُ مِنْ جِنْسِهِ كَحَبَّةِ حِنْطَةٍ) بەلام لە ڕەگەزی ماڵ بوو، وەك بڵێ: مەبەستم یەك دەنكە گەنم بوو (أَوْ) یان ڕوونی كردەوە (بِما یَحِلُّ اقْتِناءُهُ) بە شتێكی وەها: كە لە ڕەگەزی ماڵ نەبو، بەلام ڕاگرتنی دروست بوو (كَكَلْبٍ مُعَلَّمٍ) وەك بڵێ: سەگێكی فێرە ڕاوكراوم مەبەست بوو، هەم (وَسِرْجِینٍ) وەك بڵێ: مەبەستم زبڵ بوو، ئەو كاتەش (قُبِلَ) ئەو ڕوونكردنەوەیەی لێ قبوڵ دەكرێ (فِیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام (وَلاَ یُقْبَلُ بِما لاَ یُقْتَنى) لێی قبوڵ ناكرێ: ڕوونی بكاتەوە بە شتێكی وەها: كە ڕاگرتنی دروست نەبێ: (كَخِنْزِیرٍ وَكَلْبٍ لاَ نَفْعَ فِیهِ) وەك بڵێ: مەبەستم بەراز، یان سەگێكی بێسود بوو (وَلاَ بِعِیادَةٍ وَرَدِّ سَلامٍ) هەم لێی قبوڵ ناكرێ: بڵێ: مەبەستم سەردانی نەخۆش، یان وەڵامی سەلام بوو.

(وَلَوْ أَقَرَّ بِمالٍ) ئەگەر دانی هێنا بە ماڵێك (أَوْ مالٍ عَظِیمٍ أَوْ كَبِیرٍ) یان بە ماڵێكی گەورە (أَوْ كَثِیرٍ) یان بە ماڵێكی زۆر، وەك بڵێ: ماڵێكی گەورەی فلانكەسم لە لایە، یان ماڵێكی زۆری ئەوم لە سەرە، ئەوە (قُبِلَ تَفْسِیرُهُ بِما قَلَّ مِنْهُ) لێی قبوڵ دەكرێ ڕوونی بكاتەوە بە ماڵێكی كەم (وكَذَا) هەروەها لێی قبوڵ دەكرێ ڕوونی بكاتەوە (بِالْمُسْتَوْلَدَةِ) بەو (جاریة)ی منداڵی لە گەورەكەی بووە (فِیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (لاَ بِكَلْبٍ وَجِلْدِ مَیْتَةٍ) بەلام لێی قبوڵ ناكرێ بڵێ: مەبەستم سەگ، یان پێستەی مرداربووە.

(وَقَوْلُهُ) ئەگەر بڵێ: (لَهُ كَذَا) ئەوەندەی لە سەر منە (كَقَوْلِهِ شَیْءٌ) وەك بڵێ: شتێكی لە سەر من هەیە، لە هەردووكیان قبوڵ دەكرێ بە شتێكیكەم ڕوونی بكاتەوە (وَقَوْلُهُ) ئەگەر بڵێ: (شَیْءٌ شَیْءٌ) شتێك، شتێك (أَوْ) یان بڵێ: (كَذَا كَذَا) ئەوەندە، ئەوەندە. ئەوە (كَما لَوْ لَمْ یُكَرِّرْ) وەك دووبارە نەكرابنەوە، وەهایە، بەلام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (شَیْءٌ وَشَیْءٌ) شتێكو شتێك (أَوْ) یان بڵێ: (كَذَا وكَذَا) ئەوەندەو ئەوەندە. ئەو كاتە (وَجَبَ شَیْئانِ) دوو شتی لە سەر واجب دەبن، هەرچەند كەمیش بن.

(وَلَوْ قالَ: كَذَا دِرْهَماً أَوْ رَفَعَ الدِّرْهَمَ أَوْ جَرَّهُ) ئەگەر گوتی: ئەوەندە دیرهەمەی ئازادم لە لایە، ئەوە (لَزِمَهُ دِرْهَمٌ) دیرهەمێكی لە سەر واجب دەبێ، جا بۆر بداتە (درهم)، یان ژێری

وَالْمَذْهَبُ: أَنَّهُ لَوْ قالَ: كَذَا وَكَذَا دِرْهَماً بِالنَّصْبِ، وَجَبَ دِرْهَمان، وَأَنَّهُ لَوْ رَفَعَ أَوْ جَرَّ فَدِرْهَمٌ، وَلَوْ حَذَفَ الْواوَ فَدِرْهَمٌ فِي الأَحْوالِ، وَلَوْ قالَ: أَلْفٌ وَدِرْهَمٌ، قُبِلَ تَفْسِيرُ الأَلْفِ بِغَيْرِ الدَّراهِمِ، وَلَوْ قالَ: خَمْسَةٌ وَعِشْرُونَ دِرْهَماً، فَالْجَمِيعُ دَراهِمُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قالَ: اَلدَّراهِمُ الَّتِي أَقْرَرْتُ بِها ناقِصَةُ الْوَزْنِ، فَإِنْ كانَتْ دَراهِمُ الْبَلَدِ تامَّةَ الْوَزْنِ فَالصَّحِيحُ قَبُولُهُ إِنْ ذَكَرَهُ مُتَّصِلاً، وَمَنْعُهُ إِنْ فَصَلَهُ عَنِ الإِقْرارِ، وَإِنْ كانَتْ ناقِصَةً قُبِلَ إِنْ وَصَلَهُ وَكَذَا إِنْ فَصَلَهُ فِي النَّصِّ، وَالتَّفْسِيرُ بِالْمَغْشُوشَةِ كَهُوَ بِالنَّاقِصَةِ، وَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ مِنْ دِرْهَمٍ إِلَى عَشَرَةٍ، لَزِمَهُ تِسْعَةٌ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ قالَ: دِرْهَمٌ فِي عَشَرَةٍ، فَإِنْ أَرادَ الْمَعِيَّةَ لَزِمَهُ

---

بداتێ (وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لَوْ قالَ: كَذَا وَكَذَا دِرْهَماً بِالنَّصْبِ) ئەگەر بڵێ: ئەوەندەو ئەوەندە دیرهەمە. ئەوە (وَجَبَ دِرْهَمانِ) دوو دیرهەمی لە سەر واجب دەبن (وَأَنَّهُ لَوْ رَفَعَ أَوْ جَرَّ فَدِرْهَمٌ) ئەگەر بۆر بداتە (درهم)، یان ژێری بداتێ، ئەوە دیرهەمێکی لە سەر واجبە، بەلام (وَلَوْ حَذَفَ الْواوَ) ئەگەر پیتی (واو) نەڵێ، ئەوە (فَدِرْهَمٌ فِي الأَحْوالِ) لە هەموو حاڵەتەكاندا یەك دیرهەمی لەسەرە.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر بڵێ: (أَلْفٌ وَدِرْهَمٌ) هەزارێكو دیرهەمێكی لە لامە، ئەوە (قُبِلَ تَفْسِيرُ الأَلْفِ بِغَيْرِ الدَّراهِمِ) لێی قبوڵ دەكرێ: هەزارەكە بە شتێكی -جگە لە دیرهەم- ڕوون بكاتەوە (وَلَوْ قالَ خَمْسَةٌ وَعِشْرُونَ دِرْهَماً) ئەگەر گوتی بیستو پێنج دیرهەم، ئەوە (فَالْجَمِيعُ دَراهِمُ عَلَى الصَّحِيحِ) هەموو بیستو پێنجەكە بە دیرهەم ڕوون دەكرێتەوە.

(وَلَوْ قالَ: اَلدَّراهِمُ الَّتِي أَقْرَرْتُ بِها ناقِصَةُ الْوَزْنِ) ئەگەر گوتی: ئەو دیرهەمانەی دانم پێدا هێناون كێشیان ناتەواوە، ئەوە تەماشا دەكرێ: (فَإِنْ كانَتْ دَراهِمُ الْبَلَدِ تامَّةَ الْوَزْنِ) ئەگەر دیرهەمەكانی ئەو شوێنە كێشیان تەواو بوو (فَالصَّحِيحُ قَبُولُهُ إِنْ ذَكَرَهُ مُتَّصِلاً) ئەو قسەیەی لێقبوڵ دەكرێ ئەگەر لەگەڵ دانپێداهێنانەكەدا گوتبێتی: كێشان ناتەواوە (وَمَنْعُهُ إِنْ فَصَلَهُ عَنِ الإِقْرارِ) بەلام لێی قبوڵ ناكرێ ئەگەر گوتەكەی لە دانپێداهێنانەكە جیا كردبێتەوە (وَإِنْ كانَتْ ناقِصَةً) ئەگەر دیرهەمەكانی شوێنەكە ناتەواو بون، ئەو كاتە (قُبِلَ إِنْ وَصَلَهُ وَكَذَا إِنْ فَصَلَهُ فِي النَّصِّ) لێی قبوڵ دەكرێ: جا لەگەڵ دانپێداهێنانەكەدا گوتبێتی، یان بە جیا.

(وَالتَّفْسِيرُ بِالْمَغْشُوشَةِ) ڕوونكردنەوەی دیرهەمەكان بە دیرهەمی فێڵ تێداكراو (كَهُوَ بِالنَّاقِصَةِ) وەك ڕوونكردنەوەیانە بە دیرهەمی ناتەواو، لە گشت باسەكانیڕابردوودا (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (لَهُ عَلَيَّ مِنْ دِرْهَمٍ إِلَى عَشَرَةٍ) لە دیرهەمێك تا دە دیرهەمی لە سەر منە. ئەوە (لَزِمَهُ تِسْعَةٌ فِي الأَصَحِّ) نۆ دیرهەمی لە سەر واجب دەبن (وَإِنْ قالَ: دِرْهَمٌ فِي عَشَرَةٍ) ئەگەر گوتی: دیرهەمێك لە دە دیرهەمدا لە سەر منی هەیە. ئەوە (فَإِنْ أَرادَ الْمَعِيَّةَ لَزِمَهُ

أَحَدَعَشَرَ، أَوِ الْحِسابَ فَعَشَرَةٌ، وَإِلاَّ فَدِرْهَمٌ.

(فَصْلٌ) قالَ: لَهُ عِنْدِي سَيْفٌ فِي غِمْدٍ أَوْ ثَوْبٌ فِي صُنْدُوقٍ، لاَيَلْزَمُهُ الظَّرْفُ، أَوْ غِمْدٌ فِيهِ سَيْفٌ أَوْ صُنْدُوقٌ فِيهِ ثَوْبٌ، لَزِمَهُ الظَّرْفُ وَحْدَهُ، أَوْ عَبْدٌ عَلَى رَأْسِهِ عِمامَةٌ، لَمْ تَلْزَمْهُ الْعِمامَةُ عَلَى الصَّحِيحِ، أَوْ دابَّةٌ بِسَرْجِها أَوْ ثَوْبٌ مُطَرَّزٌ، لَزِمَهُ الْجَمِيعُ، وَلَوْ قالَ: فِي مِيراثِ أَبِي أَلْفٌ، فَهُوَ إِقْرارٌ عَلَى أَبِيهِ بِدَيْنٍ، وَلَوْ قالَ فِي مِيراثِي مِنْ أَبِي أَلْفٌ، فَهُوَ وَعْدُ هِبَةٍ، وَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ دِرْهَمٌ دِرْهَمٌ، لَزِمَهُ دِرْهَمٌ، فَإِنْ قالَ: وَدِرْهَمٌ، لَزِمَهُ دِرْهَمانِ، وَلَوْ قالَ: لَهُ دِرْهَمٌ

---

أَحَدَعَشَرَ) ئەگەر مەبەستی لەگەڵ بێ، یانزە دیرهەمی لە سەر واجب دەبن (أَوِ الْحِسابَ فَعَشَرَةٌ) یان ئەگەر مەبەستی لێکدانی ژمارە بێ: دە دیرهەمی لە سەر واجب دەبن (وَإِلاَّ) ئەگەر هیچیانی مەبەست نەبێ (فَدِرْهَمٌ) دیرهەمێکی لە سەر واجب دەبێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەند جۆرێکی دانپێداهێنان ﴾

(قالَ) ئەگەر یەکێك گوتی: (لَهُ عِنْدِي سَيْفٌ فِي غِمْدٍ) ئازاد شمشێرێکی لە کالانێکدا لە لای منە (أَوْ ثَوْبٌ فِي صُنْدُوقٍ) یان جلێکی لە سندوقێکدا لە لای منە. ئەوە (لاَ يَلْزَمُهُ الظَّرْفُ) کالانەکەو سندوقەکەی ناکەونە سەر، بەڵکو تەنها شمشێرو جلەکەی دەکەونە سەر (أَوْ) یان ئەگەر گوتی: (غِمْدٌ فِيهِ سَيْفٌ) کالانێکی لە لای منە شمشێرێکی تێدایە (أَوْ صُنْدُوقٌ فِيهِ ثَوْبٌ) یان سندوقێکی لە لای منە جلێکی تێدایە، ئەوە –بە پێچەوانەی ڕابردوو– (لَزِمَهُ الظَّرْفُ وَحْدَهُ) تەنها کالانەکەو سندوقەکەی دەکەونە سەر (أَوْ) یان گوتی: (عَبْدٌ عَلَى رَأْسِهِ عِمامَةٌ) کۆیلەیەکی لە لامە مێزەرێکی لە سەرە (لَمْ تَلْزَمْهُ الْعِمامَةُ) مێزەرەکەی ناکەوێتە سەر (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(أَوْ) یان گوتی: (دابَّةٌ بِسَرْجِها) وولاغێکی بە زینەکەیەوە، یان بە کورتانەکەیەوە لە لامە (أَوْ ثَوْبٌ مُطَرَّزٌ) یان جلێکی قەیتان لێدراوی لە لای منە. ئەوە (لَزِمَهُ الْجَمِيعُ) گشتی دەکەونە سەر. واتە: وولاغەکەو زینەکەو جلەکەو قەیتانەکە (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (فِي مِيراثِ أَبِي أَلْفٌ) ئازاد لە میراتیباوکمدا هەزار دیناری هەیە (فَهُوَ إِقْرارٌ عَلَى أَبِيهِ بِدَيْنٍ) ئەوە دانهێنانێکە –بە قەرزێك– لە سەر باوکیخۆی، بەڵام (وَلَوْ قالَ فِي مِيراثِي مِنْ أَبِي أَلْفٌ) ئەگەر گوتی: لە میراتیمن کە لە باوکم وەرم گرتوە هەزار دیناری هەیە (فَهُوَ وَعْدُ هِبَةٍ) ئەوە گفتی بەخشینێکە: کە هەزار دیناری بە بەخشین بداتێ، واتە: لە سەری واجب نیە.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (لَهُ عَلَيَّ دِرْهَمٌ دِرْهَمٌ) ئازاد دیرهەمێك دیرهەمێکی لە سەر منە. ئەوە (لَزِمَهُ دِرْهَمٌ) یەك دیرهەمی دەکەوێتە سەر، بەڵام (فَإِنْ قالَ: وَدِرْهَمٌ) ئەگەر گوتی: دیرهەمێك و دیرهەمێکی لە سەر منە. ئەوە (لَزِمَهُ دِرْهَمانِ) دوو دیرهەمی دەکەونە سەر (وَلَوْ قالَ: لَهُ دِرْهَمٌ

وَدِرْهَمٌ وَدِرْهَمٌ، لَزِمَهُ بِالأَوَّلَيْنِ دِرْهَمان وَأَمَّاالثَّالِثُ فَإِنْ أَرادَ بِه تَأْكِيدَالثَّانِي لَمْ يَجِبْ بِـهِ شَيْءٌ، وَإِنْ نَوَى الإِسْتِئْنافَ لَزِمَهُ ثالِثٌ، وَكَذَا إِنْ نَوَى تَأْكِيدَالأَوَّلِ أَوْ أَطْلَقَ فِي الأَصَحِّ، وَمَتَى أَقَرَّ بِمُبْهَمٍ كَشَيْءٍ وَثَوْبٍ وَطُولِبَ بِالْبَيانِ فَامْتَنَعَ فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ يُحْبَسُ، وَلَـوْ بَيَّنَ وَكَذَّبَهُ الْمُقَرُّلَهُ فَلْيُبَيِّنْ وَلْيَدَّعِ وَالْقَوْلُ قَوْلُ الْمُقِرِّ فِي نَفْيِه، وَلَوْ أَقَرَّ لَهُ بِأَلْفٍ ثُمَّ أَقَـرَّ لَـهُ بِأَلْفٍ فِي يَوْمٍ آخَرَ لَزِمَهُ أَلْفٌ فَقَطْ، وَإِن اخْتَلَفَ الْقَدْرُ دَخَلَ الأَقَلُّ فِي الأَكْثَرِ،

---

(وَدِرْهَمٌ وَدِرْهَمٌ) ئەگەر گوتی: دیرهەمێكو دیرهەمێكو دیرهەمێكی لە سەر منە. ئەوە (لَزِمَهُ بِالأَوَّلَيْنِ دِرْهَمانِ) بە یەكەمەكەو دووەمەكە دوو دیرهەمی دەكەونە سەر (وَأَمَّا الثَّالِثُ) بەڵام دیرهەمەكەیسێیەم (فَإِنْ أَرادَ بِـهِ تَأْكِيدَالثَّانِي) ئەگەر مەبەستی دووپاتكردنەوەی دووەمەكە بوبێ (لَمْ يَجِبْ بِهِ شَيْءٌ) هیچی بە سێیەمەكە ناكەوێتە سەر.

بەڵام (وَإِنْ نَوَىالإِسْتِئْنافَ) ئەگەر مەبەستی بنیاتنـان بێ (لَزِمَـهُ ثالِثٌ) ئـەوە دیرهەمەكەی سێیەمیشی دەكەوێتە سەر (وَكَذَا) هـەروەها سێیەمەكەی دەكەوێتە سەر (إِنْ نَوَىتَأْكِيدَ الأَوَّلِ أَوْ أَطْلَقَ) ئەگەر مەبەستی دووپاتكردنەوەییەكەمەكە بوبێ، یـان هـیچ دووپاتكردنەوەیەكی مەبەست نەبوبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَمَتَى أَقَرَّ بِمُبْهَمٍ) هەر كاتێك دانیهێنا بە شتێكی نەناسراودا (كَشَيْءٍ) وەك بڵێ: شتێكی لە لای منە (وَثَوْبٍ) هەم وەك بڵێ: جلێكی لە لای منە (وَ) لەو حاڵەتەشدا (طُولِبَ بِالْبَيانِ) دانهێنەرەكە داوای ڕوونكردنـەوەی لێكرا (فَامْتَنَعَ) جا ئـەویش ڕوونـی نـەكردەوە، ئـەوە (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست: (أَنَّهُ يُحْبَسُ) ئەو دانهێنەرە دەخرێتە بەندیخانـە، واتـە: تـا ڕوونی دەكاتەوە.

بەڵام (وَلَوْ بَيَّنَ) ئەگەر دانهێنەرەكە ڕوونـی كردەوەو (وَكَذَّبَـهُ الْمُقَرُّلَـهُ) دان بۆهێنراوەكەش باوەڕی پێنەكردو گوتی: وا نیـە (فَلْيُبَيِّنْ) بـا دان بۆهێنراوەكە بەخۆی ڕوونـی بكاتـەوە، ئینجا (وَلْيَدَّعِ) با داوای شتەكەش لـە دانهێنەرەكـە بكا، جا لـەو كێشـەیەدا (وَالْقَـوْلُ) ئـەو قسەیەی كە وەردەگیرێ (قَوْلُ الْمُقِرِّ فِينَفْيِهِ) قسەیدانهێنەرەكەیە كـە سوێند بخواو بڵێ: ئەو شتەی لێی داوا كردوم لە سەرم نیە.

(وَلَوْ أَقَرَّ لَهُ بِأَلْفٍ) ئەگەر دانی هێنا بە هەزار دینار بۆ ئازاد (ثُمَّ أَقَرَّ لَـهُ بِأَلْفٍ فِـي يَوْمٍ آخَرَ) ئینجا لە ڕۆژێكیتریشدا دانی هێنا بە هەزار دینار هەر بۆ ئازاد، ئەوە (لَزِمَـهُ أَلْـفٌ فَقَـطْ) تـەنها هەزارێكی دەكەوێتە سەر، چونكە دانهێنانەكە هەواڵێكە دووبارە گوتراوەتەوە.

(وَ) هەروەها (إِنِ اخْتَلَفَ الْقَدْرُ) ئەگەر ئەندازەكەش لێك جیاواز بێ، وەك ڕۆژێك بڵێ: هـەزار دیناری لە سـەر منـە. ڕۆژێكیتـریش بڵـێ: پێنجسـەد دینـاری لـە سـەر منـە. ئـەوەش (دَخَلَ الأَقَلُّ فِيالأَكْثَرِ) كەمەكە دەچێتە ناو زۆرەكەو تەنها هەزار دیناری دەكەوێتە سەر.

فَلَوْ وَصَفَهُمَا بِصِفَتَيْنِ مُخْتَلِفَتَيْنِ أَوْ أَسْنَدَهُما إِلَى جِهَتَيْنِ أَوْ قالَ: قَبَضْتُ يَوْمَ السَّبْتِ عَشَرَةً، ثُمَّ قالَ: قَبَضْتُ يَوْمَ الأَحَد عَشَرَةً، لَزِما، وَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ مِنْ ثَمَنِ خَمْرٍ أَوْ كَلْبٍ، أَوْ أَلْفٌ قَضَيْتُهُ، لَزِمَهُ الأَلْفُ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ قالَ: مِنْ ثَمَنِ عَبْدٍ لَمْ أَقْبِضْهُ إِذَا سَلَّمَهُ سَلَّمْتُ، قُبِلَ عَلَى الْمَذْهَبِ وَجُعِلَ ثَمَناً، وَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ إِنْ شاءَ اللهُ، لَمْ يَلْزَمْهُ شَيْءٌ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ قالَ: أَلْفٌ لاَ يَلْزَمُ، لَزِمَهُ، وَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ، ثُمَّ جاءَ بِأَلْفٍ وَقالَ: أَرَدْتُ بِهِ هَذَا وَهُوَ وَدِيعَةٌ،

---

بەلام (فَلَوْ وَصَفَهُمَا بِصِفَتَيْنِ مُخْتَلِفَتَيْنِ) ئەگەر دوو هەزارەکانی هەر یەکە بە جۆرێك باس کرد، وەك بڵێ: هەزار دیناری دروشتەی لە لای منە، ڕۆژێکیتریش بڵێ: هەزار دیناری ووردەی لە لای منە (أَوْ أَسْنَدَهُما إِلَى جِهَتَيْنِ) یان دوو هەزارەکانی دانە پاڵ دوو لای لێك جیاواز، وەك بڵێ: هەزار دینار پارەی فرۆشراوێکی لە سەر منە. جارێکیتریش بڵێ: هەزار دینار قەرزی لە سەر منە. (أَوْ قالَ: قَبَضْتُ يَوْمَ السَّبْتِ عَشَرَةً) یان گوتی: ڕۆژی شەممە دە دینارم لێی وەرگرتوە (ثُمَّ قالَ قَبَضْتُ يَوْمَ الأَحَدِ عَشَرَةً) ئینجا گوتی: ڕۆژی یەك شەممە دە دینارم لێی وەرگرتوە. لەو سێ مەسەلانەدا (لَزِما) هەردوو ئەندازەکانی دەکەونە سەر، واتە: دوو هەزارەکانو دوو دەیەکان.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ مِنْ ثَمَنِ خَمْرٍ أَوْ كَلْبٍ) ئازاد هەزار دیناری پارەی شەراب، یان پارەی سەگێکی لە سەر منە (أَوْ أَلْفٌ قَضَيْتُهُ) یان گوتی: هەزار دیناری لە سەر منە بەلام داومەتەوە، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (لَزِمَهُ الأَلْفُ) هەزارەکەی دەکەوێتە سەر (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەلام (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (مِنْ ثَمَنِ عَبْدٍ لَمْ أَقْبِضْهُ إِذَا سَلَّمَهُ سَلَّمْتُ) هەزار دیناری پارەی کۆیلەیەکی لە سەر منە، کۆیلەکەم وەرنەگرتوە، هەر کاتێك کۆیلەکەم تەسلیم بکا، پارەکەی تەسلیم دەکەم (قُبِلَ) ئەو قسەیەی لێقبول دەکرێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَجُعِلَ ثَمَناً) هەزار دینارەکە دەکرێتە پارەی کۆیلە فرۆشراوەکە.

(وَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ إِنْ شاءَ اللهُ) ئەگەر گوتی: هەزار دیناری لە سەر منە ئەگەر خوا حەز بکا. ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ شَيْءٌ) هیچی لە سەر واجب نابێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە حەزکردنو حەزنەکردنی خوا لە ئێمە دیار نیە (وَلَوْ قالَ: أَلْفٌ لاَ يَلْزَمُ) ئەگەر گوتی: هەزار دیناری لە سەر منەو هەزارەکە واجب نابێ، ئەوە (لَزِمَهُ) هەزارەکەی لە سەر واجب دەبێ بیداتێ.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ) ئازاد هەزار دیناری لە سەر منە (ثُمَّ جاءَ بِأَلْفٍ وَقالَ) ئینجا دانهێنەرەکە هەزار دیناری هێناو گوتی: (أَرَدْتُ بِهِ هَذَا، وَهُوَ وَدِيعَةٌ) مەبەستم

فَقالَ الْمُقَرُّلَهُ: لي عَلَيْهِ أَلْفٌ آخَرُ، صُدِّقَ الْمُقِرُّ-فِي الأَظْهَرِ- بِيَمِينِهِ، فَإِنْ كَانَ قَالَ: فِي ذِمَّتِي أَوْ دَيْناً صُدِّقَ الْمُقَرُّلَهُ عَلَى الْمَذْهَبِ، قُلْتُ: فَإِذَا قَبِلْنَا التَّفْسِيرَ بِالْوَدِيعَةِ فَالأَصَحُّ أَنَّها أَمانَةٌ فَيُقْبَلُ دَعْواهُ التَّلَفَ بَعْدَالإِقْرارِ وَدَعْوَى الرَّدِّ، وَإِنْ قالَ: لَهُ عِنْدِي أَوْ مَعِي أَلْفٌ، صُدِّقَ فِي دَعْوَى الْوَدِيعَةِ وَالرَّدِّ وَالتَّلَفِ قَطْعاً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ أَقَرَّ بِبَيْعٍ أَوْ هِبَةٍ وَإِقْباضٍ ثُمَّ قالَ كانَ فاسِداً وَأَقْرَرْتُ لِظَنِّي الصِّحَّةَ، لَمْ يُقْبَلْ وَلَهُ تَحْلِيفُ الْمُقَرِّلَهُ، فَإِنْ نَكَلَ

---

ئەم هەزار دینارە بوو، ئەم هەزارەش-ئازاد- بە سپاردن لە لای من دایناب‌و (فَقالَ الْمُقَرُّلَهُ: لي عَلَيْهِ أَلْفٌ آخَرُ) دان بۆهێنراوەکەش-واتە: ئازاد- گوتی: جگە لەم هەزارە، هەزاریتریشم لە سەر تۆیە. ئەوە (صُدِّقَ الْمُقِرُّ-فِي الأَظْهَرِ- بِيَمِينِهِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: باوەڕ بە دانهێنەرەکە دەکرێ، ئەگەر سوێند بخوا: (کە لە سەری واجب نیە هەزاریتری بداتێ). بەلام هەر لەم مەسەلەیەدا (فَإِنْ كانَ قالَ) ئەگەر گۆتبێتی (فِي ذِمَّتِي) هەزار دیناری لە ئەستۆی مندا هەیە (أَوْ دَيْناً) یان هەزار دیناری بە قەرز لە لای منە، ئینجا هەزار دیناری هێناو گوتی: مەبەستم ئەم هەزارە بوو، کە بە سپاردن لە لای من داینابو، ئەو کاتە (صُدِّقَ الْمُقَرُّ لَهُ) بە سوێند باوەڕ بە دان بۆهێنراوەکە دەکرێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (فَإِذَا قَبِلْنا التَّفْسِيرَ بِالْوَدِيعَةِ) هەر کاتێك لێی قبول بکەین: هەزار دینارەکە بە سپاردن ڕوون بکاتەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّها أَمانَةٌ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەو هەزارە ئەمانەتێکە لە لایدانهێنەرەکە، کەوابو:(فَيُقْبَلُ دَعْواهُ التَّلَفَ بَعْدَ الإِقْرارِ) بە سوێندخواردن لێی قبول دەکرێ بلێ: لە دوای دانهێنانەکەم هەزارەکە فەوتا (وَ) هەروەها بە سوێند لێی قبول دەکرێ (دَعْوَى الرَّدِّ) کە بلێ: لە دوای دانهێنانەکەم بۆ خاوەنەکەیم گەڕاندەوە (وَإِنْ قالَ) ئەگەر بلێ: (لَهُ عِنْدِي أَوْ مَعِي أَلْفٌ) هەزار دیناری لە لای منە، یان لەگەل منە. ئەوە (صُدِّقَ فِي دَعْوَى الْوَدِيعَةِ وَالرَّدِّ وَالتَّلَفِ قَطْعاً) بە سوێند باوەڕی پێ دەکرێ ئەگەر بلێ: بە سپاردن لە لای منە. یان بلێ: بۆ خاوەنەکەیم گەڕاندەوە. یان بلێ: فەوتا. (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَلَوْ أَقَرَّ بِبَيْعٍ) ئەگەر دانی هێنا بە فرۆشتنێك (أَوْ هِبَةٍ وَإِقْباضٍ) یان دانی هێنا بە بەخشینیشتێكو دانەدەست پێبەخشراوەکە (ثُمَّ قالَ كانَ فاسِداً) ئینجا دانهێنەرەکە گوتی: فرۆشتنەکە، یان بەخشینەکە بەتالو دانەمەزراو بوو، بەلام (وَأَقْرَرْتُ لِظَنِّي الصِّحَّةَ) بۆیێ دانم هێنا چونکە وا تێگەیشتبوم دروست بووە. ئەوە (لَمْ يُقْبَلْ) قسەی دانەمەزرانەکەی لێ قبول ناکرێ، بەلام (وَلَهُ تَحْلِيفُ الْمُقَرِّلَهُ) بۆی هەیە دان بۆهێنراوەکە سوێند بدا: لە سەر دانەمەزرانی فرۆشتن، یان بەخشینەکە (فَإِنْ نَكَلَ) جا ئەگەر دان بۆهێنراوەکە سوێندی

حَلَفَ الْمُقرُّ وَبَرِئَ، وَلَوْ قالَ: هَذه الدَّارُ لزَيْد بَلْ لعَمْرو أَوْ غَصَبْتُها منْ زَيْد بَلْ منْ عَمْرو سُلِّمَتْ لزَيْد، وَالأَظْهَرُ أَنَّ الْمُقرَّ يَغْرَمُ قيمَتَها لعَمْرو بالإقْرار، وَيَصحُّ الإسْتثْناءُ إن اتَّصلَ وَلَمْ يَسْتَغْرقْ، فَلَوْ قالَ: لَهُ عَلَيَّ عَشَرَةٌ إلاَّ تسْعَةً إلاَّ ثَمانيَةً لَزمَهُ تسْعَةٌ، وَيَصحُّ منْ غَيْرالْجنس: كَأَلْف إلاَّ ثَوْباً، وَيُبَيِّنُ بثَوْب قيمَتُهُ دُونَ أَلْف، وَمنَ الْمُعَيَّن: كَهَذه الدَّارُ لَهُ إلاَّ هَذَاالْبَيْتَ، أَوْ هَذه الدَّاراهمُ لَهُ إلاَّ ذَاالدِّرْهَمَ، وَفيالْمُعَيَّنِ وَجْهٌ شاذٌ، قُلْتُ: لَوْ قالَ: هَؤُلاَء الْعَبيدُ لَهُ إلاَّ واحداً قُبلَ وَرَجَعَ فيالْبَيان إلَيْه،

---

نەخوارد، ئەو كاتە (حَلَفَ الْمُقرُّ) دانهێنەرەكە سوێندی گەڕاندرایەوە دەخوا: (كە فرۆشتنەكە، یان بەخشینەكە دانەمەزراوە). ئینجا (وَبَرِئَ) لە مافەكە ئازاد دەبێو بڕیاری دانەمەزراندنیان بۆ دەدرێ، چونكە گەڕاندنەوەی سوێند وەكو دانپێداهێنانە.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (هَذه الدَّارُ لزَيْد بَلْ لعَمْرو) ئەم خانووە هی (زەید)ە، بەڵكو هی (عەمر)ە (أَوْ) یان گوتی: (غَصَبْتُها منْ زَيْد بَلْ منْ عَمْرو) داگیرم كردوە لە (زەید)، بەڵكو لە (عەمر). ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا ماڵەكەی لێوەردەگیرێ، هەم (سُلِّمَتْ لزَيْد) تەسلیمی زەید دەكرێ، ئینجا (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ الْمُقرَّ يَغْرَمُ قيمَتَها لعَمْرو بالإقْرار) دانهێنەرەكە نرخی دان پێداهێنراوەكەش -لە تۆڵە- دەداتە عەمر بە هۆی دانپێداهێنانەكەی بۆ ئەویش.

(وَيَصحُّ الإسْتثْناءُ) لە دانهێناندا جیاكردنەوە دروستە (إن اتَّصلَ) بەو مەرجەی جیاكراوەكە -بە بێ نێوان- لەگەڵ دان پێداهێنراوەكەدا بگوترێ، هەم (وَلَمْ يَسْتَغْرقْ) گشت دان پێداهێنراوەكەش نەگرێتەوە، كەواتە: ئەگەر بڵێ: دە دیناری لە سەر منە دە دینار نەبێ، ئەو جیاكردنەوەیە دانامەزرێ (فَلَوْ قالَ) جا ئەگەر گوتی: (لَهُ عَلَيَّ عَشَرَةٌ إلاَّ تسْعَةً إلاَّ ثَمانيَةً) دە دیناری لە سەر منە نۆ دینار نەبێ، هەشت دینار نەبێ، ئەوە (لَزمَهُ تسْعَةٌ) نۆ دیناری لە سەر واجب دەبن.

(وَيَصحُّ منْ غَيْرالْجنس) جیاكردنەوە دروستە لە ڕەگەزێكیتری جگە لە ڕەگەزی دان پێداهێنراوەكە (كَأَلْف إلاَّ ثَوْباً) وەك: هەزار دیناری لە سەر منە جلێك نەبێ (وَيُبَيِّنُ بثَوْب قيمَتُهُ دُونَ أَلْف) ئەو جلە ڕوون دەكرێتەوە بە جلێكی وەها: كە نرخی لە هەزار دینار كەمتر بێ (وَ) هەروەها (منَ الْمُعَيَّن) جیاكردنەوە لە شتی دیاركراویشدا دروستە (كَهَذه الدَّارُ لَهُ إلاَّ هَذَاالْبَيْتَ) وەك: ئەم خانووە هی ئازادە ئەو ژوورە نەبێ (أَوْ هَذه الدَّاراهمُ لَهُ إلاَّ ذَاالدِّرْهَمَ) یان ئەم دیرهەمانە هی ئازادە ئەم دیرهەمە نەبێ (وَفيالْمُعَيَّنِ وَجْهٌ شاذٌ) لەبارەی دیاركراو، فەرموودەی بێهێز هەیە: كە جیاكردنەوەی لێ دروست نەبێ.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: (لَوْ قالَ هَؤُلاَء الْعَبيدُ لَهُ إلاَّ واحداً) ئەگەر گوتی: ئەو كۆیلانە هی ئەون یەك كۆیلە نەبێ. ئەوە (قُبلَ) لێی قبوڵ دەكرێو (وَرَجَعَ فيالْبَيان إلَيْه)

فَإِنْ ماتُوا إِلاَّ واحِداً وَزَعَمَ أَنَّهُ الْمُسْتَثْنَى صُدِّقَ بِيَمِينِه عَلَىالصَّحِيحِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

بۆ دیارکردنی کۆیلەکەش دەگەڕێتەوە لای دانهێنەرەکە (فَإِنْ ماتُوا إِلاَّ واحِداً) جا ئەگەر کۆیلەکان گشتیان مردن تەنهایەکێکیان نەبێ (وَزَعَمَ أَنَّهُ الْمُسْتَثْنَى) دانهێنەرەکەش گوتی: ئەمەیان جیاکراوەکە بوو، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ عَلَىالصَّحِيحِ) بە سوێند باوەڕی پێ دەکرێ لە سەر فەرموودەی ڕاست ، چونکە ئەو مەبەستی خۆی دەزانێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی دانهێنان بە نەژادی ئادەمیزادێك ﴾

واتە: نەژادی ئادەمیزادێك بە خۆیەوە ببەستێ‌و بە بەچەی‌خۆی دابنێ، یان نەژادی‌خۆی بە ئادەمیزادێکەوە ببەستێ‌و خۆی بە بەچەی ئەو دابنێ.

جا بزانە: لە سەردەمی نەفامی‌و لە سەرەتای ئیسلامیش ڕەفتار ئەوەبو: پیاوێك منداڵی کەسێکی‌تری دەکردە کوڕی خۆی، جا کوڕەکە بە کوڕی ئەو پیاوە ناوی دەهێندرا، ئینجا خوای‌گەورە ئەم ڕەفتارەی حەرام کردو فەرمووی: ﴿اُدْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَاللهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُواآبَائَهُمْ فَإِخْوانُكُمْ فِيالدِّينِ وَمَوالِيكُمْ﴾ بە باوکی‌خۆیان ناویان بهێنن، ئەوە دادپەروەرانەترە لە لای‌خوا، جا ئەگەر نەتانزانی کێ باوکیانە-وەك منداڵەکە دۆزرابێتەوە- ئەوان برای‌ئێوەن لە ئایین‌و برادەری‌ئێوەن، واتە: بە برا ناویان بهێنن.

ئینجا ئەگەر ئەو دانپێداهێنانە ڕاست بێ، ئەو کاتە دانهێنانەکە واجبە، بەڵام ئەگەر درۆ بێ، ئەو کاتە حەرامەو لە گوناهە گەورەکانە، جیاوازی نیە درۆیەکە: لە هەبوونی نەژادەکەدا بێ، یان لە نەبوونی‌دا بێ، هەروەك لە (تحفة) و(نهاية)و، حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە،

دەربارەی درۆکردن لە هەبوونی‌نەژاددا، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿مَنْ ادَّعَى إِلى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرامٌ﴾ وفي حديث آخر: ﴿فَعَلَيْهِ لَعْنَةُاللهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ رواهماالشيخان، هەر کەسێك خۆی بە نەژادی کەسێکی‌تری جگە لە باوکی خۆیەوە ببەستێ‌و بشزانێ ئەو کەسە باوکی خۆی نیە، ئەوە بەهەشتی لێ حەرامەو لەعنەتی خواو مەلائیکەو خەڵکی لە سەر بێ.

هەم دەربارەی درۆکردن لە نەبوونی‌نەژاددا، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿أَيمارَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ إِحْتَجَبَ اللهُ عَنْهُ وَفَضَحَهُ عَلَى رُؤُوسِ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ﴾ رواه ابوداود وصححه ابن حبان والحاكم، هەر پیاوێك بە منداڵی خۆی بڵێ: منداڵی من نیە. بشزانێ منداڵی خۆیەتی، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت خۆی لێ دائەپۆشێ‌و ڕووڕەشی ئەکا لە بەرچاوی هەموو خەڵك.

﴿ ئاگاداری ﴾: لەعنەت‌و هەڕەشەی ئەو حەدیسانە، ئەو کەسانەش دەگرێتەوە: کە-لە سەردەمی ئێستادا- منداڵێك لە کەسێك وەردەگرن، یان منداڵێك دەدۆزنەوە، ئینجا لە

(فَصْلٌ) أَقَرَّ بِنَسَبٍ إِنْ أَلْحَقَهُ بِنَفْسِهِ اُشْتُرِطَ لِصِحَّتِهِ أَنْ لاَ يُكَذِّبَهُ الْحِسُّ وَلاَ الشَّرْعُ بِأَنْ يَكُونَ مَعْرُوفَ النَّسَبِ مِنْ غَيْرِهِ، وَأَنْ يُصَدِّقَهُ الْمُسْتَلْحَقُ إِنْ كَانَ أَهْلاً لِلتَّصْدِيقِ، فَإِنْ كَانَ بَالِغاً فَكَذَّبَهُ لَمْ يَثْبُتْ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ، وَإِنْ اسْتَلْحَقَ صَغِيراً ثَبَتَ، فَلَوْ بَلَغَ

---

بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامەو ناسنامەدا نەژادی منداڵەکە بە خۆیانەوە دەبەستن‌و دەیکەنە کوڕی خۆیان، یان کیژی خۆیان، جا بە هۆی ئەو تاوانە گەورەیە، پاشەرۆژێکی پڕ ترس‌و ناشەرعی چاوەڕوانی خێزانەکەو منداڵەکە دەکا؟ چونکە منداڵەکە بە حەرامی تێکەڵی ئەو خێزانە دەبێ‌و بە ناشەرعی میرات لەو خێزانە دەگرێ‌و گشتیان دەبنەماڵوێرانی ڕۆژی قیامەت، کەوابو: هەر ئێستا لە سەر ئەندامانی خێزانەکە واجبەو هەم هەر کاتێك منداڵەکەش بلۆغی بو، لە سەری واجبە: بە پەلە خۆیان لەو گوناهە گەورەیە ڕزگار بکەن‌و ئەو نەژادە درۆزنە هەڵبوەشێننەوە، نەوەك بەردەوام لە لەعنەتی خوادا بمێننەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ إِدَّعَى بِغَيْرِأَبِيهِ–وَهُوَ يَعْلَمُ– إِلاَّ كَفَرَ﴾ رواه الشيخان، هەر پیاوێك نەژادی خۆی بە کەسێکی‌تر–جگە لە باوکی‌خۆی– ببەستێ‌و بشزانێ باوکی خۆی نیە، بە ڕاستی کافر بووە. واتە: ئەگەر بە حەڵاڵی دابنێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(أَقَرَّ بِنَسَبٍ) هەر کاتێك دانی هێنا: بە نەژادی کەسێك، ئەوە تەماشا دەکەین: (إِنْ أَلْحَقَهُ بِنَفْسِهِ) ئەگەر نەژادی کەسەکەی بە خۆیەوە بەست (اُشْتُرِطَ لِصِحَّتِهِ) بەمەرج داندراوە بۆ دروستبوونی بەستانەکە، سێ مەرج:

یەکەم: (أَنْ لاَيُكَذِّبَهُ الْحِسُّ) نابێ هەستکردن بە درۆزنی دابنێ، کەوابو: ئەگەر یەکێکی تەمەن بیست ساڵی، یەکێکی پانزە ساڵی بە منداڵی‌خۆی دابنێ، ئەوە درۆیەو دروست نابێ.

دووەم: (وَلاَالشَّرْعُ) نابێ شەرع بە درۆزنی دابنێ: (بِأَنْ يَكُونَ مَعْرُوفَ النَّسَبِ مِنْ غَيْرِهِ) وەك منداڵەکە ناسراو بێ: کە لە نەژادی کەسێکی‌ترە، هەروەك تازە ڕوونمان کردەوە، یان منداڵەکە لە زینا بوبێ؟ چونکە منداڵی لە زینا بیژییەو دروست نیە بە نەژادی خۆیەوە ببەستێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

سێیەم: (وَأَنْ يُصَدِّقَهُ الْمُسْتَلْحَقُ) دەبێ نەژادبەستراوەکە باوەڕ بە دانهێنەرەکە بکا (إِنْ كَانَ أَهْلاً لِلتَّصْدِيقِ) ئەگەر لەوانە بێ: کەڵکی باوەڕ پێ‌کردنی هەبێ: وەك بالغ‌و عاقڵ بێ، کەوابو: (فَإِنْ كَانَ بَالِغاً فَكَذَّبَهُ) ئەگەر نەژادبەستراوەکە بالغ‌و عاقڵ بوو و دانهێنەرەکەی بەدرۆ خستەوە، ئەو کاتە: (لَمْ يَثْبُتْ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ) نەژادەکەی ئاشکرا نابێ، تەنها بە شاهید نەبێ، بەڵام (وَإِنِ اسْتَلْحَقَ صَغِيراً) ئەگەر نەژادی منداڵێکی نەبالغ، یان شێتێکی بە خۆیەوە بەست، ئەو کاتە: (ثَبَتَ) نەژادەکەی ئاشکرا دەبێ، کەوابو: (فَلَوْ بَلَغَ) ئەگەر منداڵەکە

وَكَذَّبَهُ لَمْ يَبْطُلْ فِي الأَصَحِّ، وَيَصِحُّ أَنْ يَسْتَلْحِقَ مَيِّتاً صَغِيراً وَكَذَا كَبِيرٌ فِي الأَصَحِّ وَيَرِثُهُ، وَلَوْ اسْتَلْحَقَ إِثْنَانِ بالغاً ثَبَتَ لِمَنْ صَدَّقَهُ، وَحُكْمُ الصَّغِيرِ يَأْتِي فِي اللَّقِيطِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعالَى، وَلَوْ قالَ لِوَلَدِ أَمَتِهِ هَذَا وَلَدِي ثَبَتَ نَسَبُهُ، وَلاَ يَثْبُتُ الإِسْتِيلاَدُ فِي الأَظْهَرِ، وَكَذَا لَوْ قالَ: وَلَدِي وَلَدَتْهُ فِي مِلْكِي، فَإِنْ قالَ عَلِقَتْ بِهِ فِي مِلْكِي ثَبَتَ الإِسْتِيلاَدُ، فَإِنْ كانَتْ فِراشاً لَهُ لَحِقَهُ بِالْفِراشِ مِنْ غَيْرِ اسْتِلْحاقٍ، وَإِنْ كانَتْ مُزَوَّجَةً فَالْوَلَدُ لِلزَّوْجِ وَاسْتِلْحاقُ السَّيِّدِ باطِلٌ،

---

بلۆغی بوو، یان شێتەکە چاك بۆوەو (وَكَذَّبَهُ) دانهێنەرەکەی بەدرۆ خستەوە (لَمْ يَبْطُلْ) نەژادەبەستراوەکە بەتاڵ نابێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيَصِحُّ أَنْ يَسْتَلْحِقَ مَيِّتاً صَغِيراً) دروستە نەژادی منداڵێکی نەبالغی مردوو بە خۆیەوە ببەستێ (وَكَذَا كَبِيرٌ) هەروەها دروستە نەژادی مردوویەکی گەورەی بالغیش بەخۆیەوە ببەستێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابوو: (وَيَرِثُهُ) دانهێنەرەکە میرات دەگرێ لە نەژادبەستراوە مردووەکە.

(وَلَوِ اسْتَلْحَقَ إِثْنانِ بالِغاً) ئەگەر دووکەس، یان زیاتر نەژادی یەکێکی بالغو عاقڵیان بە خۆیانەوە بەستو هەردووك گوتیان ئەمە کوڕی منە. ئەوە (ثَبَتَ لِمَنْ صَدَّقَهُ) نەژادەکەی بۆ ئەو کەسەیان ئاشکرا دەبێ: کە ئەو باوەڕی پێ دەکا.

(وَحُكْمُ الصَّغِيرِ يَأْتِي فِي اللَّقِيطِ) بڕیاری منداڵی نەبالغ کە دوو کەس بە نەژادی خۆیانەوە بیبەستن لە باسی منداڵی دۆزراوەدا دێ، إنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَلَوْ قالَ لِوَلَدِ أَمَتِهِ: هَذا وَلَدِي) ئەگەر گوتیە منداڵی (جارية)کەی خۆی: ئەمە منداڵی منە (ثَبَتَ نَسَبُهُ) نەژادەکەی ئاشکرا دەبێ، بەلام (وَلاَ يَثْبُتُ الإِسْتِيلاَدُ) دایکە منداڵیەکەی (جارية)کە ئاشکرا نابێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَكَذا) هەروەها دایکە منداڵیەکەی ئاشکرا نابێ (لَوْ قالَ: وَلَدِي وَلَدَتْهُ فِي مِلْكِي) ئەمە منداڵی منە لە ملکایەتی مندا لێی بوە، بەلام (فَإِنْ قالَ: عَلِقَتْ بِهِ فِي مِلْكِي) ئەگەر گوتی: لە ملکایەتی مندا زگی پێ گرتوە، ئەو کاتە (ثَبَتَ الإِسْتِيلاَدُ) (جارية)کە دەبێتە دایکە منداڵ.

(فَإِنْ كانَتْ فِراشاً لَهُ) جا ئەگەر (جاریە)کە سەرجێی گەورەکەی بێ، واتە: جیماعی لەگەڵ کردبو، ئەو کاتە (لَحِقَهُ بِالْفِراشِ مِنْ غَيْرِ اسْتِلْحاقٍ) نەژادی منداڵی (جارية)کە-بە هۆی سەرجێییەکە- بە گەورەکەیەوە دەبەسترێ، بێ ئەوەی گەورەکە بیبەستێ، بەلام (وَإِنْ كانَتْ مُزَوَّجَةً) ئەگەر (جارية)کە لە یەکێکیتر مارە کرابو، ئەو کاتە (فَالوَلَدُ لِلزَّوْجِ) منداڵی (جارية)کە دەبێتە هی مێردەکەی، کەوابو: (وَاسْتِلْحاقُ السَّيِّدِ باطِلٌ) نەژادبەستانی گەورەکەی بەخۆیەوە بەتاڵەو دروست نابێ.

وَأَمَّا إذا أَلْحَقَ النَّسَبَ بغَيْرِه كَهَذا أَخِي أَوْ عَمِّي فَيَثْبُتُ نَسَبُهُ مِنَ الْمُلْحَقِ بِه بالشُّـرُوطِ السَّابِقَة، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُ الْمُلْحَقِ به مَيِّتاً، وَلاَ يُشْتَرَطُ أَنْ لاَ يَكُـونَ نَفـاهُ فِيالأَصَـحِّ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُ الْمُقِرِّ وارِثاً حائزاً، وَالأَصَحُّ أَنَّ الْمُسْتَلْحَقَ لاَ يَرِثُ وَلاَ يُشـارِكُ الْمُقِـرَّ فِيحِصَّتِه، وَأَنَّ الْبالِغَ مِنَ الْوَرَثَة لاَ يَنفَرِدُ بِالإِقْرار،

---

ئینجا بزانە: تا ئێرە باس لەوە بوو: نەژادەکە بە خۆیـەوە ببەستێ (وَأَمّـا إذا أَلْحَقَ النَّسَبَ بغَيْرِه) بەڵام ئەگەر نەژادەکە–جگە لە خۆی– بە خزمێکیتریەوە ببەستێ (گـ) وەك بڵـێ: (هَذا أَخِي) ئەمە برامە کوڕی باوکمە (أَوْ یان بڵێ: (عَمِّي) ئەمە ماممە کوڕی باپیرمـە، ئـەو کاتە (فَيَثْبُتُ نَسَبُهُ مِنَ الْمُلْحَقِ بِـه) نەژادەکـەی لـە پێوەبەستراوەکە ئاشکرا دەبێ: کـە بـاوکو باپیرەیـەتی (بالشُّرُوطِ السَّابِقَة) بـەو سـێ مەرجانـەیڕابردوو، هـەم چـوارەمیش: (وَيُشْتَرَطُ كَوْنُ الْمُلْحَقِ بِهِ مَيِّتاً) لێرەدا بـە مـەرج دادەنـدرێ: پێوەبەستراوەکە مـردوو بـێ، واتە: نەژاد بەستن بە زیندووێکی جگە لە خۆی دروست نابـێ، بـەڵام (وَلاَ يُشْتَرَطُ) لێـرەدا بـە مـەرج دانانـدرێ: (أَنْ لاَ يَكُونَ نَفـاهُ) پێوەبەسـتراوەکە لـە ژیـانیدا نـەیگوتبێ: ئەمـە منداڵی من نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها (وَيُشْتَرَطُ) لێرەدا بۆ دروستبوونی نەژادەکە بە مەرج دادەندرێ (كَوْنُ الْمُقِرِّ وارِثـاً حائزاً) دانهێنەرەکە میراتگرێکی وەها بێ: گشت میراتی مردووەکەی–بـە شـەرع– بدرێتێ، جیاوازی نیـە: میراتگرە دانهێنەرەکـە: یـەك کـەس بێ، یـان زیـاتر بـێ، بۆ وێنـە: ئەگـەر یەکێك بمرێو تەنها کوڕێکی لە دوا بـەجێ بمێنـێ، ئینجا ئـەم کـوڕە دان بهێنـێ: کـە ئـازاد برایەتی. ئەو کاتە نەژادی ئازاد ئاشکرا دەبێو لەگـەڵ دانهێنەرەکـە دەبنـە بـرای یـەکتریو میراتەکە لە نێوانیاندا بە نیوەیی دەبێ، کەوابو: ئەگـەر میراتگرەکـان کۆمـەڵێك کـوڕو کـیژ بون، ئەو کاتە: پێویستە گشتیان لـە سـەر دانهێنانەکـە ڕێك بکـەون، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بـەڵام ئەگـەر میراتگرەکـان–بـە گشـتی– لـە سـەر دانهێنانەکـە ڕێـك نەکـەوتن، بـەڵکو هەنـدێکیان دانیـان پێـدا هێنـاو هەنـدێکیش دانیـان پێـدا نـەهێنا، ئـەو کاتـە (وَالأَصَحُّ) فـەرموودەی ڕاسـتتر: (أَنَّ الْمُسْتَلْحَقَ لاَ يَـرِثُ) نەژادبەسـتراوەکە مـیرات نـاگرێ، چـونکە ئاشکرابوونی نەژادەکـەی دروست نـەبوە، هـەم (وَلاَ يُشـارِكُ الْمُقِـرَّ فِـي حِصَّتِـه) ناشبێتە هاوبەشی دانهێنەرەکە لە بەشە میراتەکەیدا.

(وَ) هەر بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّ الْبـالِغَ مِـنَ الْوَرَثَـةِ لاَ يَنْفَـرِدُ بِـالإِقْرارِ) ئـەو میراتگرەی بلۆغی بووە، نابـێ بـە تـەنها دان بهێنـێ بـە نەژادەکـە، بـەڵکو چاوەڕوانی ئـەوانیتریش دەکرێ تا بلۆغیان دەبێ، هەم چاوەڕوان دەکرێ شێتەکەیان چاك ببێتەوە.

وَأَنَّهُ لَوْ أَقَرَّ أَحَدُ الْوارِثَيْنِ وَأَنْكَرَ الآخَرُ وَماتَ وَلَمْ يَرِثْهُ إلاَّ الْمُقِرُّ ثَبَتَ النَّسَبُ، وَأَنَّهُ لَوْ أَقَرَّ ابْنٌ حائِزٌ بِأُخُوَّةِ مَجْهُولٍ فَأَنْكَرَ الْمَجْهُولُ نَسَبَ الْمُقِرِّ لَمْ يُؤَثِّرْ فِيهِ وَيَثْبُتُ أَيْضاً نَسَبُ الْمَجْهُولِ، وَأَنَّهُ إذا كانَ الْوارِثُ الظَّاهِرُ يَحْجُبُهُ الْمُسْتَلْحَقُ كَأَخٍ أَقَرَّ بِابْنٍ لِلْمَيِّتِ ثَبَتَ النَّسَبُ وَلاَ إرْثَ.

(كِتابُ الْعارِيَةِ)

---

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لَوْ أَقَرَّ أَحَدُ الْوارِثَيْنِ) ئەگەر لە دوو برا -کە هەردووکیان میراتگر بون- یەکێکیان دانی هێنا بە نەژادی برایەکی سێیەم (وَأَنْكَرَ الآخَرُ) ئەویتریش دانی پێدا نەهێنا، ئەوە سێیەمەکە میرات ناگرێ، چونکە نەژادی بە دروستی ئاشکرا نەبوە، بەلام (وَ) هەر کاتێك (ماتَ) داننەهێنەرەکە مرد (وَلَمْ يَرِثْهُ إلاَّ الْمُقِرُّ) جگە لە دانهێنەرەکەش کەسیتر میراتی لە داننەهێنەرەکە نەدەگرت، ئەو کاتە (ثَبَتَ النَّسَبُ) بە هۆی دانهێنانەکەیڕابردوو، نەژادەکە ئاشکرا دەبێ و سێیەمەکەش میرات دەگرێ، چونکە دانهێنەرەکە- ئێستا- گشت میراتی دەدرێتێ.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لَوْ أَقَرَّ ابْنٌ حائِزٌ) ئەگەر کوڕێکی ناسراو-کە هەموو میراتەکەی دەبرد- دانی هێنا (بِأُخُوَّةِ مَجْهُولٍ) بە برایەتی نەناسراوێك (فَأَنْكَرَ الْمَجْهُولُ نَسَبَ الْمُقِرِّ) ئینجا نەناسراوەکەش دانی نەهێنا بە نەژادی دانهێنەرەکە، واتە: نەناسراوەکە بە کوڕەکەی گوت: من کوڕی مردووەکەم، تۆ کوڕی ئەو نی، ئەوە (لَمْ يُؤَثِّرْ فِيهِ) داننەهێنانەکەیوی کار لە نەژادی کوڕەکە ناکا، چونکە نەژادەکەی بەستراوە، کەوابو: (وَيَثْبُتُ أَيْضاً نَسَبُ الْمَجْهُولِ) بە هۆی دانهێنانینناسراوەکە، نەژادی نەناسراوەکەش ئاشکرا دەبێ.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ إذا كانَ الْوارِثُ الظاهِرُ يَحْجُبُهُ الْمُسْتَلْحَقُ) هەر کاتێك میراتگرێکی ئاشکرا بە هۆی نەژادبەستراوەکە، بێبەش دەبو لە میراتی مردووەکەی: (كَأَخٍ أَقَرَّ بِابْنٍ لِلْمَيِّتِ) وەك برای مردووێك دان بهێنێ بە نەژادی کوڕێك بۆ مردووەکە، ئەو کاتە (ثَبَتَ النَّسَبُ) نەژادیکوڕەکە ئاشکرا دەبێ و دەبێتە کوڕی مردووەکە، بەلام (وَلاَ إرْثَ) هیچ میراتەکەی نادرێتێ، چونکە ئەگەر میراتی بدرێتێ، برایەکە لە میراتگریەتی دەکەوێ، وە ئەگەر لە میراتگریەتی بکەوێ، دانهێنانەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

## ﴿ كِتابُ الْعارِيَةِ: **پەرتوکی خواستن** ﴾

واتە: شتێك-بە خواستن- لە کەسێك وەربگرێ تاکو سودی لێوەربگرێ، ئینجا بۆ خاوەنەکەی بیگەڕێنێتەوە ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: كانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ فَاسْتَعارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَساً مِنْ أَبِي طَلْحَةَ فَرَكِبَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ قالَ: مَا رَأَيْنا مِنْ شَيْءٍ﴾ رواه البخاري، ترسێك لە (مدینة)

شَرْطُ الْمُعِيرِ: صِحَّةُ تَبَرُّعِه، وَمِلْكُهُ الْمَنْفَعَةَ، فَيُعِيرُ مُسْتَأْجِرٌ لاَ مُسْتَعِيرٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَهُ أَنْ يَسْتَنِيبَ مَنْ يَسْتَوْفِي الْمَنْفَعَةَ لَهُ،

---

ڕوویدا، جا پێغەمبەرﷺ ئەسپێکی لە (أبي‌طلحة) خواستو بەرەو ڕوداوەکە ڕۆیشت، جا کە گەڕاوە فەرمووی: هیچمان نەدیت.

ئینجا بزانە: شت بە خوازدان– لە خودی‌خۆیدا – سوننەتە، بەڵام ئەگەر ببێتە هۆی دروستبوونی خواپەرستیەکی واجب، یان ڕزگارکردنی گیانێکی‌ڕێزدار ئەو کاتە بەخوازدانەکە واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَتَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ یارمەتی یەکتری بدەن لە سەر چاکەو خواپەرستی، بەڵام یارمەتی یەکتری مەدەن لە سەرگوناهو دوژمنکاری.

دیسان بزانە: مامڵەتی‌خواستن لەم چوار ڕوکنانە پێك دێ: (مُعِيرٌ)خوازدەر: کە خاوەن ماڵەکەیە. (مُسْتَعِيرٌ)ماڵخواز: کە ماڵەکە بە خواستن وەردەگرێ. (مُسْتَعَارٌ)خواستراوەکە: کە ماڵەکەیە، هەم پێی دەگوترێ: (مُعَارٌ) بەخوازدراو. (اَلصِّيغَةُ): گوتەی مامڵەتەکە.

(شَرْطُ الْمُعِيرِ) مەرجی خوازدەرەکە، ئەمەیە: (صِحَّةُ تَبَرُّعِه) دروست بێ: ماڵی خۆی بە خۆڕایی بداتە یەکێکی‌تر، واتە: بالغو عاقڵ بێو قەدەغەی لە سەر نەبێو زۆرلێکراو نەبێ، کەواتە: ئەگەر منداڵو شێتو زۆرلێکراو و قەدەغەکراو شتێك بە خواستن بدەن، خواستنەکە دروست نابێو ماڵخوازەکەش دەبێتە زامینیو هەم کرێیەکەشی دەکەوێتە سەر، هەروەك (تحفة) لە (الأنوار) گێڕاویەتیەوە.

ئینجا بزانە: پێویستە ماڵخوازەکەش ئەو مەرجانەی‌ڕابردووی تێدا بێنە جێ، کەواتە: خواستنی منداڵو شێتو قەدەغەکراو و زۆرلێکراو دروست نابێ، بەڵام نابنە زامینی ماڵەخواستراوەکە، بەو مەرجەی لە منداڵو شێتو قەدەغەکراو وەریاننەگرتبێ، ئەگینا: ئەوانیش دەبنە زامینی ماڵەکە، هەروەك لە (حاشيةالعوض)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَ) هەم مەرجی خوازدەرەکە ئەمەیە: (مِلْكُهُ الْمَنْفَعَةَ) سودی ماڵە بەخوازدراوەکەش ملکی‌خۆی بێ، هەرچەند خودی ماڵەکەش ملکی‌خۆی نەبێ، کەوابو: (فَيُعِيرُ مُسْتَأْجِرٌ) دروستە: بەکرێگرێك ماڵە بەکرێگیراوەکە–بە خواستن– بداتە کەسێکی‌تر، چونکە خاوەنی سودەکەیە، کەوابو: وەسێت بۆکراو و وەقف بۆسەرکراویش بۆیان دروستە: وەسێت پێکراوەکەو وەقفکراوەکە بەخواستن بدەن.

بەڵام (لاَ مُسْتَعِيرٌ) دروست نیە: ماڵخوازێك ماڵەخواستراوەکە –بە خواستن– بداتە یەکێکی‌تر (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە خاوەنی سودەکە نیە، بەڵکو بۆی حەڵاڵ کراوە: سود لە ماڵەکە وەربگرێ، کەوابو: (وَلَهُ) بۆ ماڵخوازەکە دروستە (أَنْ يَسْتَنِيبَ مَنْ يَسْتَوْفِي الْمَنْفَعَةَ لَهُ) یەکێك لە جێی خۆی دابنێ تاکو سودەکەی بۆ

وَالْمُستَعارِ: كَوْنُهُ مُنْتَفِعاً بِهِ مَعَ بَقاءِ عَيْنِه، وَتَجُوزُ إعارَةُ جارِيَةٍ لِخِدْمَةِامْرَأَةٍ أَوْ مَحْـرَمٍ، وَيُكْرَهُ إعارَةُ عَبْدِمُسْلِمٍ لِكَافِرٍ، وَالأَصَحُّ اشْتِراطُ لَفْظٍ: كَأَعَرْتُكَ أَوْ أَعِرْنِـي، وَيَكْفِـي لَفْظُ أَحَدِهِما مَعَ فِعْلِ الآخَرِ،

---

وەربگریٚ: وەك وەكیلەكەی، یان ژنەكەی سواری ئۆتۆمبیلەكە بكا، یان گاجووتەكە بداتـە دەست یەكێكیتر تاكو جووتی بۆ بكا.

(وَالْمُسْتَعارِ) مەرجی ماڵەخواستراوەكەش ئەمەیـە: (كَوْنُـهُ مُنْتَفَعـاً بِـهِ) لەوانـە بیٚ: سـودی لیٚوەربگیریٚ (مَـعَ بَقـاءِ عَيْنِـهِ) لەگـەڵ ئەوەشدا خـودی ماڵەكـەش بمێنێتـەوە، كەواتـە: بـە خوازدانی بەفر بۆ ساردكردنی ئاو، یان مۆم بۆ داگیرساندن، دروست نابـیٚ، كـەوابو: ڕێگـای شەرعی ئەمەیە: بە فرۆشتن، یان بە بەخشین بیداتیٚ.

هەروەها ئەگەر بۆ میوە لیٚخواردن درەختێكی بداتیٚ، یان بۆ شیر لیٚخواردن، یان بیٚچوو لیٚبـوون ئـاژەڵێكی بـداتیٚ، دەبـی میوەكـەو شـیرەكەو بیٚچـووەكەی بـۆ حـەڵاڵ بكـاو درەختەكەیو ئاژەڵەكەشی بە خواستن بداتیٚ، تاكو بتوانیٚ ئـەو بەرهەمانەیان لیٚوەدەست بێنیٚ، چونكە مەرجی خواستراوەكە ئەمەیە: بە هـۆی سـود لیٚوەرگرتن لـەناو نەچیٚ، ئـیتر دیاریكردنی خواستراوەكە مەرج نیە، كەواتە: دروستە بڵیٚ: هەر ئـاژەڵێكی منـت دەویٚ بـە خواستن بیبە. هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَتَجُـوزُ إِعارَةُجارِيَـةٍ) دروسـتە (جاریـة) بـە خواسـتن بـدا (لِخِدْمَـةِامْرَأَةٍ أَوْ مَحْـرَمٍ) بـۆ خزمەتكردنی ئافرەت، یـان پیـاوێكی مـەحرەم، چـونكە مەترسـی بیٚ شـەرعیی لیٚنـاكریٚ، بەڵام (وَيُكْرَهُ إِعارَةُ عَبْدٍمُسْلِمٍ لِكافِرٍ) ناپەسندە كۆیلەیـەكی موسـوڵمان بـە خواسـتن بدرێتـە كافرێك، چونكە سوكایەتی تیٚدایە.

كەواتە: حەڕامە چەك بە خواسـتن بدرێتـە ڕیٚگر، یـان هـەر شتێكیتر كـە ببێتـە پاڵپشـتی پیاوخراپان بۆ خراپەكەیان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئامازەیـان بـۆ كـردوەو، لـە سەرەتای ئەم باسەدا بەڵگەمان هێناوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستر: (اشْتِراطُ لَفْظٍ) بـۆ دروسـتبوونی خواسـتن مەرجـە: بـە زوبـان، یان بە نووسین گوتەیـەكی وەهـا هـەبیٚ: كـە ئیزنـدانی سود لیٚوەرگرتن بگەیـەنیٚ (كَـ) وەك بڵـیٚ: (أَعَرْتُـكَ) بـە خواسـتن ئـەم شـتەم دایـە تـۆ. یـان بڵـیٚ: بـۆم حـەڵاڵ كـردی سـودی لیٚوەربگری. ئینجا ماڵخوازەكەش شتەكە ببا (أَوْ) یان ماڵخوازەكە بڵیٚ: (أَعِرْنِـي) ئـەم شـتەم بە خواستن بدیٚ. ئینجا خوازدەرەكەش بیداتیٚ، چونكە (وَيَكْفِي لَفْظُ أَحَدِهِما مَـعَ فِعْلِ الآخَـرِ) بـۆ دروسـتبوونی سـود لیٚوەرگرتن ئەوەنـدە بەسـە: یـەكێكیان گوتەكـە بڵـیٚو ئـەویتریش كردارەكە بكا، واتە: مەرج نیە: هەردووكیان گوتەكە بڵێن.

وَلَوْ قالَ أَعَرْتُكَهُ لتَعْلِفَهُ أَوْ لتُعيرَنِي فَرَسَكَ فَهُوَ إِجارَةٌ فاسِدَةٌ تُوجِبُ أُجْرَةَالْمِثْلِ، وَمُؤْنَةُالرَّدِّ عَلَىالْمُسْتَعيرِ، فَإِنْ تَلِفَتْ لاَ باسْتِعْمالٍ ضَمِنَها وَإِنْ لَمْ يُفَرِّطْ،

---

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر خوازدەرەكە گوتی: (أَعَرْتُكَهُ لِتَعْلِفَهُ) ئەسپەكەم بە خواستن دایە تۆ، تاكو ئالیكی بدەیتێ (أَوْ لِتُعيرَنِي فَرَسَكَ) یان تاكو تۆش ئەسپەكەت بە خواستن بدەیتە من (فَهُوَ) ئەو مامڵەتە (إِجارَةٌ فاسِدَةٌ) بەكرێدانێكی دانەمەزراوی نادروستە، كەوابو: (تُوجِبُ أُجْرَةَالْمِثْلِ) كرێی هاووێنە لە سەر ماڵخوازەكە واجب دەكا بۆ خاوەنی ئەسپەكە، ئەگەر ماوەیەكی وەهای پێ بچێ: كرێی هەبێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەركی بەخێوكردنی ماڵەخواستراوەكە لە سەر خاوەنەكەیەتی، واتە: لە سەر ماڵخوازەكە نیە، جا ئەگەر ماڵخوازەكە ئەركی بەخێوكردنی دا، بەڵام ئیزنی قازیی وەرنەگرتو شاهیدیشی نەگرتن تاكو ئەركەكە لە خاوەنەكەی وەربگرێتەوە، ئەو كاتە مافی وەرگرتنەوەی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

(وَمُؤْنَةُالرَّدِّ) ئەركی گەڕاندنەوەی ماڵەخواستراوەكە: بۆ خاوەنەكەی (عَلَىالْمُسْتَعيرِ) لە سەر ماڵخوازەكەیە، پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ﴿عَلَىالْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، ئەو دەستەی شتێك وەردەگرێ، واجبە: بیپارێزێ تا دەیداتەوە خاوەنەكەی.

ئینجا بزانە: هەر كاتێك خاوەنەكە: دلوای ماڵە خواستراوەكەی كرد، یان مرد، لە سەر ماڵخوازەكە واجبە: بە پەلە ماڵە خواسترلوەكە بگەڕێنێتەوە، ئەگینا: دەبێتە زامینو كرێیەكەشی دەكەوێتە سەر، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

جا ئەگەر خاوەنەكەو ماڵخوازەكە لە سەر گەڕاندنەوەی ماڵەكە بووە كێشەیان: خاوەنەكە دەیگوت: نەتگەڕاندۆتەوە، ماڵخوازەكەش دەیگوت: گەڕاندومەتەوە—هیچ شاهیدیشی نەبو— ئەوە باوەڕ بە خاوەنەكە دەكرێ ئەگەر سوێند بخوا، هەروەك لە (مغنی)و (اقناع)دا فەرموویەتی.

(فَإِنْ تَلِفَتْ) جا ئەگەر ماڵەخواستراوەكە فەوتا، یان عەیبێكی لێپەیدا بو (لاَ بِاسْتِعْمالٍ) فەوتانەكەش بە هۆی بەكارهێنانێكی ئیزندراو نەبو: وەك گورگ ئاژەڵەخواستراوەكە بخوا، یان ماڵەخواستراوەكە بدزرێ، یان بسوتێ، ئەوە (ضَمِنَها) ماڵخوازەكە دەبێتە زامینیو دەبی تۆڵەی بدا (وَإِنْ لَمْ يُفَرِّطْ) هەرچەند كەمتەرخەمیشی نەكردبێ ﴿عَنْ صَفْوانَ بنِ أُمَيَّةَ﴿: أَنَّ النَّبِيَّﷺ اسْتَعارَ مِنْهُ أَدْرُعاً يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَقالَ: أَغَصْبٌ يامُحَمَّدُ؟ قالَ: بَلْ عارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ﴾ رواه ابوداود والنسائی باسناد جید، پێغەمبەرﷺ چەند زرێیەكی لە (صفوان) خواست بۆ جەنگی (حنین)، جا (صفوان) گوتی: ئایا بە زەوتكردن

وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَضْمَنُ ما يَنْمَحِقُ أَوْ يَنْسَحِقُ باسْتِعْمالٍ، وَالثَّالِثُ يَضْمَنُ الْمُنْمَحِقَ، وَالْمُسْتَعِيرُ مِنَ الْمُسْتَأْجِرِ لاَ يَضْمَنُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ تَلِفَتْ دابَّتُهُ فِي يَدِ وَكِيلٍ بَعَثَهُ فِي شُغْلِهِ أَوْ فِي يَدِ مَنْ سَلَّمَها إِلَيْهِ لِيَرُوضَها فَلاَ ضَمانَ، وَلَهُ الإِنْتِفاعُ بِحَسَبِ الإِذْنِ،

---

زرێیەکان دەبەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵکو بە خواستنێکیزامینکراو وەریان دەگرم ئەگەر لەناو چوون تۆڵەیان دەدەم.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بە هۆی بەکارهێنانێکیئیزنندرلو ماڵەخواستراوەکە بفەوتێ، ئەو کاتە نابێتە زامین، هەروەك لە (شرح المنهج)دا فەرموویەتی، کەواتە: ئەگەر داس بە دروێنە بشکێ، یان گاجووت بە کێڵان بمرێ، یان قاچی بشکێ، ماڵخوازەکە نابێتە زامین، واتە: بەو مەرجەی لە ڕادە بەدەر بە کاری نەهێنابێ، ئەگینا: لەو حاڵەتەشدا دەبێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

جا ئەگەر هەردوولا بووە کێشەیان: ئایا خواستراوەکە بە هۆی بەکارهێنانێکی ئیزندراو فەوتاوە، یان نا؟ ئەوە باوەڕ بە ماڵخوازەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا، هەروەك —بە پێچەوانەی(تحفة)— لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يَضْمَنُ ما يَنْمَحِقُ) ماڵخوازەکە نابێتە زامینی ئەو خواستراوەی بە هۆی بەکارهێنانێکی ئیزندراو گشتی لەناو بچێ: وەك جلوبەرگو ئەو جۆرە شتانە، هەم وەکو وولاغەکە بە هۆی بارێکیعادەتی، یان سوارییێکیعادەتی لەناو بچێ (أَوْ يَنْسَحِقُ بِاسْتِعْمالٍ) یان بەهۆی بەکارهێنانێکی ئیزندراو عەیبدار بێو کەم ببێتەوە: وەك وولاغەکە پشتی بریندار ببێ، یان شەلە ببێ، یان کێردەکە بشکێ (وَالثَّالِثُ) بە فەرموودەی سێیەم (يَضْمَنُ الْمُنْمَحِقَ) دەبێتە زامینی ئەو خواستراوەی گشتی لەناو دەچێ.

(وَالْمُسْتَعِيرُ مِنَ الْمُسْتَأْجِرِ) ئەو کەسەی ماڵێکی خواستوە: لە بەکرێگرێك، یان لە وەسێت بۆکراوێك، یان لە وەقف بۆسەرکراوێك (لاَ يَضْمَنُ) ئەویش نابێتە زامین (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە دەستی ئەوانەش جێگری خاوەن ماڵەکەیە.

(وَلَوْ تَلِفَتْ دابَّتُهُ) ئەگەر وولاغەکەی خۆی فەوتا: (فِي يَدِ وَكِيلٍ بَعَثَهُ فِي شُغْلِهِ) لە دەستی وەکیلێکیدا: کە بۆ کارێکیخۆی ناردویەتی (أَوْ فِي يَدِ مَنْ سَلَّمَها إِلَيْهِ لِيَرُوضَها) یان لە دەستی کەسێکدا: کە وولاغەکەی تەسلیم کردبو تاکو مەشقی سواریی پێ بکا (فَلاَ ضَمانَ) وەکیلەکەو کەسەکە نابنە زامینی وولاغەکە، بەو مەرجەی کەمتەرخەمییان نەکردبێ.

(وَلَهُ الإِنْتِفاعُ) بۆ ماڵخوازەکە دروستە: سود لە خواستراوەکە وەربگرێ (بِحَسَبِ الإِذْنِ) بەگوێرەی ئیزندانەکە، کەواتە: ئەگەر کتێبێکی بە خواستن وەرگرتو دیتی هەڵەیەکی

فَإنْ أَعارَهُ لِزراعَةِ حِنْطَةٍ زَرَعَها وَمِثْلَها إنْ لَمْ يَنْهَهُ، أَوْ لِشَعيرٍ لَمْ يَزْرَعْ ما فَوْقَهُ كَحِنْطَـةٍ، وَلَوْ أَطْلَقَ الزِّراعَةَ صَحَّ -فِي الأَصَحِّ- وَيَزْرَعُ ما شاءَ، وَإذا اسْتَعارَ لِبناءٍ أَو غِراسٍ فَلَـهُ الزَّرْعُ وَلاَعَكْسَ، وَالصَّحيحُ أَنَّهُ لاَيَغْرِسُ مُسْتَعيرٌ لِبناءٍ وَكَذا الْعَكْسُ، وَأَنَّـهُ لاَتَصِـحُّ إعارَةُالأَرْضِ مُطْلَقَةً، بَلْ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ نَوْعِ الْمَنْفَعَةِ.

---

تێدایه، دروست نیه: هەڵەکە -بە بێ ئیزنی خاوەنەکەی- چاك بکاتەوە، مەگەر خواسترلوەکە قورئان بێ، یان کتێبێکی وەقفکراو بێ، ئەو کاتە واجبە: هەڵەکە چاك بکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(فَإنْ أَعارَهُ لِزراعَةِ حِنْطَةٍ) جا ئەگەر زەویەکەی بە خواستن دایێ تاکو گەنمی تێدا بچێنێ، ئەوە (زَرَعَها وَمِثْلَها) گەنم و وێنەی گەنمیشی تێدا دەچێنێ (إنْ لَمْ يَنْهَهُ) ئەگەر لە وێنەکە قەدەغەی نەکردبێ، کەوابو: دروستە جۆی تێدا بچێنێ، بەڵام دروست نیە برنجی تێدا بچێنێ؟ چونکە زیانی زیاترە (أَوْ لِشَعيرٍ) یان بۆ داچاندنی جۆ دابوێ، ئەوە (لَمْ يَزْرَعْ ما فَوْقَهُ كَحِنْطَةٍ) دروست نیە: ئەو شتەی تێدا بچێنێ کە زیانی زیاترە: وەکو گەنم، بەڵام (وَلَوْ أَطْلَقَ الزِّراعَةَ) ئەگەر تەنها گوتی: بۆ کشتوکاڵ دامە تۆ، ئەوەش (صَحَّ) دروست دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: (وَيَزْرَعُ ما شاءَ) هەرکشتوکاڵێکی حەز دەکا تێیدا دەچێنێ.

ئینجا بزانە: هەر کاتێك ماڵخوازەکە -بە پێچەوانەوە- شتێکی ئیزننەدراوی تێدا چاند، ئەوە بۆ خاوەنەکە دروستە: هەڵیبکەنێ و هیچ تۆڵەشی نەداتێ، بەڵکو ئەگەر ماوەیەکیشی بە سەردا چوبێ، لە سەر ماڵخوازەکە واجبە: کرێی هاووێنەیشی بداتێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَإذا اسْتَعارَ لِبناءٍ أَو غِراسٍ)هەر کاتێك زەویەکی بە خواستن وەرگرت بۆ خانوو تێدا کردن، یان بۆ درەخت تێدا چاندن، ئەوە (فَلَـهُ الزَّرْعُ) بۆی دروستە: کشتوکاڵی تێدا بچێنێ، چونکە زیانی کەمترە، بەڵام (وَلاَ عَكْسَ) پێچەوانەکەی دروست نیە، واتە: ئەگەر بۆ کشتوکاڵ خواستبێتی، دروست نیە بۆ درەخت و خانوو بە کاری بێنێ، چونکە زیانیان زۆرترە (وَالصَّحيحُ) بە فەرموودەی ڕاست (أَنَّهُ لاَ يَغْرِسُ مُسْتَعيرٌ لِبناءٍ) ئەو ماڵخوازەی بۆ خانوو زەویەکەی خواستوە، بۆی دروست نیە: درەختی تێدا بچێنێ (وَكَذا الْعَكْسُ) هەروەها پێچەوانەکەشی دروست نیە، واتە: ئەگەر بۆ درەخت خواستبێتی دروست نیە خانووی تێدا دروست بکا.

(وَأَنَّهُ لاَ تَصِحُّ إعارَةُ الأَرْضِ مُطْلَقَةً) هەر بە فەرموودەی ڕاست: دروست نیە: زەوی بە خواستن بدرێ بێ باسکردنی سودەکەی (بَلْ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ نَوْعِ الْمَنْفَعَةِ) بەڵکو بە مەرج

(فَصْلٌ) لِكُلٍّ مِنْهُما رَدُّ الْعارِيَةِ مَتى شاءَ إِلاَّ إِذا أَعارَ لِلدَّفْنِ فَلا يَرْجِعُ حَتَّى يَنْـدَرِسَ أَثَـرُ الْمَدْفُونِ وَإِذا أَعارَ لِلْبِناءِ أَوِ الْغِراسِ وَلَمْ يَذْكُرْ مُدَّةً ثُمَّ رَجَعَ إِنْ كانَ شَرَطَ الْقَلْعَ مَجَّاناً لَزِمَهُ،

---

داندراوە: جۆری سود لێوەرگرتنەکەی دیاری بکرێ، بەڵام ئەگەر بڵێ: بە خواستن دامە تۆ، تاکو سودی لێوەربگری بە بۆچوونی خۆت، یان چۆن بەخۆت حەز دەکەی. ئەوە دروست دەبێو چۆن حەز دەکا سودی لێوەردەگرێ.

ئینجا بزانە: هەر شتێك -وەکو زەوی- لە چەند ڕوویکەوە سووی لێوەربگیرێ، وەك: وولاغ، ئەویش وەکو زەوی بڕیاری بۆ دەدرێ: لە گشت ئەو ڕوونکردنەوانەی ڕابردوودا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی هەڵوەشاندنەوەی خواستن ﴾

(لِكُلٍّ مِنْهُما) بۆ خوازدەرەکەو بۆ ماڵخوازەکە دروستە: هەر یەکەیان (رَدُّالْعارِيَـةِ مَتـى شـاءَ) پەشیمان ببێتەوەو ماڵە خواستراوەکە بگەڕێنێتەوە، هەر کاتێك حەز دەکا (إِلاَّ إِذا أَعارَ لِدَفْنٍ) تەنها ئەگەر زەویەکی بە خواستن دایێ بۆ ناشتنی مردوویێك، مردووەکەشی تێدا نێژرابو، ئەو کاتە (فَلاَ يَرْجِعُ) بۆ هیچ لایەکیان دروست نیە: پەشیمان ببێتەوە (حَتَّى يَنْدَرِسَ أَثَرُالْمَدْفُونِ) تا ئاسەواری مردووەکە دەبڕێو دەبێتە خۆڵ، ئەو کاتە دروستە پەشیمان ببێتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە خوازدەرەکەو لە ماڵخوازەکە -تەنها- یەکێکیان بمرێ، یان شێت ببێ، یان بێهۆش ببێ، یان قەدەغەی لە سەر دابندرێ، ئەوە یەکسەر خواستنەکە هەڵدەوەشێتەوە، کەوابو: واجبە: ماڵخوازەکە، یان میراتگرەکەی -بە پەلە- ماڵە خواستراوەکە بگەڕێننەوە، ئەگینا: دەبنە زامین.

جا بزانە: ئەگەر لە دوای پەشیمانبوونەوەی خوازدەرەکە، ماڵخوازەکە خواستراوەکەی بەکار هێنا، ئەوە ئەگەر نەیزانیبێ پەشیمان بۆتەوە کرێی ناکەوێتە سەر، وە ئەگەر زانیبێتی دەیکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر لە دوای مردنو شێتبوونو بێهۆشبوونی خوازدەرەکە بە کاری بێنێ، ئەو کاتە کرێی دەکەوێتە سەر، جا زانیبێتی، یان نەیزانیبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِذا أَعارَ لِلْبِناءِ أَوِالْغِراسِ)هەر کاتێك زەویەکی بە خواستن دایێ بۆ خانوو تێداکردن، یان بۆ درەخت تێداچاندن (وَلَمْ يَذْكُرْ مُدَّةً) باسی هیچ ماوەیەکیشی نەکرد (ثُمَّ) ئینجا لە دوای خانوو کردنو درەخت چاندن (رَجَعَ) خوازدەرەکە پەشیمان بۆوە، ئەوە تەماشا دەکەین: (إِنْ كانَ شَرَطَ الْقَلْعَ مَجَّاناً) ئەگەر خوازدەرەکە بە مەرجی دانابێ: ماڵخوازەکە بە خۆڕایی- بە بێتۆڵە درەختەکەو خانووەکە هەڵکەنێو لایانببا، ئەوە (لَزِمَهُ) لە سەر

وَإِلاَّ فَإِنْ اخْتارَ الْمُسْتَعِيرُ اَلْقَلْعَ قَلَعَ، وَلاَ يَلْزَمُهُ تَسْوِيَةُ الأَرْضِ فِي‌الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ تَلْزَمُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِنْ لَمْ يَخْتَر لَمْ يُقْلَعْ مَجَّاناً، بَلْ لِلْمُعِيرِ الْخِيارُ بَيْنَ أَنْ يُبْقِيَهُ بِأُجْرَة أَوْ يَقْلَعَ وَيَضْمَنَ أَرْشَ النَّقْصِ، قِيلَ أَوْ يَتَمَلَّكَهُ بِقِيمَتِه، فَإِنْ لَمْ يَخْتَرْ لَمْ يُقْلَعْ مَجَّاناً إِنْ بَذَلَ الْمُسْتَعِيرُ اَلأُجْرَةَ وَكَذَا إِنْ لَمْ يَبْذُلْها فِي‌الأَصَحِّ،

---

ماڵخوازەکە واجبە: هەڵیانبکەنێو لایان ببا، جا ئەگەر لاینەبردن، ئەو کاتە خوازدەرەکە بەخۆی لایاندەبا، جا ئەگەر پێویستی بە کرێکار هەبو، ئەو کاتە لە سەر حیسابی ماڵخوازەکە کرێیەکە دەدا، شاهیدیش دەگرێ تاکو بتوانێ لێی وەربگرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

(وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر هەڵکەندن‌و لابردنی بە مەرج دانەنابێ، ئەو کاتە: (فَإِنِ اخْتارَ الْمُسْتَعِيرُ الْقَلْعَ)ئەگەر ماڵخوازەکە -بەخۆی- هەڵکەندن‌و لابردنی هەڵبژارد، ئەوە (قَلَعَ) هەڵیدەکەنێ‌و لایدەباو مافی تۆڵە وەرگرتنیشی نیە، هەم (وَلاَ يَلْزَمُهُ تَسْوِيَةُ الأَرْضِ فِي‌الأَصَحِّ) لە سەری واجب نیە زەویەکەش ڕێك بخاتەوە، بەلام (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: (الأَصَحُّ تَلْزَمُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: لە سەری واجبە: زەویەکە ڕێك بخاتەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەلام لە سەری واجب نیە: گڵێکیتری بۆ بێنێ ئەگەر گڵەکەی خۆی بەشی نەکردەوە.

(وَإِنْ لَمْ يَخْتَر) جا ئەگەر ماڵخوازەکە هەڵکەندنی هەڵنەبژارد (لَمْ يُقْلَعْ مَجَّاناً) نابێ بە بێ‌تۆڵە هەڵبکەندرێ، چونکە بە ڕێگایەکی شەرعی درەخت‌و خانووەکە لە زەویەکەدا دانراون (بَلْ لِلْمُعِيرِ الْخِيارُ) بەڵکو -ئەو کاتە- خوازدەرەکە مافی هەڵبژاردنی یەکێك لەو سێ ڕێگایانەی هەیە:

یەکەم: (بَيْنَ أَنْ يُبْقِيَهُ بِأُجْرَة) یان خانووەکەو درەختەکە بە کرێ لە زەویەکەیدا بهێڵێتەوە. دووەم: (أَوْ يَقْلَعَ وَيَضْمَنَ أَرْشَ النَّقْصِ) یان درەخت‌و خانووەکە هەڵبکەنێ‌و تۆڵەی ناتەواویەکەشی بدا. سێیەم: (قِيلَ) لە فەرموودەیەکدا -کە بە ڕاستتر دانراوە- (أَوْ يَتَمَلَّكَهُ بِقِيمَتِهِ) یان درەخت‌و خانووەکە لە ماڵخوازەکە دەکڕێ بە نرخی ڕۆژی کڕین، جا هەر کاتێك خوازدەرەکە یەکێکی لەو سێیانە هەڵبژارد، لە سەر ماڵخوازەکەش واجبە: لەگەڵی ڕێك بکەوێ، ئەگینا: زۆری لێدەکرێ -بە بێ‌تۆڵەوەرگرتن- درەخت‌و خانووەکەی لاببا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(فَإِنْ لَمْ يَخْتَرْ) بەلام ئەگەر خوازدەرەکە هیچێکی لەو سێیانە هەڵنەبژارد، ئەو کاتەش (لَمْ يُقْلَعْ مَجَّاناً) درەخت‌و خانووەکە بە بێ‌تۆڵە هەڵناکەندرێن (إِنْ بَذَلَ الْمُسْتَعِيرُ الأُجْرَةَ) ئەگەر ماڵخوازەکە کرێیەکە بدا (وَكَذَا إِنْ لَمْ يَبْذُلْها) هەروەها ئەگەر کرێیەکەش نەدا، هەڵناکەندرێن (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ثُمَّ قِيلَ يَبِيعُ الْحاكِمُ الأَرْضَ وَما فِيها وَتُقْسَمُ بَيْنَهُما، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُعْرِضُ عَنْهُما حَتَّى يَخْتارا شَيْئاً، وَلِلْمُعِيرِ دُخُولُها وَالإِنْتِفاعُ بِها، وَلاَ يَدْخُلُها الْمُسْتَعِيرُ بِغَيْرِ إِذْنٍ لِلتَّفَرُّجِ، وَيَجُوزُ لِلسَّقْيِ وَالإِصْلاحِ فِي الأَصَحِّ، وَلِكُلٍّ بَيْعُ مِلْكِه، وَقِيلَ لَيْسَ لِلْمُسْتَعِيرِ بَيْعُهُ لِثالِث، وَالْعارِيَةُ الْمُؤَقَّتَةُ كَالْمُطْلَقَة، وَفِي قَوْلٍ لَهُ الْقَلْعُ فِيها مَجَّاناً إِذا رَجَعَ،

---

(ثُمَّ قِيلَ يَبِيعُ الْحاكِمُ الأَرْضَ وَما فِيها) ئینجا لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: دادوەر زەویەکەو درەختو خانووەکە وێکڕا دەفرۆشێو (وَتُقْسَمُ بَيْنَهُما) پارەکەش لە نێوان خوازدەرەکەو ماڵخوازەکەدا بەش دەکا.

بەلام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يُعْرِضُ عَنْهُما حَتَّى يَخْتارا شَيْئاً) دادوەر وازیان لێدێنێ تا -بەخۆیان- شتێك هەڵدەبژێرنو کێشەکە دەبڕێتەوە.

(وَ) لەو حاڵەتەی وازیان لێدێنێ (لِلْمُعِيرِ دُخُولُها وَالإِنْتِفاعُ بِها) بۆ خوازدەرەکە دروستە بچێتە ناو زەویەکەیخۆیو سودی لێوەربگرێ.

بەلام (وَلاَ يَدْخُلُها الْمُسْتَعِيرُ بِغَيْرِ إِذْنٍ) نابێ ماڵخوازەکە بە بێئیزنی خوازدەرەکە بڕواتە ناو زەویەکە (لِلتَّفَرُّجِ) بۆ غەم ڕەواندن، بەلام (وَيَجُوزُ لِلسَّقْيِ وَالإِصْلاحِ) دروستە بۆ ئاودانو چاککردنەوەو میوەڕنین بچێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَ) هەروەها (لِكُلٍّ بَيْعُ مِلْكِه) بۆ خوازدەرەکەو بۆ ماڵخوازەکە دروستە: هەر یەکەیان ملکی خۆی بفرۆشێتە ئەویتر، یان بێگانەیەك (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (لَيْسَ لِلْمُسْتَعِيرِ بَيْعُهُ لِثالِثٍ) بۆ ماڵخوازەکە دروست نیە: درەختو خانووەکەی بفرۆشێتە سێیەمێکی بێگانە.

ئینجا بزانە: دروستبوونی فرۆشتن لەو حاڵەتەدایە: کە زەویەکە، یان درەختو خانووەکە وەقف نەکرابن، چونکە فرۆشتنی وەقفکراو دروست نابێ.

کەوابو: ئەگەر خانووەکە کرابوە مزگەوت، ئەو کاتە: یان دەبی بە کرێ بهێڵدرێتەوە، یان بروخێندرێو تۆڵەی ناتەواویی بدرێ، جا -ئەگەر بگونجێ- کەلوپەلەکەیشی بکرێتەوە مزگەوت، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

(وَالْعارِيَةُ الْمُؤَقَّتَةُ) ئەو خواستنەی ماوەیەکی بۆ داندراوە (كَالْمُطْلَقَةِ) وەك ئەو خواستنەیە کە ماوەی بۆ دانەندرابێ: لە گشت بڕیارەکانیڕابردوودا، واتە: جیاوازی نیەو یەکسانە: پێش تەواوبوونی ماوەکە، یان دوای تەواوبوونی ماوەکە پەشیمان ببێتەوە، لە هەردوو حاڵەتدا گشت ئەو بڕیارانەیڕابردووی تێدا دێنە جێ، چونکە ماوە دانان گفتێکە واجب نیە جێبەجێ بکرێ، بەلام (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (لَهُ الْقَلْعُ فِيها مَجَّاناً) لە خواستنی بە ماوەدا بۆ خوازدەرەکە دروستە: درەختو خانووەکە بە بێتۆڵە هەڵبکەنێ (إِذا رَجَعَ) هەر کاتێك لە دوای تەواوبوونی ماوەکە پەشیمان ببێتەوە.

وَإِذا أَعارَهُ لِزِراعَةٍ وَرَجَعَ قَبْلَ إِدْراكِ الزَّرْعِ فَالصَّحِيحُ أَنَّ عَلَيْهِ الإِبْقاءَ إِلَى الْحَصادِ، وَأَنَّ لَهُ الأُجْرَةَ، فَلَوْ عَيَّنَ مُدَّةً وَلَمْ يُدْرِكْ فِيها لِتَقْصِيرِهِ بِتَأْخِيرِ الزِّراعَةِ قَلَعَ مَجّاناً، وَلَوْ حَمَلَ السَّيْلُ بَذْراً إِلَى أَرْضِهِ فَنَبَتَ فَهُوَ لِصاحِبِ الْبَذْرِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُجْبَرُ عَلَى قَلْعِهِ، وَلَوْ رَكِبَ دابَّةً وَقالَ لِمالِكِها أَعَرْتَنِيها فَقالَ بَلْ آجَرْتُكَها، أَوْ اخْتَلَفَ مالِكُ الأَرْضِ وَزارِعُها كَذَلِكَ

---

(وَإِذا أَعارَهُ لِزِراعَةٍ) هەر كاتێك زەویەكەی بە خواستن داین بۆ كشتوكاڵێك (وَرَجَعَ قَبْلَ إِدْراكِ الزَّرْعِ) ئینجا پێش پێگەیینی كشتوكاڵەكە پەشیمان بۆوە، ئەوە (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست: (أَنَّ عَلَيْهِ الإِبْقاءَ إِلَى الْحَصادِ) لە سەری واجبە: تا كاتی دروێنە بیهێڵێتەوە، بەلام (وَأَنَّ لَهُ الأُجْرَةَ) بە فەرموودەی ڕاست-لە كاتی پەشیمانبوونەوەوە تا كاتی دروێنە- مافی كرێی هەیە (فَلَوْ عَيَّنَ مُدَّةً) جا ئەگەر ماوەیەكی بۆ كشتوكاڵەكە دیاری كرد (وَلَمْ يُدْرِكْ فِيها) لەو ماوەیەشدا كشتوكاڵەكە پێنەگەیشت (لِتَقْصِيرِهِ بِتَأْخِيرِ الزِّراعَةِ) چونكە ماڵخوازەكە كەمتەرخەمی كردبو بە هۆی دواخستنی چاندن، ئەو كاتە (قَلَعَ مَجّاناً) بە بێ تۆڵە كشتوكاڵەكە هەڵدەكەنێ.

(وَلَوْ حَمَلَ السَّيْلُ بَذْراً إِلَى أَرْضِهِ) ئەگەر لافاو تۆوی دانەوێڵەیەك، یان لقە درەختێك، یان دەنكی میوەیەكی هێنا ناو زەویەكەی (فَنَبَتَ) ئینجا لە ناو زەویەكەیدا دانەوێڵەكە، یان لقەكە، یان دەنكەكە ڕواو سەوز بو (فَهُوَ لِصاحِبِ الْبَذْرِ) ئەوە هەر هی خاوەنی تۆیەكەیە، لە سەر خاوەن زەویەكەش واجبە: ئاگاداری بكاتەوەو بیداتەوە (وَالأَصَحُّ) فەرموودەیڕاستتر (أَنَّهُ يُجْبَرُ عَلَى قَلْعِهِ) خاوەنەكە ناچار دەكرێ سەوزبووەكەی هەڵبكەنێو لایببا.

هەروەها ئەگەر ڕەگەكانی درەختێك بێنە ناو زەویەكەیو لقیان لێ سەوز ببێ، ئەم سەوزبووەش هەر هی خاوەنی درەختەكەیەو خاوەنەكەش ناچار دەكرێ لایانببا، جا ئەگەر خاوەنەكە سەوزبووەكەی لانەبرد، ئەو كاتە خاوەن زەویەكە بە خۆی لایدەبا، هەروەك ئەگەر بە هۆی لافاو-واتە: یان بە هۆیەكیتر- بەردو گڵی زەویەكەی سەرەوە هاتە ناو زەویەكەی خوارەوە، ئەو كاتەش خاوەنی خوارەوە بۆی دروستە: خاوەنی سەرەوە ناچار بكا: تاكو بەردو گڵەكەی لاببا، بەلام ئەگەر خاوەنەكە ولزی لە دانەوێڵەكە، یان لە شتەكانیتر هێنا، یان بەگوێرەی عادەت بە زۆری ولز لەو جۆرە شتانە دەهێندرا، ئەو كاتە دەبێتە هی خاوەن زەویەكە، هەروەك لە (تحفة)دا ئەم باسە ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ رَكِبَ دابَّةً) ئەگەر سواری ووڵاغێك بوو و (وَقالَ لِمالِكِها أَعَرْتَنِيها) گوتیە خاوەنەكەی: ووڵاغەكەت بە خواستن داومێ (فَقالَ: بَلْ آجَرْتُكَها) خاوەنەكەش گوتی: بەڵكو بە كرێ داومەتە تۆ (أَوِ اخْتَلَفَ مالِكُ الأَرْضِ وَزارِعُها كَذَلِكَ) یان خاوەن زەویەكەو داچێنەری

فَالْمُصَدَّقُ الْمالِكُ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَكَذَا لَوْ قالَ: أَعَرْتَنِي وَقالَ بَلْ غَصَبْتَ مِنِّي، فَإِنْ تَلِفَتِ الْعَيْنُ فَقَدْ اتَّفَقا عَلَى الضَّمانِ، لَكِنِ الأَصَحُّ أَنَّ الْعارِيَةَ تُضْمَنُ بِقيمَةِ يَوْمِ التَّلَفِ، لاَ بِأَقْصَى الْقِيَمِ وَلاَ بِيَوْمِ الْقَبْضِ، فَإِنْ كانَ ما يَدَّعِيهِ الْمالِكُ أَكْثَرَ حَلَفَ لِلزِّيادَةِ.

## (كِتابُ الْغَصْبِ)

هُوَ الإِسْتِيلاَءُ عَلَى حَقِّ الْغَيْرِ عُدْواناً،

---

كشتوكاڵەكە ئەوها بووە كێشەیان، ئەوە (فَالْمُصَدَّقُ الْمالِكُ) لە هەردوو كێشەكەدا-ئەگەر شاهید نەبێ- بە سوێندخواردن باوەڕ بە خاوەن وولاغو خاوەن زەویەكە دەكرێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستیمەزهەب. واتە: خاوەنەكە سوێند دەخوا: (بە خواستن نەمداوەتێ بەڵكو بە كرێ داومەتێ). ئینجا كە سوێندی خوارد مافی كرێی هاووێنەی هەیە.

(وكَذَا) هەروەها-بە سوێندخواردن- باوەڕ بە خاوەنەكە دەكرێ (لَوْ قالَ: أَعَرْتَنِي) ئەگەر سوارەكە، یان داچێنەرەكە بڵێ: بە خواستن داومێ (وَقالَ بَلْ غَصَبْتَ مِنِّي) خاوەنەكەش بڵێ: بەڵكو لە منت زەوت كردوە. ئینجا كە سوێندی خوارد مافی كرێی هاووێنەی هەیە (فَإِنْ تَلِفَتِ الْعَيْنُ) جا ئەگەر-لەم مەسەلەیەدا- پێش گەڕاندنەوە ماڵەكە فەوتا، ئەوە (فَقَدْ اتَّفَقا عَلَى الضَّمانِ) هەردوو لا یەكدەنگن لە سەر زامینی، چونكە ماڵی خواستراو و ماڵی زەوتكراو هەردووكیان تۆڵەیان بۆ داندراوە.

(لَكِنِ الأَصَحُّ) بەڵام بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الْعارِيَةَ تُضْمَنُ بِقيمَةِ يَوْمِ التَّلَفِ) ماڵی خواستراو بە گوێرەی نرخی ڕۆژی لەناوچوونی تۆڵەی بۆ دادەندرێ (لاَ بِأَقْصَى الْقِيَمِ) نەك بە گوێرەی نرخەهەرەزۆرەكەیی، هەم (وَلاَ بِيَوْمِ الْقَبْضِ) نەك بەگوێرەی‌نرخی ڕۆژی وەرگرتنی (فَإِنْ كانَ مايَدَّعِيهِ الْمالِكُ أَكْثَرَ) جا ئەگەر ئەوەی خاوەنەكە-بە هۆی زەوتكردن- داوای دەكرد زۆرتر بوو لە نرخی ڕۆژی لەناوچوون، ئەوكاتە (حَلَفَ لِلزِّيادَةِ) خاوەنەكە سوێند دەخوا: كە مافی ئەو زێدەییەی هەیە.

## ﴿ كِتابُ الْغَصْبِ: پەڕتوكی زەوتكردن-داگیركردن ﴾

(هُوَ) پێناسەی زەوتكردن-داگیركردن لە شەرعدا: (الإِسْتِيلاَءُ عَلَى حَقِّ الْغَيْرِ عُدْواناً) دەست بەسەرداگرتنی مافیكەسێكیتره بە ناهەق. كەوابو: ئەگەر داوای شتێك لە كەسێك بكا، ئەویش لە شەرمان، یان لە ترسان شتەكەی بداتێ، ئەوەش پێی دەگوترێ (غَصْبُ الْحَياءِ): زەوتكردنی شەرمنی، وەكو زەوتكردنی زۆرداری حەڕامەو نابێتە ملكی زەوتكەرەكە.

هەروەها: هەر شتێكیش بە مامڵەتێكی نادروستو دانەمەزراو وەربگرێ، ئەویش پێناسەی (غصب)-زەوتكردن دەیگرێتەوەو بڕیاری زەوتكراوی لە سەر دەدرێ، هەروەك

فَلَوْ رَكِبَ دابَّةً أَوْ جَلَسَ عَلَى فِراشٍ فَغاصِبٌ وَإِنْ لَمْ يَنْقُلْ، وَلَوْ دَخَلَ دارَهُ وَأَزْعَجَهُ عَنْها أَوْ أَزْعَجَهُ وَقَهَرَهُ عَلَى الدَّارِ وَلَمْ يَدْخُلْ فَغاصِبٌ، وَفِي الثَّانِيَةِ وَجْهٌ واهٍ، وَلَوْ سَكَنَ بَيْتاً وَمَنَعَ الْمالِكَ مِنْهُ دُونَ باقِي الدَّارِ فَغاصِبٌ لِلْبَيْتِ فَقَطْ، وَلَوْ دَخَلَ بِقَصْدِ الإِسْتِيلاءِ وَلَيْسَ الْمالِكُ فِيها فَغاصِبٌ، وَإِنْ كانَ وَلَمْ يُزْعِجْهُ

---

لە (بجیرمی)دا فەرموویەتی‌و لە ئاگاداریەکەی‌داهاتوو و لە(باسی ماوەی بەکرێدان)دا وێنەی بۆدێنین، إن شاء الله تعالى.

ئینجا بزانە: زەوتکردن لە گوناهە گەورەکانە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ لە نێوان خۆتاندا ماڵی‌یەکتری بە ناهەق مەخۆن. هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ﴾ رواه الشيخان، خوێنتان‌و ماڵتان‌و ئابرووتان‌-ناموستان لە سەر یەکتری حەرامە.

(فَلَوْ رَكِبَ دابَّةً) جا ئەگەر-بێ‌ئیزن- سواری وولاغێکی، یان ئوتومبێلێکی کەسێکی‌تر بوو (أَوْ جَلَسَ عَلَى فِراشٍ) یان-بێ‌ئیزن- لە سەر ڕایەخی کەسێکی‌تر دانیشت (فَغاصِبٌ) ئەوە بە زەوتکەر دادەندرێ (وَإِنْ لَمْ يَنْقُلْ) هەرچەندە شتەکەشی نەگواستبێتەوە بۆ شوێنێکی‌تر، بەڵام ئەگەر مانگایەك وەگەڵ گاگەلی‌گاوانێك بکەوێ، ئەوە ئەگەر گاوانەکە لەگەڵ مانگایەکانی خۆی ئەو مانگایەش لێبخوڕێ، دەبێتە زامین، ئەگەر لێی نەخوڕێ-واتە: بەخۆی بڕوا- نابێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ دَخَلَ دارَهُ) ئەگەر چووە ناو خانووی کەسێك (وَأَزْعَجَهُ عَنْها) خاوەنەکەی لە خانووەکە دەرکردە دەرەوە (أَوْ أَزْعَجَهُ وَقَهَرَهُ عَلَى الدَّارِ) یان دەری کردە دەرەوەو قەدەغەشی کرد: دەستکاری خانووەکەی بکا، بەڵام (وَلَمْ يَدْخُلْ) بە خۆی نەچووە ناو خانووەکە، ئەوە (فَغاصِبٌ) لە هەردوو مەسەلەدا بە زەوتکەر دادەندرێ (وَفِي الثَّانِيَةِ وَجْهٌ واهٍ) لە مەسەلەی دووەمدا فەرموودەیەکی زۆر بێ‌هێز هەیە: کە نابێتە زەوتکەر.

(وَلَوْ سَكَنَ بَيْتاً) ئەگەر لە ژوورێکی خانووەکەدا نیشتەجێ بو، هەم (وَمَنَعَ الْمالِكَ مِنْهُ دُونَ باقِي الدَّارِ) خاوەنەکەشی-تەنها- لەو ژوورە قەدەغە کرد، نەك لە بەشەکانی‌تری خانووەکە، ئەو کاتە (فَغاصِبٌ لِلْبَيْتِ فَقَطْ) تەنها بە زەوتکەری ژوورەکە دادەندرێ، نەك بەشەکانی‌تری خانووەکە.

(وَلَوْ دَخَلَ بِقَصْدِ الإِسْتِيلاءِ) ئەگەر بە مەبەستی دەست بەسەرداگرتن چووە ناو خانووەکە (وَلَيْسَ الْمالِكُ فِيها) لەو حاڵەتەشدا: نە خاوەنەکەو نە جێنیشێکی خاوەنەکە لە ناو خانووەکەدا نەبو، ئەوەش (فَغاصِبٌ) بە زەوتکەر دادەندرێ (وَ) هەروەها (إِنْ كانَ وَلَمْ يُزْعِجْهُ) ئەگەر خاوەنەکە، یان جێگرێکی خاوەنەکە لە ناو خانووەکەدا بوو، بەڵام دەری‌نەکردە

فَغاصِبٌ لنصْفِ الدَّارِ إلاَّ أنْ يَكُونَ ضَعِيفاً لاَ يُعَدُّ مُسْتَوْلِياً عَلَى صاحِبِ الدَّارِ، وَعَلَى الْغَاصِبِ اَلرَّدُّ، فَإِنْ تَلِفَ عِنْدَهُ ضَمِنَهُ،

---

دەرەوە، ئەو کاتەش (فَغاصِبٌ لِنِصْفِ الدَّارِ) زەوتکەری نیوەی خانووەکەیە، چونکە هەردوو لا-بە هەق و بە ناهەق- دەستیان بە سەردا گرتوە (إلاَّ أنْ يَكُونَ ضَعِيفاً لاَ يُعَدُّ مُسْتَوْلِياً عَلَى صاحِبِ الدَّارِ) مەگەر ئەوەی-بە ناهەق- چۆتە ناو خانووەکە بێهێز بێو دەسەڵاتی بەسەر خاوەن خانووەکەدا نەبێ، ئەو کاتە بە زەوتکەر دانانرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر ڕێگەی نەدا خاوەنەکە کەلوپەلی خۆی لە خانووەکەی بباتە دەرەوە، ئەو کاتە بە زەوتکەری کەلوپەلەکەش دادەنرێ، هەرچەندە مەبەستیشی زەوتکردنی کەلوپەلەکە نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە پێناسەی زەوتکردن و لەو مەسەلانەی ڕابردوو ئاشکرا دەبێ: هەر کەسێك بە کرێ لە دوکانی، یان لە خانووی کەسێکدا نیشتەجێ ببێو ماوەی بەکرێدانەکەش تەواو ببێ، یان مامڵەتی بەکرێدانەکە دانەمەزراو بێ: وەك خاوەنەکە بە ئەندازەی کرێیەکە ڕازی نەبێ، ئەوە لە سەری واجبە: یەکسەر لە دوکان و لە خانووەکە بڕواتە دەرەوە، یان خاوەنەکەی ڕازی بکا، ئەگینا: بە زەوتکەر دادەنرێ و تا لە دوکان و خانووەکەشدا بێ، لە گشت کاتێکیدا لە سەر گوناهی زەوتکردن بەردەوام دەبێ، جگە لەوەش لە (المجموع)دا فەرموویەتی: نوێژکردن لە شوێنی زەوتکراودا حەرامە. هەروەك لە باسی نوێژبڕەکاندا ڕوونمان کردەوە.

(وَعَلَى الْغَاصِبِ اَلرَّدُّ) لە سەر زەوتکەرەکە واجبە: خودیزەوتکراوەکە-بە پەلە- بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، هەرچەندە ئەرکیگەڕاندنەوەشی زۆر بێ، واتە: ئەرکی گەڕاندنەوەی زەوتکراوەکە لە سەر زەوتکەرەکەیە، هەروەك لە (فصل)یداهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ الله تعالَى، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿عَلَى الْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ﴾ رواه أحمد وصححه الحاكم، ئەو دەستەی شتێکی وەرگرتوە، واجبە: بیپارێزێ تا دەیداتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر زەوتکەرەکە شتە زەوتکراوەکەی لە بەر دەستی خاوەنەکەی دانا، یان لە خانووی خاوەنەکەی داناو خاوەنەکەش-لە هەردوو حاڵەتدا- زانی ئەوە ماڵی خۆیەتی و هیچ شتێکیش ڕێگەی وەرگرتنی ماڵەکەی لێنەدەکرد، ئەوە زەوتکەرەکە ئازاد دەبێ، هەروەها ئەگەر شتەزەوتکراوەکە بداتەوە دەست بەکرێگری شتەکە، یان دەست ئەمینداری شتەکە، ئەو کاتەش ئازاد دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ تَلِفَ عِنْدَهُ) جا ئەگەر زەوتکراوەکە- هەمووی، یان بەشێکی- لە لای زەوتکەرەکە بە خۆی فەوتا، یان فەوتێندرا، ئەوە (ضَمِنَهُ) زەوتکەرەکە دەبێتە زامینی فەوتاوەکەو

وَلَوْ أَتْلَفَ مالاً فِي يَدِ مالكه ضَمنَهُ، وَلَوْ فَتحَ رَأْسَ زِقٍّ مَطْـرُوحٍ عَلَـىالأَرْضِ فَخَـرَجَ مَافِيه بِالْفَتْحِ، أَوْ مَنصُوبٍ فَسَقَطَ بِالْفَتْحِ وَخَرَجَ مافيه ضَمِنَ، وَإِنْ سَقَطَ بِعارِضِ رِيحٍ لَمْ يَضْمَنْ، وَلَوْ فَتحَ قَفَصاً عَنْ طائِرٍ وَهَيَّجَهُ فَطارَ ضَمِنَهُ، وَإِنِ اقْتصَرَ عَلَـىالْفَتْحِ فَـالأَظْهَرُ أَنَّهُ إِذَا طَارَ فِي الْحالِ ضَمِنَ، وَإِنْ وَقَفَ ثُمَّ طَارَ فَلاَ،

---

تۆڵەی دەکەوێتە سەر-بە (اجماع)ی زانایانی ئیسلام- بەو جۆرەی لە (فصل)ی‌داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَلَوْ أَتْلَفَ مالاً فِي يَدِ مالكِهِ) ئەگەر ماڵێکی لە دەستی خاوەنەکەی‌دا فەوتاند (ضَمِنَهُ) دەبێتە زامینی، واتە: تۆڵەی ماڵەکەی دەکەوێتە سەر (وَ) هەروەها (لَوْ فَتَحَ رَأْسَ زِقٍّ مَطْرُوحٍ عَلَىالأَرْضِ) ئەگەر سەرقەپاغ، یان زاربێنی مەشکێکی درێژکراو لە سەر زەوی‌ی کردەوە (فَخَرَجَ ما فِيهِ بِالْفَتْحِ) بە هۆی کردنەوەکە ئەوەی لە ناو مەشکەکەدا بوو، هاتە دەرەوە (أَوْ مَنْصُوبٍ) یان مەشکەکە بە پێوە داندرابو (فَسَقَطَ بِالْفَتْحِ) بە هۆی کردنەوەی زاربێنەکە کەوتە سەر زەوی‌و (وَخَرَجَ ما فِيهِ) ئەوەی تێ‌یدابو، هاتە دەرەوە (ضَمِنَ) لە هەردوو حاڵەتدا دەبێتە زامین، بەڵام (وَإِنْ سَقَطَ بِعارِضِ رِيحٍ) ئەگەر بە هۆی هاتنی با، یان بە هۆیەکی‌تر مەشکەکە کەوت (لَمْ يَضْمَنْ) نابێتە زامین.

(وَلَوْ فَتَحَ قَفَصاً عَنْ طائِرٍ) ئەگەر قەفەسێکی لە باڵندەیەك کردەوەو (وَهَيَّجَهُ فَطارَ) باڵندەکەشی وەجولە خست‌و هەڵفڕی، یان کتك خواردی (ضَمِنَهُ) دەبێتە زامین، بەڵام (وَإِنِ اقْتَصَرَ عَلَىالْفَتْحِ) ئەگەر تەنها قەفەسەکەی کردەوە، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ إِذَا طَارَ فِيالْحالِ) ئەگەر هەر ئەو دەم باڵندەکە هەڵفڕی (ضَمِنَ) دەبێتە زامین (وَإِنْ وَقَفَ ثُمَّ طَارَ) ئەگەر ماوەیەك وەستا، ئینجا فڕی (فَلاَ) نابێتە زامینی.

﴿ ئاگـاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر کەسێك ڕاگری کەشتی‌یەك-واتە: یان ئوتومبێلێك- بکاتەوەو بە هۆی کردنەوەکەی زیانێکی بکاتێ، دەبێتە زامینی، هەروەها ئەگەر پەتی وڵاغێك بکاتەوە، یان دەرگەی تەویلەکەی بکاتەوەو بە هۆی کردنەوەکەی شتێکی بە سەر بێ، دەبێتە زامینی‌و ئەگەر شتێکیشی لە تەنیشت بێ‌و یەکسەر بیخوا، ئەوە دەبێتە زامینی شتەکەش، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر یەکێك دووزمانی بکاو ناوی کەسێك بداتە ستەمکارێك، ستەمکارەکەش-بە هۆی دووزمانیەکەی وی- شتێك بە ناهەق لە کەسەکە بستێنێ، ئەوە ئەگەر ستەمکارەکە بە ماڵ سەندن ناسراوبو، دووزمانیەکەش بە ناهەق بوو، ئەو کاتە کەسەکە بۆی دروستە تۆڵەی ماڵەستێندراوەکەی لە دووزمانەکە وەرگرێتەوە، هەروەك لە (بغيةالمسترشدين)دا-بە پێچەوانەی (تحفة)و (نهاية)- ڕوون کراوەتەوە.

وَالأَيْدي الْمُتَرَتِّبَةُ عَلَى يَدِالْغَاصِب أَيْدِى ضَمَان وَإنْ جَهلَ صاحِبُها الْغَصْبَ، ثُمَّ إنْ عَلِمَ فَكَغاصِبٍ مِنْ غَاصِب فَيَسْتَقِرُّ عَلَيْه ضَمَانُ مَا تَلِفَ عِنْدَهُ، وَكَذَا إنْ جَهِلَ وَكَانَتْ يَدُهُ فِي أَصْلِها يَدَ ضَمَان كَالْعارِيَة، وَإنْ كَانَتْ يَدَ أَمانَة كَوَديعَة

---

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا ئەگەر کرێکارێك-بە فەرمانی کاربەدەستێك- ناوی کۆمەڵەخەڵکێك بنووسێ‌و ناوەکانیش بداتە پارەتیدەرەکانی کاربەدەستەکە، ئەوانیش بە ناهەق پارە لە ناونووسراوەکان بستێنن، ئەوە کاربەدەستەکەو پارەتیدەرەکانی‌و ناونووسەکە-هەر سێکیان- ستەمەکەیان لە سەر دەنووسرێ لە دونیاو قیامەت، هەروەك لە (الدّرالمُنْتَقى)دا فەرموویەتی.

(وَالأَيْدِي الْمُتَرَتِّبَةُ عَلَى يَدِالْغَاصِبِ) ئەو دەستانەی زەوتکراوەکە لە دەستی زەوتکەرەکە وەردەگرن، گشتیان (أَيْدِي ضَمَانٍ) دەستی زامینن‌و ئەوانیش-وەکو زەوتکەرەکە- بە زەوتکەر دادەندرێن (وَإنْ جَهِلَ صاحِبُهاالْغَصْبَ) هەرچەندە خاوەن دەستەکانیش نەیانزانیبێ شتەکە زەوتکراوە.

(ثُمَّ إنْ عَلِمَ) ئینجا ئەگەر خاوەن دەستی‌دووەم زانیبی شتەکە زەوتکراوە، ئەوە (فَكَغاصِبٍ مِنْ غَاصِبٍ) دووەمەکە وەك زەوتکەرێك لە زەوتکەرێك وایە، واتە: هەرچی لە زەوتکەرەکە داوا بکرێ لەویش داوا دەکرێ، کەوابو: (فَيَسْتَقِرُّ عَلَيْهِ ضَمَانُ مَا تَلِفَ عِنْدَهُ) لە سەر خاوەن دەستی‌دووەم جێگیر دەبێ زامینی‌ی ئەو زەوتکراوەی لە لای وی فەوتاوە، واتە: ئەگەر زەوتکەرەکە تۆڵەی زەوتکراوەکەی لێوەرگیرا، مافی هەیە ئەویش ئەندازەی تۆڵەوەرگیراوەکە لە خاوەن دەستی‌دووەم وەربگرێتەوە، بەڵام خاوەن دەستی‌دووەم مافی نیە هیچ لە زەوتکەرەکە وەربگرێ.

جا ئەگەر هەردوو لا بووە کێشەیان: زەوتکەرەکە گوتی: پێم گوتی شتەکە زەوتکراوە. دووەمەکەش گوتی: پێت نەگوتم. ئەوە بە سوێندخواردن باوەڕ بە زەوتکەرەکە دەکرێ، بەڵام ئەگەر بڵێ: کەسێکی‌تر پێی گوتی: شتەکە زەوتکراوە. ئەو کاتە باوەڕ بە دووەمەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا، هەروەك لە (بجيرمی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وكَذَا إنْ جَهِلَ) هەروەها ئەگەر خاوەن دەستی‌دووەم نەشیزانیبێ شتەکە زەوتکراوە، زامینی‌ی هەر لە سەر جێگیر دەبێ (وَ) لەو حاڵەتەی نەزانیندا (كَانَتْ يَدُهُ فِي أَصْلِها يَدَ ضَمَانٍ) دەستی‌دووەمەکە دەستی زامینی بوو: (كَالْعارِيَةِ) وەك خواستن، واتە: شتە زەوتکراوەکە-لە زەوتکەر- بخوازێ، یان لێی بکڕێ، یان بە قەرز، یان بە بەخشین لێی وەربگرێ، لەو مەسەلانەشدا تۆڵەی هەر لە سەر دووەمەکەیە.

بەڵام (وَإنْ كَانَتْ يَدَأَمانَةٍ) ئەگەر خاوەن دەستی‌دووەم نەیزانیبو زەوتکراوەو بە دەستی ئەمینداری زەوتکراوەکەی لێوەرگرت: (كَوَدِيعَةٍ) وەك بە سپاردن لێی وەربگرێ، ئەو کاتە

فَالْقَرارُ عَلَى‌الْغَاصِبِ، وَمَتَى أَتْلَفَ الآخِذُ مِنَ الْغَاصِبِ مُسْتَقِلاًّ بِهِ فَالْقَرارُ عَلَيْهِ مُطْلَقـاً، وَإِنْ حَمَلَهُ الْغَاصِبُ عَلَيْهِ بِأَنْ قَدَّمَ لَهُ طَعَاماً مَغْصُوباً ضِيَافَةً فَأَكَلَـهُ فَكَـذَا فِي‌الأَظْهَـرِ، وَعَلَى هَذَا لَوْ قَدَّمَهُ لِمالِكِهِ فَأَكَلَهُ بَرِئَ الْغَاصِبُ.

---

(فَالْقَرارُ عَلَى‌الْغَاصِبِ) تۆڵـەی زەوتکراوەکـە لـە سـەر زەوتکەرەکە جێگیر دەبێ، کەواتـە: ئەگـەر خـاوەن دەسـتی‌دووەم تۆڵـەی زەوتکراوەکـە بـدا، مـافی هەیـە بگەڕێتـەوە سـەر زەوتکەرەکەو ئەنـدازەی تۆڵەکـەی لێوەربگرێتـەوە، بـەڵام زەوتکەرەکە مـافی نیـە هـیچ لـە دووەمەکە وەربگرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر یەکێك زۆری لە یەکێکی‌تر کرد: تـاکو شـتێك زەوت بکا، یان لـە نـاوی ببا، لەو دوو حاڵەتەشدا زامینیەکە لە سەر زۆردارەکـە جێگیر دەبێ‌و واجبـە: ئـەو تۆڵـەی شتەکە بدا، هەروەك لە (الشبراملسی)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر یەکێك ماڵێکی ناسراوێکی‌خۆی لـە دزێندەیـەك، یان لـە زەوتکـەرێك، یـان لـە دزێـك وەربگرێتـەوە، تـاکو بیداتـەوە خاوەنەکـەی، بـەڵام پـێش ئـەوەی بیداتـەوە، شتەکە فـەوتا، یـان گـوم بـو، ئـەوە نابێتـە زامـین، هـەروەك (القاضـي) فەرموویـەتی. بـەڵام ئەگـەر خاوەنەکـەی نەدەناسـی، یـان کەمتەرخـەمی‌ی کـرد، یـان مەبەسـتی دانـەوە نـەبو، ئـەو کاتـە دەبێتە زامین، ئینجا ئیمامی(السُّبْكي) ئەو فەرموودەیەی بەهێز کردوە: کە بـەو مەرجـە نابێتـە زامین ئەگەر ماڵەکـە مەترسـی فـەوتانی لێبکرێ‌و نەشتواندرێ دلوای‌تۆڵـەی لـە زەوتکەرەکـەی بکرێ، هەروەك لە(تحفة)و(الشروانی)دا لە سەرەتای ئەم باسەدا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: تا ئێستا باسی ئەوە بوو: زەوتکراوەکە بە خۆی بفـەوتێ، بـەڵام (وَمَتَـى أَتْلَـفَ الآخِـذُ مِـنَ الْغَاصِـبِ مُسْتَقِلاًّ بِـهِ) هـەر کاتێـك ئـەو دەسـتە دووەمـەی زەوتکراوەکـەی لـە زەوتکەرێك وەرگرتوە، سەربەخۆ زەوتکراوەکەی فەوتاند، ئەو کاتە (فَـالْقَرارُ عَلَيْـهِ) تۆڵـەی زەوتکراوەکە لە سەر دەستەوەرگرەکە جێگیر دەبێ‌و واجبە: ئەو تۆڵـەی بـژمێرێ (مُطْلَقاً) جا دەستەوەرگرەکە دەستی زامینی بێ، یان دەستی ئەمینداری بێ.

(وَإِنْ حَمَلَـهُ الْغَاصِـبُ عَلَيْـهِ) بـەڵام ئەگـەر سـەربەخۆ زەوتکراوەکـەی نەفەوتانـد، بـەڵکو زەوتکەرەکە هانی‌دا لە سەر فەوتاندنی (بِأَنْ قَـدَّمَ لَـهُ طَعَامـاً مَغْصُوباً ضِيافَةً فَأَكَلَهُ) وەك خواردەمەنیـەکی زەوتکـراوی بـە میوانـداری دابیتـێ، ئینجـا خـواردی (فَكَـذَا) تۆڵـەی خواردەمەنیەکە هەر لە سەر میوانەبخۆرەکە جێگیر دەبێ‌و واجبە: تۆڵـەی بـدا (فِي‌الأَظْهَـرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَعَلَـى هَـذَا) لـە سـەر فـەرموودەی بـەهێزتر (لَـوْ قَدَّمَـهُ لِمالِكِـهِ) ئەگـەر زەوتکەرەکـە خواردەمەنیەزەوتکراوەکـەی دایـە خاوەنەکـەی (فَأَكَلَـهُ) خاوەنەکـەش خـواردی‌و نەشیدەزانی خواردەمەنیەکەی خۆیـەتی، ئـەو کاتـە (بَـرِئَ الْغَاصِـبُ) زەوتکەرەکـە ئـازاد دەبێ، چونکە خاوەنەکە بە خۆی ماڵی‌خۆی فەوتاندوە.

(فَصْلٌ) تُضمَنُ نَفسُ الرَّقيقِ بقيمَته تَلفَ أوْ أُتلفَ تَحتَ يَد عاديَة، وأَبعاضُـــهُ الّتــي لاَ يَتقَدَّرُ أَرشُها منَ الحُرِّ بما نَقصَ منْ قيمَته، وكَذَا المُقَدَّرَةُ إنْ تَلفَتْ، وإنْ أُتلفَتْ فَكَــذَا فِي القَديمِ، وعَلَى الجَديد تَتقَدَّرُ منَ الرَّقيقِ، والقيمَةُ فيه كالدِّيَة فِي الحُرِّ، فَفي يَده نصْــفُ قيمَته، وسائرُ الحَيَوان بالقيمَة، وغَيرُهُ مثليٌّ ومُتقَوَّمٌ، والأَصحُّ أَنَّ المثْليَّ ما حَصرَهُ كَيْــلٌ أَوْ وَزْنٌ وجازَ السَّلَمُ فيه: كَماء وتُراب ونُحاس

---

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی تۆڵەی زەوتكراو و فەوتاوەكانیتر ﴾

(تُضمَنُ نَفسُ الرَّقيقِ) زامینی دادەندرێ بۆ گیانی كۆیله (بِقيمَتِهِ) به نرخهكهیخۆی، واته: تۆڵەی بۆ دادەندرێ به ئەندازەی نرخهكەی خۆی: كەم بێ، یان زۆر بێ، جا (تَلِفَ) به خۆی بفەوتێ (أوْ أُتلِفَ) یان بفەوتێندرێ (تَحتَ يَدٍعادِيَةٍ) فەوتانەكەشی لە ژێر دەستێكی زامیندا بێ: وەك دەستی زەوتكەرو ماڵخوازو مامڵەتكەر (وأَبعاضُهُ الّتِي لاَ يَتقَدَّرُ أَرشُها مِنَ الحُرِّ) ئەو بەشانەی كۆیله: كه له مرۆڤی ئازاد ئەندازەی تۆڵـەی بۆ دانەندراوه، ئەوانیش تۆڵەیان بۆ دادەندرێ (بما نَقَصَ مِنْ قيمَتِهِ) به گوێرەی كەمكردنەوەی لـه نرخـی كۆیلەكه (وكَذَا المُقَدَّرَةُ إنْ تَلِفَتْ) هـەروەها ئەوانـەی ئەنـدازەی تۆڵەشـیان بـۆ دانـدراوه، هـەر به گوێرەی كەمكردنەوه تۆڵەیان بۆ دادەندرێ، ئەگەر به خۆیان بفەوتێن.

(وَ) هـەروەها (إنْ أُتلِفَتْ) ئەگـەر بشـفەوتێندرێن (فَكَذَا فِي القَدِيمِ) هـەروەك فـەوتاوەكان تۆڵەیان بۆ دادەندرێ له فەرموودەی كۆندا، بەڵام (وعَلَى الجَدِيدِ) لەسـەر فـەرموودەی نوێ (تَتقَدَّرُ مِنَ الرَّقِيقِ) لـه كۆیلـەش ئەنـدازه بـۆ تۆڵەكـەی دادەنـدرێ، كـەوابو: (والقِيمَةُ فِيهِ) نرخـی بەشـه فەوتێندراوەكـه لـه كۆیلەكـەدا (كالدِّيَةِ فِي الحُرِّ) وەكـو خـوێنی بەشـه فەوتاوەكەی مرۆڤی ئازاده، كەواته: (فَفِي يَدِهِ) لـه دەسـتی كۆیلەكەدا ئەگـەر لێ‌ی كـراوه (نِصْفُ قِيمَتِهِ) نیـوەی نرخـی كۆیلەكـه واجب دەبێ، هـەروەك لـه مرۆڤـی ئازاددا نیوەی خوێنی واجب دەبێ.

(وَسائرُ الحَيَوانِ) گشـت گیانلەبـەرێكیتریش -جگـه لـه ئـادەمیزاد- تۆڵـەی بـۆ دادەنـدرێ (بالقِيمَةِ) به ئەندازەی نرخیخۆی، جا به خۆی -له ژێر دەسته زامینەكەدا- بفەوتێ، یان بفەوتێنـدرێ، هـەروەهاش بەشـەكانیگیانلەبەرەكەش تۆڵـەیان بـۆ دادەنـدرێ: بەگوێرەی كەمكردنەوەیان له نرخی گیانلەبەرەكه (وَغَيرُهُ) مڵـكو مـاڵیتریش -جگـه لـه گیانلەبـەر- دوو بەشه: (مِثْلِيٌّ) هاووێنەییەو (وَمُتَقَوَّمٌ) نرخ بۆ داندراوه:

ئینجا (والأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أنَّ المِثْلِيَّ) مەبەست به ماڵی هاووێنـەیی (ما حَصَرَهُ كَيْلٌ أَوْ وَزْنٌ وَجازَ السَّلَمُ فِيهِ) ئەوەیـه: بـه پێـوان، یـان بـه كێشـان ئەندازەكەی بزانـدرێو سـەلەمیشی تێدا دروسـت بێ: (كَماءٍ) وەك ئاوی سـاردو (وتُرابٍ) گڵو (ونُحاسٍ) مـسو

وَتِبْرٍ وَمِسْكٍ وَكافُورٍ وَقُطْنٍ وَعِنَبٍ وَدَقِيقٍ، لاَ غالِيَةٍ وَمَعْجُونٍ، فَيُضْمَنُ الْمِثْلِيُّ بِمِثْلِهِ تَلِفَ أَوْ أُتْلِفَ، فَإِنْ تَعَذَّرَ فَالْقِيمَةُ، وَالأَصَحُّ أَنَّ الْمُعْتَبَرَ أَقْصَى قِيَمِهِ مِنْ وَقْتِ الْغَصْبِ إِلَى تَعَذُّرِ الْمِثْلِ، وَلَوْ نَقَلَ الْمَغْصُوبَ الْمِثْلِيَّ إِلَى بَلَدٍ آخَرَ فَلِلْمالِكِ أَنْ يُكَلِّفَهُ رَدَّهُ وَأَنْ يُطالِبَهُ بِالْقِيمَةِ فِي الْحالِ

---

(وَتِبْرٍ) زێڕی پاککراوەو (وَ) هەروەها (مِسْكٍ وكـافُورٍ) کە بۆنیـان خۆشەو (وَقُطْنٍ) لۆکەو (وَعِنَبٍ) ترێو گشت میوەیتریش (وَدَقِيقٍ) ئارد (لاَغالِيَةٍ وَمَعْجُونٍ) نەك ئەو بۆنانەی لە زۆر شت تێکەڵکراون، یان گەنم وجۆی تێکەڵکراو.

هەروەها ئەو شتانەی بە ژماردن، یـان بـە پێـوانی گـەز ئەندازەیان بزانـدرێ: وەك ئـاژەڵو جل‌وبـەرگ، ئـەوانیش هاووێنـەیی نـین، بـەڵکو نـرخ بـۆ دانـدراون، واتـە: دەقرسـێندرێن، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: (فَيُضْمَنُ الْمِثْلِيُّ بِمِثْلِهِ) شـتی هاووێنـەیی تۆڵـەی بـۆ دادەنـدرێ: بـە وێنەکـەی خۆی، جیاوازی نیە: (تَلِفَ) شتەکە بە خۆی بفـەوتێ لـە لای زەوتکەرەکـە (أَوْ أُتْلِفَ) یـان بفەوتێندرێ (فَإِنْ تَعَذَّرَ) جا ئەگەر وێنەکـەی دەسـت نەکـەوت، ئـەو کاتـە (فَالْقِيمَةُ) نرخـی شتەکە واجب دەبێ لە تۆڵەی بدا.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەیڕاسـتتر (أَنَّ الْمُعْتَبَرَ) ئـەو نرخـەی بـۆ تۆڵـەی زەوتکراوەکـە ڕەچـاو دەکرێ (أَقْصَى قِيَمِهِ) نرخە هەرە بەرزەکەیەتی (مِنْ وَقْتِ الْغَصْبِ إِلَى تَعَذُّرِ الْمِثْلِ) لـە کـاتی زەوتکردنیـەوە تـا کـاتی دەسـتنەکەوتنی وێنەکـەی، واتـە: ئەگـەر لـە ڕۆژی زەوتکردنـیدا نرخی سەدو پەنجا دینـار بـوو، لـە ڕۆژی فەوتانیشـیدا سـەدو بیسـت دینـار بـوو، لـە ڕۆژی دەستنەکەوتنی وێنەکەشیدا سەد دینار بوو، ئەوە سەدو پەنجا دینارەکە واجب دەبێ لـە تۆڵـەی بـدا، ئینجـا بزانـە: ئەگـەر هـەر لـە سـەرەتاوە هـەردوو لا ڕازی بـبن نرخـی شـتەکە وەربگیرێ، ئـەوە دروسـتە، هەرچـەند وێنەکەشـی دەسـت بکـەوێ، هـەروەك لـە زۆریـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ نَقَلَ الْمَغْصُوبَ الْمِثْلِيَّ إِلَى بَلَدٍ آخَرَ) ئەگەر –زەوتکەرەکە– زەوتکراوەکـەی گواسـتبۆوە بـۆ شارێکی‌تر، ئەو کاتە (فَلِلْمالِكِ أَنْ يُكَلِّفَهُ رَدَّهُ) بۆ خاوەنەکـەی دروسـتە: داوا لـە زەوتکەرەکـە بکا: زەوتکراوەکە لە سەر ئەرکی‌خۆی بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی، هـەم (وَأَنْ يُطالِبَهُ بِالْقِيمَةِ فِي الْحالِ) بۆی دروستە: هـەر ئـەو دەم –پـێش گەڕاندنـەوەی– داوای نرخـی زەوتکراوەکـەی لێبکا، واتە: بەرزترینی نرخەکەی لە ڕۆژی زەوتکردنیەوە تا کاتی داوالێکردنی.

ئینجـا بزانـە: ئـەم تۆڵـە وەرگرتنـە بـۆ (الْحَيْلُولَةِ)یـە، واتـە: ئەگـەر نرخەکـەی لێوەرگرت، ئەو نرخـە –وەکـو ماڵێکی‌قـەرزکـراو– دەبێتـە مـڵکـی خـاوەنی‌زەوتکـراوەکـەو بـۆ خـۆی

فَإذا رَدَّهُ رَدَّها، فَإنْ تَلفَ فِي الْبَلَدالْمَنْقُول إلَيْه طالَبَهُ بالْمثلِ فِي أيِّ الْبَلَدَيْنِ شاءَ، فَإنْ فُقدَالْمثْلُ غرَّمَهُ قيمَةَ أَكْثَرالْبَلَدَيْنِ قيمَةً، وَلَوْ ظَفرَ بالْغَاصب فِي غَيْرِ بَلَدالتَّلف فَالصَّحيحُ أَنَّهُ إنْ كانَ لاَ مُؤْنَةَ لنَقْله كَالنَّقد فَلَهُ مُطالَبَتُهُ بالْمَثْلِ وَإلاَّ فَلاَ مُطالَبَةَ بالْمثْلِ بَلْ يُغَرِّمُهُ قيمَةَ بَلَدالتَّلَف، وَأَمَّاالْمُتَقَوَّمُ فَيُضْمَنُ بأَقْصَى قيمه منَ الْغَصْب إلَى التَّلَف،

---

دەستكاریی دەكاو گشت سودێكی لێدەبینێ، بەلام (فَإذا رَدَّهُ) هەر كاتێك زەوتكەرەكە زەوتكراوەكەی بۆ گەڕاندەوە (رَدَّها) ئەویش ئەو نرخەی -كە لە تۆڵە- لێی وەرگرتبو، بۆی دەگەڕێنێتەوە، جا ئەگەر نرخەكە نەمابو، ئەو كاتە شتێكیتری -بە ئەندازەی ئەو نرخەی- بۆ دەگەڕێنێتەوە.

(فَإنْ تَلِفَ فِيالْبَلَدالْمَنْقُولِ إلَيْهِ) جا ئەگەر زەوتكراوەكە لەو شارەدا فەوتابو: كە بۆ ئەوێ گواسترابۆوەو خاوەنەكەش لەوێ زەوتكەرەكەی گرت، ئەو كاتە (طالَبَهُ بِالْمِثْلِ) خاوەنەكە داوای وێنەی زەوتكراوەكەی لە زەوتكەرەكە دەكا (فِي أيِّ الْبَلَدَيْنِ شاءَ) لە هەر شارێكدا حەز دەكا لەو دوو شارانە (فَإنْ فُقِدَالْمِثْلُ) جا ئەگەر وێنەكەیشی نەبو، ئەو كاتە (غَرَّمَهُ قِيمَةَ أكْثَرِ الْبَلَدَيْنِ قِيمَةً) خاوەنەكە نرخە زۆرترەكەی زەوتكراوەكە -تۆڵە- لە زەوتكەرەكە وەردەگرێ، جا زۆرترەكە: هی شاریخۆی بێ، یان هی شارەكەی بۆگواستراوە بێ: كە زەوتكراوەكەی تێدافەوتاوە.

بەلام (وَلَوْ ظَفِرَ بِالْغَاصِبِ فِي غَيْرِ بَلَدِالتَّلَفِ) ئەگەر خاوەنەكە زەوتكەرەكەی گرت لە شارێكیتردا -جگە لە شاری لێفەوتانەكە- ئەوە (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست: (أنَّهُ إنْ كانَ لاَ مُؤْنَةَ لِنَقْلِهِ) ئەگەر وێنەی فەوتاوەكە ئەركی گواستنەوەی نەدەویا (كَالنَّقْدِ) وەكو پارەو پول، یان خاوەنەكە ئەركی گواستنەوەی دەدا، ئەو كاتە (فَلَهُ مُطالَبَتُهُ بِالْمِثْلِ) بۆ خاوەنەكەی دروستە: داوای وێنەی فەوتاوەكەی لە زەوتكەرەكە بكا.

(وَإلاَّ) بەلام ئەگەر ئەركی گواستنەوەی دەویاو خاوەنەكەش ئەركەكەی نەدەدا، یان ڕێگایەكە بە ترس بوو، ئەو كاتە (فَلاَ مُطالَبَةَ بِالْمِثْلِ) نابێ داوای وێنەی فەوتاوەكە لە زەوتكەرەكە بكا (بَلْ يُغَرِّمُهُ قِيمَةَ بَلَدِالتَّلَفِ) بەڵكو خاوەنەكە نرخی ئەو شارەی تێیدا فەوتاوە- تۆڵە- لە زەوتكەرەكە وەردەگرێ، بەلام لێرەدا تۆڵە وەرگرتنەكە بۆ (الْفَيْصُولَة)یە، واتە: بە یەكجاری تۆڵە وەرگیراوەكە دەبێتە ملكی خاوەنەكەو كێشەكە دەبڕێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَأمَّاالْمُتَقَوَّمُ) ئینجا زەوتكراوی نرخ بۆداندراو: وەكو ئاژەڵو جلوبەرگ (فَيُضْمَنُ بِأقْصَى قِيَمِهِ) تۆڵەی بۆ دادەندرێ بە بەرزترین نرخەكانی (مِنَ الْغَصْبِ إلَىالتَّلَفِ) لە ڕۆژی زەوتكردنیەوە تا ڕۆژی فەوتانی، واتە: ئەگەر لە ڕۆژی زەوتكردنی نرخی سەد دینار بوو،

وَفِي الإتْلاَفِ بِلاَغَصْبٍ بِقِيمَةِ يَوْمِ التَّلَفِ، فَإنْ جَنَى وَتَلِفَ بِسِرَايَةٍ فَالْوَاجِبُ الأَقْصَى أَيْضَاً، وَلاَتُضْمَنُ الْخَمْرُ وَلاَتُرَاقُ عَلَى ذِمِّيٍّ إلاَّ أَنْ يُظْهِرَ شُرْبَهَا أَوْ بَيْعَهَا، وَتُرَدُّ عَلَيْهِ إنْ بَقِيَتْ الْعَيْنُ

---

ئینجا بووه سەدو بیست دینار، ئینجا له ڕۆژی فەوتانی بووه هەشتا دینار، ئەوه سەدو بیست دینارەکه له تۆڵەی دەدرێ.

بەلام (وَفِي الإتْلاَفِ بِلاَ غَصْبٍ) لەو فەوتاندنەی بە بێزەوتکردنە، دەبێتە زامین (بِقِيمَةِ يَوْمِ التَّلَفِ) بە نرخی ڕۆژی فەوتانیو بەگوێرەی نرخی شوێنی لێفەوتاندنی، کەواتە: فەوتاندنی ئاوی سارد له هاوینو له شوێنێکی گەرمیاندا، تۆڵەی زۆرترە لە فەوتاندنی ئاو لە کوێستان، یان له زستاندا (فَإنْ جَنَى) جا ئەگەر دەستدرێژی کردە سەر شتێکی نرخ بۆ داندراو: وەك ئاژەڵێك بریندار بکا، ئینجا (وَتَلِفَ بِسِرَايَةٍ) بە پێداڕۆیشتنی دەستدرێژیەکە ئاژەڵەکە مرد، ئەوە (فَالْوَاجِبُ الأَقْصَى) لەم مەسەلەیەشدا بەرزترین نرخ لە تۆڵە واجب دەبێ (أَيْضَاً) وەك مەسەلەیزەوتکردن.

## ﴿ تێکدانی شتە ناشەرعیەکان ﴾

(وَلاَ تُضْمَنُ الْخَمْرُ) شەڕابو هەر شتێکیتری مرۆڤ سەرخۆش بکا زامینی بۆ دانەندراوە، واتە: ئەگەر بفەوتێندرێ تۆڵەی نیە، جیاوازی نیە شەڕابەکە: هی موسوڵمان بێ، یان هی کافر بێ، جا ئەگونجا شەڕابەکە بڕژێندرێ؟ چونکە ماوەیەکیزۆری دەویا، یان فاسقەکان ڕێگەیان نەدەدا، ئەو کاتە دروستە: شوشەکەیشەڕابیش بشکێنێ، بەڵکو کاریەدەست بۆی دروستە: شوشەو گشت کیسەیەکیتریش کە ئەو سەرخۆشکەرانەی تێدایە، بیانشکێنێو لە ناویان ببا، تاکو خەڵك تەمبێ ببێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إهْتَرِقِ الْخَمْرَ وَاكْسِرِ الدِّنَانَ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، شەڕابەکە بڕژێنەو کوپەکانی شەڕابەکەش بشکێنە.

(وَلاَ تُرَاقُ عَلَى ذِمِّيٍّ) پەیمان لەئەستۆ شەڕابی لێناڕژێندرێ، جا جولەکە بێ، یان گاور، یان مەگوش (إلاَّ أَنْ يُظْهِرَ شُرْبَهَا) مەگەر بە ئاشکرایی لە ناو موسوڵماناندا شەڕابەکە بخواتەوە (أَوْ بَيْعَهَا) یان بە ئاشکرایی لە ناو موسوڵماناندا بیفرۆشێ، ئەو کاتە شەڕابەکەی لێ دەڕژێندرێ، چونکە ئەو ئاشکراکردنە سوکایەتیئیسلامی تێدایە.

کەوابو: بەرازو زوڕناو مۆسیقاش-ئەگەر ئاشکرا بکەن- هەمان بڕیاری شەڕابی بۆ دەدرێ، بەلام ئەگەر پەیمان لە ئەستۆکان-سەربەخۆ- لە دێیەکدا نیشتەجێ بن، ئەو کاتە وازیان لێدەهێندرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەر کاتێك پەیمان لەئەستۆ شەڕابەکەی ئاشکرا نەکردبو (تُرَدُّ عَلَيْهِ) ئەگەر لێسەتێندرابو، واجبە: بیدرێتەوە (إنْ بَقِيَتْ الْعَيْنُ) ئەگەر خودی شەڕابەکەی خۆی مابێ،

وَكَذَا الْمُحْتَرَمَةُ إِذَا غُصِبَتْ مِنْ مُسْلِم، وَالأَصْنامُ وَآلاَتُ الْمَلاَهِي لاَيَجِبُ فِي إِبْطالِهــا شَيْءٌ، وَالأَصَحُّ أَنَّها لاَ تُكْسَرُ الْكَسْرَ الْفَاحِشَ، بَلْ تُفْصَلُ لِتَعُودَ كَما قَبْلَ التَّأْلِيفِ، فَــإِنْ عَجَزَ الْمُنْكِرُ عَنْ رِعايَةِ هَذَا الْحَدِّ لِمَنْعِ صَاحِبِ الْمُنْكَرِ أَبْطَلَهُ كَيْفَ تَيَسَّــرَ، وَتُضْــمَنُ مَنْفَعَةُ الدَّارِ وَالْعَبْدِ وَنَحْوِهِما بِالتَّفْوِيتِ وَالْفَواتِ فِي يَدِ عادِيَةٍ،

---

بەلام ئەگەر خودی شەرابەکەی خۆی فەوتابو، دروست نیە تۆڵەی بدرێتێ، هەروەك لە (شرح المنهج)دا فەرموویەتیو تازەش ڕابرا (وَكَذَا الْمُحْتَرَمَةُ) هەروەهاش شەرابی ڕێزدار، واجبە: بدرێتەوە خاوەنەکەی (إِذَا غُصِبَتْ مِنْ مُسْلِمٍ) هەر کاتێك لە موسوڵمانێك زەوت کرابێ، (شەرابی ڕێزدار ئەمەیە: بە مەبەستی کردنە سرکە گوشرابێو بە بێدەستکاریش بوبێتە شەراب). کەواتە: شەرابە بێڕێزەکەی گشت موسوڵمانێك واجبە: بڕژێندرێو تۆڵەشی نادرێتێ، هەروەك ڕابرا.

(وَالأَصْنامُ) بتو سەنەمەکان، واتە: هەر شتێکی بپەرسترێو، هەم (صَلِيب) کە دروشمێکیگاورەکانی(صليبي)-خاچ پەرستەکانەو، هەم (وَآلاَتُ الْمَلاَهِي) کەلوپەلی گەمەو ڕابواردنی حەرام: وەك زوڕناو مۆسیقاو تاوڵەو دۆمینەو...هتد (لاَ يَجِبُ فِي إِبْطالِها شَيْءٌ) لە تێکدانیاندا هیچ تۆڵەیەك واجب نابێ، بەلام (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّها لاَ تُكْسَرُ الْكَسْرَ الْفَاحِشَ) ئەوانەیڕابردوو بە شێوەیەکی وەها ناشکێندرێن: کە هیچ کەڵکیان نەمێنێ (بَلْ تُفْصَلُ لِتَعُودَ كَما قَبْلَ التَّأْلِيفِ) بەڵکو لێك دەکرێنەوەو پارچە پارچە دەکرێن: تاکو وەك پێش پێکەوەنانیان لێ بێنەوە.

(فَإِنْ عَجَزَ الْمُنْكِرُ عَنْ رِعايَةِ هَذَاالْحَدِّ) جا ئەگەر ڕێگریخراپەکە نەیتوانی ئەو سنورەیڕابردوو ڕەچاو بکا (لِمَنْعِ صَاحِبِ الْمُنْكَرِ) چونکە خاوەنیخراپەکە، یان کاربەدەستەکان ڕێگەیان لێدەگرت—وەك سەردەمیئێستا— ئەو کاتە (أَبْطَلَهُ كَيْفَ تَيَسَّرَ) چۆن بۆی بکرێ وەها تێکی دەدا، هەرچەند لەو سنوورەیڕابردووش زیاتر بێ: وەکو سوتاندن.

ئینجا بزانە: لەو تێکدانەیڕابردوودا جیاوازی پیاو و ئافرەت نیە، هەم بۆ کاربەدەستەکان دروستە: بتو سەنەمو گشت بێشەرعیەکانیتریش لە ڕەگو ڕیشەوە تێك بدەن، هەروەك لە (مغنی)و (الشبراملسی)دا فەرموویانە، واتە: بە بەڵگەی سوتاندنی (مَسْجِدالضِّرار)و سوتاندنی گوێلکەپەرستراوەکەی (بَنيإِسْرائيل)، ئینجا لە (كتاب الجهاد)دا ئەم باسە درێژتر ڕوون دەکەینەوە، إن شاءَ الله تعالى.

(وَتُضْمَنُ مَنْفَعَةُالدَّارِ وَالْعَبْدِ وَنَحْوِهِما) سودی خانوو و کۆیلەو شتی وەك ئەوانیش: وەکو ئاژەڵو ئۆتومبێل، زامینیی بۆ داندراوە، واتە: تۆڵەی سودی ئەو جۆرە شتانەش واجبە: بدرێ، ئینجا (بِالتَّفْوِيتِ) سودەکە بە هۆی بەکارهێنان فەوتێندرابێ: وەك لە خانووەکەدا دانیشتبێ، یان سواری ئۆتومبێلەکە بوبێ (وَالْفَواتِ فِي يَدِ عادِيَةٍ) یان لە دەستێکی

وَلاَتُضْمَنُ مَنْفَعَةُالْبُضْعِ إلاَّ بِتَفْوِيت، وَكَذَا مَنْفَعَةُ بَدَنِ الْحُرِّ فِي الأَصَحِّ، وَإِذَا نَقَصَ الْمَغْصُــوبُ بِغَيْرِ إسْتِعْمَالٍ وَجَبَ الأَرْشُ مَعَ الأُجْرَة، وَكَذَا لَوْ نَقَصَ بِهِ بِأَنْ بَلِيَ الثَّوْبُ فِي الأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) إدَّعَى تَلَفَهُ وَأَنْكَرَالْمَالِكُ صُدِّقَ الْغَاصِبُ بِيَمِينِهِ

---

دوژمنکاریدا سودەکە–بەخۆی– فەوتا بێ: وەك زەوتکەرەکە خانووەکەی کلیل دابێ‌و هیچ سودێکی لێوەرنەگرتبێ، واتە: لە هەردوو حاڵەتدا واجبە: کرێی هاووێنە–لە تۆڵەی سودی شتەزەوتکراوەکە– بداتە خاوەنەکەی.
(وَلاَ تُضْمَنُ مَنْفَعَةُ الْبُضْعِ إلاَّ بِتَفْوِيتٍ) سودی ئەندامی مێبینەیی(جاریة) زامینیی بۆ داناندرێ، تەنها بە فەوتاندنی نەبێ، واتە: ئەگەر جیماعی لەگەڵ (جاریة)زەوتکراوەکە کرد، واجبە: مارەیی هاووێنەی لە تۆڵە بدا.
(وَكَذَا مَنْفَعَةُ بَدَنِ الْحُرِّ) هەروەهاش سودی لاشەی مرۆڤی ئازاد، تەنها بە هۆی فەوتاندن تۆڵەی بۆ داندراوە: وەك بە زۆرلێکردن کارێکی پێبکا، واجبە: کرێیەکەی بداتێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەواتە: ئەگەر سودەکانی–بەخۆ– بفەوتێن: وەك لە شوێنێکدا بەندی بکاو ڕێگەی نەدا هیچ کارێك بکا، ئەو کاتە زۆردارەکە نابێتە زامین‌و تۆڵەی سودەکانی لە سەر نیە.
هەروەها سودەکانی مزگەوت‌و خوێندنگاو شوێنە گشتیەکانی‌تریش وەکو مرۆڤی‌ئازادن، واتە: ئەگەر کەلوپەلێکی خۆی لە یەکێك لەو شوێنانە دابنێ‌و کلیلی بدا، واجبە: کرێی گشت شوێنەکە بدلو ئەگەر کلیلی نەدا، واجبە: کرێی شوێنی کەلوپەلەکەی بدا، بەو مەرجەی بەو کەلوپەلە بەرتەنگ ببێ‌و عادەتیش نەبێ ئەو کەلوپەلەی تێدا دابندرێ، ئینجا کرێیەکەش بۆ بەرژەوەندی شوێنەکە سەرف دەکرێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.
(وَإذَا نَقَصَ الْمَغْصُوبُ بِغَيْرِإسْتِعْمَالٍ) هەر کاتێك زەوتکراوەکە–بێ بەکارهێنان– لە خۆیەوە ناتەواویەکی لێپەیدا بو: وەك ئاژەڵەکە کوێر ببێ، یان لاواز ببێ، یان قاچی بشکێ، ئەوە (وَجَبَ الأَرْشُ مَعَ الأُجْرَةِ) واجبە: تۆڵەی ناتەواویەکە بداتە خاوەنەکەی، هەم واجبە: کرێی سودەفەوتاوەکەشی بداتێ (وَكَذَا لَوْ نَقَصَ بِهِ) هەروەها ئەگەر بە هۆی بەکارهێنانیش ناتەواوی لێپەیدا ببێ (بِأَنْ بَلِيَ الثَّوْبُ) وەك بە هۆی دەبەرکردن جلەکە بدڕێ‌و کۆن ببێ، واجبە: تۆڵەی ناتەواویەکەو کرێی سودە فەوتێندراوەکە بداتە خاوەنەکەی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی کێشەی خاوەنەکەو زەوتکەرەکە ﴾

(إدَّعَى تَلَفَهُ) ئەگەر زەوتکەرەکە گوتی: زەوتکراوەکە فەوتاوە (وَأَنْكَرَالْمَالِكُ) خاوەنەکەش گوتی: وا نیەو نەفەوتاوە. هیچ شاهیدیش نەبو، ئەو کاتە (صُدِّقَ الْغَاصِبُ بِيَمِينِهِ) باوەڕ

عَلَى الصَّحِيحِ، فَإِذَا حَلَفَ غَرَّمَهُ الْمالِكُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ اخْتَلَفا فِي قِيمَتِهِ أَوْ فِي الثِّيابِ الَّتِي عَلَى الْعَبْدِ الْمَغْصُوبِ أَوْ فِي عَيْبٍ خَلْقِيٍّ صُدِّقَ الْغاصِبُ بِيَمِينِهِ، وَفِي عَيْبٍ حادِثٍ يُصَدَّقُ الْمالِكُ بِيَمِينِهِ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ رَدَّهُ ناقِصَ الْقِيمَةِ لَمْ يَلْزَمْهُ شَيْءٌ، وَلَوْ غَصَبَ ثَوْباً قِيمَتُهُ عَشَرَةٌ فَصارَتْ بِالرُّخْصِ دِرْهَماً ثُمَّ لَبِسَهُ فَصارَتْ نِصْفَ دِرْهَمٍ فَرَدَّهُ لَزِمَهُ خَمْسَةٌ وَهِيَ قِسْطُ التَّالِفِ مِنْ أَقْصَى الْقِيَمِ،

---

به زەوتکەرەکە دەکرێ به هۆی سوێندخواردنی (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، ئینجا (فَإِذَا حَلَفَ) هەر کاتێك زەوتکەرەکە سوێندی خوارد (غَرَّمَهُ الْمالِكُ) خاوەنەکە تۆڵەی زەوتکراوەکەی لێ داوا دەکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا (وَلَوِ اخْتَلَفا فِي قِيمَتِهِ) ئەگەر لە دوای کێشەی فەوتانیزەوتکراوەکە-دووبارە- بووە کێشەیان: لە بارەی نرخیزەوتکراوەکە (أَوْ فِي الثِّيابِ الَّتِي عَلَى الْعَبْدِ الْمَغْصُوبِ) یان بووە کێشەیان: لە بارەی ئەو جلوبەرگەی بەسەر کۆیلە زەوتکراوەکەوە بووە (أَوْ فِي عَيْبٍ خَلْقِيٍّ) یان بووە کێشەیان لە بارەی عەیبێکی زگماکی، وەك زەوتکەرەکە بڵێ: لە زگماکدا کوێر بوو. خاوەنەکەش بڵێ: لە لای تۆ کوێر بوە. شاهیدیش نەبو، ئەوە لە هەر سێك مەسەلەکاندا (صُدِّقَ الْغاصِبُ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە زەوتکەرەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا.

بەڵام (وَفِي عَيْبٍ حادِثٍ) ئەگەر لە عەیبێکی پەیدابوودا بووە کێشەیان، وەك زەوتکەرەکە بڵێ: لە لای تۆ دەستی لێکراوەتەوە، شاهیدیش نەبو، ئەو کاتە (يُصَدَّقُ الْمالِكُ بِيَمِينِهِ) باوەڕ بە خاوەنەکەی دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ رَدَّهُ) ئەگەر زەوتکەرەکە زەوتکراوەکەی بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە، بەڵام (ناقِصَ الْقِيمَةِ) بە هۆیهەرزانی نرخی دابەزیبو-نەك لە بەر هۆیەکیتر- وەك پارە زەوتکراوەکە، یان شتێکیتریزەوتکراو نرخی دابەزێ، ئەو کاتە (لَمْ يَلْزَمْهُ شَيْءٌ) زەوتکەرەکە هیچ تۆڵەی لە سەر نیە، چونکە خودی زەوتکراوەکە کەم نەبۆتەوە، بەڵکو خەڵك بە نرخی جاران نایەوێ.

(وَلَوْ غَصَبَ ثَوْباً قِيمَتُهُ عَشَرَةٌ) ئەگەر جلێکی زەوت کرد کە نرخەکەی دە دیرهەم بوو (فَصارَتْ بِالرُّخْصِ دِرْهَماً) ئینجا بە هۆی هەرزانی نرخی بووە دیرهەمێك (ثُمَّ لَبِسَهُ فَصارَتْ نِصْفَ دِرْهَمٍ) ئینجا جلەکەی دەبەر کردو جلەکەی کۆن کردو نرخەکەی بووە نیو دیرهەم (فَرَدَّهُ) ئینجا بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە (لَزِمَهُ خَمْسَةٌ) پێنج دیرهەمی تۆڵە لە سەر واجب دەبێ (وَهِيَ قِسْطُ التَّالِفِ) ئەو پێنج دیرهەمە بەشی فەوتاوەکەیە (مِنْ أَقْصَى الْقِيَمِ) لە بەرزترین نرخەکانی، چونکە کە بە هۆیهەرزانی نرخەکەی بووەتە دیرهەمێك، ئەو کاتە بە هۆی دبەرکردنیش نیوەینرخی دابەزیوە، کەواتە: نیوەی دەیەکە کە بەرزترین نرخەکەیە دەکات پێنج.

قُلْتُ: وَلَوْ غَصَبَ خُفَّيْنِ قِيمَتُهُما عَشَرَةٌ فَتَلِفَ أَحَدُهُما وَرَدَّ الآخَرَ وَقِيمَتُهُ دِرْهَمانِ أَوْ أَتْلَفَ أَحَدَهُما غَصْباً أَوْ فِي يَدِ مالِكِهِ لَزِمَهُ ثَمانِيَةٌ فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ حَدَثَ نَقْصٌ يَسْرِي إِلَى التَّلَفِ بِأَنْ جَعَلَ الْحِنْطَةَ هَرِيسَةً فَكَالتَّالِفِ، وَفِي قَوْلٍ يَرُدُّهُ مَعَ أَرْشِ النَّقْصِ، وَلَوْ جَنَى الْمَغْصُوبُ فَتَعَلَّقَ بِرَقَبَتِهِ مالٌ لَزِمَ الْغاصِبَ تَخْلِيصُهُ بِالأَقَلِّ مِنْ قِيمَتِهِ وَالْمالِ، فَإِنْ تَلِفَ فِي يَدِهِ غَرَّمَهُ الْمالِكُ، وَلِلْمَجْنِيِّ عَلَيْهِ تَغْرِيمُهُ وَأَنْ يَتَعَلَّقَ بِما أَخَذَهُ الْمالِكُ

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النـولوی) دەفـەرموێ: (وَلَوْ غَصَبَ خُفَّيْنِ) ئەگەر جووتە خوففێك، یان جووتە گۆرەویەکی زەوت کرد: کە (قِيمَتُهُما عَشَرَةٌ) نرخەکەیان دە دیرهەم بوو (فَتَلِفَ أَحَدُهُما) ئینجا یەکێکیان بە خۆی فەوتا (وَرَدَّ الآخَرَ وَقِيمَتُهُ دِرْهَمانِ) جا ئەوەکەیتریشی گەڕاندەوەو نرخەکەی دوو دیرهەم بوو (أَوْ أَتْلَفَ أَحَدَهُما غَصْباً) یان تەنها یەکێکیانی بە زەوتکردن فەوتاند (أَوْ فِي يَدِمالِكِهِ) یان لە دەستی خاوەنەکەیدا فەوتاندی، ئەوە (لَزِمَهُ ثَمانِيَةٌ) هەشت دیرهەمی لە سەر واجب دەبن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: پێنج دیرهەم نرخی فەوتاوەکەیە، سێ دیرهەمیش تۆڵەی کەمکردنەوەی نرخەکەیەتی بە هۆی لێك جیاکردنەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَلَوْ حَدَثَ نَقْصٌ يَسْرِي إِلَى التَّلَفِ) ئەگەر ناتەواویەکی وەها لە زەوتکراوەکەدا پەیدا بو: کە سەری دەکێشا لای فەوتان (بِأَنْ جَعَلَ الْحِنْطَةَ هَرِيسَةً) وەك گەنمە زەوتکراوەکە بکاتە هەریسە، یان بیکاتە چێشتێکیتر: کە ئەگەر ماوەیەك دابنرێ تێك بچێ، ئەوە (فَكَالتَّالِفِ) وەك زەوتکراویفەوتاوە، واتە: لەو حاڵەتەدا واجبە: زەوتکەرەکە تۆڵەی گشت زەوتکراوەکە بداتە خاوەنەکەی، جا زەوتکراوەکەش گشتی دەبێتە ملکی زەوتکەرەکە، بەڵام نابێ دەستکاریی بکا تا تۆڵەی دەداتە خاوەنەکەی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (يَرُدُّهُ مَعَ أَرْشِ النَّقْصِ) زەوتکراوەکە بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێنێتەوە لەگەڵ تۆڵەی ناتەواویەکە.

(وَلَوْ جَنَى الْمَغْصُوبُ) ئەگەر کۆیلە زەوتکراوەکە تاوانێکی کرد (فَتَعَلَّقَ بِرَقَبَتِهِ مالٌ) جا لە تۆڵەی تاوانەکە هەندێكماڵی بە گەردەنیەوە بەسترا (لَزِمَ الْغاصِبَ تَخْلِيصُهُ بِالأَقَلِّ مِنْ قِيمَتِهِ وَالْمالِ) لە سەر زەوتکەرەکە واجبە: کۆیلەکە ڕزگار بکا بە ئەندازەکەمترەکە: لە نرخەکەیو لە تۆڵەی تاوانەکە (فَإِنْ تَلِفَ فِي يَدِهِ) جا ئەگەر کۆیلە تاوانکارەکە لە دەستی زەوتکەرەکەدا فەوتا (غَرَّمَهُ الْمالِكُ) خاوەنەکە نرخە هەرە بەرزەکەی -لە تۆڵە- لێ دەستێنێ، هەم (وَلِلْمَجْنِيِّ عَلَيْهِ تَغْرِيمُهُ) ئەوەی تاوانەکەشی کراوەتە سەر بۆی دروستە: تۆڵەی تاوانەکە لە زەوتکەرەکە بستێنێ، هەم (وَأَنْ يَتَعَلَّقَ بِما أَخَذَهُ الْمالِكُ) بۆی دروستە: دەست بەو نرخەوە بگرێ کە خاوەنەکە لە زەوتکەرەکەی وەرگرتوە، بە ئەندازەی تۆڵەی تاوانەکەی لێ ببا

ثُمَّ يَرْجِعُ الْمالكُ عَلَى الْغاصِبِ، وَلَوْ رَدَّ الْعَبْدَ إِلَى الْمالك فبيعَ فِي الْجِنايَة رَجَعَ الْمالكُ بِما أَخَذَهُ الْمَجْنِيُّ عَلَيْه عَلَى الْغاصِب، وَلَوْ غصبَ أَرْضاً فَنَقَلَ تُرابَها أَجْبَرَهُ الْمالكُ عَلَى رَدِّه أَوْ رَدِّ مِثْله وَإِعادَة الأَرْضِ كَما كانَتْ، وَلِلنّاقِلِ الرَّدُّ وَإِنْ لَمْ يُطالِبْهُ الْمالكُ إِنْ كانَ لَهُ فِيه غَرَضٌ، وَإِلاّ فَلا يَرُدُّهُ بِلا إِذْنٍ فِي الأَصَحِّ، وَيُقاسُ بِما ذَكَرْنا حَفْرُ الْبِئْرِ وَطَمُّها، وَإِذا أَعادَ الأَرْضَ كَما كانَتْ وَلَمْ يَبْقَ نَقْصٌ فَلا أَرْشَ لَكِنْ عَلَيْه أُجْرَةُ الْمِثْلِ لِمُدَّة الإِعادَة،

---

(ثُمَّ يَرْجِعُ الْمالكُ عَلَى الْغاصِبِ) ئینجا دیسان خاوەنەکە دەگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکەو ئەندازەی تۆڵەی تاوانەکە -کە داویەتی- لە زەوتکەرەکەی وەردەگرێتەوە (وَ) هەروەها (لَوْ رَدَّ العَبْدَ إِلَى الْمالكِ) ئەگەر زەوتکەرەکە کۆیلە تاوانکارەکەی بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە (فَبِيعَ فِي الْجِنايَة) ئینجا لە بەر تۆڵەی تاوانەکە کۆیلەکە فرۆشرا، ئەو کاتەش (رَجَعَ الْمالكُ بِما أَخَذَهُ الْمَجْنِيُّ عَلَيْهِ عَلَى الغاصِبِ) خاوەنەکە دەگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکە تاکو تاوان کراوەسەر چەند تۆڵەی تاوانەکەی لێوەرگرتوە، ئەویش ئەوەندە لە زەوتکەرەکە وەریگرێتەوە.

(وَلَوْ غَصَبَ أَرْضاً) ئەگەر زەویەکی زەوت کرد (فَنَقَلَ تُرابَها) ئینجا گڵی زەویەکەی گواستەوە (أَجْبَرَهُ الْمالكُ عَلَى رَدِّه) خاوەن زەویەکە ناچاری دەکا: یان خودی گڵەکە بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی (أَوْ رَدِّ مِثْلِه) یان وێنەی گڵەکە بێنێتەوە، هەم (وَإِعادَة الأَرْضِ كَما كانَتْ) ناچاری دەکا زەویەکەش وەکو جاران ڕێك بخاتەوە.

(وَلِلنّاقِلِ الرَّدُّ) هەم ئەو کەسەی گڵەکەشی گواستۆتەوە، مافی هەیە گڵەکە بگەڕێنێتەوە (وَإِنْ لَمْ يُطالِبْهُ الْمالكُ) هەرچەند خاوەنەکەشی داوای لێنەکا (إِنْ كانَ لَهُ فِيه غَرَضٌ) ئەگەر لەو گەڕاندنەوەیەدا مەبەستێکی شەرعیی هەبێ: وەك گڵەکەی لە ملکی خۆی دانابێ و بیەوێ لایببا، یان تاکو لە زامینی ئازاد ببێ (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر هیچ مەبەستێکی نەبو، ئەو کاتە (فَلا يَرُدُّهُ بِلا إِذْنٍ) نابێ بیگەڕێنێتەوە، تەنها بە ئیزنیخاوەنەکەی نەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيُقاسُ بِما ذَكَرْنا) بەو ڕوونکردنەوەی ڕابردوو (قیاس) دەکرێ (حَفْرُ الْبِئْرِ وَطَمُّها) هەڵکەندی بیر لە ناو ملکێکیزەوتکراودلو پڕکردنەوەی بیرەکە، واتە: ئەگەر خاوەن ملکەکە فەرمانی پێکرد، واجبە: بیرەکە پڕ بکاتەوە، هەم ئەگەر بە خۆیشی مەبەستێکی شەرعیی هەبێ، دروستە پڕی بکاتەوە، ئەگینا: بە بێئیزنی خاوەنەکە دروست نیە پڕی بکاتەوە.

(وَإِذا أَعادَ الأَرْضَ كَماكانَتْ) هەر کاتێك زەویەکەی وەك جاران ڕێك خستەوە (وَلَمْ يَبْقَ نَقْصٌ) هیچ ناتەواویەکی نەما، ئەوە (فَلا أَرْشَ) هیچ تۆڵەی لە سەر نیە (لَكِنْ عَلَيْهِ أُجْرَةُ الْمِثْلِ لِمُدَّة الإِعادَة) بەڵام کرێی هاووێنەی بۆ ماوەی ڕێکخستنەوەی زەویەکەی لە سەرە،

وَإِنْ بَقِيَ نَقْصٌ وَجَبَ أَرْشُهُ مَعَها، وَلَوْ غَصَبَ زَيْتاً وَنَحْوَهُ وَأَغْلاَهُ فَنَقَصَتْ عَيْنُهُ دُونَ قِيمَتِه رَدَّهُ وَلَزِمَهُ مِثْلُ الذَّاهِبِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ نَقَصَت الْقِيمَةُ فَقَطْ لَزِمَهُ الأَرْشُ، وَإِنْ نَقَصَتَا غَرِمَ الذَّاهِبَ وَرَدَّ الْبَاقِيَ مَعَ أَرْشِه إِنْ كانَ نَقْصُ الْقِيمَةِ أَكْثَرَ، وَالأَصَحُّ أَنَ السِّمَنَ لاَ يَجْبُرُ نَقْصَ هُزالٍ قَبْلَهُ، وَأَنَّ تَذَكُّرَ صَنْعَةٍ نَسِيَها يَجْبُرُ النِّسْيانَ، وَتَعَلُّمُ صَنْعَةٍ لاَ يَجْبُرُ نِسْيانَ أُخْرَى قَطْعاً، وَلَوْ غَصَبَ عَصِيراً فَتَخَمَّرَ ثُمَّ تَخَلَّلَ فَالأَصَحُّ:

---

هەروەك كرێی پێش ئەو ماوەیەشی -لە كاتی زەوتكردنیەوە- لە سەرە (وَ) هەروەها (إِنْ بَقِيَ نَقْصٌ) ئەگەر ناتەواویەكی مابو، ئەو كاتە (وَجَبَ أَرْشُهُ) واجبە: تۆڵەی ناتەواویەكەش بدا (مَعَها) لەگەڵ كرێی زەوتكراوەكە.

(وَلَوْ غَصَبَ زَيْتاً وَنَحْوَهُ) ئەگەر ڕۆنو ئەو جۆرە شتەی وەك ڕۆنە، زەوتی كرد (وَأَغْلاَهُ) ڕۆنەكەشی كوڵاند (فَنَقَصَتْ عَيْنُهُ دُونَ قِيمَتِهِ) خودی ڕۆنەكە كەم بۆوە، بەڵام نرخەكەی كەم نەبۆوە، ئەو كاتە (رَدَّهُ) واجبە: ئەوەندەی ماوە بۆ خاوەنەكەی بیگەڕێنێتەوە، هەم (وَلَزِمَهُ مِثْلُ الذَّاهِبِ) واجبە: وێنەی ڕۆیشتووەكەش -لە تۆڵە- بداتە خاوەنەكەی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (وَإِنْ نَقَصَتِ الْقِيمَةُ فَقَطْ) ئەگەر تەنها نرخەكەی كەم بۆوە، ئەو كاتە (لَزِمَهُ الأَرْشُ) واجبە: تۆڵەی كەمبوونەوەی نرخەكەی بدا.

(وَإِنْ نَقَصَتَا) ئەگەر ڕۆنەكەو نرخەكەی هەردووكیان بە كوڵاندن كەم بونەوە، ئەو كاتە (غَرِمَ الذَّاهِبَ) وێنەی ڕۆیشتووەكە لە تۆڵەی دەدا (وَرَدَّ الْبَاقِيَ مَعَ أَرْشِهِ) ئەوەندەش كە ماوەتەوە بۆ خاوەنەكەی دەگەڕێنێتەوە، لەگەڵ تۆڵەی كەمبوونەوەی (إِنْ كانَ نَقْصُ الْقِيمَةِ أَكْثَرَ) ئەگەر كەمبوونەوەی نرخەكەی زۆرتر بێ لە كەمبوونەوەی خودی ڕۆنەكە، وەك دوو كیلۆ ڕۆن نرخەكەیان دوو دینار بێو بە هۆیكوڵاندن ببێتە یەك كیلۆ، نرخەكەشی ببێتە نیو دینار، ئەوە واجبە: كیلۆیەكەی بداتەوەو نیو دیناری كیلۆ ڕۆنێكیش لە تۆڵەی بدا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَ السِّمَنَ لاَ يَجْبُرُ نَقْصَ هُزالٍ قَبْلَهُ) قەڵەوبوونی زەوتكراوەكە ناتەواوی لاوازبوونی پێشەخۆی پڕ ناكاتەوەو واجبە: تۆڵەی لاوازبوونەكە بدا (وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ تَذَكُّرَ صَنْعَةٍ) وەبیرهاتنەوەی پیشەیەك: كە (نَسِيَها) كۆیلە زەوتكراوەكە لە بیری كردبێ (يَجْبُرُ النِّسْيانَ) وەبیرهاتنەوەكە لە بیركردنەكە پڕ دەكاتەوە، بەڵام (وَتَعَلُّمُ صَنْعَةٍ لاَ يَجْبُرُ نِسْيانَ أُخْرَى قَطْعاً) فێربوونی پیشەیەكیتر لە بیركردنی پیشەكەیتر پڕ ناكاتەوە.

(وَلَوْ غَصَبَ عَصِيراً) ئەگەر ئاوێكی گوشراوی ترێی زەوت كرد (فَتَخَمَّرَ) ئینجا ئاوەكەش بووە شەڕاب (ثُمَّ تَخَلَّلَ) ئینجا شەڕابەكەش بووە سركە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر:

أَنَّ الْخَلَّ لِلْمالِكِ، وَعَلَى الْغاصِبِ الأَرْشُ إِنْ كانَ الْخَلُّ أَنْقَصَ قِيمَةً، وَلَوْ غَصَبَ خَمْراً فَتَخَلَّلَتْ، أَوْ جِلْدَ مَيْتَةٍ فَدَبَغَهُ فَالأَصَحُّ أَنَّ الْخَلَّ وَالْجِلْدَ لِلْمَغْصُوبِ مِنْهُ.

(فَصْلٌ) زِيادَةُ الْمَغْصُوبِ إِنْ كانَتْ أَثَراً مَحْضاً كَقِصارَةٍ فَلاَ شَيْءَ لِلْغاصِبِ بِسَبَبِها وَلِلْمالِكِ تَكْلِيفُهُ رَدَّهُ كَما كانَ إِنْ أَمْكَنَ، وَأَرْشُ النَّقْصِ، وَإِنْ كانَتْ عَيْناً: كَبِناءٍ وَغِراسٍ كُلِّفَ الْقَلْعَ،

---

(أَنَّ الْخَلَّ لِلْمالِكِ) سرکەکە دەبێتە هی خاوەنی ئاویترێیەکە (وَعَلَى الْغاصِبِ الأَرْشُ) واجبە: زەوتکەرەکەش تۆڵەی ناتەواوی بدا (إِنْ كانَ الْخَلُّ أَنْقَصَ قِيمَةً) ئەگەر نرخی سرکەکە لە ئاویترێیەکە کەمتر بێ.

(وَلَوْ غَصَبَ خَمْراً) ئەگەر شەڕابێکی زەوت کرد (فَتَخَلَّلَتْ) شەڕابەکەش بووە سرکە (أَوْ جِلْدَ مَيْتَةٍ) یا پیستەی مرداربووی زەوت کرد (فَدَبَغَهُ) پیستەکەشی دەباغ کرد، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الْخَلَّ وَالْجِلْدَ لِلْمَغْصُوبِ مِنْهُ) سرکەکەو پیستە دەباغکراوەکە هی ئەو کەسەیە: کە لێی زەوتکراوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گۆڕانکاریەکانی زەوتکراو ﴾

(زِيادَةُ الْمَغْصُوبِ) زێدەبوونی زەوتکراوەکە (إِنْ كانَتْ أَثَراً مَحْضاً) ئەگەر ئاسەوارێکی ڕووت بوو (كَقِصارَةٍ) وەك شۆردنی جلەزەوتکراوەکەو هاڕینیگەنمو سەربڕینیئاژەڵو برژاندنیو ئەو جۆرە کردارانە، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ لِلْغاصِبِ بِسَبَبِها) بە هۆی ئەو کردارانە زەوتکەرەکە مافی هیچ کرێیەکی نیە، بەڵکو (وَلِلْمالِكِ تَكْلِيفُهُ رَدَّهُ كَماكانَ) خاوەنەکە مافی هەیە داوا لە زەوتکەرەکە بکا: زەوتکراوەکە بگەڕێنێتەوە سەر شێوەی جارانی (إِنْ أَمْكَنَ) ئەگەر بگونجێ، هەم (وَأَرْشُ النَّقْصِ) مافی هەیە تۆڵەی ناتەواویەکەشی لێبستێنێ، هەم مافی هەیە کرێی هاووێنەیشی لێوەربگرێ.

بەڵام (وَإِنْ كانَتْ عَيْناً) ئەگەر زێدەبوونی زەوتکراوەکە لاشەیەکی بەرچاو بوو (كَبِناءٍ وَغِراسٍ) وەك لە زەویەکیزەوتکراودا خانووی کردبێ، یان درەختی چاندبێ، ئەوە (كُلِّفَ الْقَلْعَ) داوا لە زەوتکەرەکە دەکرێ –لە سەر ئەرکیخۆی– هەڵیانبکەنێو لایانببا، تۆڵەی ناتەواوی زەویەکەش بداو کرێی ماوەی زەوتکردنەکەش بدا، واتە: خاوەن زەویەکەش هیچ تۆڵەی زەرەری درەختوخانووەکەی لە سەر نیە، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لِعِرْقٍ ظالِمٍ حَقٌّ﴾ رواه أبوداود بإسنادحسن، ڕەگی زۆرداری هیچ مافیکی نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر زەوتکەرەکە هەڵینەکەندنو لاینەبردن، ئەو کاتە خاوەن زەویەکە لە سەر حیسابیزەوتکەرەکە لایاندەبا، واتە: شاهید دەگرێ: تاکو ئەرکیلابردنیان لە زەوتکەرەکە وەربگرێتەوە، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی، بەڵکو ئەگەر

وَإِنْ صَبَغَ الثَّوْبَ بِصِبْغِهِ وَأَمْكَنَ فَصْلُهُ أُجْبِرَ عَلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ لَمْ يُمْكِنْ: فَإِنْ لَمْ تَزِدْ قِيمَتُهُ فَلاَ شَيْءَ لِلْغَاصِبِ فِيهِ، وَإِنْ نَقَصَتْ لَزِمَهُ الأَرْشُ، وَإِنْ زَادَتْ اشْتَرَكَا فِيهِ، وَلَوْ خَلَطَ الْمَغْصُوبَ بِغَيْرِهِ وَأَمْكَنَ التَّمِييزُ لَزِمَهُ، وَإِنْ شَقَّ فَإِنْ تَعَذَّرَ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ كَالتَّالِفِ فَلَهُ تَغْرِيمُهُ، وَلِلْغَاصِبِ أَنْ يُعْطِيَهُ مِنْ غَيْرِ الْمَخْلُوطِ،

---

زەوتكەرەكە بە خۆڕاییش شتە زێدەكانی بداتە خاوەن زەویەكە، ئەوە لە سەری واجب نیە لێی قبوڵ بكا، چونكە منەتی تێدایە، هەروەها ئەگەر خاوەن زەویەكە ڕازی بوو: درەختو خانووەكە بە كرێ بهێڵدرێتەوە، یان بە پارە لە زەوتكەرەكە بیانكڕێتەوە، ئەو كاتەش لە سەر زەوتكەرەكە واجب نیە ڕازی ببێ، چونكە خاوەن زەویەكە هیچ تۆڵەی لابردنی لە سەر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ صَبَغَ الثَّوْبَ بِصِبْغِهِ) ئەگەر زەوتكەرەكە بە سبوغیخۆی جلە زەوتكراوەكەی ڕەنگ كرد (وَأَمْكَنَ فَصْلُهُ) دەشگونجا سبوغەكە لە جلەكە بكرێتەوە (أُجْبِرَ عَلَيْهِ) ناچار دەكرێ لێی بكاتەوە، هەرچەندە زەرەرێكی زۆریش بكا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام (وَإِنْ لَمْ يُمْكِنْ) ئەگەر نەگونجا سبوغەكەی لێبكاتەوە، ئەو كاتە تێبینی دەكرێ:

(فَإِنْ لَمْ تَزِدْ قِيمَتُهُ) ئەگەر نرخی جلەكە–بە هۆی سبوغكردن– زیادو كەمی نەكردبو، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ لِلْغَاصِبِ فِيهِ) زەوتكەرەكە هیچ بەشێكی لە جلەكەدا نیە (وَإِنْ نَقَصَتْ) ئەگەر نرخەكەی كەمی كردبو (لَزِمَهُ الأَرْشُ) تۆڵەی كەمكردنەكەی لە سەر واجب دەبێ، بەلام (وَإِنْ زَادَتِ) ئەگەر نرخەكەی زیادی كردبو (اشْتَرَكَا فِيهِ) هەردووكیان لە جلەكەدا دەبنە هاوبەش: بەشی خاوەنەكە بەگوێرەی نرخی جلەكەیەو بەشی زەوتكەرەكەش بە گوێرەی زێدەبیەكەیە، بۆ وێنە: ئەگەر نرخی جلەكە دە دینار بێو بە سبوغەوە پانزە دینار بێ، ئەوە دوو بەش بۆ خاوەنەكەیەو بەشێكی بۆ زەوتكەرەكەیە.

(وَلَوْ خَلَطَ الْمَغْصُوبَ بِغَيْرِهِ) ئەگەر زەوتكراوەكەی تێكەڵی شتێكیتر كردبو (وَأَمْكَنَ التَّمِييزُ) دەشگونجا لێكی جیا بكاتەوە، ئەوە (لَزِمَهُ وَإِنْ شَقَّ) لە سەری واجبە: لێكی جیا بكاتەوە، هەرچەند زۆریش ماندوو ببێ، بەلام (فَإِنْ تَعَذَّرَ) ئەگەر نەگونجا (فَالْمَذْهَبُ) ئەوە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ كَالتَّالِفِ) زەوتكراوەكە وەكو زەوتكراوی فەوتاوە، كەوابو: (فَلَهُ تَغْرِيمُهُ) بۆ خاوەنەكەی دروستە تۆڵەی زەوتكراوە تێكەڵكراوەكەی لێبستێنێ، ئینجا تێكەڵكراوەكەش دەبێتە ملكی زەوتكەرەكە، بەلام (وَلِلْغَاصِبِ) بۆ زەوتكەرەكە دروستە (أَنْ يُعْطِيَهُ مِنْ غَيْرِ الْمَخْلُوطِ) تۆڵەی زەوتكراوەكەی لە شتێكیتری تێكەڵنەكراو بداتە خاوەنەكەو هەم بۆی دروستە: لە تێكەڵكراوەكەشی بداتێ بەو مەرجەی تێكەڵی وێنەی خۆی، یان تێكەڵی باشتری كردبێ.

وَلَوْ غصَبَ خَشَبَةً وَبَنَى عَلَيْها أُخرِجَتْ، وَلَوْ أَدْرَجَها في سَفينَة فَكَذَلكَ إلاّ أَنْ يَخافَ تَلَفَ نَفسٍ أَوْ مالٍ مَعْصُومَيْن، وَلَوْ وَطِيءَ الْمَغْصُوبَةَ عالماً بالتَّحْرِيم حُدَّ، وَإنْ جَهِلَ فَلاَ حَدَّ، وَفي الحالَيْن يَجبُ الْمَهْرُ إلاَّ أَنْ تُطاوعَهُ فَلاَ يَجبُ عَلَى الصَّحيح، وَعَلَيْها الْحَدُّ إنْ عَلِمَتْ، وَوَطْءُ الْمُشْتَرِي مِنَ الْغاصِبِ كَوَطْئِه في الْحَدِّ وَالْمَهْرِ، فَإنْ غَرِمَهُ لَمْ يَرْجِعْ بِهِ عَلَى الْغاصِبِ في الأَظْهَرِ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرچەند تێکەڵکراوەکە -لەو مەسەلەیەدا- دەبێتە مڵکی زەوتکەرەکە، بەڵام بۆی دروست نیە: هیچ دەستکاریەکی بکا، تا تۆڵەی دەداتە خاوەنەکەی، هەروەك لە (فصل)ی ڕابردوودا ڕوون کراوە، جا ئەگەر ئەندازەی ماڵی خاوەنەکەی لە تێکەڵکراوەکە -بۆ خاوەنەکە- جیا کردەوە، ئەوە بەسە، واتە: ئەو کاتە دروستە دەستکاری ئەوی‌تر بکا، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ غَصَبَ خَشَبَةً) ئەگەر پارچە دارێك، یان بەردێکی زەوت کرد و (وَبَنَى عَلَيْها) دیوارێکی لە سەر دروست کرد، ئەوەش (أُخْرِجَتْ) واجبە: بهێندرێتە دەرەوە، هەرچەند زەوتکەرەکەش زەرەرێکی زۆر بکا، هەم واجبە: تۆڵەی ناتەواویەکەو کرێیەکەشی بدا (وَلَوْ أَدْرَجَها في سَفِينَةٍ) ئەگەر تەختەدارێکیزەوتکراوی خستبوە کەشتی‌یەك (فَكَذَلِكَ) ئەوەش واجبە: بهێندرێتە دەرەوە (إلاَّ أَنْ يَخافَ تَلَفَ نَفْسٍ أَوْ مالٍ مَعْصُومَيْنِ) تەنها ئەگەر بترسێ گیانو ماڵێکی پارێزراو لە ناو بچن، وەك کەشتیەکە لە ناو دەریادابێو تەختەدارەکەش لە لای بنەوەی بێو بە هۆی دەرهێنانی ئەو ترسە ڕوبدا، ئەو کاتە چاوەڕوان دەکرێ تا کەشتیەکە دەگاتە کەناری دەریا.

(وَلَوْ وَطِيءَ الْمَغْصُوبَةَ) ئەگەر زەوتکەرەکە جیماعی لەگەڵ (جارية) زەوتکراوەکە کرد (عالماً بِالتَّحْرِيمِ) دەشیزانی جیماعەکە حەرامە، ئەوە (حُدَّ) زەوتکەرەکە سزای زینای لێ دەدرێ، بەڵام (وَإنْ جَهِلَ) ئەگەر نەیزانی حەرامە؟ چونکە تازە موسوڵمان بوو، یان لە زانایانیئاییني دوور بوو، ئەو کاتە (فَلاَ حَدَّ) سزی لێنادرێ، بەڵام (وَفي الْحالَيْنِ يَجِبُ الْمَهْرُ) لە هەردوو حاڵەتی زانینو نەزانیندا واجبە: مارەیی (جارية)کە بداتە خاوەنەکەی (إلاَّ أَنْ تُطاوِعَهُ) مەگەر (جارية)کە بە خۆشیخۆی ڕێگەی جیماع کردنی بداتێ، ئەو کاتە (فَلاَ يَجِبُ عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست مارەییەکەی واجب نابێ، بەڵکو (وَعَلَيْها الْحَدُّ إنْ عَلِمَتْ) (جارية)کەش سزای زینای لە سەرە، ئەگەر زانیبێتی حەرامە.

(وَوَطْءُ الْمُشْتَرِي مِنَ الْغاصِبِ) جیماعی ئەو کەسەی (جارية)کەی لە زەوتکەرەکە کڕیوە (كَوَطْئِه في الْحَدِّ وَالْمَهْرِ) وەکو جیماعی زەوتکەرەکەیە: لە بارەی سزای زیناو مارەیی (جارية)کە (فَإنْ غَرِمَهُ) جا ئەگەر خاوەنەکە مارەییەکەی لە کڕیارەکە وەرگرت، ئەوە (لَمْ يَرْجِعْ بِهِ عَلَى الْغاصِبِ) کڕیارەکە مافی نیە بگەڕێتەو سەر زەوتکەرەکەو ئەندازەی مارەییەکەی لێوەربگرێتەوە (في الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

وَإِنْ أَحْبَلَ عالماً بِالتَّحْرِيمِ فالْوَلَدُ رَقِيقٌ غَيْرُ نَسِيب، وَإِنْ جَهِلَ فَحُرٌّ نَسِيبٌ، وَعَلَيْه قِيمَتُهُ يَوْمَ الإِنْفِصالِ، وَيَرْجِعُ بِهاالْمُشْتَرِي عَلَىالْغاصِب، وَلَوْ تَلِفَ الْمَغْصُوبُ عِنْدَالْمُشْتَرِي وَغَرِمَهُ لَمْ يَرْجِعْ بِهِ، وَكَذَا لَوْ تَعَيَّبَ عِنْدَهُ فِيالأَظْهَر، وَلاَ يَرْجِعُ بِغُرْمِ مَنْفَعَةٍ اسْتَوْفاها فِيالأَظْهَر، وَيَرْجِعُ بِغُرْمِ مَا تَلِفَ عِنْدَهُ وَبِأَرْشِ نَقْصِ بِنائِه وَغِراسِه

---

(وَإِنْ أَحْبَلَ) ئەگەر زەوتکەرەکە، یان کڕیارەکە (جاریە)کەی ئاوس کرد (عالِماً بِالتَّحْرِيمِ) دەشیزانی جیماعەکە حەرامە (فالْوَلَدُ رَقِيقٌ غَيْرُ نَسِيب) ئەو منداڵەی لەو جیماعە بووە: کۆیلەیەکی بێنەژادە، واتە: بیژییە، چونکە لە زینایە، بەڵام (وَإِنْ جَهِلَ) ئەگەر جیماعکەرەکە نەیزانیبێ حەرامە، ئەو کاتە (فَحُرٌّ نَسِيبٌ) منداڵەکە ئازادەو لە نەژادی جیماعکەرەکەیە، کەوابو: (وَعَلَيْهِ قِيمَتُهُ يَوْمَ الإِنْفِصالِ) لە سەر جیماعکەرەکە واجبە نرخی ئەو منداڵە بداتە گەورەی (جاریە)کە، واتە: نرخی ڕۆژی لە دایکبوونی (وَيَرْجِعُ بِها الْمُشْتَرِي عَلَىالْغاصِب) جا ئەگەر کڕیارەکە تۆڵەی منداڵەئازادەکەی دایە گەورەی(جاریە)کە، مافی هەیە ئەویش بگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکەو نرخەکەی لێوەربگرێتەوە.

(وَلَوْ تَلِفَ الْمَغْصُوبُ عِنْدَالْمُشْتَرِي) ئەگەر شتێکیزەوتکراو فرۆشرا، ئینجا لە لای کڕیارەکە فەوتا (وَغَرِمَهُ) کڕیارەکەش تۆڵەی زەوتکراوەکەی دایە خاوەنەکەی، ئەوە (لَمْ يَرْجِعْ بِهِ) نابێ کڕیارەکە بگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکە تاکو ئەندازەی تۆڵەی زەوتکراوەکەی لێوەربگرێتەوە، بەڵکو تەنها مافی هەیە پارەکەیخۆی وەربگرێتەوە: کە لە بەرامبەر کڕینیزەوتکراوەکە دابویە زەوتکەرەکە.

(وَكَذَا لَوْ تَعَيَّبَ عِنْدَهُ) هەروەها ئەگەر زەوتکراوەکە لە لای کڕیارەکە عەیبێکی لێپەیدا ببێو تۆڵەی عەیبەکەی لێبستێندرێ، نابێ لە زەوتکەرەکەی وەربگرێتەوە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە فرۆشراو پاش وەرگرتنی لە زامینیی کڕیارەکەدایە.

(وَ) هەروەها (لاَ يَرْجِعُ بِغُرْمِ مَنْفَعَةٍ اسْتَوْفاها) کڕیارەکە ناگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکە، تاکو تۆڵەی ئەو سودەی لێبستێنێتەوە: کە بە خۆی سودەکەی وەرگرتوەو تۆڵەشی داوە: وەك کڕیارەکە سواری وولاغەزەوتکراوەکە بوبێ، یان لە خانووەزەوتکراوەکەدا نیشتەجێ بوبێو خاوەنەکەش کرێی لێوەرگرتبێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی ڕاستردا، بەڵام (وَيَرْجِعُ بِغُرْمِ ما تَلِفَ عِنْدَهُ) کڕیارەکە دەگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکە تاکو تۆڵەی ئەو سودەی لێ بستێنێ: کە لە لای وی فەوتاوەو تۆڵەشی لێوەرگیراوە.

(وَ) هەروەها ئەگەر زەویەکی کڕیو خانووی تێدا کردو درەختی تێدا چاند، ئینجا ئاشکرا بوو: زەویەکە زەوتکراوە، ئەو کاتەش کڕیارەکە دەگەڕێتەوە سەر زەوتکەرەکە: (بِأَرْشِ نَقْصِ بِنائِهِ وَغِراسِهِ) بۆ وەرگرتنەوەی تۆڵەی کەمبوونەوەی خانووەکەیو

إِذا نُقِضَ فِي الأَصَحِّ، وَكُلُّ مالَوْ غَرِمَهُ الْمُشْتَرِي رَجَعَ بِهِ لَوْ غَرِمَهُ الْغاصِبُ لَمْ يَرجِعْ بِهِ عَلَى الْمُشْتَرِي، وَمَا لاَ فَيَرْجِعُ، قُلْتُ: وَكُلُّ مَنِ انْبَنَتْ يَدُهُ عَلَى يَدِ الْغاصِبِ فَكالْمُشْتَرِي وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

درەختەکەی (إِذا نُقِضَ) هەر کاتێك لە لایەن خاوەن زەویەکەوە هەڵکەندران و لابران (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە زەوتکەرەکە هەڵیخەڵەتاندوەو ملکی کەسێکی تری فرۆشتوەتێ.

(وَكُلُّ مالَوْ غَرِمَهُ الْمُشْتَرِي رَجَعَ بِهِ) هەر شتێك ئەگەر کڕیارەکە تۆڵەی دابا، بۆی دروست بوو لە زەوتکەرەکەی وەربگرێتەوە: وەك تۆڵەی ئەو سودەی لە بن دەستی کڕیارەکەدا فەوتاوە (لَوْ غَرِمَهُ الْغاصِبُ) ئەگەر هاتو: لە سەرەتاوە زەوتکەرەکە ئەو تۆڵەیەی دا، ئەوە (لَمْ يَرجِعْ بِهِ عَلَى الْمُشْتَرِي) نابێ بگەڕێتەوە سەر کڕیارەکە بۆ ئەوەی لێی وەربگرێتەوە (وَمَا لاَ) وە هەر شتێکیش ئەگەر کڕیارەکە تۆڵەی دابایە، بۆی دروست نەبو لە زەوتکەرەکەی وەربگرێتەوە: وەکو ئەو سودەی بە خۆی فەوتاندویەتی، ئەوە (فَيَرْجِعُ) ئەگەر لە سەرەتاوە زەوتکەرەکە ئەو تۆڵەیەی دا، بۆی دروستە لە کڕیارەکەی وەربگرێتەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ: (وَكُلُّ مَنِ انْبَنَتْ يَدُهُ عَلَى يَدِ الْغاصِبِ) هەر کەسێك دەستی لە سەر دەستی زەوتکەرەکە دامەزرابێ و لە لایەن زەوتکەرەکەوە زەوتکراوەکەی هاتبێتە ژێردەست، ئەوەش (فَكالْمُشْتَرِي وَاللهُ أَعْلَمُ) وەکو کڕیارەکەیە ڕابردووە: لە گشت بڕیارەکانیدا، هەروەك لە باسی (وَالأَيْدِي الْمُتَرَتِّبَةُ عَلَى يَدِ الْغاصِبِ)دا بە دریژی ڕوون کراوە.

## ﴿ پاشکۆ: لە بارەی تۆبەکردن لە ماڵی حەرام ﴾

پێشەکی بزانە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ كانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لأَخِيهِ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ مِنْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ...﴾ الحديث رواه البخاري، هەر کەسێك ستەمێکی برای خۆی لە لایە: لە ناموس، یان لە شتێکی‌تر، با هەر ئەمڕۆ لەم دونیایەدا خۆی لەو ستەمە ئازاد بکا.

جا بزانە: هەر کەسێك ماڵێکی حەرامی کەوتە دەست: وەك زەوتکراو و دزراو و ڕیباو شیربایی و ئەو جۆرە شتانە، ئینجا ویستی تۆبە بکا، یان بە ڕێگایەکی‌تر ماڵی کەسێکی کەوتە دەست: وەك ئەمانەتێك، یان قەرزێك، یان ماڵێکی دۆزرایەوە لە ناو ئاودا، یان ماڵێکی لە دڕندەو دزو زەوتکەر ستاندەوە، یان مردوێکی بێ‌کەس ماڵێکی لە پاش بەجێما، ئەوە ڕێگای ئازادبوون لە گشت ئەو جۆرە ماڵانەی ڕابردوو بەم جۆرەیە:

یەکەم: ئەگەر خاوەنی ماڵەکەی دەناسی و زیندوو بوو، واجبە: بیداتەوە خودی خاوەنەکە، وە ئەگەر نەیدەناسی، یان بێ‌هەواڵ گوم بوبێ و لە ناسین و هاتنەوەی بێ‌ئومێد بوبێ، یان مردبێ، ئەو کاتە دەیداتەوە میراتگرەکانی، ئینجا ئەگەر میراتگریشی نەبێ، یان لە ناسینی

میراتگرەکانیشی بێئومێد ببن، ئەو کاتە ماڵەکە دەبێتە ملکی (بَيْتُ المال)، جا ئەگەر قازی، یان سەرپەرشتکارەکە فاسقو خائین بون، یان هەر (بَيْتُ المال) نەبو، ئەو کاتە دەیداتە دەست پیاوچاکانی شوێنەکە، یان هەر بە خۆی -بە زامینیی‌خۆی- لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی دەکا: وەکو مزگەوتو ڕێگەو شوێنە گشتیەکان، هەم دروستە بە سەر هەژارانیشدا بەشی بکا، جا ئەگەر بە خۆیشی هەژار بوو، بۆی دروستە بەشی خۆیو منداڵەکانیشی دابنێ، مەبەستیش (بە زامینیی‌خۆی) ئەمەیە: واجبە نیەت بێنێ: هەر کاتێك خاوەنەکەی دەست کەوت، تۆڵەی ماڵەسەرفکراوەکەی بداتێ، هەروەك لە (تحفة) لە باسی (الشهادات)دا فەرموویەتی.

دووەم: ئەگەر ئەو ماڵەحەرامانەی‌ڕابردوو تێکەڵی ماڵی خۆی بوبنو ویستی تۆبە بکا، ئەو کاتەش بۆی دروستە: ئەندازەی حەرامەکە -بە مەبەستی‌بەشکردن- لە ماڵی خۆی جیا بکاتەوە، تەسلیمی‌خاوەنەکەی بکاتەوە، جا ئەگەر خاوەنەکەی دەست نەکەوت، ئەوە -بەو شێوەی‌ڕابردوو- بۆ (بَيْتُ المال)، یان بۆ بەرژەوەندیەکان، یان بۆ هەژاران سەرفی دەکا، هەروەك لە (تحفة)لە باسی نێچیردا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ناوەڕۆکی ئەو (پاشکۆیە)م لە (إحیاءالعلوم) لە باسی حەلاڵو حەرامو، لە (بغیةالمسترشدین) لە باسی (غصب)و، لە چەند شوێنێکی‌تری(تحفة) وەرم گرتوە، بەڵگەی پاشکۆیەکەش ئەم حەدیسانەیە، یەکەم: کە پێغەمبەرﷺ گۆشتی مەڕێکی برژاوی‌حەرامی درایێ، مەڕە برژێندراوەکەش گوتی: من حەرامم. پێغەمبەرﷺفەرمووی: ﴿أَطْعِمُوهَا الأُسارَى﴾ رواه الإمام أحمد بإسناد جيد، گۆشتی مەڕەکە دەرخواردی دیلەکان بدەن.

دووەم: کە ئیمامی(أبوبکر)ﷺ گرۆیەکەی سورەتی(الرُّوم)ی لە کافرەکان بردەوەو وەری‌گرت، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ﴿هَذا سُحْتٌ فَتَصَدَّقْ بِهِ﴾ رواه البيهقي والترمذي بإسناد حسن، ئەم گرۆیە حەرامە، کەوابو: بیکە خێر بە سەر خەڵکیدا. ئینجا تکایە بگەڕێوە بۆ مەرجی‌چوارەمی مامڵەت پێکراو لەم بەرگەدا.

## ﴿ كِتابُ الشُّفْعَة: پەڕتوکی شوفعە ﴾

شوفعە: مافێکی زاڵبوونی‌هاوبەشەکەی‌کۆنە بە سەر هاوبەشەکەی‌نوێ‌دا لە بە ملککردنی ئەو بەشەی نوێیەکە کڕیویەتیە ملکی‌خۆی لە بەرامبەر شتێك.

بۆ وێنە یەکێك لە هاوبەشەکان بەشە ملکەکەی‌خۆی بفرۆشێتە کەسێکی‌تر، ئینجا هاوبەشەکەی‌تریش بە زۆر ئەو بەشە فرۆشراوە لە کڕیارەکە بستێنێتەوە بەو پارەیەی پێی کڕیوە، واتە: هەرچەند کڕیارەکەش ڕازی نەبێ، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ:

لاَ تَثْبُتُ فِى مَنْقُولٍ، بَلْ فِى أَرْضٍ وَمَافِيها مِنْ بناءٍ وَشَجَرٍ تَبَعاً وَكَذَا ثَمَرٌ لَمْ يُؤَبَّرْ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ شُفْعَةَ فِى حُجْرَةٍ بُنِيَتْ عَلَى سَقْفٍ غَيْرِ مُشْتَرَكٍ، وَكَذَا مُشْتَرَكٌ فِى الأَصَحِّ، وَكُلُّ مَا لَوْ قُسِمَ بَطَلَتْ مَنْفَعَتُهُ الْمَقْصُودَةُ كَحَمَّامٍ وَرَحىً لاَشُفْعَةَ فِيه فِى الأَصَحِّ، وَلاَشُفْعَةَ إِلاَّ لِشَرِيكٍ،

﴿اَلشُّفْعَةَ فِي كُلِّ شِرْكٍ لَمْ يُقْسَمْ: فِي أَرْضٍ أَوْ رَبْعٍ أَوْ حائِطٍ، لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ شاءَ أَخَذَ وَإِنْ شاءَ تَرَكَ، فَإِذَا باعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ﴾ رواه مسلم، شوفعه له گشت شتێكی هاوبەشدا هەیه–كه بەش نەكرابێ–: زەوی بێ، یان خانوو بێ، یان باغ بێ، دروست نیه هاوبەشەكه بەشەكەیخۆی بفرۆشێ تا ئاگاداری هاوبەشەكەیتری دەكاتەوە، جا بیەوێ، یان نەیەوێ، جا ئەگەر ئاگاداری نەكردەوەو بەشەكەیخۆی فرۆشت، ئەو كاته هاوبەشەكه زیاتر مافی هەیه به شوفعه وەریبگرێتەوە.

ئینجا به بەلگەی ئەو حەدیسه (لاَ تَثْبُتُ فِي مَنْقُولٍ) شوفعه لەو جۆره شتەدا نیه، كه بگوازرێتەوە (بَلْ فِي أَرْضٍ) بەلكو له زەویو شتیتری نەگوازراوەدا هەیه، هەم (وَمَافِيها) شوفعه لەو شتانەشدا هەیه: كه له زەویه فرۆشراوەكەدانه (مِنْ بِناءٍ وَشَجَرٍ تَبَعاً) له خانوو، له درەخت، به هۆی پابەندبوونیان به زەویەكەوە (وَكَذَا ثَمَرٌ لَمْ يُؤَبَّرْ) هەروەها شوفعه له میوەی درەختەكانی زەویه فرۆشراوەكەدا هەیه كه میوەكه به دەر نەكەوتبێ (فِي الأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ شُفْعَةَ فِى حُجْرَةٍ) شوفعه له ژوورێكی وەهادا نیه: كه (بُنِيَتْ عَلَى سَقْفٍ غَيْرِ مُشْتَرَكٍ) له سەر بانێكی بێهاوبەشی دروست كرابێ (وَكَذَا مُشْتَرَكٌ) هەروەها ئەگەر له سەر بانێكی هاوبەشیش دروست كرابێ، شوفعەی تێدا نیه (فِي الأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا، چونكه له سەر شوێنێكی جێگیر دروست نەكراوەو وەكو گواستراوەیه.

(وَكُلُّ ما لَوْ قُسِمَ بَطَلَتْ مَنْفَعَتُهُ الْمَقْصُودَةُ) هەر شتێك ئەگەر بەش بكرێ ئەو سوودەی–كه مەبەسته– تێك بچێ: (كَحَمَّامٍ) وەك گەرماوێكی بچووك (وَرَحىً) وەك ئاشێكی بچووك، ئەو جۆره شتەش (لاَ شُفْعَةَ فِيهِ) شوفعەی تێدا نیه (فِي الأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَشُفْعَةَ إِلاَّ لِشَرِيكٍ) مافی به شوفعه وەرگرتنەوە تەنها بۆ ئەو هاوبەشەیه: كه بەشی له شته فرۆشراوەكەدا هەبێ: جا مندالْ بێ، یان گەورە بێ، موسولْمان بێ، یان كافر بێ، هەرچەنده ئازادەمیزادیش نەبێ: وەك مزگەوتێك بەشه ملكێكی وەقف نەكراوی لەگەلْ كەسێكدا هەبێ، ئەوە–ئەگەر بەرژەوەندیمزگەوتی تێدابێ– واجبه: سەرپەرشتكارەكه بەشه فرۆشراوەكه به شوفعه بۆ مزگەوتەكه وەربگرێتەوە.

ئینجا بزانه: له مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا دراوسێی پێوەنوسیش مافی شوفعەی هەیه، واته: ئەگەر دراوسێیەك ملكێكی خۆی فرۆشت، ئەوە–له هەر لایەك– هەر دراوسێیەك ملكی

وَلَوْ باعَ داراً وَلَهُ شَرِيكٌ فِي مَمَرِّها فَلاَ شُفْعَةَ لَهُ فِيها، وَالصَّحِيحُ ثُبُوتُها فِي الْمَمَرِّ إِنْ كانَ لِلْمُشْتَرِي طَرِيقٌ آخَرُ إِلَى الدَّارِ، أَوْ أَمْكَنَ فَتْحُ بابٍ إِلَى شارِعٍ وَإِلاَّ فَلاَ، وَإِنَّما تَثْبُتُ فِيما مُلِكَ بِمُعاوَضَةٍ مِلْكاً لاَزِماً مُتَأَخِّراً عَنْ مِلْكِ الشَّفِيعِ: كَمَبِيعٍ وَمَهْرٍ وَعِوَضِ خُلْعٍ وَصُلْحِ دَمٍ وَنُجُومٍ وَأُجْرَةٍ وَرَأْسِ مالِ سَلَمٍ،

---

لەگەڵ ئەو ملکە فرۆشراوە پێکەوەنوسابێ، مافی هەیە ملکە فرۆشراوەکە بە شوفعە وەربگرێتەوە، جا ئەگەر دوو دراوسێ یان زیاتر بون، ئەو کاتە شوفعەکە -بەگوێرەی ژمارەی خۆیان- بە یەکسانی بە سەریاندا بەش دەکرێ، هەروەك لەکتێبەکانی مەزهەبی (حنفی)دا روون کراوەتەوە، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ﴿اَلْجارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ﴾ رواه البخاري، دراوسێ لەپێشترە بە هۆی نزیکیی ملکی دراوسێیەکەی بکرێتەوە.

(وَلَوْ باعَ داراً) ئەگەر خانووێکی فرۆشت (وَلَهُ شَرِيكٌ فِي مَمَرِّها) هاوبەشێکی -تەنها- لە رێگەی خانووەکەدا هەبو، واتە: لە خودیخانووەکەدا هاوبەشی نەبو (فَلاَ شُفْعَةَ لَهُ فِيها) ئەو هاوبەشە مافی شوفعەی لە خانووەکەدا نیە، چونکە بەشی تێدا نیە.

بەڵام (وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی راست (ثُبُوتُها فِي الْمَمَرِّ) مافی شوفعەی لە رێگەکەدا هەیە (إِنْ كانَ لِلْمُشْتَرِي طَرِيقٌ آخَرُ إِلَى الدَّارِ) بەو مەرجەی کڕیارەکە رێگەیەکیتری بۆ خانووەکە هەبێ (أَوْ أَمْكَنَ فَتْحُ بابٍ إِلَى شارِعٍ) یان بۆی بگونجێ -بە بێئەرکێکی زۆر- دەرگایەك بەرەو کۆڵانێك بکاتەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر کڕیارەکە رێگەیەکیتری نەبو، ئەشدەگونجا دەرگایەکیتر بکاتەوە، ئەو کاتە (فَلاَ) هاوبەشەکە مافی شوفعەی نیە، چونکە زەرەری کڕیارەکەی تێدایە، بنچینەی شەرعیش دەفەرموێ: (اَلضَّرَرُ لاَيُزالُ بِالضَّرَرِ) زیان بە زیانێکی وەکو خۆی لانابردرێ.

(وَإِنَّما تَثْبُتُ فِيما مُلِكَ بِمُعاوَضَةٍ) شوفعە تەنها لەو شتەدا هەیە: کە لە بەرامبەر وەرگرتنی شتێك کرابێتە ملکی هاوبەشە نوێیەکە (مِلْكاً لاَزِماً) ملکایەتیەکەش واجب بوبێ و (مُتَأَخِّراً عَنْ مِلْكِ الشَّفِيعِ) هۆی ملکایەتیەکەش لە دوای ملکایەتی شوفعەگرەکە بێ: کە هاوبەشە کۆنەکەیە (كَمَبِيعٍ) وەك بەشەکە فرۆشرابێ، هەم (وَمَهْرٍ) وەك بەشەکە کرابێتە مارەیی ژن، هەم (وَعِوَضِ خُلْعٍ) وەك بەشەکە لە بەرامبەر (خُلْع) درابێتە مێردەکە، هەم (وَصُلْحِ دَمٍ) وەك بەشەکە لە جیاتی خوێنی کوژراوێك بە سولح درابێ، هەم (وَنُجُومِ كِتابَةٍ) وەك لە جیاتی بەشەکانی نووسراوپێدانی کۆیلە درابێ، هەم (وَأُجْرَةٍ) وەك بەشەکە لە جیاتی کرێی خانووێك درابێ، هەم (وَرَأْسِ مالِ سَلَمٍ) وەك بەشەکە بۆ سەرمایەی سەلەم درابێ، واتە: لە گشت ئەو بەشانەیڕابردوودا شوفعەگر-هاوبەشەکۆنەکە مافی هەیە: بەشەکان بە شوفعە وەربگرێتەوە، چونکە لە بەرامبەر شتێك وەرگیراون.

وَلَوْ شُرِطَ فِي الْبَيْعِ الْخِيارُ لَهُما أَوْ لِلْبائِعِ لَمْ يُؤْخَذْ بِالشُّفْعَةِ حَتَّى يَنْقَطِعَ الْخِيارُ، وَإِنْ شُرِطَ لِلْمُشْتَرِي وَحْدَهُ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُؤْخَذُ إِنْ قُلْنا الْمِلْكُ لِلْمُشْتَرِي وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ وَجَدَ الْمُشْتَرِي بِالشِّقْصِ عَيْباً وَأَرادَ رَدَّهُ بِالْعَيْبِ وَأَرادَ الشَّفِيعُ أَخْذَهُ وَيَرْضَى بِالْعَيْبِ فَالأَظْهَرُ إِجابَةُ الشَّفِيعِ، وَلَوْ اشْتَرَى اثْنانِ داراً أَوْ بَعْضَها فَلاَ شُفْعَةَ لأَحَدِهِما عَلَى الآخَرِ، وَلَوْ كانَ لِلْمُشْتَرِي شِرْكٌ فِي الأَرْضِ

---

کەوابو: ئەگەر بەشەکە بە میرات، یان بە بەخشین، یان بە وەسێت بووە ملکی کەسێکیتر، ئەو کاتە هاوبەشە کۆنەکە مافی شوفعەی نیە، چونکە بێبەرامبەر بووەتە ملك، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ شُرِطَ فِي الْبَيْعِ الْخِيارُ لَهُما) ئەگەر لە مامڵەتی فرۆشتنەکەدا مافی پەشیمانی بۆ کڕیارەکەو بۆ فرۆشیارەکە بە مەرج داندرا (أَوْ لِلْبائِعِ) یان تەنها بۆ فرۆشیارەکە داندرا، ئەو کاتە (لَمْ يُؤْخَذْ بِالشُّفْعَةِ) نابێ بەشە فرۆشراوەکە بە شوفعە وەربگیرێتەوە (حَتَّى يَنْقَطِعَ الْخِيارُ) تا ماوەی پەشیمانیەکە دەبڕێ.

بەلام (وَإِنْ شُرِطَ لِلْمُشْتَرِي وَحْدَهُ) ئەگەر مافی پەشیمانی تەنها بۆ کڕیارەکە بە مەرج داندرابێ، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ يُؤْخَذُ) ئەو بەشە فرۆشراوە ئێستا بە شوفعە وەردەگیرێتەوە (إِنْ قُلْنا الْمِلْكُ لِلْمُشْتَرِي) ئەگەر بە فەرموودەی ڕاستتر بڵێین: ملکایەتی فرۆشراوەکە لە ماوەی پەشیمانیدا بۆ کڕیارەکەیە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر بە فەرموودەی بێهێز بڵێین: بۆ فرۆشیارەکەیە، یان دەوەستێندرێ (فَلاَ) ئەو کاتە بە شوفعە وەرناگیرێتەوە، تا ماوەی پەشیمانی کۆتایی دێ.

(وَلَوْ وَجَدَ الْمُشْتَرِي بِالشِّقْصِ عَيْباً) ئەگەر کڕیارەکە دیتی: ئەو بەشە ملکەی کڕیویەتی عەیبێکی هەیە، ئینجا (وَأَرادَ رَدَّهُ بِالْعَيْبِ) ویستی بە هۆی عەیبەکە بیگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیارەکە، بەلام (وَأَرادَ الشَّفِيعُ أَخْذَهُ) شوفعەگرەکەش ویستی بەشە فرۆشراوەکە-بە شوفعە- وەربگرێتەوەو (وَيَرْضَى بِالْعَيْبِ) بە عەیبەکەشی ڕازی بێ، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (إِجابَةُ الشَّفِيعِ) وەلامی شوفعەگرەکە دەدرێتەوەو بەشە فرۆشراوەکەی دەدرێتێ.

(وَلَوِ اشْتَرَى اثْنانِ داراً أَوْ بَعْضَها) ئەگەر دوو کەس وێکڕا خانوویێکیان کڕی، یان بەشێکی خانوویێکیان کڕی، ئەوە (فَلاَ شُفْعَةَ لأَحَدِهِما عَلَى الآخَرِ) هیچێکیان -ئێستا- مافی شوفعەی لە سەر ئەویتر نیە، چونکە لە یەك کاتدا هەردووکیان بوونەتە خاوەنی ملکەکە.

(وَلَوْ كانَ لِلْمُشْتَرِي شِرْكٌ فِي الأَرْضِ) ئەگەر کڕیارەکە بەشێکی لە زەویە فرۆشراوەکەدا هەبو: وەك زەویەکە لە نێوان سێ کەساندا هاوبەش بێ، ئینجا یەکێکیان بەشەکەی خۆی

فَالأَصَحُ أَنَّ الشَّرِيكَ لاَ يَأْخُذُ كُلَّ الْمَبِيعِ بَلْ حِصَّتَهُ، وَلاَ يُشْتَرَطُ فِي التَّمَلُّكِ بِالشُّفْعَةِ حُكْمُ حاكِمٍ وَلاَ إِحْضارُ الثَّمَنِ وَلاَ حُضُورُ الْمُشْتَرِي، وَيُشْتَرَطُ لَفْظٌ مِنَ الشَّفِيعِ: كَتَمَلَّكْتُ أَوْ أَخَذْتُ بِالشُّفْعَةِ، وَيُشْتَرَطُ مَعَ ذَلِكَ: إِمَّا تَسْلِيمُ الْعِوَضِ إِلَى الْمُشْتَرِي فَإِذَا تَسَلَّمَهُ أَوْ أَلْزَمَهُ الْقَاضِي التَّسَلُّمَ مَلَكَ الشَّفِيعُ الشِّقْصَ، وَإِمَّا رِضَى الْمُشْتَرِي بِكَوْنِ الْعِوَضِ فِي ذِمَّتِه،

---

بفرۆشێته یەکێك لە هاوبەشەکانیتر، ئەوە (فالأصَحُ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أنَّ الشَّرِيكَ) هاوبەشەکەیتر (لاَ يَأْخُذُ كُلَّ الْمَبِيعِ) نابێ -بە تەنهایی- گشت بەشە فرۆشراوەکە بە شوفعە وەربگرێتەوە (بَلْ حِصَّتَهُ) بەڵکو بەشیخۆی وەردەگرێ، واتە: لەم مەسەلەیەدا -تەنها- شەشێکی بەشە فرۆشراوەکە بە شوفعە وەردەگرێتەوە، شەشێکەکەیتریش بۆ کڕیارەکە دەمێنێتەوە؟ چونکە ئەویش وەکو ئەویتر هاوبەشەو مافی شوفعەی هەیە، هەرچەندە کڕیاریش بێ.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) بە مەرج دانانرێ (فِي التَّمَلُّكِ بِالشُّفْعَةِ) لە مافی کردنەملکایەتیی بە شوفعە (حُكْمُ حاكِمٍ) دادوەرێك بڕیار بدا، هەم (وَلاَ إِحْضارُ الثَّمَنِ) مەرج نیە پارەکە ئێستا حازر بکا، هەم (وَلاَ حُضُورُ الْمُشْتَرِي) مەرج نیە کڕیارەکە ئامادە بێو ڕازی بێ، چونکە بە بڕیاری پێغەمبەرﷺ مافی شوفعەی هەیە، بەڵام (وَيُشْتَرَطُ) بۆ کردنە ملکایەتی بە مەرج دادەندرێ (لَفْظٌ مِنَ الشَّفِيعِ) لە لایەن شوفعەگرەکەوە: گوتەیەك، یان نووسینێك هەبێ (كَ) وەك بڵێ: (تَمَلَّكْتُ) ئەم بەشەم بە شوفعە کردە ملکی خۆم (أَوْ) یان بڵێ: (أَخَذْتُ بِالشُّفْعَةِ) ئەم بەشەم بە شوفعە وەرگرتەوە. واتە: ئەگەر -تەنها- بڵێ: من داوای شوفعە دەکەم. بەو گوتەیە نابێتە ملك.

ئینجا (وَيُشْتَرَطُ مَعَ ذَلِكَ) بە مەرج دادەندرێ -لەگەڵ گوتەیڕابردووش- یەکێك لەم سێیانەی داهاتووش بێ، یەکەم: (إِمَّا تَسْلِيمُ الْعِوَضِ إِلَى الْمُشْتَرِي) یان دەبێ شوفعەگرەکە پارەی بەشە فرۆشراوەکە تەسلیمی کڕیارەکە بکا (فَإِذَا تَسَلَّمَهُ) جا هەر کاتێك کڕیارەکە بەخۆی پارەکەی لێوەرگرت (أَوْ) یان بە ڕقەکاری لێیوەرنەگرت، بەڵام (أَلْزَمَهُ الْقَاضِي التَّسَلُّمَ) قازی بە زۆرلێکردن ناچاری کرد لێیوەربگرێ، ئەو کاتە (مَلَكَ الشَّفِيعُ الشِّقْصَ) شوفعەگرەکە دەبێتە خاوەنی بەشە وەرگیراوەکە، جا ئەگەر شوفعەگرەکە پارەکەی لە بەر دەستیکڕیارەکە دانا بە شێوەیەکی وەها: بۆی دەگونجا وەریبگرێ، ئەوەش بەسەو بە وەرگرتن دادەندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

دووەم: (وَإِمَّا رِضَى الْمُشْتَرِي) یان دەبێ کڕیارەکە ڕازی بێ (بِكَوْنِ الْعِوَضِ فِي ذِمَّتِهِ) پارەی بەشە فرۆشراوەکە قەرز بێ لە ئەستۆی شوفعەگرەکەدا.

وَإِمَّا قَضاءُ الْقَاضِي لَهُ بِالشُّفْعَةِ إِذا حَضَرَ مَجْلِسَهُ وَأَثْبَتَ حَقَّهُ فَيَمْلِكُ بِهِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَتَمَلَّكُ شِقْصاً لَمْ يَرَهُ الشَّفِيعُ عَلَى الْمَذْهَبِ.

(فَصْلٌ) إِنْ اشْتَرَى بِمِثْلِيٍّ أَخَذَهُ الشَّفِيعُ بِمِثْلِهِ، أَوْ بِمُتَقَوَّمٍ فَبِقِيمَتِهِ يَوْمَ الْبَيْعِ، وَقِيلَ يَوْمَ اسْتِقْرارِهِ بِانْقِطاعِ الْخِيارِ، أَوْ بِمُؤَجَّلٍ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ مُخَيَّرٌ بَيْنَ أَنْ يُعَجِّلَ وَيَأْخُذَ فِي الْحالِ أَوْ يَصْبِرَ إِلَى الْمَحِلِّ وَيَأْخُذَ،

---

سێیەم: (وَإِمَّا قَضاءُ الْقَاضِي لَهُ بِالشُّفْعَةِ) یان دەبێ قازی بڕیاری مافی شوفعەی بۆ بدا (إِذا حَضَرَ مَجْلِسَهُ) هەر کاتێك شوفعەگرەکە لە دانیشگەی قازیدا ئامادە بوو، هەم (وَأَثْبَتَ حَقَّهُ) مافی هەبوونی شوفعەی بۆ خۆی جێگیر کرد، ئەو کاتە (فَيَمْلِكُ بِهِ) بەو بڕیارە دەبێتە خاوەنی بەشەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ يَتَمَلَّكُ شِقْصاً لَمْ يَرَهُ الشَّفِيعُ) شوفعەگرەکە نابێتە خاوەنی بەشێکی وەها: کە نەیدیتبێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لەسەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە فرۆشتنی شتی نادیار دروست نیە، بەڵام لە فەرموودەی بێهێزدا دبێتە خاوەنیو هەر کاتێك دیتی مافی پەشیمانبوونەوەشی هەیە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ڕوونکردنەوەی نرخی بەشە فرۆشراوەکە ﴾

(إِنِ اشْتَرَى بِمِثْلِيٍّ) ئەگەر کڕیارەکە –بەشەکەی– بە شتێکی هاوێنەیی کڕیبێ: وەکو گەنمو پارە، ئەوە (أَخَذَهُ الشَّفِيعُ بِمِثْلِهِ) شوفعەگرەکەش هەر بە وێنەیشتەکە بەشە فرۆشراوەکە وەردەگرێتەوە، واتە: کڕیارەکە چەند گەنم، یان چەند پارەی پێداوە، شوفعەگرەکەش ئەوەندە دەداتە کڕیارەکە.

(أَوْ بِمُتَقَوَّمٍ) یان ئەگەر بە شتێکی نرخ بۆ داندراو بەشەکەی کڕیبو: وەك جلوبەرگو ئاژەڵ، ئەوە(فَبِقِيمَتِهِ) شوفعەگرەکە بە نرخی شتەکە بەشە فرۆشراوەکە وەردەگرێتەوە، واتە: شوفعەگرەکە نرخی بەشە فرۆشراوەکە ناداتە کڕیارەکە، بەڵکو چی پێداوە، نرخی ئەوەندەی دەداتێ، نرخەکەش کە ڕەچاو دەکرێ (يَوْمَ الْبَيْعِ) هی ئەو ڕۆژەیە: کە بەشەکەی تێدا فرۆشراوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَوْمَ اسْتِقْرارِهِ) نرخی ڕۆژی جێگیربوونی مامڵەتەکەیە (بِانْقِطاعِ الْخِيارِ) بە هۆی بڕانەوەی مافی پەشیمانبوونەوە.

(أَوْ بِمُؤَجَّلٍ) یان ئەگەر بەشەکەی بە قەرز کڕیبو، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ مُخَيَّرٌ) شوفعەگرەکە سەرپشکە (بَيْنَ أَنْ يُعَجِّلَ وَيَأْخُذَ فِي الْحالِ) لە نێوان ئەوەی هەر ئێستا پارەیکڕیارەکە بدلو بەشە فرۆشراوەکەش–هەر ئێستا– بە شوفعە وەریگرێتەوە (أَوْ يَصْبِرَ إِلَى الْمَحِلِّ) یان خۆی ڕابگرێ تا کاتی دانەوەیقەرزەکە دێ، ئینجا ئەو کات پارەی فرۆشراوەکە بدلو (وَيَأْخُذُ) هەر ئەو کاتیش بەشەکە بە شوفعە وەریگرێتەوە، بەڵام

وَلَوْ بِيعَ شِقْصٌ وَغَيْرُهُ أَخَذَهُ بِحِصَّتِهِ مِنَ الْقِيمَةِ، وَيُؤْخَذُ الْمَمْهُورُ بِمَهْرِمِثْلِها وَكَذَا عِوَضُ الْخُلْعِ، وَلَوْ اشْتَرَى بِجُزَافٍ وَتَلِفَ امْتَنَعَ الأَخْذُ، فَإِنْ عَيَّنَ الشَّفِيعُ قَدْراً وَقالَ الْمُشْتَرِي لَمْ يَكُنْ مَعلُومَ الْقَدْرِ حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ، وَإِنِ ادَّعَى عِلْمَهُ وَلَمْ يُعَيِّنْ قَدْراً لَمْ تُسْمَعْ دَعْواهُ فِي الأَصَحِّ،

---

ئەگەر کڕیارەکە ڕازی بو: پارەکەی بە قەرز لە سەر شوفعەگرەکە بێ، ئەو کاتە واجبە: شوفعەگرەکەش ڕازی ببێو هەر ئێستا بەشەکە بە شوفعە وەربگرێتەوە، ئەگینا: مافی شوفعەی نامێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ بِيعَ شِقْصٌ وَغَيْرُهُ) ئەگەر بەشەکەو شتێکی‌تر وێکڕا فرۆشران، بەڵام شتەکە شوفعەی تێدا نەبو: وەك بەشە زەویەکی هاوبەش‌و زەویەکی‌تری تایبەت بەخۆی وێکڕا بفرۆشێ، ئەو کاتە (أَخَذَهُ بِحِصَّتِهِ مِنَ الْقِيمَةِ) شوفعەگرەکە -تەنها- بەشەکە بە شوفعە وەردەگرێتەوە بە بەشە نرخەکەی‌خۆی لە کۆی نرخی هەردوو فرۆشراوەکە.

(وَ) هەروەها (يُؤْخَذُالْمَمْهُورُ) ئەو بەشەی-لە لایەن مێردەوە- کراوەتە مارەیی‌ژن، ئەویش بە شوفعە وەردەگرێتەوە (بِمَهْرِمِثْلِها) بە مارەیی هاوێنەی ژنەکە، واتە: شوفعەگرەکە مارەیی هاوێنە دەداتە ژنەکەو بەشەکەش بە شوفعە لە ژنەکە وەردەگرێتەوە (وَكَذَا عِوَضُ الْخُلْعِ) هەروەها ئەو بەشەی کراوەتە عیوەزی خولع-واتە: لە بەرامبەر خولع دراوەتە مێردی ژنەکە- ئەویش وەردەگرێتەوە بە مارەیی هاوێنەی ژنەکە، واتە: بە شوفعە لە مێردەکەی وەردەگرێتەوە، جا-لە هەردوو مەسەلەدا- جیاوازی نیە: مارەییەکە لە نرخی بەشەکە: کەمتر بێ، یان زیاتر بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوِ اشْتَرَى بِجُزافٍ) ئەگەر-کڕیارەکە- بەشەکەی بە شتێکی لە گۆترە کڕی‌و (وَتَلِفَ) پێش ئەوەی ئەندازەشی بزاندرێ شتەکە فەوتا، ئەو کاتە (امْتَنَعَ الأَخْذُ) قەدەغەیەو نابێ بە شوفعە وەربگرێتەوە؟ چونکە نازاندرێ ئەندازەی پارەکەی چەند بووە تا بەو ئەندازەیە شوفعە کە وەربگرێتەوە.

(فَإِنْ عَيَّنَ الشَّفِيعُ قَدْراً) جا ئەگەر شوفعەگرەکە ئەندازەیەکی دیاری کردو گوتی: بە سەد دینار بەشەکەت کڕیوە (وَقالَ الْمُشْتَرِي لَمْ يَكُنْ مَعلُومَ الْقَدْرِ) کڕیارەکەش گوتی: ئەندازەی پارەکە زاندراو نەبو، ئەوە (حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ) کڕیارەکە سوێند دەخوا: کە نازانێ بە چەندی کڕیوە، ئینجا کە سوێندی خوارد، شوفعەگرەکەش مافی شوفعەی نامێنێ، بەڵام (وَإِنِ ادَّعَى عِلْمَهُ) ئەگەر شوفعەگرەکە گوتی: کڕیارەکە دەزانێ بە چەندی کڕیوەو (وَلَمْ يُعَيِّنْ قَدْراً) هیچ ئەندازەشی دیاری نەکرد، ئەو کاتە (لَمْ تُسْمَعْ دَعْواهُ) گوێ نادرێتە داواکاریەکەی (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَإِذا ظَهَرَ الثَّمَنُ مُسْتَحَقّاً: فَإِنْ كانَ مُعَيَّناً بَطَلَ الْبَيْعُ وَالشُّفْعَةُ، وَإِلاَّ أُبْدِلَ وَبَقِيا، وَإِنْ دَفَعَ الشَّفيعُ مُسْتَحَقّاً لَمْ تَبْطُلْ شُفْعَتُهُ إِنْ جَهِلَ وَكَذا إِنْ عَلِمَ فِي الأَصَحِّ، وَتَصَرُّفُ الْمُشْتَرِي فِي الشِّقْصِ كَبَيْعٍ وَوَقْفٍ وَإِجارَةٍ صَحيحٌ، وَلِلشَّفيعِ نَقْضُ ما لاَشُفْعَةَ فيهِ كَالْوَقْفِ، وَأَخْذُهُ، وَيَتَخَيَّرُ فيما فيهِ شُفْعَةٌ كَبَيْعٍ: بَيْنَ أَنْ يَأْخُذَ بِالْبَيْعِ الثّاني أَوْ يَنْقُضَهُ وَيَأْخُذَ بِالأَوَّلِ،

---

(وَإِذا ظَهَرَ الثَّمَنُ مُسْتَحَقّاً) هەر كاتێك ئەو پارەیەی بەشەكەی پێ‌كڕاوە، بە ماڵی كەسێكی‌تر دەرچو، تەماشا دەكەین: (فَإِنْ كانَ مُعَيَّناً) ئەگەر پارەكە دیاركراو بوو: وەك بە خودی پارەیەكی دزراو، یان بە ماڵی كەسێكی‌تر بە بێ‌ئیزن بەشەكە بكڕێ، ئەوە (بَطَلَ الْبَيْعُ وَالشُّفْعَةُ) فرۆشتنەكەو شوفعەكە هەردووكیان بەتاڵ دەبنەوەو هیچیان دروست نابن، چونكە پارەكە ملكی كڕیارەكە نیە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر پارەكە دیاركرلو نەبو، بەڵكو بە قەرز بەشەكەی كڕی‌بو، ئینجا پارەیەكی دزراوی لەو قەرزە دلوە، ئەو كاتە (أُبْدِلَ) ئەو پارەی دلویەتی بە پارەیەكی ملكی خۆی دەگۆڕدرێتەوەو (وَبَقِيا) فرۆشتنەكەو شوفعەكەش بە دروستبوویی دەمێننەوە.

(وَ) هەروەها (إِنْ دَفَعَ الشَّفيعُ مُسْتَحَقّاً) ئەگەر شوفعەگرەكەش ماڵی كەسێكی‌تری دا كڕیارەكە (لَمْ تَبْطُلْ شُفْعَتُهُ إِنْ جَهِلَ) مافی شوفعەكەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەگەر نەیزانیبێ (وكَذا إِنْ عَلِمَ) هەروەها ئەگەر زانیبیشی، هەر بەتاڵ نابێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەواتە: ئەم جارە خودی ماڵی‌خۆی دەداتە كڕیارەكەو بەشەكەشی بە شوفعە لێوەردەگیرێتەوە.

(وَتَصَرُّفُ الْمُشْتَرِي فِي الشِّقْصِ) دەستكاری‌ی‌كڕیارەكە لە بەشە فرۆشراوەكەدا (كَبَيْعٍ) وەك بەشەكەی بفرۆشێ (وَوَقْفٍ) یان وەقفی بكا (وَإِجارَةٍ) یان بە كرێی بدا، یان ببیەخشێ، گشتی (صَحيحٌ) دروستە، چونكە ئەو دەستكاریەی لە ملكی خۆیدا كردوە، بەڵام (وَلِلشَّفيعِ) بۆ شوفعەگرەكەش دروستە: (نَقْضُ ما لاَشُفْعَةَ فيهِ) هەر دەستكاریەكی كڕیارەكە: كە مافی شوفعەی تێدا نیە، هەڵبوەشێنێتەوە (كَالْوَقْفِ) وەك وەقفو بەخشینو بەكرێدان، واتە: مافی هەیە هەر یەكێك لەو دەستكاریانە هەڵبوەشێنێتەوەو (وَأَخْذُهُ) بەشەكە بۆ خۆی بە شوفعە وەربگرێتەوە.

(وَ) هەروەها (يَتَخَيَّرُ فيما فيهِ شُفْعَةٌ) شوفعەگرەكە سەرپشكە لەو دەستكاریەی مافی شوفعەی تێدایە (كَبَيْعٍ) وەكو فرۆشتن: (بَيْنَ أَنْ يَأْخُذَ بِالْبَيْعِ الثّاني) لە نێوان ئەوەی بە فرۆشتنەكەی دووەم شوفعەكە وەربگرێتەوە (أَوْ يَنْقُضَهُ) یان فرۆشتنەكەی دووەم هەڵبوەشێنێتەوەو (وَيَأْخُذَ بِالأَوَّلِ) بە فرۆشتنەكەی یەكەم شوفعەكە وەربگرێتەوە، چونكە مافی شوفعەگرەكە لە پێش هەردوو كڕیارەكەدایە.

وَلَوْ اخْتَلَفَ الْمُشْتَرِى وَالشَّفِيعُ فِى قَدْرِ الثَّمَنِ صُدِّقَ الْمُشْتَرِى وَكَذَا لَوْ أَنْكَرَ الشِّرَاءَ أَوْ كَوْنَ الطَّالِبِ شَرِيكاً، فَإِنْ اعْتَرَفَ الشَّرِيكُ بِالْبَيْعِ فَالأَصَحُّ ثُبُوتُ الشُّفْعَةِ، وَيُسَلِّمُ الثَّمَنُ إِلَى الْبَائِعِ إِنْ لَمْ يَعْتَرِفْ بِقَبْضِهِ، وَإِنْ اعْتَرَفَ فَهَلْ يُتْرَكُ فِى يَدِ الشَّفِيعِ أَمْ يَأْخُذُهُ الْقَاضِى وَيَحْفَظُهُ؟ فِيهِ خِلاَفٌ سَبَقَ فِى الإِقْرَارِ نَظِيرُهُ، وَلَوْ اسْتَحَقَّ الشُّفْعَةَ جَمْعٌ أَخَذُوا عَلَى قَدْرِ الْحِصَصِ،

---

(وَلَوِ اخْتَلَفَ الْمُشْتَرِى وَالشَّفِيعُ) ئەگەر کڕیارەکەو شوفعەگرەکە بووە کێشەیان: (فِى قَدْرِ الثَّمَنِ) لە ئەندازەی پارەکەدا، وەك کڕیارەکە بڵێ: بە دوو سەد دینار کڕیومە. شوفعەگرەکەش بڵێ: بە سەد دینار. هیچ شاهیدیش نەبو، ئەو کاتە (صُدِّقَ الْمُشْتَرِى) بە سوێندخواردن باوەڕ بە کڕیارەکە دەکرێ، جا بەو پارەیەی سوێندی لە سەر خواردوە، بەشەکە بە شوفعە وەردەگرێتەوە (وَكَذَا) هەروەها (لَوْ أَنْكَرَ الشِّرَاءَ) ئەگەر کڕیارەکە دان بە کڕینەکەدا نەهێنێو بڵێ: بەشەکەم نەکڕیوە (أَوْ كَوْنَ الطَّالِبِ شَرِيكاً) یان داننەهێنێ کە داواکاریشوفعەکە هاوبەشە –لە هەردوو مەسەلەدا– بە سوێندخواردن باوەڕ بە کڕیارەکە دەکرێ.

ئینجا لەو مەسەلەیەدا: کە کڕیارەکە دەڵێ بەشەکەم نەکڕیوە (فَإِنِ اعْتَرَفَ الشَّرِيكُ بِالْبَيْعِ) ئەگەر هاوبەشە کۆنەکە دانی بە فرۆشتنەکەدا هێناو گوتی: بەشەکەی خۆم فرۆشتوتە ئەو کڕیارە. ئەوە (فَالأَصَحُّ ثُبُوتُ الشُّفْعَةِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بەو دانهێنانە مافی شوفعە بۆ هاوبەشەکەیتر جێگیر دەبێ، هەرچەند کڕیارەکەش بڵێ: درۆ دەکاو بەشەکەم نەکڕیوە. کەوابو: (وَيُسَلِّمُ الثَّمَنُ إِلَى الْبَائِعِ) پارەی بەشە فرۆشراوەکە تەسلیمی فرۆشیارەکە دەکرێ –کە هاوبەشە کۆنەکەیە– (إِنْ لَمْ يَعْتَرِفْ بِقَبْضِهِ) ئەگەر داننەهێنێو نەڵێ: پارەکەشم وەرگرتوە.

بەڵام (وَإِنِ اعْتَرَفَ) ئەگەر بڵێ: پارەکەشم لە کڕیارەکە وەرگرتوە. ئەو کاتە (فَهَلْ يُتْرَكُ فِى يَدِ الشَّفِيعِ) ئایا پارەی بەشە فرۆشراوەکە هەر لە دەستی شوفعەگرەکەدا دەهێڵدرێتەوەو لێیوەرناگیرێ (أَمْ يَأْخُذُهُ الْقَاضِى وَيَحْفَظُهُ؟) یان قازی لێیوەردەگرێو دەیپارێزێ؟ چونکە ماڵێکی لە دەستچووی بێخاوەنە (فِيهِ خِلاَفٌ سَبَقَ فِى الإِقْرَارِ نَظِيرُهُ) دوو فەرموودەی جیاوازی تێدانە، وێنەکەشی لە باسی دانهێناندا ڕابرا، فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: هەر لە دەست شوفعەگرەکەدا دەهێڵدرێتەوە.

(وَلَوِ اسْتَحَقَّ الشُّفْعَةَ جَمْعٌ) ئەگەر کۆمەڵە هاوبەشێك مافی شوفعەیان هەبو، ئەوە بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَخَذُوا عَلَى قَدْرِ الْحِصَصِ) گشتیان بەشە فرۆشراوەکە بە شوفعە وەردەگرنەوە: لە سەر ئەندازەی بەشەکانیخۆیان لەو مڵکەدا، بۆ وێنە: ئەگەر سێ کەس

وَفِي قَوْلٍ عَلَىالرُّؤُوسِ، وَلَوْ باعَ أَحَدُالشَّرِيكَيْنِ نِصْفَ حِصَّتِه لِرَجُلٍ ثُمَّ بَاقِيَهَا لآخَرَ فَالشُّفْعَةُ فِيالنِّصْفِ الأَوَّلِ لِلشَّرِيكِ الْقَدِيمِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ عَفَا عَنِ النِّصْفِ الأَوَّلِ شارَكَهُ الْمُشْتَرِيالأَوَّلُ فِيالنِّصْفِ الثَّانِي، وَإِلاَّ فَلاَ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لَوْ عَفَا أَحَدُ الشَّفِيعَيْنِ سَقَطَ حَقُّهُ، وَتَخَيَّرَ الآخَرُ بَيْنَ أَخْذِ الْجَمِيعِ وَتَرْكِه، وَلَيْسَ لَهُ الإِقْتِصارُ عَلَىحَصَّتِه،

---

له زه‌ویه‌كدا هاوبه‌ش بن: یه‌كێكیان نیوه‌ی هه‌بێو یه‌كێكیان سێیه‌كی هه‌بێو یه‌كێكیان شه‌شێكی هه‌بێ، ئینجا خاوه‌نی نیوه‌كه به‌شه‌كه‌ی خۆی فرۆشت، ئه‌وه خاوه‌نی سێیه‌كه‌كه دوو به‌ش به شوفعه وه‌رده‌گرێته‌وه‌و خاوه‌نیشه‌شێكه‌كه‌ش به‌شێك وه‌رده‌گرێته‌وه، به‌لام (وَفِيقَوْلٍ) له فه‌رمووده‌یه‌كدا (عَلَىالرُّؤُوسِ) له سه‌ر ژماره‌ی خاوه‌ن به‌شه‌كان شوفعه‌كه وه‌رده‌گیرێ، واته: به یه‌كسانی -به‌شه‌كه- به سه‌ر گشتیاندا به‌ش ده‌كرێ، هه‌روه‌ك مه‌زهه‌بی ئیمامی (حنفی)ش ئه‌وه‌هایه‌و له سه‌ره‌تای ئه‌م باسه ڕابرا.

(وَلَوْ باعَ أَحَدُالشَّرِيكَيْنِ نِصْفَ حِصَّتِه لِرَجُلٍ) ئه‌گه‌ر هاوبه‌شێك نیوه‌ی به‌شه‌كه‌یخۆی فرۆشته پیاوێك (ثُمَّ بَاقِيَهَا لآخَرَ) ئینجا -پێش به شوفعه‌وه‌رگرتنی ئه‌م به‌شه- نیوه‌كه‌یتریشی فرۆشته پیاوێكیتر، ئه‌وه (فَالشُّفْعَةُ فِيالنِّصْفِ الأَوَّلِ) مافی شوفعه له نیوه فرۆشراوه‌كه‌ی یه‌كه‌مدا (لِلشَّرِيكِ الْقَدِيمِ) ته‌نها بۆ هاوبه‌شه كۆنه‌كه‌یه، چونكه له كاتی فرۆشتنیدا -جگه له فرۆشیاره‌كه- هیچ هاوبه‌شێكیتری له‌گه‌ڵدا نه‌بو.

ئینجا (وَالأَصَحُّ) به فه‌رمووده‌ی ڕاستتر (أَنَّهُ إِنْ عَفَا عَنِ النِّصْفِ الأَوَّلِ) ئه‌گه‌ر هاوبه‌شه كۆنه‌كه -بۆ كڕیاره‌كه‌ییه‌كه‌م- وازی هێنا له شوفعه‌ی نیوه‌فرۆشراوه‌كه‌ییه‌كه‌مو لێی وه‌رنه‌گرته‌وه، ئه‌و كاته (شارَكَهُ الْمُشْتَرِيالأَوَّلُ) كڕیاره‌یه‌كه‌مه‌كه‌ش مافی هه‌یه: هاوبه‌شیی هاوبه‌شه‌كۆنه‌كه بكا (فِي النِّصْفِ الثَّانِي) له شوفعه‌ی نیوه‌فرۆشراوه‌كه‌ی دووه‌مدا، چونكه به هۆی وازلێهێنانه‌كه نیوه‌ییه‌كه‌م بۆته ملكی ئه‌وی‌و ئه‌ویش بۆته هاوبه‌شی هاوبه‌شه كۆنه‌كه (وَإِلاَّ) به‌لام ئه‌گه‌ر هاوبه‌شه‌كۆنه‌كه وازی نه‌هێناو نیوه‌كه‌ییه‌كه‌می به شوفعه وه‌رگرته‌وه، ئه‌و كاته (فَلاَ) كڕیاره یه‌كه‌مه‌كه نابێته هاوبه‌شی كۆنه‌كه‌و مافی نیه هیچ له نیوه فرۆشراوه‌كه‌یدووه‌م وه‌ربگرێته‌وه، چونكه نیوه‌كه‌ی خۆی به شوفعه لێ وه‌رگیراوه‌و هه‌ر له‌و كاتیشدا هاوبه‌شیه‌كه‌شی نه‌ماوه.

(وَالأَصَحُّ) به فه‌رمووده‌ی ڕاستتر (أَنَّهُ لَوْ عَفَا أَحَدُالشَّفِيعَيْنِ) ئه‌گه‌ر یه‌كێك له شوفعه‌گره‌كان وازی هێنا له مافی خۆی (سَقَطَ حَقُّهُ) به‌و وازهێنانه مافی شوفعه‌ی له ده‌ست ده‌چێ‌و (وَتَخَيَّرَ الآخَرُ) هاوبه‌شه‌كه‌یتریش ده‌بێته سه‌رپشك: (بَيْنَ أَخْذِالْجَمِيعِ وَتَرْكِه) له نێوان ئه‌وه‌ی هه‌موو به‌شه فرۆشراوه‌كه به شوفعه وه‌ربگرێته‌وه، یان واز له هه‌مووی بێنێ، كه‌واته: (وَلَيْسَ لَهُ الإِقْتِصارُ عَلَى حَصَّتِه) مافی نیه ته‌نها به‌شی خۆی له

وَأَنَّ الْوَاحِدَ إِذَا أَسْقَطَ بَعْضَ حَقِّهِ سَقَطَ كُلُّهُ، وَلَوْ حَضَرَ أَحَدُ الشَّفِيعَيْنِ فَلَهُ أَخْذُ الْجَمِيعِ فِي الْحَالِ فَإِذَا حَضَرَ الْغَائِبُ شَارَكَهُ، وَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ تَأْخِيرَ الأَخْذِ إِلَى قُدُومِ الْغَائِبِ، وَلَوْ اشْتَرَيَا شِقْصاً فَلِلشَّفِيعِ أَخْذُ نَصِيبِهِمَا وَنَصِيبِ أَحَدِهِمَا، وَلَوْ إِشْتَرَى وَاحِدٌ مِنْ إِثْنَيْنِ فَلَهُ أَخْذُ حِصَّةِ أَحَدِ الْبَائِعَيْنِ فِي الأَصَحِّ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ الشُّفْعَةَ عَلَى الْفَوْرِ، فَإِذَا عَلِمَ الشَّفِيعُ بِالْبَيْعِ فَلْيُبَادِرْ عَلَى الْعَادَةِ،

---

بەشە فرۆشراوەکە –بە شوفعە– وەریبگرێتەوە (وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الْوَاحِدَ إِذَا أَسْقَطَ بَعْضَ حَقِّهِ) ئەگەر یەك شوفعەگر بەشێکی مافی خۆی لە دەست دا، ئەوە (سَقَطَ كُلُّهُ) گشت مافەکەی خۆی لە دەست دەچێ.

(وَلَوْ حَضَرَ أَحَدُ الشَّفِيعَيْنِ) ئەگەر لە دوو شوفعەگرەکان تەنها یەکێکیان حازر بو (فَلَهُ أَخْذُ الْجَمِيعِ فِي الْحَالِ) بۆی دروستە –هەر ئێستا– هەموو بەشەفرۆشراوەکە بە شوفعە وەربگرێتەوە، کەواتە: هەموو بەشەکە دەبێتە ملکی خۆی و گشت بەرهەمی بەشەکەش بۆ خۆیەتی تا شوفعەگرەکەی نادیار دەگەڕێتەوە، ئینجا (فَإِذَا حَضَرَ الْغَائِبُ) هەر کاتێك شوفعەگرەکەی نادیار هاتەوە، ئەو کاتە (شَارَكَهُ) ئەویش –ئەگەر حەز بکا– دەبێتە هاوبەشی حازرەکە لە شوفعەی بەشەکەدا.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ لَهُ تَأْخِيرَ الأَخْذِ) شوفعەگرەکەی حازریش مافی هەیە وەرگرتنەوەکە دوا بخا (إِلَى قُدُومِ الْغَائِبِ) تا شوفعەگرەکەی نادیار دێتەوە، واتە: بەم دواخستنە مافەکەی لە دەست ناچێ، چونکە عوزری هەیە.

(وَلَوِ اشْتَرَيَا شِقْصاً) ئەگەر دوو کڕیار بەشێکیان لە هاوبەشێك کڕی، ئەوە (فَلِلشَّفِيعِ) بۆ شوفعەگرەکە دروستە (أَخْذُ نَصِيبِهِمَا وَنَصِيبِ أَحَدِهِمَا) بەشی هەردوو کڕیارەکان بە شوفعە وەربگرێتەوە، هەم دروستە تەنها بەشی یەکێکیانیش وەربگرێتەوە.

(وَ) هەروەها (لَو اشْتَرَى وَاحِدٌ مِنْ إِثْنَيْنِ) ئەگەر یەك کڕیار لە دوو هاوبەشانی کڕی، ئەو کاتەش (فَلَهُ) بۆ شوفعەگرەکە دروستە (أَخْذُ حِصَّةِ أَحَدِ الْبَائِعِينَ) تەنها بەشی فرۆشیارێك بە شوفعە وەربگرێتەوەو هی ئەویتریش واز لێ بێنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ الشُّفْعَةَ عَلَى الْفَوْرِ) داواکردنی شوفعە لە سەر پەلەیە، کەوابو: (فَإِذَا عَلِمَ الشَّفِيعُ بِالْبَيْعِ) هەر کاتێك شوفعەگرەکە زانی: بەشەکە فرۆشراوە (فَلْيُبَادِرْ عَلَى الْعَادَةِ) واجبە: بێدواکەوتن –بەگوێرەی عادەت– بە پەلە داوای شوفعەکە بکا، بەلام ئەگەر نەیزانیبێ بەشەکە فرۆشراوە، ئەوە مافی شوفعەکەی هەر بەردەوامە، هەرچەند سالێکیشی بە سەردا بڕوا.

هەروەها ئەگەر زانی: بەشەکە فرۆشراوە، بەلام بە درۆ پارەیەکی زۆریان پێ گوت، بۆیێ وازی لێهێنا، یان نەیدەزانی مافی شوفعەی هەیە، یان نەیدەزانی پەلەکردن واجبە، یان

فَإِنْ كانَ مَرِيضاً أَوْ غائِباً عَنْ بَلَدِالْمُشْتَرِى أَوْ خائِفاً مِنْ عَدُوٍّ فَلْيُوَكِّلْ إِنْ قَدَرَ، وَإِلاَّ فَلْيُشْهِدْ عَلَى‌الطَّلَبِ، فَإِنْ تَرَكَ الْمَقْدُورَ عَلَيْهِ مِنْهُما بَطَلَ حَقُّهُ فِى‌الأَظْهَرِ، فَلَوْ كانَ فِى‌صَلاَةٍ أَوْ حَمَّامٍ أَوْ طَعامٍ فَلَهُ الإِتْمامُ، وَلَوْ أَخَّرَ وَقالَ لَمْ أُصَدِّقِ الْمُخْبِرَ لَمْ يُعْذَرْ إِنْ أَخْبَرَهُ عَدْلاَنِ، وَكَذَا ثِقَةٌ فِى‌الأَصَحِّ، وَيُعْذَرُ إِنْ أَخْبَرَهُ مَنْ لاَ يُقْبَلُ خَبَرُهُ، وَلَوْ أُخْبِرَ بِالْبَيْعِ بِأَلْفٍ فَتَرَكَ فَبانَ بِخَمْسِمأَةٍ

---

شوفعه‌گره‌كه يه‌تيم بوو و سه‌رپه‌رشتكاره‌كه‌ى شوفعه‌ى بۆ وه‌رنه‌گرتبو، يان وازى لێهێنابو، له‌و حاڵه‌تانه‌شدا په‌له‌كردن واجب نيه، واته: تا عوزره‌كه‌يان لاده‌چێ، مافى شوفعه‌يان هه‌ر ده‌مێنێ، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ى سه‌رچاوه‌كاندا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر سه‌رپه‌رشتكارى مزگه‌وتيش به‌شه‌كه‌ى به شوفعه بۆ مزگه‌وت وه‌رنه‌گرته‌وه، يان وازى لێهێنا، مزگه‌وته‌كه مافه‌كه‌ى له ده‌ست ناچێ‌و مافى به شوفعه وه‌رگرتنه‌وه‌ى هه‌ر ده‌مێنێ، هه‌روه‌ك له (الشبراملسى)دا فه‌رموويه‌تى.

(فَإِنْ كانَ مَرِيضاً) جا ئه‌گه‌ر شوفعه‌گره‌كه: نه‌خۆش بوو، يان له به‌نديخانه‌دا بوو (أَوْ غائِباً عَنْ بَلَدِالْمُشْتَرِى) يان له شوێنى كڕياره‌كه حازر نه‌بو (أَوْ خائِفاً مِنْ عَدُوٍّ) يان له دوژمنێك ده‌ترسا، له‌و حاڵه‌تانه‌دا (فَلْيُوَكِّلْ) با وه‌كيلێك بگرێ تاكو داواى شوفعه‌ى بۆ بكا (إِنْ قَدَرَ) ئه‌گه‌ر تواناى هه‌بێ (وَإِلاَّ) به‌ڵام ئه‌گه‌ر تواناى وه‌كيلگرتنى نه‌بو (فَلْيُشْهِدْ عَلَى‌الطَّلَبِ) با شاهيد بگرێ له سه‌ر داواكردنى شوفعه‌كه، جا لێره‌دا شاهيدێكيش به‌سه، بۆ ئه‌وه‌ى به خۆيشى سوێند بخوا.

(فَإِنْ تَرَكَ الْمَقْدُورَ عَلَيْهِ مِنْهُما) جا ئه‌گه‌ر تواناى يه‌كێكى له‌و دووانه هه‌بو، به‌ڵام هيچيانى نه‌كرد، واته: نه وه‌كيل‌و نه شاهيدى نه‌گرت، ئه‌و كاته (بَطَلَ حَقُّهُ) مافى شوفعه‌ى نامێنێ (فِى الأَظْهَرِ) له فه‌رمووده‌ى به‌هێزتردا (فَلَوْ كانَ فِى صَلاَةٍ) جا ئه‌گه‌ر زانى به‌شه‌كه فرۆشراوه، به‌ڵام خه‌ريكى نوێژكردن بوو (أَوْ حَمَّامٍ) يان له گه‌رماودا بوو (أَوْ طَعامٍ) يان خه‌ريكى خواردن بوو (فَلَهُ الإِتْمامُ) بۆى دروسته ئه‌وانه ته‌واو بكا، ئينجا داواى شوفعه بكا.

(وَلَوْ أَخَّرَ) ئه‌گه‌ر شوفعه‌گره‌كه داواكردنى شوفعه‌ى دواخست‌و (وَقالَ لَمْ أُصَدِّقِ الْمُخْبِرَ) گوتى: باوه‌ڕم به هه‌واڵده‌ره‌كه نه‌كرد، بۆيێ دوام خست. ئه‌وه (لَمْ يُعْذَرْ) عوزرى وه‌رناگيرێ (إِنْ أَخْبَرَهُ عَدْلاَنِ) ئه‌گه‌ر دوو داپه‌روه‌ر هه‌واڵه‌كه‌يان بۆ هێنابێ (وَكَذَا ثِقَةٌ) هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر باوه‌ڕ پێكراوێكيش هه‌واڵه‌كه‌ى بداتێ، عوزرى نادرێتێ (فِى‌الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ى ڕاستتردا، به‌ڵام (وَيُعْذَرُ) عوزرى دواخستنى لێوه‌رده‌گيرێ (إِنْ أَخْبَرَهُ مَنْ لاَ يُقْبَلُ خَبَرُهُ) ئه‌گه‌ر يه‌كێكى قسه‌وه‌رنه‌گيراو هه‌واڵه‌كه‌ى بداتێ: وه‌ك فاسق‌و منداڵ.

(وَلَوْ أُخْبِرَ بِالْبَيْعِ بِأَلْفٍ) ئه‌گه‌ر پێيان گوت: به‌شه‌كه به هه‌زار دينار فرۆشراوه (فَتَرَكَ) ئه‌ويش وازى له شوفعه‌كه هێنا (فَبانَ بِخَمْسِمائَةٍ) ئينجا ئاشكرا بوو: به پێنجسه‌د دينار

بَقِيَ حَقُّهُ، وَإِنْ بانَ بِأَكْثَرَ بَطَلَ، وَلَوْ لَقِيَ الْمُشْتَرِيَ فَسَلَّمَ عَلَيْه، أَوْ قالَ بارَكَ اللهُ في صَـــفْقَتِكَ لَمْ يَبْطُلْ، وَفي الدُّعاءِ وَجْهٌ، وَلَوْ بَاعَ الشَّفيعُ حِصَّتَهُ جاهِلاً بِالشُّفْعَةِ فَالأَصَحُّ بُطْـــلانُها.

(كتابُ الْقِراضِ)

اَلْقِـــراضُ وَالْمُـــضارَبَةُ أَنْ يَدْفَـــعَ إِلَـــيْهِ مـــالاً لِيَتَّجِـــرَ فِـــيهِ وَالـــرِّبْحُ مُـــشْتَرَكٌ،

---

فرۆشراوه، ئەوه (بَقِيَ حَقُّهُ) مافی شوفعەی هەر دەمێنێ (وَإِنْ بانَ بِأَكْثَرَ) بەڵام ئەگەر ئاشکرا بوو بە زیاتر فرۆشراوه، ئەو کاته (بَطَلَ) مافی شوفعەی نامێنێ.

(وَلَوْ لَقِيَ الْمُشْتَرِيَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ) ئەگەر شوفعەگرەکە گەیشته کڕیارەکەو سەلامی لێکرد (أَوْ قالَ بارَكَ اللهُ في صَفْقَتِكَ) یان پێی گوت: خوا بەرەکەت بخاته مامڵەتەکەت (لَمْ يَبْطُلْ) بەوانە مافی شوفعەی لە دەست ناچێ (وَفي الدُّعاءِ وَجْهٌ) بەڵام لە دوعاکردنەکەدا فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: شوفعەی پێ لە دەست دەچێ.

(وَلَوْ بَاعَ الشَّفيعُ حِصَّتَهُ) ئەگەر شوفعەگرەکەش-وەك هاوبەشەکەیتر- هەموو بەشەکەی خۆی فرۆشت (جاهِلاً بِالشُّفْعَةِ) لە حاڵەتیفرۆشتنیشدا نەیزانیبو مافی شوفعەی هەیە، یان نەیزانیبو هاوبەشەکەشی بەشەکەیخۆی فرۆشتوه، ئەوه (فَالأَصَحُّ بُطْلانُها) بە فەرموودەی ڕاستتر: مافی شوفعەی نامێنێ، چونکه بە هۆی فرۆشتن هاوبەشیەکەی لاچووه، بەڵام ئەگەر هەموو بەشەکەیخۆی نەفرۆشتبو، بەڵکو هەندێکی مابو، ئەو کاتە ئەگەر نەیزانیبێ، مافی شوفعەی دەمێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ كتابُ الْقِراضِ: **پەرتوکی مامڵەتی قازانجیهاوبەش** ﴾

(اَلْقِـــراضُ وَالْمُضـــارَبَةُ) ئـەو دوو وشـەیە بـۆ مامڵـەتی قازانجیهاوبـەش دەگـوترێن، مەبەستیش بەو مامڵەتە ئەمەیە: (أَنْ يَدْفَعَ إِلَيْهِ مالاً) خاوەن ماڵەکە هەندێك پارەو پوول بداتە کرێکارێك (لِيَتَّجِرَ فيهِ) تاکو بازرگانیی پێ بکاو (وَالرِّبْحُ مُشْتَرَكٌ) قازانجەکەش هاوبەش بێ لە نێوان هەردووکیاندا.

جا ئەو مامڵەتە بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام دروسته، هەم ﴿عَنْ نُفَيْسَةَ بِنْتِ مُنَيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ضارَبَ لِخَدِيجَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها -قَبْلَ الْبَعْثَـــةِ- بِمالِهـــا إِلَى الشَّـــامِ﴾ رواه ابو نعيم وغيره، وهذا مشهور، پێغەمبەر ﷺ پێش بوونی بە پێغەمبەر بازرگانیی بە ماڵی (خدیجة) کرد بۆ وڵاتی شام. واتە: لە دوای بوونیشی بە پێغەمبەر، ئەو مامڵەتەی ڕەد نەکردۆتەوە، سەحابەکانیش کردویانە.

ئینجا بزانە: مامڵەتی قازانجیهاوبەش لەم ڕوکنانە پێك دێ: (اَلْمال): ماڵی بازرگانیەکە. (اَلْمالِك): خاوەنەکە: کە پارەکە دەدا. (اَلْعامِلْ): کرێکارەکە: کە پارەکە وەردەگرێو بازرگانیی پێ دەکا. (اَلرِّبْح) قازانجەکە. (اَلصِّيغَة): گوتەی مامڵەتەکە. (اَلْعَمَل): کارکردن کە بازرگانیەکەیە.

وَيُشْتَرَطُ لِصِحَّتِهِ كَوْنُ الْمالِ دَرَاهِمَ أَوْ دَنانِيرَ خالِصَةً، فَلاَ يَجُوزُ عَلَى تِبْرٍ وَحُلِيٍّ وَمَغْشُوشٍ وَعُرُوضٍ، وَمَعْلُوماً مُعَيَّناً، وَقِيلَ يَجُوزُ عَلَى إِحْدَى الصُّرَّتَيْنِ،

---

(وَيُشْتَرَطُ لِصِحَّتِهِ) بە مەرج دادەنرێ: بۆ دروستبوونی مامڵەتی قازانجیهاوبەش (كَوْنُ الْمالِ دَرَاهِمَ أَوْ دَنانِيرَ خالِصَةً) سەرمایەی ماڵی بازرگانیەكە، یان دیرهەمی زیو، یان دیناری زێڕی بێگەرد بێ، كەوابو: (فَلاَ يَجُوزُ عَلَى تِبْرٍ) ئەو مامڵەتە دروست نیە: لە سەر زێڕو زیوی لێنەدراو بێ، هەم (وَحُلِيٍّ) دروست نیە لە سەر خشڵی زێڕو زیو بێ، هەم (وَمَغْشُوشٍ) دروست نیە: لە سەر دیرهەمو دیناری فێڵ تێداكراو بێ، هەم (وَعُرُوضٍ) دروست نیە لە سەر كەلوپەل بێ، واتە: ئەوانەیڕابردوو دروست نیە بكرێنە سەرمایەی مامڵەتی قازانجی هاوبەش، وەك بڵێ: ئەم زێڕە، یان ئەم گەنمە ببە بازرگانیی پێبكە، قازانجمان بە نیوەیی، یان بڵێ: ئەو خشڵەم، یان ئەم جلەم بۆ بفرۆشە قازانجمان بە نیوەیی، واتە: مامڵەتەكە دروست نابێ، چونكە ئەوانە پارە نین.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: چەند زانایەكیئایینی ڕێگەیان داوە: بە پارەی (مَغْشُوش)ی فێڵ تێداكراویش ئەو مامڵەتەیقازانجیهاوبەش بكرێ، بەو مەرجەی لە بازاڕدا ڕەواجی هەبێ، ئیمامی (السُّبْكی)ش ئەو فەرموودەیەی هەڵبژاردوە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە، كەوابو: چارەمان نیەو دەبی بە فەرموودەی ئەوانە ڕەفتار بكەین: ئەگەر بمانەوێ مامڵەتی قازانجیهاوبەش بە پارەی ئەم سەردەمە بكەین، چونكە ئەویش ئێستا جێگری پارەی زێڕ و زیوەو لە بازاڕدا ڕەواجی هەیە، وَاللهُ أَعْلَمُ.

دووەم: بە مەزهەبی ئیمام(أحمد): ئەگەر كەسێك وولاغەكەی بداتە كەسێكیتر تاكو كرێكاریی پێبكاو كرێیەكەش لە نێوانیاندا بە نیوەیی، یان بە سێیەك بێ، ئەوە دروستە، هەروەك لە (مغنی ابن قدامە)دا فەرموویەتی، كەوابو: ئۆتومبیلەكانی ئەم سەردەمەش–بە مەزهەبی ئیمام(أحمد)– هەمان بڕیاری وولاغی بۆ دەدرێ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(وَمَعْلُوماً) هەم مەرجە: سەرمایەی مامڵەتەكە زاندراو بێ، هەم (مُعَيَّناً) دیاركراویش بێ، كەواتە: دروست نیە بڵێ: ئەو قەرزەی لە سەر تۆم هەیە، یان ئەو قەرزەی لە سەر فلانكەسم هەیە بازرگانیی پێ بكە. بەڵكو مەرجە: قەرزەكە وەربگرێتەوە، ئینجا مامڵەتەكە ببەستێو بیداتە كرپارەكە.

بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا دروستە بڵێ: (قەرزەكەم لە فلانكەس وەربگرەوەو بازرگانی قازانجیهاوبەشی پێبكە). یان بڵێ: (ئەم كەلوپەلەم بۆ بفرۆشەو بە پارەكەی بازرگانی قازانجیهاوبەش بكە). هەروەك لە كتێبەكانی خۆیاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يَجُوزُ عَلَى إِحْدَى الصُّرَّتَيْنِ) دروستە بڵێ: بە یەكێك لەم دوو كیسە پارەیە بازرگانی بكە.

وَمُسَلَّماً إِلَىٰ‌الْعامِلِ فَلاَ يَجُوزُ شَرْطُ كَوْنِ الْمالِ فِي يَدِالْمالِكِ، وَلاَ عَمَلِهِ مَعَهُ، وَيَجُوزُ شَرْطُ عَمَلِ غُلاَمِ الْمالِكِ مَعَهُ عَلَىٰ‌الصَّحِيحِ، وَوَظِيفَةُ الْعامِلِ اَلتِّجارَةُ وَتَوابِعُها كَنَشْرِ الثِّيابِ وَطَيِّها، فَلَوْ قارَضَهُ لِيَشْتَرِيَ حِنْطَةً فَيَطْحَنَ وَيَخْبِزَ، أَوْ غَزْلاً يَنْسُجُهُ وَيَبِيعُهُ فَسَدَ الْقِراضُ، وَلاَ يَجُوزُ أَنْ يَشْرِطَ عَلَيْهِ شِراءَ مَتاعٍ مُعَيَّنٍ أَوْ نَوعٍ يَنْدُرُ وُجُودُهُ، أَوْ مُعامَلَةَ شَخْصٍ، وَلاَ يُشْتَرَطُ بَيانُ مُدَّةِ الْقِراضِ،

---

(وَمُسَلَّماً إِلَىٰ‌الْعامِلِ) هەم دەبی ماڵەکە تەسلیمی کرێکارەکە بکرێ، کەوابو: (فَلاَ يَجُوزُ شَرْطُ كَوْنِ الْمالِ فِي يَدِالْمالِكِ) دروست نیە بە مەرجی ماڵەکە لە دەستی خاوەن پارەکە دابێ (وَلاَ عَمَلِهِ مَعَهُ) هەم دروست نیە بە مەرجی خاوەن پارەکەش لەگەڵ کرێکارەکە کاری بازرگانیەکە بکا، بەلام (وَيَجُوزُ شَرْطُ عَمَلِ غُلاَمِ الْمالِكِ مَعَهُ) دروستە بە مەرجی کۆیلەی خاوەنەکە لەگەڵ کرێکارەکە کاری بازرگانی بکا (عَلَىٰ‌الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، هەروەها دروستە بە مەرجی بە وولاغی، یان بە ئوتومبێلی خاوەن ماڵەکە: ماڵەکە بار بکرێ.

(وَوَظِيفَةُ الْعامِلِ) لەو مامڵەتەدا ئەرکی سەرشانی کرێکارەکە: (اَلتِّجارَةُ) بازرگانی‌یە، واتە: کڕین‌و فرۆشتنە، هەم (وَتَوابِعُها كَنَشْرِالثِّيابِ وَطَيِّها) ئەو کارانەی پابەندی بازرگانیەکەنە: وەك بڵاوکردن‌و پێچانەوەی جل‌وبەرگو کەلوپەل‌تر، هەم پێوان‌و کێشان بە گوێرەی عادەت (فَلَوْ قارَضَهُ) جا ئەگەر پارەی دایە کرێکارێك بۆ قازانجی‌هاوبەش (لِيَشْتَرِيَ حِنْطَةً فَيَطْحَنَ وَيَخْبِزَ) تاکو گەنمی پێ بکڕێ، جا گەنمەکەش بهاڕێ‌و بیکاتە نان (أَوْ غَزْلاً يَنْسُجُهُ وَيَبِيعُهُ) یان ڕیسێکی پێ بکڕێ‌و بیچنێ‌و بیفرۆشێ، لە هەردوو مەسەلەدا (فَسَدَالْقِراضُ) مامڵەتی قازانجی‌هاوبەش بەتاڵ دەبێتەوەو دروست نابێ، چونکە ئەو جۆرە کارانە ئەرکی سەرشانی کرێکارەکە نین، بەڵکو بەکرێ ئەنجام دەدرێن.

﴿ ئاگاداری ﴾: بە مەزهەبی ئیمام(أحمد) دروستە: پارچە قوماشێك بداتە بەرگدرووێك تاکو بیکاتە کراس و بیفرۆشێ، نیوەی‌قازانجیشی – لە بەرامبەر کارەکەی – بداتێ، هەروەك لە(مغنى ابن قدامه)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يَجُوزُ أَنْ يَشْرِطَ عَلَيْهِ شِراءَ مَتاعٍ مُعَيَّنٍ) دروست نیە لە سەر کرێکارەکە بە مەرج دابنێ: کەلوپەلێکی دیارکراو بکڕێ، وەك بڵێ: تەنها ئەم گەنمە، یان ئەم جلە بکڕە (أَوْ نَوعٍ يَنْدُرُ وُجُودُهُ) یان بە مەرج دابنێ: جۆرێکی وەها بکڕێ: کە کەم دەست بکەوێ، وەك بڵێ: تەنها ئەسپ‌و ماینی بازوو بکڕە (أَوْ مُعامَلَةَ شَخْصٍ مُعَيَّنٍ) یان بە مەرج دابنێ، کڕین، یان فرۆشتن تەنها لەگەڵ مرۆڤێکی دیارکراو بکا.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) بە مەرج دانانرێ (بَيانُ مُدَّةِالْقِراضِ) ماوەی مامڵەتی قازانجی‌هاوبەش دیاری بکرێ، چونکە کاتی قازانج کردن دیار نیە، کەوابو: ئەگەر گوتی: تا ماوەی ساڵێك

فَلَوْ ذَكَرَ مُدَّةً وَمَنَعَهُ التَّصَرُّفَ بَعْدَها فَسَدَ، وَإِنْ مَنَعَهُ الشِّراءَ بَعْدَها فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَيُشْتَرَطُ إِخْتِصاصُهُما بالرِّبْحِ وَاشتِراكُهُما فيه، وَلَوْ قالَ قارَضْتُكَ عَلَى أَنَّ كُلَّ الرِّبْحِ لَكَ فَقِراضٌ فاسِدٌ، وَقِيلَ قِراضٌ صَحِيحٌ، وَإِنْ قالَ كُلُّهُ لِي فَقِراضٌ فاسِدٌ وَقِيلَ إِبْضاعٌ، وَكَوْنُهُ مَعْلُوماً بِالْجُزْئِيَّةِ،

---

مامڵەتی قازانجیھاوبەشم لەگەڵ کردی. ئەوە دروست نابێ، ھەروەھا (فَلَوْ ذَكَرَ مُدَّةً) ئەگەر ماوەیەکی دیاری کردو (وَمَنَعَهُ التَّصَرُّفَ بَعْدَها) لە دوای ماوەکەش قەدەغەی کرد لە دەستکاری کردن، وەك بڵێ: لە دوای ساڵێك ھیچیتر دەستکاری ماڵەکە مەکە. ئەوە (فَسَدَ الْعَقْدُ) مامڵەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام (وَإِنْ مَنَعَهُ الشِّراءَ بَعْدَها) ئەگەر تەنھا لە کڕین قەدەغەی کردو، گوتی: لە دوای ساڵێك ھیچ شتێك مەکڕە، تەنھا بفرۆشە. ئەو کاتە (فَلاَ) مامڵەتەکە بەتاڵ نابێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بە ھۆی فرۆشتنەکە قازانج دەست دەکەوێ.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی ئەو مامڵەتە بە مەرج دادەندرێ (إِخْتِصاصُهُما بِالرِّبْحِ) قازانجەکە تایبەت بێ بە خاوەنەکەو بە کرێکارەکە، واتە: دروست نیە بەشێکی قازانجەکە بۆ کەسێکیتر دابندرێ (وَ) ھەروەھا مەرجە: (اشْتِراكُهُما فِيهِ) ھەردووکیان لە قازانجەکەدا ھاوبەش بن: خاوەنەکە بە ھۆی ملکایەتیو کرێکارەکەش بە ھۆی کارکردن.

کەوابو: (وَلَوْ قالَ) ئەگەر خاوەنەکە گوتی (قارَضْتُكَ عَلَى أَنَّ كُلَّ الرِّبْحِ لَكَ) ئەم پارەیەم بە قازانجی ھاوبەشی دایە تۆ بەو مەرجەی گشت قازانجەکە بۆ تۆ بێ. ئەوە (فَقِراضٌ فاسِدٌ) مامڵەتێکی بەتاڵە، کەوابو: کرێکارەکە لە قازانجی بازرگانیەکە ھیچی نادرێتێ، بەڵام مافی ھەیە کرێیھاووێنە لە خاوەنەکە وەربگرێ، چونکە بە خۆڕایی ئەو کارەی نەکردوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێھێزدا: (قِراضٌ صَحِيحٌ) مامڵەتێکی دروستە.

(وَ) ھەروەھا (إِنْ قالَ: كُلُّهُ لِي) ئەگەر خاوەنەکە گوتی: بەو مەرجەی گشت قازانجەکە بۆ من بێ (فَقِراضٌ فاسِدٌ) ئەوەش مامڵەتێکی بەتاڵە، بەڵام لێرەدا کرێکارەکە مافی ھیچ کرێیەکی نیە ؟ چونکە بە خۆڕایی کارەکەی کردوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێھێزدا: ئەو مامڵەتە (إِبْضاعٌ) ماڵ پێدا ناردنێکی بە خۆڕاییە بۆ بازرگانی، واتە: وەکیلایەتیەکی بە خۆڕاییە لە کڕینو فرۆشتندا.

ئینجا بزانە: لەو مەسەلانەیڕابردوودا –بە ھۆی ئیزنەکە– گشت کڕینو فرۆشتنێکی کرێکارەکە دروست دەبن، ھەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَ) ھەروەھا مەرجە: (كَوْنُهُ مَعْلُوماً بِالْجُزْئِيَّةِ) دەبی ئەندازەی ھاوبەشیەکە –بەگوێرەی بەشەکانی قازانجەکە– زاندراو بێ، وەك بڵێ: نیوەی قازانجەکە، یان سێیەکیقازانجەکە

فَلَوْ قالَ: عَلَى أَنَّ لَكَ فيهِ شَرِكَةً أَوْ نَصيباً فَسَدَ، أَوْ بَيْنَنا فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ وَيَكُونُ نِصْفَيْنِ، وَلَوْ قالَ لِي النِّصْفُ فَسَدَ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ قالَ: لَكَ النِّصْفُ صَحَّ عَلَى الصَّحيحِ، وَلَوْ شَرَطَ لأَحَدِهِما عَشَرَةً أَوْ رِبْحَ صِنْفٍ فَسَدَ.

(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ إِيجابٌ وَقَبُولٌ، وَقِيلَ يَكْفِي الْقَبُولُ بِالْفِعْلِ، وَشَرْطُهُما كَوَكِيلٍ وَمُوَكِّلٍ،

---

بۆ تۆ. کەوابو: (فَلَوْ قالَ) ئەگەر خاوەنەکە گوتی: ئەم پارەیەم بە قازانجیهاوبەش دایە تۆ (عَلَى أَنَّ لَكَ فيهِ شَرِكَةً أَوْ نَصِيباً) بەو مەرجەی: تۆش بەشێکت لە قازانجەکەدا هەبێ، یان تۆش هاوبەش بی لە قازانجەکەدا. ئەوە (فَسَدَ) مامڵەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

(أَوْ بَيْنَنا) بەڵام ئەگەر گوتی: قازانجەکە هاوبەش بێ: لە نێوان هەردووکماندا. ئەوە (فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ) بە فەرموودەی ڕاستتر مامڵەتەکە دروستەو (وَيَكُونُ نِصْفَيْنِ) قازانجەکە دەبێتە نیوە لە نێوانیاندا.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر خاوەنەکە گوتی: (لِيَ النِّصْفُ) نیوەی قازانجەکە بۆ من بێ. بەڵام باسی کرێکارەکەی نەکرد، ئەو کاتەش (فَسَدَ فِي الأَصَحِّ) مامڵەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام (وَإِنْ قالَ لَكَ النِّصْفُ) ئەگەر گوتی: نیوەی قازانجەکە بۆ تۆ بێ. باسی خۆیشی نەکرد، ئەو کاتە (صَحَّ عَلَى الصَّحِيحِ) مامڵەتەکە دروست دەبێ لەسەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلَوْ شَرَطَ لأَحَدِهِما) ئەگەر خاوەنەکە –بۆ خۆی، یان بۆ کرێکارەکەی– بە مەرجی دانا: (عَشَرَةً) لە قازانجەکە دە دیناری هەبێ (أَوْ رِبْحَ صِنْفٍ) یان بە مەرجی دانا: یەکێکیان قازانجی جۆرەماڵێکی ئەو بازرگانییەی هەبێ، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (فَسَدَ) مامڵەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە وادەبێ تەنها دە دینارەکە قازانج دەبێ، یان تەنها جۆرەکە قازانج دەدا، ئەو کاتەش تایبەت دەبێ بە یەکێکیان نەك بە هەردووکیان.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گۆتە و مەرجەکانی خاوەنەکە و کرێکارەکە ﴾

(يُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی مامڵەتی قازانجیهاوبەش بە مەرج دادەنرێ: (إِيجابٌ) گۆتەی ماڵ وێدان هەبێ، وەك بڵێ: ئەم پارەیەم بە قازانجیهاوبەشی دایە تۆ. یان بڵێ: ئەم پارەیەم لێوەربگرەو بازرگانیی پێ بکە قازانج بە نیوەییمان.

(وَقَبُولٌ) هەم گۆتەی قبوڵکردنیش هەبێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (يَكْفِي الْقَبُولُ بِالْفِعْلِ) قبوڵکردنی بە کردار بەسەو پێویست بە گۆتن ناکا.

(وَشَرْطُهُما) مەرجی خاوەنەکەو کرێکارەکە (كَوَكِيلٍ وَمُوَكِّلٍ) وەکو مەرجەکانی وەکیلو وەکیلگرە، کەوابو: ئەگەر یەکێکیان منداڵ، یان شێت، یان قەدەغەکراو، یان زۆرلێکراو بوو، ئەوە مامڵەتەکە دروست نابێ، بەڵام بۆ سەرپەرشتکاری شێتو منداڵ دروستە:

وَلَوْ قارَضَ الْعَامِلُ آخَرَ بِإِذْنِ الْمالك لِيُشارِكَهُ فِي الْعَمَلِ وَالرِّبْحِ لَمْ يَجُزْ فِي الأَصَحِّ، وَبِغَيْرِ إِذْنِه فاسِدٌ، فَإِنْ تَصَرَّفَ الثَّانِي فَتَصَرُّفُ غاصِب: فَإِنْ اشْتَرَى فِي الذِّمَّةِ وَقُلْنا بِالْجَدِيد فَالرِّبْحُ لِلْعامِلِ الأَوَّل فِي الأَصَحِّ وَعَلَيْهِ لِلثَّانِي أُجْرَتُهُ، وَقِيلَ هُوَ لِلثَّانِي،

---

پارەی ئەوان بە قازانجیهاوبەش بداتە ئەو جۆرە کەسەی: کە دروستە ماڵی ئەوانی لە لای دابنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ قارَضَ الْعَامِلُ آخَرَ بِإِذْنِ الْمالِكِ) ئەگەر کرێکارەکە-بە ئیزنی خاوەنەکە- پارەکەی وی بە قازانجیهاوبەش دایە کەسێکیتر (لِيُشارِكَهُ فِي الْعَمَلِ وَالرِّبْحِ) تاکو ئەو کەسەش هاوبەشیی کرێکارەکە بکا: لە کارکردنو لە قازانجدا (لَمْ يَجُزْ) ئەوە مامڵەتەکەیدووەم حەڵاڵ نیەو دروست نابێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام مامڵەتەکەی یەکەم هەر بە دروستی دەمێنێتەوە، کەوابو: ئەگەر کرێکارە دووەمەکە-لەو مامڵەتە دروست نەبووەدا- کڕینو فرۆشتنی کردو قازانجی کرد، ئەوە گشت قازانجەکە بۆ خاوەن پارەکەیە، خاوەنەکەش کرێیهاووێنە دەداتە ئەو کرێکارە دووەمە، کرێکارە یەکەمەکەش-ئەگەر هیچ کاری نەکردبێ- هیچی نادرێتێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

(وَ) هەر ئەو جۆرە مامڵەتەیڕابردوو (بِغَيْرِ إِذْنِهِ) بێئیزنیخاوەنەکە (فاسِدٌ) بەتاڵەو دانامەزرێ، کەوابو: (فَإِنْ تَصَرَّفَ الثَّانِي) ئەگەر کرێکارە دووەمەکە-بێئیزنی خاوەنەکە- کڕینو فرۆشتنی کرد، ئەوە (فَتَصَرُّفُ غاصِبٍ) دەستکاریی زەوتکەرەو دەبێتە زامین.

ئینجا (فَإِنِ اشْتَرَى فِي الذِّمَّةِ) ئەگەر کرێکارە دووەمەکە شتێکی بۆ کرێکارەکەییەکەم بە قەرز کڕی، ئینجا قەرزەکەشی لە ماڵی مامڵەتەکە دایەوەو قازانجیشی کرد (وَقُلْنا بِالْجَدِيدِ) ئەگەر -لە باسیزەوتکردندا- بە فەرموودەی نوێی ئیمامی (الشافعي) بڵێین: قازانج گشتی بۆ زەوتکەرەکەیە ئەگەر بە قەرز بکڕێ، ئەو کاتە لەم مەسەلەیەشدا (فَالرِّبْحُ لِلْعامِلِ الأَوَّلِ) گشت قازانجەکە بۆ کرێکارەکەی یەکەمە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە کڕینەکە بۆ وی دامەزراوەو دروست بووە، دووەمەکەش وەکو وەکیلێك بە ئیزنی وی بۆ وی کڕیویەتی، کەوابو: (وَعَلَيْهِ لِلثَّانِي أُجْرَتُهُ) لە سەر کرێکارەکەییەکەم واجبە: کرێی کرێکارەکەیدووەم بدا، چونکە بەشی لە قازانجەکە نیەو بە خۆڕاییش ئەو کارەی نەکردوە، بەڵام دووەمەکەش دەبێتە زامینی ئەو پارەیەی لە قەرزی داوەتەوە، چونکە قەرزدانەوەکەی ناشەرعییەو دروست نەبووە، کەوابو: تۆڵەی پارەکە دەداتە خاوەنەکەی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (هُوَ لِلثَّانِي) قازانجەکە گشتی بۆ کرێکارەکەی دووەمە.

وَإِن اشْتَرَى بِعَيْنِ مالِ الْقِراضِ فَباطِلٌ، وَيَجُوزُ أَنْ يُقـارِضَ الْواحِـدُ إِثْنَـيْنِ مُتَفاضِـلاً وَمُتَساوِياً، وَالإِثْنان وَاحِداً وَالرِّبْحُ بَعْدَ نَصِيب الْعامِلِ بَيْنَهُما بِحَسَبِ الْمالِ، وَإِذا فَسَـدَ الْقِراضُ نَفَذَ تَصَرُّفُ الْعامِلِ، وَالرِّبْحُ لِلْمالِك، وَعَلَيْهِ لِلْعامِلِ أُجْرَةُ مِثْـلِ عَمَلِـه إِلاَّ إِذا قالَ قارَضْتُكَ وَجَمِيعُ الرِّبْحِ لِي فَلاَ شَيْءَ لَهُ فِي الأَصَحِّ، وَيَتَصَرَّفُ الْعامِـلُ مُحْتاطـاً لاَ بِغَبْنٍ وَلاَ نَسِيئَة

---

بەلام (وَإِنِ اشْتَرَى بِعَيْنِ مالِ الْقِراضِ) ئەگەر کرێکارەکەی‌دووەم بە خودی مـاڵی مامڵەتەکە شتێکی کڕی، ئەو کاتە (فَباطِلٌ) کڕینەکە–لە سەر فـەرموودەی‌نوێ– بەتاڵەو بۆ هیچێکیان دانامەزرێ، هەروەك لە مەرجی‌چوارەمی مامڵەت پێکراودا ڕوونمان کردەوە.

(وَيَجُوزُ أَنْ يُقارِضَ الْواحِدُ إِثْنَيْنِ) دروستە: یەك خاوەن پارەکەی بە قازانجی‌هاوبەش بداتە دوو کرێکاران: جا (مُتَفاضِلاً) بەشی یەکێکیان–لە قازانجەکە– لەوی‌تر زیاتر بێ (وَمُتَساوِياً) یان یەکسان بێ (وَ) هـەروەها بـە پێچـەوانەوەش دروسـتە (الإِثْنـانِ وَاحِداً) دوو خـاوەن مامڵـەتی قازانجی‌هاوبـەش لەگـەڵ یـەك کرێکـار ببەسـتن، ئینجـا (وَالـرِّبْحُ) قـازانجی ماڵەکـەی هەردووکیان (بَعْدَ نَصِيبِ الْعامِلِ) پاش ئەوەی بەشی کرێکارەکەی لێوەرگیرا (بَيْنَهُمـا بِحَسَبِ الْمالِ) لە نێوان هەردووکیاندا بە گوێرەی پارەکەیان دەبێ، واتە: ئەگـەر خاوەنێك دوو هـەزار دینـاری دابـوێ، خاوەنەکـەی‌تریش هـەزاری دابـوێ، نیـوەی قازانجیشـیان بـۆ کرێکارەکـە دانابو، ئەوە کرێکارەکە نیـوەی قازانجەکـە وەردەگرێ، ئینجـا لـە نیوەکـەی‌تریش: خـاوەنی هەزارەکـە بەشـێکی لێوەردەگرێو خـاوەنی دوو هەزارەکـەش دوو بەشـی لێ وەردەگـرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَإِذا فَسَدَالْقِراضُ) هـەر کاتێـك مامڵـەتی قازانجی‌هاوبـەش بـەتاڵو نـا دروسـت بوبـێ (نَفَـذَ تَصَـرُّفُ الْعامِـلِ) دەسـتکاری‌کرێکارەکە بـە کـڕینو فرۆشـتن، جێبـەجێ دەبـێو بـە دروستبوویی دادەندرێ، چونکە ئیزندانەکە هەر بەردەوامە، بەلام (وَالـرِّبْحُ لِلْمالِكِ) قازانجەکە گشتی بۆ خاوەن پارەکەیەو (وَعَلَيْهِ لِلْعامِلِ أُجْـرَةُ مِثْـلِ عَمَلِـهِ) لـە سـەر خاوەنەکـەش واجبـە: کـرێی وێنەی‌کارەکـە بداتـە کرێکارەکـە، هەرچـەند هـیچ قازانجیشـی نـەکردبێ، چـونکە بـە خۆڕایی ئـەو کـارەی نـەکردوە (إِلاَّ إِذا قـالَ) تـەنها لـەو کاتـەدا نـەبێ: کـە خاوەنەکـە بڵـێ: (قارَضْتُكَ وَجَمِيعُ الرِّبْحِ لِي) مامڵەتی قازانجی‌هاوبەشم لەگەڵ کردیو هـەموو قازانجەکـەش بۆ من بێ، ئەو کاتە (فَلاَ شَيْءَ لَهُ) کرێکارەکە مافی هیچ کرێو هیچ قـازانجێکی نیـە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بە خۆڕایی کارەکەی کردوە.

(وَيَتَصَرَّفُ الْعامِـلُ مُحْتاطـاً) کرێکارەکـە بـە پارێزکاریـەوە دەستکاری لـە ماڵەکـەدا دەکـا، کەوابو: (لاَ بِغَبْنٍ) نابێ بە زەرەرێکی ناشیرن کـڕینو فـرۆشتن بکـاو (وَلاَ نَسِـيئَةٍ) نابـێ بـە

بلاَ إذْن، وَلَهُ الْبَيْعُ بعَرْض، وَلَهُ الرَّدُّ بعَيْب تَقْتَضيه مَصْلَحَةٌ، فَإن اقْتَضَت الإمْساكَ فَلاَ في الأَصَحِّ، وَلِلْمالك اَلرَّدُّ، فَإن اخْتَلَفا عُمِلَ بالْمَصْلَحَة، وَلاَ يُعامِلُ الْمالكَ، وَلاَ يَشْتَرى للْقراض بأكْثَرَ منْ رَأْس الْمال، وَلاَ مَنْ يَعْتقُ عَلَىالْمالك بغَيْر إذْنه، وَكَذا زَوْجُهُ فيالأَصَحِّ، وَلَوْ فَعَلَ لَمْ يَقَعْ للْمالك، وَيَقَعُ للْعامل إنْ اشْتَرى

---

قەرزیش کڕینو فرۆشتن بکا (بِلاَ إذْنٍ) بە بێئیزنی خاوەنەکە (وَلَهُ الْبَيْعُ بعَرْضٍ) بۆ کرێکارەکە دروستە: کڕینو فرۆشتنەکە بە کەلوپەلێکی -جگە لە پارە- بکا، بەڵام دروست نیە: کڕینو فرۆشتنەکە بە پارەیەکیتری -جگە لە پارەی شوێنەکە- بکا، چونکە پارەکەیتر لەو شوێنەدا ڕەواجی نیە.

(وَلَهُ الرَّدُّ بعَيْبٍ) بۆ کرێکارەکە دروستە، بەڵکو واجبە: کەلوپەلیکڕاو بۆ فرۆشیارەکە بگەڕێنێتەوە بە هۆی عەیبێکی وەها: کە نەیزانیبێ، لەو حاڵەتەی کە (تَقْتَضيه مَصْلَحَةٌ) بەرژەوەندیەك گەڕاندنەوەکەی بوێ، بەڵام (فَإنِ اقْتَضَتِ الإمْساكَ) ئەگەر بەرژەوەندیەکە گرتنەوەی عەیبدارەکەی دەویا (فَلاَ) نابێ بیگەڕێنێتەوە (فيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَ) هەروەها (لِلْمالك الرَّدُّ) خاوەنەکەش مافی گەڕاندنەوەی عەیبدارەکەی هەیە (فَإنِ اخْتَلَفا) جا ئەگەر کرێکارەکەو خاوەنەکە لە گەڕاندنەوەیدا بووە کێشەیان، ئەو کاتە (عُمِلَ بِالْمَصْلَحَةِ) بەگوێرەی بەرژەوەندی کار دەکرێ.

(وَلاَ يُعامِلُ الْمالِكَ) دروست نیە کرێکارەکە مامڵەتی کڕینو فرۆشتن -بە خودی ماڵی قازانجیهاوبەش- لەگەڵ خاوەنەکە بکا، هەم دروست نیە دوکانیشی لێبەکرێ بگرێ بۆ ئەوەی کەلوپەلی قازانجیهاوبەشی تێدا دابنێ، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی، بەڵکو ئەگەر خاوەنەکە دوو کرێکاری ئەو مامڵەتەی هەبون، بۆ ئەوانیش دروست نیە: بە خودی ماڵی قازانجیهاوبەش کڕینو فرۆشتن لەگەڵ یەکتری بکەن، چونکە لە گشت ئەو مەسەلانەیڕابردوودا دەبێتە ماڵفرۆشتنی یەك خاوەن بە ماڵی هەمان خاوەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام دروستە کرێکارەکە بە ماڵی خۆی ماڵی بازرگانیەکە لە خاوەنەکە بکڕێ بۆ خۆی، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يَشْتَرِي لِلْقراضِ بأَكْثَرَ مِنْ رَأْسِ الْمالِ) نابێ بۆ قازانجیهاوبەش بە زیاتر لە سەرمایەی مامڵەتەکە شت بکڕێ بێئیزنی خاوەنەکە، هەم (وَلاَ مَنْ يَعْتِقُ عَلَىالْمالِكِ بِغَيْرِ إذْنِهِ) نابێ -بێ ئیزن- کۆیلەیەکی وەها بکڕێ: کە لە دژی خاوەنەکە ئازاد ببێ: وەك باوكو دایكو منداڵەکانی خاوەنەکە (وَكَذا زَوْجُهُ فِيالأَصَحِّ) هەروەها ژنیخاوەنەکەش -ئەگەر کۆیلە بێ- نابێ بیکڕێ (وَلَوْ فَعَلَ) ئەگەر کرێکارەکە یەکێکی لەو قەدەغەکراوانە کرد، ئەوە (لَمْ يَقَعْ لِلْمالِكِ) مامڵەتەکە بۆ خاوەنەکەی دانامەزرێ، بەڵام (وَيَقَعُ لِلْعامِلِ إنِ اشْتَرى

فِي الذِّمَّة، وَلاَ يُسافِرُ بِالْمال بِلاَ إِذْن، وَلاَ يُنْفِقُ مِنْهُ عَلَى نَفْسِه حَضَراً وَكَذَا سَفَراً فِي الأَظْهَر، وَعَلَيْه فِعْلُ ما يُعْتادُ: كَطَيِّ الثَّوْب وَوَزْن الْخَفِيف كَذَهَب وَمِسْك لاَ الْأَمْتِعَة الثَّقِيلَة وَنَحْوُهُ، وَما لاَيَلْزَمُهُ لَهُ الإِسْتِئْجارُ عَلَيْه، وَالأَظْهَرُ أَنَّ الْعامِلَ يَمْلِكُ حِصَّتَهُ مِنَ الرِّبْحِ بِالْقِسْمَة لاَ بِالظُّهُور،

---

فِي الذِّمَّةِ) بۆ کرێکارەکە دادەمەزرێ ئەگەر بە قەرزی کڕیبێ، واتە: ئەگەر بە خودی ماڵی قازانجی هاوبەشیی کڕیبێ، ئەو کاتە مامڵەتەکە بەتاڵە.

(وَلاَ يُسافِرُ بِالْمالِ بِلاَ إِذْنٍ) نابێ کرێکارەکە بە بێ ئیزن بازرگانیەکە بباتە شارێکیتر، هەم (وَلاَ يُنْفِقُ مِنْهُ عَلَى نَفْسِهِ حَضَراً) نابێ لە ماڵی بازرگانی ئەرکی بەخێوکردنی خۆی ببا ئەگەر لە ماڵەوە بێ (وَكَذَا سَفَراً) هەروەها ئەگەر لە سەفەریش بێ، هەر دروست نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام لە فەرموودەی بێهێزدا: هەر ئەرکێك بە هۆی سەفەر لە سەر کرێکارەکە زیاد ببێ، بۆی دروستە لە ماڵی بازرگانیەکە بیدا -بەگوێرەی عادەت- واتە: وەك کرێی ئوتومبێلو میوانخانە -نەك خواردن- جا ئەو ئەرکانەش لە قازانجی بازرگانیەکە دەردەکرێن، جا ئەگەر قازانج نەبو، ئەو کاتە بە زەرەر دادەندرێن، هەروەها دروست نیە هیچ شتێکیش لە ماڵی بازرگانیەکە بکاتە خێر، هەروەك ئەو دوو مەسەلەیە لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَعَلَيْهِ فِعْلُ ما يُعْتادُ) لە سەر کرێکارەکە واجبە: ئەو جۆرە کارانەی عادەتە بازرگانەکان بیکەن، ئەویش بەخۆی بیانکا: (كَطَيِّ الثَّوْبِ) وەکو پێچانەوەی جلوبەرگو کەلوپەل، هەم (وَوَزْنِ الْخَفِيفِ) کێشانی شتی سوك بە تەرازوو: (كَذَهَبٍ وَمِسْكٍ) وەکو زێڕو میسك (لاَ الأَمْتِعَةَ الثَّقِيلَةَ) نەك کەلوپەلی گرانو (وَنَحْوُهُ) کاریتری ئەوها گرانیشی لە سەر نیە: وەك گواستنەوەو هەڵگرتنی لە ناو بازاڕدا، کەوابو: (وَما لاَ يَلْزَمُهُ) هەر کارێکی لە سەری واجب نەبێ (لَهُ الإِسْتِئْجارُ عَلَيْهِ) بۆی دروستە: لە ماڵی بازرگانیەکە کرێی بۆ بدا، بەڵام ئەگەر بەخۆی بیکا، ئەو کاتە مافی کرێی نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەی گومرگو پاسەوانەکانی دوکانو ڕێگەو پۆلیسەکان لێیوەردەگرتن، کشتی لە ماڵی بازرگانی دەژمێردرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: لە قازانجەکەی دەدرێ، جا ئەگەر قازانج نەبو، ئەوە بە زەرەر دادەندرێ، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ الْعامِلَ يَمْلِكُ حِصَّتَهُ مِنَ الرِّبْحِ) کرێکارەکە دەبێتە خاوەنی بەشەکەیخۆی لە قازانجی بازرگانیەکە (بِالْقِسْمَةِ) بە بەشکردنیقازانجەکە: کە کرابێتەوە پارە (لاَبِالظُّهُورِ) نەك بە ئاشکرابوونی قازانجەکە.

وَثِمارُ الشَّجَرِ وَالنِّتاجُ وَكَسْبُ الرَّقِيقِ وَالْمَهْرُ الْحاصِلَةُ مِنْ مالِ الْقِراضِ يَفُوزُ بِها الْمالِكُ، وَقِيلَ مالُ قِراضٍ، وَالنَّقْصُ الْحاصِلُ بِالرُّخْصِ مَحْسُوبٌ مِنَ الرِّبْحِ ما أَمْكَنَ وَمَجْبُورٌ بِهِ، وَكَذا لَوْ تَلِفَ بَعْضُهُ بِآفَةٍ أَوْ غَصْبٍ أَوْ سَرِقَةٍ بَعْدَ تَصَرُّفِ الْعامِلِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ تَلِفَ قَبْلَ تَصَرُّفِهِ

---

(وَثِمارُالشَّجَرِ) بەری درەختی بازرگانیەکەو (وَالنِّتاجُ) بێچووەکانی ئاژەڵی بازرگانیەکەو (وَكَسْبُ الرَّقِيقِ) کەسابەتی کۆیلەی بازرگانیەکەو (وَالْمَهْرُ) مارەیی (جاریة)ی بازرگانیەکە، هەم کرێی زەوی‌و ئاژەڵی بازرگانیەکە: کە لە کاتی کڕیندا نەبوبن، بەڵکو (الْحاصِلَةُ مِنْ مالِ الْقِراضِ) گشتیان لە دوای‌کڕین–بەخۆیان– لە ماڵی بازرگانیەکە پەیدا بوبن، نەك بە دەستکاریی‌کرێکارەکە، ئەوە (يَفُوزُ بِهاالْمالِكُ) گشتی دەبێتە هی خاوەن پارەکە، نابێتە ماڵی بازرگانیەکە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: (مالُ قِراضٍ) ئەوانە گشتی ماڵی بازرگانیەکەنە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئاژەڵی ئاوس، یان داری بە بەری بۆ بازرگانی کڕیبێ، ئەو کاتە بێچووەکەش‌و بەرەکەش هەر بە ماڵی بازرگانی دادەندرێن، بە فەرموودەی بەهێزتر: چونکە لە کاتی کڕیندا ئەوانە هەبون.

(وَالنَّقْصُ الْحاصِلُ بِالرُّخْصِ) ئەو زەرەرو ناتەواویەی لە ماڵی بازرگانیەکە پەیدا دەبێ: بە هۆی هەرزانی، یان عەیبداری (مَحْسُوبٌ مِنَ الرِّبْحِ ما أَمْكَنَ) لە قازانجەکە دەژمێردرێ تا دەگونجێ (وَمَجْبُورٌ بِهِ) زەرەکە بە قازانجەکە پڕ دەکرێتەوە، جیاوازی نیە زەرەرەکە: پێش قازانجەکە پەیدا بوبێ، یان لە دوای قازانجەکە، هەروەك لە (بجیرمی)دا فەرموویەتی.

جا ئەگەر قازانجەکە بەش کرابو، بەڵام مامڵەتەکە هەر بەردەوام بوو و هەڵنەوەشێندرابۆوە، ئەو کاتە زەرەرەکە بە قازانجە بەشکراوەکەش پڕ دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر ماڵەکە کرابۆوە پارەو مامڵەتەکەش کۆتایی هاتبو، یان هەڵوەشێندرابۆوە، ئەو کاتە ملکایەتی‌کرێکارەکە لە قازانجەکە جێگیر دەبێ‌و بە هیچ جۆرێك لێی وەرناگیرێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَكَذا) هەروەها (لَوْ تَلِفَ بَعْضُهُ بِآفَةٍ) ئەگەر بەشێکی ماڵەکە بە هۆی ڕوداوێکی ئاسمانی لە ناو چوو: وەك سوتان‌و کەوتنە ناو ئاو (أَوْ غَصْبٍ) یان بە هۆی زەوتکردن (أَوْ سَرِقَةٍ) یان بە هۆی دزین لە ناو چوو، ئەشگونجا تۆڵەی لە زەوتکەرەکەو دزەکە وەربگیرێ، هەم (بَعْدَ تَصَرُّفِ الْعامِلِ) لە دوای دەستکاریی‌کرێکارەکەش ئەو ڕوداوانە پەیدا بون، ئەوانەش گشتی لە قازانجەکە دەژمێردرێن‌و پێی پڕ دەکرێنەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (وَإِنْ تَلِفَ قَبْلَ تَصَرُّفِهِ) ئەگەر بەشێکی ماڵەکە پێش

فَمِــــــنْ رَأْسِ الْمــــــــال فِي الأَصَـــــــحِّ.
(فَصْلٌ) لِكُلٍّ فَسْخُهُ، وَلَوْ ماتَ أَحَدُهُما أَوْ جُنَّ أَوْ أُغْمِيَ عَلَيْهِ انْفَسَخَ، وَيَلْــزَمُ الْعامِــلَ الإِسْتِيفاءُ إِذا فَسَخَ أَحَدُهُما، وَتَنْضِيضُ رَأْسِ الْمالِ إِنْ كانَ عَرَضــاً، وَقِيــلَ لاَ يَلْزَمُــهُ التَّنْضِيضُ إِذا لَمْ يَكُنْ رِبحٌ،

---

دەستکاریی کرێکارەکە لەناو چوو، واتە: پێش ئەوەی دەست بە کڕینو فرۆشتن بکا، ئەو کاتە (فَمِنْ رَأْسِ الْمالِ) زەرەرەکە لە سەرمایەی بازرگانیەکە دەژمێردرێ نەك لە قازانجەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر ماڵەکە هەمووی لە ناو بچێ، ئەو کاتە -لە گشت حاڵەتێکدا- مامڵەتەکە کۆتایی دێ، بەڵام ئەگەر بێگانەیەك هەموو ماڵەکەی فەوتاندو تۆڵەی لێوەرگیرا، یان تۆڵەی لە زەوتکەرەکەو لە دزەکە وەرگیرا، ئەو کاتە مامڵەتەکە کۆتایی نایێو بەو تۆڵەیە بازرگانی دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

### ﴿ فَصْلٌ: لە باسی هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتەکەو، کێشەی هەردوو لا ﴾

(لِكُلٍّ فَسْخُهُ) بۆ هەر یەکێك لە خاوەنەکەو لە کرێکارەکە دروستە: مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە هەر کاتێك حەز بکا، هەرچەند ئەویتریش ڕازی نەبێو حازریش نەبێ، وەك بڵێ: (مامڵەتەکەم هەڵوەشاندەوە). یان خاوەنەکە بڵێ: (هیچیتر دەستکاری ماڵەکەم مەکە). یان ماڵەکەی خۆی لە کرێکارەکە وەربگرێتەوە.

(وَلَوْ ماتَ أَحَدُهُما) ئەگەر یەکێکیان -خاوەنەکە، یان کرێکارەکە- مرد (أَوْ جُنَّ) یان یەکێکیان شێت بوو (أَوْ أُغْمِيَ عَلَيْهِ) یان یەکێکیان بێهۆش بوو، ئەو کاتە (انْفَسَخَ) مامڵەتەکە بە خۆی هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر خاوەنەکە مرد، یان شێت بوو، ئەو کاتە بە بێئیزنی میراتگرەکانی بۆ کرێکارەکە دروستە: ئەوەندە کەلوپەلەی لە دەستیدا ماوە، بیکاتەوە پارەو ئەو پارەیەی وەرنەگیراوە، وەریبگرێ، بەڵام ئەگەر کرێکارەکە بمرێ، ئەو دەستکاریانە بۆ میراتگرەکانیوی دروست نینە بە بێئیزنی خاوەن پارەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَلْزَمُ الْعامِلَ الإِسْتِيفاءُ إِذا فَسَخَ أَحَدُهُما) جا هەر کاتێك یەکێکیان مامڵەتەکەی هەڵوەشاندەوە، لە سەر کرێکارەکە واجبە: قەرزەکانی بازرگانیەکە وەربگرێتەوەو هەم (وَتَنْضِيضُ رَأْسِ الْمالِ) بە ئەندازەی سەرمایەکەش لە بازرگانیەکە بکاتەوە پارە (إِنْ كانَ عَرَضاً) ئەگەر ئەوەی لە بەردەستیدایە کەلوپەل بێ، واتە: بەڵام ئەندازەی قازانجەکەی لە سەر واجب نیە: بیکاتەوە پارە، چونکە لە نێوانیاندا هاوبەشە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لاَ يَلْزَمُهُ التَّنْضِيضُ) کردنە پارەی لە سەر نیە (إِذا لَمْ يَكُنْ رِبحٌ) ئەگەر قازانجی نەبێ.

وَلَوْ اسْتَرَدَّ الْمالكُ بَعْضَهُ قَبْلَ ظُهُورِ رِبْحٍ وَخُسْرانٍ رَجَعَ رَأْسُ الْمالِ إِلَى الْباقي، وَإِن اسْتَرَدَّ بَعْدَ الرِّبْحِ فَالْمُسْتَرَدُّ شائعٌ رِبْحاً وَرَأْسَ مال، مثالُهُ: رَأْسُ الْمالِ مِأَةٌ وَالرِّبْحُ عِشْرُونَ وَاسْتَرَدَّ عِشْرِينَ فَالرِّبْحُ سُدُسُ الْمالِ فَيَكُونُ الْمُسْتَرَدُّ سُدُسُهُ مِنَ الرِّبْحِ فَيَسْتَقِرُّ لِلْعامِلِ الْمَشْرُوطُ مِنْهُ، وَباقيه مِنْ رَأْسِ الْمالِ، وَإِن اسْتَرَدَّ بَعْدَ الْخُسْرانِ فَالْخُسْرانُ مُوَزَّعٌ عَلَى الْمُسْتَرَدِّ وَالْباقي فَلاَ يَلْزَمُ جَبْرُ حِصَّةِ الْمُسْتَرَدِّ لَوْ رَبِحَ بَعْدَ ذَلِكَ،

---

(وَلَو اسْتَرَدَّ الْمالِكُ بَعْضَهُ) ئەگەر خاوەنەکە بەشێکی لە ماڵی بازرگانیەکە وەرگرتەوە (قَبْلَ ظُهُورِ رِبْحٍ وَخُسْرانٍ) پێش ئەوەی قازانجو زەرەر ئاشکرا بین، ئەوە (رَجَعَ رَأْسُ الْمالِ إِلَى الْباقِي) سەرمایەی بازرگانیەکە دێتەوە سەر ئەو ئەندازەیەی ماوەتەوە، واتە: وا دادەندرێ: لە سەرەتاوە هەر ئەو ئەندازەیەی بۆ بازرگانی داناوە.

بەڵام (وَإِنِ اسْتَرَدَّ بَعْدَ الرِّبْحِ) ئەگەر لە دوای ئاشکرابوونی قازانج بەشێکی لە ماڵی بازرگانیەکە وەرگرتەوە، ئەو کاتە (فَالْمُسْتَرَدُّ) ئەوەی وەرگیراوەتەوە (شائِعٌ رِبْحاً وَرَأْسَ مال) بە بەربڵاوی بەش دەکرێ بە سەر قازانجەکەو سەرمایەکەدا:

(مِثالُهُ) بۆ وێنەی ئەم مەسەلەیە دەڵێین: (رَأْسُ الْمالِ مِأَةٌ) سەرمایەی بازرگانیەکە -کە خاوەنەکە دابویە کرێکارەکە- سەد دینار بوو (وَالرِّبْحُ عِشْرُونَ) قازانجەکەشی بیست دینار بوو، کۆی دەکاتە سەدو بیست دینار (وَاسْتَرَدَّ عِشْرِينَ) خاوەنەکەش بیست دیناری -لەو سەدو بیستە- وەرگرتەوە، ئەوە (فَالرِّبْحُ سُدُسُ الْمالِ) قازانجەکە -کە بیستەکەیە- شەشێکی هەموو ماڵی بازرگانیەکەیەو لە نێوانیاندا هاوبەشە، کەوابو: (فَيَكُونُ الْمُسْتَرَدُّ) ئەو بیستەی وەرگیراوەتەوە بەم جۆرە بەش دەکرێ: (سُدُسُهُ مِنَ الرِّبْحِ) شەشێکی -کە سێ دینارو سێیەکە دینارێکە- لە قازانجەکە دەژمێردرێ (فَيَسْتَقِرُّ لِلْعامِلِ الْمَشْرُوطُ مِنْهُ) ئەو بەشەی بۆ کرێکارەکە بە مەرج داندراوە، لەو شەشێکە جێگیر دەبێ، واتە: ئەگەر نیوەی قازانجی بۆ بە مەرج داندرابێ: لێرەدا بەشی کرێکارەکە دینارێکو دوو سێیەکو لە ئەستۆی خاوەنەکەدایەو واجبە بیداتەوە (وَباقِيه) ئەوی‌تریش -کە شانزە دینارو دوو سێیەکە- گشتی (مِنْ رَأْسِ الْمالِ) لە سەرمایەکە دەژمێردرێ، کەواتە: سەرمایەکە دێتەوە سەر هەشتاو سێ دینارو سێیەکە دینارێك.

(وَإِنِ اسْتَرَدَّ بَعْدَ الْخُسْرانِ) ئەگەر لە دوای ئاشکرابوونی زەرەر بەشێکی لە ماڵی بازرگانیەکە وەرگرتەوە، ئەو کاتە (فَالْخُسْرانُ مُوَزَّعٌ) زەرەرەکە بەش دەکرێ (عَلَى الْمُسْتَرَدِّ وَالْباقِي) بەسەر ئەوەی وەرگیراوەتەوەو ئەوەی ماوەتەوە، کەوابو: (فَلاَ يَلْزَمُ جَبْرُ حِصَّةِ الْمُسْتَرَدِّ) واجب نیە بەشە زەرەرەکەی وەرگیراوەکە پڕ بکرێتەوە (لَوْ رَبِحَ بَعْدَ ذَلِكَ) ئەگەر لە دوای ئەو وەرگرتنەوەیە قازانجی کرد:

مثالُهُ: اَلْمالُ مأةٌ وَالْخسْرانُ عِشْرُون ثُمَّ اسْتَرَدَّ عشرِينَ فَرُبُعُ الْعشرِينَ حصَّةُ الْمُسْتَرَدِّ، وَيَعُودُ رَأْسُ الْمالِ إِلَى خَمْسَةٍوَسَبْعِينَ، وَيُصَدَّقُ الْعامِلُ بِيَمِينِه فِي قَوْلِه: لَمْ أَرْبَحْ، أَوْ لَمْ أَرْبَحْ إِلاَّ كَذَا، أَوِ اشْتَرَيْتُ هَذَا لِلْقِراضِ أَوْ لِي، أَوْ لَمْ تَنْهَنِي عَنْ شِراءِ كَذَا، وَفِي قَدْرِ رَأْسِ الْمالِ، وَدَعْوَى التَّلَفِ، وَكَذَا دَعْوَى الرَّدِّ فِي الأَصَحِّ، وَلَوِ اخْتَلَفا فِي الْمَشْرُوطِ لَهُ تَحالَفا، وَلَهُ أُجْرَةُ الْمِثْلِ.

---

(مِثالُهُ) وێنەی ئەم مەسەلەیە: (اَلْمالُ مأةٌ) سەرمایەکە سەد دینار بوو (وَالْخُسْرانُ عِشْرُونَ) زەرەرەکەش بیست دینار بوو (ثُمَّ اسْتَرَدَّ عِشْرِينَ) ئینجا خاوەنەکەش بیست دیناری لێ وەرگرتەوە، ئەوە (فَرُبُعُ الْعِشْرِينَ) چوارێکی بیستەکەی زەرەر-کە پێنج دینارە- (حِصَّةُ الْمُسْتَرَدِّ) بەشی بیستە وەرگیراوەکەیەو لە سەر خاوەنەکە دەژمێردرێو وا دادەندرێ: بیستو پێنج دیناری وەرگرتۆتەوە، کەوابو: (وَيَعُودُ رَأْسُ الْمالِ إِلَى خَمْسَةٍ وَسَبْعِينَ) سەرمایەکە دێتەوە سەر حەفتاو پێنج دینار، چونکە ئێستا شەست دینار لە دەست کرێکارەکەدا ماوەو، هەر بیست دینارێکیش پێنج دیناری زەرەر بۆ دادەندرێو، سێ جار پێنج دەکاتە پانزە، لەگەڵ شەستەکە دەکاتە حەفتاو پێنج، کەواتە: ئەگەر قازانجی کرد، لە قازانجەکە پانزە دینار دادەنێتە سەر شەستەکە، تاکو سەرمایەکە ببێتەوە حەفتاو پێنج، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی.

(وَيُصَدَّقُ الْعامِلُ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە کرێکارەکە دەکرێ (فِي قَوْلِهِ) ئەگەر بڵێ: (لَمْ أَرْبَحْ) قازانجم نەکردوە (أَوْ) یان بڵێ (لَمْ أَرْبَحْ إِلاَّ كَذَا) تەنها ئەوەندەم قازانج کردوە (أَوْ) یان بڵێ: (اِشْتَرَيْتُ هَذَا لِلْقِراضِ) ئەوەم بۆ قازانجی هاوبەشی کڕیوە (أَوْ لِي) یان بڵێ: بۆ خۆم کڕیومە (أَوْ) یان بڵێتە خاوەنەکە: (لَمْ تَنْهَنِي عَنْ شِراءِ كَذَا) لە کڕینی ئەو شتە قەدەغەت نەکردومو نەتگوت مەیکڕە.

(وَ) هەروەها بە سوێندخواردن باوەڕ بە کرێکارەکە دەکرێ (فِي قَدْرِ رَأْسِ الْمالِ) لە ئەندازەی سەرمایەکەو، هەم (وَدَعْوَى التَّلَفِ) لە داوای فەوتانی ماڵەکەدا، چونکە کرێکارەکە ئەمیندارە، کەوابو: نابێتە زامینی ماڵە فەوتاوەکەش، بەڵام ئەگەر دوژمنکاری، یان کەمتەرخەمی کردبێ: ئەو کاتە دەبێتە زامین، بەو جۆرەی لە (اَلْوَدِيعَةِ)دا ڕوون دەکرێتەوە (وَكَذَا) هەروەها بە سوێندخواردن باوەڕی پێ دەکرێ (دَعْوَى الرَّدِّ) ئەگەر بڵێ: ماڵەکەم بۆ خاوەنەکەی گەڕاندۆتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوِ اخْتَلَفا فِي الْمَشْرُوطِ لَهُ) ئەگەر خاوەنەکەو کرێکارەکە بووە کێشەیان: لە بارەی ئەندازەی ئەو بەشە قازانجەی بە مەرج بۆی داندراوە (تَحالَفا) هەردووکیان سوێند بۆ یەکتری دەخۆن-وەك لە کێشەی کڕیارو فرۆشیاردا ڕابرا- ئینجا (وَلَهُ أُجْرَةُ الْمِثْلِ)

## (كتابُ الْمُساقاة)

تَصِحُّ مِنْ جائِزِ التَّصرُّف، وَلِصَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ بِالْوِلايَةِ، وَمَوْرِدُها اَلنَّخْلُ وَالْعِنَبُ، وَجَوَّزَها الْقَدِيمُ فِي سائِرِ الأَشْجارِ الْمُثْمِرَةِ،

---

کرێکارەکە کرێی وێنەی کارەکەیخۆی دەدرێتێ: جا زۆر بێ، یان کەم بێ، کەواتە: قازانجەکەش گشتی بۆ خاوەن پارەکەیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر خاوەنەکەو کرێکارەکە بووە کێشەیان: خاوەنەکە گوتی: پارەکەم بە قەرز داویێ. کرێکارەکە گوتی: بە قازانجیهاویەش داومتێ. ئەوە تەماشا دەکرێ: ئەگەر کێشەکەیان پێش فەوتانی ماڵەکە بێ-واتە: ماڵەکەی بازرگانی مابو- ئەوە بە سوێندخواردن باوەڕ بە خاوەنەکە دەکرێ.

بەڵام ئەگەر کێشەکەیان لە دوای فەوتانی ماڵەکە بوو-واتە: ماڵەکە نەمابو- ئەو کاتە باوەڕ بە کرێکارەکە دەکرێ ئەگەر سوێند بخوا، چونکە کرێکارەکە ئەمیندارەو ئەگەر دوژمنکاریو کەمتەرخەمیی نەکردبێ نابێتە زامینی ماڵەفەوتاوەکە، هەروەك لە(تحفة)دا-بە پێچەوانەی(نهاية)- ڕوون کراوەتەوە.

### ﴿ كتابُ الْمُساقاة: پەڕتوکی باغەوانی ﴾

واتە: خاوەن باغەکە یەکێکیتر بە کرێ بگرێ بە بەشێکی میوەی درەختەکان، تاکو درەختەکانی بۆ ئاو بداو پەروەردەیان بکا ﴿عَنْ ابْن عمر رَضِىَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دانیشتووانی (خَيْبَر) ڕێك کەوت: کە باغەکانی ئاو بدەنو زەویەکانی دابچێنن بە نیوەی بەرهەمەکەی: لە میوە، یان لە دانەوێڵە.

(تَصِحُّ) باغەوانی دروست دەبێ (مِنْ جائِزِالتَّصَرُّفِ) لە لایەن کەسێکی وەهاوە: کە دەستکاریی لە ملكو ماڵی خۆیدا دروست بێ، واتە: خاوەنەکەو باغەوانەکە هەردووکیان بالغو عاقڵ بنو قەدەغەکراو و زۆرلێکراو نەبن (وَ) هەروەها بۆ سەرپەرشتکار دروستە: باغەوان بگرێ (لِصَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ) بۆ منداڵو شێت (بِالْوِلاَيِةِ) بە هۆی سەرپەرشتکاریەتیی لە سەر ئەوان، ئەگەر بەرژەوەندی هەبێ.

(وَمَوْرِدُها) ئەو درەختانەی مامڵەتی باغەوانییان لە سەر دەکرێ (اَلنَّخْلُ وَالْعِنَبُ) داری خورماو داری تریێیە، بەڵام (وَجوَّزَهاالْقَدِيمُ فِي سائِرِالأَشْجارِالْمُثْمِرَةِ) فەرموودەی کۆنی ئیمامی(الشافعي) دروستی کردوە: باغەوانی لە گشت درەختێکی بەردەردا بکرێ: وەك هەنجیرو سێو و...هتد، ئیمامی(النواوي)ش ئەم فەرموودەکۆنەی هەڵبژاردوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ تَصِحُّ الْمُخابَرَةُ: وَهِيَ عَمَلُ الأَرْضِ بِبَعْضِ مَايَخْرُجُ مِنْهـا وَالْبَـذْرُ مِـنَ الْعامِـلِ، وَلاَالْمُزارَعَةُ: وَهِيَ هَذه الْمُعامَلَةُ وَالْبَذْرُ مِنَ الْمالك،

---

## ﴿ باسی سەپانیی دانەویڵە: بە نیوەتۆو، بە بنەتۆو ﴾

(وَلاَ تَصِحُّ الْمُخابَرَةُ) سەپانیی دانەویڵە بـە نیوەتـۆو دروسـت نیـە (وَهـِيَ) مامڵـەتینیوەتۆو ئەمەیە: (عَمَلُ الأَرْضِ) سەپانەکە لە زەویەکەدا کار بکاو دانەویڵـەی تـێدا بچێنێ (بِبَعْضِ ما يَخْرُجُ مِنْها) بەرامبـەر وەرگرتنی بەشێك لـەو بەرهەمـەی لـە زەویەکـە دەردەچێ: وەك نیـوەیی، سـێیەك، چـوارێك...هتـد (وَالْبَـذْرُ مـِنَ الْعامـِلِ) تـۆوە چـێندراوەکەش لـە لایـەن سەپانەکەوە بێ ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: نَهَى رَسُـولُ اللهِ ﷺ عَـنِ الْمُخـابَرَةِ وَالْمُحاقَلَـةِ﴾ رواه الشـيخان، پێغەمبـەر ﷺ قەدەغـەی کـردوە: زەوی بـە نیوەتـۆو دابچـێندرێو قەدەغـەی کردوە: پەڵە گەنم بە گەنم بدرێ.

(وَلاَالْمُزارَعَةُ) هەروەها سەپانیی بە بنـەتۆویش دروسـت نیـە (وَهـِيَ) مامڵەتیبنـەتۆو (هَذه الْمُعامَلَةُ) هـەر مامڵەتەکـەیڕابردووە، بـەڵام لێـرەدا (وَالْبَـذْرُ مـِنَ الْمالك) تۆوەکـە لـە لایـەن خاوەن زەویەکـەوە بـێ ﴿عَنْ ثابِـتٍ ﷺ: نَهَـى رَسُـولُ اللهِ ﷺ عَـنِ الْمُزارَعَـةِ وَأَمَـرَ بِالْمُؤاجَرَةِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبـەر ﷺ قەدەغـەی کـردوە: زەوی بـە بنـەتۆو دابچـێندرێو فەرمانی داوە بەکرێ بدرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکـەم: لە لای چەند زانایەکی ئایینی سەپانیدانەویڵە: بـە نیوەتـۆو و بـە بنەتۆو دروستە، ئیمامی(النـواوی)ش ئـەم فەرموودەیـەی هەڵبـژاردوەو لـە (شـرح مسـلم)دا بەڵگـەی بـە حەدیسـەکەی(خَيْبَـر)یڕابـردوو هێناوەتـەوە، هـەم فەرموویـەتی: مەبەسـتی قەدەغەکردنی ئەو دوو حەدیسەیڕابردوو ئەمەیە: هەر یـەکێك-لـە سـەپانەکەو لـە خـاوەن زەویەکە- پارچەیەکی دیارکراوی بۆ دابچێندرێ، هەم لە زۆریـەی سەرچاوەکانیشـدا ئـەوها ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر بە فەرموودەی ئەو زانایە-زەویەکـە بـە نیوەتـۆو، یـان بـە بنـەتۆو داچـێندرا، نابـێ هـیچ لایـەك بەشـەکەیخۆی لـە بەرهەمەکـە ببـا، تـا زەکـاتی لێدەدرێ؟ چـونکە زەکاتوەرگرەکان -بە ئەندازەی زەکات- لەو بەرهەمـەدا هاوبەشـن، کـەوابو: هـەر یـەکێکیان -پێش زەکاتدان- بەشی خۆی ببا، ئەوە ئەندازەی زەکات نابێتە ملکی ئـەویو واجبـە: لێی وەربگیرێتەوە، ئینجـا لـە هـەموو حاڵەتێکدا زەکـات لـە سـەر خـاوەن تۆوەکـە دەژمێـردرێ، واتە: لـە بەشـەکەی وی دەڕوا، جیـاوازی نیـە خاوەنیتۆوەکە: سـەپانەکە بـێ، یـان خـاوەن زەویەکە، هـەروەك لـە (پاشکۆ)ی زەکاتیدانەویڵـەدا ڕوونمـان کردەوە، هـەم لـەم باسەشـدا زۆریەی سەرچاوەکان فەرموویانە: (**کشتوکاڵ پابەندی تۆوەکەیە**).

فَلَوْ كانَ بَيْنَ النَّخلِ بَياضٌ صَحَّتِ الْمُزارَعَةُ عَلَيْهِ مَعَ الْمُساقاةِ عَلَى النَّخلِ بِشَرْطِ اتِّحادِ الْعامِلِ وَعُسْرِ إِفْرادِ النَّخلِ بِالسَّقْيِ وَالْبَياضِ بِالْعِمارَةِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُشْتَرَطُ أَنْ لاَ يُفْصَلَ بَيْنَهُما وَأَنْ لاَ يُقَدَّمَ الْمُزارَعَةَ، وَأَنَّ كَثِيرَ الْبَياضِ كَقَلِيلِه، وَأَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ تَساوِي الْجُزْءِ الْمَشْرُوطِ مِنَ الثَّمَرِ وَالزَّرْعِ، وَأَنَّهُ لاَ يَجُوزُ أَنْ يُخابِرَ تَبَعاً لِلْمُساقاةِ، فَإِنْ أُفْرِدَتْ أَرْضٌ بِالْمُزارَعَةِ

---

سىٚيەم: ئەگەر سەپانەكە زەويەكەى بە مامڵەتىنيوەتۆو وەرگرت -واتە: تاكو بە تۆوەكەى خۆى بيكا- بەڵام بەشێكى زەويەكەى دانەچاند، يان هەر هيچى دانەچاند تا كاتى كشتوكاڵەكە بەسەر چوو، ئەوە كرێى زەويەكەى دەكەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر لەو حاڵەتەدا بە مامڵەتىبنەتۆو وەرىگرتبو -واتە: تاكو بە تۆوىخاوەنەكەى بيكا- ئەو كاتە كرێى لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانى)دا ڕوون كراوەتەوە.

چوارەم: ئەگەر سەپانەكە، يان باغەوانەكە -بە قەسدى- وازى لە ئاودان هێناو بە هۆى ئاونەدانەكە ميوەكە، يان كشتوكاڵەكە فەوتا، ئەوە دەبێتە زامينو تۆڵەى دەكەوێتە سەر، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموويانە.

(فَلَوْ كانَ بَيْنَ النَّخْلِ بَياضٌ) جا ئەگەر لە نێوان دارخورمايەكاندا پارچە زەويەكى نەچێندراو هەبو، ئەو كاتە (صَحَّتِ الْمُزارَعَةُ عَلَيْهِ) مامڵەتى بنەتۆو لە سەر ئەو زەويە دروستە (مَعَ الْمُساقاةِ عَلَى النَّخْلِ) لەگەڵ مامڵەتى باغەوانى لە سەر دارخورمايەكان (بِشَرْطِ اتِّحادِ الْعامِلِ) بەو مەرجەى باغەوانەكەو سەپانەكە يەك كەس بنو لێك جيا نەبن، هەم (وَعُسْرِ اِفْرادِ النَّخْلِ بِالسَّقْيِ) زەحمەت بێ دارخورمايەكان بە تەنها خزمەت بكرێنو ئاوبدرێنو (وَالْبَياضِ بِالْعِمارَةِ) پارچە زەويەكەش بە تەنها دابچێندرێ.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەى ڕاستتر: (أَنَّهُ يُشْتَرَطُ أَنْ لاَ يُفْصَلَ بَيْنَهُما) بە بە مەرج دادەندرێ: مامڵەتى باغەوانىو سەپانى يەك مامڵەت بنو لێك نەكرێتەوەو هەم (وَأَنْ لاَ يُقَدِّمَ الْمُزارَعَةَ) مامڵەتى سەپانيەكە پێش باغەوانيەكە نەكوترێ.

(وَ) هەر بە فەرموودەى ڕاستتر: (أَنَّ كَثِيرَ الْبَياضِ كَقَلِيلِه) بۆ دروستبوونى ئەو دوو مامڵەتە زەوىى زۆر وەكو كەم وايە، هەم (وَأَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ تَساوِي الْجُزْءِ الْمَشْرُوطِ) بە مەرج دانانرێ ئەو بەشانەى بۆ سەپانەكە بە مەرج داندراون يەكسان بن (مِنَ الثَّمَرِ وَالزَّرْعِ) لە ميوەكەو لە كشتوكاڵەكە، بەڵكو دروستە: يەكێكيان نيوە بێو ئەوىتريان چوارێك بێ (وَ) هەر بە فەرموودەى ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ أَنْ يُخابِرَ تَبَعاً لِلْمُساقاةِ) دروست نيە: مامڵەتى نيوەتۆو لەگەڵ خاوەنەكە بكا، بە پابەندى باغەوانيەكە، بەڵام بە فەرموودەى بێهێز ئەوەشيان هەر دروستە.

ئينجا ئەگەر بەو فەرموودەيە ڕەفتار بكەين: كە سەپانى بە بنەتۆو و بە نيوەتۆو دروست نيە، تەماشا دەكرێ: (فَإِنْ أُفْرِدَتْ أَرْضٌ بِالْمُزارَعَةِ) ئەگەر زەويەك بە مامڵەتى بنەتۆو

فَالْمَغَلُّ لِلْمالك وَعَلَيْه لِلْعامِلِ أُجْرَةُ عَمَله وَدَوابِّه وَآلاته، وَطَرِيقُ جَعْلِ الْغَلَّة لَهُما وَلاَ أُجْـرَةَ: أَنْ يَسْتَأْجِرَهُ بِنِصْف الْبَذْر لِيَزْرَعَ لَهُ النِّصْفَ الآخَـرَ وَيُعِـيرَهُ نِصْـفَ الأَرْضِ، أَوْ يَسْـتَأْجِرَهُ بِنِصْف الْبَذْرِ وَنِصْف مَنْفَعَة الأَرْضِ لِيَزْرَعَ لَهُ النِّصْفَ الآخَرَ فِي النِّصْفِ الآخَرِ مِنَ الأَرْضِ.

(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ تَخْصِيصُ الثَّمَرِ بِهِما،

---

داچێندرا –واته: به تۆوی خاوەن زەویەکە– ئەو کاتە (فَالْمَغَلُّ لِلْمالك) بەروبومەکە گشتی بۆ خاوەن زەویەکەیە، چونکە بەرهەمی ملکیخۆیەتی، بەڵام (وَعَلَيْه لِلْعامِلِ أُجْرَةُ عَمَله) لە سەر خاوەن زەویەکەش واجبە: کرێی کرداری سەپانەکە بدا، هەم (وَدَوابِّه) کرێی ئاژەڵەکانیشی بدا، هەم (وَآلاته) کرێی کەرستەی وەدەستهێنانی بەرهەمەکەشی بدا: وەك ئامێری کێڵان‌و شتەکانیتر، جا جیاوازی نیە: کشتوکاڵەکە سەلامەت ببێ، یان لەناو بچێ، هەر واجبە: ئەو کرێیانە بداتە سەپانەکە.

بەڵام ئەگەر–هەر بەو فەرموودەیە– زەویەکە بە نیوەتۆو داچێندرا–واتە: بە تۆوی سەپانەکە– ئەو کاتە بەروبومەکە گشتی بۆ سەپانەکەیە، چونکە کشتوکاڵەکە پابەندی تۆوەکەیە، کەوابێ: لە سەر سەپانەکە واجبە: کرێی وێنەی زەویەکە بداتە خاوەنی زەویەکە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، جا لە بەر ئەوەی کشتوکاڵ پابەندی تۆوەکەیەتی لە هەردوو مامڵەتی بنەتۆو و نیوەتۆودا زەکاتیش لە سەر خاوەن تۆوەکەیە، هەروەك لە پێش ئێرەدا ڕوونمان کردەوە.

(وَطَرِيقُ جَعْلِ الْغَلَّة لَهُما) جا–هەر بەو فەرموودەیە– ڕێگای شەرع بۆ ئەوەی بەروبومەکە بۆ هەردووکیان بێ‌و (وَلاَ أُجْرَةَ) هیچ لایەکیش کرێی ئەویتر نەدا، ئەمەیە (أَنْ يَسْتَأْجِرَهُ بِنِصْفِ الْبَذْرِ) خاوەن زەویەکە سەپانەکە بە کرێ بگرێ بە نیوەیتۆوی خۆی (لِيَزْرَعَ لَهُ النِّصْفَ الآخَرَ) تاکو نیوەکەیتریتۆوەکەی بۆ دابچێنێ‌و ( وَيُعِيرَهُ نِصْفَ الأَرْضِ) نیوەی زەویەکەشی بە خواستن بداتە سەپانەکە، تاکو ئەویش نیوەکەیخۆی تێدا بچێنێ بە بەریلاوی (أَوْ يَسْتَأْجِرَهُ) یان خاوەنەکە سەپانەکە بەکرێ بگرێ (بِنِصْفِ الْبَذْرِ وَنِصْفِ مَنْفَعَةِالأَرْضِ) بە نیوەی تۆوەکەو بە نیوەی سودیزەویەکە (لِيَزْرَعَ لَهُ النِّصْفَ الآخَرَ) تاکو نیوەکەیتری تۆوەکەی بۆ دابچێنێ (فِي النِّصْفِ الآخَرِ مِنَ الأَرْضِ) لە نیوەیتری زەویەکەدا بە بەریلاوی، یان نیوەیتۆوەکەی بە قەرز بداتێ‌و نیوەیزەویەکەشی بەکرێ بداتێ بە بەریلاوی.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی باغەوانی ﴾**

(يُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (تَخْصِيصُ الثَّمَرِ بِهِما) میوەی درەختەکان تایبەت بە خاوەنەکەو بە باغەوانەکە بێ، واتە: دروست نیە: بەشێکی بۆ کەسێکیتر دابندرێ

وَاشْتِراكُهُما فيهِ وَالْعِلْمُ بِالنَّصيبَيْنِ بِالْجُزْئِيَّةِ كَالْقِراضِ، وَالأَظْهَرُ صِحَّةُ الْمُساقاةِ بَعْدَ ظُهُـورِ الثَّمَرِ لَكِنْ قَبْلَ بُدُوِّ الصَّلاحِ، وَلَوْ ساقاهُ عَلَى وَدِيٍّ لِيَغْرِسَهُ وَيَكُونَ الشَّجَرُ لَهُما لَمْ يَجُزْ،

---

(وَاشْتِراكُهُما فيهِ) هەم مەرجە هەردووكيان لە ميوەكەدا هاوبەش بن، نەك تەنها بۆ يەكێكيان بێ (وَالْعِلْمُ بِالنَّصيبَيْنِ بِالْجُزْئِيَّةِ) هەم مەرجە هەردووكيان بزانن بەشيان لە ميوەكە چەندە: وەك نيوە، چوارێك...هتد، ئەوانە گشتى (كَالْقِراضِ) وەك لە مامڵەتى قازانجى هاوبەشىدا ڕابرا.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەى بەهێزتر: (صِحَّةُ الْمُساقاةِ بَعْدَ ظُهُورِ الثَّمَرِ) مامڵەتى باغەوانى -هەروەك پێش دەركەوتنى ميوەى درەختەكان دروست دەبێ- دواى دەركەوتنى ميوەكەش دروست دەبێ (لَكِنْ قَبْلَ بُدُوِّ الصَّلاحِ) بەڵام بەو مەرجەى مامڵەتەكە پێش ئاشكرابوونى پێگەيشتنى ميوەكە بێ، واتە: لە دواى ئاشكرابوونى پێگەيشتنى ميوەكە بە هيچ جۆرێك دروست نابێ.

ئينجا بزانە: ئەگەر پێش دەركەوتنى ميوەكە مامڵەتەكە بەسترا، ئەوە باغەوانەكە دەبێتە خاوەنى بەشە ميوەكەى خۆى بە دەركەوتنى ميوەكە، بەڵام ئەگەر لە دواى دەركەوتنى ميوەكە مامڵەتەكە بەسترا، ئەوە هەر ئەو دەم دەبێتە خاوەنى بەشەكەى خۆى، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) دا فەرموويانە.

## ﴿ مامڵەتى نيوە باغى ﴾

(وَلَوْ ساقاهُ) ئەگەر خاوەن زەويەكە لەگەڵ باغەوانەكە پێك هات (عَلَى وَدِيٍّ لِيَغْرِسَهُ) لە سەر هەندێك نەمامى دارخورما -واتە: يان نەمامى هەر درەختێكيتر- تاكو لە زەويەكەيدا بيچێنێ و (وَيَكُونَ الشَّجَرُ لَهُما) درەختەكە، يان ميوەى درەختەكە بۆ هەردووكيان بێ (لَمْ يَجُزْ) ئەو مامڵەتە دروست نيە، چونكە هيچ حەديسێك لەبارەى ئەو نيوە باغىيە نەهاتوە، كەوابو: ئەگەر نەمامەكانيش ملكى خاوەن زەويەكە بن، ئەوە درەختەكانيش گشتى بۆ خۆيەتى و باغەوانەكە هيچ بەشێكى لە درەختەكاندا نيە، بەڵام لە سەر خاوەنەكەيان واجبە: كرێى كردارى باغەوانەكەو كرێى كەرستەكانيشى بدا.

بەڵام ئەگەر نەمامەكان ملكى باغەوانەكە بن، ئەوە درەختەكانيش گشتى بۆ باغەوانەكە دەبن و خاوەن زەويەكە هيچ بەشى لە درەختەكاندا نابێ، بەڵكو واجبە: باغەوانەكە كرێى وێنەى زەويەكە بداتە خاوەنەكەى، كەواتە: خاوەن زەويەكە سەرپشكە: لە نێوان هێشتنەوەى درەختەكان و كرێى زەويەكەشى وەربگرێ، يان درەختەكان بە نرخىخۆيان لە باغەوانەكە بكڕێ، يان هەڵيانبكەنێ و تۆڵەى ناتەواوييان بدا: بە گوێرەى ئەو ڕوونكردنەوەى لە كۆتايى (عارية)دا ڕابرلو، هەم لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَلَوْ كانَ مَغْرُوساً وَشَرَطَ لَهُ جُزْءاً مِنَ الثَّمَرِ عَلَىالْعَمَلِ فَإِنْ قَدَّرَ لَهُ مُدَّةً يُثْمِرُ فِيها غالِباً صَحَّ، وَإلاَّ فَلاَ، وَقِيلَ إنْ تَعارَضَ الإِحْتِمالاَنِ صَحَّ، وَلَهُ مُساقاةُ شَرِيكِه فِيالشَّجَرِ إذَا شَرَطَ لَهُ زِيادَةً عَلَىحِصَّتِه، وَيُشْتَرَطُ أنْ لاَيَشْرِطَ عَلَىالعامِلِ مَالَيْسَ مِنْ جِنْسِ أعْمالِها، وَأنْ يَنْفَرِدَ بِالْعَمَلِ وَبِالْيَدِ فِيالْحَدِيقَةِ، وَمَعْرِفَةُالْعَمَلِ بِتَقْدِيرِالْمُدَّةِ كَسَنَةٍ أوْ أكْثَرَ، وَلاَ يَجُوزُ التَّوْقِيتُ بِإدْراكِ الثَّمَرِ فِيالأَصَحِّ، وَصِيغَتُها: ساقَيْتُكَ عَلَى هَذَاالنَّخْلِ بِكَذَا أوْ سَلَّمْتُهُ إلَيْكَ لِتَتَعَهَّدَهُ،

---

(وَلَوْ كانَ مَغْرُوساً) ئەگەر ئەمامەكان چێندراو بون‌و (وَشَرَطَ لَهُ جُزْءاً مِنَ الثَّمَرِ) خاوەنەكە بۆ باغەوانەكەی بە مەرج دانا: بەشێكیمیوەكەیانی بداتێ (عَلَىالْعَمَلِ) لە بەرامبەر كاركردنی، ئەوە تەماشا دەكەین: (فَإِنْ قَدَّرَ لَهُ مُدَّةً) ئەگەر ماوەیەكی وەهای بۆ مامڵەتەكە دانا: كە (يُثْمِرُ فِيها غالِباً) ئەو ئەمامانە لەو ماوەیەدا بە ئەغڵەبی بەریان دەدا، واتە: میوەیان دەگرت، ئەوە (صَحَّ) مامڵەتەكە دروست دەبێ (وَإلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا بەریان نەدەدا، مامڵەتەكە دروست نابێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إنْ تَعارَضَ الإِحْتِمالاَنِ) ئەگەر ئیحتیمالی بەردان‌و بەرنەدان هەردووكی بەرامبەر یەك وەستان، ئەو كاتە (صَحَّ) مامڵەتەكە دروست دەبێ.

ئینجا هەروەك مامڵەتی باغەوانی لەگەڵ بێگانەدا دروستە (وَلَهُ مُساقاةُ شَرِيكِه فِيالشَّجَرِ) ئەوەاش بۆی دروستە: لەگەڵ هاوبەشەكەشی لە درەختەكاندا مامڵەتی باغەوانی بكا (إذَا شَرَطَ لَهُ زِيادَةً عَلَىحِصَّتِه) بەو مەرجەی بەشێكی زیاد لە بەشەكەی خۆی بۆی دیاری بكا، بۆ وێنە: ئەگەر باغەكە لە نێوانیاندا بە نیوەیی بوو، ئەو دوو بەشی میوەكەی بداتێ.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی باغەوانی بە مەرج دادەندرێ (أنْ لاَ يَشْرِطَ عَلَىالعامِلِ ما لَيْسَ مِنْ جِنْسِ أعْمالِها) ئەو جۆرە كارانە لە سەر باغەوانەكە بە مەرج نەگرێ كە لە كردارەكانی باغەوانی نین: وەك بیر هەڵكەندن (وَ) هەروەها مەرجە (أنْ يَنْفَرِدَ بِالْعَمَلِ وَبِالْيَدِ فِيالْحَدِيقَةِ) باغەوانەكە سەربەخۆ بێ لە كاركردن، هەم باغەكەش لە ژێر دەستی ئەودابێ.

(وَ) هەروەها مەرجە (مَعْرِفَةُ الْعَمَلِ) ماوەی كاركردنەكە بزاندرێ (بِتَقْدِيرِالْمُدَّةِ) بە دیاریكردنی ئەندازەی ماوەكە (كَسَنَةٍ أوْ أكْثَرَ) وەك ماوەی ساڵێك، یان زیاتر، واتە: ماوەیەكی وەها دابندرێ: كە میوەكەی تێدا دەربكەوێ‌و پێویستی بە كاركردن نەمێنێ، بەڵام (وَلاَ يَجُوزُ التَّوْقِيتُ بِإدْراكِ الثَّمَرِ) دروست نیە: ماوەكە دابندرێ: بە پێگەیشتنی میوەكە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونكە كاتی پێگەیشتنی دیار نیە.

(وَصِيغَتُها) گوتەی مامڵەتی باغەوانی، وەك بڵێ: (ساقَيْتُكَ عَلَى هَذَا النَّخْلِ بِكَذَا) مامڵەتی باغەوانیم لەگەڵ تۆ بەست بەوەندە میوەیە: نیوە، چوارێك...(أوْ) یان بڵێ: (سَلَّمْتُهُ إلَيْكَ لِتَتَعَهَّدَهُ) باغەكەمم تەسلیمی تۆ كرد، تاكو پەروەردەی بكەی بەوەندە میوەیە.

وَيُشْتَرَطُ الْقَبُولُ دُونَ تَفْصِيلِ الأَعْمالِ، وَيُحْمَلُ الْمُطْلَقُ فِي كُلِّ ناحِيَةٍ عَلَى الْعُرْفِ الْغالِبِ، وَعَلَى الْعامِلِ مَايُحْتاجُ إِلَيْهِ لِصَلاحِ الثَّمَرِ وَاسْتِزادَتِهِ مِمَّا يَتَكَرَّرُ كُلَّ سَنَةٍ: كَسَقْيٍ وَتَنْقِيَةِ نَهْرٍ وَإِصْلاحِ الأَجاجِينِ الَّتِي يَثْبُتُ فِيهاالْماءُ، وَتَلْقِيحٍ، وَتَنْحِيَةِ حَشِيشٍ وَقُضْبانٍ مُضِرَّةٍ، وَتَعْرِيشٍ جَرَتْ بِهِ عادَةٌ، وَكَذا حِفْظُ الثَّمَرِ وَجَذاذُهُ وَتَجْفِيفُهُ فِي الأَصَحِّ، وَما قُصِدَ بِهِ حِفْظُ الأَصْلِ وَلاَ يَتَكَرَّرُ كُلَّ سَنَةٍ: كَبِناءِ الْحِيطانِ وَحَفْرِ نَهْرٍجَدِيدٍ فَعَلَى الْمالِكِ، وَالْمُساقاةُ لاَزِمَةٌ، فَلَوْ هَرَبَ الْعامِلُ قَبْلَ الْفَراغِ وَأَتَمَّهُ الْمالِكُ مُتَبَرِّعاً بَقِيَ اسْتِحْقاقُ الْعامِلِ،

---

(وَيُشْتَرَطُ الْقَبُولُ) بە مەرج دادەنـدرێ: باغەوانەکەش بڵـێ: قبوڵم کرد (دُونَ تَفْصِيلِ الأَعْمالِ) بەڵام مەرج نیە بە درێژی باسی کارەکانی باغەوانی بکرێ، چونکە (وَيُحْمَلُ الْمُطْلَقُ فِي كُلِّ ناحِيَةٍ عَلَى الْعُرْفِ الْغالِبِ) لە گشت شوێنێکدا ئەو باغەوانییەی باسی کارەکانی نەکراوە، دێتە سەر عادەتە زۆرەکەی شوێنەکەو ڕەفتاری پێ دەکرێ.

(وَعَلَى الْعامِلِ) لە سەر باغەوانەکە واجبە: (مَايُحْتاجُ إِلَيْهِ) ئەو کارانە بکا: کە پێویستن (لِصَلاحِ الثَّمَرِ وَاسْتِزادَتِهِ) بۆ چاکیی‌میوەکەو زیادبوونیی (مِمَّا يَتَكَرَّرُ كُلَّ سَنَةٍ) لەو جۆرانەی گشت ساڵێك دووبارە دەبنەوە (كَسَقْيٍ) وەك ئاودانو (وَتَنْقِيَةِ نَهْرٍ) خاوێن کردنەوەی جۆگە: لە خڵتو قوڕو (وَإِصْلاحِ الأَجاجِينِ الَّتِي يَثْبُتُ فِيهاالْماءُ) هەم چاککردنی ئەو قۆرتانەی لە دەورەی‌درەختەکەنەو ئاویان تێ‌دەکرێ تاکو درەختەکە بیخواتەوەو (وَتَلْقِيحٍ) هەم تۆوی نێرەی دارخورما بنێتە ناو مێیەکەیو (وَتَنْحِيَةِ حَشِيشٍ) هەم پوشو گیای زیانبەخش لاببەو (وَقُضْبانٍ مُضِرَّةٍ) هەم لقەدارەکانی زیانبەخش لاببەو (وَتَعْرِيشٍ جَرَتْ بِهِ عادَةٌ) هەم کەپر بۆ دارمیوەکان بکا بە گوێرەی عادەتی شوێنەکە (وَكَذا حِفْظُ الثَّمَرِ) هەروەها میوەکەش بپارێزێو (وَجَذاذُهُ) میوەکەش لە درەختەکان بکاتەوەو (وَتَجْفِيفُهُ) ووشکی بکاتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام (وَما قُصِدَ بِهِ حِفْظُ الأَصْلِ)ئەو کارەش کە بۆ پاراستنی‌درەختەکان مەبەستەو (وَلاَ يَتَكَرَّرُ كُلَّ سَنَةٍ) گشت ساڵێکیش دووبارە نابێتەوە (كَبِناءِ الْحِيطانِ) وەك پەرژینو دیوار دروستکردنو (وَحَفْرِ نَهْرٍجَدِيدٍ) هەڵکەندنی جۆگەیەکی‌نوێ، هەم چاککردنەوەی جۆگەی ڕماو، هەم کێڵانی‌زەویەکە، ئەوانە (فَعَلَى الْمالِكِ) گشتی لە سەر خاوەن درەختەکەیە.

(وَالْمُساقاةُ لاَزِمَةٌ) باغەوانی ماملەتێکی چەسپاوە، کەواتە: واجبە: باغەوانەکە ماوەی کارەکانی‌خۆی تەواو بکا، هەرچەند میوەکەش گشتی لەناو چوبێو هیچی دەست نەکەوێ (فَلَوْ هَرَبَ الْعامِلُ قَبْلَ الْفَراغِ) جا ئەگەر باغەوانەکە —پێش ئەوەی کارەکەی تەواو بکا— هەڵاتو گوتی: هیچی‌تر کار ناکەم، یان نەخۆش بوو، یان بەند کرا (وَأَتَمَّهُ الْمالِكُ مُتَبَرِّعاً) بەڵام خاوەن باغەکە، یان بێگانەیەك بە خۆڕایی کارەکانی تەواو کردن، ئەوە (بَقِيَ اسْتِحْقاقُ الْعامِلِ) مافی باغەوانەکە —لەو بەشەی دیارکراوە— هەر دەمێنێ.

وَإِلاَّ اسْتَأْجَرَ الْحاكِمُ عَلَيْهِ مَنْ يُتِمُّهُ، فَإِنْ لَمْ يَقْدِرْ عَلَى الْحاكِمِ فَلْيُشْهِدْ عَلَى الإِنْفاقِ إِنْ أَرادَ الرُّجُوعَ، وَلَوْ ماتَ وَخَلَّفَ تَرِكَةً أَتَمَّ الْوارِثُ الْعَمَلَ مِنْها، وَلَهُ أَنْ يُتِمَّ الْعَمَلَ بِنَفْسِهِ أَوْ بِمالِهِ، وَلَوْ ثَبَتَتْ خِيانَةُ عامِلٍ ضُمَّ إِلَيْهِ مُشْرِفٌ، فَإِنْ لَمْ يَتَحَفَّظْ بِهِ اُسْتُؤْجِرَ مِنْ مالِ الْعامِلِ، وَلَوْ خَرَجَ الثَّمَرُ مُسْتَحَقًّا فَلِلْعامِلِ عَلَى الْمُساقِي أُجْرَةُ الْمِثْلِ.

## (كِتابُ الْإِجارَةِ)

---

(وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر هیچ کەسێك بە خۆڕایی کارەکەی نەدەکرد، ئەو کاتە (اسْتَأْجَرَ الْحاكِمُ عَلَيْهِ مَنْ يُتِمُّهُ) دادوەر لە سەر حیسابی باغەوانەکە، کەسێکی وەها بە کرێ دەگرێ: کە کارەکەی بۆ تەواو بکا (فَإِنْ لَمْ يَقْدِرْ عَلَى الْحاكِمِ) جا ئەگەر خاوەنەکە توانای نەبو لە ڕێگای دادوەرەوە بە کرێی بگرێ؟ چونکە دادوەر لەوێدا نەبو، یان بۆی نەدەکرد، ئەو کاتە (فَلْيُشْهِدْ) با خاوەنەکە شاهید بگرێ (عَلَى الإِنْفاقِ) لە سەر ئەو مەسرەفەی لە بەکرێگرتن دەیکا، یان لە سەر ئەو کارەی بەخۆی بە کرێ دەیکا لە سەر حیسابی باغەوانەکە (إِنْ أَرادَ الرُّجُوعَ) ئەگەر بیەوێ کرێیەکە لە باغەوانەکە وەربگرێتەوە.

(وَلَوْ ماتَ) ئەگەر باغەوانەکە مرد پێش ئەوەی کارەکەی تەواو بکاو (وَخَلَّفَ تَرِكَةً) میراتیشی لە پاش خۆی بەجێ هێشت، ئەو کاتە (أَتَمَّ الْوارِثُ الْعَمَلَ مِنْها) میراتگرەکەی بەو میراتە یەکێك بەکرێ دەگرێو کارەکەی تەواو دەکا، بەلام (وَلَهُ أَنْ يُتِمَّ الْعَمَلَ بِنَفْسِهِ أَوْ بِمالِهِ) بۆ میراتگرەکە دروستە: بەخۆی، یان بە ماڵیخۆی کارەکە تەواو بکا.

(وَلَوْ ثَبَتَتْ خِيانَةُ عامِلٍ) ئەگەر ئاشکرا بوو: باغەوانەکە خیانەتی کردوە (ضُمَّ إِلَيْهِ مُشْرِفٌ) لە سەر ئەرکیخۆی چاودێرێکی وەگەڵ دیخرێ (فَإِنْ لَمْ يَتَحَفَّظْ بِهِ) جا ئەگەر بەو چاودێرەش خۆی لە خیانەت نەپاراست، ئەو کاتە (اُسْتُؤْجِرَ مِنْ مالِ الْعامِلِ) بە ماڵی باغەوانەکە کرێکارێك بە کرێ دەگیرێ تاکو کارەکەی وی تەواو بکا.

(وَلَوْ خَرَجَ الثَّمَرُ مُسْتَحَقًّا) ئەگەر میوەیباغەکە بە ماڵی کەسێکیتر دەرچوو، ئەو کاتە (فَلِلْعامِلِ عَلَى الْمُساقِي أُجْرَةُ الْمِثْلِ) باغەوانەکە مافی کرێی هاوێنەی لە سەر ئەو کەسە هەیە: کە مامڵەتی باغەوانیی لەگەڵ کردوە.

### ﴿ كِتابُ الإِجارَةِ: پەرتوکی بەکرێدانو بەکرێگرتن ﴾

واتە: سودێك بکرێتە ملکیکەسێك لە بەرامبەر وەرگرتنی شتێك بەو مەرجانەی لەم باسەدا گوتراون. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر ئافرەتەکان منداڵیان بۆ ئێوە شیردان، ئێوەش کرێیەکەیان بدەنێ. ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اسْتَأْجَرَ دَلِيلاً فِي الْهِجْرَةِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ -کە کۆچی کرد بۆ مەدینە- پیاوێکی شارەزای بە کرێ گرت تاکو لە ڕێگە شارەزایان بکا.

شَرْطُهُما: كَبائِعٍ وَمُشْتَرٍ، وَالصِّيغَةُ: آجَرْتُكَ هَذَا أَوْ أَكْرَيْتُكَ أَوْ مَلَّكْتُكَ مَنافِعَهُ سَنَةً بِكَذَا، فَيَقُولُ: قَبِلْتُ أَوْ اسْتَأْجَرْتُ أَوْ اكْتَرَيْتُ، وَالأَصَحُّ انْعِقادُها بِقَوْلِه: آجَرْتُكَ مَنْفَعَتَها، وَمَنْعُها بِقَوْلِه: بِعْتُكَ مَنْفَعَتَها، وَهِيَ قِسْمانِ: وَارِدَةٌ عَلَى عَيْنٍ كَإِجارَةِ الْعَقارِ وَدابَّةٍ أَوْ شَخْصٍ مُعَيَّنَيْنِ، وَعَلَى الذِّمَّةِ كَاسْتِئْجارِ دابَّةٍ مَوْصُوفَةٍ، وَبِأَنْ يُلْزِمَ ذِمَّتَهُ خِياطَةً أَوْ بِناءً،

---

ئینجا بزانە: مامڵەتی بەکرێدان لەم ڕوکنانە پێك دێ: (اَلْمُؤَجِّر): بەکرێدەر. (اَلْمُسْتَأْجِر): بەکرێگر. (اَلأُجْرَة): کرێ. (اَلْمَنْفَعَة): سودە بەکرێدراوەکە. (اَلصِّيغَة): گوتەی بەکرێدانو بەکرێگرتن.

(شَرْطُهُما) مەرجی بەکرێدەرو بەکرێگر (كَبائِعٍ وَمُشْتَرٍ) وەك فرۆشیارو کڕیارە، واتە: هەردوو لا بالغو عاقڵ بنو قەدەغەکراو و زۆرلێکراو نەبن بە ناهەق.

ئینجا بزانە: بۆ سەرپەرشتکار دروستە: منداڵو شێتو هەم ماڵەکەشیان بە کرێ بدا، هەروەك لە باسی هەڵوەشاندنەوەی بەکرێداندا دێ، هەروەها دروستە: موسوڵمان خۆی بکاتە کرێگرتەی کافر، بەڵام حەرامە: بەخۆی خزمەتی کافرەکە بکا، هەروەك لە (القليوبي)دا فەرموویەتی، کەوابو: ئەگەر بەخۆی خزمەتی کرد، مافی کرێیەکەی هەیە، هەروەك لە (الشبراملسي)دا فەرموویەتی.

(وَالصِّيغَةُ) گوتەی بەکرێدانو بەکرێگرتن: وەك بڵێ: (آجَرْتُكَ هَذا أَوْ أَكْرَيْتُكَ) ئەم شتەم بە کرێ دایە تۆ (أَوْ) یان بڵێ: (مَلَّكْتُكَ مَنافِعَهُ سَنَةً بِكَذَا) سودەکانی ئەم شتەم کردە ملکی تۆ بۆ ماوەی ساڵێك بەوەندە پارەیە (فَيَقُولُ) بەکرێگرەکەش بڵێ: (قَبِلْتُ) قبوڵم کرد (أَوِ اسْتَأْجَرْتُ أَوِ اكْتَرَيْتُ) یان بڵێ: بە کرێم گرت.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (انْعِقادُها بِقَوْلِه:) بەکرێدان دادەمەزرێ کە بڵێ: (آجَرْتُكَ مَنْفَعَتَها) سودی ئەم شتەم بەکرێ دایە تۆ (وَمَنْعُها بِقَوْلِه:) بەڵام دانامەزرێ ئەگەر بڵێ: (بِعْتُكَ مَنْفَعَتَها) سودی ئەم شتەم فرۆشتە تۆ. چونکە فرۆشتن بۆ سودەکان بە کار نایێ، بەڵکو بۆ خودی سوددەرەکان بە کار دێ.

(وَهِيَ قِسْمانِ) بەکرێدانو بەکرێگرتن دوو بەشە، یەکەم: (وَارِدَةٌ عَلَى عَيْنٍ) بەکرێدانەکە دێتە سەر خودی شتێك: (كَإِجارَةِ الْعَقارِ) وەك بەکرێدانی زەمینو خانوو، هەم (وَدابَّةٍ) وەك بەکرێدانی وولاغ (أَوْ شَخْصٍ) یان ئادەمیزادێك: کە (مُعَيَّنَيْنِ) وولاغەکەو مرۆڤەکە هەردووکیان دیارکراو بن.

دووەم: (وَعَلَى الذِّمَّةِ) بەکرێدانەکە دێتە سەر ئەستۆی کەسێك: (كَاسْتِئْجارِ دابَّةٍ مَوْصُوفَةٍ) وەك وولاغێکی ناونیشان دراو-کە دیار نەبێ- لە کەسەکە بە کرێ بگرێ (وَ) هەروەها (بِأَنْ يُلْزِمَ ذِمَّتَهُ خِياطَةً أَوْ بِناءً) وەك بخاتە ئەستۆیکەسەکە: دوورینی جلێك، یان

وَلَوْ قالَ: اسْتَأْجَرْتُكَ لِتَعْمَلَ كَذَا فَإجارَةُ عَيْنٍ، وَقِيلَ ذِمَّةٌ، وَيُشْتَرَطُ فِي إجارَةِ الذِّمَّةِ تَسْلِيمُ الأُجْرَةِ فِي الْمَجلِسِ، وَإجارَةُ الْعَيْنِ لاَ يُشْتَرَطُ ذَلِكَ فِيها، وَيَجُوزُ فِيها التَّعْجِيلُ وَالتَّأْجِيلُ إنْ كانَتْ فِي الذِّمَّةِ، وَإذا أُطْلِقَتْ تَعَجَّلَتْ، وَإنْ كانَتْ مُعَيَّنَةً مُلِكَتْ فِي الْحالِ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُ الأُجْرَةِ مَعْلُومَةً فَلا تَصِحُّ بِالْعِمارَةِ وَالْعَلَفِ،

---

دروستکردنی خانوویێك (وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی (اسْتَأْجَرْتُكَ لِتَعْمَلَ كَذَا) تۆم بەکرێ گرت تاکو ئەو کارەم بۆ بکەی (فَإجارَةُ عَيْنٍ) ئەوە بەکرێگرتنی خودی بەکرێگیراوەکەیەو واجبە: بەخۆی کارەکە بکا (وَقِيلَ ذِمَّةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بەکرێگرتنی لە ئەستۆیە، واتە: مەرج نیە بەخۆی کارەکە بکا.

(وَيُشْتَرَطُ فِي إجارَةِ الذِّمَّةِ) بە مەرج دادەندرێ لە بەکرێگرتنی لە ئەستۆدا (تَسْلِيمُ الأُجْرَةِ فِي الْمَجْلِسِ) لە دانیشگەی مامڵەتەکەدا کرێیەکە تەسلیم بکرێ، کەواتە: ئەگەر گوتی خستمە ئەستۆی تۆ خانوویێکی نوو ژووریم بۆ دروست بکەی، یان کراسێکم بۆ بدورری، ئەوە واجبە: هەر لەم دانیشگەیەدا کرێیەکە تەسلیم بکا.

بەڵام (وَإجارَةُ الْعَيْنِ لاَيُشْتَرَطُ ذَلِكَ فِيها) لە بەکرێگرتنی خودیشتێکدا مەرج نیە: کرێیەکە —لە دانیشگەدا— تەسلیم بکرێ، کەوابو: (وَيَجُوزُ فِيها) لە بەکرێگرتنی خودی شتەکەدا دروستە: (اَلتَّعْجِيلُ) زوو کرێیەکە بداو، هەم (وَالتَّأْجِيلُ) لەمەودواش بیدا (إنْ كانَتْ فِي الذِّمَّةِ) ئەگەر کرێیەکە قەرز بێ لە ئەستۆی بەکرێگرەکەدا، بەڵام (وَإذا أُطْلِقَتْ) هەر کاتێك لە مامڵەتەکەدا باسی حازرو قەرزی کرێیەکە نەکرا، ئەو کاتە (تَعَجَّلَتْ) کرێیەکە دەبێتە حازرو واجبە: ئێستا بیدا.

ئینجا (وَإنْ كانَتْ مُعَيَّنَةً) ئەگەر کرێیەکە شتێکی دیارکراو بوو: وەك ئەم خانووەی لێ بە کرێ بگرێ بەم گەنمە، یان قەرز بوو، ئەوە (مُلِكَتْ فِي الْحالِ) بە بەستنیمامڵەتەکە دەمودەست کرێیەکە دەبێتە ملکی بەکرێدەرەکە، هەروەك سودی خودی بەکرێگیراوەکەش دەبێتە ملکی بەکرێگرەکەو، لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی بەکرێدان بەمەرج دادەندرێ (كَوْنُ الأُجْرَةِ مَعْلُومَةً) کرێیەکە زاندراو بێ: لە ڕووی ڕەگەزو ئەندازەیەوە، کەوابو: (فَلاَ تَصِحُّ بِالْعِمارَةِ) دروست نیە خانوو بە کرێ بدرێو کرێیەکەشی چاککردنەوەی خانووەکە بێ، هەم (وَالْعَلَفِ) دروست نیە وولاغ بە کرێ بدرێو کرێیەکەشی ئالیکدانی بێ، چونکە نازاندرێ ئەندازەی کرێیەکە چەندە، بەڵام ئەگەر خانووەکەی، یان وولاغەکەی بە کرێیەکی زاندراو بە کرێ دابێ، ئینجا ئیزنیدا کرێیەکەش لە چاککردنەوەیخانووەکەو لە ئالیکدان خەرج بکا، ئەو کاتە: دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ لِيَسْلَخَ بِالْجِلْدِ وَيَطْحَنَ بِبَعْضِ الدَّقِيقِ أَوْ بِالنُّخالَةِ، وَلَوْ اسْتَأْجَرَها لِتُرْضِعَ رَقِيقاً بِبَعْضِه فِي الْحالِ جازَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَكَوْنُ الْمَنْفَعَةِ مُتَقَوِّمَةً: فَلاَ يَصِحُ اسْتِئْجارُ بَيَّاعٍ عَلَى كَلِمَةٍ لاَ تُتْعِبُ

---

هەروەها ئەگەر بلّێ: دامە تۆ بە کرێ ئینجا دوایێ پێك دێین. یان گوتی: ئەم کارەم بۆ بکە کرێی خەلّکی چەند بوو ئەوەندەت دەدەمێ. یان شتێکت دەدەمێ. ئەوانەش دروست نابن (وَلاَ لِيَسْلَخَ بِالْجِلْدِ) هەروەها دروست نیە بۆ گرواندنی ئاژەلّە سەربڕاوەکەی، یان بۆ سەربڕینەکەی یەکێك بە کرێ بگرێ بە پێستەکەی (وَيَطْحَنَ بِبَعْضِ الدَّقِيقِ) هەم دروست نیە بۆ هاڕینی گەنمەکەی ئاشەوان بە کرێ بگرێ بە بەشێکی ئاردەکە: وەك سێیەکی، یان هەشتێکی (أَوْ بِالنُّخالَةِ) یان بە کەپەك=پوشکەکەی، چونکە ئەستوریی پێستەکەو ئەندازەی ئاردەکەو پوشکەکە ئێستا نەزانراوە، کەوابو: ئەگەر بلێ: بە ڕبەیەکی ئەم گەنمەم بە کرێ گرتی تاکو ئەویترم بۆ بهاڕی، ئەوە دروست دەبێ، هەروەك لە(تحفە)دا فەرموویەتی.

## ﴿ ئاگاداری: لەبارەی مامڵەتی شوانکاری ﴾

ئەگەر بلێ ئەم مەڕەم بۆ قەڵەو بکە نیوەی بۆ تۆ. یان گوتی ئەم دوو مەڕەم، یان ئەم کۆمەڵە جوجەڵەیەم بۆ بەخێو بکە نیوەی بۆ تۆ. ئەو مامڵەتە بەتاڵەو دروست نابێ، چونکە ئەندازەی کرێیەکەی ئێستا نەزانراوە، کەوابو: شوانەکە مافی کرێی هاوێنەی دەکەوێتە سەر خاوەن ئاژەڵەکە، هەروەك لە (مغنی)—لە کۆتایی شریکایەتی‌دا—و لە (بغیة)دا فەرموویانە.

جا بزانە: ڕێگەی شەرعی بۆ دروستبوونی مامڵەتی ئاژەڵ بە نیوەیی ئەمەیە: هەر لە سەرەتاوە ئەندازەیەکی زانراوی بۆ دیاری بکا، وەك بلێ: تۆم بە کرێ گرت بە نیوەی ئێستای ئەم مانگایە تاکو نیوەکەی‌ترم بۆ بەخێو بکەی تا ماوەی ئەوەندە ساڵە. یان بلێ: تۆم بە کرێ گرت بە دە مەڕی ئێستا لەم پەنجا مەڕە تاکو چلەکەی‌ترم بۆ بەخێو بکەی تا ئەوەندە ساڵە. ئەوها دروستە، هەروەك دەفەرموێ:

(وَلَوْ اسْتَأْجَرَها) ئەگەر ئافرەتێکی بە کرێ گرت (لِتُرْضِعَ رَقِيقاً) تاکو کۆیلەیەکی بۆ شیر بدا (بِبَعْضِه فِي الْحالِ) بە بەشێکی زانراوی ئێستای‌کۆیلەکە: وەك سێیەکی، یان چوارێکی، ئەوە (جازَ عَلَى الصَّحِيحِ) بەکرێگرتنەکە دروست دەبێ، لە سەر فەرموودەی ڕاست، کەواتە: بەکرێگیراوەکە—لەو مەسەلانەی‌ڕابردوودا— بە ئەندازەی کرێیە دیارکراوەکە بە بەرێلاوی دەبێتە هاوبەشی خاوەنەکە، هەروەك لە شریکایەتی‌دا ڕابرا.

(وَكَوْنُ الْمَنْفَعَةِ مُتَقَوِّمَةً) مەرجە—بۆ دروستبوونی بەکرێدان— سودەکە نرخی هەبێ، کەوابو: (فَلاَ يَصِحُ اسْتِئْجارُ بَيَّاعٍ عَلَى كَلِمَةٍ لاَ تُتْعِبُ) دروست نیە: دەلاّلێك بە کرێ بگرێ

وَإِنْ رَوَّجَت السِّلْعَةَ، وَكَذَا دَراهِمُ وَدَنانِيرُ لِلتَّزيِين، وَكَلْبٌ لِلصَّيْد فِي الأَصَحِّ، وَكَوْنُ الْمُؤَجِّرِ قادِراً عَلَى تَسْلِيمِها: فَلاَ يَصِحُّ اسْتِئْجارُ آبِقٍ وَمَغْصُوبٍ وَأَعْمَى لِلْحِفْظِ وَأَرْضٍ لِلزِّراعَةِ لاَ ماءَ لَها دَائِمٌ وَلاَ يَكْفِيها الْمَطَرُ الْمُعْتادُ، وَيَجُوزُ إِنْ كَانَ لَها ماءٌ دائِمٌ، وَكَذَا إِنْ كَفاها الْمَطَرُ الْمُعْتادُ أَوْ ماءُ الثُّلُوجِ الْمُجْتَمِعَةِ وَالْغالِبُ حُصُولُها فِي الأَصَحِّ، وَالإِمْتِناعُ الشَّرْعِيُّ كَالْحِسِّيِّ: فَلاَ يَصِحُّ اسْتِئْجارٌ لِقَلْعِ سِنٍّ صَحِيحَةٍ، وَلاَ حائِضٍ لِخِدْمَةِ مَسْجِدٍ، وَكَذَا مَنْكُوحَةٍ لِرَضاعٍ أَوْ غَيْرِهِ

---

بۆ گۆتنی ووشەیەکی وەها: کە ماندووی نەکا (وَإِنْ رَوَّجَت السِّلْعَةَ) هەرچەند ڕەواجیش بداتە کەلوپەلەکە (وَكَذَا دَراهِمُ وَدَنانِيرُ لِلتَّزيِينِ) هەروەها دروست نیە بەکرێگرتنی دیرهەمو دینار بۆ ڕازاندنەوە، هەم (وَكَلْبٌ لِلصَّيْدِ) دروست نیە بەکرێگرتنی سەگ بۆ ڕاوکردن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها مەرجە: بە هۆی سودوەرگرتن خودی شتەکە لەناو نەچێ، کەوابو: دروست نیە ئاژەڵێك بۆ شیر لێخواردن بە کرێ بگیرێ، یان باغێك بۆ میوە لێخواردن بە کرێ بگیرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە، چونکە خودی شیرەکەو میوەکە لەدوای خواردن نامێنێتەوە.

(وَكَوْنُ الْمُؤَجِّرِ قادِراً عَلَى تَسْلِيمِها) هەروەها مەرجە: بەکرێدەرەکە توانای هەبێ: سودەکە تەسلیمی بەکرێگرەکە بکا، کەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ اسْتِئْجارُ آبِقٍ وَمَغْصُوبٍ) دروست نیە بەکرێگرتنی کۆیلەی هەڵاتوو و شتی ونبوو و شتی زەوتکراو، هەم (وَأَعْمَى لِلْحِفْظِ) دروست نیە بەکرێگرتنی کوێر بۆ پاسەوانی، هەم (وَأَرْضٍ لِلزِّراعَةِ لاَ ماءَ لَها دَائِمٌ) دروست نیە بەکرێگرتنی زەوی بۆ کشتوکاڵ: کە ئاوێکی بەردەوامی نەبێو (وَلاَ يَكْفِيها الْمَطَرُ الْمُعْتادُ) بارانی عادەتیشی بەس نەبێ.

بەڵام (وَيَجُوزُ) بەکرێگرتنی زەوی دروستە (إِنْ كانَ لَها ماءٌ دائِمٌ) ئەگەر ئاوێکی بەردەوامی هەبێ (وَكَذَا إِنْ كَفاها الْمَطَرُ الْمُعْتادُ) هەروەها ئەگەر بارانی عادەتیشی بەس بێ (أَوْ ماءُ الثُّلُوجِ الْمُجْتَمِعَةِ) یان ئاوی بەفری کۆبووەوەی بەس بێ (وَالْغالِبُ حُصُولُها) بە ئەغڵەبیش ئاوی بەفرەکە وەدەست بهێندرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالإِمْتِناعُ الشَّرْعِيُّ) ڕێگەنەدانی شەرعی بۆ تەسلیمکردنی سودەکە (كَالْحِسِّيِّ) وەك ڕێگە نەدانی هەست پێکراوی‌برابردووە، کەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ اسْتِئْجارٌ لِقَلْعِ سِنٍّ صَحِيحَةٍ) دروست نیە بەکرێگرتنی کەسێك بۆ دەرهێنانی ددانێکی ساغ، یان بۆ لێکردنەوەی ئەندامێکی ساغ، چونکە شەرع ڕێگەی زیان لێدان نادا (وَلاَ حائِضٍ لِخِدْمَةِ مَسْجِدٍ) هەم بەکرێگرتنی ئافرەتی حەیزداریش بۆ خزمەتی مزگەوت دروست نابێ، چونکە حەرامە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە (وَكَذَا مَنْكُوحَةٍ لِرَضاعٍ) هەروەها ئافرەتی مارەبڕاویش بۆ شیردان (أَوْ غَيْرِهِ)

بغَيْرِ إذْنِ الزَّوْجِ فِي الأَصَحِّ، وَيَجُوزُ تَأجِيلُ الْمَنْفَعَةِ فِي إجارَةِ الذِّمَّةِ كَأَلْزَمْتُ ذِمَّتَكَ الْحَمْلَ إِلَى مَكَّةَ أَوَّلَ شَهْرِ كَذَا، وَلاَ يَجُوزُ إجارَةُ عَيْنٍ لِمَنْفَعَةٍ مُسْتَقْبَلَةٍ، فَلَوْ آجَرَ السَّنَةَ الثَّانِيَةَ لِمُسْتَأْجِرِ الأُولَى قَبْلَ انْقِضائِها جازَ فِي الأَصَحِّ، وَيَجُوزُ كِراءُ الْعُقَبِ فِي الأَصَحِّ: وَهُوَ أَنْ يُؤَجِّرَ دابَّةً رَجُلاً لِيَرْكَبَها بَعْضَ الطَّرِيقِ، أَوْ رَجُلَيْنِ لِيَرْكَبَ هَذا أَيّاماً وَذا أَيّاماً وَيُبَيِّنَ الْبَعْضَيْنِ، ثُمَّ يَقْتَسِمانِ.

---

يان بۆ كارێكی‌تر (بِغَيْرِ إذْنِ الزَّوْجِ) به بێ‌ئیزنی مێرده‌كه‌ی دروست نابێ (فِي الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستردا، چونكه له گشت كاتێكدا مافی مێرده‌كه‌ی له سه‌ره.

(وَيَجُوزُ تَأجِيلُ الْمَنْفَعَةِ فِي إجارَةِ الذِّمَّةِ) له به‌كرێگرتنی له ئه‌ستۆدا دروسته: سوده‌كه دوا بخرێ تا كاتێكی زاندراو (كـ) وه‌ك بلێ: (أَلْزَمْتُ ذِمَّتَكَ الْحَمْلَ إِلَى مَكَّةَ أَوَّلَ شَهْرِ كَذا) خستمه ئه‌ستۆی تۆ: ئه‌و شته‌م بۆ بار بكه‌ی تا (مكة)ی پیرۆز له سه‌ره‌تای فلانه مانگه‌دا. به‌لام (وَلاَ يَجُوزُ إجارَةُ عَيْنٍ لِمَنْفَعَةٍ مُسْتَقْبَلَةٍ) دروست نیه به‌كرێدانی خودی شتێك بۆ سودی سالّی داهاتوو، وه‌ك بلێ: ئه‌و خانووه‌م به‌كرێ دایه تۆ بۆ سالّی داهاتوو، یان بۆ سالێك سه‌ره‌تاییه‌كه‌ی له سبه‌ینێوه ده‌ست پێ بكا.

به‌لام ئه‌گه‌ر سوده‌كه‌ی سالّی‌داهاتووش یه‌كسه‌ر له دوای سالّی‌ڕابردوو ده‌ستی پێ‌ده‌كرا، ئه‌و كاته: دروسته، هه‌روه‌ك ده‌فه‌رموێ: (فَلَوْ آجَرَ السَّنَةَ الثّانِيَةَ لِمُسْتَأْجِرِ الأُولَى) ئه‌گه‌ر سالّی دووه‌میش به كرێ داوه به‌كرێگره‌كه‌ی سالّی‌یه‌كه‌م (قَبْلَ انْقِضائِها) پێش ئه‌وه‌ی سالّی یه‌كه‌م ته‌واو ببێ (جازَ فِي الأَصَحِّ) ئه‌و كاته دروسته، له فه‌رمووده‌ی‌ڕاستردا، چونكه هه‌ردوو ماوه‌كان پێكوه‌نووساون.

﴿ ئاگاداری ﴾: هه‌ر به‌م (قاعِدَة)یه، مه‌رجه: به‌كرێگرتنی خودی كه‌سێك بۆ حه‌ج كردن له‌جیاتی یه‌كێكی‌تر، له‌و كاته‌دا بێ: كه حاجیه‌كان ده‌ڕۆنه حه‌ج، یان خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئاماده ده‌كه‌ن، هه‌روه‌ك له (تحفة)و (نهاية)دا فه‌رموویانه‌و، له په‌ڕتووكی حه‌جدا ڕوونمان كردۆته‌وه.

(وَيَجُوزُ كِراءُ الْعُقَبِ) دروسته به‌كرێدانی به نۆبه‌ت (فِي الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستردا (وَهُوَ) به‌كرێدانی به نۆبه‌ت ئه‌مه‌یه: (أَنْ يُؤَجِّرَ دابَّةً رَجُلاً) وولاغێك به كرێ بداته پیاوێك (لِيَرْكَبَها بَعْضَ الطَّرِيقِ) تاكو له به‌شێكی ڕێگه‌دا ئه‌و سواری ببێ‌و له به‌شێكی‌تریشدا خاوه‌نه‌كه‌ی سواری ببێ (أَوْ رَجُلَيْنِ) یان به‌كرێی بداته دوو كه‌سان (لِيَرْكَبَ هَذا أَيّاماً وَذا أَيّاماً) تاكو ئه‌مه‌یان چه‌ند ڕۆژێك سوار ببێ‌و ئه‌وی‌تریش چه‌ند ڕۆژێك (وَيُبَيِّنَ الْبَعْضَيْنِ) به‌شه‌كانی هه‌ردووكیشیان ڕوون بكاته‌وه (ثُمَّ) ئینجا له دوای دروستبوونی به‌كرێگرتنه‌كه (يَقْتَسِمانِ) به‌شه نۆبه‌ته‌كانیان به‌ش بكه‌ن: به كات، یان به ئه‌ندازه‌ی ڕێگه‌كه.

(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ كَوْنُ الْمَنْفَعَة مَعْلُومَةً، ثُمَّ تارَةً تُقَدَّرُ بِزَمان كَدار سَنَةً، وَتارَةً بِعَمَل كَدابَّة إلَى مَكَّةَ، وَكَخياطَة ذَاالثَّوْب، فَلَوْ جَمَعَهُما فَاسْتَأْجَرَهُ لِيَخيطَهُ بَياضَ النَّهارِ لَمْ يَصِحَّ فِي‌الأَصَحِّ، وَيُقَدَّرُ تَعْليمُ الْقُرْآن بِمُدَّة أَوْ تَعْليمِ سُوَر،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی‌تری سودەکە ﴾

(يُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی مامڵەتی بەکرێدان بە مەرج دادەندرێ (كَوْنُ الْمَنْفَعَةِ مَعْلُومَةً) سودەکە زاندراو بێ: لە ڕووی چۆنیەتی‌و ئەندازەیەوە (ثُمَّ تارَةً تُقَدَّرُ بِزَمانٍ) ئینجا هەندێ جار ئەندازەی سودەکە بە ماوەیەك دیاری دەکرێ (كَدارِ سَنَةً) وەك بڵێ: ئەم خانووەم بەکرێ دایە تۆ بە سەد دینار بۆ ماوەی ساڵێك تێیدا نیشتەجێ ببە.

کەواتە: ئەگەر ماوەی بەکرێدانەکەی نەگوت، یان ئەندازەی ماوەکەی دیاری نەکرد، وەك تەنها بڵێ: ئەم خانووەم بەکرێ دایە تۆ هەر مانگێك بە پێنج دینار. ئەوە دروست نابێ، بەڵام ئەگەر ئەندازەکە دیاری بکاو بڵێ: بۆ ماوەی ساڵێك بە کرێ دامە تۆ هەر مانگێك بە پێنج دینار، ئەو کاتە: دروست دەبێ، هەروەك لە (مغنى)و (الشروانى)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە لای ئیمام (أحمد): ئەگەر ئەندازەی ماوەی بەکرێدانەکەش دیاری نەکرێ هەر دروستە، وەك: ئەم شتەم بە کرێ دایە تۆ هەر مانگێك بە دیرهەمێك. ئەم بەکرێدانە دروست‌و جێگیر دەبێ‌و تا مانگی یەکەمیش تەواو دەبێ، بۆ هیچ لایەنەکیان دروست نیە هەڵیبوەشێنێتەوە، لە مانگەکانی دوای مانگی‌یەکەمیش بە هەمان بڕیار ڕەفتار دەکرێ، کەواتە لە دوای تەواوبوونی هەر مانگێکدا دروستە: بەکرێدانەکە هەڵبوەشێندرێتەوە، هەروەك لە(مغنى إبن قدامة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَتارَةً بِعَمَلٍ) هەندێ جاریش سودەکە بە کردار دیاری دەکرێ (كَدابَّةٍ إلَى مَكَّةَ) وەك بڵێ: ئەم وڵاغەم بە کرێ دایە تۆ بە سەد دینار سواری ببە تا (مكة)ی پیرۆز (وَكَخِياطَةِ ذَا الثَّوْبِ) هەم وەك بڵێ: تۆم بە کرێ گرت بە سەد دینار بۆ دوروینی ئەم جلە.

(فَلَوْ جَمَعَهُما) جا ئەگەر ماوەو کردارەکەی هەردووك کۆ کردنەوەو (فَاسْتَأْجَرَهُ) بە کرێی گرت بە سەد دینار (لِيَخيطَهُ بَياضَ النَّهارِ) تاکو لە سپیایی ئەم ڕۆژەیدا بەرگێکی بۆ بدورێ، یان لە ماوەی ئەم مانگەیدا شتێکی بۆ دروست بکا (لَمْ يَصِحَّ فِي‌الأَصَحِّ) ئەوە دروست نابێ لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە وا دەبێ کردارەکە پێش دەکەوێ، یان دوا دەکەوێ.

(وَيُقَدَّرُ تَعْليمُ الْقُرْآنِ بِمُدَّةٍ) فێرکردنی قورئانی پیرۆز ئەندازەی دیاری دەکرێ (بِمُدَّةٍ) بە ماوەیەك، وەك بڵێ: ماوەی مانگێك فێرە قورئانم بکە (أَوْ تَعْليمِ سُوَرٍ) یان بە دیاری‌کردنی سوورەتەکان، وەك بڵێ: ئەو سوورەتەو ئەو سوورەتەم فێر بکە.

وَفي الْبناء يُبَيِّنُ الْمَوْضِعَ وَالطُّولَ وَالْعَرْضَ وَالسَّمْكَ وَما يُبْنَى بِه إنْ قُدِّرَ بِالْعَمَلِ، وَإذَا صَلَحَت الأَرْضُ لِبناء وَزِراعَة وَغِراس اُشْتُرِطَ تَعْيينُ الْمَنفَعَة، وَيَكْفي تَعيينُ الزِّراعَة عَنْ ذِكْرِ ما يُزْرَعُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ قالَ لِتَنْتَفِعَ بِها بِما شِئْتَ، صَحَّ، وَكَذا لَوْ قالَ إنْ شِئْتَ فَازْرَعْ وَإنْ شِئْتَ فَاغْرِسْ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَفِي الْبِناء) له بەکرێگرتن بۆ دروستکردنی خانوو (يُبَيِّنُ الْمَوْضِعَ) دەبی شوێنەکە دیاری بکاو (وَالطُّولَ) درێژیەکەیو (وَالعَرْضَ) بەرینیەکەیو (وَالسَّمْكَ) بەرزیەکەیو (وَما يُبْنَى بِه) هەم ئەو کەرەستەی پێی دروست دەکرێ: وەك خشتو بەردو...هتد (إنْ قُدِّرَ بِالْعَمَلِ) ئەگەر ئەندازەی بەکرێگرتنەکە بە کردار دیاری بکرێ، بەڵام ئەگەر بە کات دیاری بکرێ، ئەوانەیڕابردووی ناوێ.

(وَإذَا صَلَحَتِ الأَرْضُ) هەر کاتێك زەویەکە کەڵکی هەبو: (لِبِناءٍ) بۆ خانوو و (وَزِراعَةٍ) بۆ کشتوکاڵو (وَغِراسٍ) بۆ درەخت ڕواندن (اُشْتُرِطَ) لە بەکرێدانیدا بەمەرج داندراوە (تَعْيِينُ الْمَنْفَعَةِ) ئەو سودەی بۆی بە کرێ گیراوە دیاری بکرێ بەڵام (وَيَكْفِي تَعيِينُ الزِّراعَةِ) دیاریکردنی کشتوکاڵ بەسە (عَنْ ذِكْرِ ما يُزْرَعُ) لەجیاتی گۆتنی ناوی ئەو شتەی تێیدا دەچێندرێ، واتە: ئەگەر لەجیاتی بڵێ: بۆ گەنم. بڵێ: بۆ کشتوکاڵ. ئەوە بەسە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: بە کرێ دامە تۆ (لِتَنْتَفِعَ بِها بِما شِئْتَ) تاکو بە هەرچی حەز دەکەی سودی لێوەربگرێ (صَحَّ) ئەوە دروست دەبێو دروستە: بۆ درەختو کشتوکاڵو بۆ خانوو سودی لێوەربگرێ (وَكَذَا لَوْ قالَ) هەروەها دروست دەبێ، ئەگەر بڵێ: (إنْ شِئْتَ فَازْرَعْ وَإنْ شِئْتَ فَاغْرِسْ) ئەگەر حەز دەکەی کشتوکاڵی تێدا بچێنەو ئەگەر حەزیش دەکەی درەختی تێدا بچێنە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر زەویەکەی بۆ درەختو خانوو بە کرێ دایێ، ئینجا بەکرێگرەکەش خانووی تێدا کردو درەختی تێدا چاند، ئینجا ماوەی بەکرێدانەکەش تەواو بوو، ئەوە بەکرێدەرەکە سەرپشکە: یان بۆ ماوەیەکیتری دیارکراو-بە کرێ- درەختو خانووەکە بهێڵێتەوە، یان هەڵیانبکەنێو تۆڵەی ناتەواویش بداتە بەکرێگرەکە، یان بە نرخی خۆیان لە خاوەنەکەیان بیانکرێو بیانکاتە ملکی خۆی.

هەروەها ئەگەر زەویەکی کڕی، بەڵام کڕینەکە نادروستو دانەمەزراو بوو، ئینجا کڕیارەکەش خانووی تێدا کردو درەختی تێدا چاند، ئەو کاتەش فرۆشیارەکە سەرپشکە لە نێوان ئەو سێ کارانەیڕابردوودا، هەروەك لە(بجيرمي)و(الشرواني) لە کۆتایی(عارية)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَيُشْتَرَطُ فِي إجارَةِ دابَّةٍ لِرُكُوبٍ مَعْرِفَةُ الرَّاكِبِ بِمُشاهَدَةٍ أَوْ وَصْفٍ تامٍّ، وَقِيلَ لاَ يَكْفِي الْوَصْفُ، وَكَذَا الْحُكْمُ فِيما يَرْكَبُ عَلَيْهِ مِنْ مَحْمِلٍ وَغَيْرِهِ إِنْ كانَ لَهُ، وَلَوْ شَرَطَ حَمْلَ الْمَعالِيقِ مُطْلَقاً فَسَدَ الْعَقْدُ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ لَمْ يَشْرِطْهُ لَمْ يَسْتَحِقَّ، وَيُشْتَرَطُ فِي إجارَةِ الْعَيْنِ: تَعْيِينُ الدَّابَّةِ، وَفِي اشْتِراطِ رُؤْيَتِها الْخِلاَفُ فِي بَيْعِ الْغائِبِ، وَفِي إجارَةِ الذِّمَّةِ: ذِكْرُ الْجِنْسِ وَالنَّوْعِ وَالذُّكُورَةِ وَالأُنُوثَةِ، وَيُشْتَرَطُ فِيهِما بَيانُ قَدْرِ السَّيْرِ كُلَّ يَوْمٍ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِالطَّرِيقِ مَنازِلُ مَضْبُوطَةٌ فَيُنَزَّلُ عَلَيْها،

---

(وَيُشْتَرَطُ فِي إجارَةِ دابَّةٍ) بە مەرج دادەندرێ لە بەکرێدانی وولاغ (لِرُكُوبٍ) بۆ سواری (مَعْرِفَةُ الرَّاكِبِ) سوارەکە بناسێ (بِمُشاهَدَةٍ) بە دیتن (أَوْ وَصْفٍ تامٍّ) یان بە باسکردنێکی تەواوی لاشەکەی لە ڕووی قەڵەوی‌و لاوازیەوە (وَقِيلَ لاَ يَكْفِي الْوَصْفُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: باسکردنی بەس نیە (وَكَذَا الْحُكْمُ فِيما يَرْكَبُ عَلَيْهِ) هەروەها مەرجە ئەو شتەش بزاندرێ: کە لە سەری سوار دەبێ (مِنْ مَحْمِلٍ وَغَيْرِهِ) لە کەژاوەو زین‌و کورتان (إِنْ كانَ لَهُ) ئەگەر ئەو شتانە ملکی بەکرێگرەکە بن.

(وَلَوْ شَرَطَ حَمْلَ الْمَعالِيقِ مُطْلَقاً) ئەگەر بە مەرجی دانا کەرستەی کاروانچی-ڕێبوار: وەک یاتاغ‌و ئاو و خواردەمەنی‌و مەسینەو جامە-بێ دیتن‌و باسکردن- بار بکرێن (فَسَدَ الْعَقْدُ) مامڵەتەکە بەتاڵ دەبێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە خەڵك لە زۆری‌و کەمی ئەو کەرستانەدا لێك جیاوازن (وَإِنْ لَمْ يَشْرِطْهُ) جا ئەگەر هەڵگرتنی‌ئەوانەی بە مەرج دانەنا، مامڵەتەکە دروست دەبێ، بەڵام (لَمْ يَسْتَحِقَّ حَمْلَها) مافی بارکردنیان نیە، هەرچەند کەم‌و سوکیش بن.

(وَيُشْتَرَطُ فِي إجارَةِ الْعَيْنِ) بە مەرج دادەندرێ: لە بەکرێدانی خودی وولاغێك بۆ سواری، یان بۆ بارکردن (تَعْيِينُ الدَّابَّةِ) وولاغەکە دیاری بکا، واتە: دروست نیە بڵێ: یەکێك لەم دوو وولاغە (وَفِي اشْتِراطِ رُؤْيَتِها) لەبارەی بە مەرج دانانی دیتنی وولاغەکە (الْخِلاَفُ فِي بَيْعِ الْغائِبِ) ئەو فەرموودانەی ڕابران لە فرۆشتنی نادیاردا، لێرەشدا هەنە، فەرموودەی بەهێزتر: مەرجە وولاغە بەکرێگیراوەکە بدیترێ (وَفِي إجارَةِ الذِّمَّةِ) بە مەرج دادەندرێ لە بەکرێدانی وولاغ لە ئەستۆدا: (ذِكْرُ الْجِنْسِ) ڕەگەزی وولاغەکە بگوترێ (وَالنَّوْعِ) جۆرەکەی بگوترێ (وَالذُّكُورَةِ وَالأُنُوثَةِ) نێرایەتی‌و مێیایەتی‌ی بگوترێ.

(وَيُشْتَرَطُ فِيهِما) بە مەرج دادەندرێ لە هەردوو بەکرێدانەکاندا، واتە: خودی وولاغێك و وولاغێکی لە ئەستۆدا: (بَيانُ قَدْرِ السَّيْرِ كُلَّ يَوْمٍ) ئەندازەی ڕۆیشتن لە گشت ڕۆژێکدا دیاری بکرێ (إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِالطَّرِيقِ مَنازِلُ مَضْبُوطَةٌ) مەگەر لە ڕێگەدا چەند قۆناغێکی پشوودانی ڕێك هەبن، ئەو کاتە (فَيُنَزَّلُ عَلَيْها) ئەگەر باس نەکرا، ئەندازەی ڕۆیشتنەکە دەهێندرێتە سەر ئەو قۆناغانە.

وَيَجِبُ فِي الإِيجَارِ لِلْحَمْلِ أَنْ يَعْرِفَ الْمَحْمُولَ، فَإِنْ حَضَرَ رَآهُ وَامْتَحَنَهُ بِيَدِهِ إِنْ كَانَ فِي ظَرْفٍ، وَإِنْ غَابَ قُدِّرَ بِكَيْلٍ أَوْ وَزْنٍ، وَجِنْسَهُ، لاَ جِنْسَ الدَّابَّةِ وَصِفَتَهَا إِنْ كَانَتْ إِجَارَةَ ذِمَّةٍ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْمَحْمُولُ زُجَاجاً وَنَحْوَهُ.
(فَصْلٌ) لاَ تَصِحُّ إِجَارَةُ مُسْلِمٍ لِجِهَادٍ وَلاَ عِبَادَةٍ تَجِبُ لَهَا نِيَّةٌ إِلاَّ حَجٌّ وَتَفْرِقَةُ زَكَاةٍ، وَتَصِحُّ لِتَجْهِيزِ مَيِّتٍ وَدَفْنِهِ، وَتَعْلِيمِ الْقُرْآنِ،

---

(وَيَجِبُ فِي الإِيجَارِ لِلْحَمْلِ) واجبە: لە بەكرێدانی وولاٚغ بۆ باركردن: (أَنْ يَعْرِفَ الْمَحْمُولَ) بەكرێدەرەكە باركراوەكە بزانێ (فَإِنْ حَضَرَ) جائەگەر باركراوەكە حازر بوو، ئەو كاتە (رَآهُ) بە چاو ببینێ (وَامْتَحَنَهُ بِيَدِهِ إِنْ كَانَ فِي ظَرْفٍ) هەم گرانابیشی بە دەستی خۆی تاقی بكاتەوە، ئەگەر لە ناو شتێكدا بوو، بەلاٚم (وَإِنْ غَابَ) ئەگەر شتەكە نادیار بوو، ئەو كاتە (قُدِّرَ بِكَيْلٍ أَوْ وَزْنٍ) ئەندازەی بە پێوان، یان بە كێشان دیاری دەكرێ (وَ) هەروەها (جِنْسَهُ) واجبە: ڕەگەزی هەلگیراوە نادیارەكەش بزانێ: ئایا گەنمە، یان خوێیە.
(لاَ جِنْسَ الدَّابَّةِ وَصِفَتَهَا) بەلاٚم لە بەكرێدانی وولاٚغ بۆ باركردن مەرج نیە: ڕەگەزو سیفەتی وولاٚغەكە بزاندرێ (إِنْ كَانَتْ إِجَارَةَ ذِمَّةٍ) ئەگەر بەكرێدانەكەی لە ئەستۆدا بێ (إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْمَحْمُولُ زُجَاجاً وَنَحْوَهُ) مەگەر باركراوەكە شوشەو ئەو جۆرە شتە بێ: كە مەترسی شكانی لێبكرێ، ئەو كاتە مەرجە: ڕەگەزو سیفەتی وولاٚغەكە بزاندرێ، تاكو باركراوەكە بپارێزرێ، هەروەها لە بەكرێگرتنی وولاٚغ بۆ سواری مەرجە: ڕەگەزو سیفەتی وولاٚغەكە بزاندرێ، چونكە سواریی هەر جۆرێك لەوی‌تر جیاوازە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەكرێگرتن بۆ خواپەرستی ﴾

(لاَ تَصِحُّ إِجَارَةُ مُسْلِمٍ لِجِهَادٍ) دروست نیە مرۆڤی موسوڵمان بۆ جیهاد-غەزاكردن بە كرێ بگیرێ، چونكە هەر كاتێك گەیشتە ڕیزی جەنگ لە سەری دەبێتە (فَرْضُ الْعَيْنِ)و خێرەكەشی بۆ خۆیەتی (وَلاَ عِبَادَةٍ تَجِبُ لَهَا نِيَّةٌ) هەم دروست نیە بەكرێگرتن بۆ كردنی خواپەرستیەكی وەها: كە نیەت بۆهێنانی واجب بێ: وەكو نوێژو ڕۆژوو (إِلاَّ حَجٌّ وَتَفْرِقَةُ زَكَاةٍ) تەنها بەكرێگرتن بۆ حەج و بۆ بەشكردنی‌زەكات دروستە.
هەم (وَتَصِحُّ لِتَجْهِيزِ مَيِّتٍ) بەكرێگرتن دروستە: بۆ كاروباری مردوو: وەك شۆردن و كفن و نوێژ لەسەركردن و (وَدَفْنِهِ) ناشتنی، هەم (وَتَعْلِيمِ الْقُرْآنِ) بۆ فێركردنی قورئانی پیرۆز، هەم بۆ كردنی گشت (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)كانی‌تر، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَحَقَّ مَا أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْراً كِتَابُ اللهِ تَعَالَى﴾ رواه البخاري، بە ڕاستی باشترین شت كە كرێی لە سەر وەربگرن قورئانی پیرۆزە.
﴿ ئاگاداری ﴾: بە بەلگەی ئەو حەدیسە بەكرێگرتن دروستە: بۆ خوێندنی ئەندازەیەكی دیاركراو لە قورئانی پیرۆز: لە سەر گۆڕی‌مردووێك، چونكە لە حاڵەتی قورئان خوێندندا

وَلِحَضانَةٍ وَإِرْضاعٍ مَعاً، وَلِأَحَدِهِما فَقَطْ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَسْتَتْبِعُ أَحَدُهُما الآخَرَ، وَالْحَضانَةُ حِفْظُ صَبِيٍّ وَتَعَهُّدُهُ بِغَسْلِ رَأْسِهِ وَبَدَنِهِ وَثِيابِهِ وَدَهْنِهِ وَكَحْلِهِ وَرَبْطِهِ فِي الْمَهْدِ وَتَحْرِيكِهِ لِيَنامَ وَنَحْوِها، وَلَوْ اسْتَأْجَرَ لَهُما فَانْقَطَعَ اللَّبَنُ فَالْمَذْهَبُ انْفِساخُ الْعَقْدِ فِي الإِرْضاعِ دُونَ الْحَضانَةِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَجِبُ حِبْرٌ وَخَيْطٌ وَكُحْلٌ عَلَى وَرَّاقٍ وَخَيَّاطٍ وَكَحَّالٍ، قُلْتُ: صَحَّحَ الرَّافِعِيُّ فِي الشَّرْحِ

---

ڕەحمەتیخوا دێتە خوارەوەو مردووەکە سوودی پێدەگا، هەروەها لە دوورەوەی گۆڕەکەش دروستە قورئان بە خێریمردووەکە بخوێندرێ، بەڵام بەو مەرجەی لە دوای خوێندنەکە دوعایخێرەکە بکاو بڵێ: خوایە وێنەی خێری ئەم قورئانخوێندنەم بگەینە فڵانە مردووە. واتە: ئەگەر تەنها نیەتی خێری مردووەکە بێو ئەو جۆرە دوعایەشی بۆ نەکا، خێر ناگاتە مردووەکە، جا ئەگەر بە (جَنابَة)وە قورئانی خوێند، ئەو کاتە مافی کرێیەکەی نیە، هەرچەند لە بیریشی چوبێ کە جەنابەتدارە، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)و حاشیەکانیاندا ناوەڕۆکی ئەو ئاگادارییە ڕوون کراوەتەوەو، لە (پەرتوکیوەسێت)دا درێژتر ڕوونی دەکەینەوە، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَلِحَضانَةٍ وَإِرْضاعٍ مَعاً) دروستە: ئافرەتێك بە کرێ بگیرێ بۆ بەخێوکردنو شیردانیمنداڵ وێکڕا، هەم (وَلِأَحَدِهِما فَقَطْ) بۆ تەنها یەکێکیشیان دروستە، جیاوازی نیە بەکرێگیراوەکە: دایکی منداڵەکە بێ، یان بێگانە بێ (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يَسْتَتْبِعُ أَحَدُهُما الآخَرَ) لەو دووانە یەکێکیان نابێتە پابەندی ئەویتر، چونکە هەر یەکەیان کارێکی سەربەخۆیە (وَالْحَضانَةُ) مەبەست بە بەخێوکردن (حِفْظُ صَبِيٍّ) پاراستنی منداڵە، هەم (وَتَعَهُّدُهُ) خزمەتکردنی منداڵە (بِغَسْلِ رَأْسِهِ وَبَدَنِهِ) بەوەی سەرو لاشەی بشواو (وَثِيابِهِ) جلوبەرگەکانی بشواو (وَدَهْنِهِ) چەوری بکاو (وَكَحْلِهِ)کلی دەچاوان بکاو (وَرَبْطِهِ فِي الْمَهْدِ) بیخاتە ناو بێشکەو (وَتَحْرِيكِهِ لِيَنامَ) بێشکەش بژێنێ تاکو بخەوێ (وَنَحْوِها) ئەوەی وەك ئەو کارانەشە: وەك پاککردنەوەی لە میزو پیسایی.

(وَلَوْ اسْتَأْجَرَ لَهُما) ئەگەر بۆ بەخێوکردنو شیردان ئافرەتێکی بە کرێ گرت (فَانْقَطَعَ اللَّبَنُ) ئینجا شیرەکەی نەماو بڕا، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ انْفِساخُ الْعَقْدِ فِي الإِرْضاعِ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: مامڵەتەکە لە شیردانەکە هەڵدەوەشێتەوە (دُونَ الْحَضانَةِ) بەڵام لە بەخێوکردندا هەڵناوەشێتەوە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ لاَ يَجِبُ حِبْرٌ) مەرەکەب واجب نیەو هەم (وَخَيْطٌ) داوی دوروین واجب نیەو هەم (وَكُحْلٌ) کل واجب نیە (عَلَى وَرَّاقٍ وَخَيَّاطٍ وَكَحَّالٍ) لە سەر نوسەری کتێبو لە سەر بەرگدروو و لە سەر کل دەچاوکەر (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (صَحَّحَ الرَّافِعِيُّ فِي الشَّرْحِ) ئیمامی (الرافعی) لە شەرحە گەورەکەیدا ئەو

اَلرُّجُوعَ فيه إِلَى الْعادَة، فَإِن اضْطَرَبَتْ وَجَبَ الْبَيانُ وَإِلاَّ فَتَبْطُلُ الإِجارَةُ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) يَجِبُ تَسْلِيمُ مِفْتاحِ الدَّارِ إِلَى الْمُكْتَرِي، وَعِمارَتُها عَلَى الْمُؤَجِّرِ، فَإِنْ بادَرَ وَأَصْلَحَها، وَإِلاَّ فَلِلْمُكْتَرِي الْخِيارُ، وَكَسْحُ الثَّلْجِ عَنِ السَّطْحِ عَلَى الْمُؤَجِّرِ، وَتَنْظِيفُ عَرْصَةِ الدَّارِ عَنْ ثَلْجٍ وَكُناسَةٍ عَلَى الْمُكْتَرِي، وَإِنْ آجَرَ دابَّةً لِرُكُوبٍ فَعَلَى الْمُؤَجِّرِ إِكافٌ وَبَرْذَعَةٌ وَحِزامٌ وَثَفَرٌ وَبُرَةٌ وَخِطامٌ، وَعَلَى الْمُكْتَرِي مَحْمِلٌ وَمِظَلَّةٌ وَوِطاءٌ وَغِطاءٌ وَتَوابِعُها،

---

فەرموودەیەی بە ڕاست داناوە: کە دەفەرمویّ (الرُّجُوعَ فِيهِ إِلَى الْعادَةِ) لەوانەیڕابردوودا دەگەڕێینەوە سەر عادەتی خەڵك (فَإِنِ اضْطَرَبَتْ) جا ئەگەر عادەتەکە ڕێك نەبو، ئەو کاتە: (وَجَبَ الْبَيانُ) واجبە ڕوون بکرێتەوە: لە سەر کامەیانە (وَإِلاَّ) ئەگەر ڕوون نەکراوە (فَتَبْطُلُ الإِجارَةُ) بەکرێدانەکە بەتاڵ دەبێتەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەرکەکانی بەکرێدەرو بەکرێگر ﴾

(يَجِبُ تَسْلِيمُ مِفْتاحِ الدَّارِ إِلَى الْمُكْتَرِي) واجبە: بەکرێدەرەکە کلیلی خانووە بەکرێدراوەکە تەسلیمی بەکرێگرەکە بکا، جا ئەگەر تەسلیمی نەکرد، ئەو کاتە: بەکرێگرەکە مافی پەشیمانیی هەیە، جا ئەگەر پەشیمان نەبۆوە، ئەو کاتە: ماوەی کلیل وێنەدانەکە بە هەڵوەشاوە دادەندریّ، واتە: کریّی ئەو ماوەیەی نادریّتیّ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَعِمارَتُها) چاککردنەوەی خانووەکە (عَلَى الْمُؤَجِّرِ) لە سەر بەکرێدەرەکەیە، کەوابو: (فَإِنْ بادَرَ وَأَصْلَحَها) ئەگەر بەکرێدەرەکە پەلەی کردو چاکی کردەوە، ئەوە باشە (وَإِلاَّ) بەلاّم ئەگەر چاکی نەکردوە، ئەو کاتە (فَلِلْمُكْتَرِي الْخِيارُ) بەکرێگرەکە مافی پەشیمانیی هەیە.

(وَكَسْحُ الثَّلْجِ عَنِ السَّطْحِ عَلَى الْمُؤَجِّرِ) ڕامالینی بەفر لە سەربانیخانووەکە لە سەر بەکرێدەرەکەیە، هەروەها خزمەتکردنی سەربانەکەش تاکو دلۆپە نەکا، ئەویش لە سەر بەکرێدەرەکەیە، چونکە ئەگەر دلۆپە بکا، لەو حاڵەتەدا بەکرێگرەکە مافی پەشیمانیی هەیە، بەلاّم (وَتَنْظِيفُ عَرْصَةِ الدَّارِ) پاککردنەوەی حەوش و پێش دەرگەی خانووەکە (عَنْ ثَلْجٍ وَكُناسَةٍ) لە بەفرو لەخڵت و خاڵ (عَلَى الْمُكْتَرِي) لە سەر بەکرێگرەکەیە.

(وَإِنْ آجَرَ دابَّةً لِرُكُوبٍ) ئەگەر وولاغێکی بە کریّدا بۆ سواری، ئەوە (فَعَلَى الْمُؤَجِّرِ إِكافٌ) لە سەر بەکرێدەرەکە واجبە: کورتانی وولاغەکەو (وَبَرْذَعَةٌ) جلی سەر پشتی وولاغەکەو (وَحِزامٌ) تەنگە-کەژیو (وَثَفَرٌ) پالوو (وَبُرَةٌ) ئالقەی لووتی ووشترو (وَخِطامٌ) داوی ئالقەکەش، بەلاّم (وَعَلَى الْمُكْتَرِي مَحْمِلٌ) کەژاوەی سەرپشتی وولاغەکە، ئەویان لە سەر بەکرێگرەکەیە، هەم (وَمِظَلَّةٌ) چەتری سێبەرو (وَوِطاءٌ وَغِطاءٌ) داپۆشەری کەژاوەکەو (وَتَوابِعُها) پابەندیەکانی کەژاوەکە: وەکو گوریس و ئەو جۆرە شتانەش گشتی لە سەر

وَالأَصَحُّ فِي السَّرْجِ اتِّبَاعُ الْعُرْفِ، وَظَرْفُ الْمَحْمُولِ عَلَى الْمُؤَجِّرِ فِي إِجارَةِ الذِّمَّةِ، وَعَلَى الْمُكْتَرِي فِي إِجارَةِ الْعَيْنِ، وَعَلَى الْمُؤَجِّرِ فِي إِجارَةِ الذِّمَّةِ الْخُرُوجُ مَعَ الدَّابَّةِ لِتَعَهُّدِها، وَإِعانَةُ الرَّاكِبِ فِي رُكُوبِهِ وَنُزُولِهِ بِحَسَبِ الْحاجَةِ، وَرَفْعُ الْحِمْلِ وَحَطُّهُ، وَشَدُّ الْمَحْمِلِ وَحَلُّهُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ فِي إِجارَةِ الْعَيْنِ إِلاَّ التَّخْلِيَةُ بَيْنَ الْمُكْتَرِي وَالدَّابَّةِ، وَتَنْفَسِخُ إِجارَةُ الْعَيْنِ بِتَلَفِ الدَّابَّةِ،

---

بەكرێگرەكەیە (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (فِي السَّرْجِ) لەبارەی زینی ئەسپی بەكرێدراو (اتِّباعُ العُرْفِ) بە شوێنكەوتنی عادەتی شوێنەكەیە، جا ئەگەر هیچ عادەتێك نەبو، ئەو كاتە: واجبە: دیاری بكرێ لە سەر كامەیانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەركی بەخێوكردنی وولاغە بەكرێدراوەكە لە سەر بەكرێدەرەكەیە، هەروەك لە (القلیوبی)دا فەرموویەتی، هەروەها پاراستنی وولاغەكەش لە سەر خاوەنەكەیەتی، بەڵام ئەگەر تەسلیمی بەكرێگرەكەی كردبێ تاكو -بە تەنهایی- بە سواری وولاغەكە بۆ سەفەر بڕوا، ئەو كاتە: پاراستنی لە سەر بەكرێگرەكەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

(وَظَرْفُ الْمَحْمُولِ) كیسەی ئەو شتەی بە كرێ بار دەكرێ: وەك جەواڵو خەلارو سندوق (عَلَى الْمُؤَجِّرِ فِي إِجارَةِ الذِّمَّةِ) لە سەر بەكرێدەری وولاغەكەیە لە بەكرێدانی لە ئەستۆدا، بەڵام (وَعَلَى الْمُكْتَرِي فِي إِجارَةِ الْعَيْنِ) لە بەكرێدانی خودی وولاغەكەدا لە سەر بەكرێگرەكەیە.

(وَعَلَى الْمُؤَجِّرِ فِي إِجارَةِ الذِّمَّةِ) لە بەكرێدانی لە ئەستۆدا لە سەر بەكرێدەری وولاغەكە واجبە: (الْخُرُوجُ مَعَ الدَّابَّةِ) بەخۆی، یان جێگری خۆی لەگەڵ وولاغەكە دەربچێ بۆ سەفەرەكە (لِتَعَهُّدِها) تاكو ئاگای لە وولاغەكەی بێ‌و خزمەتی بكا، هەم (وَإِعانَةُ الرَّاكِبِ فِي رُكُوبِهِ وَنُزُولِهِ) لە سەری واجبە یارمەتی سوارەكەش بدا لە سواربوون‌و دابەزینیدا (بِحَسَبِ الْحاجَةِ) بەگوێرەی پێویستی (وَرَفْعُ الْحِمْلُ وَحَطُّهُ) لە سەر بەكرێدەرەكە واجبە: بارەكە لە وولاغ بار بكاو دایببەزێنێ، هەم (وَشَدُّ الْمَحْمِلِ وَحَلُّهُ) واجبە كەژاوەكەش ببەستێ‌و بیكاتەوە.

بەڵام (وَلَيْسَ عَلَيْهِ فِي إِجارَةِ الْعَيْنِ) لە بەكرێدانی خودی وولاغەكەدا، هیچ ئەوانەی ڕابردوو لە سەر بەكرێدەرەكە واجب نیە (إِلاَّ التَّخْلِيَةُ بَيْنَ الْمُكْتَرِي وَالدَّابَّةِ) تەنها ئەوەندە واجبە: بۆ بەكرێگرەكە واز لە وولاغەكە بێنێ‌و بۆی بگونجێنێ سودی لێوەربگرێ.

(وَتَنْفَسِخُ إِجارَةُ الْعَيْنِ) مامڵەتی بەكرێدانی خودی‌وولاغێك -یان شتێكی‌تر- لەمەودوا هەڵدەوەشێتەوە (بِتَلَفِ الدَّابَّةِ) بە فەوتانی وولاغە بەكرێگیراوەكە -یان شتە بەكرێگیراوەكانی‌تر- بەڵام لە ڕابردوودا هەڵناوەشێتەوە، كەواتە: ئەگەر لە ڕێگەدا وولاغەكە فەوتا، ئەو كاتە: خاوەنەكەی مافی بەشەكرێیەكەی ڕابردووی هەیە.

وَيَثْبُتُ الْخِيارُ بِعَيْبِها، وَلاَخِيارَ في إجارَةِالذِّمَّةِ، بَلْ يَلْزَمُهُ الإِبْدالُ، وَالطَّعامُ الْمَحْمُولُ لِيُؤْكَلَ يُبْدَلُ إذا أُكِلَ فِيالأَظْهَرِ.
(فَصْلٌ) يَصِحُّ عَقْدُالإجارَةِ مُدَّةً تَبْقَى فِيهاالْعَيْنُ غالِباً، وَفِيقَوْلٍ لاَ يُزادُ عَلَىسَنَةٍ، وَفِيقَوْلٍ ثَلاَثِينَ، وَلِلْمُكْتَرِي اسْتِيفاءُ الْمَنْفَعَةِ بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ فَيُرْكِبُ وَيُسْكِنُ مِثْلَهُ،

---

(وَ) هەروەها (يَثْبُتُ الْخِيارُ بِعَيْبِها) مافی پەشیمانی بۆ بەکرێگرەکە هەیە: بە هۆی عەیبێکی هەبوویی ئەگەر نەیزانیبێ، هەم بە هۆی عەیبێکی پەیدابووش مافی پەشیمانیی هەیە، بەلام (وَلاَ خِيارَ فِي إجارَةِالذِّمَّةِ) لە بەکرێدانی لە ئەستۆدا بەکرێگرەکە مافی پەشیمانیی نیە: ئەگەر وولاغەکە فەوتا، یان عەیبێکی هەبو (بَلْ يَلْزَمُهُ الإِبْدالُ) بەلکو لە سەر بەکرێدەرەکە واجبە: ئەو وولاغە بە وولاغێکیتری ساغ بگۆڕێو لە جێی دابنێ، جا ئەگەر نەگونجا بیگۆڕێ، ئەو کاتە: بەکرێگرەکە مافی پەشیمانیی هەیە.
(وَالطَّعامُ الْمَحْمُولُ لِيُؤْكَلَ) ئەو خواردەمەنیەی بارکراوە، تاکو لە ڕێگەدا بخورێ (يُبْدَلُ إذا أُكِلَ) هەر کاتێك خورا، خواردەمەنیەکیتری لە جێ بار دەکرێتەوە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ماوەی بەکرێدانو، زامینیی بەکرێگر ﴾

(يَصِحُّ عَقْدُ الإجارَةِ مُدَّةً) مامڵەتی بەکرێدان دروست دەبێ بۆ ماوەیەکی زاندراوی وەها: کە (تَبْقَى فِيها الْعَيْنُ غالِباً) خودی شتە بەکرێدراوەکە لەو ماوەیەدا بمێنێ بە ئەغڵەبی، هەرچەند بشگاتە سەد ساڵ، جیاوازی ملکی وەقفکراو و بەرەڵدراو نیە (وَفِي قَوْلٍ لاَ يُزادُ عَلَى سَنَةٍ) لە فەرموودەیەکدا: نابێ لە ساڵێك زیاتر بە کرێ بدرێ (وَفِي قَوْلٍ ثَلاَثِينَ) لە فەرموودەیەکدا: نابێ لە سی ساڵ زیاتر بەکرێ بدرێ.
ئینجا ماوەی بەکرێدانەکە زۆر بێ، یان کەم بێ، مەرجە: ماوەی بەکرێدانەکە بزاندرێ، واتە: ئەگەر دیاری نەکرێ ماوەی بەکرێدانەکە چەندە، ئەوە مامڵەتەکە دانامەزرێو دروست نابێ ، هەروەك لە لە مەرجەکانی سودی بەکرێگیراودا ڕابرا.
(وَلِلْمُكْتَرِي) بۆ بەکرێگرەکە دروستە: (اسْتِيفاءُالْمَنْفَعَةِ بِنَفْسِهِ) سودی شتەبەکرێگیراوەکە بە خۆی وەربگرێ، هەم (وَبِغَيْرِهِ) بە کەسێکیتری ئەمینیش وەریبگرێ، چونکە سودەکە بووەتە ملکیخۆی، کەوابو: بۆی دروستە: شتەبەکرێگیراوەکە بەکرێ بداتەوە یەکێکیتر، هەم دروستە: بە خواستنیشی بداتێ، هەروەك لە (المهذب)و (مغنی)دا فەرموویانە.
جا ئەگەر بەکرێگیراوەکە وولاغ بوو، ئەوە (فَيُرْكِبُ) بۆی دروستە کەسێکیتری وەك خۆی سواری وولاغەکە بکا (وَ) هەروەها لە خانووی بەکرێگیراویشدا (يُسْكِنُ مِثْلَهُ) بۆی

وَلاَ يُسَكِّنُ حَدَّاداً وَقَصَّاراً، وَما يُسْتَوْفَى مِنْهُ: كَدارٍ وَدابَّةٍ مُعَيَّنَةٍ لاَ يُبْدَلُ، وَما يُسْتَوْفَى بِهِ: كَثَوْبٍ وَصَبِيٍّ عُيِّنَ لِلْخِياطَةِ وَالإِرْتِضاعِ يَجُوزُ إِبْدالُهُ فِي الأَصَحِّ، وَيَدُالْمُكْتَرِي عَلَى الدَّابَّةِ وَالثَّوْبِ يَدُ أَمانَةٍ مُدَّةَ الإِجارَةِ

---

دروسته: یەكێكی‌تری وەك خۆی تێیدا نیشتەجێ بكا: بە كرێ، یان بە خۆڕایی، بەلاَم (وَلاَ يُسَكِّنُ حَدَّاداً) نابێ ئاسنگرو (وَقَصَّاراً) جلشۆر لە خانووەكەدا نیشتەجێ بكا، ئەگەر بە خۆی لەو چینانە نەبێ.

﴿ **ئاگاداری سەرقوفلانە** ﴾: لە مەرجەكانی بەكرێگرتندا ئاشكرا بوو: ئەوەی‌ڕابردوو لەحالەتێكدا بوو: كە مامڵەتی بەكرێگرتنەكە دروست‌و دامەزراوبێ‌و ماوەی بەكرێگرتنەكەش مابێ، چونكە ئەگەر مامڵەتەكە نادروست بێ –وەك ماوەی بەكرێگرتنەكە دیاری نەكرابێ، یان ماوەی بەكرێگرتنەكە تەواو بوبێ– واجبە بەكرێگراوەكە بداتەوە خاوەنەكەی، واتە: بۆی دروست نیە: نە بە خۆڕایی‌و نە بە كرێ بیداتە كەسێكی‌تر، هەم دروست نیە: مافی بەكرێگرتنەكەشی بفرۆشێتێ، چونكە ملكی‌خۆی نیە، كەواتە: هەركەسێك ئەم جۆرە بەكرێگراوە لە بەكرێگرەكە وەربگرێ، لێی حەرامەو ئەویش بە (غاصب)=زەوتكەر دادەندرێ، چونكە بە مامڵەتێكی نادروست بەكرێگراوەكەی وەرگرتوە، هەروەك لە پێناسەی (غصب)و لە چوارەم مەرجی فرۆشراودا ڕابرا، جا ئەم مامڵەتە ناشەرعی‌یە پێی دەگوترێ: (**سەرقوفلانە**). پێویستە موسوڵمان خۆی لێ‌بپارێزێ.

(وَما يُسْتَوْفَى مِنْهُ) ئەو شتەی سودەكەی لێوەردەگیرێ: (كَدارٍ) وەكو خانوو، هەم (وَدابَّةٍ مُعَيَّنَةٍ) وەكو وولاغێكی دیاركراو (لاَ يُبْدَلُ) دروست نیە: بە شتێكی‌تر بگۆڕدرێ، بەلاَم (وَما يُسْتَوْفَى بِهِ) ئەو شتەی سودەكەی پێ‌وەردەگیرێ: (كَثَوْبٍ وَصَبِيٍّ) وەكو جلێك، یان منداڵێك: كە (عُيِّنَ لِلْخِياطَةِ) جلەكە بۆ دوروین دیاری‌كرابێ‌و (وَالإِرْتِضاعِ) منداڵەكەش بۆ شیرخواردن دیاری‌كرابێ، ئەوە (يَجُوزُ إِبْدالُهُ) دروستە بەكرێگرەكە بە شتێكی‌تری وەك خۆی بیگۆڕێ، هەرچەند بەكرێگیراوەكەش ڕازی نەبێ، واتە: دروستە لە جیاتی ئەم جلە، جلێكی‌تری وەك خۆی پێی بدورووێ‌و لەجیاتی ئەم منداڵە منداڵێكی‌تری وەك خۆی پێی شیر بدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

## ﴿ زامینی بەكرێگرو بەكرێگیراوەكان ﴾

(وَيَدُالْمُكْتَرِي) دەستی مرۆڤی‌بەكرێگر (عَلَى الدَّابَّةِ وَالثَّوْبِ) لە سەر وولاغ‌و جلە بەكرێگیراوەكان‌و لە سەر گشت شتێكی‌تری بەكرێگیراویش (يَدُأَمانَةٍ) دەستی ئەمینداریە (مُدَّةَ الإِجارَةِ) لە ماوەی بەكرێگیرانەكەدا، واتە: ئەگەر لەو ماوەیەدا شتەبەكرێگیراوەكە فەوتا، بەكرێگرەكە نابێتە زامین، بەو مەرجەی كەمتەرخەمی نەكردبێ، كەوابو: واجبە: پاسی زەرەرو زیانی لێ‌بكا، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

وَكَذَا بَعْدَها فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ رَبَطَ دابَّةً إكْتَراها لِحَمْلٍ أَوْ رُكُوبٍ وَلَمْ يَنْتَفِعْ بِها لَمْ يَضْمَنْ، إلاَّ إذا انْهَدَمَ عَلَيْها اصْطَبْلٌ فِي وَقْتٍ لَوِ انْتَفَعَ بِها لَمْ يُصِبْها الْهَدْمُ، وَلَوْ تَلِفَ الْمالُ فِي يَدِ أجِيرٍ بِلاَتَعَدٍّ كَثَوْبٍ اُسْتُؤْجِرَ لِخياطَتِه أَوْ صَبْغِه لَمْ يَضْمَنْ إنْ لَمْ يَنْفَرِدْ بِالْيَدِ بِأَنْ قَعَدَ الْمُسْتَأْجِرُ مَعَهُ أَوْ أَحْضَرَهُ مَنْزِلَهُ، وَكَذَا إنِ انْفَرَدَ فِي أَظْهَرِ الأَقْوالِ،

---

(وكَذَا بَعْدَها) هەروەها لە دوای تەواوبوونی ماوەی بەکرێگیرانەکەش دەستی بەکرێگرەکە هەر دەستی ئەمینداریيە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.
کەوابو: نەگەڕاندنەوەی بەکرێگیراوەکەو نە ئەرکی گەڕاندنەوەی لە سەر بەکرێگرەکە نیە، بەڵکو مەرجە: بۆ خاوەنەکەی بیپارێزێو هەر کاتێك داوای کرد بیداتەوە، هەم نابێ -لە دوای تەواوبوونی ماوەکە- بە کاری بێنێ، ئەگینا: دەبێتە زامِنو کرێی ماوێنەی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.
(ولَوْ رَبَطَ دابَّةً إكْتَراها لِحَمْلٍ أَوْ رُكُوبٍ) ئەگەر بەکرێگرەکە وولاغێکی بەستەوە: کە بۆ بارکردن، یان بۆ سواری، یان بۆ کارێکیتر بە کرێی گرتبو (ولَمْ يَنْتَفِعْ بِها) سودیشی لێوەرنەگرتو وولاغەکە فەوتا، ئەوە (لَمْ يَضْمَنْ) نابێتە زامینی وولاغەکە، جیاوازی نیە: لە ماوەی بەکرێداندا بفەوتێ، یان لە دوای ماوەکە (إلاَّ إذا انْهَدَمَ عَلَيْها اصْطَبْلٌ) مەگەر تەویلە، یان خانوێکی بە سەردا بڕوخێ (فِي وَقْتٍ لَوِ انْتَفَعَ بِها) لە کاتێکی وەهادا: ئەگەر سودی لێوەرگرتبا (لَمْ يُصِبْها الْهَدْمُ) لەو کاتەدا ڕوخانەکەی تووش نەدەبو، ئەوە لەو حاڵەتەدا دەبێتە زامِن ئەگەر هیچ عوزرێکی وەکو ترسو نەخۆشیی نەبێ، واتە: ئەگەر عوزرێکی وەهای هەبو، یان لە کاتێکی وەهادا بە سەریدا ڕوخا: کە عادەت نەبو بە کار بهێندرێ: وەکو تاریکە شەو، ئەو کاتانە نابێتە زامِن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.
(ولَوْ تَلِفَ الْمالُ) ئەگەر ماڵی کەسێك فەوتا (فِي يَدِ أجِيرٍ) لە دەستی بەکرێگیراوێکدا (بِلاَ تَعَدٍّ) فەوتانەکەش بێدوژمنکاریو بێکەمتەرخەمی بوو (كَثَوْبٍ) وەك جلێك لە لای بفەوتێ کە (اُسْتُؤْجِرَ لِخِياطَتِهِ أَوْ صَبْغِهِ) بە کرێ گیرابێ بۆ دوروینی، یان بۆ ڕەنگکردنی، هەم وەك ئاژەڵێك بفەوتێ کە بە کرێ گیرابێ بۆ لەوەڕاندنی، ئەو بەکرێگیراوە (لَمْ يَضْمَنْ) نابێتە زامینی شتە فەوتاوەکە (إنْ لَمْ يَنْفَرِدْ بِالْيَدِ) ئەگەر بە تەنها دەستی بە سەر شتەکەوە نەبێ (بِأَنْ قَعَدَ الْمُسْتَأْجِرُ مَعَهُ) وەك بەکرێگرەکەش لەگەڵی دانیشتبێ (أَوْ أَحْضَرَهُ مَنْزِلَهُ) یان هێنابێتیە ماڵی خۆی.
(وكَذَا إنِ انْفَرَدَ فِي أَظْهَرِ الأَقْوالِ) هەروەها ئەگەر بە تەنهاش بێ، هەر نابێتە زامِن، لە بەهێزترینی فەرموودەکاندا.

وَالثَّالثُ: يَضْمَنُ الْمُشْتَرِكُ: وَهُوَ مَنِ الْتَزَمَ عَمَلاً فِيذمَّته، لاَالْمُنفَرِدُ: وَهُوَ مَنْ آجَرَ نَفْسَهُ مُدَّةً مُعَيَّنَةً لعَمَلٍ، وَلَوْ دَفَعَ ثَوْباً إلَىقَصَّارٍ لِيُقَصِّرَهُ أَوْ خَيَّاطٍ لِيَخِيطَهُ فَفَعَلَ وَلَمْ يَذْكُرْ أُجْرَةً فَلاَ أُجْرَةَ لَهُ، وَقِيلَ لَهُ،

---

(وَالثَّالثُ) به فەرموودەی سێیەم (يَضْمَنُ الْمُشْتَرِكُ) بەكرێگیراویهاوبەش دەبێتە زامین (وَهُوَ) بەكرێگیراویهاوبەش (مَنِ الْتَزَمَ عَمَلاً فِيذمَّتِهِ) ئەو كەسەیە: كە كاركردنێكی خستبێتە ئەستۆیخۆی (لاَالْمُنْفَرِدُ) بەلام بەكرێگیراوی تاك نابێتە زامین (وَهُوَ) بەكرێگیراویتاك (مَنْ آجَرَ نَفْسَهُ مُدَّةً مُعَيَّنَةً لِعَمَلٍ) ئەو كەسەیە: بۆ ماوەیەكی دیاركراو خۆی بە كرێ دابێ: بۆ كاركردنێك.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەو كەسەی بە كرێ گیراوە: بۆ چاودێریو پاسەوانیی دوكانو ماڵو باغو خەرمانو ئوتومبێلو ئەوجۆرە شتانە-ئەگەر دوژمنكاریو كەمتەرخەمی نەكا- نابێتە زامینی فەوتانی ئەو شتانە، هەروەها: گەرماوچیو خانچی نابنە زامینی جلو وولاغی خەڵكی، تەنها ئەگەر پاراستنیان بخەنە ئەستۆی خۆیان، یان كرێی پاراستنیان وەربگرن، ئەو كاتە-ئەگەر كەمتەرخەمی بكەن- دەبنە زامین، هەروەها هەر بەكرێگیراوێكیتریش ئەگەر كەمتەرخەمی، یان دوژمنكاری بكا: وەك ئاژەڵەكە بداتە دەست كەسێكیترو بفەوتێ، یان نانكەر ئاگرێكی زۆر لە بن نان‌دا بكاتەوەو نانەكە بسوتێ، ئەو كاتە ئەویش دەبێتە زامین.

ئینجا بزانە: شوانی شێت، یان نەبالغ-واتە: هەم گشت بەكرێگیراوێكیتری شێت، یان نەبالغ- ئەگەر كەمتەرخەمیش بكا، هەر نابێتە زامینی ماڵەفەوتاوەكە، بەلام ئەگەر دوژمنكاری بكا: وەك بە دەستیخۆی شتەكە بفەوتێنێ، ئەو كاتە ئەویش دەبێتە زامین.

جا هەر كاتێك بەكرێگرەكەو بەكرێگیراوەكە بووە كێشەیان: لەبارەی كەمتەرخەمیو دوژمنكاری، ئەوە-بە سوێندخواردن- باوەڕ بە بەكرێگیراوەكە دەكرێ؟ چونكە ئەمیندارە، بەو مەرجەی دوو كەسی لێزان بە پێچەوانەی قسەكەی وی شاهیدی نەدەن، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)و حاشیەكانیاندا ناوەڕۆكی ئەم ئاگاداریە ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ دَفَعَ ثَوْباً إِلَىقَصَّارٍ لِيُقَصِّرَهُ) ئەگەر جلێكی دایە دەست جلشۆرێك تاكو بیشوا (أَوْ خَيَّاطٍ لِيَخِيطَهُ) یان دایە دەست بەرگدروو تاكو بیدوروێ (فَفَعَلَ) ئەویش كارەكەی كرد (وَلَمْ يَذْكُرْ أُجْرَةً) هیچ لایەك باسی كرێی نەكرد، ئەوە (فَلاَ أُجْرَةَ لَهُ) مافی كرێی نیە، هەروەك ئەگەر بڵێ: مانگێك لە خانووەكەتدا نیشتەجێم بكە، ئەویش نیشتەجێی بكاو باسی كرێش نەكەن، ئەویش مافی كرێی نیە (وَقِيلَ لَهُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: مافی كرێی هاووێنەی هەیە.

وَقِيلَ إِنْ كانَ مَعْرُوفاً بِذَلِكَ الْعَمَلِ فَلَهُ، وَإِلاَّ فَلاَ وَقَدْ يُسْتَحْسَنُ، وَلَوْ تَعَدَّى الْمُسْتَأْجِرُ بِأَنْ ضَرَبَ الدَّابَّةَ أَوْ كَبَحَهَا فَوْقَ الْعادَةِ أَوْ أَرْكَبَها أَثْقَلَ مِنْهُ أَوْ أَسْكَنَ حَدَّاداً أَوْ قَصَّاراً ضَمِنَ الْعَيْنَ، وَكَذَا لَوْ اكْتَرَى لِحَمْلِ مأةِ رِطْلٍ مِنْ حِنْطَةٍ فَحَمَّلَ مأةً شَعِيراً أَوْ عَكَسَ، أَوْ لِعَشْرَةِ أَقْفِزَةِ شَعِيرٍ فَحَمَّلَ حِنْطَةً، دُونَ عَكْسِهِ، وَلَوْ اكْتَرَى لِمأةٍ فَحَمَّلَ مأةً وَعَشَرَةً لَزِمَهُ أُجْرَةُ الْمِثْلِ لِلزِّيادَةِ، وَإِنْ تَلِفَتْ بِذَلِكَ ضَمِنَها إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُها مَعَها، فَإِنْ كانَ ضَمِنَ قِسْطَ الزِّيادَةِ، وَفِي قَوْلٍ نِصْفَ الْقِيمَةِ،

---

(وَقِيلَ إِنْ كانَ مَعْرُوفاً بِذَلِكَ الْعَمَلِ) لە فەرموودەیەكدا: ئەگەر مرۆڤەكە بەو كارە ناسراو بێ: كە بە كرێ دەیكا، ئەوە (فَلَهُ) مافی كرێی هاوێنەی هەیە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر وەها نە ناسرابێ (فَلاَ) مافی كرێی نیە (وَقَدْ يُسْتَحْسَنُ) وا جوانە ئەم فەرموودە سێیەمە بەهێز بكرێ، هەم زۆر لە زانایان هەڵیانبژاردووەو فتوایان پێداوە.

(وَلَوْ تَعَدَّى الْمُسْتَأْجِرُ) ئەگەر بەكرێگرەكە دوژمنكاریی كرد (بِأَنْ ضَرَبَ الدَّابَّةَ) وەك لە عادەت زیاتر لە وڵاغەكەی دابێ (أَوْ كَبَحَهَا فَوْقَ الْعادَةِ) یان لغاوەكەی لە دەمی داوە لە عادەت زیاتر (أَوْأَرْكَبَها أَثْقَلَ مِنْهُ) یان یەكێكی لە خۆی گرانتر سواری وڵاغەكەی كرد (أَوْ أَسْكَنَ حَدَّاداً أَوْقَصَّاراً) یان ئاسنگرێك، یان جلشۆرێكی لە خانووەكەدا نیشتەجێ كرد، ئەوە (ضَمِنَ الْعَيْنَ) دەبێتە زامینی خودی بەكرێگیراوەكە.

(وَكَذَا) هەروەها دەبێتە زامین (لَواكْتَرَى لِحَمْلِ مأةِرِطْلٍ مِنْ حِنْطَةٍ) ئەگەر وڵاغەكەی بە كرێ گرتبێ بۆ باركردنی سەد ڕیتل گەنم (فَحَمَّلَ مأةً شَعِيراً) ئینجا ئەویش سەد ڕیتل جۆی لێ بار كرد (أَوْ عَكَسَ) یان بە پێچەوانەی كرد، هەر دەبێتە زامین، چونكە جۆیەكە زۆرتر لە پشتی وڵاغەكە دەگرێو گەنمەكەش گرانایییەكەی لە یەك شوێندا كۆدەبێتەوە (أَوْ لِعَشْرَةِ أَقْفِزَةِ شَعِيرٍ) یان بە كرێی گرت بۆ باركردنی دە كەویشكە جۆ (فَحَمَّلَ حِنْطَةً) ئەویش دە كەویشكە گەنمی لێ بار كردن، ئەوەش دەبێتە زامین (دُونَ عَكْسِهِ) بەڵام بە پێچەوانەوە نابێتە زامین، چونكە جۆ سوكترە.

(وَلَو اكْتَرَى لِمأةٍ) ئەگەر وڵاغەكەی بەكرێ گرت بۆ باركردنی سەد كیلۆ (فَحَمَّلَ مأةً وَعَشَرَةً) ئەویش سەدو دە كیلۆی لێ بار كرد، ئەوە (لَزِمَهُ أُجْرَةُ الْمِثْلِ لِلزِّيادَةِ) كرێی هاوێنەی بۆ ئەو دە كیلۆ زیادەیەش لە سەر واجب دەبێ، هەم (وَإِنْ تَلِفَتْ بِذَلِكَ) ئەگەر وڵاغەكە بە هۆی ئەو دە كیلۆ زیادەیە فەوتا، ئەو كاتە (ضَمِنَها إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُها مَعَها) بەكرێگرەكە دەبێتە زامینیوڵاغەكە ئەگەر خاوەنەكەی لەگەڵدا نەبێ (فَإِنْ كانَ) جا ئەگەر خاوەنەكەی لەگەڵدا بوو، ئەو كاتە (ضَمِنَ قِسْطَ الزِّيادَةِ) بە بەشی زێدەییەكە دەبێتە زامینی وڵاغەكە (وَفِي قَوْلٍ نِصْفَ الْقِيمَةِ) لە فەرموودەیەكدا: بە نیوەی نرخەكەی دەبێتە زامین.

وَلَوْ سَلَّمَ الْمأَةَ وَالْعَشَرَةَ إلَى الْمُؤَجِّرِ فَحَمَّلَها جاهِلاً ضَمِنَ الْمُكْتَرِى عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ وَزَنَ الْمُؤَجِّرُ وَحَمَّلَ فَلاَ أُجْرَةَ لِلزِّيادَةِ، وَلاَضَمانَ إنْ تَلِفَتْ، وَلَوْ أَعْطاهُ ثَوْباً لِيَخِيطَهُ فَخاطَهُ قَباءً وَقالَ: أَمَرْتَنِى بِقَطْعِهِ قَباءً، فَقالَ: بَلْ قَمِيصاً، فَالأَظْهَرُ تَصْدِيقُ الْمالِكِ بِيَمِينِهِ، وَلاَ أُجْرَةَ عَلَيْهِ، وَعَلَى الْخَيَّاطِ أَرْشُ النَّقْصِ.

(فَصْلٌ) لاَ تَنْفَسِخُ الإِجارَةُ بِعُذْرٍ: كَتَعَذُّرِ وَقُودِ حَمَّامٍ وَسَفَرٍ وَمَرَضِ مُسْتَأْجِرِ دابَّةٍ لِسَفَرٍ،

---

(وَلَوْسَلَّمَ الْمأَةَ وَالْعَشَرَةَ إلَى الْمُؤَجِّرِ) جا ئەگەر سەدو دە کیلۆیەکەی تەسلیمی بەکرێدەرەکە کرد (فَحَمَّلَهاجاهِلاً) ئەویش لە وولاغەکەی بار کردو نەیزانی دە کیلۆ زیادە، ئەو کاتە (ضَمِنَ الْمُكْتَرِى عَلَى الْمَذْهَبِ) بەکرێگرەکە بە بەشە زێدەبییەکە دەبێتە زامینی وولاغەکە، بەڵام (وَلَوْ وَزَنَ الْمُؤَجِّرُ) ئەگەر بەکرێدەرەکە بارەکەی کێشاو زانی چەندەو (وَحَمَّلَ) بە بێ ئیزن لە وولاغەکەی بار کرد (فَلاَ أُجْرَةَ لِلزِّيادَةِ) ئەو کاتە مافی کرێی زێدەبییەکەی نیە، هەم (وَلاَضَمانَ إنْ تَلِفَتْ) بەکرێگرەکەش نابێتە زامین ئەگەر وولاغەکە بفەوتێ، بەڵکو بەکرێگرەکە مافی هەیە داوای لێبکا: زێدەبییەکە بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی.

(وَلَوْ أَعْطاهُ ثَوْباً لِيَخِيطَهُ) ئەگەر پارچە قوماشێکی دایێ تاکو بیدوورێ (فَخاطَهُ قَباءً) ئەویش دووری و کردیە کەوا (وَقالَ أَمَرْتَنِى بِقَطْعِهِ قَباءً) گوتی: تۆ فەرمانت پێ کردم بیکەمە کەوا (فَقالَ: بَلْ قَمِيصاً) خاوەنەکەش گوتی: نا، بەڵکو گوتبوم بیکە کراس. هیچ شاهیدیش نەبو، ئەوە (فَالأَظْهَرُ تَصْدِيقُ الْمالِكِ بِيَمِينِهِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: بە سوێندخواردن باوەڕ بە خاوەنەکە دەکرێ، ئینجا کە سوێندی خوارد (وَلاَ أُجْرَةَ عَلَيْهِ) کرێی دوورینەکەشی لە سەر نیە، بەڵکو (وَعَلَى الْخَيَّاطِ أَرْشُ النَّقْصِ) واجبە بەرگدرووەکە تۆڵەی ناتەواویش بداتە خاوەنەکەی.

ئینجا بزانە: ئەگەر بەرگدرووەکە جلێکی هێناو گوتی: ئەمە جلەکەی تۆیە. خاوەنەکەش گوتی: ئەمە جلەکەی من نیە. ئەو کاتە بە سوێندخواردن باوەڕ بە بەرگدرووەکە دەکرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتی بەکرێدان ﴾

(لاَ تَنْفَسِخُ الإِجارَةُ بِعُذْرٍ) مامڵەتی بەکرێدان بە هۆی پەیدابوونی عوزرێك هەڵناوەشێتەوە (كَتَعَذُّرِ وَقُودِحَمَّامٍ) وەك دەستنەکەوتنی سووتەمەنیی گەرماو: وەکو نەفتو دار، یان وەك دەستنەکەوتنی سووتەمەنیی ئۆتومبێل: وەکو گازو بەنزین، هەم (وَسَفَرٍ) وەکو سەفەر، واتە: بۆی نەگونجێ بە سواری وولاغەکە بڕواتە سەفەر، یان سەفەری تووش بێ و بۆی نەگونجێ سود لە بەکرێگیراوەکە وەربگرێ (وَمَرَضِ مُسْتَأْجِرِ دابَّةٍ لِسَفَرٍ) هەم وەك نەخۆشبوونی بەکرێگری وولاغەکە بۆ سەفەر، واتە: بە هۆی ئەو عوزرانە مامڵەتەکە هەڵناوەشێتەوە.

وَلَوْ اسْتَأْجَرَ أَرْضاً لِزِراعَةٍ فَزَرَعَ فَهَلَكَ الزَّرْعُ بِجائِحَةٍ فَلَيْسَ لَهُ الْفَسْخُ وَلاَ حَطُّ شَيْءٍ مِنَ الأُجْرَةِ، وَتَنْفَسِخُ بِمَوْتِ الدَّابَّةِ وَالأَجِيرِ الْمُعَيَّنَيْنِ فِي الْمُسْتَقْبَلِ لاَ الْمَاضِي فِي الأَظْهَرِ، فَيَسْتَقِرُّ قِسْطُهُ مِنَ الْمُسَمَّى، وَلاَ تَنْفَسِخُ بِمَوْتِ الْعاقِدَيْنِ وَمُتَوَلِّي الْوَقْفِ، وَلَوْ آجَرَ الْبَطْنُ الأَوَّلُ مُدَّةً وَماتَ قَبْلَ تَمامِها، أَوِ الْوَلِيُّ صَبِيّاً مُدَّةً لاَ يَبْلُغُ فِيها بِالسِّنِّ فَبَلَغَ بِالإِحْتِلاَمِ

---

(وَلَوْ اسْتَأْجَرَ أَرْضاً لِزِراعَةٍ) ئەگەر زەویەکی بە کرێ گرت بۆ چاندنی کشتوکاڵێك (فَزَرَعَ) ئینجا کشتوکاڵەکەشی تێدا چاند (فَهَلَكَ الزَّرْعُ بِجائِحَةٍ) کشتوکاڵەکەش بە هۆی ڕوداوێك لەناو چوو: وەك کلۆ و لافاو و سەرما، ئەوە (فَلَيْسَ لَهُ الْفَسْخُ) مافی هەڵوەشاندەوەی نیەو هەم (وَلاَ حَطُّ شَيْءٍ مِنَ الأُجْرَةِ) مافی داشکاندنی هیچ بەشێکی کرێیەکەشی نیە، چونکە ڕوداوەکە تووشی خودیزەویە بەکرێگیراوەکە نەبوە، واتە: ئەگەر خودیبەکرێگیراوەکە -بە هۆی ڕودلوەکە- فەوتا، یان کەڵکی سودلێوەرگرتنی نەما، ئەو کاتە -بۆ ماوەیداهاتوو- مامڵەتەکە هەڵدەوەشێتەوە، هەروەك لە (مغنی)و (القلیوبی)دا فەرموویانە.

(وَتَنْفَسِخُ) مامڵەتی بەکرێدان هەڵدەوەشێتەوە (بِمَوْتِ الدَّابَّةِ) بە هۆی مردنی وولاغە بەکرێگیراوەکە، هەم (وَالأَجِيرِ) بە هۆی مردنی مرۆڤیبەکرێگیراو بۆ کارکردنێك: کە (الْمُعَيَّنَيْنِ) وولاغەکەو مرۆڤەکە هەردووکیان دیارکراو بن، ئینجا هەڵوەشانەوەکەش: (فِي الْمُسْتَقْبَلِ لاَ الْمَاضِي) لە ماوەیداهاتوودا، نەك ماوەیڕابردوودا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەواتە: (فَيَسْتَقِرُّ قِسْطُهُ مِنَ الْمُسَمَّى) بەشەکرێیەکەی ماوەیڕابردوو جێگیر دەبێ: لە کۆی هەموو کرێیەکەی ناوبراو:

بۆ وێنە: ئەگەر ماوەی بەکرێدانەکە ساڵێك بێو لە نیوەیساڵدا بەکرێگیراوەکە فەوتا، ئەوە ئەگەر بەشە کرێیەکەی نیوەیڕابردوو دوو هەندەی ماوەیداهاتوو بوو، واجبە: دوو بەشیکرێیەکەی بۆ ماوەیڕابردوو دابندرێ، لە نیوەیداهاتووشدا هەڵدەوەشێتەوەو هیچی بۆ داناندرێ.

(وَلاَ تَنْفَسِخُ بِمَوْتِ الْعاقِدَيْنِ) مامڵەتی بەکرێدان هەڵناوەشێتەوە بە هۆی مردنی بەکرێدەرو بەکرێگر، یان تەنها یەکێکیان (وَمُتَوَلِّي الْوَقْفِ) هەروەها بە هۆی مردنی سەرپەرشتکاری وەقفەکەش هەڵناوەشێتەوە.

(وَلَوْ آجَرَ الْبَطْنُ الأَوَّلُ مُدَّةً) ئەگەر چینی یەکەمی وەقف بۆسەرکراوەکان وەقفکراوەکەیان بۆ ماوەیەکی دیارکراو بە کرێ دا (وَماتَ قَبْلَ تَمامِها) چینەکەش پێش تەواوبوونی ماوەکە مرد (أَوِالْوَلِيُّ صَبِيّاً) یان سەرپەرشتکار منداڵێکی بە کرێ دا، یان ماڵی منداڵەکەی بە کرێ دا، یان ماڵی شێتێکی بە کرێ دا (مُدَّةً لاَ يَبْلُغُ فِيها بِالسِّنِّ) بۆ ماوەیەکی وەها: کە -بە ساڵ- بلۆغی نەدەبو لەو ماوەیەدا (فَبَلَغَ بِالإِحْتِلاَمِ) ئینجا ئەویش بە (مَنِي)هاتن

فَالأَصَحُّ انْفِساخُها فِي الْوَقْفِ لاَ الصَّبِيِّ، وَأَنَّها تَنْفَسِخُ بِانْهِدامِ الدَّارِ، لاَ انْقِطاعِ مـاءِ أَرْضٍ اُسْتُؤْجِرَتْ لِزِراعَةٍ، بَلْ يَثْبُتُ الْخِيارُ، وَغَصْبُ الدَّابَّةِ وَإِباقُ الْعَبْدِ يُثْبِـتُ الْخِيـارَ، وَلَـوْ أَكْرَى جِمالاً وَهَرَبَ وَتَرَكَها عِنْدَ الْمُكْتَرِي راجَعَ الْقاضِيَ لِيَمُونَها مِنْ مالِ الْجَمَّالِ، فَـإِنْ لَمْ يَجِدْ لَهُ مالاً اقْتَرَضَ عَلَيْهِ، فَإِنْ وَثِقَ بِالْمُكْتَرِي دَفَعَهُ إِلَيْهِ، وَإِلاَّ جَعَلَهُ عِنْدَ ثِقَةٍ، وَلَهُ

---

بلۆغی بوو، یان شێتەکە چاك بۆوە، ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (انْفِساخُها فِي الْوَقْفِ) بەکرێدانەکە -بۆ ماوەیداهاتوو- لە مەسەلەی وەقفەکەدا هەڵدەوەشێتەوە (لاَ الصَّبِيِّ) بەڵام لە مەسەلەی منداڵەکەو شێتەکەدا هەڵناوەشێتەوە.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّها تَنْفَسِخُ بِانْهِدامِ الدَّارِ) مامڵەتی بەکرێدان -بۆ ماوەی داهاتوو- هەڵدەوەشێتەوە: بە هۆی ڕوخانی هەموو خانووە بەکرێدراوەکە، بەڵام ئەگەر بەشێکی خانووەکە ڕوخاو خاوەنەکەی بە پەلە چاکی نەکردەوە، ئەو کاتە بەکرێگرەکە مافی پەشیمانی‌ی هەیە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(لاَ انْقِطاعِ ماءِ أَرْضٍ اُسْتُؤْجِرَتْ لِزِراعَةٍ) بەڵام بە هۆی بڕانی ئاوی زەویەکی‌بەراو-کە بۆ کشتوکاڵ بە کرێ گیرابێ- بەکرێدانەکە هەڵناوەشێتەوە (بَلْ يَثْبُتُ الْخِيارُ) بەڵکو بە هۆی ئاوبڕانەکە بەکرێگرەکە مافی پەشیمانبوونەوەی هەیە، ئەگەر بەکرێدەرەکە لە لایەکی‌تر بە پەلە ئاوی بۆ پەیدا نەکا (وَ) هەروەها (غَصْبُ الدَّابَّةِ) زەوتکردنی ووڵاغە بەکرێگیراوەکەو (وَإِباقُ الْعَبْدِ) هەڵاتنی کۆیلەبەکرێگیراوەکە (يُثْبِتُ الْخِيارَ) هەر یەکێك لەوانە مافی پەشیمانی بۆ بەکرێگرەکە جێگیر دەکەن، ئەگەر بە پەلە زەوتکراوەکە وەرنەگرێتەوە، چونکە لەو حاڵەتەدا ناگونجێ سودی لێوەربگرێ.

(وَلَوْ أَكْرَى جِمالاً) ئەگەر چەند ووشترێکی بە کرێ دانە کەسێك، ئینجا (وَهَرَبَ وَتَرَكَها عِنْدَ الْمُكْتَرِي) بەکرێدەرەکەش هەڵاتو ووشترەکانی لە لای‌بەکرێگرەکە بەجێ هێشتن، ئەو کاتە ئەگەر بەکرێگرەکە بە خۆی بەخێویان نەکا (راجَعَ الْقاضِيَ لِيَمُونَها مِنْ مالِ الْجَمَّالِ) دەچێتە لای قازی تاکو ووشترەکان بە ماڵی‌ووشترەوانەکە بەخێو بکا (فَإِنْ لَمْ يَجِدْ لَهُ مالاً) جا ئەگەر قازی -جگە لەو ووشترانە- هیچ ماڵی‌تری ووشترەوانەکەی دەست نەکەوت، ئەوە (اقْتَرَضَ عَلَيْهِ) بۆ بەخێوکردنی ووشترەکان قازی هەندێك ماڵ لە سەر حیسابی ووشترەوانەکە قەرز دەکا.

ئینجا (فَإِنْ وَثِقَ بِالْمُكْتَرِي دَفَعَهُ إِلَيْهِ) ئەگەر قازی باوەڕی بە بەکرێگرەکە هەبو، ئەوە ماڵەقەرزکراوەکەی دەداتە دەست تاکو ووشترەکانی پێ بەخێو بکا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر باوەڕی بە بەکرێگرەکە نەبو، ئەو کاتە (جَعَلَهُ عِنْدَ ثِقَةٍ) ماڵەقەرزکراوەکە لە لای باوەڕپێکراوێك دادەنێ، تاکو لە بەخێوکردنی ووشترەکان خەرجی بکا (وَلَهُ) هەم بۆ قازی

أَنْ يَبِيعَ مِنها قَدْرَ النَّفَقَة، وَلَوْ أذنَ لِلْمُكْتَرِى فِي الإِنْفاقِ مِنْ مالِه لِيَرْجِعَ جازَ فِي الأَظْهَرِ، وَمَتَى قَبَضَ الْمُكْتَرِى الدَّابَّةَ أوالدَّار وَأَمْسَكَها حَتَّى مَضَتْ مُدَّةُ الإجارَة اسْتَقَرَّت الأُجْرَةُ وَإِنْ لَمْ يَنْتَفِعْ، وَكَذا لَوْ اكْتَرى دابَّةً لِرُكُوب إلَى مَوْضِعٍ وَقَبَضَها وَمَضَتْ مُدَّةُ إمْكان السَّيْر إِلَيْه، وَسَواءٌ فيه إجارَةُ الْعَيْنِ وَالذِّمَّة إِذا سَلَّمَ الدَّابَّةَ الْمَوْصُوفَة، وَتَسْتَقِرُّ فِي الإِجارَةِ الْفاسِدَة أُجْرَةُ الْمِثْلِ بِما يَسْتَقِرُّ بِه الْمُسَمَّى فِي الصَّحِيحَة،

---

دروسته: (أَنْ يَبِيعَ مِنها قَدْرَ النَّفَقَةِ) به ئەندازەی ئەرکی بەخێوکردنی ووشترەکان بەشێك لە ووشترەکان بفرۆشێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ أذنَ لِلْمُكْتَرِى فِي الإِنْفاقِ مِنْ مالِه) ئەگەر قازی ئیزن بدا بەکرێگرەکە لە ماڵیخۆی ووشترەکان بەخێو بکا (لِيَرْجِعَ) تاکو ئەرکی بەخێوکردنەکە لە خاوەنەکەیان وەربگرێتەوە (جازَ) ئەوەش دروستە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، جا ئەگەر بەکرێگرەکە قازیی دەست نەکەوت، ئەو کاتە شاهید دەگرێ: کە لە سەر حیسابی خاوەنەکەیان -بە ماڵیخۆی- بەخێویان دەکا، تاکو بتوانێ ئەرکی بەخێوکردن وەربگرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَتَى قَبَضَ الْمُكْتَرِى الدَّابَّةَ أوالدَّار) هەر کاتێك بەکرێگرەکە وولاغەکە، یان خانووە بەکرێدراوەکەی وەرگرت، یان هەر شتێکیتری بەکرێدراوی وەرگرت (وَأَمْسَكَها حَتَّى مَضَتْ مُدَّةُ الإجارَة) بەکرێگراوەکەشی لە لایخۆی هێشتەوە تا ماوەی بەکرێدانەکە تەواو بوو، ئەوە (اسْتَقَرَّت الأُجْرَةُ) کرێیەکەی لە سەر جێگیر دەبێ (وَإِنْ لَمْ يَنْتَفِعْ) هەرچەند سودیشی لێوەرنەگرتبێ، جیاوازی نیە: بە قەسدی سودی لێوەرنەگرتبێ، یان عوزرێکی وەك ترسو نەخۆشیی هەبوبێ (وَكَذا) هەروەها کرێیەکەی لە سەر جێگیر دەبێ (لَوِ اكْتَرى دابَّةً لِرُكُوبٍ إلَى مَوْضِعٍ) ئەگەر وولاغێکی بۆ سواری بەکرێ گرتبو بۆ شوێنێك (وَقَبَضَها) وولاغەکەشی وەرگرت (وَمَضَتْ مُدَّةُ إمْكانِ السَّيْرِ إِلَيْه) ماوەیەکیوەهاش بەسەر چوو: کە دەگونجا بڕواتە شوێنەکە، بەڵام نەڕۆیشت.

(وَسَواءٌ فيه) جیاوازی نیەو یەکسانە: لە هەر یەکێك لەو دوو مەسەلانەیڕابردوودا (إجارَةُ الْعَيْنِ وَالذِّمَّة) بەکرێدانی خودیشتێك و بەکرێدانی لە ئەستۆ (إِذا سَلَّمَ الدَّابَّةَ الْمَوْصُوفَة) هەر کاتێك بەکرێدەرەکە وولاغەباسکراوەکە تەسلیمی بەکرێگرەکە بکا.

(وَتَسْتَقِرُّ فِي الإِجارَةِ الْفاسِدَة أُجْرَةُ الْمِثْلِ) لە بەکرێدانی نادروستدا -کە مەرجێکی ناتەواو بێ- کرێی هاوێنە جێگیر دەبێ (بِما يَسْتَقِرُّ بِه الْمُسَمَّى فِي الصَّحِيحَة) بەو هۆیانەی کرێی ناوبراو لە بەکرێدانیدروستبوودا جێگیر دەبو، جا لە بەکرێدانینادروستیشدا جیاوازی نیە: سودی لێوەرگرتبێ، یان نا، واتە: چونکە بەکرێدانی نادروستیش هەمان بڕیاری بەکرێدانی

وَلَوْ أَكْرَى عَيْناً مُدَّةً وَلَمْ يُسَلِّمْها حَتَّى مَضَتْ انْفَسَخَتْ، وَلَوْ لَمْ يُقَدِّرْ مُدَّةً وَآجَرَ لِرُكُـوب إلَى مَوْضِعٍ وَلَمْ يُسَلِّمْها حَتَّى مَضَتْ مُدَّةُ السَّيْرِ فَالأَصَحُّ أَنَّها لاَ تَنْفَسِخُ، وَلَوْ آجَرَ عَبْدَهُ ثُـمَّ أَعْتَقَهُ فَالأَصَحُّ أَنَّها لاَ تَنفَسِخُ الإجارَةُ وَأَنَّهُ لاَ خِيارَ لِلْعَبْد، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَيَرْجِـعُ عَلَى سَـيِّدِهِ بِأُجْرَة مابَعْدَالْعِتْقِ، وَيَصِحُّ بَيْعُ الْمُسْتَأْجَرَة لِلْمُكْتَرِى، وَلاَ تَنْفَسِخُ الإجارَةُ فِي الأَصَحِّ،

---

دروستبووی بۆ دەدرێ، بەڵام لەوەدا جیاوازن: لـە دروسـتبووەکەدا کرێی ناوبراو جێگیر دەبێ، لە نادروستەکەدا کرێی هاوێنە جێگیر دەبێ.

بەڵام ئەگەر بەکرێدانەکە لە بنچینەدا (باطل)=دانەمەزراو بوو: وەك منداڵێك مرۆڤێکی بـالغ بە کرێ بگرێو کـارێکی پێبکـا، ئـەوە مـافی هـیچ کرێیەکی نیـە، هـەروەك لـە (مغنـی)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ أَكْرَى عَيْناً مُدَّةً) ئەگەر خودی شتێکی بۆ ماوەیەکی دیارکراو بە کـرێ دا (وَلَـمْ يُسَلِّمْها حَتَّى مَضَتْ) شتەکەشی تەسلیمی بەکرێگرەکە نەکرد تا ماوە دیارکراوەکە تەواو بـوو، ئـەو کاتـە (انْفَسَخَتْ) بەکرێدانەکـە هەڵدەوەشێتەوە، چـونکە پـێش وەرگـرتن کـاتی سـودەکە فەوتاوە.

بەڵام (وَلَوْ لَمْ يُقَدِّرْ مُدَّةً) ئەگەر لەو بەکرێدانەدا ماوەی دیـار نـەکردبێو (وَآجَـرَ لِرُكُـوبٍ إلَـى مَوْضِعٍ) بەکرێی دابـێ بـۆ سـواری تـا شـوێنێکی دیـارکراو (وَلَـمْ يُسَلِّمْها حَتَّـى مَضَتْ مُدَّةُ السَّيْرِ إلَيْهـا) وولاغەکەشـی تەسـلیمی بەکرێگرەکـە نـەکرد، تـا مـاوەی ڕۆیشـتن بـۆ شـوێنە دیارکراوەکـە بەسـەر چـوو، ئـەوە (فَالأَصَحُّ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّهـا لاَ تَنْفَسِـخُ) بەکرێدانەکە هەڵناوەشێتەوە، چونکە پەیوەندی بە کاتەوە نیـەو شـوێنی سـودەکەش هـەر ماوە.

(وَلَوْ آجَرَ عَبْدَهُ) ئەگەر کۆیلەکـەی خـۆی بـەکرێ دا (ثُمَّ أَعْتَقَهُ) ئینجـا ئـازادی کـرد، ئـەوە (فَالأَصَحُّ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّهـا لاَ تَنْفَسِـخُ الإجـارَةُ) بەکرێدانەکـە هەڵناوەشـێتەوە (وَأَنَّهُ لاَ خِيارَ لِلْعَبْدِ) کۆیلەکەش مافی پەشیمانیی نیە لـە دوای ئـازادبوونی، کەواتـە: هـەر بـە بەکرێـدراوی دەمێنێتـەوە تـا مـاوەی بەکرێدانەکـە تـەولو دەبـێ، بـەڵام (وَالأَظْهَرُ) بـە فـەرموودەی بـەهێزتر: (أَنَّـهُ لاَيَرْجِـعُ عَلَى سَيِّدِهِ) کۆیلـە ئازادکراوەکـە ناگەڕێتـەوە سـەر گەورەکـەی خـۆی، واتـە: (بِـأُجْرَةِ مـا بَعْدَالْعِتْقِ) کـرێی دوای ئـازادبوونی لـە گەورەکـەی وەرناگرێتەوە، کەوابو: تا ماوەی بەکرێدانەکە تەولو دەبێ، لە (بیت المال)، یـان لـە لایـەن دەوڵەمەندەکان بەخێو دەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَصِحُّ بَيْعُ الْمُسْتَأْجَرَةِ لِلْمُكْتَرِى) دروسـتە شـتی بەکرێـدراو بفرۆشـێتە بەکرێگرەکـە، پـێش ئـەوەی مـاوەی بەکرێدانەکە تـەواو ببـێ (وَلاَ تَنْفَسِـخُ الإجـارَةُ) بـەو فرۆشـتنە بەکرێدانەکـە هەڵناوەشێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَــوْ باعَهـا لِغَيْـرِهِ جـازَ فِـي الأَظْهَـرِ وَلاَ تَنْفَسِـخُ.

(كتابُ إحْياءِ الْمَوات)

اَلأَرْضُ الَّتِي لَمْ تُعمَّرْ قَطُّ إنْ كانَتْ بِبِلاَدِالإِسْلاَمِ فَلِلْمُسْلِمِ تَمَلُّكُها بالإِحْياءِ، وَلَيْسَ هُـوَ لِذِمِّيٍّ، وَإنْ كانَتْ بِبِلاَدِ كُفَّارٍ

---

(وَلَوْ باعَها لِغَيْرِهِ) ئەگەر شتە بەکرێنراوەکەی فرۆشتە کەسێکی‌تری-جگە لە بەکرێگرەکە- ئـەوەش (جـازَ فِيالأَظْهَـرِ) لـە فـەرموودەی بـەهێزتردا: دروسـتە، هـەم (وَلاَ تَنْفَسِـخُ) بـەو فرۆشـتنەش بەکرێدانەکـە هەڵناوەشـێتەوە، کەواتـە: لـە هـەردوو مەسـەلەکەدا-تـا مـاوەی بەکرێدانەکـە تـەولو دەبـێ- شـتە فرۆشـراوەکە لـە دەسـتی بەکرێگرەکـەدا دەمێنێتـەوە، کرێیەکەشی-لەو ماوەیەدا- هەر بۆ بەکرێدەرەکەیە، واتە: هیچی بۆ کڕیارەکە نیە.

بەڵام ئەگەر کڕیارەکە نـەیزانیبو بـە کـرێ دراوە، یـان زانیبـوی بـەڵام وا تێگەیشـتبو: کـرێی ئەو ماوەیە بۆ خۆیەتی-چونکە شارەزا نەبو- ئەو کاتە مافی پەشیمانی هەیـە، هـەروەك لـە زۆریەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ پاشـكۆ ﴾: ئەگـەر بەکرێدەرەکـەو بەکرێگرەکـە بـووە کێشـەیان: لـە بـاری ئەنـدازەی کرێیەکە، یان لە ئەندازەی ماوەکـە، یـان لـە ئەنـدازەی بەکرێنراوەکـە، یـان لـە ئەنـدازەی سود لێوەرگرتنەکە، ئەوە لێرەشدا-وەك کێشـەی کڕیـارو فرۆشـیار- هـەردووکیان سـوێند بـۆ یـەکتری دەخـۆن، ئینجـا بەکرێدانەکـە هەڵدەوەشـێتەوەو کرێی‌هاووێنـەش لـە سـەر بەکرێگرەکە واجب دەبێ: بۆ ئـەو ماوەیـەی کـە سـودەکەی وەرگرتـوە، هـەروەك لـە (فـتح المعین)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ كِتابُ إحْياءِ الْمَواتِ: **پەرتوکی زیندووکردنەوەی زەمینی مردوو** ﴾

واتە: ئاوەدانکردنەوەی زەمینێکی وەها کە هیچ کاتێك ملکی هـیچ کەسێك نـەبوبێ‌و مـافی هیچ کەسێکی بە سەرەوە نەبێ. پێغەمبـەرﷺدەفـەرموێ: ﴿مَنْ عَمَّرَ أَرْضاً لَيْسَتْ لأَحَـدٍ فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا﴾ رواه البخاري، هەر کەسێك زەمینێك ئاوەدان بکاتەوە کـە مـافی کەسـی تـێدا نەبێ، ئەوە دەبێتە ملکی خۆی.

(اَلأَرْضُ الَّتِـي لَـمْ تُعَمَّـرْ قَـطُّ) ئـەو زەمینـەی هـیچ کاتێـك ئـاوەدان نـەکراوەو مـافی هـیچ ئاوەدانیەکیشی تێدا نیە (إنْ كانَتْ بِبِلاَدِالإِسْلاَمِ) ئەگەر لـە وڵاتـەکانی ئیسلامدابێ، ئـەوە (فَلِلْمُسْـلِمِ تَمَلُّكُهـا بِالإِحْيـاءِ) بـۆ مرۆڤـی موسـوڵمان دروسـتە بیکاتـە ملکی‌خـۆی بـە ئاوەدانکردنەوەی زەمینەکە، هەرچەند کاربەدەستی موسوڵمانانیش ئیزنی نەدا.

بـەڵام (وَلَـيْسَ هُـوَ لِـذِمِّيٍّ) ئـەو ئاوەدانکردنەوەیـە بـۆ جولەکـەو دیـان‌و مەگوشـی پـەیمان لەئەستۆ دروست نیە (وَإنْ كانَتْ بِبِلاَدِ كُفَّارٍ) ئەگەر زەمـینەکە لە وڵاتی کافـراندا بـێ، ئـەو

فَلَهُمْ إِحْيَاؤُها، وَكَذَا لِلْمُسْلِمِ إِنْ كانَتْ مِمَّا لاَيَذُبُّونَ الْمُسْلِمِينَ عَنْها، وَما كانَ مَعْمُوراً فَلِمالِكِه، فَإِنْ لَمْ يُعْرَفْ وَالْعِمارَةُ إِسْلاَمِيَّةٌ فَمالٌ ضائِعٌ، وَإِنْ كانَتْ جاهِلِيَّةً فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُمْلَكُ بِالإِحْياءِ، وَلاَ يُمْلَكُ بِالإِحْياءِ حَرِيمُ مَعْمُورٍ، وَهُوَ ما تَمَسُّ الْحاجَةُ إِلَيْهِ لِتَمامِ الإِنْتِفاعِ، فَحَرِيمُ الْقَرْيَةِ: اَلنَّادِي وَمُرْتَكَضُ الْخَيْلِ

---

کاته (فَلَهُمْ إِحْياؤُها) بۆ کافران دروسته: زیندووی بکەنەوه (وَكَذَا لِلْمُسْلِمِ) هەروەها بۆ موسوڵمانیش دروسته (إِنْ كانَتْ مِمَّا لاَيَذُبُّونَ الْمُسْلِمِينَ عَنْها) بەو مەرجەی کافرەکان موسوڵمانان لەو شوێنە دەرنەکەن، واته: ئەگەر موسوڵمانیان لەو شوێنە دەردەکرن، ئەو کاته دروست نیه موسوڵمان ئاوەدانی بکاتەوه.

(وَما كانَ مَعْمُوراً) هەر زەمینێك –لە ڕابردوودا– ئاوەدان بووبێ‌و ئێستا وێران بێ، ئەوه (فَلِمالِكِهِ) هەر بۆ خاوەنەکەی‌خۆیەتی، جا ئەگەر نەمابو، ئەو کاته بۆ میراتگرەکەیەتی، جیاوازی نیه: خاوەنەکەی موسوڵمان بێ، یان کافر (فَإِنْ لَمْ يُعْرَفْ) جا ئەگەر نەزانرا خاوەنەکەی کێیه (وَالْعِمارَةُ إِسْلاَمِيَّةٌ) ئاوەدانیەکەش ئاوەدانیەکی ئیسلامی بوو: وەك نیشانەیەکی ئیسلامی تێدا بێ، ئەو کاته (فَمالٌ ضائِعٌ) زەمینەکە ماڵێکی لە دەستچووەو دەکەوێتە دەست کاربەدەستی موسوڵمانان، واته: ئەگەر ئومێدی ئاشکرابوونی خاوەنەکەی هەبێ، ئەوه زەمینەکەی بۆ دەپارێزێ، یان دەیفرۆشێ‌و پارەکەی بۆ دەپارێزێ، یان به قەرز دەیداته (بَيْتُ الْمال)، بەڵام ئەگەر ئومێدی ئاشکرابوونی نەبو، ئەو کاته یەکسەر دەبێته ملکی (بَيْتُ المال)، کەوابو: بۆ کاربەدەستی موسوڵمانان دروسته بیداته کەسێك، واته: ئەگەر کاربەدەست نەیدا، ئەوه به ئاوەدانکردنەوه نابێته ملکی هیچ کەسێك، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوه.

(وَإِنْ كانَتْ جاهِلِيَّةً) بەڵام ئەگەر وێرانبووەکە ئاوەدانیی سەردەمی کافران بوو: وەك نیشانەیەکی کافرانی تێدابێ، یان گومان لەوەدا هەبو: کە هی سەردەمی کافرانه، ئەو کاته (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ يُمْلَكُ بِالإِحْياءِ) بە هۆی زیندووکردنەوه دەکرێته ملك‌و دروسته وەك زەمینی‌مردوو زیندوو بکرێتەوه.

(وَلاَ يُمْلَكُ بِالإِحْياءِ حَرِيمُ مَعْمُورٍ) پاسکراوی شوێنی ئاوەدانکراو، بە زیندووکردنەوه ناکرێته ملك (وَهُوَ) پاسکراو (ما تَمَسُّ الْحاجَةُ إِلَيْهِ) ئەو شوێنەیه کە زۆر پێویستی پێ دەبێ (لِتَمامِ الإِنْتِفاعِ) بۆ سوودوەرگرتنی‌تەواو لە شوێنەکە، ئینجا ئەو پاسکراوەش بەگوێرەی شوێنەکە دەگۆڕێ.

کەوابو: (فَحَرِيمُ الْقَرْيَةِ) پاسکراوی گوند=دێ: (اَلنَّادِي) ئەو شوێنەیه کە خەڵك بۆ قسەکردن لێی دادەنیشێ‌و هەم (وَمُرْتَكَضُ الْخَيْلِ) شوێنی غارغارانێی سوارئەسپەکانەو

وَمُناخُ الإبلِ وَمَطْرَحُ الرَّماد وَنَحْوُها، وَحَرِيمُ الْبِئْرِ فِي الْمَوات: مَوْقِفُ النَّازِحِ وَالْحَوْضُ وَالدُّولابُ وَمُجْتَمعُ الْماء وَمُتَرَدَّدُ الدَّابَّة، وَحَرِيمُ الدَّارِ فِي الْمَوات: مَطْرَحُ رَماد وَكُناسَة وَثَلْجٍ وَمَمَرٌّ فِي صَوْب الْباب، وَحَرِيمُ آبارِالْقَناة: مالَوْ حُفِرَ فِيه نَقَصَ ماؤُهـا أَوْ خِيفَ الإِنْهِيارُ، وَالدَّارُالْمَحْفُوفَةُ بِدُورٍ لاحَرِيمَ لَها، وَيَتَصرَّفُ كُلُّ واحد فِي مِلْكِه عَلَى الْعادَة،

---

هەم (وَمُناخُ الإبلِ) شوێنی ئیخ کردنی ووشترەکانەو هەم (وَمَطْرَحُ الرَّماد) شوێنی فرێدانی خۆڵو خڵتوخاڵو زبڵو (وَنَحْوُها) ئەوەی وەك ئەو شوێنانەیە: وەك یاریگەی منداڵانو مۆڵگەو لەوەڕگەی ئاژەڵەکانو شوێنی دار لێهێنانو کانگەی گڵو بەردی خانوو و قەراغی جۆگەو گشت شوێنە گشتی‌یەکانی‌تر، واتە: ئەوانە -هیچیان- دروست نیە ئاوەدان بکرێنەوەو بکرێتە ملکی تایبەتی کەسێك.

هەروەها پاسکراوی جۆگەش ئەم لاو ئەو لایەتی: کە لە کاتی جۆماڵکردن قوڕو بەردی فڕێ دەدرێتێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَحَرِيمُ الْبِئْرِ فِي الْمَوات) پاسکراوی بیرێك کە لە زەمینێکی مردوودا هەڵکەندرابێ (مَوْقِفُ النَّازِحِ) ئەو شوێنەیە کە بۆ ئاوهەڵێنجان مرۆڤەکەی لێڕادەوەستێ، هەم (وَالْحَوْضُ) ئەو حەوزەیە کە ئاوەکەی تێدەکرێو هەم (وَالدُّولابُ) شوێنی دۆلابەیە، هەم (وَمُجْتَمَعُ الْماءِ) ئەو شوێنەیە کە ئاوی تێدا کۆ دەکرێتەوە بۆ ئاودانی ئاژەڵەکانو هەم (وَمُتَرَدَّدُ الدَّابَّةِ) ئەو شوێنەیە کە وولاغی ئاوهەڵێنجان هاتوچۆی تێدا دەکا.

(وَحَرِيمُ الدَّارِ فِي الْمَوات) پاسکراوی خانووی دروستکراو لە زەمینێکی مردوودا (مَطْرَحُ رَمادٍ وَكُناسَةٍ وَثَلْجٍ) ئەو شوێنەیە کە خۆڵەمێشو خڵتوخاڵو بەفری فڕێ‌دەدرێتێ، هەم (وَمَمَرٌّ فِي صَوْبِ الْبابِ) شوێنی هاتوچۆکردنە لە لای دەرگەوە.

(وَحَرِيمُ آبارِالْقَناةِ) پاسکراوی بیرەکانی کارێز (مالَوْ حُفِرَ فِيه) ئەو شوێنەیە: کە ئەگەر بیرێکی تازەی لێ هەڵبکەندرێ (نَقَصَ ماؤُها) بەو بیرەتازەیە ئاوی کارێزەکە کەم دەبو (أَوْ خِيفَ الإِنْهِيارُ) یان ترسی تێکڕمانی کارێزەکە دەبو (وَالدَّارُالْمَحْفُوفَةُ بِدُورٍ) ئەو خانووەی بە خانووەکانی‌تر دەورەی دراوە (لاَ حَرِيمَ لَها) هیچ پاسکراوی نیە، چونکە ئەو لە خانووەکانی‌تر زیاتر مافی نیە.

(وَيَتَصرَّفُ كُلُّ واحدٍ فِي مِلْكِه عَلَى الْعادَةِ) گشت خاوەنێك بەگوێرەی عادەت دەستکاری لە ملکی خۆیدا دەکا، هەرچەندە بە هۆی ئەو دەستکاریەش دراوسێ‌یەکەی زیانی بکاتێ: وەك بیرێك لە ملکی خۆیدا هەڵبکەنێو بە هۆی بیرەکە ئاوی بیری دراوسێ‌یەکەی کەم بکاتەوە، یان دیواری دراوسێ‌یەکەی بڕوخێ، یان بە هۆی بیری ئاودەستخانەکەی بیری ئاوی دراوسێ‌یەکەی بگۆڕێ، واتە: چونکە ئەو دەستکاریانەی لە ملکی‌خۆیدا کردوون لێی قەدەغە ناکرێن، بەو مەرجەی بەگوێرەی عادەت بێ.

فَإِنْ تَعَدَّى ضَمِنَ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَجُوزُ أَنْ يَتَّخِذَ دارَهُ الْمَحْفُوفَةَ بِمَساكِنَ حَمَّاماً وَإِصْطَبْلاً، وَحانُوتَهُ فِي الْبَزَّازِينَ حانُوتَ حَدَّادٍ إِذا احْتاطَ وَأَحْكَمَ الْجُدْرانَ، وَيَجُوزُ إِحْياءُ مَواتِ الْحَرَمِ دُونَ عَرَفات فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: وَمُزْدَلِفَةُ وَمِنَى كَعَرَفَةَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَخْتَلِفُ الإِحْياءُ بِحَسَبِ الْغَرَضِ فَإِنْ أَرادَ مَسْكَناً اشْتُرِطَ تَحْوِيطُ الْبُقْعَةِ وَسَقْفُ بَعْضِها وَتَعْلِيقُ بابٍ وَفِي الْبابِ وَجْهٌ،

---

بەلام (فَإِنْ تَعَدَّى) ئەگەر لە سنووری عادەت تێپەڕیو لە عادەت زیاتر دەستکاریی لە ملکی خۆیدا کرد، ئەو کاتە (ضَمِنَ) دەبێتە زامینی گشت زیانێك کە-بێگومان- بە هۆی ئەو دەستکاریە ڕوو بدا، یان بە گومانێکی بەهێز: وەك دوو کەسی لێزان و ئاگادار شاهیدی بدەن: کە ئەو زیانە بە هۆی ئەو دەستکاریە پەیدا بوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە، کەوابو: ئەگەر خانووەکەی بکاتە کارگەی دەرمانێکی بۆندار و منداڵی دراوسێکانی بە هۆی بۆنەکەی بمرن، ئەوە دەبێتە زامین، هەروەك لە (نهایة)دا فەرموویەتی.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يَجُوزُ أَنْ يَتَّخِذَ دارَهُ الْمَحْفُوفَةَ بِمَساكِنَ) دروستە خانووەکەی خۆی-کە بە چەند خانووێك دەورەی دراوە- بیکاتە (حَمَّاماً) گەرماو و هەم (وَإِصْطَبْلاً) بیکاتە خانەی ئاژەڵ و بیکاتە فڕنی و بیکاتە مزگەوت، هەم (وَحانُوتَهُ فِي الْبَزَّازِينَ) دروستە دوکانەکەی خۆی لە ناو کوتاڵفرۆشەکاندا بکاتە (حانُوتَ حَدَّادٍ) دوکانی ئاسنگر و جلشۆر (إِذا احْتاطَ وَأَحْكَمَ الْجُدْرانَ) بەو مەرجەی پارێزکاری بکاو دیوارەکان باش قاییم بکا.

ئینجا بزانە: کۆمەڵێکی زانایان ئەو فەرموودەیان هەڵبژاردوە: کە هەر دەستکاریەك ببێتە هۆی ئازاردانی دراوسێکانی و عادەت نەبێ، ئەوە لێی قەدەغە دەکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ إِحْياءُ مَواتِ الْحَرَمِ) دروستە: شوێنەمردووەکانی (حرم)ی پیرۆز زیندوو بکرێنەوە (دُونَ عَرَفاتٍ) بەلام زەمینی (عرفة) دروست نیە زیندوو بکرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (وَمُزْدَلِفَةُ وَمِنَى) هەردووکیان (كَعَرَفَةَ) وەکو زەمینی (عرفة) دروست نیە زیندوو بکرێنەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ چۆنیەتی زیندووکردنەوە ﴾

(وَيَخْتَلِفُ الإِحْياءُ بِحَسَبِ الْغَرَضِ) زیندووکردنەوەی زەمینەکە بەگوێرەی مەبەستەکەی لێك جیاوازە، کەوابو: (فَإِنْ أَرادَ مَسْكَناً) ئەگەر ویستی شوێنەکە بکاتە خانوو (اشْتُرِطَ تَحْوِيطُ الْبُقْعَةِ) بە مەرج داندراوە، دیوارێك لە دەورەی پارچە زەمینەکە بکاو هەم (وَسَقْفُ بَعْضِها) بان بۆ هەندێکیشی دروست بکاو هەم (وَتَعْلِيقُ بابٍ) دەرگەشی پێوە بخا (وَفِي الْبابِ وَجْهٌ) لە بارەی دەرگە فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: بە مەرج نەبێ.

أَوْ زَرِيبَةَ دَوَابَّ فَتَحْوِيطٌ لاَ سَقْفٌ، وَفِي الْبَابِ الْخِلاَفُ، أَوْ مَزْرَعَةً فَجَمْعُ التُّرَابِ حَوْلَهَا وَتَسْوِيَةُ الأَرْضِ وَتَرْتِيبُ مَاءٍ لَهَا إِنْ لَمْ يَكْفِهَا الْمَطَرُ الْمُعْتَادُ، لاَ الزِّرَاعَةُ فِي الأَصَحِّ، أَوْ بُسْتَاناً فَجَمْعُ التُّرَابِ وَالتَّحْوِيطُ حَيْثُ جَرَتِ الْعَادَةُ بِهِ وَتَهْيِئَةُ مَاءٍ وَيُشْتَرَطُ الْغَرْسُ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَمَنْ شَرَعَ فِي عَمَلِ إِحْيَاءٍ وَلَمْ يُتِمَّهُ أَوْ أَعْلَمَ عَلَى بُقْعَةٍ بِنَصْبِ أَحْجَارٍ أَوْ غَرْزَ خَشَباً

---

﴿ئاگاداری﴾: لە شوێنەواری خێڵو کۆچەریەکانیش -لە گەرمیانو لە کوێستان- بەگوێرەی عادەت ڕەفتار دەکرێ، کەوابو: ئەگەر یەکێکیان شوێنێکی لە درکو بەرد پاك کردەوەو ڕێکی خست تاکو خێمەی لێدابکوتێ، یان کەپرو ساباتی لێدروست بکاو ئاژەڵەکانی لێبدۆشێ، ئەوە ئەگەر بە مەبەستی ملکایەتی ئەو کارەی کردبێ، ئەو پارچە زەمینە دەبێتە ملکی خۆی، هەرچەندە لەوێش بار بکا، بەڵام ئەگەر بە مەبەستی سود لێوەرگرتن ئەو کارەی کردبێ، ئەو کاتە ئەویان بۆ سود لێوەرگرتن لە گشت کەسێکیتر لە پێشترە تا بار دەکا، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ زَرِيبَةَ دَوَابَّ) ئەگەر ویستی بیکاتە شوێنی ئاژەڵەکان، ئەو کاتە (فَتَحْوِيطٌ) پێویستە دیواری لە دەورە بکا، بەڵام (لاَ سَقْفٌ) بان بۆکردن پێویست نیە (وَفِي الْبَابِ الْخِلاَفُ) لە بارەی دەرگەش دوو فەرموودەکەیڕابردوو هەنە، ڕاسترەکەیان: مەرجە دەرگەی هەبێ.

(أَوْ مَزْرَعَةً) یان ئەگەر ویستی زەمینەکە بکاتە زەویی کشتوکاڵ (فَجَمْعُ التُّرَابِ حَوْلَهَا) مەرجە گڵی لە دەورە کۆ بکاتەوە، یان بە بەرد دیواری بۆ بکا، یان بە درك پەرژینی بۆ بکا، هەم (وَتَسْوِيَةُ الأَرْضِ) زەویەکەش ڕێك بخا، واتە: بڵندیو نەویایەتی لاببا، هەم (وَتَرْتِيبُ مَاءٍ لَهَا) ئاویشی بۆ دابین بکا (إِنْ لَمْ يَكْفِهَا الْمَطَرُ الْمُعْتَادُ) ئەگەر بارانیعادەتیی بەس نەبێ (لاَ الزِّرَاعَةُ) بەڵام مەرج نیە کشتوکاڵەکەی تێدا بچێنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا.

(أَوْ بُسْتَاناً) یان ئەگەر ویستی زەمینەکە بکاتە باغ، ئەو کاتە (فَجَمْعُ التُّرَابِ) مەرجە گڵی لە دەورە کۆ بکاتەوەو هەم (وَالتَّحْوِيطُ) دیواریشی لە دەورە بکا (حَيْثُ جَرَتِ الْعَادَةُ بِهِ) بەگوێرەی عادەت: ئەگەر عادەت دیواری بەرد بوو بە بەرد دیوارەکە بکا، ئەگەر عادەت پەرژین بوو بە درکو قامیش پەرژینی بکا، هەم (وَتَهْيِئَةُ مَاءٍ) ئاویشی بۆ ئامادە بکا (وَ) هەروەها (يُشْتَرَطُ الْغَرْسُ) لێرەدا بە مەرج داندراوە: هەندێك درەختی تێدا بچێنێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَمَنْ شَرَعَ فِي عَمَلِ إِحْيَاءٍ) هەر کەسێك دەستی کرد بە کاری زیندووکردنەوەی شوێنێكو (وَلَمْ يُتِمَّهُ) تەواویشی نەکرد (أَوْ أَعْلَمَ عَلَى بُقْعَةٍ) یان نیشانەی لە سەر پارچەزەمینێك دانا (بِنَصْبِ أَحْجَارٍ أَوْ غَرْزَ خَشَباً) چەند بەردێکی وەکو کێل دانا، یان دارێکی چەقاند، بەڵام

فَمُتَحَجِّرٌ وَهُوَ أَحَقُّ بِهِ، لَكِنِ الأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ بَيْعُهُ، وَأَنَّهُ لَوْ أَحْيَاهُ آخَرُ مَلَكَهُ، وَلَوْ طَالَتْ مُدَّةُ التَّحَجُّرِ قَالَ لَهُ السُّلْطَانُ: أَحْيِ أَوْ اُتْرُكْ، فَإِنِ اسْتَمْهَلَ أُمْهِلَ مُدَّةً قَرِيبَةً، وَلَوْ أَقْطَعَهُ الإِمَامُ مَوَاتاً صَارَ أَحَقَّ بِإِحْيَائِهِ كَالْمُتَحَجِّرِ، وَلاَ يُقْطِعُ إِلاَّ قَادِراً عَلَى الإِحْيَاءِ وَقَدْراً يَقْدِرُ عَلَيْهِ، وَكَذَا التَّحَجُّرُ،

---

هیچ کارێکی‌تری تێدا نەکرد، ئەوە (فَمُتَحَجِّرٌ) شوێنەکەی بۆ خۆی قەدەغە کردووە، واتە: نابێتە ملکی خۆی، کەوابو: (وَهُوَ أَحَقُّ بِهِ) ئەو لە گشت کەسێك مافی زیاترەو لە پێشترە بۆ زیندووکردنەوەی ئەو پارچەیە (لَكِنِ الأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ بَيْعُهُ) بەلام بە فەرموودەی ڕاستتر دروست نیە: ئەو پارچەیە بفرۆشێتە کەسێکی‌تر، چونکە ئەو خاوەنی شوێنەکە نیە، بەڵکو مافی هەیە بیکاتە ملکی خۆی‌و ئەو مافەش نافرۆشرێ.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (لَوْ أَحْيَاهُ آخَرُ) ئەگەر کەسێکی‌تر ئەو شوێنەقەدەغەکراوەی بۆ خۆی زیندوو کردەوەو ئەویش وازی لێنەهێنابو، ئەوە (مَلَكَهُ) ئەو کەسە دەبێتە خاوەنی شوێنەکە، بەلام گوناهبار دەبێ.

(وَلَوْ طَالَتْ مُدَّةُ التَّحَجُّرِ) ئەگەر ماوەی دەست بە سەرداگرتنی شوێنەقەدەغەکراوەکە زۆر درێژ بۆوە، ئەو کاتە (قَالَ لَهُ السُّلْطَانُ: أَحْيِ أَوْ اُتْرُكْ) کاربەدەست پێی دەڵێ: یان زیندووی بکەوە، یان وازی لێبێنە (فَإِنِ اسْتَمْهَلَ) جا ئەگەر داوای مۆڵەتی کرد (أُمْهِلَ مُدَّةً قَرِيبَةً) بۆ ماوەیەکی نزیك مۆڵەتی دەدرێتێ، جا ئەگەر ئەو ماوەیەش ڕۆیشت‌و زیندووی نەکردەوە، ئەو کاتە مافی لەو قەدەغەکراوەدا نامێنێ.

(وَلَوْ أَقْطَعَهُ الإِمَامُ مَوَاتاً) ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان پارچە زەمینێکی دایە کەسێك: تاکو بۆ خۆی زیندووی بکاتەوە، ئەوەش (صَارَ أَحَقَّ بِإِحْيَائِهِ) لە گشت کەسێك مافی زیاترە: ئەو پارچەیە بۆ خۆی زیندوو بکاتەوە (كَالْمُتَحَجِّرِ) وەك قەدەغەکەری‌ڕابردوو، بەلام ئەگەر پێشەوا پارچەکەی بۆ کردنەملك بداتێ، ئەو کاتە یەکسەر دەبێتە ملکی وی، هەروەها ئەگەر ئەو شوێنە وێرانبووانەش–کە خاوەنیان نادۆزرێتەوە– بە ملکایەتی بداتە کەسێك، ئەویش دەبێتە ملکی وی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: (وَلاَ يُقْطِعُ إِلاَّ قَادِراً عَلَى الإِحْيَاءِ) پێشەوا ئەو پارچە زەویە ناداتە گشت جۆرە کەسێك، بەڵکو تەنها دەداتە ئەو کەسەی توانای زیندووکردنەوەی هەیە، هەم (وَقَدْراً يَقْدِرُ عَلَيْهِ) تەنها ئەندازەیەکی وەهاشی دەداتێ، کە توانای زیندووکردنەوەیی هەبێ.

(وَكَذَا التَّحَجُّرُ) قەدەغەکردنی‌ڕابردووش هەر ئەوەهایە، واتە: تەنها ئەو جۆرە کەسە مافی هەیە پارچەیەك بۆ خۆی قەدەغە بکا، کە توانای زیندووکردنەوەی هەبێ‌و تەنها بە ئەندازەی پێویست بێ‌و توانای زیندووکردنەوەی ئەو ئەندازەیەی هەبێ.

وَالأَظْهَرُ أَنَّ للإمامِ أَنْ يَحْمِيَ بُقْعَةَ مَواتٍ لِرَعْيِ نَعَمِ جِزْيَةٍ وَصَدَقَةٍ وَضالَّةٍ وَضَعِيفٍ عَنِ النُّجْعَةِ، وَأَنَّ لَهُ نَقْضَ ما حَماهُ لِلْحاجَةِ، وَلاَ يَحْمِي لِنَفْسِه.

## ﴿ پووشانەو پاوان کردنی لەوەڕگە ﴾

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ لِلإمامِ) بۆ پێشەوای موسوڵمانانو بۆ جێگرەکەی دروستە (أَنْ يَحْمِيَ بُقْعَةَ مَواتٍ) پارچەزەمینێکی مردوو پاوان بکا، واتە: قەدەغەی بکا تاکو خەڵك ئاژەڵەکان لەو پارچەیە نەلەوەڕێنێ، جا ئەو پاوانەش (لِرَعْيِ نَعَمِ جِزْيَةٍ) بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی سەرانەیەو هەم (وَصَدَقَةٍ) بۆ ئاژەڵەکانی زەکاتو هەم (وَضالَّةٍ) بۆ ئاژەڵەکانی ونبوو و هەم (وَضَعِيفٍ عَنِ النُّجْعَةِ) بۆ ئەو ئاژەڵەی بێهێزەو ناگاتە لەوەڕگەی دوور، ئینجا بەو مەرجەش دروستە: کە لەوەڕگەیتر-جگە لە پاوانکراوەکە- زۆر بنو بەشی لەوەڕانی ئاژەڵەکانیخەڵك بکەن، هەرچەند دووریش بن.

(وَأَنَّ لَهُ نَقْضَ ماحَماهُ لِلْحاجَةِ) هەم بۆ پێشەوای موسوڵمانان دروستە: پاوانکراوی خۆیو کاربەدەستەکانی پێشەخۆیشی هەڵبوەشێنێتەوە بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان (وَلاَ يَحْمِي لِنَفْسِهِ) نابێ: نە پێشەواو نە خەڵکیتر شوێنێك بۆ خۆی پاوان بکا، چونکە ئەو پاوانکردنە تایبەتە بە بەرژەوەندی گشتیی ئیسلام، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لاَ حِمَى إلاَّ لِلّهِ وَلِرَسُولِه﴾ رواه البخاري، پاوانکردنی لەوەڕگەی گشتی تەنها بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوایەﷺ هیچ کەسێکیتر مافی پاوانکردنی نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: حەرامە کاربەدەست، یان خەڵکیتر شتێك لەو کەسانە وەربگرن: کە لە پاوانکراوێکی مردوو، یان لە لەوەڕگەیەکی مردوو ئاژەڵەکانیان دەلەوەڕێنن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: بە بەڵگەی حەدیسەکەیداهاتوو، جا ئەو شتە حەرامەی وەردەگیرێ لە کوردستاندا پێی دەگوترێ: (پووشانە). هەم دەشگوترێ: (پاوان فرۆشتن). جا ئەو شتە حەرامە-پارە بێ، یان شتێکیتر- نابێتە ملکی ئەو کەسەی وەریگرتوە، جیاوازی نیە: خەڵکی شوێنەکە بە تێکڕایی وەریبگرن، یان تەنها خاوەن دەسەلاتو زۆرداریك وەریبگرێ، کەواتە: ئەگەر بە ناوی زەکاتیش وەریبگرێ، بە زەکات ناچێو لە هەموو حاڵەتێکدا واجبە: بۆ خاوەنەکەی بگەڕێندرێتەوە.

هەروەها ئەو خاوەن ئاژەڵانەی بە لای دێیەکدا ڕادەبرنو دەچنە شوێنێکیتر، بۆ دانیشتووانیدێیەکە دروست نیە: قەدەغەیان بکەن لە لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان لە لەوەڕگەگشتیەکەی دێیەکە، واتە: ئەو ماوەیەی بەوێدا ڕادەبرن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، کەواتە: ئەگەر لەوەڕگەکە لە پێویستی خۆیان زیاد بێ، ئەو کاتە ناتوانن لە لەوەڕاندنی یەکجاریش قەدەغەیان بکەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

(فَصلٌ) مَنفَعَةُ الشَّارِعِ اَلْمُرُورُ، وَيَجُوزُ الْجُلُوسُ بِهِ لاسْتِراحَةٍ وَمُعامَلَةٍ وَنَحْوِهِما إذَا لَمْ يُضَيِّقْ عَلَى الْمارَّةِ، وَلاَ يُشْتَرَطُ إذْنُ الإمامِ، وَلَهُ تَظْلِيلُ مَقْعَدِهِ بِبارِيَّةٍ وَغَيْرِها، وَلَوْ سَبَقَ إلَيْهِ إثْنانِ أُقْرِعَ، وَقِيلَ يُقَدِّمُ الإمامُ بِرَأْيِهِ،

---

﴿اَلنَّاسُ شُرَكَاءُ فِي ثَلاثَةٍ: اَلْكَلأِ وَالْماءِ وَالنَّارِ﴾ رواه أبوداود بسندصالح، خەڵك لە سێ شتدا هاوبەشن: لە گیاو لە ئاو و لە ئاگردا.

## ﴿ فَصلٌ: لە باسی سودەکانی هاوبەش ﴾

(مَنْفَعَةُالشَّارِعِ) بنچینەی سودی ڕێگە (اَلْمُرُورُ) هاتوچۆکردنە بەڵام (وَيَجُوزُالْجُلُوسُ بِهِ) دروستە: لە ڕێگە دابنیشێ (لاِسْتِراحَةٍ وَمُعامَلَةٍ وَنَحْوِهِما) بۆ حەسانەوەو مامڵەت کردنو ئەو جۆرە شتانە: وەکو پیشەسازیو چاوەڕوانکردن (إذَا لَمْ يُضَيِّقْ عَلَى الْمارَّةِ) بەو مەرجەی ڕێگەکە بەرتەنگ نەکا لەو کەسانەی هاتوچۆ دەکەن.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ إذْنُ الإمامِ) بۆ دانیشتنی ڕێگەو سودەکانیتری ڕێگە، ئیزنـدانی کاربەدەست بە مەرج دانانرێ، هەروەها (وَلَهُ) ئەو کەسەی لە ڕێگە دادەنیشێ بۆی دروستە (تَظْلِيلُ مَقْعَدِهِ بِبارِيَّةٍ) لە شوێنی دانیشتنیخۆی سێبەرێك بکا: بە کەپرۆکەیەك، هەم (وَغَيْرِها) بە شتیتریش وەك پارچە جلو لقیدرەخت، بەو مەرجەی زیان لە خەڵکیتر نەدا، بەڵام دروست نیە خانووی تێدا بکا.

(وَلَوْ سَبَقَ إلَيْهِ إثْنانِ) ئەگەر دوو کەس وێکڕا هاتنە شوێنێکی ڕێگەکەو بەشی هەردووکیانی نەدەکردو بووە کێشەیان، ئەو کاتە (أُقْرِعَ) پشکە لە نێوانیاندا دەکرێو بۆ کامەیان دەرچوو، ئەویان تێیدا دادەنیشێو واجبە: ئەویتر واز بێنێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يُقَدِّمُ الإمامُ بِرَأْيِهِ) کاربەدەست یەکێکیان وەپێش ئەویتر دەخا بە بۆچوونی خۆی.

﴿ ئاگاداری ﴾: نە بۆ کاربەدەستو نەبۆ خەڵکیتریش دروست نیە: کرێ لەو کەسانە وەربگرن: کە لە سەر ڕێگەکاندا کڕینو فرۆشتنو پیشەسازیو ئەو جۆرە کارانە دەکەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: دروست نیە مرۆڤ -بە بێئیزن- لە سەر کۆسپەدەرگەی دوکانو خانوو دابنیشێ، جا ئەگەر خاوەنەکەی ئیزنیشی بدا، ئەو کاتەش بۆی دروستە ئەویان دەریکاو یەکێکیتر بهێنێتە شوێنەکەی، هەروەها دانیشتن لە دەورووبەری دوکانو خانووش -ئەگەر زیانی بۆ خاوەنەکانیان هەبێ- بە بێئیزن دروست نیە، واتە: بەڵام ئەگەر زیانی نەبێ، ئەو کاتە بە بێئیزن دروستە، بەڵام بە هیچ جۆرێك دروست نیە کرێ لە دانیشتووی سەر کۆسپەکەو دەورووبەری خانووەکە وەربگیرێ، هەروەك لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَلَوْ جلَسَ فيه للْمُعامَلَة ثُمَّ فارَقَهُ تاركاً للْحرْفَة أوْ مُنْتَقلاً إلَى غَيْره بَطَلَ حَقُّهُ، وإنْ فارَقَهُ ليَعُودَ لَمْ يَبْطُلْ إلاّ أنْ تَطُولَ مُفارَقَتُهُ بحَيْثُ يَنْقَطعُ مُعامِلُوهُ عَنْهُ ويَأْلَفُونَ غَيْرَهُ، وَمَنْ أَلِفَ منَ الْمَسْجد مَوْضعاً يُفْتي فِيهِ وَيُقْرِئُ كَالْجالِسِ فِي شارِعٍ لِمُعامَلَةٍ، وَلَوْ جلَسَ فِيهِ لِصَلاَةٍ لَمْ يَصِرْ أَحَقَّ بِهِ فِي غَيْرِها،

---

دیسان بزانە: بۆ دوکانداران بۆ مامڵەتچی سەر ڕێگەش دروستە: ئەو کەسانە قەدەغە بکەن کە لە پێشیان ڕادەوەستن و دەبنە هۆی نەدیتنی کەلوپەلەکەیان و ڕێگەی کڕیارەکانیان دەگرن، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ جَلَسَ فِيهِ لِلْمُعامَلَةِ) ئەگەر کەسێك لە ڕێگەدا دانیشت بۆ کڕین و فرۆشتن و پیشەسازی (ثُمَّ فارَقَهُ تارِكاً لِلْحِرْفَةِ) ئینجا شوێنەکەی بەجێهێشت، چونکە وازی لە کارەکەی هێنا (أوْ مُنْتَقِلاً إلَى غَيْرِهِ) یان بەو مەبەستەی بڕواتە شوێنێکیتر تا لەوێ کارەکەی بکا، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (بَطَلَ حَقُّهُ) مافی لەو شوێنەدا نامێنێ، کەواتە: دروستە یەکێکیتر بچێتە شوێنەکەی، بەڵام (وَإنْ فارَقَهُ لِيَعُودَ) ئەگەر بەو مەبەستە ڕۆیشتبو، تاکو بگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی: وەك لە شەوێدا بڕواتەوە ماڵیخۆی، یان بۆ حەسانەوە بڕواتە شوێنێك، ئەو کاتە (لَمْ يَبْطُلْ) مافی بەتاڵ نابێ و هەر دەمێنێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إذَا قامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك لە شوێنی خۆی هەڵساو ڕۆیشت، ئینجا گەڕاوە، ئەوە لە گشت کەسێك لەپێشترە بۆ شوێنەکەی خۆی.

(إلاّ أنْ تَطُولَ مُفارَقَتُهُ) مەگەر بەجێهێشتنەکەی زۆر درێژ بێ (بِحَيْثُ يَنْقَطِعُ مُعامِلُوهُ عَنْهُ) بە شێوەیەکی وەها: مامڵەتچی‌یەکانی وازی لێبێنن و (وَيَأْلَفُونَ غَيْرَهُ) هاموشۆی کەسێکیتر بکەن، ئەو کاتەش مافی نامێنێ.

(وَمَنْ أَلِفَ مِنَ الْمَسْجِدِ مَوْضِعاً) ئەگەر کەسێك هاموشۆی شوێنێکی لە مزگەوت دەکرد (يُفْتِي فِيهِ) لەو شوێنەدا (فتوا)ی دەدا (وَيُقْرِئُ) یان دەرسی قورئان، یان حەدیس، یان شەرع، یان دەرسەکانیتری ئایینی دەگوتنەوە، ئەو زانایەش (كَالْجالِسِ فِي شارِعٍ لِمُعامَلَةٍ) وەك ئەو کەسە بڕیاری بۆ دەدرێ: کە بۆ مامڵەت کردن لە ڕێگە دادەنیشێ، واتە: تا بە تەواوی شوێنەکە بەجێ نەهێڵێ، هیچ کەسێك ناتوانێ دەری بکا، هەروەها نابێ ئەویش بە هۆی دەرس گوتنەوە مزگەوتەکە لە نوێژکەران بەرتەنگ بکاو نابێ نوێژیان لێ تێك بدا.

بەڵام (وَلَوْ جَلَسَ فِيهِ لِصَلاَةٍ) ئەگەر کەسێك لە مزگەوتدا لە شوێنێك دانیشت بۆ نوێژکردن، ئەوە (لَمْ يَصِرْ أَحَقَّ بِهِ فِي غَيْرِها) جگە لەو نوێژە لە هیچ نوێژێکیتردا مافی

فَلَوْ فارَقَهُ لِحاجَةٍ لِيَعُودَ لَمْ يَبْطُلِ اخْتِصاصُهُ فِي تِلْكَ الصَّلاَةِ فِيالأَصَحِّ وَإِنْ لَمْ يَتْرُكْ إِزارَهُ، وَلَوْ سَبَقَ رَجُلٌ إِلَى مَوْضِعٍ مِنْ رِباطٍ مُسَبَّلٍ أَوْ فَقِيهٌ إِلَىمَدْرَسَةٍ أَوْ صُوفِيٌّ إِلَىخانَقاه لَمْ يُزْعَجْ وَلَمْ يَبْطُلْ حَقُّهُ بِخُرُوجِهِ لِشِراءِ حاجَةٍ وَنَحْوِهِ.
(فَصْلٌ) اَلْمَعْدِنُ الظَّاهِرُ: وَهُوَ ماخَرَجَ بِلاَعِلاَجٍ كَنِفْطٍ وَكِبْرِيتٍ وَقارٍ وَمُومِياءٍ

---

له كەسێكی‌تر زیاتر نیه لەو شوێنەدا، كەواته: ئەگەر لەو نوێژەوە تا نوێژێكی‌تر هەر لەو شوێنەدا مایەوە، ئەوە مافەكەی هەر بەردەوامە.
هەروەها (فَلَوْ فارَقَهُ لِحاجَةٍ) ئەگەر پێش ئەوەی نوێژەكە بكا لە شوێنە ڕۆیشت لە بەر پێویستیەك (لِيَعُودَ) تاكو لە دوای بەجێ هێنانی پێویستیەكە بێتەوە شوێنەكە، ئەو كاتەش (لَمْ يَبْطُلِ اخْتِصاصُهُ فِي تِلْكَ الصَّلاَةِ) تایبەتیەكەی بەو شوێنەوە لەو نوێژەدا بەتاڵ نابێتەوە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَإِنْ لَمْ يَتْرُكْ إِزارَهُ) هەرچەند پەشتەماڵەكەی، یان شتێكی‌تری لەو شوێنەش بەجێ نەهێشتبێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی‌ڕابردوو، بەڵام ئەگەر ئیقامەتی نوێژ كراو لە كاتی نوێژدابەستندا حازر نەبو، ئەو كاتە شوێنەكەی پڕ دەكرێتەوە، جا ئەگەر شتێكیشی لە شوێنی خۆی بەجێ هێشتبو، ئەو كاتە یەكێك بە پێ‌ی‌خۆی لای‌دەدلو ڕیزی نوێژەكە پێكوەدەندرێتەوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَلَوْ سَبَقَ رَجُلٌ إِلَى مَوْضِعٍ مِنْ رِباطٍ مُسَبَّلٍ) ئەگەر پیاوێك پێش خەڵكی‌تر هاتە شوێنێك لەو خانانەی بۆ خێرات دروست كراون‌و لە ڕێگەی‌خوا پێویست‌و هەژارەكانی تێ‌دا دەحاوێنەوە (أَوْ فَقِيهٌ إِلَىمَدْرَسَةٍ) یان مامۆستایەكی ئایینی، یان قوتابیەكی ئایینی پێشدا چووە خوێندنگایەكی ئایینی (أَوْ صُوفِيٌّ إِلَى خانَقاه) یان سۆفیەك پێشدا هاتە خانەقایەك، هەر یەكێك لەوانە (لَمْ يُزْعَجْ) بە ناهەق دەرناكرێ‌و (وَلَمْ يَبْطُلْ حَقُّهُ بِخُرُوجِهِ) هەروەها مافی مانەوەشی لەو شوێنەدا نافەوتێ بە هۆی چوونە دەرەوەی (لِشِراءِ حاجَةٍ) بۆ كڕینی پێویستیەكان‌و (وَنَحْوِهِ) بۆ ئەو جۆرە شتانەشی كە وەك شت كڕین دەبنە عوزر.
كەواتە: ئەگەر بە هۆی نەخۆشی، یان ترس، یان بە عادەت لە مانگی ڕەمەزان‌و لە جەژنەكاندا قوتابی ئایینی خوێندنگای بەجێ هێشت، ئەوە مافی نافەوتێ، هەرچەند یاتاغ‌و كەلوپەلەكەشی بەجێ نەهێڵێ، بەڵام ئەگەر بە بێ‌عوزر ڕۆیشت، یان ماوەیەكی زۆر بزر بوو، یان وازی لە خوێندن هێنا، یان سۆفی وازی لە خواپەرستی هێنا، ئەو كاتە مافی لە شوێنەكە نامێنێ‌و دەردەكرێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی كانگەكانی هاوبەش ﴾

(اَلْمَعْدِنُ الظَّاهِرُ) كانگەی ئاشكرا (وَهُوَ ما خَرَجَ بِلاَعِلاَجٍ) ئەوەیە: بە بێ‌كاركردن بەدەركەوتوە (كَـ) وەك (نِفْطٍ) هەم (وَكِبْرِيتٍ) گۆگردو (وَقارٍ) قیرو (وَمُومِياءٍ) مومیاو

وَبِرامٍ وَأَحْجارِرَحَىً لاَيُمْلَكُ بِالإحْياء، وَلاَيَثْبُتُ فيه اخْتصاصٌ بِتَحَجُّرٍ وَلاَإقْطـاعٍ، فَـإنْ ضاقَ نَيْلُهُ قُدِّمَ السَّابِقُ بِقَدْرِحاجَته فَإنْ طَلَبَ زِيادَةً فَالأَصَحُّ إزْعاجُهُ، فَلَـوْ جـاءا مَعـاً أُقْرِعَ فِيالأَصَحِّ، وَالْمَعْدِنُ الْباطِنُ: وَهُوَ ما لاَيَخْرُجُ إلاَّ بِعِلاجٍ كَذَهَبٍ وَفِضَّةٍ وَحَديـدٍ وَنُحاسٍ لاَ يُمْلَكُ بِالْحَفْرِ وَالْعَمَلِ فِيالأَظْهَرِ،

---

(وَبِرامٍ) بەردی دیزەو (وَأَحْجارِ رَحَىً) بەردی ئاشو بەردی مەڕمەڕو بەردی دروستکردنی خانوو و بەردی گەچو خوێو ئەو جۆرە شتەگشتیانە (لاَ يُمْلَكُ بِالإحْياء) بە هۆی زیندووکردنەوە نابێتە ملکی هیچ کەسێك، هەم (وَلاَ يَثْبُتُ فِيهِ اخْتِصاصٌ بِتَحَجُّرٍ) ناشبێتە تایبەتی هیچ کەسێك بە هۆی قەدەغەکردنو دەست بەسەرداگرتن (وَلاَ إقْطاعٍ) هەم بە پێبەخشینی کاربەدەستیش نابێتە تایبەتی هیچ کەسێك، چونکە ئەو جۆرە کانگایانە هاوبەشن لە نێوان خەلْکداو هەر کەسێك مافی هەیە بە ئەندازەی پێویستی خۆی لێی ببا وەکو گیاو ئاوی گشتی ﴿عَنْ أَبْيَضَ بنِ حَمالٍ﷛: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَقْطَعَهُ مِلْـحَ مَـأْرِبَ، فَقـالَ رَجُلٌ: إنَّهُ كَالْماءِالْعِدِّ، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَـلاَ إذَنْ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه ابن حبان، پێغەمبەرﷺ کانگەی خوێی (مأرب)ی دایە پیاوێك، ئینجا پیاوێکیتر گوتی: ئەو کانگایە وەك ئاوی ڕەوانیگشتی بەردەوامە، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: کەوابو: نایدەمێ.

(فَإنْ ضاقَ نَيْلُهُ) جا ئەگەر دەستکەوتی کانگەکە بەشی دوو کەس، یان زیاتری نەدەکرد، ئەو کاتە (قُدِّمَ السَّابِقُ) کامەیان پێشدا گەیوەتە کانگەکە ئەویان وەپێش دیخرێ (بِقَدْرِ حاجَتِهِ) بە ئەندازەی پێویستی خۆی بیبا (فَإنْ طَلَبَ زِيادَةً) جا ئەگەر لە پێویستیخۆی زیاتری دلوا کرد، ئەوە (فَالأَصَحُّ إزْعاجُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر دەردەکرێ بەو مەرجەی لە لای خەلْکیتر پاڵەپەستەی لەگەڵ بکرێ لە سەر کانگەکە، ئەگینا: وازی لێدەهێندرێ.

(فَلَوْ جاءا مَعاً) جا ئەگەر دوو کەس وێکڕا هاتنە سەر کانگەکەو بەشی هەردووکیانی نەدەکرد، ئەو کاتە (أُقْرِعَ فِيالأَصَحِّ) پشکە لە نێوانیاندا دەکرێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلاّم ئەگەر بەشی هەردووکیانی دەکرد، ئەو کاتە هەردووکیان وێکڕا بەشی خۆیانی لێ دەبەن، جیاوازی دەوڵەمەندو هەژار نیە، هەم جیاوازی نیە: بۆ پێویستی بیبا، یان بۆ بازرگانی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْمَعْدِنُ الْباطِنُ) کانگەی ناو زەمین (وَهُوَ مالاَ يَخْرُجُ إلاَّ بِعِلاجٍ) کە تەنها بە هۆی کارکردن بەدەر دەکەوێ (كَذَهَبٍ وَفِضَّةٍ) وەکو زێڕو زیو، هەم (وَحَدِيدٍ وَنُحاسٍ) وەکو ئاسنو مسو ئەو جۆرە شتانە (لاَ يُمْلَكُ بِالْحَفْرِ وَالْعَمَلِ) شوێنەکەی نابێتە ملکی هیچ کەسێك بە هۆی هەلْکەندنو کار تێداکردن (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەلْکو تەنها دەستکەوتەکەی دەبێتە ملکی ئەو کەسەی کاری تێدا کردووە بە کارکردن وەدەستی هێناوە.

وَمَنْ أَحْيا مَواتاً فَظَهَرَ فيه مَعْدنٌ باطنٌ مَلَكَهُ، وَالْمياهُ الْمُباحَةُ مِنَ الأَوْدِيَةِ وَالْعُيُونِ فِي الْجبالِ يَسْتَوِي النّاسُ فيها، فَإِنْ أَرادَ قَوْمٌ سَقْيَ أَراضيهِمْ مِنْها فَضاقَ سُقِيَ الأَعْلَى فَالأَعْلَى وَحَبَسَ كُلُّ واحدٍ الْمَاءَ حَتَّى يَبْلُغَ الْكَعْبَيْنِ، فَإِنْ كانَ فِي الأَرْضِ ارْتفاعٌ وَانْخفاضٌ أُفْرِدَ كُلُّ طَرَفٍ بِسَقْيٍ، وَما أُخِذَ مِنْ هَذَا الْماء فِي إِناءٍ مُلِكَ عَلَى الصَّحيحِ،

---

(وَمَنْ أَحْيا مَواتاً) هەر کەسێك شوێنێکی‌مردووی زیندوو کردەوە (فَظَهَرَ فيهِ مَعْدِنٌ باطِنٌ) ئینجا کانگەیەکی ناو زەمینی تێدا ئاشکرا بوو، ئەو کەسە (مَلَكَهُ) دەبێتە خاوەنی کانگەکەش، واتە: بەو مەرجەی لە حاڵەتی زیندووکردنەوەدا نەیزانیبێ ئەو کانگەیە هەیە، ئەگینا: نابێتە خاوەنی کانگەکە، چونکە مەبەستەکەی خراپ بووە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْمِياهُ الْمُباحَةُ) ئەو ئاوە گشتیانەی دێنە دەرەوە (مِنَ الأَوْدِيَةِ وَالْعُيُونِ فِي الْجِبالِ) لە گەلیەکان‌و لە سەرچاوەکانی ناو چیاو دەشت (يَسْتَوِي النَّاسُ فِيها) گشت کەسێك تێیاندا هاوبەشە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿النَّاسُ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثَةٍ: الْكَلأِ وَالْماءِ وَالنَّارِ﴾ی‌رابردوو، واتە: خەڵك لە گیاو ئاو و ئاگردا هاوبەشن.

(فَإِنْ أَرادَ قَوْمٌ سَقْيَ أَراضِيهِمْ مِنْها) جا ئەگەر کۆمەڵێك ویستیان زەویەکانی خۆیان لەو ئاوە گشتیە ئاو بدەن (فَضاقَ) ئاوەکەش بەشی نەدەکرد، ئەو کاتە (سُقِيَ الأَعْلَى فَالأَعْلَى) زەویەکەی سەرەوەتر: کە لە ئاوەکە نزیکترە، ئینجا ئەوەکەی‌تر...بەو جۆرە ئاودەدرێ، هەرچەند کشتوکاڵەکەی خوارەوەش ووشك ببێ تا نۆبەتی دەگاتێ (وَحَبَسَ كُلُّ واحِدٍ الْمَاءَ) هەر کەسەش ئاو لە ناو ملکی‌خۆیدا رادەگرێ (حَتَّى يَبْلُغَ الْكَعْبَيْنِ) تا دەگاتە گوزینگەکان (فَإِنْ كانَ فِي الأَرْضِ ارْتِفاعٌ وَانْخِفاضٌ) جا ئەگەر زەمینەکە بلندو نەوی‌ی تێدا بوو، ئەو کاتە (أُفْرِدَ كُلُّ طَرَفٍ بِسَقْيٍ) گشت لایەك بە تەنها ئاودەدرێ، تاکو لە مافی خۆی زیاتر ئاوەکە نەبا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر کەسێك ویستی زەمینێك زیندوو بکاتەوەو لەو ئاوەگشتیە ئاوی بدا، ئەوە ئەگەر تەنگایی پەیدا بکاو ئاوەکە بەش نەکا، ئەو کاتە بۆ خاوەنەکانی پێشەوی دروستە: رێگەی نەدەن‌و لە ئاودانەکەش قەدەغەی بکەن، هەروەها ئاوی ئەو سەرچاوانەی لە ملکێکدا بە دەست کەسێکەوەبن، یان بە دەست کۆمەڵێکەوەبن‌و بنچینەکەیان نەزاندرێ، ئەوە بڕیاری ملکایەتی‌ئاوەکە بۆ ئەوان دەدرێ‌و کەسی‌تر ناتوانێ ئاوەکەیان لێبستێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَما أُخِذَ مِنْ هَذَا الْماءِ فِي إِناءٍ) هەر ئاوێکی لەو ئاوەگشتیانە وەرگیرابێ‌و خرابێتە ناو جامێك، یان حەوزێك (مُلِكَ عَلَى الصَّحِيحِ) دەبێتە ملکی ئەو کەسەی وەری‌گرتوە، لە سەر فەرموودەی ڕاست.

وَحافِرُ بِئْرٍ بِمَواتٍ لِلإِرْتِفاقِ أَوْلَى بِماءِها حَتَّى يَرْتَحِلَ، وَالْمَحْفُورَةُ لِلتَّمَلُّكِ أَوْ فِي مِلْكٍ يُمْلَكُ ماؤُها فِي الأَصَحِّ، وَسَواءٌ مَلَكَهُ أَمْ لاَ: لاَ يَلْزَمُهُ بَذْلُ ما فَضَلَ عَنْ حاجَتِهِ لِزَرْعٍ، وَيَجِبُ لِماشِيَةٍ عَلَى الصَّحِيحِ، وَالْقَناةُ الْمُشْتَرَكَةُ يُقْسَمُ ماؤُها بِنَصْبِ خَشَبَةٍ فِي عُرْضِ النَّهْرِ فِيها ثُقَبٌ مُتَساوِيَةٌ أَوْ مُتَفاوِتَةٌ عَلَى قَدْرِ الْحِصَصِ، وَلَهُمُ الْقِسْمَةُ مُهايَأَةً.

---

(وَحافِرُ بِئْرٍ بِمَواتٍ لِلإِرْتِفاقِ) ئەو كەسەی لە زەمینێكی مردوودا بیرێكی هەڵكەندوە، تاكو بۆ خۆی سودی لێوەربگرێ، نەك بۆ ملكایەتی، ئەوە (أَوْلَى بِماءِها حَتَّى يَرْتَحِلَ) لە گشت كەسێك زیاتر ماق لە ئاوەكەدا هەیە تا بار دەكا، ئینجا هەر كاتێك باری كرد، بیرەكە بۆ گشت كەسێك حەڵاڵ دەبێ، كەوابو: دروست نیە: بیرەكە پڕ بكاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَالْمَحْفُورَةُ لِلتَّمَلُّكِ) بەڵام ئەو بیرەی لە زەمینێكیمردوودا هەڵیكەندوە بۆ ئەوەی بیكاتە ملكی خۆی (أَوْ فِي مِلْكٍ) یان لە ناو ملكێكیخۆیدا هەڵیكەندوە، ئەو كاتە (يُمْلَكُ ماؤُها) لە هەردوو مەسەلەدا ئاوەكەی دەبێتە ملكی خاوەنیبیرەكە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَسَواءٌ) لەو مەسەلەیەدا یەكسانە-(مَلَكَهُ أَمْ لاَ) ببێتە خاوەنی ئاوی بیرەكە، یان نا- لە هەردوو حاڵەتدا (لاَ يَلْزَمُهُ بَذْلُ ما فَضَلَ عَنْ حاجَتِهِ لِزَرْعٍ) لە سەری واجب نیە: ئەو ئاوەی لە پێویستی خۆی زیاترە بۆ كشتوكاڵ بیداتە كەسێكیتر، بەڵام (وَيَجِبُ لِماشِيَةٍ عَلَى الصَّحِيحِ) واجبە: بۆ ئاودانی ئاژەڵ بیداتە خەڵكیتر، بەو مەرجەی ئاوێكیتر بێتەوە جێیو زیان نەگاتە كشتوكاڵو ئاژەڵەكانی خۆی، جا هەر كاتێك بەخشینی ئاو واجب بێ، دروست نیە هیچ شتێك لە بەرامبەر ئاودانەكە وەربگرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَالْقَناةُ الْمُشْتَرَكَةُ) ئاوی كارێزو سەرچاوەی هاوبەش لە نێوان كۆمەڵێكدا (يُقْسَمُ ماؤُها) ئاوەكەی بەش دەكرێ (بِنَصْبِ خَشَبَةٍ فِي عُرْضِ النَّهْرِ) بە داچەقاندنی دارێك لە ناو ڕووبارەكەدا (فِيها ثُقَبٌ مُتَساوِيَةٌ) دارەكە چەند كونێكی یەكسانی تێدابێ (أَوْ مُتَفاوِتَةٌ عَلَى قَدْرِ الْحِصَصِ) یان لێك جیاواز بن بە گوێرەی بەشەئاوەكان (وَلَهُمُ الْقِسْمَةُ مُهايَأَةً) هەروەها بۆیان دروستە بە نۆبەتیش ئاوەكە بەش بكەن: لە سەر حیسابی ڕۆژ، یان كاتژمێر، بەگوێرەی بەشیملكەكان.

﴿ئاگاداری﴾ یەكەم: دروست نیە بەشە ئاوی ئەم زەویو باغەی ببا بۆ زەویو باغێكیتر: كە بەشی لەم ئاوەدا نەبێ، جیاوازی نیە: ئەویتریش بەرلو بێ، یان دێمەكار بێ؟ چونكە لەمەودوا دلوای بەشەئاوێكی وەهای بۆ دەكا: كە لەمەوپێش نەیبوە، هەروەك لە زۆربەی

## (كِتابُ الْوَقْفِ)

**شَرْطُ الْواقِفِ: صِحَّةُ عِبارَتِهِ وَأَهْلِيَّةُ التَّبَرُّعِ، وَالْمَوقُوفِ: دَوامُ الإِنْتِفاعِ بِهِ، لاَ مَطْعُومٌ وَرَيْحانٌ، وَيَصِحُّ وَقْفُ عَقارٍ وَمَنْقُولٍ**

---

سەرچاوەکاندا فەرموویانە، جا ئەگەر بەشە ئاوەکەی‌خۆی لە ملکی‌خۆی زیاد بوو، ئەو کاتە چۆن حەز دەکا: دەستکاری ئاوەکە دەکا، تەنها نابێ ئاوەکە بباتە ملکێکی‌تر: کە بەشی لە ئاوەکەدا نەبێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، واتە: چونکە لەو حاڵەتەشدا مەترسی ئەوە هەیە لەمەودوا بڵێ: بۆ ئەو ملکەشم بەشم لە ئاوەکەدا هەیە.

دووەم: دروست نیە بەشە ئاوی ملکەکەی‌خۆی بفرۆشێتە کەسێکی‌تر، چونکە ئاوی ڕەوان ناگونجێ تەسلیمی کڕیار بکرێ، لە بەر ئەوەی بەرەبەرە ئاوێکی‌تر دێو تێکەڵی فرۆشراوەکە دەبێو ئەندازەیشی نازاندرێ، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

### ﴿ كِتابُ الْوَقْفِ: پەڕتوکی وەقف ﴾

واتە: وەستاندنی ماڵێکی بەردەوامی بە سود: لە سەر ڕووەکی حەڵاڵ لە ڕێگەی خوا، تاکو نەفرۆشرێو نەبەخشرێ، بەڵکو بەردەوام سودی لێوەربگیرێ. وەك بڵێ: ئەم خانووەم وەقف کرد لە سەر ئەم مزگەوتە.

ئینجا بزانە: وەقفکردن خێرێکی نەبڕاوەیە، لە دوای مردنی‌وەقفکەرەکەش خێرەکەی هەر بۆ دەچێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا ماتَ ابْنُ آدَمَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَث: صَدَقَةجارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍصالِحٍ يَدْعُو لَهُ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك ئادەمیزاد مرد، خێری کردەوەکانی‌خۆی دەبڕێ، تەنها لە سێ کردەوەی‌خۆی خێرەکەی بەردەوامە، یەکەم: خێرێکی ڕەهوانی بەردەوامی وەکو وەقف. دووەم: زانستێکی‌ئایینی‌ی بە سود. سێیەم: منداڵێکی‌خۆی کە پیاوچاك بێو دوعای بۆ بکا.

(شَرْطُ الْواقِفِ) مەرجی وەقفکەر، واتە: ئەو کەسەی ماڵەکە وەقف دەکا، ئەمەیە: (صِحَّةُ عِبارَتِهِ) قسەکردنی دروست ببێ، واتە: منداڵو شێتو زۆرلێکراو نەبێ، هەم (وَأَهْلِيَّةُ التَّبَرُّعِ) ماڵ بەخشینیشی دروست بێ، واتە: خاوەنی ماڵە وەقفکراوەکە بێ، کۆیلە نەبێو قەدەغەکراو نەبێ.

(وَالْمَوقُوفِ) مەرجی ماڵەوەقفکراوەکەش ئەمەیە (دَوامُ الإِنْتِفاعِ بِهِ) بەردەوام سودی لێ وەربگیرێ، واتە: (لاَ مَطْعُومٌ وَرَيْحانٌ) خواردەمەنی نەبێو ڕەیحانو ئەو جۆرە گیایانەش نەبێ، چونکە سودەکەیان بەردەوام نیە (وَيَصِحُّ وَقْفُ عَقارٍ) دروستە وەقفکردنی زەویو باغو خانوو، بە (إجماع)ی زانایانی ئایینی، هەم (وَمَنْقُولٍ) دروستە: وەقفکردنی ئەو جۆرە شتەی دەگوازرێتەوە: وەکو کتێبو ئاژەڵو جلو چەكو ئوتومبێل...هتد، پێغەمبەرﷺ

وَمُشاعٍ، لاَ عَبْد وَثوْب فِي الذِّمَّة، وَلاَ وَقْفُ حُرٍّ نَفْسَهُ، وَكَذَا مُسْتَوْلَدَة وَكَلْب مُعَلَّم وَأَحَد عَبْدَيْه فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ وَقَفَ بناءً أَوْ غراساً فِي أَرْضٍ مُسْتَأْجَرَة لَهُمـا فَالأَصَحُّ جَوازُهُ، فَإِنْ وَقَفَ عَلَى مُعَيَّنٍ واحد أَوْ جَمْعٍ اُشْتُرِطَ إِمْكانُ تَمْلِيكه،

---

فەرمووی: ﴿وَأَمَّا خالِدٌ فَقَدْ احْتَبَسَ أَدْراعَهُ وَأَعْتادَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ رواه الشيخان، حەزرەتی (خالد) زرێو تاقمەکانیجەنگی خۆی لە ڕێگەیخوا وەقف کردون.

(وَمُشاعٍ) هەروەها وەقفکردنی بەشێکی بەربلاویش دروستە، واتە: بەشێکی دیارنەکراو لە ماڵێکی هاوبەشدا وەقف بکا (لاَ عَبْدٍ وَثَوْبٍ فِي الذِّمَّةِ) بەڵام دروست نیە وەقفکردنی کۆیلەیەک، یان جلێك، یان هەر شتێکیتر، کە قەرز بێ لە ئەستۆیکەسێکدا، چونکە خودی شتە قەرزەکە ملکی وی نیە (وَلاَ وَقْفُ حُرٍّ نَفْسَهُ) هەروەها دروست نیە مرۆڤی ئازاد خۆی وەقف بکا، چونکە گەردەنی خۆی ملکیخۆی نیە (وَكَذَا مُسْتَوْلَدَةٌ) هەروەها دروست نیە وەقفکردنی (أُمِّ الْوَلَدِ)و هەم (وَكَلْبٍ مُعَلَّمٍ) سەگی ڕاهێنراو، چونکە سەگ ملك نیە (وَ) هەروەها دروست نیە (أَحَدِعَبْدَيْهِ) وەقفکردنی یەکێك لە دوو کۆیلەکانی، یان یەکێك لە دوو خانووەکانی، چونکە نەزانـدراوە وەقفکـراو کامەیانـە (فِي الأَصَحِّ) لـە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ وَقَفَ بِناءً أَوْ غِراساً فِي أَرْضٍ مُسْتَأْجَرَةٍ لَهُما) ئەگەر خانووێك، یان چەند درەختێکی وەقف کردن کە لە زەویەکی بەکرێگیراودا دروست کرابو و چێندرابون، زەویەکەش بۆ درەختو خانوو بە کرێ گیرابو، یان خواسترابو، ئەوە (فَالأَصَحُّ جَوازُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: وەقفکردنەکە دروستە، ئینجا کە ماوەی بەکرێگرتنەکە تەواو بوو، ئەو کاتە خاوەن زەویەکە سەرپشکە: یان درەختەکانو خانووەکە –بۆ ماوەیەکیتری دیارکراو– بە کرێ بهێڵێتەوە، یان هەڵیانبکەنێو تۆڵەی ناتەواویش بداتە وەقف لەسەرکراوەکە، جا ئەگەر بگونجێ، واجبە بەو تۆڵەیەو بە پارچەکانی درەختو خانووە وەقفکراوەکە: پارچە زەویەك بکڕدرێو لە جێیان بکرێتە وەقف، جا ئەگەر نەگونجا، ئەو کاتە گشتی دەبێتە ملکی وەقف لەسەرکراوەکە، واتە: لە مەسەلەی وەقفکردندا دروست نیە خاوەن زەویەکە: درەختو خانووە وەقفکراوەکە بکاتە ملکیخۆی، هەروەك لە (عارية)دا ڕابرا، لە (تحفة)و (نهاية)شدا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ وەقف لەسەرکراو ﴾

(فَإِنْ وَقَفَ عَلَى مُعَيَّنٍ) جا ئەگەر شتەکەی وەقف کرد لە سەر دیارکراوێك (واحِدٍ أَوْ جَمْعٍ) دیارکراوەکەش یەك کەس بێ، یان کۆمەڵێك، ئەوە (اُشْتُرِطَ إِمْكانُ تَمْلِيكِهِ) بە مەرج داندراوە: بگونجێ شتەکە بکرێتە ملکی وی، هەم لە حاڵەتی وەقفکردندا وەقف لەسەرکراوەکە هەبێ.

فَلاَ يَصِحُّ عَلَى جَنِينٍ، وَلاَ عَلَى الْعَبْدِ لِنَفْسِهِ فَلَوْ أَطْلَقَ الْوَقْفَ عَلَيْهِ فَهُوَ وَقْفٌ عَلَى سَيِّدِهِ، وَلَوْ أَطْلَقَ الْوَقْفَ عَلَى بَهِيمَةٍ لَغَا وَقِيلَ هُوَ وَقْفٌ عَلَى مَالِكِهَا، وَيَصِحُّ عَلَى ذِمِّيٍّ، لاَ مُرْتَدٍّ وَحَرْبِيٍّ وَنَفْسِهِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ وَقَفَ عَلَى جِهَةِ مَعْصِيَةٍ كَعِمَارَةِ الْكَنَائِسِ فَبَاطِلٌ، أَوْ جِهَةِ قُرْبَةٍ كَالْفُقَرَاءِ وَالْعُلَمَاءِ وَالْمَسَاجِدِ وَالْمَدَارِسِ صَحَّ،

---

کەوابو: (فَلاَ يَصِحُّ عَلَى جَنِينٍ) وەقف لە سەر کۆرپەی ناو زگ دروست نابێ، هەم لە سەر شتی نەبووش -سەربەخۆ- دروست نابێ، وەك بڵێ: وەقف بێ لە سەر منداڵەکانم. لەو کاتیشدا هیچ منداڵێکی نەبێ، یان بڵێ: لە سەر مزگەوتێك کە لەمەودوا دروست دەکرێ. بەڵام وەقفکردن لە سەر شتی نەبوو -بە پابەندی‌هەبووێك- دروست دەبێ، وەك بڵێ: وەقف بێ لە سەر ئەم منداڵانەم‌و لە سەر منداڵی‌منداڵەکانم. کە لەو کاتدا منداڵی‌منداڵەکانی نەبێ، یان بڵێ: وەقف بێ لە سەر ئەم مزگەوتەو لە سەر هەر مزگەوتێکی‌تری لەمەودوا لەو شوێنە دروست دەکرێ. ئینجا مەرجە: وەقفکردنەکەش گوناهی تێدا نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلاَعَلَى الْعَبْدِ لِنَفْسِهِ) هەروەها وەقف لە سەر کۆیلە بۆ خودی خۆی دروست نابێ، بەڵام (فَلَوْ أَطْلَقَ الْوَقْفَ عَلَيْهِ فَهُوَ وَقْفٌ عَلَى سَيِّدِهِ) ئەگەر تەنها گوتی وەقف بێ لە سەر کۆیلەکە، ئەوە دەبێتە وەقف لە سەر گەورەکەی (وَلَوْ أَطْلَقَ الْوَقْفَ عَلَى بَهِيمَةٍ) ئەگەر بێ باسکردنی هیچ شتێك وەقفی کردە سەر وڵاغێك (لَغَا) وەقفەکە بەتاڵە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (هُوَ وَقْفٌ عَلَى مَالِكِهَا) شتەکە دەبێتە وەقف لە سەر خاوەن وڵاغەکە (وَيَصِحُّ عَلَى ذِمِّيٍّ) دروستە: وەقف لە سەر کافری پەیمان لە ئەستۆ (لاَ مُرْتَدٍّ وَحَرْبِيٍّ) بەڵام لە سەر موسوڵمانی کافربوو و لە سەر کافری‌جەنگی دروست نیە.

(وَنَفْسِهِ) هەروەها وەقف لە سەر خودی‌خۆیشی دروست نیە: وەك ئەم شتەم وەقف کرد لە سەر خۆم (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام لە فەرموودەی‌بێ‌هێزدا: وەقف لە سەر خودی‌خۆیشی دروست دەبێ، کۆمەڵێکی زانایانیش ئەم فەرموودەیان هەڵبژاردوە، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە.

(وَإِنْ وَقَفَ عَلَى جِهَةِ مَعْصِيَةٍ) ئەگەر وەقفی کردە سەر ڕووێکی گوناهکاری (كَعِمَارَةِ الْكَنَائِسِ) وەك دروستکردن‌و چاککردنەوەی دێرو کەنیسەکان‌و مەیخانەکان‌و سینەماو شوێنەکانی‌تر: کە گوناهیان تێدا دەکرێ (فَبَاطِلٌ) وەقفەکە بەتاڵەو دانامەزرێ.

(أَوْ جِهَةِ قُرْبَةٍ) یان ئەگەر وەقفی کردە سەر ڕووێکی خواپەرستی (كَالْفُقَرَاءِ) وەك گەداو هەژارەکان، هەم (وَالْعُلَمَاءِ) زانایانی‌ئایینی، هەم (وَالْمَسَاجِدِ) مزگەوتەکان، هەم (وَالْمَدَارِسِ) خوێندنگاکانی ئایینی‌و هەم ڕێگەو جۆگەی‌ئاو و جەنگاوەرانی‌ئیسلام‌و قوتابیانی ئایینی، ئەوانە گشتی (صَحَّ) دروست دەبێ.

أَوْ جِهَة لاَتَظْهَرُ فيهاالْقُرْبَةُ كَالأَغْنياء صَحَّ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ إلاَّ بلَفْظ، وَصَرِيحُهُ: وَقَفْتُ كَذَا، أَوْ أَرْضِي مَوْقُوفَةٌ عَلَيْه، وَالتَّسْبِيلُ وَالتَّحْبِيسُ صَرِيحان عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ قالَ تَصَدَّقْتُ بكَذَا صَدَقَةً مُحَرَّمَةً أَوْ مَوْقُوفَةً أَوْ لاتُباعُ وَلاتُوهَبُ فَصَرِيحٌ فِي الأَصَحِّ، وَقَوْلُهُ: تَصَدَّقْتُ فَقَطْ لَيْسَ بِصَرِيحٍ وَإِنْ نَوَى، إلاَّ أَنْ يُضِيفَ إِلَى جِهَةٍ عامَّةٍ وَيَنْوِيَ،

---

(أَوْ جِهَةٍ لاَ تَظْهَرُ فِيهاالْقُرْبَةُ) یان ئەگەر وەقفی کردە سەر ڕووێکی وەها: کە خواپەرستی تێدا دیار نەبو (كَالأَغْنِياءِ) وەك وەقف لە سەر دەوڵەمەندەکان، ئەوەش (صَحَّ فِی الأَصَحِّ) دروست دەبێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەوەی ڕەچاو دەکرێ ئەوەیە: ڕووەکە گوناهکاریی تێدا نەبێ، ئیتر مەرج نیە: ڕووەکە لە حاڵەتی وەقفکردندا بێگومان هەبێ، بەڵکو ئەوەندە بەسە: بگونجێ ڕووەکە ببێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) لە باسی (اللَّقِيطْ)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: وەك وەقفکردن لە سەر ئیمامەتی ئەم مزگەوتە، یان قوتابیانی ئایینی ئەو شوێنە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بڵێ: ملكو ماڵی خۆم وەقف کرد لە سەر منداڵە نێرینەکانی خۆم. ئەو وەقفەش دروست دەبێو گوناهباریش نابێ، هەرچەندە مەبەستیشی بێبەشکردنی منداڵەمێیەکان بێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ گوتەی وەقفکردن ﴾

(وَلاَ يَصِحُّ) وەقف دروست نابێ (إِلاَّ بِلَفْظٍ) تەنها بە گوتنی ووشەیەك نەبێ، یان بە نووسینی ووشەیەك لەگەڵ نیەتی وەقفکردن (وَصَرِيحُهُ) ووشەی ئاشکرای وەقفکردن: (وَقَفْتُ كَذَا) ئەو شتەم وەقف کرد لە سەر ئەو شتە (أَوْ) یان بڵێ: (أَرْضِي مَوْقُوفَةٌ عَلَيْهِ) زەویەکەم وەقفکراوە، یان وەقفە لە سەر فلانکەس (وَالتَّسْبِيلُ) بەردەوام دامە ڕێگەی خوا، هەم (وَالتَّحْبِيسُ) ئەم ملکەم وەستاند بۆ خوا، هەردووکی (صَرِيحانِ عَلَى الصَّحِيحِ) ووشەی ئاشکرای وەقفکردنن، لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (تَصَدَّقْتُ بِكَذَا صَدَقَةً مُحَرَّمَةً) ئەو شتەم کردە خێرێکی حەرامکراو (أَوْ مَوْقُوفَةً) یان کردمە خێرێکیوەقفکراو (أَوْ لاَ تُباعُ وَلاَ تُوهَبُ) یان کردمە خێرێکی وەها: نەفرۆشرێو نەبەخشرێ (فَصَرِيحٌ فِی الأَصَحِّ) هەر یەکێك لەوانە ووشەیەکی ئاشکرایە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (وَقَوْلُهُ: تَصَدَّقْتُ فَقَطْ) ئەگەر بڵێ: کردمە خێر. هیچیتریش نەڵێ، ئەوە (لَيْسَ بِصَرِيحٍ وَإِنْ نَوَى) ووشەی ئاشکرا نیەو وەقفەکەشی پێ دانامەزرێ، هەرچەند نیەتی وەقفیشی هەبێ (إِلاَّ أَنْ يُضِيفَ إِلَى جِهَةٍ عامَّةٍ وَيَنْوِيَ) مەگەر خێرەکە بداتە پاڵ ڕووێکی گشتی، وەك بڵێ: ئەم شتەم کردە خێر لە سەر هەژارەکان. نیەتی وەقفکردنیشی هەبێ، ئەو کاتە وەقفەکەی دادەمەزرێ.

وَالأَصَحُّ أَنَّ قَوْلَهُ: حَرَّمْتُهُ أَوْ أَبَّدْتُهُ، لَيْسَ بِصَرِيحٍ، وَأَنَّ قَوْلَهُ: جَعَلْتُ الْبُقْعَةَ مَسْجِداً، تَصِيرُ بِهِ مَسْجِداً، وَأَنَّ الْوَقْفَ عَلَى مُعَيَّنٍ يُشْتَرَطُ فِيهِ قَبُولُهُ، وَلَوْ رَدَّ بَطَلَ حَقُّهُ شَرَطْنَا الْقَبُولَ أَمْ لاَ، وَلَوْ قَالَ: وَقَفْتُ هَذَا سَنَةً، فَبَاطِلٌ،

---

(وَالأَصَحُّ أَنَّ قَوْلَهُ) به فەرموودەی ڕاستتر ئەگەر بڵێ: (حَرَّمْتُهُ أَوْ أَبَّدْتُهُ) ئەو شتەم حەڕام کرد، یان یەکجاریم کرد (لَيْسَ بِصَرِيحٍ) ووشەی ئاشکرا نیە.

(وَأَنَّ قَوْلَهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر ئەگەر بڵێ: (جَعَلْتُ الْبُقْعَةَ مَسْجِداً) ئەم پارچە زەویەم کردە مزگەوت. ئەوە (تَصِيرُ بِهِ مَسْجِداً) بەو ووشەیە شوێنەکە دەبێتە مزگەوت، هەرچەند نیەتیشی نەبێ، بەڵام ئەگەر خانوویێکی دروست کردو ئیزنیدا: نوێژی تێدا بکرێ، بەو ئیزندانە نابێتە مزگەوت، هەرچەند نوێژیشی تێدا بکرێ.

هەروەها ئەگەر بڵێ: ئەم شوێنەم وەقف کرد بۆ نوێژ تێداکردن، ئەوە دەبێتە وەقفکراو بۆ نوێژ تێداکردن، بەڵام ئەگەر نیەتی مزگەوتی نەبوبێ، نابێتە مزگەوت، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَنَّ الْوَقْفَ عَلَى مُعَيَّنٍ) هەر بە فەرموودەیڕاستتر: وەقف لە سەر کەسێکیدیارکراو-جا یەك کەس بێ، یان کۆمەڵێك- (يُشْتَرَطُ فِيهِ قَبُولُهُ) بە مەرج دادەندرێ: وەقف لەسەرکراوەکە قبوڵی بکا، جا ئەگەر منداڵ، یان شێت بوو، ئەو کاتە سەرپەرشتکارەکەی بۆی قبوڵ دەکا (وَلَوْ رَدَّ) ئەگەر وەقف لەسەرکراویدیارکراو وەقفەکەی ڕەد کردەوە، ئەو کاتە (بَطَلَ حَقُّهُ) مافیخۆی لە وەقفەکەدا بەتاڵ دەبێتەوە، جیاوازی نیە: (شَرَطْنَا الْقَبُولَ أَمْ لاَ) قبوڵکردن بە مەرج دابنێین، یان نا.

## ﴿ مەرجەکانی وەقف ﴾

ئینجا بزانە: مەرجە وەقفەکە بە بەردەوامی بێو کاتی بۆ دانەندرێ، کەوابو: (وَلَوْ قَالَ وَقَفْتُ هَذَا سَنَةً) ئەگەر گوتی: ئەم شتەم بۆ ماویسالێك وەقف کرد (فَبَاطِلٌ) ئەوە بەتاڵەو دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر وەقفەکە بە بەردەوامی بێو کاتێك بۆ سود لێوەرگرتنی دابنێ، وەك بڵێ: ئەم شتەم وەقف کرد لە سەر فلانکەس ماوەی سالێك، ئینجا لە سەر هەژارانی ئەو شوێنە. یان بڵێ: ئەم شتەم وەقف کردە سەر فلانکەس تا کوڕێکم دەبێ. ئەو کاتە-لە هەردوو مەسەلەدا- وەقفەکە دروست دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، واتە: هەر کاتێك ساڵەکە تەولو بوو، وەقفەکە لە فلانکەسەکە وەردەگیرێتەوەو دەدرێتە هەژارەکان، یان ئەگەر کوڕێکی بوو، ئەوە دەدرێتە کوڕەکە.

هەروەها ئەگەر وەقفکردنەکە وەکو ئازادکردن بێ، واتە: ملکایەتیەکەی تەنها بۆ خوا بێ، وەك بڵێ: ئەم شتەم سالێك کردە مزگەوت، یان گۆڕستان، یان خوێندنگای ئایینی، ئەو

وَلَوْ قالَ: وَقَفْتُ عَلَى أَوْلَادِى أَوْ عَلَى زَيْد ثُمَّ نَسْلِه، وَلَمْ يَزِدْ فَالأَظْهَرُ صِحَّةُ الْوَقْف فَإِذَا انْقَرِضَ الْمَذْكُورُ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَبْقَى وَقْفاً وَأَنَّ مَصْرِفَهُ أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَى الْوَاقِف يَوْمَ انْقِرَاضِ الْمَذْكُورِ، وَلَوْ كانَ الْوَقْفُ مُنْقَطِعَ الأَوَّلِ كَوَقَفْتُهُ عَلَى مَنْ سَيُولَدُ لِى، فَالْمَذْهَبُ بُطْلَانُهُ، أَوْ مُنْقَطِعَ الْوَسَطِ كَوَقَفْتُ عَلَى أَوْلَادِى ثُمَّ رَجُلٍ ثُمَّ الْفُقَرَاءِ، فَالْمَذْهَبُ صِحَّتُهُ، وَلَوْ

---

کاتەش وەقفەکە بە بەردەوامی دروست دەبێو ماوەدانانەکە ڕەفتاری پێناکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها وەقفی(مُنْقَطِعُ الآخِرِ): دوابڕاویش دروستە، کەوابو: (وَلَوْ قالَ وَقَفْتُ عَلَى أَوْلَادِي) ئەم شتەم وەقف کرد لە سەر منداڵەکانیخۆم (أَوْ) یان بڵێ: (عَلَى زَيْدٍ ثُمَّ نَسْلِهِ) وەقفم کرد لە سەر زەید، ئینجا لە سەر منداڵەکانی زەید (وَلَمْ يَزِدْ) لەوەش زیاتری نەگوت، ئەوە (فَالأَظْهَرُ صِحَّةُ الْوَقْفِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: وەقفەکە دروست دەبێ (فَإِذَا انْقَرَضَ الْمَذْكُورُ) جا هەر کاتێك ئەو ناوبراوانە بڕانەوەو نەمان، ئەو کاتەش (فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَبْقَى وَقْفاً) بە فەرموودەی بەهێزتر: شتەکە لە دوای ئەوانیش هەر بە وەقفکراوی دەمێنێتەوە، ئینجا (وَأَنَّ مَصْرِفَهُ أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَى الْوَاقِفِ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: بەرهەمی وەقفەکە دەدرێتە نزیکترین خزمە هەژارەکانی وەقفکەرەکە، ئینجا نزیکیەکەش لە ڕووی ڕەحمەوە ڕەچاو دەکرێ، نەك لە ڕووی میراتەوە (يَوْمَ انْقِرَاضِ الْمَذْكُورِ) لەو ڕۆژەی ناوبراوەکان بڕاونەوە، کەوابو: کیژی کوڕ، لە کوڕی مام لە پێشترە، مامو خاڵیش یەکسانن.

جا ئەگەر وەقفکەرەکە هیچ خزمی نەبون، یان هەیبون بەڵام گشتیان دەوڵەمەند بوون، ئەو کاتە پێشەوای موسوڵمانان بەرهەمی وەقفەکە لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکا، ئینجا—لە فەرموودەیەکیتردا— بۆ هەژارەکانی موسوڵمانان سەرفی دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ كانَ الْوَقْفُ مُنْقَطِعَ الأَوَّلِ) ئەگەر وەقفەکە پێش بڕاو بوو: (کـ) وەك بڵێ: (وَقَفْتُهُ عَلَى مَنْ سَيُولَدُ لِي) وەقفم کردە سەر ئەو منداڵانەی کە لەمەودوا بۆم دەبن، ئینجا بۆ سەر هەژاران. یان وەقفم کردە سەر مزگەوتێك کە لەمەودوا دەکرێ، ئینجا بۆ سەر هەژاران. ئەوە (فَالْمَذْهَبُ بُطْلَانُهُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب وەقفەکە بەتاڵە، چونکە سەرەتایەکەی دانەمەزراوە.

بەڵام (أَوْ مُنْقَطِعَ الْوَسَطِ) ئەگەر وەقفەکە ناوەند بڕاو بوو: (کـ) وەك بڵێ: (وَقَفْتُ عَلَى أَوْلَادِي ثُمَّ رَجُلٍ ثُمَّ الْفُقَرَاءِ) وەقفم کرد لە سەر منداڵەکانی خۆم، ئینجا لە سەر پیاوێك، ئینجا لە سەر هەژارەکانی ئەم شوێنە. ئەوە (فَالْمَذْهَبُ صِحَّتُهُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: وەقفەکە دروست دەبێو لە دوای منداڵەکانی دەدرێتە هەژارەکان، بەڵام (وَلَوْ

اقْتَصَرَ عَلَى وَقَفْتُ فَالأَظْهَرُ بُطْلاَنُهُ، وَلاَ يَجُوزُ تَعْلِيقُهُ كَقَوْلِه: إِذَا جاءَ زَيْدٌ فَقَدْ وَقَفْتُ، وَلَوْ وَقَفَ بِشَرْطِ الْخِيارِ بَطَلَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِذَا وَقَفَ بِشَرْطِ أَنْ لاَ يُؤَجَّرَ اُتُّبِعَ شَرْطُهُ، وَأَنَّهُ إِذَا شَرَطَ فِي وَقْفِ الْمَسْجِدِ اخْتِصاصَهُ بِطائِفَةٍ كَالشَّافِعِيَّةِ اُخْتُصَّ كَالْمَدْرَسَةِ وَالرِّباطِ، وَلَوْ وَقَفَ عَلَى شَخْصَيْنِ ثُمَّ الْفُقَراءِ فَماتَ أَحَدُهُما فَالأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ أَنَّ نَصِيبَهُ يُصْرَفُ إِلَى الآخَرِ.

---

اقْتَصَرَ عَلَى وَقَفْتُ) ئەگەر تەنها گوتی: وەقفم کرد. واتە: دیاری نەکرد بدرێتە کێ؟ ئەوە (فَالأَظْهَرُ بُطْلاَنُهُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: وەقفەکە بەتاڵە، چونکە نازاندرێ بۆ کێیە.
(وَلاَ يَجُوزُ تَعْلِيقُهُ) دروست نیە وەقفکردنەکە هەڵبواسێ (كَقَوْلِه) وەك بڵێ: (إِذَا جاءَ زَيْدٌ فَقَدْ وَقَفْتُ) هەر کاتێك زەید هات ئەم شتەم وەقف کرد. ئەوە دروست نیە.
هەروەها ئەگەر بڵێ: خانووەکەم سێ ڕۆژ پێش دەردی مردنم وەقفی سەر مزگەوت بێ. ئەوەش دروست نابێ، بەڵام ئەگەر بە مردنی خۆی هەڵیبواسێ، وەك بڵێ: هەر کاتێك مردم، خانووەکەم وەقفی سەر هەژارەکان بێ. یان خانووەکەم لە دوای مردنم وەقفی سەر مزگەوت بێ. ئەو کاتە دروست دەبێو وەکو وەسێت بڕیاری بۆ دەدرێ.
هەروەها وەقفی وێنەی ئازادکردنیش دروستە هەڵبواسرێ، وەك بڵێ: هەر کاتێك ڕەمەزان هات ئەم زەوییەم کردە مزگەوت. ئەوەش دروست دەبێ، وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.
(وَلَوْ وَقَفَ بِشَرْطِ الْخِيارِ) ئەگەر شتێکی وەقف کرد بە مەرجی پەشیمانبوونەوەی بۆ هەبێ، ئەوە (بَطَلَ عَلَى الصَّحِيحِ) وەقفەکە بەتاڵ دەبێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستتر (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ إِذَا وَقَفَ بِشَرْطِ أَنْ لاَ يُؤَجَّرَ) ئەگەر شتێکی وەقف کرد بەو مەرجەی وەقفکراوەکە بە کرێ نەدرێ، ئەوە وەقفەکە دروستەو هەم (اُتُّبِعَ شَرْطُهُ) مەرجەکەیشی بەجێدەهێندرێ بەو مەرجەی حاڵەتێکی ناچاری ڕوو نەدا، ئەگینا: بەجێ ناهێندرێ (وَأَنَّهُ إِذَا شَرَطَ فِي وَقْفِ الْمَسْجِدِ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر لە وەقفکردنی مزگەوتدا بە مەرجی دانا (اخْتِصاصَهُ بِطائِفَةٍ كَالشَّافِعِيَّةِ) مزگەوتەکە تایبەت بێ: بە تەنها چینێك: وەك شافعیەکان، یان مالیکیەکان...ئەوەش دروستەو هەم (اُخْتُصَّ) تایبەت دەبێ بە چینەکە (كَالْمَدْرَسَةِ وَالرِّباطِ) وەك بە مەرج دانانی تایبەتبوونی خوێندنگاو خانەی خێراتەکان، واتە: ئەوانیش تایبەت دەبن.
(وَلَوْ وَقَفَ عَلَى شَخْصَيْنِ) ئەگەر شتێکی وەقف کرد لە سەر دوو کەسان (ثُمَّ الْفُقَراءِ) ئینجا لە سەر هەژارەکان (فَماتَ أَحَدُهُما) ئینجا لەو دوو کەسانەش یەکێکیان مرد، ئەوە (فَالأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ) بە دەقی فەرموودەیڕاستتر: (أَنَّ نَصِيبَهُ يُصْرَفُ إِلَى الآخَرِ) بەشی مردووەکەش دەدرێتە زیندووەکە، ئینجا کە ئەویش مرد، گشتی دەدرێتە هەژارەکان.

(فَصْلٌ) قَوْلُهُ: وَقَفْتُ عَلَى أَوْلَادِى وَأَوْلَادِأَوْلَادِى، يَقْتَضِيالتَّسْوِيَةَ بَيْنَ الْكُلِّ وَكَذَا لَوْ زَادَ: مَاتَنَاسَلُوا أَوْ بَطْناً بَعْدَبَطْنٍ، وَلَوْ قَالَ: عَلَى أَوْلَادِى ثُمَّ أَوْلَادِأَوْلَادِى ثُمَّ أَوْلَادِهِمْ مَا تَنَاسَلُوا، أَوْ عَلَى أَوْلَادِى وَأَوْلَادِأَوْلَادِى اَلأَعْلَى فَالأَعْلَى أَوْ اَلأَوَّلِ فَالأَوَّلِ، فَهُوَ للتَّرْتِيبِ، وَلاَ يَدْخُلُ أَوْلاَدُالأَوْلَادِ فِيالْوَقْفِ عَلَىالأَوْلَادِ فِيالأَصَحِّ، وَيَدْخُلُ أَوْلَادُالْبَنَاتِ فِيالْوَقْفِ عَلَىالذُّرِّيَّةِ وَالنَّسْلِ وَالْعَقِبِ وَأَوْلَادِالأَوْلَادِ إِلاَّ أَنْ يَقُولَ عَلَىمَنْ يَنْتَسِبُ إِلَيَّ مِنْهُمْ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بڕیاری ووشەکانی وەقف ﴾

(قَوْلُهُ) ئەگەر بڵێ: (وَقَفْتُ عَلَى أَوْلَادِى وَأَوْلَادِأَوْلَادِى) ئەم شتەم وەقف کردە سەر منداڵەکانمو منداڵەکانیمنداڵەکانم. ئەوە دروستەو پێی دەگوترێ (وَقْفُ التَّشْرِيك): وەقفی هاوبەشکردن، کەوابو: ئەو ڕستەیە (يَقْتَضِيالتَّسْوِيَةَ بَيْنَ الْكُلِّ) وا دەخوازێ: وەقفەکە بە یەکسانی لە نێوان گشت منداڵو منداڵیمنداڵەکانیدا بەش بکرێ: نێرەکانیانو مێیەکانیان (وَكَذَا) هەروەها بە یەکسانی لە نێوانیاندا بەش دەکرێ (لَوْ زَادَ مَا تَنَاسَلُوا) ئەگەر زیاتریش بڵێ: تا زاوزێ دەکەن (أَوْ یان بڵێ: (بَطْناً بَعْدَ بَطْنٍ) زگ لە دوای زگ.

بەڵام (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (عَلَى أَوْلَادِى ثُمَّ أَوْلَادِأَوْلَادِى ثُمَّ أَوْلَادِهِمْ مَا تَنَاسَلُوا) وەقفم کرد لە سەر منداڵەکانم، ئینجا منداڵەکانیمنداڵەکانم، ئینجا منداڵەکانی ئەوانیش تا زاوزێ دەکەن (أَوْ) یان گوتی: (عَلَى أَوْلَادِى وَأَوْلَادِأَوْلَادِى اَلأَعْلَى فَالأَعْلَى) وەقفم کردە سەر منداڵەکانمو منداڵەکانیمنداڵەکانم هی سەرەوەتر، ئینجا سەرەوەتر (أَوِ الأَوَّلِ فَالأَوَّلِ) یان لەپێشتر، جا لەپێشتر (فَهُوَ) ئەوە -لەو مەسەلانەدا- (لِلتَّرْتِيبِ) بۆ ڕیزکردنەو پێی دەگوترێ: (وَقْفُ التَّرْتِيبِ)، واتە: تا زگێکی نزیکتر هەبێ، نادرێتە زگەکەی دوای ئەوی.

(وَلاَ يَدْخُلُ أَوْلَادُ الأَوْلَادِ) منداڵەکانیمنداڵەکان ناچنەگەڵ منداڵەکان (فِيالْوَقْفِ عَلَىالأَوْلَادِ) لەو وەقفەدا: کە کراوەتە سەر تەنها منداڵەکان (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە ڕاستیدا منداڵەکانیمنداڵەکان منداڵیمرۆڤەکە نین، بەڵام (وَيَدْخُلُ أَوْلَادُالْبَنَاتِ) منداڵەکانی کیژەکان دەچنە گەڵ منداڵەکانیمنداڵەکان (فِيالْوَقْفِ عَلَىالذُّرِّيَّةِ) لەو وەقفەدا: کە کراوەتە سەر وەچەو هەم (وَالنَّسْلِ) سەر نەتەوەو هەم (وَالْعَقِبِ) سەر پاشماوەو هەم (وَأَوْلَادِالأَوْلَادِ) سەر منداڵیمنداڵەکان، چونکە ووشەکان دەیانگرنەوە(إِلاَّ أَنْ يَقُولَ) تەنها ئەو کاتە منداڵەکانی کیژەکان ناچنە گەڵ منداڵەکانیمنداڵەکان، وەك بڵێ: (عَلَى مَنْ يَنْتَسِبُ إِلَيَّ مِنْهُمْ) وەقفم کرد لە سەر ئەوانەی نەژادیان دێتەوە سەرە من لە منداڵەکانیمنداڵەکانم. چونکە منداڵەکانی کیژەکانی نەژادیان دەچێتە سەر باوکی خۆیان، نەك دایکیان.

وَلَوْ وَقَفَ عَلَى مَوالِيهِ وَلَهُ مُعْتِقٌ وَمُعْتَقٌ قُسِمَ بَيْنَهُما، وَقِيلَ يَبْطُلُ، وَالصِّفَةُ الْمُتَقَدِّمَةُ عَلَى جُمَلٍ مَعْطُوفَةٍ تُعْتَبَرُ فِي الْكُلِّ: كَوَقَفْتُ عَلَى مُحْتاجِي أَوْلَادِي وَأَحْفادِي وَإِخْوَتِي، وَكَذَا الْمُتَأَخِّرَةُ عَلَيْها وَالإِسْتِثْناءُ إِذَا عُطِفَ بِواوٍ كَقَوْلِهِ: عَلَى أَوْلَادِي وَأَحْفادِي وَإِخْوَتِي الْمُحْتاجِينَ، أَوْ إِلاَّ أَنْ يَفْسُقَ بَعْضُهُمْ.

---

(وَلَوْ وَقَفَ عَلَى مَوالِيهِ) ئەگەر وەقفی کردە سەر خزمەکانی کۆیلایەتی (وَلَهُ مُعْتِقٌ وَمُعْتَقٌ) لە هەمان کاتیشدا ئازادکەرو ئازادکراوێکی هەبو (قُسِمَ بَيْنَهُما) وەقفەکە لە نێوانیاندا بەش دەکرێ (وَقِيلَ يَبْطُلُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بەتاڵ دەبێتەوە.

(وَالصِّفَةُ الْمُتَقَدِّمَةُ عَلَى جُمَلٍ مَعْطُوفَةٍ) ئەو سیفەتەی وەپێش چەند ڕستەیەك كەوتووە: كە بە دوای‌یەکتردا هاتوون (تُعْتَبَرُ فِي الْكُلِّ) سیفەتەکە لە گشت ڕستەکاندا ڕەچاو دەکرێ (كَـ) وەك بڵێ: (وَقَفْتُ عَلَى مُحْتاجِي أَوْلَادِي وَأَحْفادِي وَإِخْوَتِي) وەقفم کرد لە سەر هەژارەکانی منداڵەکانم‌و نەوەکانم‌و برایەکانم. واتە: سیفەتی هەژاری لە هەرسێکیاندا ڕەچاو دەکرێ.

(وَكَذَا الْمُتَأَخِّرَةُ عَلَيْها) هەروەها سیفەتی دواکەوتووش لە گشتیاندا ڕەچاو دەکرێ، هەم (وَالإِسْتِثْناءُ) جیاکردنەوەش لە گشتیاندا ڕەچاو دەکرێ (إِذَا عُطِفَ بِواوٍ) هەر کاتێك –لە هەردووکیاندا– ڕستەکان بە پیتی (ولو) بە دوای یەکتری‌دا بێن (كَقَوْلِهِ) وەك بڵێ: (عَلَى أَوْلَادِي وَأَحْفادِي وَإِخْوَتِي الْمُحْتاجِينَ) وەقفم کرد لە سەر منداڵەکانم‌و نەوەکانم‌و برایەکانم کە هەژار بن. واتە: سیفەتی هەژاری هەرسێکیان دەگرێتەوە (أَوْ) یان بڵێ: (إِلاَّ أَنْ يَفْسُقَ بَعْضُهُمْ) وەقفم کردە سەر منداڵەکانم‌و نەوەکانم‌و برایەکانم، تەنها ئەوەیان نەبێ: کە فاسق دەبێ. واتە: لە هەرسێکیاندا فاسقەکان جیا دەکرێنەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ملکایەتی وەقفکراوەکە ﴾

پێشەکی بزانە: کڕین‌و فرۆشتن‌و بەخشین‌و گۆڕینەوەو بە میراتگرتنی شتی وەقفکراو، هیچیان دروست نیەو دانامەزرێ، لە سەرچاوەکاندا بەڵگەیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە: ﴿عَنْ ابْنِ عمر رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ أَصابَ أَرْضاً بِخَيْبَرَ، فَقالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: إِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَها. فَتَصَدَّقَ بِها عُمَرُ: إِنَّهُ لاَ يُباعُ أَصْلُها وَلاَ يُورَثُ وَلاَ يُوهَبُ، لاَ جُناحَ عَلَى مَنْ وَلِيَها أَنْ يَأْكُلَ مِنْها بِالْمَعْرُوفِ أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقاً غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ﴾ رواه الشيخان، ئیمامی(عمر) پارچە ملکێکی لە (خیبر) دەست کەوت، ئینجا بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ملکەکەی وەقف کرد لە سەر هەژاران‌و خزمەکان‌و ڕێگەی‌خوا، تاکو نەفرۆشرێ‌و بە میرات نەگیرێ‌و نەبەخشرێ، ئەو کەسەی سەرپەرشتی وەقفەکەش دەکا، گوناهی ناگاتێ بەگوێرەی‌عادەت لە وەقفکراوەکە بخواو دەرخواردی دۆستی خۆیشی بدا، بەڵام هیچی نەکاتە ملکی خۆی.

(فَصْلٌ) اَلأَظْهَرُ أَنَّ الْمِلْكَ فِي رَقَبَةِالْمَوْقُوف يَنْتَقِلُ إِلَىاللهِ تَعَالَى أَيْ يَنْفَكُّ عَنْ إِخْتِصاصِ الآدَمِيِّ، فَلاَ يَكُونُ لِلْواقِف وَلاَ لِلْمَوْقُوف عَلَيْه، وَمَنافِعُهُ مِلْكٌ لِلْمَوْقُوف عَلَيْه يَسْتَوْفِيها بِنَفْسه وَبِغَيْرِه بِإِعارَة وَإِجارَة، وَيَمْلِكُ الأُجْرَةَ وَفَوائِدَهُ كَثَمَرَة وَصُوف وَلَبَن، وَكَذَا الْوَلَدُ فِيالأَصَحِّ، وَالثَّانِي يَكُونُ وَقْفاً، وَلَوْ ماتَتِ الْبَهِيمَةُ إِخْتَصَّ بِجِلْدِها، وَلَهُ مَهْرُ الْجارِيَةِ إِذَا وُطِئَتْ بِشُبْهَة أَوْ نِكاحٍ

---

﴿ ئاگاداری ﴾: وەقف بە شاهیدیی دوو پیاو، یان بە پیاوێك و دوو ئافرەت، یان بە پیاوێك و سوێندخواردن ئاشكرا دەبێ، هەروەك لە باسی شاهیدیدا ڕوون دەكرێتەوە، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

(اَلأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ الْمِلْكَ فِي رَقَبَةِالْمَوْقُوفِ) ملكایەتی لە گەردەنی وەقفكراوەكەدا (يَنْتَقِلُ إِلَىاللهِ تَعالَى) دەگواسترێتەوە بۆ لای خوای گەورە (أَيْ) واتە: (يَنْفَكُّ عَنْ إِخْتِصاصِ الآدَمِيِّ) لە تایبەتیی ئادەمیزاد دەپچڕێ، كەواتە: (فَلاَ يَكُونُ لِلْواقِفِ وَلاَ لِلْمَوْقُوفِ عَلَيْهِ) ملكایەتی وەقفكراوەكە: نەبۆ وەقفكەرەكە دەبێ، نە بۆ وەقف لەسەركراوەكە دەبێ.

بەلام (وَمَنافِعُهُ) سوودەكانیوەقفكراوەكە (مِلْكٌ لِلْمَوْقُوفِ عَلَيْهِ) ملكی وەقف لەسەركراوەكەنە، كەواتە: (يَسْتَوْفِيها بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ) وەقف لەسەركراوەكە ئەو سوودانە لە وەقفكراوەكە وەردەگرێ: یان بە خۆی، یان بە كەسێكیتر (بِإِعارَةٍ) وەك بە خواستن بیداتە كەسێكیتر (وَإِجارَةٍ) یان بە كرێ بیداتێو كرێیەكەی بۆ خۆی وەربگرێ، كەوابو: (وَيَمْلِكُ الأُجْرَةَ) وەقف لەسەركراوەكە دەبێتە خاوەنی كرێیوەقفكراوەكەو هەم (وَفَوائِدَهُ) دەبێتە خاوەنی بەرهەمەكانیوەقفكراوەكەش: (كَثَمَرَةٍ) وەكو میوەكەییو هەم (وَصُوفٍ) خوریەكەیو هەم (وَلَبَنٍ) شیرەكەیو (وَكَذَا الْوَلَدُ) هەم ئەو بێچووەشی كە لە دوای وەقفكردن پەیدا دەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَالثَّانِي) بە فەرموودەی دووەمی بێهێز (يَكُونُ وَقْفاً) بێچووەكەش وەكو دایكەكە دەبێتە وەقفكراو.

(وَلَوْ ماتَتِ الْبَهِيمَةُ) ئەگەر ئاژەڵەوەقفكراوەكە مرد (اِخْتَصَّ بِجِلْدِها) پیستەكەی تایبەتە بە وەقف لەسەركراوەكە، ئینجا كە دەباغ كرا: پاك دەبێتەوەو دەبێتەوە وەقفكراو، ئینجا بزانە: ئەگەر ئاژەڵێكی گۆشت حەلالی وەقفكراو هاتە سەر حاڵەتی مردن، ئەو كاتە دروستە: سەر ببڕدرێو بە پارەی گۆشتەكەی ئاژەڵێكی وەك خۆی، یان بەشەئاژەڵێك بكڕدرێو لە جێی وەقف بكرێ، جا ئەگەر نەگونجا: ئەو كاتە گۆشتەكەی دەدرێتە وەقف لەسەركراوەكە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَهُ مَهْرُ الْجارِيَةِ إِذَا وُطِئَتْ) مارەیی جاریەی وەقفكراویش بۆ وەقف لەسەر كراوەكەیە، هەر كاتێك جیماعی لەگەڵ كرا: (بِشُبْهَةٍ) بە هەڵە (أَوْ نِكاحٍ) یان بە مارەبڕین

إِنْ صَحَّحْناهُ وَهُوَ الأَصَحُّ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَيَمْلِكُ قِيمَةَ الْعَبْدِالْمَوْقُوف إِذَا أُتْلِــفَ بَــلْ يُشْتَرَى بِها عَبْدٌ لِيَكُونَ وَقْفاً مَكانَهُ، فَإِنْ تَعَذَّرَ فَبَعْضُ عَبْد، وَلَوْ جَفَّــتِ الشَّــجَرَةُ لَــمْ يَنْقَطِعِ الْوَقْفُ عَلَىالْمَذْهَبِ، بَلْ يُنْتَفَعُ بِها جِذْعاً، وَقِيلَ تُبَاعُ، وَالثَّمَنُ كَقِيمَةِ الْعَبْدِ،

---

(إِنْ صَحَّحْناهُ) ئەگەر مارەبڕینەکەی دروست بکەین (وَهُوَ الأَصَحُّ) ئەو دروستکردنە بە فەرموودەی ڕاستترە.

﴿ فەوتاندن و بێکەڵکبوونی وەقفکراوەکان ﴾

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ لاَ يَمْلِكُ قِيمَةَ الْعَبْدِالْمَوْقُوفِ) نە وەقف لەسەرکراوەکەو نە وەقفکەرەکە: هیچیکیان نابنە خاوەنی تۆڵەیکۆیلە، یان شتە وەقفکراوەکە (إِذَا أُتْلِفَ) هەر کاتێك بفەوتێندرێو تۆڵەی وەربگیرێ، جیاوازی نیە: بێگانەیەك بیفەوتێنێ، یان وەقفکەرەکە بیفەوتێنێ، یان وەقف لەسەرکراوەکە بە دوژمنکاری بیفەوتێنێ، واتە: ئەگەر وەقف لەسەرکراوەکە بە دوژمنکاری نەیفەوتێنێ، نابێتە زامین (بَلْ يُشْتَرَى بِها عَبْدٌ) بەڵکو -بەو تۆڵەیە- کۆیلەیەکی وەکو خۆی، یان شتێکی وەکو خۆی دەکڕدرێ (لِيَكُونَ وَقْفاً مَكانَهُ) تاکو ببێتە وەقف لە جێی شتەفەوتاوەکە.

(فَإِنْ تَعَذَّرَ) جا ئەگەر نەگونجا کۆیلەیەکی، یان شتێکی وەکو خۆی بکڕدرێ، ئەو کاتە (فَبَعْضُ عَبْدٍ) بەشە کۆیلەیەك، یان بەشە شتێکی وەکو شتە فەوتاوەکە دەکڕدرێو لە جێی دەکرێتە وەقف.

ئینجا بزانە: ئەو کەسەی کڕینەکە دەکاو کڕدراوەکەش دەکاتە وەقف، دەبێ دادوەر بێ -واتە: ئەگەر دادوەر نەبو، ئەو کاتە سەرپەرشتکاری وەقفەکە ئەو کارانە ئەنجام دەدا- جا لە بەر ئەوەی بە خودی کڕینەکەش شتەکە نابێتە وەقف، بۆیێ پێویستە: ووشەی وەقفکردن لە لای دادوەرەکە، یان لە لای سەرپەرشتکارەکە بگۆترێ، جا ئەگەر نەگونجا بەشێکیشی پێ بکڕدرێ، ئەو کاتە گشت تۆڵەوەرگیراوەکە دەدرێتە وەقف لەسەرکراوەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ جَفَّتِ الشَّجَرَةُ) ئەگەر درەختەوەقفکراوەکە ووشك بوو، یان هەڵکەنا، ئەوە (لَمْ يَنْقَطِعِ الْوَقْفُ) وەقفەکە نابڕێتەوە (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (بَلْ يُنْتَفَعُ بِها جِذْعاً) بەڵکو بە پارچەکرایی سودی لێوەردەگیرێ، جا ئەگەر نەگونجا سودی لێوەربگیرێ، ئەو کاتە وەقفەکە دەبڕێتەوەو درەختەکەش دەبێتە ملکی وەقف لەسەرکراوەکە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (تُبَاعُ) درەختەکە دەفرۆشرێو (وَالثَّمَنُ كَقِيمَةِالْعَبْدِ) پارەکەشی وەکو تۆڵەی کۆیلەکەیڕابردوو ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ.

وَالأَصَحُّ جَوازُ بَيْعِ حُصْرِالْمَسْجِد إذَا بَلِيَتْ وَجُذُوعِهِ إذَا انْكَسَـرَتْ وَلَـمْ تَصْلُحْ إلاَّ لِلإِحْراقِ، وَلَو انْهَدَمَ مَسْجِدٌ وَتَعَذَّرَتْ إعادَتُهُ لَمْ يُبَعْ بِحالٍ.

---

(وَالأَصَحُّ) فەرمووده‌ی ڕاستتر ئەمەیە: (جَوازُ بَيْعِ حُصْرِالْمَسْجِدِ إذَا بَلِيَتْ) دروستە حەسیرەکان‌و ڕایەخەکانی مزگەوت بفرۆشرێن هەر کاتێك زۆر کۆن بون، جیاوازی وەقفکراوەکان‌و وەقف نەکراوەکان نیە، هەم (وَجُذُوعِهِ إذَا انْكَسَرَتْ) لقەدارەکانیشی دروستە بفرۆشرێن هەر کاتێك شکان‌و (وَلَمْ تَصْلُحْ إلاَّ لِلإِحْراقِ) جگە لە سوتاندن بۆ هیچیتر بە کەڵك نەئەهاتن، ئینجا پارەکەش بۆ بەرژەوەندی مزگەوتەکە سەرف دەرکرێ، هەروەك لە (مغنى)و (الشبراملسى)دا فەرموویانە.

## ﴿ مزگەوت‌و گۆڕستانی وێرانبوو ﴾

(وَلَوانْهَدَمَ مَسْجِدٌ) ئەگەر مزگەوتێك ڕوخا، یان شوێنێك وێران کراو وازیان لە مزگەوتەکەی هێنا (وَتَعَذَّرَتْ إعادَتُهُ) نەشگونجا دروست بکرێتەوە، ئەوە هەر بە وەقفکراوی دەمێنێتەوە، کەواتە: (لَمْ يُبَعْ بِحالٍ) بە هیچ جۆرێك زەمینەکەی نافرۆشرێ، ئینجا کەلوپەلەکەشی بۆ هەڵدەگیرێ، جا ئەگەر ئومێدی چاککردنەوەی نەبو، ئەو کاتە بەو کەلوپەلە مزگەوتێکیتر دروست دەکرێ، جا ئەگەر نەگونجا، ئەو کاتە شتێکی گشتیی بۆ موسوڵمانان پێ دروست دەکرێ: وەکو خانەی خێرات‌و ئاو و ئەو جۆرە شتانە.

جا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو دەربارەی کەلوپەلی مزگەوت بوو، بەڵام بەرهەمی وەقفی مزگەوتی ڕوخاو، ئەگەر چاوەڕوانی‌چاککردنەوەی بکرێ، ئەوە بۆی هەڵدەگیرێ، ئەگەر چاوەڕوان نەدەکرا، ئەو کاتە بۆ مزگەوتێکی‌تری نێزیك ئەو مزگەوتە سەرف دەکرێ، جا ئەگەر نەگونجا، ئەو کاتە بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێ، بەڵام ئەگەر مزگەوتەکە نەڕوخابێ‌و بەرهەمی وەقفەکەشی لە خۆی زیاد بێ، ئەوە ئەگەر چاوەڕوانی تێکدان‌و نوێکردنەوەی بێ، ئەو کاتە پارەکەی بۆ پاشەکەوت دەکرێ، جا ئەگەر پێویستی بە نوێکردنەوە نەبو، ئەو کاتە دروست نیە پارەکەی بۆ پاشەکەوت بکرێ، بەڵکو واجبە: بەو پارەیە زەمین‌و باغ بۆ مزگەوتەکە بکڕدرێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە.

**﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم:** خوێندگای ئایینی‌و خانەی‌خێرات‌و ئەو جۆرە شوێنەگشتیانەش وەکو مزگەوت بڕیاریان بۆ دەدرێ لە گشت ئەو ڕوونکردنەوانەی‌ڕابردوودا، هەروەك لە (الشبراملسى)دا فەرموویەتی، کەوابو: ئەو کتێبانەی وەقف کراونە سەر خوێندگایەکی ئایینی‌و هەم بەرهەمی ئەو مڵکانەی وەقف کراونە سەر خوێندگایەکە، گشتی دەگواسترێنەوە بۆ خوێندگایەکی نزیك ئەوێ‌و بەرهەمی وەقفەکەشی لە قوتابیان‌و لە بەرژەوەندی خوێندگاکە سەرف دەکرێ.

دووەم: گۆڕینی شێوەی وەقفکراوەکە دروست نیە، مەگەر وەقفکەرەکە بە مەرجی دانابێ: بەگوێرەی بەرژەوەندی ڕەفتار بکرێ، ئەو کاتە دروستە، بەڵام ئیمامی(السُّبْكي) دەفەرموێ: گۆڕینی شێوەی وەقفکراوەکە بە سێ مەرج دروستە، یەکەم: گۆڕینەکەی کەم و بێو ناوی وەقفەکە نەگۆڕێ. دووەم: خودی وەقفەکە لانەبردرێ. سێیەم: بەرژەوەندیوەقفەکەشی تێدا بێ. هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: ئەگەر گۆڕستانێکی وەقفکراو وێران بوو و ئاسەواری نەما، دروست نیە: کاربەدەست بە کرێی بدا، هەرچەند کرێیەکەشی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف بکا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، ئینجا بزانە: ئەو درەختانەی لە گۆڕستانەکاندا دەڕوێن، میوەکەیان بۆ گشت کەسێك حەڵاڵە، بەڵام وەها باشترە: لە بەرژەوەندی گۆڕستانەکە سەرف بکرێ، هەروەها ئەو درەختەی لە مزگەوتدا بۆ مزگەوت چێندراوە، ئەویش میوەکەی بە پارە دەدرێو بۆ بەرژەوەندی مزگەوتەکە سەرف دەکرێ، بەڵام ئەگەر بۆ خێرات بێ، ئەو کاتە بۆ گشت کەسێك حەڵاڵە، جا ئەگەر بەرژەوەندی مزگەوت لە بڕینی درەختەکەدا بوو، ئەو کاتە دروستە ببڕدرێ، هەروەك لە (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: بەڵام درەختیتەڕی گۆڕستان نابێ ببڕدرێ تا ووشك دەبێ، ئینجا کە ووشك بوو، دەبڕدرێو بۆ بەرژەوەندی گۆڕستانەکە سەرف دەکرێ، واللهُ أعْلَمُ.

چوارەم: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفى)دا بە ئیزنی پێشەوای موسوڵمانان بۆ (قازی) دروستە: شتێکی وەقفکراو بە شتێکیتر بگۆڕێتەوە، بەو مەرجەی بەرژەوەندی وەقفەکەی تێدا بێ: وەك شتەوەرگیراوەکە لە وەقفەکە باشتر بێو هەم وەرگیراوەکەش: زەوی، یان باغ، یان خانوو بێ.

هەروەها ئەگەر مزگەوتێك بەرتەنگ بوو و ڕێگەیەکی بەرینی لە تەنیشت بوو، دروستە بەشێکی ڕێگەکەی وەگەڵ بدرێو بەرین بکرێ، بەو مەرجەی ڕێگەکە تەسك نەبێ، هەروەها ئەگەر ملکی کەسێك لە تەنیشت مزگەوتێکی بەرتەنگ بوو، ئەو کاتەش زەویەکەی بە پارە لێوەردەگیرێ بۆ مزگەوت بەرین کردن، هەرچەند ڕازیش نەبێ، هەروەها ئەگەر ڕێگەش تەسك بوو، دروستە بەشێکی مزگەوتی وەگەڵ بدرێو فراوان بکرێ، بەو مەرجەی مزگەوتەکە پێویستی بەو بەشە نەبێ، هەروەك لە (مجمع الأنهر)و (الدرالمنتقى)دا ناوەڕۆکی ئەم چوارەمە ڕوون کراوەتەوە.

پێنجەم: بە مەزهەبی ئیمام(أحمد): ئەگەر وەقفکراوەکە خراب بوو و سودی لێوەرنەگیرا، دروستە بەشێکی بفرۆشرێ تاکو بەشەکەیتری پێ چاك بکرێتەوە، بەڵام ئەگەر بە هیچ جۆرێك نەگونجا هیچ جۆرە سودێکی لێوەربگیرێ، ئەو کاتە گشتی دەفرۆشرێو بە پارەی

(فَصْلٌ) إِنْ شَرَطَ الْواقِفُ اَلنَّظَرَ لِنَفْسِه أَوْ غَيْرِه اُتُّبِـعَ، وَإِلاَّ فَـالنَّظَرُ لِلْقاضِـي عَلَـى الْمَذْهَبِ، وَشَرْطُ النّاظِرِ: اَلْعَدالَةُ وَالْكِفايَةُ وَالإِهْتِداءُ إِلَىالتَّصرُّف، وَوَظِيفَتُهُ: الْعِمـارَةُ وَالإِجارَةُ وَتَحْصِيلُ الْغَلَّةِ وَقِسْمَتُها، فَإِنْ فُوِّضَ إِلَيْه بَعْضُ هَذه الأُمُورِ لَمْ يَتَعَدَّهُ،

---

فرۆشراوەکە شتێکی‌تر دەکڕدرێ‌و لە جێگەی‌فرۆشراوەکە وەقف دەکرێتەوە، هەروەها ئەگەر مزگەوتیش خراب بوو و بە هیچ جۆرێك نەگونجا نوێژی تێ‌دا بکرێ، ئەویش هەمان بڕیاری‌ڕابردووی وەقفکراوەکەی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (مغنی ابن قدامة)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی سەرپەرشتکاریەتی وەقفکراو ﴾

(إِنْ شَـرَطَ الْواقِـفُ النَّظَـرَ لِنَفْسِـهِ أَوْ غَيْـرِهِ) ئەگەر وەقفکەرەکە بە مەرجی دانابێ: سەرپەرشتکاریەتی وەقفەکە بۆ خۆی بێ، یان بۆ کەسێکی‌تر بێ (اُتُّبِعَ) مەرجەکەی جێبەجێ دەکرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بۆ هیچ کەسێکی دانەنابێ (فَـالنَّظَرُ لِلْقاضِـی) ئەو کاتە سەرپەرشتکاری‌ی وەقفەکە بۆ (قازی)یە (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَشَـرْطُ النّـاظِرِ) مەرجی سەرپەرشتکاری وەقف: (اَلْعَدالَـةُ) دەبی دادپەروەر بێ، هەم (وَالْكِفايَـةُ) توانای دەستکاری‌ی هەبێ، واتە: (وَالإِهْتِـداءُ إِلَىالتَّصَـرُّفِ) شارەزایی دەستکاری‌کردنی ئەو شتەی هەبێ: کە سەرپەرشتی‌ی دەکا.

(وَوَظِيفَتُهُ) ئەرکی سەر شانی سەرپەرشتکارەکە (اَلْعِمارَةُ) چاککردنەوەی وەقفکراوەکەیەو (وَالإِجـارَةُ) بەکرێدانیەتی‌و (وَتَحْصِـيلُ الْغَلَّـةِ) وەدەستهێنانی بەرووبومەکەیەتی‌و هەم (وَقِسْمَتُها) بەشکردنیەتی بە سەر خاوەن مافەکاندا (فَإِنْ فُوِّضَ إِلَيْـه بَعْضُ هَـذِهِ الأُمُـورِ) جا ئەگەر لەو کارانە هەندێکی درابوە دەست، ئەو کاتە (لَـمْ يَتَعَدَّهُ) لەوەندەیان زیاتر ناکا، واتە: چەندی دراوەتە دەست هەر ئەوەندەی دەکا.

جا بزانە: بۆ سەرپەرشتکارەکە -بە ئیزنی قازی- لە کاتی پێویستدا دروستە: شت قەرز بکا بۆ وەقفکراوەکە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، هەروەها لە حاڵەتی ناچاریشدا دروستە ماڵەوەقفکراوەکە بە قەرز بداتە کەسێکی‌تر، بەڵام ئەگەر ناچار نەبێ، ئەو کاتە دروست نیە، بە قەرزی بدا، هەروەك لە ماڵی یەتیمیشدا ئەوها بڕیار دراوەو، لە (القليوبی)و (البجيرمی)دا فەرموویانە.

دیسان بزانە: سەرپەرشتکارەکە مافی ئەو کرێیەی هەیە: کە وەقفکەرەکە بۆی داناوە، جا ئەگەر وەقفکەرەکە هیچی بۆ دانەنابو، ئەو کاتە دەچێتە لای قازی تاکو کرێی هاووێنەی -لە بەرهەمی‌وەقفەکە- بۆ دابنێ، جا (ابن الصباغ) فتوای داوە: کە بە بێ قازی بۆی دروستە: کرێی هاوێنە -لە بەرهەمی‌وەقفەکە- بۆ خۆی دابنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، واتە: بە بەڵگەی حەدیسەکەی(ابن عمر)ی‌ڕابردوو.

وَلِلْواقِفِ عَزْلُ مَنْ وَلاّهُ وَنَصْبُ غَيْرِهِ إِلاّ أَنْ يَشْرِطَ نَظَرَهُ حالَ الْوَقْفِ، وَإِذا آجَرَ النّاظِرُ فَزادَتِ الأُجْرَةُ فِي الْمُدَّةِ أَوْ ظَهَرَ طالِبٌ بِالزِّيادَةِ لَمْ يَنفَسِخِ الْعَقْدُ فِي الأَصَحِّ.

## (كِتابُ الْهِبَةِ)

اَلتَّمْلِيكُ بِلاَ عِوَضٍ هِبَةٌ، فَإِنْ مَلَّكَ مُحْتاجاً لِثَوابِ الآخِرَةِ فَصَدَقَةٌ، فَإِنْ نَقَلَهُ إِلَى مَكانِ الْمَوْهُوبِ لَهُ إِكْراماً لَهُ فَهَدِيَّةٌ،

---

(وَلِلْواقِفِ عَزْلُ مَنْ وَلاّهُ) بۆ وەقفکەرەکە دروستە: ئەو سەرپەرشتکارە لابدا: کە چاودێری وەقفەکەی داوەتێو (وَنَصْبُ غَيْرِهِ) یەکێکیتر لە جێی دابنێ (إِلاّ أَنْ يَشْرِطَ نَظَرَهُ حالَ الْوَقْفِ) مەگەر لە حاڵەتی وەقفکردندا بە مەرجی دانابێ: ئەو سەرپەرشتکارە چاودێریی بکا، ئەو کاتە دروست نیە لای‌بدا.

(وَإِذا آجَرَالنّاظِرُ) هەر کاتێك سەرپەرشتکارەکە ماڵە وەقفکراوەکەی بە کرێ دا (فَزادَتِ الأُجْرَةُ فِي الْمُدَّةِ) جا لە ماوەی بەکرێدانەکەدا کرێیەکەی زیاد بوو (أَوْ ظَهَرَ طالِبٌ بِالزِّيادَةِ) یان کەسێکیتر بە کرێیەکی زیاتری دەویا، ئەو کاتە (لَمْ يَنْفَسِخِ الْعَقْدُ) مامڵەتەکە هەڵناوەشێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە کاتی خۆیدا–بە قازانج– مامڵەتەکە دامەزراوە.

## ﴿ كِتابُ الْهِبَةِ: پەرتوکی بەخشین ﴾

واتە: لە حاڵەتی ژیانیدا شتێك بە خۆڕایی بکاتە ملکی کەسێکیتر. ئینجا (اَلتَّمْلِيكُ بِلاَ عِوَضٍ) شت کردنەملکی کەسێکیتر بە خۆڕایی لە حاڵەتی ژیانیدا (هِبَةٌ) تەنها پێی دەگوترێ: بەخشین. بەڵام (فَإِنْ مَلَّكَ مُحْتاجاً لِثَوابِ الآخِرَةِ) ئەگەر لە حاڵەتی ژیانیدا بۆ خێری قیامەت شتێك بکاتە ملکی کەسێکی پێویست، ئەو کاتە (فَصَدَقَةٌ) پێی دەگوترێ: خێر. ئینجا (فَإِنْ نَقَلَهُ) ئەگەر لە حاڵەتی ژیانیدا بەخشراوەکە، یان خێرەکەی گواستەوە (إِلَى مَكانِ الْمَوْهُوبِ لَهُ) بۆ شوێنی پێبەخشراوەکە (إِكْراماً لَهُ) بۆ ڕێزلێنانی، ئەو کاتە (فَهَدِيَّةٌ) هەم پێی دەگوترێ: دیاری.

ئینجا بزانە: هەرسێك بەشەکان سوننەتن، بەڵام بەشی‌دووەم لە هەموویان خێری گەورەترە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿تَهادَوْا تَحابُّوا﴾ رواه البخاري في‌الأدب المفرد، وفي صحيحه بلفظ: ﴿تَهادَوْا فَإِنَّ الْهَدِيَّةَ تُذْهِبُ وَحَرَ الصَّدْرِ﴾ دیاری بۆ یەکتری ببەن، یەکتریتان خۆش دەوێ. دیاری ڕقو قینەی ناو دڵ لادەبا.

دیسان بزانە: بەخشین بە هەرسێك جۆریەوە، حەرامە بدرێتە ئەو کەسەی لە بێشەرعی سەرفی دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوای گەورە دەفەرموێ:

وَشَرْطُ الْهِبَةِ إِيجَابٌ وَقَبُولٌ لَفْظاً، وَلاَ يُشْتَرَطَانِ فِي الْهَدِيَّةِ عَلَى الصَّحِيحِ، بَلْ يَكْفِي الْبَعْثُ مِنْ هَذَا وَالْقَبْضُ مِنْ ذَاكَ،

---

﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ یارمەتی یەكتری بدەن لە سەر چاكەو لەخواترسان، یارمەتی یەكتری مەدەن لە سەر گوناهو دوژمنكاری.

(وَشَرْطُ الْهِبَةِ) مەرجی دروستبوونی بەخشین (إِيجَابٌ) گۆتنی ووشەی كردنەملكە، وەك بڵێ: بەخشیمە تۆ. یان بە خۆڕایی دامە تۆ (وَقَبُولٌ لَفْظاً) هەم گۆتنی ووشەی قبوڵكردنە، وەك بڵێ: قبوڵم كرد. یان ڕازیمە. هەروەها بەخشین بە نووسینو بە ووشەی نائاشكراش دادەمەزرێ ئەگەر نیەتی بەخشینی لەگەڵدا بێ، وەك بڵێ: ئەو شتەم بۆ تۆ بێ. هەروەها بەخشین بە وێدانیش-واتە: بە بێگۆتنی هیچ ووشەیەك- دادەمەزرێ لە سەر فەرموودەیەكی هەڵبژاردراو، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَلاَ يُشْتَرَطَانِ فِي الْهَدِيَّةِ) گوتنی ووشەی كردنەملكو قبوڵكردن بە مەرج دانانرێن: نە لە دیاریداو نە لە خێركردندا (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (بَلْ يَكْفِي الْبَعْثُ مِنْ هَذَا وَالْقَبْضُ مِنْ ذَاكَ) بەڵكو ئەوەندە بەسە: ئەمەیان خێرەكەی بداتێ، یان دیاریەكەی بۆ بنێرێ، ئەویش وەریبگرێ، هەروەها خەڵاتی كاربەدەستەكانیش پێویست بە گۆتن ناكا.

ئینجا بزانە: مەرجی ماڵبەخشەكەش ئەمەیە: ماڵەكە ملكی خۆی بێ، واتە: دروست نیە سەرپەرشتكار: ماڵی شێتو منداڵ بە خێرو بەخشین بدا، هەروەها دروست نیە: ژن ماڵی مێردەكەی بە خێرو بەخشین بدا، هەروەها مەرجە لەو كەسانەش بێ: كە دروستە ماڵی خۆیان بە خۆڕایی بدەن، واتە: منداڵو شێتو زۆرلێكراو و قەدەغەكراو نەبێ، كەواتە: بەخشینی ئەو جۆرە كەسانەش دروست نابێ، هەروەها مەرجی پێبەخشراویش ئەمەیە لەوانە بێ: بتوانێ شت بكاتە ملكی خۆی، كەواتە: دەبێ سەرپەرشتكار بەخشینەكە بۆ منداڵو شێت قبوڵ بكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر مێرد خشڵی زێڕو زیوی كڕیو دایە ژنەكەیخۆی تاكو دەبەری بكاو خۆی پێبڕازێنێتەوە، مێردەكەش هیچ ووشەی بەخشینو كردنەملكیشی نەگوتبو، ئەو خشڵە نابێتە ملكیژنەكەو هەر لە ملكایەتیمێردەكەدا دەمێنێتەوەو لە دوایمردنیشی دەبێتە میرات، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلەیان هێناوەو لە (بغیة المسترشدین)شدا بە درێژی ڕوون كراوەتەوە، كەوابو: ئەگەر بووە كێشەیان، پێویستە ژنەكە، یان میراتگرەكانی ژنەكە شاهیدیان هەبێ: كە ئەو خشڵەی بە ملكایەتی دراوەتێ، جا ئەگەر شاهید نەبو، ئەو كاتە باوەڕ بە مێردەكەو بە میراتگرەكانیمێردەكە دەكرێ بەو مەرجەی مێردەكە سوێند بخوا: كە بە ملكایەتی نەیداوەتێ، یان میراتگرەكانی مێردەكە سوێند بخۆن: كە (نەیانزانیوە ئەم خشڵەی بە ملكایەتی درابێتێ).

وَلَوْ قالَ: أَعْمَرْتُكَ هَذه الدَّار فَإِذَا مُتَّ فَهِـيَ لِوَرَثَتِـكَ، فَهِـيَ هِبَـةٌ، وَلَـوْ اقْتَصَـرَ عَلىأَعْمَرْتُكَ، فَكَذَا فِي الْجَديد، وَلَوْ قالَ فَإِذَا مُتَّ عادَتْ إِلَيَّ، فَكَذَا فِي الأَصَحِّ، وَلَـوْ قالَ: أَرْقَبْتُكَ أَوْ جَعَلْتُها لَكَ رُقْبَى: أَيْ إِنْ مُتَّ قَبْلي عـادَتْ إِلَـيَّ وَإِنْ مُـتُّ قَبْلَـكَ اسْتَقَرَّتْ لَكَ، فَالْمَذْهَبُ طَرْدُ الْقَوْلَيْنِ الْجَديد وَالْقَديمِ،

---

ئینجا هەر لە (بغیـة)دا دەفـەرموێ: ئەگـەر کیژەکانیمردووەکە داوایان کـرد: ئـەم شـتەی ئێستا بـە دەسـتیانەوەیە، باوکیـان بـە ملکایـەتی دلویەتیـە ئـەوان. میراتگرەکـانیتریش گوتیان: وا نیەو ئەمەش هەر میراتە. ئەو کاتەش پێویستە کیژەکان شاهیدیان هـەبێ، جـا ئەگـەر شـاهید نـەبو، ئـەو کاتـە میراتگرەکـانیتر سـوێند دەخـۆن: کـە (نـازانن ئـەم شـتە دراوەتە کیژەکان بە ملکایەتی).

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو، لەو حاڵەتـەدا بـوو: کـە بـە دیـاری نـەناردرابێ، چـونکە ئەگـەر باوکەکە، یان مێردەکە: شتەکە، یـان خشـڵەکە بـە دیاری بنێـرێ، ئـەو کاتـە بـە-تـەنها- وەرگرتن دەبێتە ملکی کیژەکانو ژنەکـە، چـونکە گوتـەی وێدانو قبـوڵکردن لـە دیـاریدا مەرج نیە، هەروەك تازە ڕابراو، لە (تحفة)و (الشروانی)شدا لـە باسـی بـەخێوکردنی ژن ئـەم مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی: (أَعْمَرْتُكَ هَذِهِ الدَّارَ) ئەم خانووەم بە درێژایی تەمەنت دامە تـۆ (فَـإِذَا مُتَّ فَهِيَ لِوَرَثَتِكَ) جا هەر کاتێك تۆ مردی خانووەکە بـۆ میراتگرەکانت بێ (فَهِـيَ هِبَـةٌ) ئـەوە بەخشـینەو هـەر کاتێـك قبـوڵی کـرد‌و وەریگـرت، دەبێتـە ملکیخـۆی، لـە دوای مردنیشـی دەبێتە ملکی میراتگرەکانی (وَلَوْ اقْتَصَرَ عَلَـى أَعْمَرْتُـكَ) ئەگـەر تـەنها گـوتی: خانووەکـەم بـە درێژایی تەمەنت دامـە تـۆ (فَكَذَا) ئـەوەش هـەر بەخشـینەو بڕیـاری وەك ڕسـتەکەیڕابردووە (فِـي الْجَدِيـدِ) لـە فـەرموودەی نوێدا (وَلَـوْ قـالَ) ئەگـەر گوتی: (فَـإِذَا مُـتَّ عـادَتْ إِلَـيَّ) ئـەم خانووەم بە درێژایی تەمەنت دامە تۆ، جا هەر کاتێك تـۆ مـردی بـۆ خـۆم بگەڕێتـەوە (فَكَذَا) ئەوەش هەر بەخشینەو بڕیاری وەك ڕستەکەیڕابردووە، مەرجەکـەش بـەتاڵ دەبێتـەوە (فِـي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، واتە: بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێتەوە.

(وَلَوْ قالَ) هەروەها ئەگەر گوتی: (أَرْقَبْتُكَ) ئەم خانووەم بە چاوەڕوانی بەخشیمە تـۆ (أَوْ جَعَلْتُها لَكَ رُقْبَى) یان ئەم خانووەم بە چاوەڕوانی کردمـە هـی تـۆ (أَيْ) واتـەی چاوەڕوانی ئەمەیە: (إِنْ مُتَّ قَبْلِي عادَتْ إِلَيَّ) ئەگەر تـۆ پـێش مـن مـردی شـتەکە بـۆ خـۆم بگەڕێتـەوە (وَإِنْ مُتُّ قَبْلَكَ اسْتَقَرَّتْ لَكَ) ئەگەر منیش پێش تـۆ مـردم هـەر بۆ خـۆت بمێنێتـەوە، ئـەوە (فَالْمَـذْهَبُ طَـرْدُ الْقَـوْلَيْنِ الْجَدِيـدِ وَالْقَـدِيمِ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتی مەزهـەب: هـەردوو فەرموودەکـەی نـوێو کـۆن لێرەشدا دێنـە جـێ، واتـە: بـە فـەرموودەی نـوێی بەهـێز:

وَما جازَ بَيْعُهُ جازَ هِبَتُهُ، وَما لاَ: كَمَجْهُولٍ وَمَغْصُوبٍ وَضالٍّ فَلاَ، إلاَّ حَبَّتَيْ حِنْطَةٍ وَنَحْوِهِما، وَهِبَةُ الدَّيْنِ لِلْمَدِينِ إبْراءٌ، وَلِغَيْرِهِ باطِلَةٌ فِي الأَصَحِّ،

---

ئەگەر قبولّی بکاو وەری‌بگریّ، دەبێتە بەخشینێکی یەکجاری‌و لە دوای مردنیشی بۆ میراتگرەکانیەتی، واتە: مەرجەکە بەتاڵ دەبێتەوەو بۆ خاوەنەکەشی ناگەڕێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویّ: ﴿لاتُعْمِرُوا وَلاتُرْقِبُوا، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً أَوْأُرْقِبَهُ فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ﴾ رواه أبوداود والنسائي وأصله في الصحيحين، ئێوە بە درێژایی تەمەن هیچ شتێك مەبەشن‌و بە چاوەڕوانیش مەیبەخشن، جا هەر کەسێك شتێکی بە درێژایی تەمەن پێ‌بەخشرا، یان شتێکی بە چاوەڕوانی پێ‌بەخشرا، ئەوە لە دوای مردنیشی بۆ میراتگرەکانیەتی. واتە: بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێتەوە.

(وَما جازَ بَيْعُهُ)هەر شتێك فرۆشتنی دروست بێ (جازَ هِبَتُهُ) بەخشینیشی دروستە (وَما لاَ) هەر شتێك فرۆشتنی دروست نەبێ: (كَمَجْهُولٍ) وەك شتی نەزانراو، هەم (وَمَغْصُوبٍ) شتی زەوتکراو، هەم (وَضالٍّ) شتی ونبوو (فَلاَ) ئەو جۆرە شتانەبەخشینیشیان دروست نابێ (إلاَّ حَبَّتَيْ حِنْطَةٍ) تەنها دوو دەنکە گەنم‌و (وَنَحْوِهِما) ئەوەی وەکو دوو دەنکە گەنمیشە لە شتە بێ‌نرخەکان، ئەوان بەخشینیان دروستە، هەرچەند فرۆشتنیشیان دروست نیە.

ئینجا بزانە: دروستە شتی زەوتکراو ببەخشێتە ئەو کەسەی توانای وەرگرتنەوەی هەیە، هەروەها ئەگەر دووکەس شتێکیان لێ تێکەڵی یەکتری بوو، ئەوە دروستە هەریەکەیان بەشی خۆی ببەخشێتەئەوی‌تریان.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر گوتیە یەکێکی‌تر: گەردەنت ئازاد بێ لە هەر شتێکی لە باغەکەی من، یان لە خانووەکەی مندا دەیخۆی. یان بۆ تۆم حەلاڵ کرد هەرچی لە باغەکەمدا، یان لە خانووەکەمدا هەیە. لەو مەسەلانەدا تەنها خواردنی‌بۆ دروستە، واتە: بۆی دروست نیە بیداتە کەسێکی‌تر، یان بیباتەوە ماڵەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها دروستە مرۆڤ بە بێ‌ئیزن سود لە کەلوپەلی دۆستی‌خۆی وەربگرێ‌و خواردەمەنیەکەی بخواو بۆ ماڵەوەشی ببا، بەو مەرجەی بزانێ: دۆستەکەی بەو دەستکاریانە ڕازی دەبێ، هەروەك لە (شرح مسلم)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَهِبَةُالدَّيْنِ لِلْمَدِينِ) بەخشینی قەرزەکەی بە قەرزدارەکەی (إبْراءٌ) گەردەن ئازادکردنەو پێویست ناکا قبولّی‌بکا، بەڵام (وَلِغَيْرِهِ) بەخشینی قەرزەکەی بە کەسێکی‌تری جگە لە قەرزدارەکە (باطِلَةٌ فِي الأَصَحِّ) بەتاڵەو دانامەزرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستتر، بەڵام لە فەرموودەیەکی‌تر-کە کۆمەڵێك بە ڕاستتریان داناوە- دروستە: قەرزەکەی ببەخشێتە کەسێکی‌تری جگە لە قەرزدارەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ يُمْلَكُ مَوْهُوبٌ إلاَّ بقَبْضٍ بإذْنِ الْواهِب، فَلَوْ ماتَ أَحَدُهُما بَيْنَ الْهِبَةِ وَالْقَبْضِ قَامَ وارِثُهُ مَقامَهُ، وَقِيلَ يَنْفَسِخُ الْعَقْدُ، وَيُسَنُّ لِلْوالِدِ الْعَدْلُ فِي عَطِيَّةِ أَوْلاَدِهِ بأَنْ يُسَوِّيَ بَيْنَ الذَّكَرِ وَالأُنْثَى،

---

(وَلاَ يُمْلَكُ مَوْهُوبٌ) شتى بەخشراو و خێرو دیاری نابێتە ملكی پێبەخشراوەكە (إلاَّ بِقَبْضٍ) تەنها بە وەرگرتنی‌شتەكە دەبێتە ملكی‌پێبەخشراوەكە (بِإِذْنِ الْواهِبِ) وەرگرتنەكەش بە ئیزنی ماڵبەخشەكە بێ، كەواتە: ئەگەر وەری‌نەگرتبو، ئەو كاتە ماڵبەخشەكە بۆی دروستە: پەشیمان ببێتەوەو ماڵەكەی‌خۆی وەربگرێتەوە ﴿عَنْ أُمِّ كَلْثُومٍ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ هَدِيَّةً إِلَى النَّجاشِيِّ، فَماتَ قَبْلَ أَنْ تَصِلَ إِلَيْهِ، فَاسْتَرَدَّها النَّبِيُّ ﷺ﴾ حديث صحيح رواه الحاكم والبيهقي، پێغەمبەر ﷺ دیاریەكی بۆ (النجاشی) نارد، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە دەستی، مرد، جا پێغەمبەر ﷺ دیاریەكەی گەڕاندەوە.

(فَلَوْ ماتَ أَحَدُهُما) جا ئەگەر لە ماڵبەخشەكەو لە پێبەخشراوەكە یەكێكیان مرد (بَيْنَ الْهِبَةِ وَالْقَبْضِ) لە ماوەی نێوان بەخشین‌و وەرگرتندا، ئەو كاتە (قامَ وارِثُهُ مَقامَهُ) میراتگری مردووەكە دەبێتە جێگری وی: بۆ وێدانی بەخشراوەكە، یان بۆ وەرگرتنی بەخشراوەكە (وَقِيلَ يَنْفَسِخُ الْعَقْدُ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: مامڵەتی بەخشینەكە هەڵدەوەشێتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بووە كێشەیان: ماڵبەخشەكە گوتی: بە ئەمانەت، یان بە سپاردن لە لای تۆم داناوە، یان گوتی لێمت وەرنەگرتوە. پێبەخشراوەكەش گوتی: بە بەخشین داومتی‌و وەرم گرتوە. ئەوە –ئەگەر شاهید نەبو– بە سوێندخواردن باوەڕ بە ماڵبەشخەكە دەكرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ بەخشینەكانی دایك‌و باوك ﴾

(وَيُسَنُّ لِلْوالِدِ) بۆ دایك‌و باوك‌و داپیرەو باپیرە سوننەتە: (اَلْعَدْلُ فِي عَطِيَّةِ أَوْلاَدِهِ) بە دادپەروەری ڕەفتار بكەن: لەو بەخشینەی دەیدەنە منداڵەكانیان، جیاوازی نیە: بەخشین بێ، یان دیاری بێ، یان خێر بێ، یان هەر شتێكی‌تری بەخۆڕایی بێ.

ئینجا دادپەروەریەكەش: (بِأَنْ يُسَوِّيَ بَيْنَ الذَّكَرِ وَالأُنْثَى) بە یەكسانی خودی شتەكە بداتە نێرو مێیەكان، یان لە بەرامبەر شتەكە شتێكی‌تریش بداتە ئەوانی‌تر: بێ جیاوازی لە نێوان نێرو مێیەكان ﴿عَنِ النُّعْمانِ بنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنهما: أَنَّ أَباهُ نَحَلَهُ غُلاماً فَانْطَلَقَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ لِيُشْهِدَهُ، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَفَعَلْتَ هَذا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ؟ قالَ: لاَ. قالَ: اتَّقُوا اللهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ﴾ رواه الشيخان، وفي رواية لمسلم: ﴿فَأَشْهِدْ عَلَى هَذا غَيْرِي﴾ باوكم كۆیلەیەكی پێ بەخشیم‌و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ تاكو بیكاتە شاهید، جا پێغەمبەر ﷺ

وَقيلَ كَقِسْمَةِ الإرْثِ، وَلِلأَبِ الرُّجُوعُ فِي هِبَةِ وَلَدِه، وَكَذَا لِسائِرِالأُصُولِ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَشَرْطُ رُجُوعِه بَقاءُ الْمَوْهُوبِ فِي سَلْطَنَةِالْمُتَّهِبِ فَيَمْتَنِعُ بِبَيْعِه وَوَقْفِه،

---

فەرمووی: ئایا گشت منداڵەکانت ئەو بەخشینەت داونێ؟ گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە خوا بترسن‌و دادپەروەربن لە نێوان منداڵەکانتان، جگە لە من کەسێکی‌تر بکە شاهیدی ئەم بەخشینە. (وَقِيلَ كَقِسْمَةِ الإرْثِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: وەك بەشکردنی میرات شتیان پێ ببەخشێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر دادپەروەریی نەکرد، ئەو کاتە ناپەسندە، لە لای چەند زانایەکیش حەرامە، واتە: بەڵام بەخشینەکەی دروست دەبێ، چونکە لە حەدیسەکەدا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە باوکەکە کرد: کەسێکی‌تر بکاتە شاهید. جا ئەگەر منداڵەکانی‌تر رازی بون هیچیان نەدرێتێ، یان پێبەخشراوەکان هەژار بون، یان رێزێکی ئایینییان هەبو، یان بێ‌بەشکراوەکان فاسق‌و پیاوخراپ بون، ئەو کاتە: حەرام نیەو ناپەسندیش نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلِلأَبِ) بۆ باوك دروستە: (الرُّجُوعُ فِي هِبَةِ وَلَدِه) پەشیمان ببێتەوە: لە بەخشینی منداڵەکەی خۆی، واتە: شتە بەخشراوەکەی لێوەربگرێتەوە، بەڵکو ئەگەر منداڵەکە دایك، یان باوکی ئازار دەدا، ئەو کاتە سوننەتە: بەخشراوەکەی لێوەربگرێتەوە، بەو مەرجەی پێی تەمبێ بێ، هەروەها ئەگەر بەخشراوەکەی لە گوناهکاری بەکار دەهێنا، ئەو کاتە: واجبە لێی وەربگرێتەوە، بەو مەرجەی پێی واز لە گوناهەکە بێنێ، جا لەو پەشیمانبوونەوەیەدا جیاوازی بەخشین‌و خێرو دیاری نیە، بەڵام دروست نیە: گۆشتی قوربانی‌و زەکات‌و نەزرو کەففارەتی لێوەربگرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا روون کراوەتەوە.

(وَكَذَا لِسائِرِ الأُصُولِ) هەروەها بۆ گشت تیرەی سەرەوە: وەك باپیرەو دایك‌و داپیرەش، دروستە لە بەخشینەکەیاندا پەشیمان ببنەوە (عَلَى الْمَشْهُورِ) لەسەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعَ فِيها إلاَّالْوَالِدَ فِيما يُعْطِي وَلَدَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بسندصحيح، حەڵاڵ نیە، واتە: حەرامە مرۆڤی موسوڵمان شتێك ببەخشێ، ئینجا لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوەو وەری‌بگرێتەوە، تەنها بۆ باوك دروستە: پەشیمان ببێتەوە لەو بەخشینەی داویەتیە منداڵەکەی‌خۆی، واتە: لێی‌وەربگرێتەوە.

(وَشَرْطُ رُجُوعِه) مەرجی‌دروستی پەشیمانبوونەوەی باوك‌و ئەوانی‌تر لە بەخشینەکەیاندا، ئەمەیە (بَقاءُالْمَوْهُوبِ فِي سَلْطَنَةِالْمُتَّهِبِ) بەخشراوەکە لەژێر دەستی پێبەخشراوەکەدا مابێ، کەوابو: (فَيَمْتَنِعُ) پەشیمانبوونەوەکە قەدەغە دەبێ‌و دروست نیە (بِبَيْعِه وَوَقْفِه)

لابِرَهْنه وَهبَته قَبْلَ الْقَبْضِ وَتَعْليق عِتْقه وَتَزْويجِها وَزِراعَتها وَكَذَا الإجارَةُ عَلَى الْمَذْهَب، وَلَوْ زالَ مِلْكُهُ وَعادَ لَمْ يَرْجعْ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ زادَ رَجَعَ فيه بزيادَته الْمُتَّصلَةَ لاَالْمُنْفَصلَة، وَيَحْصُلُ الرُّجُوعُ: بِرَجَعْتُ فِيما وَهَبْتُ أَوْ اسْتَرْجَعْتُهُ أَوْ رَدَدْتُهُ إِلَى مِلْكِي أَوْ نَقَضْتُ الْهِبَةَ، لاَبِبَيْعِه وَوَقْفه وَهِبَته وَإِعْتاقه وَوَطْئِها فِي الأَصَحِّ،

---

به هۆی فرۆشتن، یان وەقفکردنی ماڵەبەخشراوەکە، واتە: ئەگەر پێبەخشراوەکە ماڵە بەخشراوەکەی فرۆشت، یان وەقفی کرد، یان بەخشی‌یە کەسێکی‌ترو ئەویش وەری‌گرت، ئەو کاتە: نە باوك نە باپیرەو نە ئەوانی‌تر، هیچیان بۆیان دروست نیە پەشیمان ببنەوەو لێ‌یوەربگرنەوە، چونکە لە ملکایەتی پێبەخشراوەکەدا نەماوە.

بەڵام (لاَ بِرَهْنِه) نەك بە ڕەهنکردنی‌و (وَهِبَتِه قَبْلَ الْقَبْضِ) بە بەخشینی پێش وەرگرتنی‌و (وَتَعْليقِ عِتْقِه) بە هەڵواسینی‌ئازادکردنی‌و (وَتَزْوِيجِها) بە مارەبڕینی‌و (وَزِراعَتِها) بە داچاندنی زەویە بەخشرلوەکەو (وَكَذَاالإجارَةُ) هەروەها بەکرێدانی‌بەخشرلوەکەش (عَلَى الْمَذْهَب) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، واتە: بەوانەی‌ڕابردوو پەشیمانبوونەوە قەدەغە نابێ‌و هەر دروستە، چونکە بەخشرلوەکە هەر لەژێر ملکایەتی پێبەخشرلوەکەدا ماوە.

(وَلَوْ زالَ مِلْكُهُ وَعادَ) ئەگەر پێبەخشراوەکە ملکایەتیەکەی لە بەخشراوەکەدا نەما، ئینجا ملکایەتیەکەی دووبارە بۆی گەڕاوە: وەك بیفرۆشێتە کەسێکی‌تر، یان بیبەخشێتە کەسێکی‌ترو کەسەکەش وەری‌بگرێ، ئینجا لە ڕێگەی میراتەوە، یان بە کڕین ماڵەکە بگەڕێتەوە ژێر ملکایەتی‌ی، ئەو کاتە (لَمْ يَرْجِعْ فِي الأَصَحِّ) نە باوك‌و نە ئەوانی‌تریش نابێ پەشیمان ببنەوەو لێ‌یوەربگرنەوە، لە فەرموودەی‌ڕاسترتردا، چونکە ئەم جارە لە لای ئەوانەوە نەبۆتە ملکی پێبەخشراوەکە.

(وَلَوْ زادَ) ئەگەر ماڵە بەخشراوەکە -لە کاتی پەشیمانبوونەوەدا- زیادی کردبو، ئەو کاتەش (رَجَعَ فِيهِ بِزِيادَتِهِ الْمُتَّصِلَةِ) کە پەشیمان بۆوە، ئەو زێدەییەی بە بەخشراوەکەوەیە: وەك قەڵەوی‌و گەورەیی، ئەویش لەگەڵی وەردەگرێتەوە (لاَالْمُنْفَصِلَةِ) بەڵام ئەو زێدەییەی جیا بۆتەوە: وەك بێچوو، ئەوەیان لەگەڵی وەرناگرێتەوە.

(وَيَحْصُلُ الرُّجُوعُ) پەشیمانبوونەوە لە بەخشیندا دێتە جێ (بِرَجَعْتُ فِيما وَهَبْتُ) کە بڵێ: پەشیمان بومەوە لەو شتەی‌دا کە بەخشیومەتە فلانکەس (أَوِ اسْتَرْجَعْتُهُ) یان بڵێ: شتەبەخشراوەکەم بۆ خۆم گەڕاندەوە (أَوْ رَدَدْتُهُ إِلَى مِلْكِي) یان بڵێ گەڕاندمەوە بۆ ملکایەتی خۆم (أَوْ نَقَضْتُ الْهِبَةَ) یان بڵێ: بەخشینەکەم هەڵوەشاندەوە.

(لاَ بِبَيْعِه) نەك بە فرۆشتنی بەخشراوەکەو (وَوَقْفِه) بە وەقفکردنی‌و (وَهِبَتِه) بە بەخشینی‌و (وَإِعْتاقِه) بە ئازادکردنی‌و (وَوَطْئِها) بە جیماع لەگەڵ کردنی: واتە: بەوانە پەشیمانبوونەوە نایەتە جێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

وَلاَ رُجُوعَ لِغَيْرِ الأُصُول فِي هِبَة مُقَيَّدَة بِنَفْيِ الثَّوابِ، وَمَتَى وَهَبَ مُطْلَقاً فَلاَ ثَــوابَ إِنْ وَهَبَ لِدُونِه، وَكَذا لأَعْلَى مِنْهُ فِي الأَظْهَر، وَلِنَظِيرِه عَلَى الْمَذْهَب، فَــإِنْ وَجَــبَ فَهُــوَ قِيمَةُ الْمَوْهُوب فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ لَمْ يُثِبْهُ فَلَهُ الرُّجُوعُ،

---

(وَلاَ رُجُوعَ لِغَيْرِ الأُصُولِ) پەشیمانبوونەوە لە بەخشیندا-جگە لەتیرەی سەرەوە- بۆ هیچ خزمێکی‌ترو بۆ هیچ کەسێکی‌تر دروست نیە: (فِي هِبَةٍ مُقَيَّدَةٍ بِنَفْيِ الثَّوابِ) لە بەخشینێکی وەهادا: کە بڵێ: بە بێ‌پاداشت بێ، واتە: بڵێ: داوای هیچ پاداشتێك لە بەرامبەر بەخشینەکەم ناکەم. بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌رابردوو.

(وَمَتَى وَهَبَ مُطْلَقاً) هەر کاتێك شتێکی بەخشیە یەکێکی‌تر، بەڵام باسی پاداشت وەرگرتن‌و وەرنەگرتنی نەکرد، ئەو کاتە (فَلاَ ثَوابَ) هیچ پاداشتێك واجب نیە لە بەرامبەر بەخشینەکەی (إِنْ وَهَبَ لِدُونِه) ئەگەر بەخشیبێتی‌یە کەسێکی لە خۆی بەرەوخوارتر لە پلەی دونیادا (وَكَذَا لأَعْلَى مِنْهُ) هەروەها ئەگەر بەخشیبێتی‌یە کەسێکی لە خۆیشی بە سەرەوەتر، ئەو کاتەش پاداشتەکە واجب نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵکو پاداشتەکە سوننەتە (وَلِنَظِيرِه) هەروەها ئەگەر بیبەخشێتە هاوێنەی‌خۆیشی پاداشت واجب نیە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لەسەر فەرموودەی‌ڕاستی‌مەزهەب، بەڵکو سوننەتە.

جا بزانە: دیاریش وەکو بەخشین وایە: لەو مەسەلانەی‌ڕابردوودا. دیسان بزانە: ئیمامی (الأنرعي)-لە ڕووی‌بەڵگەوە- ئەوەی هەڵبژاردوە: ئەگەر پاداشتدانەوە لە بەخشیندا عادەت بوو، ئەو کاتە واجبە: یان بەخشراوەکەی بداتەوە، یان پاداشتێکی بداتێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە، بەڵگەکەشی ئەم حەدیسەیە: ﴿كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ دیاری قبوڵ دەکردو پاداشتی دیاریەکەشی دەداوە. واتە: شتێکی دەدا خاوەنەکەی، کەوابو: ئەگەر پاداشتدانەوە واجبیش نەبێ: ئەوە بێگومان سوننەتێکی پێغەمبەرەﷺ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر شتێکی بە دیاری دایێ تاکو کارێکی بۆ پێك بێنێ، ئەویش کارەکەی بۆ پێك نەهێنا، ئەو کاتەش واجبە: دیاریەکەی بداتەوە، یان تۆڵەی بداتێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە، جا ئەگەر-بۆ وێنە- هەوڵی دا بەندکراوەکەی بۆ لە بەندیخانە ڕزگار بکا، بەڵام بۆی نەگونجا، ئەو کاتەش واجبە: دیاریەکەی بداتەوە، هەروەك لە (الشبراملسي)دا فەرموویەتی.

(فَإِنْ وَجَبَ) جا ئەگەر-بە فەرموودەی بێ‌هێز- پاداشت واجب بێ (فَهُوَ قِيمَةُ الْمَوْهُوبِ) ئەو پاداشتە نرخی بەخشراوەکەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا (فَإِنْ لَمْ يُثِبْهُ) جا ئەگەر پێبەخشراوەکە پاداشتی نەداوە، ئەو کاتە: (فَلَهُ الرُّجُوعُ) ماڵبەخشەکە بۆی

وَلَوْ وَهَبَ بِشَرْطِ ثَوابٍ مَعْلُومٍ فَالأَظْهَرُ صِحَّةُالْعَقْدِ وَيَكُونُ بَيْعاً عَلَى الصَّحِيحِ، أَوْ مَجْهُولٍ فَالْمَذْهَبُ بُطْلانُهُ، وَلَوْ بَعَثَ هَدِيَّةً فِى ظَرْفٍ فَإِنْ لَمْ تَجْرِ الْعادَةُ بِرَدِّهِ كَقُوصَرَّةِ تَمْرٍ فَهُوَ هَدِيَّةٌ أَيْضاً، وَإِلاَّ فَلاَ، وَيَحْرُمُ اسْتِعْمالُهُ إِلاَّ فِى أَكْلِ الْهَدِيَّةِ مِنْهُ إِن اقْتَضَتْهُ الْعادَةُ.

---

دروسته: بەخشراوەكەی لێوەربگرێتەوە ﴿عَنْ ابْنِ عمَر رضي الله عنهما: مَنْ وَهَبَ هِبَةً فَهُوَ أَحَقُّ بِها مَالَمْ يُثَبْ عَلَيْها﴾ رواه الحاكم وصححه مرفوعاً، هەر كەسێك شتێك ببەخشێ هەر ئەو زیاتر ماق لە بەخشراوەكەدا هەیە، مادام پاداشتی نەدرێتەوە.

(وَلَوْ وَهَبَ بِشَرْطِ ثَوابٍ مَعْلُومٍ) ئەگەر بە مەرجی پاداشتێكی زاندرلو شتێكی بەخشی، ئەوە (فَالأَظْهَرُ صِحَّةُ الْعَقْدِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: مامڵەتەكە دروست دەبێ‌و (وَيَكُونُ بَيْعاً) دەبێتە فرۆشتن (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست (أَوْ مَجْهُولٍ) یان بە مەرجی پاداشتێكی‌نەزاندرلو شتێكی بەخشی، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ بُطْلانُهُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: مامڵەتەكە بەتاڵە، چونكە بە هۆی نەزانینەكە نابێتە فرۆشتنێكی دروستبوو.

(وَلَوْ بَعَثَ هَدِيَّةً فِى ظَرْفٍ) ئەگەر یەكێك دیاریەكی لە ناو كیسەیەكدا بۆ كەسێكی‌تر نارد، ئەوە (فَإِنْ لَمْ تَجْرِ الْعادَةُ بِرَدِّهِ) ئەگەر عادەت نەبو كیسەكە بگەڕێندرێتەوە: (كَقُوصَرَّةِ تَمْرٍ) وەك زەمبیلەی قەسپ (فَهُوَ هَدِيَّةٌ أَيْضاً) ئەو كاتە كیسەكەش دەبێتە دیاری وەكو ئەو شتەی لە ناوی‌دایە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر عادەت بوو بگەڕێندرێتەوە: وەكو سندوقی‌ترێ، ئەو كاتە (فَلاَ) كیسەكە نابێتە دیاری، بەڵكو ئەمانەتە لە لای‌و واجبە: بیگەڕێنێتەوە، كەوابو: (وَيَحْرُمُ اسْتِعْمالُهُ) حەرامە كیسەكە بە كار بێنێ ( إِلاَّ فِى أَكْلِ الْهَدِيَّةِ مِنْهُ) تەنها لە خواردنی دیاریەكەدا نەبێ لەو كیسەیە (إِنِ اقْتَضَتْهُ الْعادَةُ) ئەگەر عادەت وەها بوو، ئینجا سوننەتە: بە زووترین كات كیسەكە بۆ خاوەنەكەی بگەڕێنێتەوە، واللهُ أعْلَمُ.

﴿ **پاشكۆ** ﴾: زۆر سوننەتێكی گەورەیە سەردانی خزمەكانی بكاو بەخشین‌و دیارییان بداتێ‌و سەلامیان بۆ بنێرێ، جا بزانە: ناپەسندە ئەو شتەی بە بەخشین، یان بە زەكات، یان بە خێر داویەتیە كەسێكی‌تر، لێی بكڕێتەوە، هەروەها ئەگەر كەسێك لە ناو كۆمەڵێكدا شتێكی لە كەسێكی‌تر داوا كرد، ئەویش لە شەرمی خەڵك، یان لە ترسی خراپەو دووزمانی‌ی كەسەكە شتەكەی بە بەخشین دایێ، ئەوەش حەرامە.

هەروەها ئەگەر كەسێكیش یەكێكی‌تر لە دەستی ستەمكارێك ڕزگار بكاو ئەویش بەخشینێكی بداتێ لە ترسی ئەوە: نەوەك كارەپێكهاتووەكەی لێتێك بداتەوە، ئەوەش حەرامەو دەبێتە بەرتیل، بەڵام ئەگەر لە پاداشتی‌چاكەكەی بیداتێ ئەوە حەڵاڵە.

هەروەها ئەو دیاری‌و بەخشینەی دەیداتە كاربەدەست تاكو كارێكی ناهەقی بۆ بكا، یان كارێكی حەق نەكا، ئەوەش بەرتیلەو حەرامەو هەردوو لا لەعنەتیان لێكراوە، بەڵام ئەگەر

تەنها لە بەر ئەوە بيداتیٚ تاكو كاریٚكی هەقی بۆ بكا؟ چونكە بە بیٚپارە نەیدەكرد، ئەو كاتە: تەنها وەرگرەكە گوناهبار دەبیٚ، هەروەك لە پەڕتووكی (القضاء)دا بە بەلگەوە ڕوونی دەكەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تعالَى.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەو دیاریانەی لە كاتی سوننەتكردنیكوڕ خەلك دەیهێنیٚ-واتە: یان بە بۆنەی خۆشحالیەكانیتر- ئەوە گشتی دەبیٚتە ملكی باوكیكوڕەكە، كۆمەلە زانایەكیش فەرموویانە بۆ كوڕەكەیە، جا ئەوە لە كاتیٚكدا بوو: كە مالبەخشەكە هیچیانی مەبەست نەبیٚ، واتە: ئەگەر یەكیٚكیانی مەبەست بوو، ئەو كاتە دەبیٚتە ملكی ئەویان، هەروەها ئەو پارەی بە بۆنەی خۆشحالی لە ناو تەشتیٚك، یان لە سەر بەرمالیٚك دادەندریٚ، بە ناوی هیچ كەسیٚكیش داینانیٚن، ئەوەش دەبیٚتە ملكی خاوەن خۆشیەكە.

ئینجا بزانە: ئەگەر كەسیٚك هەندیٚك پارەی دایە كەسیٚكیتر، تاكو شتیٚك بەو پارەیە بكڕیٚ، یان كاریٚكیخۆی بەو پارەیە ئەنجام بدا، مەبەستی مالبەخشەكەش هیچیتر نەبو، ئەو كاتە واجبە: خودیشتەكە بكڕیٚو خودیكارەكە بكا، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ناوەڕۆكی ئەم پاشكۆیە ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ كِتابُ اللُّقْطَةِ: پەڕتوكی هەلگرتنەوەی شتی ونبوو ﴾

واتە: شتەكە لە خاوەنەكەی بەربوبیٚتەوە، یان لیٚی بەجیٚمابیٚ: بە هۆی بیٚئاگایی، یان خەوتن، یان ترس.

جا بزانە: ئەگەر كەوشەكەی بگۆڕیٚ بە كەوشی كەسیٚكیتر، ئەوەش وەك شتی ونبووە، واتە: دروست نیە بە كاری بیٚنیٚ تا بانگەوازیداهاتووی بۆ دەكا، یان تا دلنیا دەبیٚ خاوەنەكەی وازی لیٚهیٚناوە، بەلام ئەگەر بزانیٚ خاوەنیكەوشەكە كەوشەكەیوی بردوەو نەشدەكرا كەوشەكەیخۆی وەربگریٚتەوە، ئەو كاتە دروستە-بە نیەتیتۆلە- كەوشەكە بفرۆشیٚو نرخی كەوشەكەیخۆی لە پارەی كەوشە فرۆشراوەكە وەربگریٚ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە.

كەواتە: ئاگاداریە: ئەو شتەی ڕەشەبا فڕیٚی دەداتە ناو ملكی وی، یان ئەو ئەمانەتەی لە لای داندراون، یان لە لای خزمیٚكی داندراونو خزمەكەشی مردوە، یان ئەو مالەی لە دزیٚك، یان لە زەوتكەریٚك، یان لە دڕندەیەك دەیستیٚنیٚتەوە، یان لە ناو دەریاو لافاو هەلیدەگریٚتەوە، خاوەنی ئەو شتانەش ناناسیٚتەوە، ئەوانە هیچیان وەك مالی ونبووی هەلگیراوە بڕیاری بۆ نادریٚ، بەلكو گشتیان بە مالی لەدەستچوو دادەندریٚنو دەكەونە دەست كاربەدەستی موسولمانانو واجبە: بیانپاریٚزیٚ، یان بیانفرۆشیٚو پارەكەیان

يُسْتَحَبُّ الإلْتِقاطُ لِواثِقٍ بِأَمانَةِ نَفْسِهِ، وَقِيلَ يَجِبُ، وَلاَ يُسْتَحَبُّ لِغَيْرِ واثِقٍ، وَيَجُوزُ فِي الأَصَحِّ، وَيُكْرَهُ لِفاسِقٍ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَيَجِبُ الإِشْهادُ عَلَى الإِلْتِقاطِ،

---

بپارێزێ تا خاوەنەکەیان دەردەکەوێ، جا ئەگەر بێئومێد بوو، ئەو کاتە: دەبێتە مڵکی (بَيْتُ المال)و لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکا. بەڵام ئەگەر کاربەدەستو قازی لەو شوێنەدا نەبون، یان ستەمکار بون، ئەو کاتە ئەو کەسەی ئەو شتانەی لە بەردەستدایە بە خۆی لە جیاتی قازی ئەو کارانەیڕابردوو ئەنجام دەدا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) لێرەو لە چەند باسێکیتردا ئەوها ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەو شتەی بەگوێرەیعادەت خاوەنەکەی وازی لێدێنێ، هەرکەسێك شتەکە بۆ خۆی بیبا، ئەوە شتەکە دەبێتە موڵکیخۆیو بۆی حەڵاڵە گشت دەستکاریەکی تێدا بکا، هەروەك لە(تحفة) لە (باسی نێچیر)دا ڕوون کراوەتەوە.

(يُسْتَحَبُّ الإِلْتِقاطُ) هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، سوننەتە (لِواثِقٍ بِأَمانَةِ نَفْسِهِ) بۆ ئەو کەسەی باوەڕی بە ئەمینداریەتی خۆی هەیە (وَقِيلَ يَجِبُ) لە فەرموودەی بێهێزدا: هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، واجبە، ئینجا کۆمەڵەزانایەك فەرموویانە: ناپەسندە شتەکە هەڵنەگرێتەوە؟ ئەوەك بکەوێتە دەست مرۆڤێکی خائین، بەڵکو ئەگەر لەوانە بوو: ئەگەر هەڵینەگرتباوە شتەکە دەفەوتا، ئەو کاتە واجبە هەڵیبگرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يُسْتَحَبُّ لِغَيْرِ واثِقٍ) هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، سوننەت نیە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی بە ئەمینداریەتی خۆی نیە، بەڵام (وَيَجُوزُ فِيالأَصَحِّ) لەگەڵ باوەڕنەبوونیشیدا هەر دروستە هەڵیبگرێتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيُكْرَهُ لِفاسِقٍ) هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، ناپەسندە بۆ مرۆڤی فاسق، هەرچەند ئەمیشنیش بێ، ئینجا هەر کەسێکیش بزانێ دەربارەی شتەکە خیانەت دەکا، ئەو کاتە حەرامە هەڵیبگرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ آوَى ضالَّةً فَهُوَ ضالٌّ مالَمْ يُعَرِّفْها﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك ونبووێك هەڵبگرێتەوە، ئەوە گومڕاو سەرلێشێواوە، ئەگەر بانگەوازیی بۆ نەکا.

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّهُ لاَ يَجِبُ الإِشْهادُ عَلَىالإِلْتِقاطِ) واجب نیە: شاهید بگرێ لە سەر هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، بەڵکو سوننەتە، هەرچەند دادپەروەریش بێ، هەم سوننەتە: لە سەر شتەکەش بنووسێ: (ئەمە هەڵگیراوەتەوە).

بەڵکو ئەگەر باوەڕی بە ئەمینداریەتیخۆی نەبێ، ئەو کاتە: لەوانەیە شاهیدگرتن واجب بێ، هەروەك لە(تحفة)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ وَجَدَ لُقَطَةً فَلْيُشْهِدْ

وَأَنَّهُ يَصِحُّ إِلْتِقاطُ الْفاسِقِ وَالصَّبِيِّ وَالذِّمِّيِّ فِي دارِالإِسْلاَمِ، ثُمَّ الأَظْهَرُ أَنَّهُ يُنْـزَعُ مِـنَ الْفاسِقِ وَيُوضَعُ عِنْدَ عَدلٍ وَأَنَّهُ لاَ يُعْتَدُّ بِتَعْرِيفِه بَلْ يُضَمُّ إِلَيْهِ رَقِيبٌ، وَيَنْزِعُ الْوَلِيُّ لُقْطَـةَ الصَّبِيِّ وَيُعَرِّفُ وَيَتَمَلَّكُها لِلصَّبِيِّ إِنْ رَأَى ذَلِكَ حَيْثُ يَجُوزُ الإِقْتِـراضُ لَـهُ، وَيَضْـمَنُ الْوَلِيُّ إِنْ قَصَّرَ فِي انْتِزاعِه حَتَّى تَلِفَ فِي يَدِ الصَّبِيِّ،

---

ذَوَيْ عَدْلٍ﴾ صححه ابن خزيمة وابن الجارود وابن حبان، هـەر کەسێك شتێکی ونبووی هەڵگرتەوە، با دوو کەسی دادپەروەر بکاتە شاهید.

(وَأَنَّـهُ يَصِحُّ إِلْتِقاطُ الْفاسِقِ) هـەر بـە فـەرموودەی ڕاستیمەزهەب دروست دەبێ: شت هەڵگرتنـەوەی مرۆڤـی فاسـق، هـەم (وَالصَّبِيِّ) شـت هەڵگرتنـەوەی منداڵو شێت، هـەم (وَالذِّمِّيِّ فِي دارِالإِسْلاَمِ) شت هەڵگرتنەوەی کـافری پـەیمان لـە ئەستۆ لـە خانەیئیسلامدا (ثُمَّ) ئینجا لە دوای هەڵگرتنەوەی شتەکە (اَلأَظْهَـرُ أَنَّـهُ يُنْـزَعُ مِنَ الْفاسِـقِ) بـە فـەرموودەی بـەهێزتر: شـتەکە لـە مرۆڤـی فاسـقو لـە کـافر وەردەگیرێو (وَيُوضَـعُ عِنْـدَ عَـدلٍ) لـە لای دادپـەروەرێك دادەنرێو (وَأَنَّهُ) هەر بـە فـەرموودەی بـەهێزتر (لاَ يُعْتَـدُّ بِتَعْرِيفِـهِ) پشت بـە بانگەوازی فاسقەکە نابەسترێ (بَلْ يُضَـمُّ إِلَيْـهِ رَقِيبٌ) بـەڵکو چاودێرێکی وەگـەڵ دێخرێ، بـەلام لـە فـەرموودەی بـێهێزدا: شـتەکەی لێوەرنـاگیرێو پشـت بـە بانگەوازیەکـەی دەبەسترێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَيَنْـزِعُ الْـوَلِيُّ لُقْطَةَالصَّبِيِّ) واجبە سەرپەرشتکار: شتەهەڵگیراوەکە لـە منداڵو لـە شێت وەربگرێو (وَيُعَرِّفُ) هەر بەخۆیشی بانگەوازی بۆ بکا، واتە: پشت بـە بانگـەوازی منداڵو شـێت نابەسـترێ (وَ) هـەروەها (يَتَمَلَّكُهـا لِلصَّـبِيِّ إِنْ رَأَى ذَلِـكَ) شتەکەش دەکاتـە ملکـی منداڵەکە، یان شێتەکە، ئەگەر بەرژەوەندی ئـەوانی دەدیت (حَيْـثُ يَجُوزُ الإِقْتِراضُ لَـهُ) بـەو شێوەیەی ماڵقەرزکردن بۆ منداڵەکە، یان بۆ شێتەکە دروست بوو، جا ئەگـەر کردنەملکەکە بەرژەوەندی منداڵ، یان شێتەکەی تێدا نـەبو، ئـەو کاتـە: بۆ خاوەنەکـەی دەیپارێزێ، یان دەیداتە دەست قازیی ئەمین، واتە: دروست نیە بیکاتە ملکیخۆی.

(وَيَضْمَنُ الْـوَلِيُّ) سەرپەرشتکارەکە دەبێتـە زامینی شتەکە (إِنْ قَصَّـرَ فِيانْتِزاعِـه) ئەگـەر کەمتەرخەمی کردبێ لە وەرگرتنی لە منداڵەکە، یان لە شێتەکە (حَتَّى تَلِفَ فِي يَـدِ الصَّبِيِّ) تا لە دەستی منداڵەکەدا، یان لە دەستی شێتەکەدا شتەکە فـەوتا، یـان فەوتێنـدرا، بـەلام ئەگەر کەمتەرغەمی نەکردبێ: وەك نـەیزانیبێ شتەکەی هەڵگرتۆتـەوە، یان فریا نەکـەوت لێی وەربگـرێ، ئـەوە ئەگـەر منداڵەکـە، یـان شـێتەکە بیفـەوتێنێ، ئـەو کاتـە: تـەنها فەوتێنەرەکە دەبێتە زامین، بەلام ئەگەر بەخۆی بفەوتێ، ئەو کاتـە: هـیچ کەسێك نابێتـە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَالأَظْهَرُ بُطْلاَنُ الْتِقَاطِ الْعَبْدِ وَلاَ يُعْتَدُّ بِتَعْرِيفِهِ فَلَوْ أَخَذَهُ سَيِّدُهُ مِنْهُ كَانَ الْتِقَاطاً، قُلْتُ: الْمَذْهَبُ صِحَّةُ الْتِقَاطِ الْمُكَاتَبِ كِتَابَةً صَحِيحَةً وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ، وَهِيَ لَهُ وَلِسَيِّدِهِ، فَإِنْ كَانَتْ مُهَايَأَةً فَلِصَاحِبِ النَّوْبَةِ فِي الأَظْهَرِ، وَكَذَا حُكْمُ سَائِرِ النَّادِرِ مِنَ الأَكْسَابِ وَالْمُؤَنِ إِلاَّ أَرْشَ الْجِنَايَةِ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) اَلْحَيَوَانُ الْمَمْلُوكُ الْمُمْتَنِعُ مِنْ صِغَارِ السِّبَاعِ بِقُوَّةٍ: كَبَعِيرٍ وَفَرَسٍ، اَوْ بِعَدْوٍ: كَأَرْنَبٍ وَظَبْيٍ، أَوْ طَيَرَانٍ: كَحَمَامٍ، إِنْ وُجِدَ بِمَفَازَةٍ فَلِلْقَاضِي الْتِقَاطُهُ لِلْحِفْظِ وَكَذَا لِغَيْرِهِ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَالأَظْهَرُ) به فه‌رمووده‌ی به‌هێزتر (بُطْلاَنُ الْتِقَاطِ الْعَبْدِ) شت هه‌ڵگرتنه‌وه‌ی کۆیله به‌تاڵه، هه‌م (وَلاَ يُعْتَدُّ بِتَعْرِيفِهِ) پشت به بانگه‌وازیه‌که‌شی نابه‌سترێ، به‌ڵام (فَلَوْ أَخَذَهُ سَيِّدُهُ مِنْهُ) جا ئه‌گه‌ر گه‌وره‌که‌ی شته‌که‌ی لێوه‌ربگرێ، ئه‌و کاته (كَانَ الْتِقَاطاً) ده‌بێته شت هه‌ڵگرتنه‌وه‌یه‌کی شه‌رعی (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) ده‌فه‌رموێ: (الْمَذْهَبُ صِحَّةُ الْتِقَاطِ الْمُكَاتَبِ كِتَابَةً صَحِيحَةً) شت هه‌ڵگرتنه‌وه‌ی کۆیله‌ی نووسراوپێدراو دروست ده‌بێ، ئه‌گه‌ر نووسراوپێدانه‌که‌ی دروست بوبێ (وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ) هه‌روه‌ها دروسته شت هه‌ڵگرتنه‌وه‌ی ئه‌و کۆیله‌ش که به‌شێکی ئازاده (وَهِيَ لَهُ وَلِسَيِّدِهِ) شته هه‌ڵگیراوه‌که‌ش بۆ خۆی‌و گه‌وره‌که‌یه‌تی، به‌ڵام (فَإِنْ كَانَتْ مُهَايَأَةً) ئه‌گه‌ر نۆبه‌ت له نێوان خۆی‌و گه‌وره‌که‌ی‌دا هه‌بو، ئه‌و کاته: (فَلِصَاحِبِ النَّوْبَةِ فِي الأَظْهَرِ) له فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا: شته‌که بۆ خاوه‌ن نۆبه‌ته‌که‌یه (وَكَذَا حُكْمُ سَائِرِ النَّادِرِ مِنَ الأَكْسَابِ وَالْمُؤَنِ) وه‌ك شتی هه‌ڵگیراوه‌یه: بڕیاری گشت که‌سابه‌ته که‌مه‌کانی‌ترو کرێیه‌کانی‌تر، ئه‌وانه‌ش گشتی به نۆبه‌تن (إِلاَّ أَرْشَ الْجِنَايَةِ) ته‌نها تۆڵه‌ی ده‌ستدرێژکردنه‌کانی کۆیله‌که‌و، بۆ سه‌ر کۆیله‌که نه‌بێ، واته: ئه‌و تۆڵانه‌ی ده‌درێن، یان وه‌رده‌گیرێن نابنه نۆبه‌ت، به‌ڵکو هاوبه‌شن له نێوانیاندا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی بڕیاری شتی هه‌ڵگیراوه ﴾

١-(اَلْحَيَوَانُ الْمَمْلُوكُ) ئه‌و ئاژه‌ڵه‌ی ملکی‌که‌سێکه‌و ده‌دۆزرێته‌وه، دوو جۆره: جۆری‌یه‌که‌م: (الْمُمْتَنِعُ مِنْ صِغَارِ السِّبَاعِ بِقُوَّةٍ) ئه‌وه‌یه: که به هێزوتوانای‌خۆی، خۆی ده‌پارێزێ له درنده بچووکه‌کانی وه‌ك گورگ (كَبَعِيرٍ وَفَرَسٍ) وه‌کو ووشترو ئه‌سپ‌و هێستر (اَوْ بِعَدْوٍ) یان به هۆی غاردان خۆی ده‌پارێزێ (كَأَرْنَبٍ وَظَبْيٍ) وه‌کو که‌روێشك‌و ئاسك=مامز (أَوْ طَيَرَانٍ) یان به هۆی فڕین خۆی ده‌پارێزێ (كَحَمَامٍ) وه‌کو کۆتر، جا هه‌ر یه‌کێك له‌و جۆرانه (إِنْ وُجِدَ بِمَفَازَةٍ) ئه‌گه‌ر له بیابانێك دۆزراوه، ئه‌وه (فَلِلْقَاضِي الْتِقَاطُهُ لِلْحِفْظِ) بۆ قازی دروسته: هه‌ڵیبگرێته‌وه، تاکو بۆ خاوه‌نه‌که‌ی بیپارێزێ (وَكَذَا لِغَيْرِهِ) هه‌روه‌ها-جگه له قازی- بۆ خه‌ڵکی‌تریش دروسته: هه‌ڵیبگرێته‌وه: بۆ پاراستن (فِي الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستتردا.

وَيحْرُمُ الْتقاطُهُ لتملُّك، وإنْ وُجدَ بقرْيَة فالأصحُّ جوازُ الْتقاطه للتَّمَلُّك، وَمـا لاَيمْتَنِـعُ منْها: كَشاة يَجُوزُ الْتقاطُهُ للتَّمَلُّك في الْقَرْيَة وَالْمفازَة، وَيَتَخَيَّرُ آخذُهُ منْ مفازَة: فَـإنْ شاءَ عَرَّفَهُ وَتَمَلَّكَهُ،

---

بەلام (وَيَحْرُمُ الْتِقاطُهُ لِتَمَلُّكٍ) بۆ گشت کەسێك حەرامە ئەو جۆرە ئاژەڵە هەڵبگرێتەوە تاکو بیکاتە ملکی‌خۆی ﴿عَنْ زَيْد بن خالدالْجُهَنيِّ: أَنَّهُ سُئِلَ النَّبيُّ ﷺ عَنْ ضـالَّةِالإبِلِ؟ فَقالَ: مالَكَ وَلَهَا؟ مَعَها سِقاؤُها وَحِذاؤُها تَرِدُالْماءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتّى يَلْقاها رَبُّهـا﴾ رواه الشيخان، لەبارەی ووشتری ونبوو پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا؟ ئەویش فەرمووی: چیت بەسەری‌دایە؟ بەخۆی ئاو دەخواتەوەو خواردن دەخوا، تا خاوەنەکەی دەیگاتێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر کاتەکە: کاتی ڕاوڕووت‌و تالانگری بوو، ئەو کاتە: دروستە ئەو جۆرە ئاژەڵە-لە بیابان- هەڵبگیرێتەوە، تاکو بیکاتە ملکی‌خۆی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (إنْ وُجِدَ بِقَرْيَةٍ) ئەگەر ئەو جۆرە ئاژەڵەی خۆی دەپارێزێ لە دێیەکدا، یان لە نزیك دێیەکدا، یان ئاوەدانیەکدا دۆزراوە، ئەو کاتە (فَالأصَحُّ جَوازُ الْتِقاطِهِ لِلتَّمَلُّكِ) بە فەرموودەی‌ڕاستتر دروستە: هەڵیبگرێتەوە، تاکو بیکاتە ملکی‌خۆی، نەوەك دەستی خائینەکانی بکاتێ‌و لە دەست خاوەنەکەی بچێ.

هەروەها ئەگەر خاوەنی‌ئاژەڵەکەی دەناسی، ئەو کاتە: دروستە لە گشت شوێنێك بۆ خاوەنەکەی بیهێنێتەوەو ئاژەڵەکەش دەبێتە ئەمانەتێکی‌شەرعی لە بن دەستی‌دا، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جۆری‌دووەم: (وَما لاَ يَمْتَنِعُ مِنْها) ئەو جۆرە ئاژەڵەی خۆی پێ‌ناپارێزرێ لە درندە بچووکەکان (كَشاةٍ) وەکو مەڕو بزن‌و گوێلك‌و مریشك‌و مراوی (يَجُوزُ الْتِقاطُهُ لِلتَّمَلُّكِ) بۆ گشت کەسێك دروستە هەڵیبگرێتەوە، تاکو بیکاتە ملکی‌خۆی (فِي الْقَرْيَةِ وَالْمَفازَةِ) هەم لە دێ‌و هەم لە بیاباندا دروستە هەڵیبگرێتەوە: لە کاتی ئەمینی‌و لە کاتی ڕاوڕووت‌و تالاندا ﴿عَنْ زَيْدالْجُهَنيِّ: أَنَّهُ سُئِلَ النَّبيُّ ﷺ عَنْ ضالَّةِ الْغَنَمِ؟ فَقالَ: هِـيَ لَـكَ أَوْ لأَخيـكَ أَوْ لِلذِّئْبِ﴾ رواه الشيخان، لەبارەی بزن‌و مەڕی ونبوو پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا؟ ئەویش فەرمووی: یان بۆ تۆیە، یان بۆ برای تۆیە، یان بۆ گورگە. واتە: ئەگەر وازی لێبێنی گورگ دەیخوا، ئەگەر هێناتەوەو خاوەنەکەی دیار نەبو، ئەو کاتە بۆ تۆ دەمێنێتەوە.

ئینجا (وَيَتَخَيَّرُ آخِذُهُ مِنْ مَفازَةٍ) ئەو کەسەی ئاژەڵێکی گۆشتخوراو لە بیابان دەگرێتەوە بۆ ئەوەی بیکاتە ملکی‌خۆی، سەرپشکە لە نێوان سێ ڕێگادا:

یەکەم: (فَإنْ شاءَ عَرَّفَهُ) ئەگەر حەز دەکا: بانگەوازی بۆ ئاژەڵەکە دەکا تا ماوەی ساڵێك، ئینجا ئەگەر لە دوای ساڵێك خاوەنەکەی دەست نەکەوت (وَتَمَلَّكَهُ) دەیکاتە ملکی خۆی.

أَوْ باعَهُ وَحَفظَ ثَمَنَهُ وَعَرَّفَها ثُمَّ تَمَلَّكَهُ، أَوْ أَكَلَهُ وَغَرِمَ قِيمَتَهُ إِنْ ظَهَرَ مالِكُهُ، فَإِنْ أَخَذَ مِنَ الْعُمْرانِ فَلَهُ الْخَصْلَتان الأُولَيان لاَالثَّالِثَةُ فِي الأَصَحِّ،

---

جا بزانه: له ماوه‌ی بانگه‌وازی‌شدا به‌خێوی ده‌كا، جا ئه‌گه‌ر ویستی ئه‌ركی به‌خێوكردنه‌كه له خاوه‌نه‌كه‌ی وه‌ربگرێته‌وه، ئه‌و كاته ئیزن له قازی وه‌رده‌گرێ، جا ئه‌گه‌ر نه‌گونجا، ئه‌و كاته شاهید ده‌گرێ: كه به مه‌به‌ستی وه‌رگرتنه‌وه‌ی‌مه‌سره‌فه‌كه‌ی به‌خێوی ده‌كا، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

دووه‌م: (أَوْ باعَهُ) یان به ئیزنی قازی ئاژه‌ڵه‌كه ده‌فرۆشێ، جا ئه‌گه‌ر ئیزنی قازی نه‌گونجا، ئه‌و كاته سه‌ربه‌خۆ ده‌یفرۆشێو (وَحَفظَ ثَمَنَهُ) پاره‌كه‌شی بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی داده‌نێو ده‌یپارێزێو (وَعَرَّفَها) ئینجا له دوای‌فرۆشتن بانگه‌وازی بۆ ئاژه‌ڵه‌كه ده‌كا (ثُمَّ) ئینجا له دوای ساڵێك ئه‌گه‌ر خاوه‌نه‌كه‌ی ده‌ست نه‌كه‌وت (تَمَلَّكَهُ) پاره‌ی ئاژه‌ڵه‌كه ده‌كاته ملكی خۆی‌و ده‌یخوا.

سێیه‌م: (أَوْ أَكَلَهُ) یان هه‌ر ئه‌و ده‌م ئاژه‌ڵه‌كه ده‌كاته ملكی‌خۆی‌و ده‌یخواو (وَغَرِمَ قِيمَتَهُ) نرخه‌كه‌ی ڕۆژی كردنه‌ملكیش -له تۆڵه- ده‌داته خاوه‌نه‌كه‌ی (إِنْ ظَهَرَ مالِكُهُ) ئه‌گه‌ر خاوه‌نه‌كه‌ی ده‌ست كه‌وت، ئینجا بزانه: تا نه‌یكاته ملكی‌خۆی دروست نیه بیخوا، هه‌روه‌ك له (تحفة)دا فه‌رموویه‌تی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئیمامی(الماوردی) ڕێگایه‌كی‌چواره‌میشی زیاد كردوه، كه دروسته: هه‌ر ئه‌و ده‌م ئاژه‌ڵه‌كه بكاته ملكی‌خۆی‌و نه‌یخوا، به‌ڵكو به زیندوویی بۆ شیرو خوری‌و بێچووه‌كه‌ی بهێڵێته‌وه، چونكه ئه‌وه له خواردن باشتره، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه، جا ئه‌گه‌ر خاوه‌نه‌كه‌ی ده‌ست كه‌وت، ئه‌و كاته -ته‌نها- ئاژه‌ڵه‌كه‌ی ده‌داته‌وه، شیرو بێچووه‌كه‌شی بۆ خۆی ده‌مێنێته‌وه، هه‌روه‌ك له (الشبراملسی)دا فه‌رموویه‌تی، ئینجا هه‌ر ئیمامی(الماوردی) ده‌فه‌رموێ: له‌و ڕێگایانه كامه‌یان بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی به‌سوودتره، واجبه: ئه‌ویان بكا.

ئینجا بزانه: ئه‌وه‌ی‌ڕابردوو ده‌رباره‌ی بیابان بوو، به‌ڵام (فَإِنْ أَخَذَ مِنَ الْعُمْرانِ) ئه‌گه‌ر ئاژه‌ڵه‌كه‌ی له ئاوه‌دانی‌دا دۆزیه‌وه، یان ئاژه‌ڵه‌كه گۆشتی نه‌ده‌خورا، ئه‌و كاته: (فَلَهُ الْخَصْلَتانِ الأُولَيانِ) ته‌نها ڕێگای یه‌كه‌م‌و دووه‌می بۆ دروستن، واته: یان ساڵێك بانگه‌وازی بكاو بیكاته ملكی‌خۆی، یان بیفرۆشێ‌و ساڵێك بانگه‌وازی بكاو پاره‌كه‌ی بكاته ملكی‌خۆی (لاَالثَّالِثَةُ) به‌ڵام ڕێگای سێیه‌می بۆ دروست نیه، واته: دروست نیه: بیكاته ملكی‌خۆی‌و بیخواو تۆڵه بداته خاوه‌نی (فِي الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستتردا، به‌ڵام له فه‌رمووده‌ی بێ‌هێزدا: ئه‌گه‌ر گۆشتی بخورێ، ڕێگای سێیه‌میشی بۆ دروسته وه‌ك ئاژه‌ڵی بیابان،

وَيَجُوزُ أَنْ يَلْتَقِطَ عَبْداً لاَيُمَيِّزُ، وَيَلْتَقِطَ غَيْرَالْحَيَوان، فَإِنْ كانَ يَسْرُعُ فَسادُهُ كَهَرِيسَة: فَإِنْ شاءَ باعَهُ وَعَرَّفَهُ لِيَتَمَلَّكَ ثَمَنَهُ، وَإِنْ شاءَ تَمَلَّكَهُ فِي الْحالِ وَأَكَلَهُ، وَقِيلَ إِنْ وَجَدَهُ فِي عُمْرانٍ وَجَبَ الْبَيْعُ، وَإِنْ أَمْكَنَ بَقاؤُهُ بِعِلاجٍ كَرُطَبٍ يَتَجَفَّفُ: فَإِنْ كانَتِ الْغِبْطَةُ فِي بَيْعِهِ بِيعَ، أَوْ فِي تَجْفِيفِهِ وَتَبَرَّعَ بِهِ الْواجِدُ جَفَّفَهُ، وَإِلاَّ بِيعَ بَعْضُهُ لِتَجْفِيفِ الْباقِي،

---

هەروەك لە (نهاية)و(مغني)دا فەرموویانە. (وَيَجُوزُ أَنْ يَلْتَقِطَ عَبْداً لاَيُمَيِّزُ) دروستە: كۆیلەیەكی وەها هەڵبگرێتەوە: كە فامیدە نەبوبێ.

٢-(وَيَلْتَقِطَ غَيْرَالْحَيَوانِ) هەروەها دروستە: شتیتری جگە لە ئاژەڵیش هەڵبگرێتەوە، وەكو پارەو جل‌وبەرگو خواردەمەنی، ئینجا (فَإِنْ كانَ يَسْرُعُ فَسادُهُ) ئەگەر شتە هەڵگیرایەوەكە لەو شتانە بوو: كە زوو تێك دەچون‌و خراپ دەبون (كَهَرِيسَةٍ) وەك هەریسەو خواردەمەنیە تەڕەكانیتر، ئەوەی هەڵیگرتۆتەوە سەرپشكە لە نێوان دوو ڕێگادا:

یەكەم: (فَإِنْ شاءَ باعَهُ) ئەگەر حەز دەكا: دەیفرۆشێ‌و (وَعَرَّفَهُ) لە دوای فرۆشتنیش ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ فرۆشراوەكە دەكا (لِيَتَمَلَّكَ ثَمَنَهُ) تاكو پارەكەی بكاتە ملكی خۆی ئەگەر-لە دوای‌ساڵێك- خاوەنەكەی دەست نەكەوت.

دووەم: (وَإِنْ شاءَ تَمَلَّكَهُ فِي الْحالِ) ئەگەر حەزیش دەكا: هەر ئەو دەم دەیكاتە ملكی خۆی‌و (وَأَكَلَهُ) دەیخوا، ئینجا-لە دوای‌خواردنی- ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ دەكا، نرخەكەشی-لە تۆڵە-دەداتە خاوەنەكەی، جیاوازی نیە: لە بیابان، یان لە ئاوەدانی‌دا دۆزیبێتیەوە، هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی، بەڵام (وَقِيلَ) لە فەرمودەیەكی بێ‌هێزدا: (إِنْ وَجَدَهُ فِي عُمْرانٍ وَجَبَ الْبَيْعُ) ئەگەر لە ئاوەدانی‌دا دۆزیبێتیەوە، واجبە بیفرۆشێ.

(وَإِنْ أَمْكَنَ بَقاؤُهُ بِعِلاجٍ) ئەگەر گونجا خواردەمەنیەكە بە چارەكردن بمێنێتەوە (كَرُطَبٍ يَتَجَفَّفُ) وەكو خورماو ترێ‌یەكی وەها: كە ووشك ببێتەوە، ئەو كاتە خواردنی دروست نیە، بەڵكو (فَإِنْ كانَتِ الْغِبْطَةُ فِي بَيْعِهِ) ئەگەر قازانجی خاوەنەكەی لە فرۆشتنی‌دا بوو (بِيعَ) ئەوە هەمووی دەفرۆشرێ‌و پارەكەی بۆ خاوەنی هەڵدەگیرێ (أَوْ فِي تَجْفِيفِهِ) یان ئەگەر قازانج لە ووشككردنەوەی‌دا بوو (وَتَبَرَّعَ بِهِ الْواجِدُ) ئەو كەسەش كە دۆزیویەتیەوە، یان كەسێكی‌تر بە خۆڕایی ووشكی دەكردەوە، ئەو كاتە (جَفَّفَهُ) ووشكی دەكاتەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچ كەسێك بە خۆڕایی ووشكی نەكردەوە، ئەو كاتە (بِيعَ بَعْضُهُ لِتَجْفِيفِ الْباقِي) بەشێكی لێ‌دەفرۆشرێ، تاكو بەو پارەیە ئەوی‌تر ووشك بكرێتەوەو بە ووشككراوەیی بۆ خاوەنەكەی هەڵبگیرێ.

ئینجا لە هەردووحاڵەتدا واجبە: بانگەوازی بۆ بكا، جا ئەگەر ماوەی‌ساڵێك بانگەوازی كردو خاوەنەكەی دەست نەكەوت، ئەو كاتە دروستە پارەكە، یان خواردەمەنیە

وَمَنْ أَخَذَ لُقَطَةً لِلْحِفْظِ أَبَداً فَهِيَ أَمانَةٌ، فَإِنْ دَفَعَها إِلَى الْقاضِي لَزِمَهُ الْقَبُولُ وَلَمْ يُوجِبِ الأَكْثَرُونَ التَّعْرِيفَ وَالْحالَةُ هَذِه، فَلَوْ قَصَدَ بَعْدَ ذَلِكَ خِيانَةً لَمْ يَصِرْ ضامِناً فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ أَخَذَهُ بِقَصْدِ الْخِيانَةِ فَضامِنٌ، وَلَيْسَ لَهُ بَعْدَهُ أَنْ يُعَرِّفَ وَيَتَمَلَّكَ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَإِنْ أَخَذَ لِيُعَرِّفَ وَيَتَمَلَّكَ فَأَمانَةٌ مُدَّةَ التَّعْرِيفِ وَكَذا بَعْدَها مالَمْ يَخْتَرِ التَّمَلُّكَ فِي الأَصَحِّ،

---

ووشككراوەكە بكاتە ملكی‌خۆی، یان بەردەوام بۆ خاوەنەكەی هەڵیبگرێ، هەروەك لە (حاشیةالعوض)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ أَخَذَ لُقَطَةً لِلْحِفْظِ أَبَداً) هەر كەسێك شتێكی ونبووی هەڵگرتەوە، تاكو بەردەوام بۆ خاوەنەكەی بیپارێزێ، واتە: مەبەستی نەبو: بیكاتە ملكی خۆی (فَهِيَ أَمانَةٌ بِيَدِهِ) ئەو كاتە شتەكە ئەمانەتێكە لە دەست ئەو كەسەدا، كەواتە: ئەگەر كەمتەرخەمی لە پاراستنی‌دا بكا، ئەو كاتە دەبێتە زامین (فَإِنْ دَفَعَها إِلَى الْقاضِي لَزِمَهُ الْقَبُولُ) جا ئەگەر شتەكەی دایە دەست قازی، واجبە: قبوڵی بكاو لێ‌وەربگرێ (وَلَمْ يُوجِبِ الأَكْثَرُونَ التَّعْرِيفَ وَالْحالَةُ هَذِهِ) لەو حاڵەتەی بۆ پاراستن هەڵیگرتۆتەوە، زۆرترینی‌زانایان بانگەوازییان بە واجب دانەناوە، بەڵام فەرموودەی‌بەهێزو پشت پێبەستراو ئەمەیە: لەو حاڵەتەشدا واجبە: بانگەوازی‌ی بۆ بكرێ، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَلَوْ قَصَدَ بَعْدَذَلِكَ خِيانَةً) جا ئەگەر لە دوای‌هەڵگرتنەوەی بۆ پاراستن، ویستی خیانەت لە شتەكەدا بكا، ئەو كاتەش (لَمْ يَصِرْ ضامِناً فِي الأَصَحِّ) بە تەنها مەبەستەكە نابێتە زامین، لە فەرموودەی‌ڕاستتردا، بەڵكو هەركاتێك بە كردەوە خیانەتی كرد، دەبێتە زامین.

(وَإِنْ أَخَذَهُ بِقَصْدِ الْخِيانَةِ) ئەگەر–هەر لە سەرەتاوە– بە مەبەستی خیانەتكردن شتەكەی هەڵگرتەوە، ئەو كاتە (فَضامِنٌ) دەبێتە زامین، كەوابو: (وَلَيْسَ لَهُ بَعْدَهُ) لە دوای هەڵگرتنەوەی بە مەبەستی‌خیانەت، بۆی دروست نیە: (أَنْ يُعَرِّفَ وَيَتَمَلَّكَ) بانگەوازی‌ی بۆ بكاو بیكاتە ملكی‌خۆی (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونكە بەو مەبەستە بووەتە زەوتكەر، بەڵام لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: بۆی دروستە: بانگەوازی‌ی بۆ بكاو لە دوای بانگەوازی بیكاتە ملكی‌خۆی.

(وَإِنْ أَخَذَ لِيُعَرِّفَ) ئەگەر–لە سەرەتاوە– بەو مەبەستە هەڵیگرتەوە: بانگەوازی‌ی بۆ بكاو (وَيَتَمَلَّكَ) لە دوای بانگەوازیش بیكاتە ملكی‌خۆی، ئەو كاتە (فَأَمانَةٌ مُدَّةَ التَّعْرِيفِ) لە ماوەی بانگەوازی‌دا شتەكە ئەمانەتە لە لای (وَكَذا بَعْدَها) هەروەها لە دوای ماوەی بانگەوازیش هەر ئەمانەتە لە لای (مالَمْ يَخْتَرِ التَّمَلُّكَ) مادام كردنەملكایەتی‌ی هەڵنەبژاردبێ، واتە: هەر كاتێك كردیە ملكی‌خۆی، ئەو كاتە دەبێتە زامینو تۆڵەی دەكەوێتە سەر (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَيَعْرِفُ جِنْسَها وَصِفَتَها وَقَدْرَها وَعِفاصَها وَوِكائَها ثُمَّ يُعَرِّفُها فِي الأَسْواقِ وَأَبْوابِ الْمَساجِدِ وَنَحْوِها سَنَةً عَلَى العادَةِ: يُعَرِّفُ أَوَّلاً كُلَّ يَوْمٍ طَرَفَيِ النَّهارِ، ثُمَّ كُلَّ يَوْمٍ مَرَّةً، ثُمَّ كُلَّ أُسْبُوعٍ، ثُمَّ كُلَّ شَهْرٍ، وَلاَ تَكْفِي سَنَةٌ مُتَفَرِّقَةٌ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ تَكْفِي وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَذْكُرُ بَعْضَ أَوْصافِها،

## ﴿ چۆنیەتی بانگەوازی شتی ونبوو ﴾

(وَيَعْرِفُ) ئەو كەسەی شتەكەی هەڵگرتۆتەوە، سوننەتە بزانێ (جِنْسَها) رەگەزی شتەكە چی‌یە، هەم (وَصِفَتَها) جۆرەكەو (وَقَدْرَها) ئەندازەكەی‌و (وَعِفاصَها) كیسەكەی، واتە: لە ناو چی‌دایەو (وَوِكاءَها) زاربێنەكەی چی‌یە، لە كام شوێن دۆزیویەتیەوە.

(ثُمَّ يُعَرِّفُها) ئینجا واجبە: بانگەوازی بۆ بكا بەخۆی، یان بە جێگرێكی‌خۆی (فِي الأَسْواقِ) لە بازاڕەكانداو (وَأَبْوابِ الْمَساجِدِ) لە دەرگەی مزگەوتەكاندا لەو كاتەی خەڵك لە مزگەوت دێنە دەرەوە، بەڵام حەرامە: دەنگی زۆر بەرز بكاتەوە، یان لە ناو مزگەوتدا بانگەوازیەكە بكا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَنَحْوِها) هەم لەم شوێنانەی وەك بازاڕو مزگەوت خەڵك لێیان كۆ دەبێتەوە، بانگەوازیەكە دەكا (سَنَةً عَلَى العادَةِ) ماوەی ساڵێك بەگوێرەی عادەت ﴿عَنْ زَيْدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقالَ: إِعْرِفْ عِفاصَها وَوِكاءَها ثُمَّ عَرِّفْها سَنَةً، فَإِنْ جاءَ صاحِبُها، وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ بِها﴾ رواه الشيخان، لەبارەی شتی هەڵگیرایەوە پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێكرا؟ ئەویش فەرمووی: كیسەكەو زاربێنەكەی بزانە، ئینجا ماوەی‌ساڵێك بانگەوازی بۆ بكە، جا ئەگەر خاوەنەكەی هات بیدەوە، ئەگەر نەهات چی لێدەكەی بیكە.

ئینجا بزانە: سەرەتای‌ساڵەكە: لە سەرەتای‌بانگەوازیەكەوە دەست پێ دەكا، بەڵام مەرج نیە: لە هەموو كاتەكانی ساڵدا بانگەوازی بكا، بەڵكو (يُعَرِّفُ أَوَّلاً كُلَّ يَوْمٍ طَرَفَيِ النَّهارِ) یەكەمجار-تا حەفتەیەك- هەموو ڕۆژێك سبەینەو ئێواران بانگەوازی دەكا (ثُمَّ كُلَّ يَوْمٍ مَرَّةً) ئینجا-تا حەفتەیەكی‌تر- هەر ڕۆژێك جارێك (ثُمَّ كُلَّ أُسْبُوعٍ) ئینجا هەر حەفتەیەك جارێك، تا حەفت حەفتە تەواو دەبن (ثُمَّ كُلَّ شَهْرٍ) ئینجا هەر مانگێك جارێك.

بەڵام (وَلاَ تَكْفِي سَنَةٌ مُتَفَرِّقَةٌ فِي الأَصَحِّ) ساڵێكی لێك جیاكراوە بەس نیە: وەك بە دوانزە ساڵان ساڵێك تەواو بكا (قُلْتُ) ئیمامی(النـواوي) دەفەرموێ: (الأَصَحُّ تَكْفِي وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ساڵێكی لێك جیاكراوەش بەسە.

(وَيَذْكُرُ بَعْضَ أَوْصافِها) سوننەتە: لە بانگەوازیەكەدا هەندێك سیفەتەكانی‌شتەكە بڵێ، بەڵام حەرامە: تەواوی سیفەتەكانی بڵێ، نەوەك درۆزنێك بیكاتە ملكی‌خۆی، ئینجا بزانە: ئەگەر-لە ماوەی‌بانگەوازی‌دا- ماڵهەڵگرەوەكە مرد، ئەو كاتە میراتگرەكەی-لە سەر بانگەوازیەكەی وی- بانگەوازیەكە تەولو دەكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَلاَ يَلْزَمُهُ مُؤْنَةُالتَّعْرِيف إِنْ أَخَذَ لحِفْظ، بَلْ يُرَتِّبُها الْقاضي مِنْ بَيْتِ الْمـالِ أَوْ يَقْتَـرِضُ عَلَىالْمالِك، وَإِنْ أَخَذَ لَتَمَلُّك لَزِمَتْهُ، وَقِيلَ إِنْ لَمْ يَتَمَلَّكْ فَعَلَىالْمالِـكِ، وَالأَصَـحُّ أَنَّ الْحَقِيرَ لاَ يُعَرَّفُ سَنَةً بَلْ زَمَناً يُظَنُّ أَنَّ فاقِدَهُ يُعْرِضُ عَنْهُ غالِباً.

---

﴿ ئاگـاداری ﴾: ئەگـەر ماڵهەڵگرەوەکـە لـەو بـاوەڕەدا بـوو: ئەگـەر بانگـەوازیی بـۆ بکـا، ستەمکارێك شتەهەڵگیرایەوەکەی لێدەستێنێ، ئەو کاتە حەرامـە: بانگەوازی بکـا، شـتەکەش بە ئەمانەت لە لای دەمێنێتەوە، واتە: دروست نیە لە دوای سـاڵێك بیکاتـە ملکیخۆی، بـەڵام (إبن الصباغ) فتوای داوە: ئەگەر دەترسا-بە هۆی بانگەوازیەکـە- مـاڵی خـۆی لـە بنـەبڕ لـە دەست بڕوا، ئەو کاتە عوزری بـە دەسـتە کـە بانگـەوازی نـەکاو هـەم بـۆی دروسـتە لـە دوای ساڵێك بیکاتە ملکیخۆی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جا ئەگەر بێئومێد بوو: لە دەستکەوتنی خاوەنەکەیو-بە فتـوای (إبـن الصـباغ) ڕەفتـاری نەکرد- ئەو کاتە وەك مـاڵی لەدەستچوو بڕیـاری بـۆ دەدرێ، هـەروەك لـە سـەرەتای ئـەم باسەدا ڕابرلو لە (الشروانی)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يَلْزَمُهُ مُؤْنَةُالتَّعْرِيفِ) ئەرکی بانگەوازیەکە لە سەر ماڵهەڵگرەوەکـە نیـە (إِنْ أَخَـذَ لِحِفْظٍ) ئەگەر شتەکەی بۆ پاراستن هەڵگرتبێتەوە (بَلْ) بـەڵکو لـە سـەر خاوەنەکەیـەتی، کـەوابو: (يُرَتِّبُهاالْقاضِـي مِـنْ بَيْـتِ الْمـالِ) قـازی لـە (بَيْـت الْمـال) مەسـرەفی بانگەوازیەکـە دەدا (أَوْ يَقْتَرِضُ عَلَىالْمالِكِ) یان لـە سـەر حیسابیخاوەنەکەی مەسـرەفی بانگەوازیەکـە لـە کەسـێك قــەرز دەکـا، یــان بەشـێکی لێدەفرۆشـێ، یــان فــەرمان دەداتــە ماڵهەڵگرەوەکــە: تــاکو مەسـرەفەکە بـداو لـە خاوەنەکـەی وەربگرێتـەوە-واتـە: ئەگـەر قـازی نـەبو، ئـەو کاتـە ماڵهەڵگرەوەکـە شـاهید دەگـرێ: کـە بـە مەبەسـتی وەرگرتنـەوە، مەسـرەفەکە دەکـا- هەروەك چەند جار ڕابرا.

بەڵام (وَإِنْ أَخَذَ لَتَمَلُّكٍ) ئەگەر شتەکەی بۆ ئـەوە هەڵگرتبێتـەوە: بیکاتـە ملکیخـۆی، ئـەو کاتە (لَزِمَتْهُ) ئەرکی بانگەوازیەکـە لـە سـەر ماڵهەڵگرەوەکەیـە، واتـە: هەرچـەند نەشیکاتە ملکی خۆیو بشیداتەوە خاوەنەکەی، نابێ ئـەرکی بانگەوازیەکـەی لێوەربگرێتـەوە، بـەڵام (وَقِيلَ إِنْ لَمْ يَتَمَلَّـكْ) لـە فەرموودەیـەکی بـێهێزدا: ئەگـەر نەیکاتـە ملکیخـۆی، ئـەو کاتـە (فَعَلَىالْمالِكِ) ئەرکەکە لەسەر خاوەنەکەیە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الْحَقِيرَ لاَ يُعَرَّفُ سَنَةً) شتی کـەم نـرخ پێویسـت نیـە ساڵێك بانگەوازیی بۆ بکرێ (بَلْ زَمَناً يُظَنُّ أَنَّ فاقِدَهُ يُعْرِضُ عَنْـهُ غالِبـاً) بـەڵکو ماوەیـەکی وەها بانگەوازیی بـۆ دەکـرێ: کـە وا تێبگـا خاوەنەکـەی وازی لێدێنـێ بـە ئەغلـەبی، وەك ڕۆژێك، دوو ڕۆژ، سێ ڕۆژ.

(فَصْلٌ) إذَا عَرَّفَ سَنَةً لَمْ يَمْلِكْها حَتَّى يَخْتارَهُ بِلَفْظٍ: كَتَمَلَّكْــتُ، وَقِيــلَ تَكْفِي النِّيَـةُ، وَقِيلَ يَمْلِكُ بِمُضِيِّ السَّنَةِ، فَإنْ تَمَلَّكَ فَظَهَرَ الْمالِكُ وَاتَّفَقا عَلَى رَدِّ عَيْنِها فَــذاكَ، وَإنْ أرادَها الْمالِكُ وَأرادَ الْمُلْتَقِطُ الْعُدُولَ إلى بَدَلِها

﴿ئاگاداری﴾: ئەو گوڵە گەنمەی لە پەرێز وازی لێدەهێندرێ، دروستە: هەڵیبگرێتەوە، هەروەها ئەو دەنك و دانەویڵەی بە هۆی لافاو دێتە ناو زەویەکەی ئەویش دەبێتە ملکی خاوەن زەویەکە، چونکە بەگوێرەی عادەت ئەو جۆرە شتانە وازیان لێدەهێندرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

## ﴿فَصْلٌ: لە باسی بە ملککردنی شتە هەڵگیراوەکە﴾

(إذَا عَرَّفَ سَنَةً) هەر کاتێك ساڵێك بانگەوازی بۆ شتە هەڵگیراوەکە کرد، یان کەمتر لە ساڵێك ئەگەر کەم نرخ بوو، ئەوە (لَمْ يَمْلِكْها حَتَّى يَخْتارَهُ بِلَفْظٍ) بە خودی بانگەوازیەکە نابێتە ملکیوی تا بە گوتن ملکایەتی هەڵدەبژێرێ (كَـ) وەك بڵێ: (تَمَلَّكْتُ) ئەم شتەم کردە ملکیخۆم (وَقِيلَ تَكْفِي النِّيَةُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: نیەتی کردنەملکایەتی بەسە (وَقِيلَ يَمْلِكُ بِمُضِيِّ السَّنَةِ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا بە تەولوبوونی ساڵەکە دەبێتە ملکیوی.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر شتەکەی کردە ملکیخۆیو خاوەنەکەشی دەست نەکەوت، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت داوای ئەو شتەی لێناکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، بەڵام هەر کاتێك خاوەنەکەی ئاشکرا بوو، واجبە: بیداتەوە، جا ئەگەر پێش ئەوەی بیکاتە ملکی خۆی، خاوەنەکەی ئاشکرا بوو، ئەو کاتە ئەرکیگەڕاندنەوەی لە سەر خاوەنەکەیە، بەڵام ئەگەر لە دوای کردنەملك خاوەنەکەی ئاشکرا بوو، ئەو کاتە ئەرکی گەڕاندنەوەی لە سەر ماڵهەڵگرەوەکەیە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(فَإنْ تَمَلَّكَ فَظَهَرَ الْمالِكُ) جا ئەگەر کردیە ملکیخۆی، ئینجا خاوەنەکەی ئاشکرا بوو (وَاتَّفَقا عَلَى رَدِّ عَيْنِها) هەردووکیش ڕێك کەوتن خودیماڵەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێندرێتەوە (فَذاكَ) ئەوە دیارە: خودی ماڵەکەی –بە گشت زێدەییەکەوە– دەداتەوە، بەڵام هەر زێدەییەکی لە دوای کردنەملك لێی جیا ببێتەوە: وەك شیرو خوریو بێچوو، ئەوە گشتی بۆ ماڵهەڵگرەوەکە دەمێنێتەوە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانەو، لە چوارەم ڕێگای ئاژەڵیدۆزراوەشدا ڕابرا، بەڵام ئەگەر لە پێش کردنەملك ئەو زێدەییانەی لێ جیا ببنەوە، ئەو کاتە ئەوانیش لەگەڵ شتەکەدا بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێندرێنەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

بەڵام (وَإنْ أرادَها الْمالِكُ) ئەگەر خاوەنەکە خودیماڵەکەی خۆی دەویستو (وَأرادَ الْمُلْتَقِطُ الْعُدُولَ إلى بَدَلِها) ماڵهەڵگرەوەکەش دەیویست لەجیاتی ماڵەکە شتێکیتری بداتێ، ئەو

أُجيبَ الْمالكُ فِيالأَصَحِّ، وَإِنْ تَلفتْ غرِمَ مِثْلَها أَوْ قِيمَتَها يَوْمَ التَّمَلُّكِ، وَإِنْ نَقصَتْ بِعَيْبٍ فَلَهُ أَخْذُها مَعَ الأَرْشِ فِيالأَصَحِّ، وَإِذا ادَّعاها رَجُلٌ وَلَمْ يَصِفْها وَلاَ بَيِّنَةَ لَمْ تُدْفَعْ إِلَيْهِ، وَإِنْ وَصَفَها وَظَنَّ صِدْقَهُ جازَ الدَّفْعُ إِلَيْهِ وَلاَ يَجِبُ عَلَىالْمَذْهَبِ، فَإِنْ دَفَعَ فَأَقامَ آخَرُ بَيِّنَةً بِها حُوِّلَتْ إِلَيْهِ، فَإِنْ تَلفتْ عِنْدَهُ فَلِصاحِبِ الْبَيِّنَةِ تَضْمينُ الْمُلْتَقِطِ

---

کاته (أُجِيبَ المالِكُ فيالأَصَحِّ) لـه فـەرموودەی ڕاستتردا: وەڵامـی خاوەنەکـە دەدرێتـەوەو قسەکەی جێبەجێ دەکرێ.

﴿ ئاگـاداری ﴾: ئەگـەر خاوەنەکـەی ئاشکرا بـوو، بـەڵام شتەکە فرۆشرابو، ئـەوە ئەگـەر فرۆشـیارەکە مـافی پەشـیمانیی هـەبو، ئـەو کاتـە خاوەنەکـە دەتوانـێ مامڵەتەکـە هەڵبوەشـێنێتەوەو خـودی ماڵەکـەیخۆی بباتـەوە، بـەڵام ئەگـەر فرۆشـیارەکە مـافی پەشیمانیی نـەبو، ئـەو کاتـە ناتوانـێ مامڵەتەکـە هەڵبوەشـێنێتەوە، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵکو پارەی شتەفرۆشراوەکەی وەردەگرێتەوە.

(وَإِنْ تَلِفَتْ) ئەگەر لە دوای کردنە ملك شتەکە فـەوتاو خاوەنەکەشی دەرکـەوت، ئـەو کاتـە (غَرِمَ مِثْلَها) وێنەیشتەکە—لە تۆڵە— دەداتـە خاوەنەکـەی (أَوْ قِيمَتَها يَوْمَ التَّمَلُّكِ) یـان نرخەکەی ڕۆژی کردنەملك—لە تۆڵە— دەداتە خاوەنەکەی.

(وَإِنْ نَقَصَتْ بِعَيْبٍ) ئەگەر لە دوای کردنە ملك بە هۆی عـەیبێك شتەکە کـەمی کردبو، ئـەو کاتە (فَلَهُ أَخْذُها مَعَ الأَرْشِ) بۆ خاوەنەکەی دروستە: شتەکە وەربگرێتـەوە، لەگـەڵ تۆڵـەی عەیبەکەش (فی الأَصَحِّ) لـە فـەرموودەی ڕاستتردا، بـەڵام لـە فـەرموودەی بـێهێزدا: مـافی تۆڵەی نیە.

(وَإِذا ادَّعاها رَجُلٌ) هەر کاتێك مرۆڤێك داوای شـتەکەی کـردو گـوتی هـی منـە. بـەڵام (وَلَمْ يَصِفْها) ناونیشانی نەگوتو (وَلاَ بَيِّنَةَ) هیچ شاهیدیشی نەبو—واتە: دوو پیـاو، یـان پیاوێكو دوو ئافرەت، یان پیاوێكو هەم سوێندیش بخوا— لـەو حاڵەتـەدا (لَمْ تُدْفَعْ إِلَيْـهِ) دروسـت نیـە: شـتەکەی بدرێتـەوە، بـەڵام (وَإِنْ وَصَفَها) ئەگـەر ناونیشـانی گـوتو (وَظَنَّ صِدْقَهُ) ماڵهەڵگرەوەکەش وا تێکەیشت ڕاست دەکا، ئەو کاتە (جازَ الدَّفْعُ إِلَيْـهِ) دروسـتە شـتەکەی بداتەوە، بـەڵام (وَلاَ يَجِبُ) واجب نابـێ بیداتـەوە تـا شـاهید دێنـێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لـە سـەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(فَإِنْ دَفَعَ) جا ئەگەر بە هۆی ناونیشان گۆتن شتەکەی دایە کەسێك (فَأَقامَ آخَرُ بَيِّنَةً بِها) یەکێکیتریش شاهیدی هێنا: کە شتەکە ملکیخۆیەتیو هی ئەویتر نیە، ئەو کاتـە (حُوِّلَتْ إِلَيْهِ) لەویتر وەردەگیرێتەوەو دەدرێتە خـاوەن شاهیدەکە (فَإِنْ تَلِفَتْ عِنْدَهُ) جـا ئەگـەر شتەکە لە لای ئەویتر فـەوتابو، ئـەو کاتـە (فَلِصاحِبِ الْبَيِّنَةِ تَضْمِينُ الْمُلْتَقِطِ) خـاوەن

وَالْمَدْفُوعِ إِلَيْهِ وَالْقَرارُ عَلَيْهِ، قُلْتُ: لاَ تَحِلُّ لُقَطَةُ الْحَرَمِ لِلتَّمَلُّكِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَيَجِبُ تَعْرِيفُها قَطْعاً وَاللهُ أَعْلَمُ.

(كِتابُ اللَّقِيط)

إِلْتِقاطُ الْمَنْبُوذِ فَرْضُ كِفايَةٍ، وَيَجِبُ الإِشْهادُ عَلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنَّما تَثْبُتُ وِلاَيَةُ الإِلْتِقاطِ

---

شاهیدەکە ماڤی هەیە: ماڵهەڵگرەوەکە بکاتە زامین‌و تۆڵەی لێبستێنێ، چونکە ئاشکرا بوو ئەو تەسلیمکردنەی دروست نەبوە، هەم (وَالْمَدْفُوعِ إِلَيْهِ) بۆی دروستە ئەویتریش بکاتە زامین: کە ماڵەکەی دراوەتێ، چونکە ئەویش بە ناهەق ماڵی کەسێکی‌تری بردوە (وَالْقَرارُ عَلَيْهِ) لە کۆتایی‌کێشەکەدا زامینیەکە هەر لە سەر ئەوی‌تر جێگیر دەبێ، چونکە لە دەست ئەوی‌دا فەوتاوە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النـواوی) دەفـەرموێ: (لاَ تَحِلُّ لُقَطَةُالْحَرَمِ لِلتَّمَلُّكِ) حەلاڵ نیە هەلگرتنەوەی شتی ونبوو لە حەرەمی(مکة)دا، بۆ ئەوەی بیکاتە ملکی‌خۆی (عَلَى‌الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، کەوابو: (وَيَجِبُ تَعْرِيفُها قَطْعاً) واجبە: بەردەوام بانگەوازی بۆ بکا، بە فەرموودەیەکی براوە (وَاللهُ أَعْلَمُ)، پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَاالْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللهُ تَعالَى لاَ يَلْتَقِطُ لُقَطَةُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَها﴾ رواه الشيخان، ئەم شارە خوا ڕێزی لێناوەو حەرامی کردوە، نابێ کەس شتی لێهەڵبگرێتەوە بۆ ئەوەی بیکاتە ملکی‌خۆی، تەنها ئەو کەسە نەبێ: کە بەردەوام بانگەوازی بۆ دەکا.

ئینجا بزانە: ئیمامی(البلقینی) ئەو فەرموودەیەی هەڵبژاردوە: کە حەرەمی (مدینـة)ی پیرۆزیش وەکو(مكة)یەو یەکسانن، واللهُ أَعْلَمُ.

﴿ كِتابُ اللَّقِيطِ: **پەرتوکی منداڵی‌فڕێدراو** ﴾

واتە: لە بەر نەبوونی ئەرکی‌بەخێوکردنی فڕێدرابێ، یان بیژی بێو لە ترسان، یان لە شەرمی‌خەڵك فڕێ درابێ، جا هەر جۆرێکیان بێ، ئەوە (إِلْتِقاطُ الْمَنْبُوذِ فَرْضُ كِفايَةٍ) هەڵگرتنەوەی منداڵی‌فڕێدراو، واجبە: بە (فَرْضُ الْكِفايَةِ)، واتە: ئەگەر یەکێك هەڵیبگرێتەوە، خێرەکە بۆ خۆیەتی‌و گوناهیش لە سەر خەڵکی‌تر لادەچێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَاالنَّاسَ جَمِيعًا﴾ هەر کەسێك ئادەمیزادێك لە مردن ڕزگار بکا، وەك هەموو خەڵکی ڕزگار کردبێ: وەهایە. واتە: چونکە بەو کارە باشە گشت خەڵکی لە تاوان ڕزگار کردوە.

(وَيَجِبُ الإِشْهادُ عَلَيْهِ) واجبە: هەڵگرەوەکە شاهید بگرێ لە سەر هەڵگرتنەوەی‌منداڵەکە (فِی الأَصَحِّ) لە فـەرموودەی‌ڕاستتردا (وَإِنَّماتَثْبُتُ وِلاَيَةُالإِلْتِقاطِ) سەرپەرشتکاریەتی هەڵگرتنەوە،

لِمُكَلَّفٍ حُرٌّ مُسْلِمٍ عَدْلٍ رَشِيدٍ، وَلَوْ إلْتَقَطَ عَبْدٌ بِغَيْرِإذْنِ سَيِّدِهِ اُنْتُزِعَ مِنْهُ، فَـإِنْ عَلِمَـهُ فَأَقَرَّهُ عِنْدَهُ أَوِالْتَقَطَ بِإِذْنِهِ فَالسَّيِّدُ الْمُلْتَقِطُ، وَلَوْ الْتَقَطَ صَبِيٌّ أَوْ فاسِقٌ أَوْ مَحْجُورٌعَلَيْـهِ أَوْ كافِرٌ مُسْلِماً اُنْتُزِعَ مِنْهُ، وَلَوِ ازْدَحَمَ اثْنانِ عَلَىأَخْذِهِ جَعَلَهُ الْحاكِمُ عِنْـدَ مَـنْ يَـراهُ مِنْهُما أَوْ مِنْ غَيْرِهِما، وَإِنْ سَبَقَ واحِدٌ فَالْتَقَطَهُ مُنِعَ الآخَرُ مِنْ مُزاحَمَتِـهِ، وَإِنِ الْتَقَطَـاهُ مَعاً وَهُما أَهْلٌ: فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُقَدَّمُ غَنِيٌّ

---

واته: بەخێوکردنی منداڵی هەڵگیراوەکە جێگیر دەبێ: تـەنها (لِمُكَلَّفٍ) بۆ کەسێکی وەها داوالێکراوی شەرع بێ، واتە: بالغو عاقڵ بێ، هـەم (حُرٍّ) ئازاد بـێو (مُسْلِمٍ) موسوڵمان بـێو (عَدْلٍ) دادپەروەر بێو (رَشِيدٍ) قەدەغەی دەستکاریملکو ماڵی لە سەر نەبێ.

(وَلَـوِ إلْـتَقَطَ عَبْـدٌ بِغَيْـرِ إِذْنِ سَـيِّدِهِ) ئەگـەر کۆیلەیـەك بـێئیزنی گەورەکـەی منـداڵێکی هەڵگرتـەوە (اُنْتُـزِعَ مِنْـهُ) دەبـێ منداڵەکـەی لێوەربگیرێتـەوە (فَـإِنْ عَلِمَـهُ) جـا ئەگـەر گەورەکەی زانی کۆیلەکەی منداڵێکی هەڵگرتۆتەوە (فَأَقَرَّهُ عِنْدَهُ) منداڵەکەشی لـە دەسـتی کۆیلەکەدا هێشتەوە (أَوِ الْتَقَطَ بِإِذْنِهِ) یان کۆیلەکە بە ئیزنی گەورەکـەی هـەڵیگرتبۆوە، لـە هەردوو حاڵەتدا (فَالسَّيِّدُ الْمُلْتَقِطُ) هـەر گەورەکـە بـە هـەڵگرەوە دادەنـدرێو کۆیلەکـەش جێگریەتی بۆ خزمەتکردنی منداڵەکە.

(وَ) هەروەها (لَوْ الْتَقَطَ صَبِيٌّ) ئەگەر منـداڵێك، یـان شـێتێك منداڵێکیفرێدراوی هەڵگرتـەوە (أَوْ فاسِـقٌ) یـان فاسـقێك (أَوْ مَحْجُورٌعَلَيْـهِ) یـان قەدەغەلەسـەرداندراوێك منـداڵێکی هەڵگرتەوە (أَوْ كافِرٌ مُسْلِماً) یـان کافرێـك منداڵێکیموسـوڵمانی هەڵگرتـەوە، ئـەوە (اُنْتُـزِعَ مِنْهُ) واجبە لە لایەن دادوەرەوە منداڵەکە-لە هەر یـەکێك لەوانـە- وەربگیرێتـەوە، چـونکە هیچیان-لە شەرعدا- لەوانە نین منداڵ بەخێو بکەن.

(وَلَوِازْدَحَمَ اِثْنانِ عَلَىأَخْذِهِ) ئەگـەر دوو کـەس-پـێش هەڵگرتنـەوە- بووە پاڵەپەستەیان: لـە سـەر وەرگرتنیمنـداڵێك، واتـە: هـەردووکیان دەیـانگوت: مـن وەریدەگـرمو بـەخێوی دەکەم، ئەو کاتـە (جَعَلَـهُ الْحاكِمُ عِنْدَ مَنْ يَراهُ مِنْهُمـا) دادوەر بـە بۆچوونیخۆی لـە لای یەکێك-لەو دووانە- دایدەنێ (أَوْ مِنْ غَيْرِهِما) یان لە لای یـەکێکیتری-جگـە لـەو دووانـە- دایـدەنێ، بـەڵام (وَإِنْ سَـبَقَ واحِـدٌ فَالْتَقَطَـهُ) ئەگـەر یـەکێك پـێش کـەوتو منداڵەکـەی هەڵگرتەوە، ئەو کاتە (مُنِعَ الآخَرُ مِنْ مُزاحَمَتِهِ) ئەویتر قەدەغـە دەکرێ: لـە پاڵەپەسـتەی پێشکەوتووەکە، چونکە مافەکە بۆ وی جێگیر بـووە، کەواتـە: ئەگـەر پـێش هـەموویان لـە لای ڕاوەستابو بەڵام هەڵینەگرتبۆوە، ئەو کاتە مافی نیە.

(وَإِنِ الْتَقَطَاهُ مَعاً) ئەگەر هەردووك بە یەکەوە هەڵیانگرتـەوەو (وَهُمـا أَهْـلٌ) هەردووکیشـیان لەوانە بون: هەڵگرتنەوەیان دروست بێ (فَالأَصَحُّ) بـە فەرموودەیڕاستتر (أَنَّـهُ يُقَدَّمُ غَنِـيٌّ

عَلَى فَقِيرٍ وَعَدْلٌ عَلَى مَسْتُورٍ، فَإِنِ اسْتَوَيَا أُقْرِعَ، وَإِذَا وَجَدَ بَلَدِيٌّ لَقِيطاً بِبَلَدٍ فَلَيْسَ لَهُ نَقْلُهُ إِلَى بَادِيَةٍ، وَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ نَقْلَهُ إِلَى بَلَدٍآخَرَ، وَأَنَّ لِلْغَرِيبِ إِذَا الْتَقَطَ بِبَلَدٍ أَنْ يَنْقُلَهُ إِلَى بَلَدِهِ، وَإِنْ وَجَدَهُ بِبَادِيَةٍ فَلَهُ نَقْلُهُ إِلَى بَلَدٍ، وَإِنْ وَجَدَهُ بَدَوِيٌّ بِبَلَدٍ فَكَالْحَضَرِيِّ، أَوْ بِبَادِيَةٍ أُقِرَّ بِيَدِهِ، وَقِيلَ إِنْ كَانُوا يَنْتَقِلُونَ لِلنُّجْعَةِ لَمْ يُقَرَّ، وَنَفَقَتُهُ فِي مَالِهِ الْعَامِّ: كَوَقْفٍ عَلَى اللُّقَطَاءِ، أَوِ الْخَاصِّ: وَهُوَ

---

عَلَى فَقِيرٍ) دەوڵەمەندەکەیان وەپێش هەژارەکە دێخرێ، هەم (وَعَدْلٌ عَلَى مَسْتُورٍ) دادپەروەرەکەیان وەپێش ئەوەیان دێخرێ کە حاڵی ئایینیی داپۆشراوە (فَإِنِ اسْتَوَيَا) جا ئەگەر لە گشت سیفەتەکان یەکسان بون، ئەو کاتە (أُقْرِعَ) پشکە لە نێوانیاندا دەکرێ: بۆ کامەیان دەرچوو، لە لای ئەویان دادەندرێ.

(وَإِذَا وَجَدَ بَلَدِيٌّ لَقِيطاً بِبَلَدٍ) هەر کاتێك شارستانیەك منداڵێکی هەلگرتەوە: لە شارێك، یان لە گوندێك (فَلَيْسَ لَهُ نَقْلُهُ إِلَى بَادِيَةٍ) بۆی دروست نیە: منداڵەکە بگوازێتەوە بۆ ئەو دەشتو لادێیانەی زانستی ئایینییان تێدا نیەو ژیانیان خۆش نیە، بەلام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی راستتر: (أَنَّ لَهُ نَقْلَهُ إِلَى بَلَدٍآخَرَ) بۆی دروستە: لەو شارە بیگوازێتەوە بۆ شارێکیتر.

(وَأَنَّ لِلْغَرِيبِ إِذَا الْتَقَطَ بِبَلَدٍ) هەر بە فەرموودەیراستتر: مرۆڤی‌نامۆ هەر کاتێك لە شارێکیتر جگە لە شاری خۆی هەلیبگرێتەوە، بۆی دروستە (أَنْ يَنْقُلَهُ إِلَى بَلَدِهِ) منداڵەکە بگوازێتەوە بۆ شارەکەیخۆی (وَ) هەروەها (إِنْ وَجَدَهُ بِبَادِيَةٍ) ئەگەر لە دەشتو لادێ هەلیگرتەوە، ئەو کاتەش (فَلَهُ نَقْلُهُ إِلَى بَلَدٍ) بۆی دروستە: بیگوازێتەوە بۆ ناو شارێك.

(وَإِنْ وَجَدَهُ بَدَوِيٌّ بِبَلَدٍ) ئەگەر لادێیی، واتە: دانیشتووی دەشتو لادێ لە ناو شاردا منداڵێکی هەلگرتەوە، ئەوەش (فَكَالْحَضَرِيِّ) وەك شارستانیە، واتە: ئەگەر لە شاردا نیشتەجێ ببێ، ئەوە منداڵەکەی لە دەستتدا دەهێلدرێتەوە، ئەگەر نا: دروست نیە بیگوازێتەوە بۆ شوێنێکی وەها: کە ژیانی خۆش نەبێو زانستی ئایینیی تێدا نەبێ، بەلام (أَوْ بِبَادِيَةٍ) ئەگەر لە دەشتو لادێ منداڵەکەی هەلگرتەوە، ئەو کاتە (أُقِرَّ بِيَدِهِ) هەر لەوێ لە دەستیدا دەهێلدرێتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنْ كَانُوا يَنْتَقِلُونَ لِلنُّجْعَةِ لَمْ يُقَرَّ) ئەگەر بۆ لەوەراندنی ئاژەڵەکانیان بەم لاو بەو لادا دەگەڕان، ئەو کاتە لە دەستیدا ناهێلدرێتەوە.

(وَنَفَقَتُهُ) ئەرکی بەخێوکردنی منداڵە هەلگیراوەکە (فِي مَالِهِ الْعَامِّ) لە ماڵە گشتیەکەی دەدرێ: (كَوَقْفٍ عَلَى اللُّقَطَاءِ) وەك ئەو ماڵەی وەقف کراوەتە سەر منداڵە هەلگیراوەکانو وەسێت بۆ ئەوان (أَوِ الْخَاصِّ) یان لە ماڵە تایبەتیەکەیەتی (وَهُوَ) ماڵی تایبەتیی

ماااختَصَّ بِهِ: كَثِيابٍ مَلْفُوفَةٍ عَلَيْهِ وَمَفْرُوشَةٍ تَحْتَهُ وَما فِي جَيْبِهِ مِنْ دَراهِمَ وَغَيْرِها وَمَهْدِهِ وَدَنانِيرَ مَنْثُورَةٍ فَوْقَهُ وَتَحْتَهُ، وَإِنْ وُجِدَ فِي دارٍ فَهِيَ لَهُ، وَلَيْسَ لَهُ مالٌ مَدْفُونٌ تَحْتَهُ وَكَذا ثِيابٌ وَأَمْتِعَةٌ مَوْضُوعَةٌ بِقُرْبِهِ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ لَمْ يُعْرَفْ لَهُ مالٌ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُنْفَقُ عَلَيْهِ مِنْ بَيْتِ الْمالِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ قامَ الْمُسْلِمُونَ بِكِفايَتِهِ قَرْضاً، وَفِي قَوْلٍ نَفَقَةً، وَلِلْمُلْتَقِطِ الإِسْتِقْلالُ بِحِفْظِ مالِهِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ مِنْهُ إِلاَّ بِإِذْنِ الْقاضِي قَطْعاً.

---

(ما اختَصَّ بِهِ) ئەوەیە تایبەت بە خۆی بێ: (كَثِيابٍ مَلْفُوفَةٍ عَلَيْهِ) وەك ئەو جلانەی لێی پێچراون‌و (وَمَفْرُوشَةٍ تَحْتَهُ) ئەوانەی لە ژێری ڕاخستراون، هەم (وَما فِي جَيْبِهِ مِنْ دَراهِمَ وَغَيْرِها) ئەو ماڵەی لە بەرك‌و باخەڵی داندراوە: وەك پارەو زێڕو زیو، هەم (وَمَهْدِهِ) ئەو ماڵەی لە بێشكەی داندراوە—ئەگەر بە بێشكەوە فڕێدرابێ—و هەم (وَدَنانِيرَ مَنْثُورَةٍ فَوْقَهُ وَتَحْتَهُ) ئەو پارەو زێڕەی لە سەری بڵاو كراوە، یان لە ژێری بڵاو كراوە.

(وَإِنْ وُجِدَ فِي دارٍ) ئەگەر منداڵەكە—بە تەنها— لە خانوویێكی وەهادا دۆزراوە: كە هیچ خاوەنێكی نەدەناسرا، ئەو كاتە (فَهِيَ لَهُ) خانووەكە ملكی منداڵەكەیە، چونكە لە دەستی ئەودایە، كەواتە: دوكانی بێ‌خاوەن‌و خێمەو باغی بێ‌خاوەنیش هەمان بڕیاری خانووی بۆ دەدرێ (وَلَيْسَ لَهُ مالٌ مَدْفُونٌ تَحْتَهُ) بەڵام ئەو ماڵەی لە ژێر منداڵەكەدا شاردراوەتەوە، ملكی منداڵەكە نیە، ئەگەر شوێنەكە ملكی وی نەبێ، بەڵام ئەگەر شوێنەكە ملكی وی بێ، ئەو كاتە ماڵە شاردراوەكەش هەر ملكی ئەوە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَكَذا ثِيابٌ وَأَمْتِعَةٌ مَوْضُوعَةٌ بِقُرْبِهِ) هەروەها ئەو جل‌و كەلوپەلەی لە نزیك منداڵەكە داندراون ئەوانەش ملكی ئەو نین (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(فَإِنْ لَمْ يُعْرَفْ لَهُ مالٌ) جا ئەگەر منداڵە فڕێدراوەكە هیچ ماڵێكی گشتی‌و تایبەتی نەبو، ئەو كاتە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ يُنْفَقُ عَلَيْهِ مِنْ بَيْتِ الْمالِ) لە (بَيْتُ المال) بەخێو دەكرێ.

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا ئەگەر (بَيْتُ المال) نەبو، ئەو كاتە (قامَ الْمُسْلِمُونَ بِكِفايَتِهِ قَرْضاً) واجبە: موسوڵمانە دەوڵەمەندەكان بە قەرز ئەندازەی بەخێوكردنی بدەن، واتە: هەر كاتێك منداڵەكە ماڵی پەیدا بوو، لێی وەربگرنەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا فەرموویانە (وَفِي قَوْلٍ نَفَقَةً) لە فەرموودەیەكدا: واجبە بە خۆڕایی بەخێوی بكەن‌و نابێ لێی وەربگرنەوە.

(وَلِلْمُلْتَقِطِ الإِسْتِقْلالُ بِحِفْظِ مالِهِ) بۆ هەڵگرەوەكە دروستە: سەربەخۆ ماڵی منداڵەكە بپارێزێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (وَلاَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ مِنْهُ) نابێ لە ماڵی منداڵە فڕێدراوەكە: منداڵەكە بەخێو بكا (إِلاَّ بِإِذْنِ الْقاضِي قَطْعاً) تەنها بە ئیزنی قازی

(فَصْلٌ) إِذَا وُجِدَ لَقِيطٌ بِدارِ الإِسْلامِ وَفِيها أَهْلُ ذِمَّةٍ أَوْ بِدارٍ فَتَحُوها وَأَقَرُّوها بِيَدِ كُفّارٍ صُلْحاً أَوْ بَعْدَ مِلْكِها بِجِزْيَةٍ وَفِيها مُسْلِمٌ حُكِمَ بِإِسْلامِ اللَّقِيطِ، وَإِنْ وُجِدَ بِدارِ كُفّارٍ فَكافِرٌ إِنْ لَمْ يَسْكُنْها مُسْلِمٌ، وَإِنْ سَكَنَها مُسْلِمٌ كَأَسِيرٍ وَتاجِرٍ فَمُسْلِمٌ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ حُكِمَ بِإِسْلامِهِ بِالدّارِ فَأَقامَ ذِمِّيٌّ بَيِّنَةً بِنَسَبِهِ لَحِقَهُ وَتَبِعَهُ فِي الكُفْرِ،

---

دروسته، به فه‌رمووده‌یه‌کی بڕایه‌وه، جا ئه‌گه‌ر نه‌گونجا ئیزنی قازی وه‌ربگری، یان قازی نه‌بو، ئه‌و کاته شاهید ده‌گری‌و به ماڵه‌که‌ی وی به‌خێوی ده‌کا، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌کاندا فه‌رموویانه.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی موسوڵمانی و کافری منداڵ ﴾

بزانه: به یه‌کێك له‌م سێ ڕێگایانه بڕیاری موسوڵمانبوون بۆ منداڵ ده‌درێ:

یه‌که‌م: (إِذَا وُجِدَ لَقِيطٌ بِدارِ الإِسْلامِ) هه‌ر کاتێك منداڵێکی فڕێدراو دۆزرایه‌وه له خانه‌ی ئیسلامدا و (وَفِيها أَهْلُ ذِمَّةٍ) کافره‌کانی په‌یمان له ئه‌ستۆش له‌و خانه‌یه‌دا نیشته‌جێ بون (أَوْ بِدارٍ فَتَحُوها) یان له شوێنێکی‌وه‌هادا دۆزرایه‌وه: که موسوڵمانان ڕزگاریان کردبێ‌و (وَأَقَرُّوها بِيَدِ كُفّارٍ) هه‌ر له ده‌ست کافره‌کانیشدا هێشتبێتیانه‌وه (صُلْحاً) جا له ڕووی پێکهاتنه‌وه شوێنه‌که هێشترابێته‌وه (أَوْ بَعْدَ مِلْكِها بِجِزْيَةٍ) یان له دوای کردنه ملکی ئیسلام، کافره‌کان به سه‌رانه هێشترابنه‌وه‌و (وَفِيها مُسْلِمٌ) ئه‌و شوێنه‌ش -له گشت حاڵه‌ته‌کاندا- موسوڵمانێکی تێدا بوو و ده‌گونجا منداڵه‌که له نه‌ژادی ئه‌و موسوڵمانه بێ، ئه‌وه له گشت مه‌سه‌له‌کاندا (حُكِمَ بِإِسْلامِ اللَّقِيطِ) بڕیار به ئیسلامیه‌تی منداڵه‌فڕێدراوه‌که ده‌درێ.

به‌لام (وَإِنْ وُجِدَ بِدارِ كُفّارٍ) ئه‌گه‌ر منداڵه‌که له خانه‌ی‌کافره‌کاندا دۆزرایه‌وه، ئه‌و کاته (فَكافِرٌ) منداڵه‌که به کافر داده‌نرێ (إِنْ لَمْ يَسْكُنْها مُسْلِمٌ) ئه‌گه‌ر هیچ موسوڵمانێك له‌و خانه‌یه‌دا نیشته‌جێ نه‌بێ.

به‌لام (وَإِنْ سَكَنَها مُسْلِمٌ) ئه‌گه‌ر له خانه‌ی کافره‌کاندا موسوڵمانێك نیشته‌جێ بوو و ده‌شگونجا منداڵه‌که له نه‌ژادی وی بێ: (كَأَسِيرٍ) وه‌کو دیل، هه‌م (وَتاجِرٍ) بازرگان، ئه‌و کاته (فَمُسْلِمٌ) منداڵه‌که به موسوڵمان داده‌نرێ (فِي الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی ڕاستتردا.

(وَمَنْ حُكِمَ بِإِسْلامِهِ بِالدّارِ) هه‌ر که‌سێك -به هۆی خانه‌ی‌ڕابردوو- بڕیاری ئیسلامه‌تی‌ی بۆ درابێ، ئینجا (فَأَقامَ ذِمِّيٌّ بَيِّنَةً بِنَسَبِهِ) کافرێکی په‌یمان له ئه‌ستۆ شاهیدی هێنان: که ئه‌م منداڵه له نه‌ژادی‌خۆیه‌تی. ئه‌و کاته (لَحِقَهُ) منداڵه‌که ده‌بێته منداڵی‌کافره‌که، هه‌م (وَتَبِعَهُ فِي الكُفْرِ) له کوفریشدا شوێن کافره‌که ده‌که‌وێ، واته: بڕیاری کافری‌ی بۆ ده‌درێ‌و بڕیاری ئیسلامیه‌تی‌ی لاده‌چێ، چونکه شاهیده‌کان له بڕیاره‌که به‌هێزترن، که‌وابو: جیاوازی نیه

وَإِن اقْتصَرَ عَلَى الدَّعْوَى فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ يَتْبَعُهُ فِي الْكُفْرِ، وَيُحْكَمُ بِإِسْلاَمِ الصَّبِيِّ بِجِهَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ لاَ تُفْرَضَانِ فِي لَقِيطٍ: إِحْدَاهُمَا: اَلْوِلاَدَةُ فَإِذَا كَانَ أَحَدُ أَبَوَيْهِ مُسْلِماً وَقْتَ الْعُلُوقِ فَهُوَ مُسْلِمٌ، فَإِنْ بَلَغَ وَوَصَفَ كُفْراً فَمُرْتَدٌّ،

---

شاهیدەکان: دوو پیاوی دادپەروەر بن، یان چوار ئافرەت بنو شاهیدی بدەن: ئەم منداڵە لە ژنی کافرەکە بوە. هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی.

بەلاّم (وَإِنِ اقْتَصَرَ عَلَى الدَّعْوَى) ئەگەر کافرەکە تەنها دلوای منداڵەفرێدراوەکەی کردو گوتی: کوڕی منە. هیچ بەلگەشی نەبو، ئەوە دەبێتە کوڕی خۆی، بەلاّم (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّهُ لاَ يَتْبَعُهُ فِي الْكُفْرِ) منداڵەکە لە کافریدا شوێن کافرەکە ناکەوێ، واتە: منداڵەکە بە کافر دانانرێ، چونکە-بە هۆی ئەو داوایە- بڕیاری ئیسلامیەتی هەڵناوەشێتەوە، ئینجا هەرچەند-بەو داوایە- منداڵەکە دەبێتە کوڕی کافرەکە، بەلاّم نابێ منداڵەکە لە لای کافرەکە دابندرێ، بەلکو-تا بلۆغی دەبێ- لە لای موسوڵمانێکی ئەمین دادەندرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەمو، سێیەم: (وَيُحْكَمُ بِإِسْلاَمِ الصَّبِيِّ) بڕیار بە ئیسلامیەتی منداڵ دەدرێ (بِجِهَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ) بە دوو ڕێگایتر: کە (لاَ تُفْرَضَانِ فِي لَقِيطٍ) لە منداڵیفرێدراودا ڕەچاو ناکرێن، بەلکو بە بۆنەی باسیئیسلامەتی لێرەدا گوتراون:

(إِحْدَاهُمَا: اَلْوِلاَدَةُ) ڕێگەی یەکەمیان: بە هۆی لە دایکبوونە، کەوابو: (فَإِذَا كَانَ أَحَدُ أَبَوَيْهِ مُسْلِماً) هەر کاتێك لە دایكو باوکەکانیمنداڵەکە یەکێکیان موسوڵمان بێ (وَقْتَ الْعُلُوقِ) لەو کاتەی کە تۆوی منداڵەکە لە منداڵدانەیدایکیدا جێگیر بووە (فَهُوَ مُسْلِمٌ) ئەو منداڵەش-بە پابەندیموسوڵمانەکە- بە موسوڵمان دادەندرێ، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلامو هەم ئایەتەکەیداهاتوو، لەو موسوڵمانبوونەشدا: جیاوازی دایكو باوکیخۆیو داپیرەو باپیرەو بە سەرەوەتریش نیە، بەو مەرجەی بەشێوەیەکی وەها: نەژادی بدرێتە پاڵ یەکێکیان کە نەژادەکەی بەویەوە بناسرێو نەژادەکە میراتی پێ وەربگیرێ.

کەوابو: هەر کەسێك نەژادی بگاتە باوکێکیموسوڵمان، یان دایکێکیموسوڵمان، یان داپیرەیەکیموسوڵمان، یان باپیرەیەکیموسوڵمان، یان هەر موسوڵمانێکی بە سەرەوەتر: کە بەویەوە بناسرێ، ئەو کەسە بە موسوڵمان دادەندرێ، هەرچەند لە دوای بلۆغبوونیش شادەی نەهێنابێ، یان لە باوكو دایکە نزیکەکانیشی یەکێك وەرگەڕابێو بوبێتە کافر، هەروەك لە (تحفةالمريد)و لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (فَإِنْ بَلَغَ) جا ئەگەر ئەو منداڵە بلۆغی بوو و (وَوَصَفَ كُفْراً) لە دوای بلۆغبوونی کوفرێکی کرد، ئەو کاتە (فَمُرْتَدٌّ) وەرگەڕاوەو بە کافربوو دادەندرێ.

وَلَوْ عَلِقَ بَيْنَ كافِرَيْنِ ثُمَّ أَسْلَمَ أَحَدُهُما حُكِمَ بِإسْلاَمِهِ، فَإنْ بَلَغَ وَوَصَفَ كُفْراً فَمُرْتَدٌّ، وَفِي قَوْلٍ كافِرٌ أَصْلِيٌّ، اَلثَّانِيَةُ: إذَا سَبَى مُسْلِمٌ طِفْلاً

---

(وَلَوْ عَلِقَ بَيْنَ كافِرَيْنِ) ئەگەر تۆوی منداڵەکە لە نێوان دایکو باوکێکی کافر-لە منداڵدانەی دایکیدا- جێگیر بوو (ثُمَّ أَسْلَمَ أَحَدُهُما) ئینجا لە دایکو باوکی خۆی، یان لە تیرەی بە سەرەوەتری، یەکێکیان موسوڵمان بوو پێش بلۆغبوونیمنداڵەکە، ئەو کاتەش (حُكِمَ بِإسْلاَمِهِ) بڕیار بە ئیسلامیەتی منداڵەکە دەدرێ بە پابەندیەتی ئەو موسوڵمانبووە، جیاوازی نیە-لە کاتی موسوڵمانبوونی یەکێك لە باوکو باپیرەکانی، یان لە دایکو داپیرەکانی- منداڵەکە: هەر لە زگیدایکیدابێ، یان لە دایك بوبێو بلۆغی نەبوبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو وەچەکانیشیان بە هۆی ئیمان شوێنیان کەوتون، لە بەهەشتدا وەچەکانیان بە هۆی ئیمانی ئەوان دەگەیەنینەوە ئەوان.

(فَإنْ بَلَغَ) جا ئەگەر ئەو جۆرە منداڵەش بلۆغی بوو و (وَوَصَفَ كُفْراً) لە دوای بلۆغبوونی کوفرێکی کرد (فَمُرْتَدٌّ) ئەوەش بە کافربوو دادەندرێ (وَفِي قَوْلٍ كافِرٌ أَصْلِيٌّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە کافریبنچینەیی دادەندرێ.

ئینجا بزانە: شێتیکافریش وەکو منداڵ-بە موسوڵمانبوونی یەکێك لە باوکو باپیرانی- بڕیاری ئیسلامیەتیی بۆ دەدرێ، بەڵام مرۆڤی بالغو عاقڵ لە کافربوونو لە موسوڵمانبووندا سەربەخۆیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر پیاوێکیموسوڵمان زینا لەگەڵ ئافرەتێکیکافر بکاو لەو زینایە منداڵێکی ببێ، ئەوە منداڵەکە-بە پابەندی دایکە کافرەکەی- بە کافر دادەندرێ، چونکە بە هۆی زینا نەژاد پەیدا نابێو منداڵەکە نەژادی ناچێتە سەر موسوڵمانە زیناکەرەکە هەروەك لە (نهایة)و (مغني)دا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر-بە پێچەوانەوە- کافرێك زینا لەگەڵ ئافرەتێکی موسوڵمان بکاو لەو زینایە منداڵێکی ببێ، ئەو کاتە-بە پابەندی دایکە موسوڵمانەکە- منداڵەکە بە موسوڵمان دادەندرێ، چونکە نەژادی دەچێتەوە سەر دایکیو ناچێتەوە سەر کافرە زیناکەرەکە، هەروەك لە (میرات)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: جیماع کردنی بە هەڵە وەکو جیماع کردنی بە مارەبڕینە، واتە: نەژادی پێ دروست دەبێ، چونکە حەڕام نیە، هەروەك لە باسی مارەییو (عِدَّة)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(اَلثَّانِيَةُ) ڕێگەی دووەم-کە سێیەمینیباسەکەیە- بۆ بڕیاری ئیسلامەتی منداڵ: (إذَا سَبَى مُسْلِمٌ طِفْلاً) هەر کاتێك موسوڵمانێك لە جەنگی کافراندا منداڵێکی کافران بگرێ، ئەو

تَبِعَ السَّابِيَ فِي الإِسْلاَمِ إِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ أَحَدُ أَبَوَيْهِ، وَلَوْ سَبَاهُ ذِمِّيٌّ لَمْ يُحْكَمْ بِإِسْلاَمِهِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَصِحُّ إِسْلاَمُ صَبِيٍّ مُمَيِّزٍ إِسْتِقْلاَلاً عَلَى الصَّحِيحِ، (فَصْلٌ) إِذَا لَمْ يُقِرَّ اللَّقِيطُ بِرِقٍّ فَهُوَ حُرٌّ إِلاَّ أَنْ يُقِيمَ أَحَدٌ بَيِّنَةً بِرِقِّهِ، وَإِنْ أَقَرَّ بِهِ لِشَخْصٍ فَصَدَّقَهُ قُبِلَ إِنْ لَمْ يَسْبِقْ إِقْرَارٌ بِحُرِّيَّةٍ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَيُشْتَرَطُ أَنْ لاَيَسْبِقَ تَصَرُّفٌ يَقْتَضِي

---

منداڵە (تَبِعَ السَّابِيَ فِي الإِسْلاَمِ) شوێن منداڵگرەکە دەکەوێ لە ئیسلامەتی‌دا، واتە: بڕیاری ئیسلامەتی‌ی بۆ دەدرێ (إِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ أَحَدُ أَبَوَيْهِ) بەو مەرجەی یەکێك لە دایكو باوکی‌منداڵەکە لەگەڵی بە دیل نەگیرابن، بەڵام (وَلَوْ سَبَاهُ ذِمِّيٌّ) ئەگەر کافرێکی پەیمان لە ئەستۆ منداڵێکی کافران بە دیل بگرێ (لَمْ يُحْكَمْ بِإِسْلاَمِهِ) بڕیاری ئیسلامەتی بۆ منداڵەکە نادرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَيَصِحُّ إِسْلاَمُ صَبِيٍّ مُمَيِّزٍ إِسْتِقْلاَلاً) موسوڵمانبوونی منداڵی‌فامیدە سەربەخۆ دروست نابێ کە پابەندی دایکێکی، یان باوکێکی موسوڵمانی نەبێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، هەروەك ئەگەر کافریش ببێ، بڕیاری کافربوونی لە سەر نادرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە فەرموودەیەکی‌تردا: موسوڵمانبوونی منداڵی‌فامیدە دروست دەبێ، کۆمەڵە زانایەکیش یارمەتی ئەم فەرموودەیان داوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەم لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)شدا موسوڵمانبوونی منداڵی‌فامیدە دروست دەبێ، هەروەك لە (مجمع الأنهر)دا فەرموویەتی، کەوابو: هەر کاتێك منداڵێکی فامیدە موسوڵمان بوو-بەو فەرموودەیە- لە دایكو باوکە کافرەکانی جیا دەکرێتەوە، نەوەك تووشی کافربوونی بکەنەوە، بەڵام منداڵە نەبالغەکانی‌کافرەکان-کە موسوڵمان نەبوبن- وەك کافرەکانی بالغ لە دونیادا ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێو لە گۆڕستانی موسوڵماناندا نانێژرێن، بەڵام لە قیامەتدا وەکو منداڵەکانی موسوڵمانان دەچنە بە هەشت-واللهُ أَعْلَمُ- هەروەك لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی داواکردنی نەژادی منداڵێك بۆ خۆی ﴾

(إِذَا لَمْ يُقِرَّ اللَّقِيطُ بِرِقٍّ) ئەگەر منداڵی‌فڕێدراو-لە دوای بلۆغبوون- دان بە کۆیلەیی خۆی‌دا نەنێ (فَهُوَ حُرٌّ) ئەوە بە مرۆڤێکی ئازاد دادەندرێ (إِلاَّ أَنْ يُقِيمَ أَحَدٌ بَيِّنَةً بِرِقِّهِ) مەگەر کەسێك شاهید بێنێ: کە ئەم منداڵە کۆیلەیە، ئەو کاتە دەبێتە کۆیلە (وَإِنْ أَقَرَّ بِهِ لِشَخْصٍ) ئەگەر دانی‌هێنا بە کۆیلایەتی خۆی بۆ کەسێکی‌تر (فَصَدَّقَهُ) کەسەکەش گوتی ڕاست دەکا (قُبِلَ) دانهێنانەکەی لێ‌قبوڵ دەکرێ (إِنْ لَمْ يَسْبِقْ إِقْرَارٌ بِحُرِّيَّةٍ) ئەگەر کۆیلەکە، یان کەسەکە پێش ئێستا نەیگوتبێ: من ئازادم، یان ئەمە ئازادە.

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ) بە مەرج دانانرێ (أَنْ لاَ يَسْبِقَ تَصَرُّفٌ) دەستکاریەکی وەها پێش ئێستا لە کۆیلەکە ڕووی‌نەدابێ: کە (يَقْتَضِي

نُفُوذُهُ حرِّيَّةً: كَبَيْعٍ وَنِكاحٍ، بَلْ يُقْبَلُ إقرارُهُ في أَصْلِ الرِّقِّ وَأحْكامه الْمُسْتَقْبَلَة لاَالْماضيَةِ الْمُضِرَّةِ بِغَيْرِه فيالأَظْهَر، فَلَوْ لَزِمَهُ دَيْنٌ فَأَقَرَّ برقٍّ وَفي يَده مالٌ قُضيَ منْهُ، وَلَوْ ادَّعى رِقَّهُ مَنْ لَيْسَ فِي يَده بِلاَ بَيِّنَة لَمْ يُقْبَلْ، وَكَذا إن ادَّعاهُ الْمُلْتَقطُ فيالأَظْهَر، وَلَوْ رَأَيْنا صَغيراً مُمَيِّزاً أَوْ غَيْرَهُ في يَد مَنْ يَسْتَرِقُّهُ وَلَمْ يُعْرَفْ اسْتنادُها إلَىالإلْتقاط حُكمَ لَهُ بالرِّقِّ، فَإنْ بَلَغَ وَقالَ أَنا حُرٌّ لَمْ يُقْبَلْ قَوْلُهُ فيالأَصَحِّ إلاَّ ببيِّنَة، وَمَنْ أَقامَ بَيِّنَةً برقِّه عُملَ بها وَيُشْتَرطُ أَنْ تَتَعَرَّضَ الْبَيِّنَةُ لِسَبَب الْملْك، وَفي قَوْلٍ يَكْفي مُطْلَقُ الْملْك، وَلَوْ اسْتَلْحَقَ اللَّقيطَ حُرٌّ مُسْلمٌ

---

(نُفُوذُهُ حرِّيَـةً) ئەگەر ئەو دەستكاریە بڕوێنـدرێ نیشـانەی ئـازادی كۆیلەكـە بـێ: (كَبَيْعٍ وَنِكاحٍ) وەك فرۆشتن‌و مارەبڕین‌و ئەو جۆرە دەستكاریانە (بَلْ يُقْبَلُ إقرارُهُ في أَصْلِ الرِّقِّ) بەڵكو لە دوای ئەو دەستكاریانە دانهێنـانی لـە بـارەی بنچینەیكۆیلایەتیی وەردەگیرێ، هەم (وَأحْكامه الْمُسْتَقْبَلَة) لە بـارەی بڕیارەكانیداهـاتووش وەردەگیرێ (لاَالْماضيَةِالْمُضِرَّةِ بِغَيْرِه فيالأَظْهَر) بەڵام لە بڕیارەكانیڕابردووی كە زیان لە كەسێكیتر بدەن، وەرناگیرێ.

(فَلَوْ لَزِمَهُ دَيْنٌ) ئەگەر فڕێدراوەكە قەرزێكی كەوتە سەر (فَأَقَرَّ برقٍّ) ئینجا دانیهێنـا: كـە كۆیلەیە (وَفي يَده مالٌ) لەو حاڵەتەشدا هەندێك ماڵی لە دەستدابوو (قُضيَ منْهُ) قەرزەكـە لـەو ماڵـە دەدرێتـەوە (وَلَوْ ادَّعى رِقَّهُ مَنْ لَيْسَ فِي يَده) ئەگەر كەسێكی وەهـا داوای كۆیلایەتی منداڵە فڕێدراوەكەی كرد: كە منداڵەكەی لە دەستدا نەبو (بِلاَ بَيِّنَةٍ) شاهیدیشـی نەبو (لَمْ يُقْبَلْ) داوایەكـەی لێ قبـوڵ نـاكرێ (وَكَذا إنِ ادَّعاهُ الْمُلْتَقطُ فيالأَظْهَرِ) هـەروەها ئەگەر ئـەو كەسـەی منداڵەكەشـی هەڵگرتۆتـەوە داوای كۆیلایـەتیی بكـا، هـەر لێی قبـوڵ ناكرێ لە فەرموودەی بەهێزتردا.

بەلام (وَلَوْ رَأَيْنا صَغيراً مُمَيِّزاً) ئەگەر منداڵێكی فامیدەمان دیت (أَوْ غَيْرَهُ) یـان منـداڵێكی نەفاممان دیت (في يَدِ مَنْ يَسْتَرِقُّهُ) لە دەستی كەسێكدا: كـە كردبویـە كۆیلـەی خـۆی (وَلَمْ يُعْرَفْ اسْتنادُها إلَىالإلْتقاط) نەشزاندرا بـە پاڵپشتی هەڵگرتنـەوە لـە دەسـتی دایـە، ئـەوە (حُكمَ لَهُ بالرِّقِّ) بڕیاری كۆیلایەتی منداڵەكەی بۆ دەدرێ (فَإنْ بَلَغَ وَقالَ أَنا حُرٌّ) جـا ئەگـەر منداڵەكە بلۆغی بوو و گوتی من ئازادم (لَمْ يُقْبَلْ قَوْلُهُ فيالأَصَحِّ) قسـەكەی لێقبـوڵ نـاكرێ (إلاَّ ببيِّنَةٍ) تەنها ئەگەر شاهیدی هەبێ، ئەو كاتە لێی قبوڵ دەكرێ (وَمَنْ أَقامَ بَيِّنَةً برقِّه) هـەر كەسـێك شـاهید بێنـێ: كـە ئـەم منداڵـە فڕێـدراوە كۆیلەیـە (عُملَ بها) بـە شـاهیدی شاهیدەكان ڕەفتار دەكرێ، بەلام (وَيُشْتَرطُ أَنْ تَتَعَرَّضَ الْبَيِّنَةُ لِسَبَبِ الْملْكِ) بـە مـەرج دانـدراوە: شاهیدەكان هۆیملكایەتیكۆیلەكە-بۆ كەسـەكە-بلێـن (وَفي قَوْلٍ يَكْفي مُطْلَقُ الْملْكِ) لە فەرموودەیەكدا: ئەوەندە بەسە بلێن: كۆیلەكە ملكی فلانكەسە.

(وَلَوْ اسْتَلْحَقَ اللَّقيطَ حُرٌّمُسْلمٌ) ئەگـەر پیـاوێكی ئـازادو موسوڵمان: منداڵـە فڕێدراوەكـەی بـە نەژادی خـۆیەوە بەست، یان هەر منداڵێكیتری بە نەژادی خـۆیەوە بەسـت، وەك بلێ: ئەمـە

لَحِقَهُ وَصارَ أَوْلَى بِتَرْبِيَتِه، وَإِن اسْتَلْحَقَهُ عَبْدٌ لَحِقَهُ وَفي قَوْلٍ يُشْتَرَطُ تَصْديقُ سَيِّده، وَإِنْ اسْتَلْحَقَتْهُ امْرَأَةٌ لَمْ يَلْحَقْها فِي الأَصَحِّ، أَو اثْنان لَمْ يُقَدَّمْ مُسْلِمٌ وَحُرٌّ عَلَى ذِمِّيٍّ وَعَبْدٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ عُرِضَ عَلَى الْقائِفِ فَيَلْحَقُ مَنْ أَلْحَقَهُ بِه،

---

کوڕی منه. ئەوە (لَحِقَهُ) منداڵەکە دەبێتە کوڕی موسوڵمانەکە، بەو مەرجانەی لە دانهێنانی نەژاددا ڕابران، کەوابو: (وَصارَ أَوْلَى بِتَرْبِيَتِهِ) ئەو پیاوە موسوڵمانە لە هەموو کەسێك لەپێشترە بۆ پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵەکە، چونکە باوکیەتی، بەڵام سوننەتە: قازی لێی بکۆڵێتەوەو بڵێ: لە چ ڕووێکەوە ئەم منداڵە کوڕی تۆیە، یان کچی تۆیە؟ ئایا لە ژنی خۆتە، یان لە ژنێکی بێگانەیە: کە بە هەڵە جیماعت لەگەڵ کردوە.

هەروەها ئەگەر کافرێکیش بڵێ: ئەم منداڵە فڕێدراوە هی منە. لێی قبوڵ دەکرێ‌و منداڵەکە دەبێتە کوڕی کافرەکە، بەڵام لە کافربووندا شوێنی ناکەوێ، هەروەك ڕابراو لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَإِن اسْتَلْحَقَهُ عَبْدٌ) ئەگەر کۆیلەیەك گوتی کوڕی منە (لَحِقَهُ) دەبێتە کوڕیکۆیلەکە (وَفي قَوْلٍ يُشْتَرَطُ تَصْديقُ سَيِّدِهِ) لە فەرموودەیەکدا بە مەرج داندراوە: گەورەی کۆیلەکەش باوەڕی پێ بکا.

بەڵام (وَإِن اسْتَلْحَقَتْهُ امْرَأَةٌ) ئەگەر ئافرەتێك بڵێ: ئەم منداڵە هی منە. ئەوە (لَمْ يَلْحَقْها) نابێتە منداڵیئافرەتەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵکو پێویستە شاهیدی هەبێ: کە ئەم منداڵەی لێبوە. ئینجا منداڵەکە دەبێتە منداڵیخۆی.

(أَو اثْنانِ) یان ئەگەر دوو کەس منداڵەکەیان بە نەژادیخۆیانەوە بەست‌و هەر یەکەیان گوتی: ئەم منداڵە هی منە. ئەو کاتە (لَمْ يُقَدَّمْ مُسْلِمٌ وَحُرٌّ) پیاوی موسوڵمان‌و ئازاد وەپێش نایەخرێ (عَلَى ذِمِّيٍّ وَعَبْدٍ) لە سەر کافری پەیمان لەئەستۆو لە سەر کۆیلە، بەڵکو گشتیان لەو داوایەدا یەکسانن:

کەوابو: (فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ) ئەگەر هیچێکیان شاهیدی نەبو، ئەو کاتە (عُرِضَ عَلَى الْقائِفِ) منداڵەکەو گشت داواکارەکانی دەبردرێنە لای دروشمناس، تاکو تەماشای لاشەیان بکا، ئەو کاتە (فَيَلْحَقُ مَنْ أَلْحَقَهُ بِهِ) منداڵەکە دەبێتە هی ئەو کەسەیان: کە دروشمناسەکە دەیداتێ‌و دەڵێ: لە نەژادی ئەوەیە، بە بەڵگەی: ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَسْرُوراً فَقالَ: أَلَمْ تَرَيْ إِلى مُجَزِّزٍ الْمُدْلِجِيِّ نَظَرَ إِلَى زَيْدٍ وَأُسامَةَ بنِ زَيْدٍ فَقالَ: هَذِهِ الأَقْدامُ بَعْضُها مِنْ بَعْضٍ؟﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ڕۆژێك بە دڵخۆشی هاتەوەو فەرمووی: (عائشة) نەتدیت (مُجَزِّزِ)ی دروشمناس چۆن تازە تەماشای (زەید)و (ئوسامە)ی کوڕی (زەید)ی کردو گوتی: ئەم پێیانە لە نەژادی یەکترن؟. واتە: بە دروشمی پێیەکانیان زانی (زيد)و (أسامة) کوڕو باوکن، پێغەمبەریشﷺبەم دروشمناسینە دڵخۆش بوو.

فَإنْ لَمْ يَكُنْ قائِفٌ أَوْ تَحَيَّرَ أَوْ نَفاهُ عَنْهُما أَوْ أَلْحَقَهُ بِهِما أُمِرَ بِالإنْتِساب بَعْدَ بُلُوغِهِ إلَى مَنْ يَميلُ طَبْعُهُ إلَيْهِ مِنْهُما، وَلَوْ أَقاما بَيِّنَتَيْنِ مُتَعارِضَتَيْنِ سَقَطَتا فِي الأَظْهَر.

---

(فَإنْ لَمْ يَكُنْ قائِفٌ) جا ئەگەر دروشمناس نەبو (أَوْ تَحَيَّرَ) یان هەبو، بەلام لێی شێوا (أَوْ نَفاهُ عَنْهُما) یان گوتی: منداڵەکە لە نەژادی هیچێکیان نیە (أَوْ أَلْحَقَهُ بِهِما) یان گوتی: منداڵەکە لە نەژادی هەردووکیانە، ئەو کاتە چاوەڕوانی بلۆغبوونی منداڵەکە دەکەین، کەوابو: (أُمِرَ بِالإنْتِسابِ بَعْدَ بُلُوغِهِ) لە دوای بلۆغبوونی، فەرمانی پێدەکرێ: نەژادی خۆی بلکێنێ (إلَى مَنْ يَميلُ طَبْعُهُ إلَيْهِ مِنْهُما) بەو کەسەی کە تەبیعەتو دڵو دەروونی بەلایدا دەچێ: لە یەکێك لەو دووانە.

جا بزانە: ئەگەر تەنها یەکێکیان شاهیدی هەبو، ئەوە منداڵەکەی دەدرێتێ، بەلام (وَلَوْ أَقاما بَيِّنَتَيْنِ) ئەگەر هەردووکیان شاهیدیان هێنا (مُتَعارِضَتَيْنِ) شاهیدەکانیش دژی یەکتری بون، ئەو کاتە (سَقَطَتا فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: شاهیدەکانی هەردووکیان لەکار دەکەونو دیسان دەبردرێنە لای دروشمناس بەو شێوەی ڕابرا.

﴿ **ئاگاداریەکی گرنگ** ﴾: ئەگەر بێگومان بزانێ منداڵەکە هی خۆیەتی، ئەوە واجبە: دان بهێنێو بڵێ: منداڵی منە. بەلام ئەگەر بە درۆ منداڵێك بکاتە منداڵیخۆی، یان بە درۆ بڵێ: منداڵی من نیە. ئەو کاتە حەڕامە، ئەگەر بە حەلاڵیشی بزانێ، ئەو کاتە کافر دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) لە باسی (إقرار)دا فەرموویانە.

کەوابو: ئەو ڕەفتارە خراپەی ئێستا هەیە: کە منداڵێکیفڕێدراو دەدۆزنەوە، یان لە کەسێکی وەردەگرن، ئینجا لە دادگاو لە بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامەو ناسنامەدا منداڵەکە بە ناویخۆیان تۆمار دەکەن، ئەوەش حەڕامە، ئەگەر بە حەلاڵیشی بزانن کافر دەبن.

کەوابو: هەر کاتێك منداڵەکە بلۆغی بو لە سەری واجبە: نکوڵی لەو نەژادە درۆزنە بکاو ئاشکرا بکا: کە ئەو ژنو مێردە دایکو باوکی خۆی نین، چونکە ئەگەر وا نەکا، ئەویش بە بەر هەڕەشەی ئەم حەدیسە دەکەوێ: کە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ إدَّعَى بِغَيْرِ أَبِيهِ–وَهُوَ يَعْلَمُ–إلاَّ كَفَرَ﴾ وَفِي حَديثٍ آخَرَ: ﴿فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ رواهما الشيخان، هەر کەسێك–جگە لە باوکیخۆی– خۆی بە کوڕی کەسێکیتر دابنێو بشزانێ کوڕی ئەو نیە، ئەوە کافر دەبێ–واتە: ئەگەر بە حەلاڵی بزانێ– لەعنەتی خواو مەلائیکەو هەموو خەڵکی لە سەر بێ. ئیتر لە (باسیدانپێداهێنانینەژاد)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە بە درێژی ڕابرا، بەلام لەبەر گرنگی لێرەشدا دووبارەمان کردەوە.

## (كِتابُ الْجَعالَة)

هِيَ كَقَوْلِه: مَنْ رَدَّ آبِقِي فَلَهُ كَذَا، وَيُشْتَرَطُ صِيغَةٌ تَدُلُّ عَلَىالْعَمَلِ بِعِوَضٍ مُلْتَزَمٍ، فَلَوْ عَمِلَ بِلاَ إِذْنٍ أَوْ أَذِنَ لِشَخْصٍ فَعَمِلَ غَيْرُهُ فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَلَوْ قالَ أَجْنَبِيٌّ: مَنْ رَدَّ عَبْدَ زَيْدٍ فَلَهُ كَذَا، اِسْتَحَقَّهُ الرَّادُّ عَلَىالأَجْنَبِيِّ،

---

### ﴿ كِتابُ الْجَعالَةِ: **پەرتوکی جەعالە** ﴾

واتە: شتێك بخاتە ئەستۆی‌خۆی لە بەرامبەر کارێکی زانراو، یان نەزانراو: کە بۆی بکرێ

(هِيَ) مامڵەتی‌جەعالە (كَقَوْلِه) وەك بڵێ: (مَنْ رَدَّ آبِقِي فَلَهُ كَذَا) هەر کەسێك کۆیلە هەڵاتووەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەو شتەی دەدەمێ. یان بڵێ: ئەگەر لە بەندیخانە ڕزگارم بکەی، ئەو شتەت دەدەمێ. یان بڵێ: ئەگەر ئەم کارەم بۆ پێك بێنی، ئەو شتەت دەدەمێ...هتد ﴿عَنْ أَبِي‌سَعِيدالْخُدْرِيﷺ: أَنَّ سَيِّدَ حَيٍّ مِنَ الْعَرَبِ لَدَغَتْهُ عَقْرَبٌ، فَأَتَوْا إِلَى رَهْطٍ مِنْ أَصْحابِ النَّبِيِّﷺ فَقَالُوا: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ فَقالَ بَعْضُهُمْ: نَعَمْ إِنِّي وَاللهِ لَراقٍ، وَلَكِنْ مَا أَنا بِراقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنا جُعْلاً. فَصالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنَ الْغَنَمِ، فَجَعَلَ يَتْفُلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ). فَكَأَنَّما نُشِطَ مِنْ عِقالٍ، فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمْ، ثُمَّ أَتَوُاالنَّبِيَّﷺ، فَقالَﷺ: أَصَبْتُمْ إِقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ﴾ رواه الشيخان، گەورەیەکی‌عەرەب دووپشك پێیوەداو داوای دوعایان لە سەحابەکانی پێغەمبەرﷺکرد، جا یەکێکیان گوتی: من دوعا دەزانم، بەڵام دوعاتان بۆ ناکەم تا کرێیەکمان بۆ دانەنێن. جا لە سەر سی سەرە مەڕ پێك هاتن‌و بە سورەتی (فاتحة) دوعای لە سەر گەورەکەیان خوێندو چاك بۆوە، جا سی مەڕەکەیان دانێ‌و هێنانیانەوە خزمەت پێغەمبەرﷺ، ئەویش فەرمووی: کارێکی باشتان کردوە، مەڕەکان بەش بکەن‌و لەگەڵ خۆتان بەشێکیش لەو مەڕانە بۆ من دابنێن.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی مامڵەتی‌جەعالە بە مەرج دادەندرێ (صِيغَةٌ) گۆتەیەك هەبێ: کە (تَدُلُّ عَلَىالْعَمَلِ بِعِوَضٍ مُلْتَزَمٍ) ببێتە نیشانەی ئیزندانی کارکردنێك بە کرێیەکی چەسپێندراو لە ئەستۆی ئیزندەرەکە: وەك وێنەکانی‌ڕابردوو، کەوابو: (فَلَوْ عَمِلَ بِلاَ إِذْنٍ) ئەگەر یەکێك بێ‌ئیزندان کارێکی بۆ کەسێکی‌تر کرد، یان بە ئیزنی‌کەسەکە کارەکەی کرد، بەڵام باسی کرێیەکەی نەکرد (أَوْ أَذِنَ لِشَخْصٍ فَعَمِلَ غَيْرُهُ) یان کەسەکە پیاوێکی ئیزندا کارەکەی بۆ بکاو یەکێکی‌تر کارەکەی کرد، لەو سێ مەسەلانەدا (فَلاَ شَيْءَ لَهُ) کرێکارەکە مافی هیچ کرێیەکی نیە.

(وَلَوْ قالَ أَجْنَبِيٌّ) ئەگەر بێگانەیەك گوتی: (مَنْ رَدَّ عَبْدَ زَيْدٍ فَلَهُ كَذَا) هەر کەسێك کۆیلەکەی (زەید) بگەڕێنێتەوە ئەو شتەی دەدەمێ، ئەوە (اِسْتَحَقَّهُ الرَّادُّ عَلَىالأَجْنَبِيِّ) ئەو کەسەی کۆیلەکەی گەڕاندۆتەوە، مافی شتەکەی لە سەر بێگانەکە هەیەو واجبە:

وَإنْ قالَ: قالَ زَيْدٌ: مَنْ رَدَّ عَبْدي فَلَهُ كَذَا، وَكانَ كاذِباً لَمْ يَسْتَحقَّ عَلَيْهِ وَلاَ عَلَى زَيْد، وَلاَ يُشْتَرَطُ قَبُولُ الْعامِلِ وَإنْ عَيَّنَهُ، وَتَصحُّ عَلَى عَمَلٍ مَجْهُولٍ وَكَذَا مَعْلُومٍ فِي الأَصَحِّ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُ الْجُعْلِ مَعْلُوماً، فَلَوْ قالَ:

---

بێگانەکە بیداتێ. بەڵام (وَإنْ قالَ) ئەگەر بێگانەکە گوتی: (قالَ زَيْدٌ) زەید گوتویەتی: (مَنْ رَدَّ عَبْدِي فَلَهُ كَذَا) هەر کەسێك کۆیلە هەڵاتووەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە ئەو شتەی دەدەمێ (وَكانَ كاذِباً) بێگانەکەش بە درۆ ئەو قسەیەی کردبو، ئەو کاتە (لَمْ يَسْتَحِقَّ عَلَيْهِ وَلاَ عَلَى زَيْدٍ) کرێکارەکە مافی هیچ کرێیەکی نیە: نە لە سەر بێگانەکەو نە لە سەر زەید، بەڵام ئەگەر زەید بڵێ: بێگانەکە ئەو قسەیەی بە ڕاست کردبو، ئەو کاتە: لە سەری واجبە: کرێیەکە بداتە کرێکارەکە.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی جەعالە بە مەرج دانانرێ (قَبُولُ الْعامِلِ) کرێکارەکە بە زوبان قبوڵ بکا، بەڵکو ئەوەندە بەسە: کارەکە بکا (وَإنْ عَيَّنَهُ) هەرچەند کرێدەرەکەش کرێکارەکەی دیاری کردبێ.

ئینجا بزانە: مەرجە: کرێدەرەکە دەستکاری ملكو ماڵیخۆی دروست بێ، کەوابو: کرێی جەعالە لە لایەن منداڵو شێتو قەدەغەکراو دروست نابێ، بەڵام ئەوانە هیچیان لە کرێکارەکەدا بە مەرج دانەندراون، بەڵکو تەنها ئەوەندە مەرجە: ئاگاداری بانگەوازی ئیزندانەکە بێ، کەوابو: ئەگەر یەکێك گوتی: هەر کەسێك ئەو کارەم بۆ بکا دینارێکی دەدەمێ. ئەو کاتە هەر کەسێك ئاگاداری بانگەوازیەکە بێو کارەکە بکا، مافی دینارەکەی هەیە، جیاوازی نیە کرێکارەکە: پیاو بێ، یان ئافرەت بێ، بالغو عاقڵ بێ، یان منداڵ، یان شێت بێ، هەروەك لە (نهاية)و(مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ دروستە فەرمانبەرێك بە پارە واز لە کارەکەی خۆی بێنێ بۆ کەسێکیتر، چونکە ئەوەش بەشێکی جەعالەیەو پارەکەشی لێ حەڵاڵە، هەرچەند کاربەدەستیش ئەم کەسە لە جێی فەرمانبەرەکە جێگیر نەکا، هەروەها ئەگەر بڵێتە کەسێك: سەد دینارم بۆ قەرز بکە دە دینارت دەدەمێ. ئەوەش دروستەو مافی دە دینارەکەی هەیە، هەروەك لە (تحفة)و(الشروانى)دا ئەم مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَتَصِحُّ) جەعالە دروست دەبێ (عَلَى عَمَلٍ مَجْهُولٍ) لە سەر کارێکی نەزانراو: کە چۆنیەتیو کاتو شوێنی بە ڕێکی نەزانرێ (وَكَذَا مَعْلُومٍ) هەروەها لە سەر کارێکی زانراویش دروست دەبێ، وەك بڵێ: هەر کەسێك ئەو شتەم لەو شوێنەوە بۆ بهێنێتەوە ماڵەوەم دینارێکی دەدەمێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی جەعالە بە مەرج دادەنرێ (كَوْنُ الْجُعْلِ مَعْلُوماً) دەبێ کرێیەکە زانراو بێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، کەوابو: (فَلَوْ قالَ) ئەگەر گوتی:

مَنْ رَدَّهُ فَلَهُ ثَوْبٌ أَوْ أُرْضيه، فَسَدَ الْعَقْدُ وَللرَّادِّ أُجْرَةُمِثْله، وَلَوْ قالَ منْ بَلَد كَذا فَـرَدَّهُ مِـنْ أَقْرَبَ منْهُ فَلَهُ قسْطُهُ منَ الْجُعْلِ، وَلَوْ اشْتَرَكَ اثْنان في رَدِّه اشْتَرَكا فيالْجُعْلِ، وَلَـوْ الْتَـزَمَ جُعْلاً لمُعَيَّنٍ فَشارَكَهُ غَيْرُهُ فيالْعَمَلِ: إنْ قَصَدَ إعانَتَهُ فَلَهُ كُلُّ الْجُعْـلِ، وَإنْ قَصَـدَ الْعَمَـلَ للْمالكَ فللأَوَّل قسْطُهُ وَلاَ شَيْءَ للْمُشارك بحال،

---

(مَنْ رَدَّهُ فَلَهُ ثَوْبٌ) هـەر كەسێك شتەكەم بۆ بهێنێتـەوە ماڵـەوەم جلێكـی دەدەمـێ(أَوْ أُرْضيه) یـان ڕازیی دەكـەم (فَسَدَالْعَقْدُ) مامڵەتەكـە بـەتاڵ دەبـێ، چـونكە نەزانـدرلوە جلەكـە، یـان ڕازیكردنەكـە چـیـیە؟ بـەڵام (وَللـرَّادِّ أُجْرَةُمثْلـه) ئـەو كەسـەی شـتەكەی هێناوەتەوە مافی كرێی وێنەی كارەكەی هەیـە لـە سـەر كرێدەرەكـە، چـونكە بـە خـۆڕایی كارەكەی نەكردوە.

(وَ) هەروەها (لَوْ قالَ) ئەگەر كرێدەرەكە گوتی: (مِنْ بَلَدكَذا) هـەر كەسێك ئـەو شتەم لـە فلانە شارەوە بۆ بهێنێتـەوە ئـەم شـارە، پـەنجا دینـاری دەدەمـێ (فَرَدَّهُ مِـنْ أَقْـرَبَ منْـهُ) كرێكارەكـەش لـە شـوێنێكی‌نزیكترەوە شتەكەی هێنـاوە، ئـەو كاتـەش (فَلَـهُ قسْـطُهُ مِـنَ الْجُعْلِ) مافی بەشە كرێیەكەی هەیە، كەواتـە: ئەگـەر لـە نیـوەی ڕێگـەوە بیهێنێتـەوە، ئـەو كاتە مافی نیوەی‌كرێیەكەی هەیە.

(وَلَو اشْتَرَكَ اثْنانِ فـي رَدِّه) ئەگـەر دوو كـەس–یـان زیـاتر– ئاگـاداری بانگەوازیی‌جەعالـە بوون‌و بـە هاوبەشـی شـتەكەیان هێنـاوە، ئـەو كاتـە (اشْتَرَكا فيالْجُعْلِ) لـە كرێیەكەشدا دەبنە هاوبەش بەگوێرەی ژمارەی‌كەسەكان، نەك بەگوێرەی‌كاركردنەكە.

بـەڵام (وَلَـو الْتَـزَمَ جُعْـلاً لمُعَيَّنٍ) ئەگـەر كرێدەرەكـە كرێیـەكی خسـتە ئەسـتۆی‌خۆی بـۆ كرێكارێكی دیاركراو، وەك بڵێ: ئەوزاد ئەگەر تۆ ئەو كارەم بۆ بكەی دینارێكت دەدەمـێ (فَشارَكَهُ غَيْرُهُ فيالْعَمَلِ) جا یـەكێكی‌تر هاوبەشـیی لەگـەڵ كرێكارەكـە كـرد لـەو كـارەدا، ئـەوە تەماشـا دەكـرێ: (إنْ قَصَدَ إعانَتَـهُ) ئەگـەر ئـەم دووەمـە مەبەسـتی یارمەتیـدانی كرێكارەكـە بوبـێ، ئـەوە (فَلَـهُ كُـلُّ الْجُعْـلِ) گشـت كرێیەكـە بـۆ كرێكارەكەیـە، یارمەتیدەرەكەش مافی هیچی نیە.

(وَ) هـەروەها (إنْ قَصَـدَالْعَمَلَ للْمالـك) ئەگـەر دووەمەكـە مەبەسـتی كـاركردن بـێ بـۆ كرێدەرەكـە، ئـەو كاتـە (فَلـلأَوَّل قسْـطُهُ) كرێكارەكەی‌یەكـەم بەشـەكرێیەكەی خـۆی دەدرێتێ: كە نیوەیـە، چـونكە نیوەی‌كارەكـەی كـردوە، بـەڵام (وَلاَ شَـيْءَ للْمُشـارك بحـال) دووەمەكە–كە هاوبەشیی كردوە– هیچی نادرێتـێ بـە هـیچ جۆرێك، چـونكە كرێدەرەكـە هـیچ كرێیـەكی بـۆ وی نەخستۆتە ئەسـتۆی‌خۆی‌و ئـەو بـە خـۆڕایی كارەكـەی كـردوە، كەواتە: ئەگەر كرێكارەكەی‌یەكەم دووەمەكەی بـە كـرێ گرتبـێ تـاكو یارمـەتیی بـدا، ئـەو كاتە دووەمەكە مافی كرێیەكەی لە سەر كرێكارە یەكەمەكە هەیە.

وَلِكُلٍّ مِنْهُما اَلْفَسْخُ قَبْلَ تَمامِ الْعَمَلِ، فَإِنْ فُسِخَ قَبْلَ الشُّرُوعِ أَوْ فَسَخَ الْعامِلُ بَعْدَالشُّرُوعِ فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَإِنْ فَسَخَ الْمالِكُ بَعْدَ الشُّرُوعِ فَعَلَيْهِ أُجْرَةُالْمِثْلِ فِيالأَصَحِّ، وَلِلْمالِكِ أَنْ يَزِيدَ وَيَنْقُصَ فِيالْجُعْلِ قَبْلَ الْفَراغِ، وَفائِدَتُهُ بَعْدَالشُّرُوعِ وُجُوبُ أُجْرَةِالْمِثْلِ، وَلَوْ ماتَ الآبِقُ فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ أَوْ هَرَبَ فَلاَ شَيْءَ لِلْعامِلِ،

---

(وَلِكُلٍّ مِنْهُما) بۆ هەر یەکێکیان -لە کرێدەرەکەو لە کرێکارەکە- دروستە (اَلْفَسْخُ قَبْلَ تَمامِ الْعَمَلِ) مامڵەتیجەعالە هەڵبوەشێنێتەوە پێش ئەوەی کارەکە تەواو ببێ:ئینجا (فَإِنْ فُسِخَ قَبْلَ الشُّرُوعِ) ئەگەر پێش دەستپێکردنیکارەکە مامڵەتەکە هەڵوەشێندراوە: لە لایەن کرێدەرەکە، یان لە لایەن کرێکارە دیارکراوەکە (أَوْ فَسَخَ الْعامِلُ بَعْدَ الشُّرُوعِ) یان لە دوای دەستپێکردنیکارەکە کرێکارەکە هەڵیوەشاندەوە، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (فَلاَ شَيْءَ لَهُ) کرێکارەکە مافی هیچ کرێیەکی نیە، چونکە لە مەسەلەی یەکەمدا هیچ کارێکی نەکردوەو لە دووەمیشدا بەخۆشیخۆی مەبەستی کرێدەرەکەی بەجێ نەهێناوە.

کەوابو: (وَإِنْ فَسَخَ الْمالِكُ بَعْدَ الشُّرُوعِ) ئەگەر لە دوای دەستپێکردنی کارەکە کرێدەرەکە هەڵیوەشاندەوە، ئەو کاتە (فَعَلَيْهِ أُجْرَةُالْمِثْلِ) لە سەری واجبە: کرێیهاووێنەی ئەوەندە کارەی کراوە، بداتە کرێکارەکە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە بە خۆڕایی کارەکەی نەکردوەو واجبە ڕێز لە کارەکەی بندرێ.

(وَلِلْمالِكِ) بۆ کرێدەرەکە دروستە: (أَنْ يَزِيدَ وَيَنْقُصَ فِيالْجُعْلِ قَبْلَ الْفَراغِ) کرێیەکە زیاد بکاو کەم بکا پێش تەواوبوونیکارەکە (وَفائِدَتُهُ بَعْدَالشُّرُوعِ) سودی ئەو گۆڕانکاریە لە دوای دەستپێکردنیکارەکە ئەمەیە: (وُجُوبُ أُجْرَةِالْمِثْلِ) کرێیهاووێنە لە سەر کرێدەرەکە واجب دەبێ بۆ کرێکارەکە لە بەرامبەر هەموو کارەکەی.

(وَلَوْ ماتَ الآبِقُ فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ) ئەگەر کۆیلە هەڵاتووەکەی گەڕاندەوەو لە ڕێگەدا مرد (أَوْ هَرَبَ) یان دیسان هەڵاتەوە، یان شتەکەی دۆزیەوە بەڵام پێش ئەوەی بیداتەوە دەست خاوەنەکەی، شتەکە فەوتا، یان ون بۆوە، یان زەوت کرا، یان بەشێکی دیوارەکەی دروست کرد ئینجا ڕووخا، یان نیوەی جلەکەی دوروی ئینجا سوتا، لەو مەسەلانەدا (فَلاَ شَيْءَ لِلْعامِلِ) کرێکارەکە مافی هیچ کرێیەکی نیە، چونکە کردارەکەی تەسلیمی کرێدەرەکە نەکردوەو سودی نەگەیوەتێ.

کەواتە: ئەگەر بەشێکی کارەکەی تەسلیمی کرێدەرەکە کرد: وەك نیوەی جلەکەی بدوروێو تەسلیمی خاوەنەکەی بکا، ئینجا لە دەست خاوەنەکەیدا بفەوتێ، یان نیوەی دیوارەکە دروست بکاو تەسلیمی خاوەنەکەی بکاو لە دەستیدا بڕوخێ، ئەو کاتە: مافی بەشە کرێیەکەی هەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

وَإِذَا رَدَّهُ فَلَيْسَ لَهُ حَبْسُهُ لِقَبْضِ الْجُعْلِ، وَيُصَدَّقُ الْمالِكُ إِذَا أَنْكَرَ شَرْطَ الْجُعْلِ أَوْ سَعْيَهُ فِي رَدِّه، فَإِنْ اخْتَلَفا فِي قَدْرِ الْجُعْلِ تَحالَفا.

---

(وَإِذَا رَدَّهُ) هەرکاتێك کرێکارەکە شتەکەی دۆزیەوەو گەڕاندیەوە (فَلَيْسَ لَهُ حَبْسُهُ لِقَبْضِ الْجُعْلِ) بۆی دروست نیە: شتەکە لە لایخۆی گل بداتەوەو نەیداتەوە تا کرێیەکەی وەردەگرێ، چونکە تا تەسلیمیخاوەنەکەی نەکاتەوە، مافی کرێیەکەی نابێ.

(وَ) هەر کاتێك کرێدەرەکەو کرێکارەکە بووە کێشەیان، ئەوە (يُصَدَّقُ الْمالِكُ) بە سوێندخواردن باوەڕ بەکرێدەرەکە دەکرێ (إِذَا أَنْكَرَ شَرْطَ الْجُعْلِ) ئەگەر بڵێ: هیچ کرێم بە مەرج دانەنابو. کرێکارەکەش بڵێ: بە مەرجت دانابو کرێم بدەیتێ (أَوْ سَعْيَهُ فِي رَدِّه) یان بڵێتە کرێکارەکە: تۆ نەتهێناوەتەوە.

بەڵام (فَإِنْ إِخْتَلَفا فِي قَدْرِالْجُعْلِ) ئەگەر لە ئەندازەیکرێیەکەدا بووە کێشەیان، ئەو کاتە (تَحالَفا) هەردووکیان-وەکو کڕیارو فرۆشیار- سوێند دەخۆنو مامڵەتەکە هەڵدەوەشێننەوەو کرێی هاوێنەش دەدرێتە کرێکارەکە.

ئینجا بزانە: ئەرکیبەخێوکردنو ئەرکیگەڕاندنەوەی شتەکە لە سەر خاوەنەکەیەتی، کەوابو: کرێکارەکە شاهید دەگرێ: کە بە نیەتیوەرگرتنەوە ئەو مەسرەفانە لە شتەکە دەکا، هەروەها دەستیکرێکارەکەش لە سەر شتەکە دەستیئەمینداریە، کەواتە: ئەگەر کەمتەرغەمیو دوژمنکاری نەکاو شتەکە بفەوتێ، نابێتە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە...کۆتایی.

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ لێرەدا-بە تەواوبوونی پەڕتوکی جەعالە- بەرگی سێیەمی ﴿ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين) ڕوونکردنەوەی (مِنْهاجِ الطّالِبِين)﴾ کۆتایی هات لە شەوی چوارشەممە (٢٤)ی (محرم)ی (١٤٢٢)یکۆچی، إِنْ شاءَ الله بەرگی چوارەمی بەدوادا دێ: کە بە ﴿كِتابُ الفَرائِض: پەڕتوکی میراتەکان﴾ دەست پێ دەکا، لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە: هێزو توانام بداتێ بۆ تەواوکردنی ڕوونکردنەوەی هەموو (مِنْهاج)ی ئیمامی(النواوی)رَحِمَهُ اللهُ تَعالَى، منیش بەندەی بێچارە: (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی)م، خودا لە خۆمو دایکمو باوکمو خۆشەویستانم خۆش ببێ، آمین، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعالَمِينَ، وَلاَحَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيم.

هەولێر - کوردستان

٢٤ی محرم-١٤٢٢ ی کۆچی.

٢٩ی خاکەلێوە-٢٧٠١ ی کوردی.

١٨ی نیسان-٢٠٠١ ی زایینی.

## شارەزاکردن:

## ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

*رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.

* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان ڕوون کراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

١ -(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

٢ -(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

٣ -(نهايةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

٤ -(مغنيالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطيب الشربيني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لەگەڵدا نەبێ، ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

## ئەی قوتابیی خۆشەویستو ڕێزدار، تکایە:

**١- پێشەکیەکەلە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.**

**٢- بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵکو لە لای مامۆستایئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.**

## *دانراوەکانیتری دانەر:

١ - هۆنراوەی ﴿ ئیمان و ئیسلام ﴾

٢ - ڕوونکردنەوەی ﴿ الأربعين النواوية ﴾

٣ - ﴿ عەقیدەی ئیسلامی ﴾

٤ - ڕوونکردنەوەی ﴿ العقيدةالطحاوية ﴾

٥ - چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾

٦ - ڕوونکردنەوەی ﴿ متن فتح القريب ﴾

٧ - ڕوونکردنەوەی ﴿ قطرالعارض فى علم الفرائض ﴾

٨ - چۆنیەتی ﴿ حەج و عومرە ﴾

## ناوەڕۆکی بەرگی سێیەمی ﴿ ڕووناکی(رَبُّ الْعالَمِين)﴾

# ناوەڕۆكی بەرگی سێیەمی ﴿ ڕووناكی(رَبُّ الْعالَمِين)﴾

١-خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ ﴾ (التوبة:١٢٢)، واتە: دەبوا لە هەر هۆزێکی موسوڵمانان کۆمەڵێك ڕاپەڕیبان بۆ (جیهاد)کردن و کۆمەڵێکیش بۆ خوێندن، تاکو لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن.

٢- پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ چاکەی بداتێ، لە (شەریعەتی ئیسلام) تێی ئەگەیێنێ.

٣-ئیمام (عمر بن الخطاب) دەفەرموێ: ﴿ تَفَقَّهُوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا، فَمَنْ سَوَّدَهُ قَوْمُهُ عَلَى فِقْهٍ، كَانَ حَيَاةً لَهُ وَلَهُمْ ﴾ رواه الدارمي، واتە: لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن پێش ئەوەی بکرێنە گەورە، چونکە هەر کەسێك (شەرع) بزانێ و گەلەکەی خۆی بیکاتە گەورە، ئەبێتە هۆی ژیانێکی خۆش بۆ خۆی و بۆ ئەوان.

٤- ئیمام (الأعمش) دەفەرموێ: ﴿ يَامَعْشَرَ الْفُقَهَاءِ أَنْتُمُ الأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيَادِلَةُ ﴾ رواه الصيمري، واتە: ئەی چینی(شەرعزانان) ئێوە پزیشکن، ئێمەی(حەدیس گێڕەوەش) دەرماننناسی دەرمانخانەین.

٥- ئیمام (الشافعي) دەفەرموێ: ﴿ مَنْ حَفِظَ الْفِقْهَ عَظُمَتْ قِيمَتُهُ وَمَنْ تَعَلَّمَ الْحَدِيثَ قَوِيَتْ حُجَّتُهُ ﴾ رواه ابن حجر الهيتمي، واتە: هەرکەسێك لە (شەریعەتی ئیسلام) شارەزا ببێ نرخی بەرز ئەبێتەوە، هەر کەسێك (حەدیس) فێر ببێ بەڵگەی بەهێز دەبێ.

٦-ئیمامی (البخاری) دەفەرموێ: ﴿ هُوَ-أَيِ الْفِقْهُ- ثَمَرَةُ الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ ثَوَابُ الْفَقِيهِ دُونَ ثَوَابِ الْمُحَدِّثِ ﴾ رواه القسطلاني، واتە: (شەریعەتی ئیسلام) بەرهەمی حەدیسە، پاداشتی (شەرعزان) کەمتر نیە لە پاداشتی (حەدیس گێڕەوە).